


ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

هەنگاوێك بەرەو ڕاگەیاندنێكی كوردیی ئیسلامیی هاوچەرخ




ناوی كتێب: بەرەو ئیسلام – بەرگی ١ - ١٠

نووسەر: ئەندازیار عوسمان

نەخشەسازی بەرگ: ئومێد محمدعلی قەرەداغی

تیراژ: (٢٠٠٠)دانە

نۆبەی چاپ: چوارەم – ٢٠١٠

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارە (٢١٦)ی ساڵی٢٠٠٦ی پێ دراوە



07703587100

07501069589

07480134669

ara.m@hotmail.com

# بەرەو ئیسلام

بەرگی ١ - ١٠

نووسینی
ئەندازیار عوسمان

چاپی چوارەم
١٤٣١ك - ٢٠١٠ز

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگارو درووودوسلاویش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یاروياوەران.. قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ الحجرات: ٧ - ٨

بەفەزڵ و ڕەحمەتی خوایە کە ڕێی ڕاستمان گرتووەو ئیمان و ئیسلامەتیمان هەڵبژاردووە، کە ئەمەش گەورەترین نیعمەتە خوا پێی بەخشیوین، بۆیە چەند باسی ئیمان وئیسلامەتی بکەین هێشتا هەرکەمەو، چەند باسی بانگەوازکردن بکەین بۆ ئەم پەیامە پیرۆزە لە وێنە نەبووە، کەمایەی سەرفرازی دنیاو قیامەتە هەر دڵۆپێکە لە دەریایەك.

پاش ئەوەی لەسایەی خواوە (ژیانەوە) و(بەهاری دڵان) و(لەخزمەت قورئاندا) و(بەرەو پەروەردەی ئیسلامی) و (بەرچاوڕوونی) و(فەرهەنگی بانگخوازان) و (ڕامان لە قورئان) ڕۆڵی خۆیان بینی، پێمان باش بوو کە لەم گەشتە ئیمانییەش دا بە خوێنەرانی ئازیز بگەینەوەو ناومان نا (بەرەو ئیسلام) .

تەوەرەی سەرەکی هەموو پەڕاو و باسەکان، موعجیزەکانی قورئان و سوننەت و موسوڵمان بوونی بەردەوامی خەڵکیيە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، کە پێویستی ئەم سەردەمەیە، بۆ بەرپەرچدانەوەی گومان و پڕوپاگەندەی دوژمنان، کە هەردەم لە کەمیندان بۆ موسوڵمانان و پارەوپولی دونیا بۆ دوورخستنەوەی خەڵکی لە ئیسلام بەخت دەکەن.. قورئانی پیرۆز لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴾ الأنفال: ٣٦ . واتە: بەڕاستی کافران پارەوماڵی خۆیان بەخت دەکەن بۆ دوورخستنەوەی خەڵکی لەئیسلام، پارەکانیان بەخت دەکەن و سەرەنجام دەبێتە خەم و خەفەت بۆیان و ژێر دەکەون، کافرانیش بۆ دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن..

ئاژانسەکانی دەنگ و باس دەڵێن: لە مۆسکۆی پایتەختی ڕووسیا، کەزیاتر لە حەفتا ساڵ ویستیان بە ئاگرو ئاسن ئیلحادی بەسەردا فەرز بکەن، ساڵی (٢٠٠٤) پانزە هەزار کەس

موسڵمان بوون و لە  ساڵی (٢٠٠٥) ژمارەکە زیادبووە بۆ (٢٠) هەزار کەس. ئەمە لە کاتێکدا کە لەگەڵ ئەو هەموو فشارو تەنگ پێهەڵچنینەی سەرانی کوفرو ئیلحادیشدا بۆ خەڵکی نزیکەی بیست ملیۆن موسڵمان هەن لە ڕووسیاداو پابەندی ئاینی پیرۆزی ئیسلامن.. .

ژمارەی حاجیانی ساڵی (٢٠٠٥) لە ڕوسیاوە ئەوەندەو نیوی ژمارەی حاجیانی ساڵی (٢٠٠٤)و زۆر بەشەوق و خۆشییەوە خۆیان ئامادە دەکەن بەرەو حەجی ماڵی خواو زیارەتی ئەو پێغەمبەرەی کە ڕەحمەتە  بۆ عالەم..

ئاشکراشە کە خەڵکی ڕوسیا لەسای سەری حوکمەتی گەندەڵ و مافیاکانی ڕژێمەوە لە هەژاری و نەبونییدا دەژین و حەج نزیکەی (٢٠٠٠) دۆلاری تێدەچێ، کە ئەو بڕە پارەیە بۆ ئەوان زۆرە کەچی گوێ نادەنێ و ماڵی خۆیان بەخت دەکەن و بەدەم سرودی (لبيك اللهم لبيك) ڕێی دووری حەج دەگرنە بەرو وەڵامی بانگەوازەکەی پێغەمبەر ئیبراهیم ئەدەنەوە سەلامی خوای لێبێت، کە خوای گەورە فەرمانی پێدا بانگی خەڵکی بکات بۆ حەج ﴿ وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴾ الحج: ٢٧.

هەروەها دەنگ و باسەکان دەڵێن کە موسڵمانان لەشاری (نیس)ی فەرەنسی لە هەوڵدان کە مزگەوتێك دروست بکەن و سەرۆکی شارەوانی ئەو شارەش کە پیاوێکی (متطرف)ە ئاستەنگ دەهێنێتە ڕێیان، شایەنی باسە موسڵمانانی (نیس) بیست هەزار کەسێك دەبن و نزیکەی دە هۆڵی نوێژکردنیان هەیە کە جێیان نابێتەوەو خەڵکی لەسەرجادەو شۆستەکانی دەوری مزگەوت نوێژدەکەن..

ئەم هەواڵانەو سەدان هەواڵی تری لەم جۆرە لەم لاو ئەولاوە دەبیستین، دیارە ئەمانە بەڵگەن لەسەر بڵاوبوونەوەی ئیسلام و موسڵمان بوونی بەردەوامی خەڵکانێکی زۆر لە هەموو لایەکی دنیاوە، بەڕاستی تەنها ئیسلامە وا زیاتر لە چواردە سەدەیە توانیویەتی خۆی بگرێت و خەڵکی کەمەندکێش بکات بەرەو لای بەرنامەکەی.. .

# شـكـانـدنی كـۆت و پـێوەنـدەكـان

ئاینی پیرۆزی ئیسلام سەرەتا كە هات، كۆیلایەتی نیزامێكـی جیهـانی بـوو، وردە وردە بەپێی بەرنامەیەكی ڕێك وپێك و نەخشـە بۆكێشـراو، كۆیلایـەتی كـەم كـردەوەو سـەرەنجامیش نەیهێشت، ئیسـلام باسـی ڕێزداری ئـادەمیزادی كـردو فـەرمووی: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ الإسراء: ٧٠ ، پێغەمبەریش ﷺ دای بەگوێی جیهاندا كە هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان عـەرەبێك و عەجەمێكدا مەگەر بەتـەقوا و خواناسـین... عومـەری كـوڕی خـەتتابیش فـەرمووی (مـتی استعبدتم الناس وقد ولدهم أمهاهم أحــراراً) بەمـەش كـۆت و پێوەنـدە ماددیـەكان كرانـەوەو نەمان.

كۆت و پێوەندی تریش هەن كە (مەعنوی)ن، بەهاتنی پێغەمبەر ئەو كۆت و پێوەندانەش كرانەوە :

﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ الأعـراف: ١٥٧. واتـە: ئەوانـەی شـوێن ئـەو پێغەمبـەرە نەخوێندەوارە دەكەون كە لەلایان نوسراوەو مژدە بـەهاتنی دراوە لـە تـەورات و ئینجیلدا، كـە فەرمانیان پێ ئەدا بەچاكەو جلەوگیرییان دەكات لە خراپە و، بۆیان حەڵاڵ دەكات شتانی پـاك و پوخت و یاساغی دەكات لێیان شتانی پـیس و ناهـەموارو، بـاری گـران و كـۆت و پێوەنـدیان لادەبات، جا ئەوانەی بڕوای پێ دێنن و سەری دەخەن و دوای ئەو نورە دەكـەون كـە هێناویـەتی هەر ئەوانن سەرفرازو سەركەوتوو ...

هەروەها لە سورەتی (البینة) ش دا دەفەرموێت: ﴿ لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ۝١ رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴾ البینـــة: ١ - ٢ ... واتە: ئەوانەی كە بێ بڕوابوون لە خاوەن نامـەو بت پەرستەكان، دەسـتیان هەڵنـەگرت لـە بێ بڕوایـی و كـۆت و پێوەنـدەكانیان نەكرانـەوە، تـا نیشـانە ڕوونەكـەیان بـۆ هـات، كـە ئـەویش پێغەمبەرێكە لەخواوە ئەخوێنێتەوە بەسەریانا چەند پەڕەیەكی پاك كە قورئانـە، كـە تیایانایـە

چەند نامەیەکی بەنرخ ... (یان تیایدایە پوختە و پاڵاوتەی چەند نامەیەکی بەنرخی ئاسمانی پێغەمبەرانی پێشوو) ..ئاینی ئیسلام ڕۆژانە پێنج جار بانگی (حي على الصلاة و حي على الفلاح) دەدا بەگوێی ئادەمیزادا، هەستن بۆ نوێژ، هەستن بۆ شکاندنی گشت کۆت و پێوەندە ماددی و مەعنەوی‌یەکان، هەستن بەرەو ڕزگاری و سەرفرازی . بۆ نموونە بەخیلی و چرووکی کۆت و پێوەندێکە دەستی خاوەن ماڵ دەبەستێ‌و نایەڵێ خێرو چاکە بکات، بۆیە قورئان ئامۆژگاری دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴾ الإسراء: ٢٩.

ڕق وکینەو حەسوودی دڵی مرۆڤ بەند دەکات و کۆت و پێوەند دەکاتە گەردنی، نایەڵێ ئەو دڵە بجوڵێ بەرامبەر موسڵمانان و نایەڵێ سۆزو بەزەیی و میهرەبانی ببێت، بۆیە بڕواداران دوعا دەکەن کە خوا لەو کۆت و پێوەندە ڕزگاریان بکات و، دڵیان پاك و سینەیان ساف بێت، بەرامبەر خوشك و برا ئیماندارەکانیان: ﴿ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ الحشر: ١٠. کافرەکانیش کە لەدنیادا خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَـٰقِهِمْ أَغْلَـٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ۝٨ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَـٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ۝٩ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ يس: ٨ - ١٠

واتە: ئەم کافرانە لە بێ ئاگایی و بڕوا نەهێنانیاندا وەك کەسانێکن کە زنجیرمان کردبێتە ملیان و تا چەناگەیانی داگیرکردبێ، کەواتە سەریان بەرزنەبێتەوەو بەردەمی خۆیان نابینن و، وەکو کەسانێکن کەلەبەردەم و پشتیانەوە دیوارو (بەربەست)مان دانابێ و بەرچاویان گیرابێ و نەهیچ ببینن و نەبشتوانن بجوڵێن، جا ئەوانە بیانترسێنی و ئاگاداریان کەیتەوە یان نەیکەیتەوە وەکو یەکەو هی ئەوەن کە دەستیان لێ بشۆری، ئەوەندە ڕۆچوون لە کوفرو جەهالەتدا، ئەو کافرانەی کەلەدنیادا کۆت و پێوەندی هەواو ئارەزوو پەل بەستی کردوون و نایەڵێ بێن بەرەو هەق و ڕاستی، لەقیامەتدا سزاکەیان دۆزەخە بەدەست و پەل بەستراوی‌یەوە، هەروەك لێرە لەکۆت و پێوەندابوون و ئازاد نەبوون، لە قیامەتیشدا هەروا دەبن، قورئان دەفەرموێت:

﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ ﴾ الحاقة: ٣٠ - ٣٣.

واته: بیگرن و کۆت و زنجیر بکەنە دەستی، لەپاشا بی سوتێنن لە دۆزەخا، ئینجا بە زنجیرێکی حەفتا گەزی بیبەستنەوە، چونکە ئەو بڕوای بەخوای گەورە نەنەکردو هانی خەڵکی نە ئەدا لەسەر ناندان بە هەژاران و یارمەتی و دەست گرتنیان..

هەروەها قورئـان دەفـەرموێت: ﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾ الرعد: ٥. واته: ئەوانە بڕوایان نەهێناو کافر بوون، ئەوانەن کە کۆت و پێوەند لە گەردنیاندایە وە ئەوانـەن کـە هـاودەمی ئـاگری دۆزەخـن و تیایا هەتا هەتایی دەبن[١].

## بەڵگەکان

قورئانی پیرۆز هەردەم جەخت دەکاتـە سـەر هێنـانی بەڵگـەو بورهـان و هەمیشـە زەمـی چاولێکەری کوێرانە دەکات، هەروەك لەم چەند ئایەتەدا ئاماژەی بۆکراوە:

## یەکـەم: داواکـردنی بەڵگـەو بورهـان:

١- ﴿ أَمَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ۗ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ النمل: ٦٤، واته: ئایا کێ لە سەرەتاوە دروستکراوان بەدی دەهێنێت، پاشان دوای نەمانیان دروستیان دەکاتەوە، کـێ لـە ئاسمـان و زەوی‌یـەوە ڕزق و ڕۆزیتـان پێدەبەخشـێت؟ ئایـا لەگـەڵ خـوادا کەسـی تـر هەیـە شـایانی پەرسـتن بێـت ؟ پێیـان بڵێ ئادەی بەڵگەتان چی‌یە بیهێننە مەیدان ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن..

٢- ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ ﴾ المؤمنون: ١١٧.

---

١- لە خزمەت قورئاندا — نووسەر — ل ٢٧٤.

ئەوکەسەی خوایەکی تر بڕیار بدات و بیکاتە شەریکی خوا، لە کاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیە، ئەوە بەڕاستی حساب و لێپرسینەوەی لای پەروەردگاریتی، بێگومان بێباوەڕان و خوانەناسان سەرفراز نابن .

٣- ﴿ قَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ هُوَ الْغَنِيُّ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ إِنْ عِنْدَكُمْ مِنْ سُلْطَانٍ بِهَذَا أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ یونس: ٦٨

خوا نەناسان دەڵێن: خوا منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوە ! پاکی و بێگەردی شایستەی ئەو خوایەیە، ئەو زاتە بێنیازە (پێویستی بە کوڕو کچ نیە)، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، بێگومان هیچ بەڵگەو نیشانەیەکتان نیە بۆ ئەم بوختانە ناڕەوایە، ئایا شتێك هەڵدەبەستن بۆ خواو بێباکانە دەیڵێن، کە هیچی لێ نازانن و هیچ بنەمایەکی نیە ؟!

٤- ﴿ أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُنِيرٍ ﴾ لقمان: ٢٠.

واتە: ئایا سەرنجتان نەداوە کە بەڕاستی خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر هەمووی ڕام کردووەو بۆ خزمەتی ئێوە دروستیکردووە، هەروەها نیعمەتی ئاشکراو پەنهانی بەسەردا ڕژاندون، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە خەڵکی مجادەلە و گفتوگۆی نابەجێ دەربارەی خواو بەرنامەکەی دەکەن، بێ هیچ بەڵگەیەکی زانستی و ڕێنموونیەکی پێغەمبەران و کتێبێکی ڕوونکەرەوەی خوایی..

٥- ﴿ وَقَالُوا لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ كَانَ هُودًا أَوْ نَصَارَى تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴾ البقرة: ١١١، واتە: گاورو جوولەکان دەڵێن: کەس ناچێتە بەهەشتەوە بێجگە لە جوولەکە یان گاور، جا ئەوە ئاوات و خەیاڵیانە، پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن بەڵگەکانتان بهێنن..

## دووەم: جڵەوگیری لە چاولێکەری کوێرانە :

١- ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴾ لقمان: ٢١، واتە: کاتێک پێیان بوترێت شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون خوا ناردویەتی، دەڵێن: نەخێر شوێنی ئەوە ناکەوین، بەڵکو هەر شوێنی ئەو شتانە دەکەوین کە باو و باپیرانمان پەیڕەویان کردووە، ئایا ئەگەر شەیتانیش بانگی کردبن بۆ سزای داگیرساوی دۆزەخ هەر پەیڕەوی دەکەن ؟!

٢- ﴿ وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا ﴾ الأحزاب: ٦٧. واتە: وتیان: پەروەردگارا ئێمە بەگوێی گەورەو دەسەڵاتدارانمان کرد سەرگەردانیان کردین و لە ڕێی ڕاست لایان داین، پەروەردگارا دوو بەرابەر و دوو چەندانە سزای ئەوانە بدەو نەفرینێکی گەورەو بێ ئەندازەیان لێ بکە. (بەڵێ، عەقڵیان نەخستە کار و کوێرانە دوای ئاغاکانیان کەوتن و ئێستاش کە هیچ فریایان ناکەوێ داوای سزای دوو قاتیان بۆ دەکەن).

٣- ﴿ وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي النَّارِ فَيَقُولُ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ النَّارِ ﴾ غافر: ٤٧، واتە: لە دۆزەخدا کێشەو دەمەدەمێ دروست دەبێت، لاوازو چەوساوەکان بە دەسەڵاتدارو لووت بەرزەکان دەڵێن: بە ڕاستی ئێمە شوێنکەوتەی ئێوە بووین، ئایا ئێوە ناتوانن تۆزێک سزای ئاگرمان لەسەرکەم بکەنەوە ؟ لە وەڵامیاندا خۆبەزل زانەکان دەڵێن: ئێمە هەمورمان لە ناو ئاگردا گیرمان خواردووە، بێگومان خوای گەورە دادوەری کردووە لە نێوان بەندەکانیدا و بڕیارەکانی بڕاوەتەوە.

## سێیەم: سوود وەرگرتن لە چاوو گوێ و دڵ :

١- ﴿ وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ النحل: ٧٨، واتە: خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن، ئینجا چاووگوێ و دڵی داونەتێ، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن..

٢- ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ الإسراء: ٣٦، واته: (ئەی ئینسان) لە شتێك مەدویٚ و شوێنی شتێك مەكەوە كە زانست و زانیاریت دەربارەی نیە، چونكە بەڕاستی گوێ و چاو و دڵ هەر هەموویان بەرپرسیارن لە بەرامبەریەوەو خوا محاسەبەتان دەكات لە سەری.

٣- كافران كەڕولاڵ و كوێرن و هیچیش حاڵی نابن :

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ البقرة: ١٧٠ - ١٧١، واتە: ئەگەر پێیان بوترێت: شوێنی ئەو بەرنامەیە بكەون كە لەلایەن خواوە ڕەوانەكراوە، دەڵێن: نەخێر هەر شوێنی ئەوە دەكەوین كە باووباپیرانمان پێوەی ئالوودە بوون و لەسەری ڕاهاتوون، ئایا ئەگەر باووباپیرانیشیان تێنەگەیشتوو و هیچ نەزان و هیدایەت نەدراوبن (هەر شوێنیان دەكەون)؟!..

نموونەی بێباوەڕان (لەگەڵ پێغەمبەردا، لەوەی كە سوود وەرناگرن لەم قورئانە) وەكو شەو شوانە وایە كە هاوار دەكات بەسەر ئاژەڵەكانیداو تێی ناگەن، مەگەر ئەوەندە كە گوێیان لە هات و هاوارێكە، ئەوانە كەڕولاڵ و كوێرن و ژیری و عەقڵیشیان لە دەست داوە.

لەم ئایەتانەوە تێدەگەین كەئیمان و ئیسلامەتی ئاسانكراوەو هەموو كەس دەتوانیٚ لە هەموو كات و سەردەمێكدا بەشی پێویستی لێوەرگریٚ، بە پێچەوانەی ڕێباز وبەرنامەكانی تر و ئاینە تەحریف كراوەكانەوە كە زۆر مەسەلەی تەلیسم و ناڕوونی تیایەو عەقڵ قبوڵی ناكات، بۆیە خەڵكی بەوە دەخەڵەتێنن كە ئەو بوارە تەنها بۆ پیاوانی ئاینی و كەسانی تایبەتی خۆیانە..

قورئانی پیرۆز تاقە پەڕاوی پارێزراوە کە بەوەحی نێردراوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و هیچ گومان و ناتەواویەکی تیا نیە، هیچ وشەیەکی تیانیە کە زیادەبێ و بێ مەبەست هاتبێ، قورئان لەبارەی خۆیەوە دەفەرموێت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴾ النساء: ٨٢، واتە: بۆ ورد نابنەوە لە قورئان، ئەگەر لەلایەن غەیری خواوە بهاتایەو هی خوا نەبوایە جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تیادا دەدۆزیەوە .

جا ئەوانەی کە بەویژدان و هەق ویستن لە ئەهلی کیتاب، هەروەها ئەو زانایانەی کە هەواو ئارەزوو دەمارگیریان خستۆتە لاوە، باش دەزانن ئەم قورئانە لەلایەن خواوە هاتووەو، هەق و ڕاستیەو ڕێنماییکارە بۆ ڕێی خوای خاوەن دەسەلاّت وشایستەی سوپاس و ستایش ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾ سبأ: ٦، لە فەرمودەیەکیشدا هاتووە کە دەفەرموێت: (أعربوا القرآن والتمسوا غرائبه)[1]، واتە: بگەڕێن بە دوای وردەکاریەکانی قورئان و ئەو شتانەی کە ئەوە لە دوای ئەوە - وەك بەڵگە زانستیەکان - دەردەکەون..

بەڵێ.. ڕۆژگارێك هات بەسەر مرۆڤایەتیدا، کەلە ڕۆژئاوا بەناوی ئاینەوە دژایەتی زانست کرا، ئەمەش بووە مایەی هەڵگەڕانەوەی خەڵکی لە دەسەلاّتی کەنیسەو جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت و دەسەلاّت و تەنانەت لە ژیانیش، ئەم بەلاّو نەگبەتیەش گەیشتە ولاّتە ئیسلامیەکان، و کەسانێکی ناحاڵی ویستیان ئەوەش بەرامبەر ئیسلام بکرێت، لە کاتێکدا کە ئیسلام هەرگیز دژایەتی زانستی ڕاستی نەکردووەو، تەنانەت یەکەم ئایەتمان بە ﴿ ٱقْرَأْ ﴾ دەست پێدەکات و، لەچەندەها ئایەت و فەرموودەی تریشدا ڕێز لە ئەهلی زانست گیراوەو تەنانەت ئاماژە بەوەش کراوە کە زاناکانن بە ڕاستی لە خوا دەترسن.

لەگەڵ پێشکەوتنی زانست دا ڕۆژبەڕۆژ زیاتر گەورەیی ئەم ئاینە دەردەکەوێت، زۆر نموونەمان لە پەڕاوەکانی پێشتردا باسکردووە لێرەشدا ئاماژە بەچەند ئایەتێك دەکەین:

---

١- حاکم لە "مستدرك"دا ڕیوایەتی کردووە ٢/٤٩٢.

## ١- گیانلەبەرانیش وەك مرۆڤ ئومەتن :

قورئانی پیرۆز لە سورەتی الانعام ئایەتی (٣٨) دا دەفەرموێت :﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا بِـَٔايَٰتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الأنعام: ٣٨ - ٣٩. واتە: هیچ زیندەوەرو گیانداریك نیە بەسەر زەویدا بڕوات و هیچ باڵندەیەك نیە بە باڵەكانی بفڕێت، گەل و ئومەت نەبن وەك ئێوە، دڵنیابن هیچ شتێك نیە پشتگوێمان خستبێت لەكتێبە تایبەتیەكەی (لوح المحفوظ)دا، لەوەو دوا هەر هەموو ئەوانە كۆدەكرێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان، بۆ ئەوەی دادگایی بكرێن و هەموو كەس مافی خۆی وەرگرێت..

باشە كەسێكی نەخوێندەواری وەك پێغەمبەر ﷺ كە زانست و زانینی ئەوتۆی لە بەردەستا نەبووە، چۆن باس لە مەسەلەیەك دەكات كە پاش چەندەها سەدە وپاش لێكۆڵینەوەو دیراساتی هەزاران زانا، ئنجا گەیشتنە ئەو ڕاستیەیكە هەمووگیانلەبەران گەل و ئومەتن وەك مرۆڤ، نیزام و یاساو بەرنامەی خۆیان هەیە لە ژیاندا، هیچ شتێ لەم دنیایەدا لە گۆترەو هەڕەمەكی نیە! ئەوەتا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت (لولا أن الكلاب أمة من الأمم لأمرت بقتلها كلها)[1] واتە: ئەگەر سەگ ئومەتێك نەبوایە لە ئومەتەكانی ئەم سەر ڕووی زەوی یە، فەرمانم ئەدا هەموویان لەناو ببرێن و قڕ بكرێن..

بە ڕاستی تەنها ئەم ئاماژە زانستی یە بەسە بۆ كەسێك كە بیەوێ بگاتە هەق وڕاستی، كەچی بە داخەوە زۆر كەس خۆی لە هەق و ڕاستی وێڵ دەكات و هەروا بە كەڕو لاڵی و كوێری خۆی دەهێڵێتەوەو نایەوێ لە تاریكاییەكان بێتە دەرەوەو لە ڕووناكیدا بژی.. ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا بِـَٔايَٰتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ ﴾ الأنعام: ٣٩. بێگومان ئەوەی هەق و ڕاستی نەوێت خواش هیدایەتی نادات و ئەوەش كە بەدوای هەق و ڕاستی دا بگەڕێت و مەبەستی بێت، خواش كاری

---

١- حسن صحيح /ترمذي/١٤٨٦.

بــۆ ئاســـان دەكــات و هیدایـــەتی دەدات ﴿ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الأنعام: ٣٩ ..

ئەگەر هـەر کـەس بـە ویژدانـەوە سـەیری جیهـانی باڵنـدە بکـات کـە چـۆن دەژیـن و لـە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر کۆچ دەکەن، هەروەها هەر کەس سەیری جیهـانی مێروولـە بکـات کە چۆن هاوکارن و گیان فیـدان و وردەکـارن لـە ژیانـدا، تێـدەگات کـە قورئـان چـەند مـەزن و گەورەیە کە ئاماژەی کردوە بۆ وردبوونەوە لێیان و بە ئاشکرا باسی گەل و تومەتیانی کردووە..

لە فلیمی دۆبلاژکراوی کۆمەڵـەی ئـارا(الإعجاز فی النملـــة)دا بـاس لـەجۆری مێروولـەی بەرگدروو دەکات، کە چۆن زۆر بە وردی گەڵا بەیەکەوە ئەدزوون و شـارە مێروولەیـەك بۆخۆیـان دروست دەکەن .

چـەند مێروولەیـەك بەیەکـەوە لێـواری گـەڵاکان ڕادەکێشـن و نزیکیـان دەکەنـەوە، چـەند مێروولەیەکی تریش، مێروولەی (کرمۆکە) دەهێنن کە هێشتا نەشونمای تەواو نەبووە وهێشـتا نەبووە بە مێروولە (چونکە ماددەیـەك دەردەدات کـە وەك دەزوو وایـە) و بەهۆیانـەوە گـەڵاکان بەیەکەوە دەبەستنەوە..

هەندێ مێروولەی تریش لە دارستانەکانی ئەمازۆن، (٥٠٠) هەزاریان بەیەکەوە دەژیـن و دەمیان دوو چەقۆی پێوەیە کەبە مادەی (زینك) داپۆشراوەو گەڵا دەبڕن و کۆمەڵێکیش ڕێگایان بۆ چاك دەکەن، ئەو مێروولەیەی کە گەڵاکە هەڵدەگرێ ئەگەر بە راوردبکرێ بە مرۆڤ وەك ئـەوە وایە مرۆڤێکی وەك نێمـە (٢٥٠) کیلـۆی هـەڵگرتبێ و بـە خێرایـی (١,٥) کم بـڕوات لەیـەك خولەکدا، بە ڕاستی گورج وگۆڵ وئازاو لەخۆبردوون..

مێروولەیـەکیش دەچـێتە سـەر گەڵاکـەو دەبێتـە پاسـەوان و حیمایـە، نـەك لـە ڕێـدا زەردەزیرەیەك یا دوژمنێك پەلاماری مێروولە بار هەڵگرەکە بدات کە دیـارە ناتوانێـت بـەرگری لە خۆی بکات..

کـە گـەڵاکانیان هێنایـە شارەکەیانەوە یەکسـەر بـە لیکیـان پاکیدەکەنـەوە کـەماددەی (ئـەنتیبایوتیك)ی تیایـە، نـەك گەڵاکـە پـیس بێـت و نەخۆشـی بڵاوببێتـەوە، ئنجـا کۆمـەڵێ مێروولەی تر وردی دەکەن، ئەمـەش بۆ ئەوەی کەڕووی لەسەر سەوز بێت، ئینجا هـەموویان لـە کەڕووەکە دەخۆن، پاشان کۆمەڵێکی تریان وردە گەڵاکان وپاشماوەکان فڕێ ئەدەنە دەرەوە.

چەندەها زانا چەندەها ساڵ دیراسەی شارە مێرووڵەیان کرد لەسەر تاسەری جیهانداو زۆر دیاردەی سەرسوڕهێنەریان دۆزیەوە، وەك زانای بە ناوبانگ (ڕۆیاڵ دیکنسون) کە بیست ساڵ خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لەسەر شارە مێرووڵە لە جیهانداو لە پەڕاوەکەیدا (شخصية الحشرات) زۆر ڕاستی تۆمارکرد، کە ئیبداع و تصمیم پیشان ئەدات لە دروستکراوەکانی خوادا..

زانایان بۆیان دەرکەوت کە شارە مێرووڵە :

- دەرگای هەواگۆڕکێی هەیە.. (باب التهوية).

- شوێنی تایبەتیان هەیە بۆ پاسەوانان، تا مێرووڵەی نەناسراو نەیەتە ژووری.

- شارە مێرووڵە جاری وایە چەند قاتە، قاتی یەکەم بۆ پشوودانی ئەوانەیە کە کاردەکەن بە تایبەت لە هاویندا..

- عەمباری تایبەتیان هەیە بۆ هەڵگرتنی خواردن.

- شوێنی تایبەتیان هەیە بۆ خواردن..

- شوێنی تایبەتیان هەیە بۆ سەربازەکانیان..

- ژووری تایبەتیان هەیە بۆ شاژن بۆ گەرادانان..

- شوێنی تایبەتیان هەیە بۆ بەخێوکردنی مێرووڵە بچوکەکان..

- شوێنی تایبەتیان هەیە بۆ ناشتنی ئەو مێرووڵانەی کە دەمرن..

- لە ئەمازۆن شارە مێرووڵە هەیە کە (٥) تا (٧) مەتر قووڵەو سەدان ژوورو نەفەقی تیایە، شارە مێرووڵەی وا هەیە چەندەها تەن خۆڵی لێ دەرئەدەن و زۆر بەشێوەیەکی ئەندازەیی و تەلار سازی بینای دەکەن..

- مێرووڵە ئەو دەنکە تۆوانەی دەیبەن هەڵی بگرن، دەیکەن بە دووکەرتەوە بۆ ئەوەی سەوز نەبێت و چەکەرە نەکات، بەڵام هەندێ تۆو هەیە کە ئەگەر بکرێ بەدوو لەتیشەوە هەر سەوز دەبێت وەك تۆوی قەیتەران (الكذبرة) بۆیە دەیکەن بە چوار لەتەوە بۆ ئەوەی سەوز نەبێت و چەکەرە نەکات..

- ئەگەر بەهۆی بارانەوە تۆوەکان تەڕبوون، ئەیهێننە دەرەوەی شارەکەیان و لەبەر هەتاو ئەیدەن بە هەواو هەڵی دەخەن تا وشك دەبێتەوە.

- زانا (ڕۆیال دیکنسون) دەڵێ: ئەو نیزام و ڕێك و پێکییەی لەشارە مێرووڵە دایە لەشارە گەورەکانی مرۆڤدا بەدی ناکەیت.. ئەم زانایە بۆی دەرکەوت کە مێرووڵە هەیە

قالۆنچەی بچووك دەهێنن و بە خێوی دەكەن لەناوشارەكەیاندا، پاشـان وەك چۆن مـرۆڤ مانگـا ڕادەگرێ و دەیدۆشێ ئەوانیش ئەوانە ڕۆژانە ئەدۆشن و پێیان دەوترێ (مانگای مێروولە)..

هەروەها مێروولە سوود لە حەشەرەیەكی تر وەردەگرێت كە پێـی دەوترێـت (بـق النبـات) كێچی ڕووەك، ئەم حەشەرەیە لەسەر ڕووەك دەژی و لێی جیانابێتەوە، بۆیە مێروولـە گـەراكانی ئەم حەشەرەیە دەباتە ناو شارەكەیەوە و پاشـان خزمـەتی دەكـەن تـا هەڵـدێ و گـەورە دەبێـت، دوایی ڕۆژانە لە هەریەكە لەو حەشەرانە (٤٨) قەترەیەك وەردەگرێ كە وەك هەنگوین شـیرینەو مێروولەكان دەیخـۆن و سـوودی لێـوەردەگرن وكۆمـەڵێ مێروولـەی تایبـەت كاریـان تـەنها ئـەو دۆشینەیە.[1]

## ٢- سـورەتـی "الـنمـل" و چـەنـد ئیـعـجـازێـك:

قورئان باسی چیرۆكی پێغەمبەری سولەیمان دەكـات: ﴿ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰ إِذَا أَتَوْا عَلَىٰ وَادِ النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ ﴾ النمـل: ١٧ - ١٩. واتـە: هەرچـی سـەربازو لـە شكری سولەیمان هەبوو لـە پـەری و ئـادەمیزادو باڵـندەكان كۆكرانـەوەو نمایشیـان كـرد بـەڕێز و بەڕێكوپێكی، هەموویان بە سەرەتاو كۆتاییان یەكیان گرت.. هـەتا گەیشـتنە دۆڵـی مێروولـە، مێروولەیەكی مێیە هاواری كردو وتی: مێروولەینـە، بچـنە ماڵەكانتانـەوە نـەوەكو سولەیمان و سەربازانی بتانشكێنن، لە كاتێكدا هەستان پێنەكەن.. سولەیمان كە گوێی لە مێروولەكـە بـوو پێكـەنی و وتـی: پـەروەردگارا یارمـەتیم بـدە، دڵ و دەروون و ڕۆح و گیـانم كۆبكـەرەوە، تـا سوپاسـگوزاری نـازو نیعمەتـەكانت بم كەبەسـەر مـن و دایـك و بـاوكم دا ڕژاندوتـە، هـەروەها كۆمەكیم بكە تا كاروكردەوەی چاك ئەنجام بدەم كە تۆ پێی ڕازیت و بە میهرەبانی خۆت بمخەرە ڕیزی بەندە چاكەكانتەوە.

---

١- پێگەی (مەوسوعەی ئیعجازی عیلمی لە قورئان و سوننەت) دا..

ئەم چەند ئایەتەی سورەتی (النمل) چەند ڕاستیەکی زانستی تیایە:

أ- قورئان دەفەرموێت مێرووڵەیەکی مێیە، زانستی سەردەمیش ئەوەی سەلماندووە کە مێرووڵەی مێیەی نەزۆك هەڵدەستێ بە کۆکردنەوەی خواردن و سەرپەرشتی بچوکەکان و پاراستنی شارە مێرووڵە، جا ئەگەر وەحی خوا نەبێ لە کوێوە حەزەت ﷺ زانی کە مێرووڵەی مێیە بەو کارە هەستاوەو دەتوانێ ئاوا بە وردی باس لە ڕووداوێك بکات کە پێش چەند هەزار ساڵ لەمەوبەر ڕوویداوە..

زانایان دەڵێن: نێرەی مێرووڵە تەنها لە ماوەی پیتێن دا ڕۆڵیان دەبێت و دەردەکەون..

ب- قورئان باس لە قسەی مێرووڵە دەکات، کە سولەیمان سەلامی خوای لێ بێ لێی تێ گەیشت، دیارە تەنها خوا زانیویەتی و لەم دواییەشدا لە (٢٠٠٥/٩/١٧) دا زانایانی ڕووس زمانی مێرووڵەیان دۆزیەوە کە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستێتی و موعجیزەی قورئان .

لەپێگەی (موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة)دا دەنگ و زمانی مێرووڵە تۆمارکراوە لەلایەن زانایانەوە لە وتاری (لغة النمل) دا دەتوانیت لە وێوە گوێت لێی بێت .

ج- هەندێ ناحەز و دوژمن بەئیسلام بڵاویان کردەوە گوایە چۆن قورئان دەڵێت: (لَا يَحْطِمَنَّكُمْ)، با نەتانشکێنێ؟! بۆ نالێ: با نەتانکوژێ، با نەتانپلیشێنێتەوە.. گوایە ئەو وشەیە لە شوێنی خۆیدا نیەو ناگونجێ !؟!

دیارە قورئان هەرچیەك بڵێ و هەر وشەیەك بەکاربهێنێ حیکمەتی تیایەو لەسەدا سەد تەواوە.. لەم ساڵانەی دواییدا زانایەکی ئوسترالی دیراسەی پێکهاتەی لەشی مێرووڵەی کردو بۆی دەرکەوت کە ڕێژەیەکی زۆر ماددەی شوشە هەیە لە پێکهاتەکەیدا، کە زانی قورئان وشەی (شکاندنی)ی بۆ بەکارهێناوە، موسڵمان بوو..[1]

د- خوای گەورە لەبارەی هەنگەوە دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴾ النحل: ٦٨، واتە: پەروەردگاری تۆ ئیگاو ئیلهامی

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

کردووە بۆ هەنگ کە جێگە بۆ خۆی ساز بکات لە کون و کەلێنی چیاکان و، لە کەلەبەری درەختەکان و لەو شوێنانەش کە ئادەمیزاد بۆی ئامادە دەکات..

لە کورەی هەنگدا ساڵانە چل هەزار تا هەشتا هەزار کارکەری مێ (شغالات) کە نەزۆکن کاردەکەن، نزیکەی دوو سەد نێرەش کاردەکەن کە ئیشیان تەنها تەلقیح کردنە.. ئایاتەکە ئەگەر چی بۆ هەموو هەنگە بەڵام تایبەتیشە بە هەنگی مێیە (أَنِ اتَّخِذِي) کە ئەوان هەڵدەستن بە گەڕان و دیاری کردنی شوێنی تایبەت وچاك بۆ بیناکردنی کورەی هەنگ، وە هەر ئەوانن کە بینای دەکەن و صیانەی دەکەن و پاکی دەکەنەوە و دەیپارێزن..

هەروەها لەبەر ئەوەشە کە ئەم فەرمانەی تریش هەر بۆ مێیەی هەنگە کە دەفەرموێت ﴿ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ﴾ النحل: ٦٩ .

پێغەمبەریش ﷺ لەبارەی گرنگی هەنگوینەوە دەفەرموێت (عليكم بالشفاءين العسل و القرآن)[١]: گرنگی بدەن بە دوو چارەسەرەکە قورئان و هەنگوین.. ئەمیش هەرموعجیزەیە و ڕۆژانە زیاتر گرنگی هەنگوین دەردەکەوێت .

هـ- قورئانی پیرۆز لە چیرۆکی سولەیماندا (سەلامی خوای لێبێت)، باسی ئەو حەشەرەیە دەکات کە گۆچانەکەی سولەیمان دەخوات، کە ئەمەش یەکەم ئاماژەی زانستی‌یە بۆ ئەو جۆرە حەشەرەیە لە مێژوودا و زانایان لەم سەدانەی دواییدا دۆزیانەوەو زانرا کە حەشەراتی وەك (أرضـــة) هەیەو داروتەختە دەخوات و زیان دەگەیەنێت بە کەلوپەلی تەختەی ناوماڵ، لەبەرئەوەشە ئەندازیاران لەو ناوچانەی کە ئەو حەشەرەیە هەیە ماددەی تایبەت دەکەن بە بناغەی دیواری بیناکانەوە، تاوەکو ئەو حەشەرەیە لەناو بەرێت و نەتوانیت بچێتە ناو ماڵەکەوەو زیان بدات.. ﴿ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا

١- ابن ماجه (٣٤٥٢).

دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴾ سبأ: ١٢ - ١٤، واته: بۆ سولەیمانیش (با)مان خستە ژێرفەرمانیەوە، بەیانیان یەك مانگە ڕێ دەڕۆیشت و ئێواران یەك مانگە ڕێ دەهاتەوە، کانی (مس)یشمان بۆ تواندەوە، لە پەرییەکانیش هەندێکمان بۆ ڕاهێنا کە لەبەردەستیدا کاربکەن بە فەرمانی پەروەردگاری، جائەوەی لەفەرمانی ئێمە دەرچێت سزای دۆزەخی پێدەچێژین.سولەیمان هەرچی بویستایە پەرییەکان بۆیان دروست دەکرد، لە چەندەها جۆری میحراب وشوێنی خواپەرستی، لە پەیکەرو قاپ وکاسە وەك حەوزی فراوان، هەروەها مەنجەڵی گەورەی وا کە لەجێگەی خۆی دامەزراوە و ناجوڵێت، ئنجا پێمان وتن: ئەی نەوەو شوێنکەوتووانی داود ئێوە بەکردارو گوفتار سوپاسگوزاربن، هەرچەند کەمێك لە بەندەکانم زۆر سوپاسگوزارن..

کاتێك بڕیاری مردنی سولەیمانمان داو مرد، تەنها حەشەرەیەك نەبێت کە گۆچانەکەی کلۆر دەکردو خواردی، هیچ شتێك ئەوانی ئاگادار نەکرد لە مردنەکەی، جا کە سولەیمان کەوت بەڕوودا، ئەوسا پەرییەکان زانییان سولەیمان دەمێکە مردووە، جا ئەگەر غەیب زان بوونایە، ئاوا لە کاروفەرمانی قورس و ناخۆش و ڕیسواکەردا بەردەوام نەدەبوون..

## ٣- تیاچوونی هەموو لەشی ئادەمیزاد تەنها کلێنچکە نەبێت:

محمد ﷺ ئەگەر پێغەمبەر نەبێت ئیشی چییە بەباسی تیاچوونی هەموو لەشی ئادەمیزاد تەنها کلێنچکە نەبێت، کە لەوەوە دروست بووەو لەویشەوە دروست دەبێتەوە لەڕۆژی قیامەتدا، زانستی سەردەمیش پاش زیاتر لە چواردە سەدە پاش لێکۆڵینەوەی زۆر ڕاستی ئەو فەرموودانە دەسەلمێنێت.. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (كل ابن ادم يأكله التراب إلاّ عجب الذنب، منه خُلق وفيه يُركب)[1]، هەروەها ((إنّ في الإنسان عظما لا تأكله الأرض أبدا فيه يركب يوم القيامة)، قالوا: أي عظم يا رسول الله ؟ قال: عجب الذنب))[2].

---

١- مسلم

٢- مسلم.

لەکۆمەڵێ تاقیکردنەوەی یەك بە دوای یەکدا زانای ئەڵمانی جوولەکە( هانس سبیمان) و قوتابخانە زانستیەکەی ساڵی (١٩٣١ - ١٩٣٥) سەلماندی کە (عجب الذنب: الخیط والعقدة البدائیین) بەرپرسە لە دروست بوونی هەموو ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلە، بۆیە ناونراوە بە (ڕێکخەری بنەڕەتی) یان ڕێکخەری سەرەتایی.. ئەو زانایە هەستا بەبڕینی (کلێنچکە) لە کۆمەڵێ گیانداری وشکاوەکیو زەرعی کرد لە (جنین) کۆرپەلەیەکی تردا، بینی کە بۆ خۆی نەشونما دەکات بەجیا لەناو ئەو کۆرپەلەیەی کەتیایدا زەرع کراوە.. هەروەها وردی کردو ئنجا زەرعی کردەوە لە کۆرپەلەیەکی تردا، بەهەمان شێوە نەشونمای کردەوەو بەجیا کۆرپەلەیەکی تری دروستکرد، بۆی دەرکەوت وردکردن کاری تێناکات، ئنجا کوڵانی و بۆی دەرکەوت کوڵانیش کاری تێناکات، لە ئەنجامی ئەم دۆزینەوە گرنگەدا لەساڵی (١٩٣٥) دا خەڵاتی نۆبڵیان دایە..

لە ساڵی (٢٠٠٣) دا دکتۆر عوسمان گەیلان تاقیکردنەوەیەکی کرد لە یەمەن لەسەر پێنج کلێنچکەی مەڕ بەوەی کە بە دەمانچەی غاز بۆ ماوەی دە خولەك سووتاندنی تاتەواو بوون بە خەڵوز، پاشان کە دیراسەی کرد بۆی دەرکەوت کە خانەکانیان زیندوون و هیچیان لێنەهاتووە .

هەروەها دکتۆر (زەغلول النجار) دەڵێت: کەئەم فەرموودەیەم بۆ چەند زانایەکی ڕۆژئاوا باس کرد، وتیان: بەڕاستی تەنها ئەم فەرموودەیە بەسە کە بەڵگە بێت لەسەر پێغەمبەرێتی محمد دروودی خوای لەسەر بێت.[1]

## هاتنی بەردەوام بەرەو ئیسلام

بەدرێژایی مێژوو کەسانێك هەبوون کە سوودیان لە هۆکارەکانی زانین وەرنەگرتووەو چاووگوێ و دڵیان لە دەست داوەو بەوەش دۆزەخ بۆتە جێیان:

﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا ۚ أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴾

الأعراف: ١٧٩. واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە زۆر لەپەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ

---

١-(ل: ١٩٤ من آیات الإعجاز العلمي/الحیوان فی القرآن الکریم/زغلول النجار).

دروستکردووه، ئەوانە دڵیان هەیەو هیچ تێناگەن، چاویان هەیەو هیچ نابینن و، گوێیان هەیەو هیچ نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵن و بەڵکو سەرگەردانترن و ئەوانە غافڵ و بێئاگان لە هەق و ڕاستی..

لەهەمان کاتیشدا بە درێژایی مێژوو لە کۆن و نوێدا کەسانێك هەبوون کە پەروانەی چرای هەق و ڕاستی بوون و هەردەم عەوداڵی دۆزینەوەی بەرنامەی خوا بوون و زۆر بە چاکی سودیان لە چاوو گوێ و دڵیان وەرگرتووەو هەرگیز بە کوێرانە دوای هیچ نەکەوتوون..

نموونەش بۆ ئەم حاڵەتە زۆرە:

## یەکەم: موسوڵمان بوونی دکتۆر میلەر

(دکتۆر میلەر) یەکێك بوو لە مژدە دەرە چالاکەکان و شارەزاییەکی باشی هەبوو لە تەورات و ئینجیلدا.. ئەمە بێجگە لەوەی کە زۆر حەزی لە بیرکاری و منگق بوو...ناوبراو (کەنەدی)یەو ماوەیەکیش مامۆستابووە لە زانکۆی (شافەهدی ئەوت) لە سعودیە..

ڕۆژێك ویستی قورئان بخوێنێتەوە بەمەبەستی ئەوەی هەڵەو کەم وکوڕییەکانی قورئان دەربێنێت و بەکاری بهێنێ دژی موسڵمانان و خەڵکی پێ ڕاکێشێ بەرەو مەسیحیەت.

د. میلەر وای زانی سەرکەوتوو دەبێت لە کارەکەیداو هەڵەو ناتەواوی زۆری چنگ دەکەوێت، چونکە پەڕاوێك چواردە سەدە لەمەوبەر نێردرابێ و، لەو کەشوهەوایەی نیوە دورگەی عەرەبدا سەری هەڵدابێ چۆن خۆی دەگرێ لەبەردەم زانستی سەردەمداو، چۆن دەتوانێت بەرگەی دیراسەو لێکۆڵینەوەی شارەزایان بگرێ .

کەچی تەواو بە پێچەوانەوە دەرچوو، شتی وای بینی لەقورئاندا کە لە هیچ پەڕاوێکی تردا نیە، (د. میلەر) چاوەڕێی ئەوەبوو قورئان باسی هەندێ بارو زروفی ناخۆش بکات کەبەسەر پێغەمبەردا هاتووە ﷺ، وەك مردنی خەدیجەی هاوسەری و مردنی کچەکانی وکوڕەکانی، کەچی هیچی لەو بارەیەوە نەبینی.. لە کاتێکدا سورەتێکی تەواوی بینی بە ناوی (مریم)ەوە سەلامی خوای لەسەربێت، کە ئەوەندە بە ڕێزەوە باسی دەکات کە لەلای گاورەکانیش ئاوا دەستی ڕێزی لێنەنراوە.

هەروەها بینی کە (عیسا) سەلامی خوای لێبێت (٢٥) جار لە قورئاندا ناوی هاتووە کەچی پێغەمبەر ﷺ (٥) جار ناوی هاتووە.. زیاتر سەرسام بوو..

زیاتر دیراسەی قورئانی کردو ئەم ئایەتە ئەوەندەی تر سەرنجی ڕاکێشا کە دەفەرموێت:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴾ النساء: ٨٢،

واتە: ئەوە بۆ لە قورئان ورد نابنەوە، خۆ ئەگەر لە لای خواوە نەهاتایە ئەوە جیاوازی و ناتەواوی زۆری تیا دەبوو.. (د.میلەر) دەڵێت: (هیچ نووسەرێك نیە لە جیهاندا پەڕاوێك بنوسێ و بوێرێت بڵێت: ئەم پەڕاوەم هیچ هەڵەی تیا نیە، کەچی قورئان ڕایدەگەیەنێت کە هیچ هەڵەو کەم و کورتی تیانیە و کەس ناتوانێت ناتەواوی تیادا بدۆزێتەوە).. .

ئایەتی (٣٠) سورەتی (الأنبياء)یش بەهەمان شێوە سەرنجی ڕاکێشا کە دەفەرموێت:

﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَـٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴾ الأنبياء: ٣٠.

دکتۆر وتی: ئەم ئایەتە کت ومت ئەو لێکۆڵینەوە زانستیەیە کە زانایەك لە ساڵی (١٩٧٣) دا دۆزییەوە لە سەر تەقینەوە گەورەکە و پاداشتی (نۆبڵ)یان دایە..

هەروەها دەڵێت: سەیرکەن چۆن قورئان بە شێوەیەکی مەنتیقی و بەڵگەی جوانەوە وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە دەیان وت: شەیتانەکان و پەرییەکان قورئانیان بۆ محمد هێناوە،

﴿ وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَـٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴾ الشعراء: ٢١٠ - ٢١٢. ئنجا ئەم قورئانەش فەرمانی داوە کە هەر خوێندت پەنا بگریت بە خوا لە شەیتانەکان و بڵێی: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)..

لەو چیرۆکانەی کە سەرنجی دکتۆری ڕاکێشا، چیرۆکی پێغەمبەر ﷺ بوو لەگەڵ (ئەبولەهەب)دا، دکتۆر دەڵێت: (ئەبولەهەب) زۆر دژایەتی ئیسلامی دەکرد، بەجۆرێك کە دوای پێغەمبەر ﷺ دەکەوت و ئەگەر قسەی لەگەڵ کەسێکدا بکردایە، دوای ئەو دەچووە لای و ساردی دەکردەوەو ئەیخستە گومانەوە، پێش دە ساڵ لە مردنی ئەبولەهەب سورەتی (مَسَد) هاتە خوارەوەو فەرمووی: ئەبولەهەب دەچێتە دۆزەخەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە موسڵمان نابێت. لە ماوەی دە ساڵدا ئەگەر ئەبولەهەب بە درۆش بوایە، شایەتمانی بهێنایەو، بە فێڵ وای پیشان بدایە کە موسڵمانە، دەیتوانی گەورەترین دوژمنایەتی ئیسلام بکات، کەچی لەو هەموو ماوە درێژەدا، هیچی نەوت و بە کافری و ئاخر شەڕی سەری نایەوەو تەنانەت لاشەو

کەلاکەکەی ئەوەندە بۆگەن و خراپ بوو لەدوورەوە خۆڵ و بەردیان بۆ هەڵداو لە چاڵێکدا شاردیانەوە، باشە ئەگەرئەوە وەحی نەبێت، پێغەمبەر ﷺ چوزانێت کە ئەبولەهەب تا دوا ساتی تەمەنی موسڵمان نابێت و بە کافرێتی سەر دەنێتەوە (خۆ ئەبوسوفیانیش سەرکردەی کافرەکان بوو، گەورەترین دژایەتی ئیسلامی کرد بۆچی هیچی لەسەر دانەبەزی، دیارە خوای گەورە کە عالیمی غەیبە دەیزانی موسڵمان دەبێت)..

هەروەها قورئان چەندەها باسی داهاتوو دەخرۆشێنێت، کە کەس ناتوانێ زەمانەتی هاتنەدیان بکات، مەگەر خوا کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە.. ئەوەتا قورئان دەفەرموێت: جوولەکە سەرسەخترین دوژمنی ئەم ئاینەن و هەرواش دەبن، بەڵام گاورەکان زیاتر نزیکن لە موسڵمانان و زیاتر لێیان موسڵمان دەبێت، ئەوەش ڕاستە کە گاورەکانیش دژایەتی ئەم ئاینەیان کردووەو دەیکەن بەڵام زۆری بە فیتی جولەکەیەو لە ژێر سەری جولەکەدایە..

قورئان دەفەرموێت: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلْحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ المائدة: ٨٢ - ٨٤ .

دکتۆر دەچێتە سەرباسێکی تر کە جێی تێڕامانە، تەنها قورئانە کە توانیویەتی هەواڵێك بدات و بڵێت: نە تۆ و نە ئەوانەی لەگەڵتدان نەتانبیستووە، هەروەك دەفەرموێت:

﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾ آل عمران: ٤٤.

هەروەها کە دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَاۖ فَٱصْبِرْۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ هود: ٤٩.

لە سورەتی (یوسف)یشدا دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوا أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴾ يوسف: ١٠٢.

بەڕاستی هیچ پەڕاوێکی پیرۆز نیە بەم شێوەیە قسە بکات، هەموو پەڕاوەکانی تر لەگەڵ ئەوەشدا کە دەستکاریکراون، هەندێ زانیاری باس دەکەن لە بارەی پاشایەك یان سەرکردەیەك لە شەڕێکدا یان لە شوێنێکدا ئیتر نالێ کەس نەیبیستووە لە پێشتردا .

ئەوەی سەیرە خەڵکی مەککە نەیانتوانی بڵێن: بیستوومانە، نەیانتوانی ڕووبەڕووی قورئان بوەستنەوە، دەی کەواتە: تەواوە، کە خۆی و گەلەکەی نەیان زانیبێت و نەیانبیستبێت، ئەی لە کوێ ئەم باسەی وەرگرت، دیارە وەحیە و خوا کە عالیمی غەیبە ئاگاداری کردووە.. ناوبراو لە ساڵی (١٩٧٧) دا موسوڵمان بوو، وە چەند پەڕاوێکی نووسی وەك (جیاوازی نێوان قورئان و کتێبی موقەددەس)، (القرآن المذهل) و(نظرة إسلامية لأساليب المبشرين)[١].

## دووەم: موســـوڵمانبوونی زانـــای مەجـــەڕی عبـــدالکریم جرمانوس

ناوبراو زانایەکی گەورەی بلیمەتەو نووسەری بەناوبانگ (عَقّاد) لەبارەیەوە دەڵێ: (عبدالکریم: دە زانایە کۆبۆتەوە لەیەك کەسدا)..

ئەم زانایە هەشت زمانی زانیوە و بە چاکی توانیویەتی پەڕاوی پێ بنووسێت، ئەو زمانانەش (فارسی، تورکی، ئوردی، ئەڵمانی، مەجەڕی، ئیتاڵی، ئینگلیزی، عەرەبی) هەروەها ئەندام بووە لە(مجمع)ی زمانی عەرەبی لە دیمەشق و قاهیرەو بەغداو رباط و، زیاتر لە(١٥٠) پەڕاوی هەیە بەو زمانانەی کە دەیزانین، وەك پەڕاوی (معاني القران)، (الله أكبر)، (الحركات الحديثة في الإسلام).

دکتۆر دەڵێت: هەرزەکار بووم، ڕۆژێکی باران لەماڵەوە بووم سەیری وێنەی لاپەڕەکانی گۆڤارێکی کۆنم دەکرد، چاوم کەوت بەتابلۆیەك کە وێنەی کۆمەڵێ خانووی لەسەر هەڵکەندرابوو کە خانووەکان گومەزی بچوکیان هەبوو، هیلالیش بەسەر لوتکەی گومەزەکانەوە بوو، لە وێنەکەدا لەسەربانێك پیاوانێك دانیشتبوون بەڕیز و بەڕێکوپێکی و جلی سەیریان

---

١- ل: ٢٣٢ بەهاری دڵان - نووسەر..

لەبەردا بوو، دیارە ئەوە وێنەی ڕۆژهەڵات بوو کە جیاواز بوو لەو وێنانەی ئێمە لە ڕۆژئاوادا دەمانبینین.

من لەوکاتەدا قوتابیەکی (١٦) ساڵ بووم و حەزێکی زۆرم لەلا دروست بوو بۆ زانینی ئەو نورەی کە لە وێنەکەدا زاڵ بووبوو بەسەر تاریکیدا..

کەوتمە دیراسەکردنی زمانی تورکی، و دواتر بۆم دەرکەوت کە زمانی تورکی وشەی فارسی و عەرەبی تیایە، بڕیارم دا هەرسێ زمانەکە بزانم..

لە پشووی هاویندا چووم بۆ بۆسنە کە نزیکترین وڵاتە لە ڕۆژهەڵاتی مەجەرەوە، لە نوتێلێك دابەزیم بۆ ئەوەی شارەزای حاڵی موسڵمانان ببم..

شەوێ هاتمە سەر جادە کە بەکەمی ڕووناك کرابووەوە و لە قاوەخانەیەك دانیشتم کە دووپیاویش لەسەر مێزێك دانیشتبوون و جلی میللی خۆیانیان لەبەردا بوو، خەنجەر بەقەدیانەوە بوو..

من غەریب بووم و ئەوانیش بە سەرسامیەوە بۆیان دەڕوانیم، کابرای قاوەخانە قاوەیەکی بۆ هێنام و ئیشارەتی کرد بۆ دوو پیاوەکە، منیش سڵاوم لێکردن و زۆر دەترسام کە پیاو خراپ بن و بمدەنە بەر خەنجەر، کەچی پاش تۆزێك هاتنە لامەوەو سەلامیان لێکردم و بە ڕوویەکی خۆشەوە هەریەکەیان فەرموویان لێکردم بۆ ماڵەکانیان کە لەلایان بمێنمەوەو خزمەتم بکەن.. ئەمە یەکەم بەیەکگەیشتنم بوو بە موسڵمانان..

چەند ساڵێك تێپەڕی، کە پڕ بوون لە هاتوچۆو دیراسەو لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا زیاتر چاوم دەکرایەوە بەسەر ئاسۆی فراوانی سەیردا..

سەردانی هەموو وڵاتانی ئەوروپام کرد، لە زانکۆی (قسطنطينية)ش وانەم وتەوە، زۆر تام و چێژم وەرگرت لە بینینی ئەو (آثار)انەی کە لە ئاسیای (صغرى) و سوریادا بینیمن.. فێری زمانی تورکی و فارسی و عەرەبی بووم، گەیشتمە پلەی مامۆستای کورسی دیراساتی ئیسلامی لە زانکۆی (بۆدابیست)، هەزاران لاپەڕەی نوسراوی زانایانی کۆنم خوێندەوە زۆر بە وردی، کەچی لەگەڵ هەموو ئەوانەدا ڕۆحم بە تینویەتی مایەوە..

من لەو پەڕاوانەوە ڕۆشناییم بەدی کرد بۆ هەندێ قۆناغی زانست، بەڵام بەپەرۆش بووم بگەمە خۆشی هەتاهەتایی لە ژێر سێبەری دینداریدا.. عەقڵم پڕ بوو، ڕۆحیشم تینوو..

شەوێکیان لە خەومدا پێغەمبەرم بینی (سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت)، بە ڕیشێکی درێژی خەنەکراوو جل و بەرگێکی سادەی سپۆرتی بۆن خۆشەوە، چاوەکانی ئەدرەوشانەوە بە درەوشانەوەیەکی بەهێزی کاریگەر، زۆر بە نەرم و نیانی پێی وتم: بۆ سەرسامیت، بەڕاستی ڕێگای ڕاست لەبەردەمتایە، ئەمین و تەختە وەك ڕووی زەوی، پیابڕۆ بە هەنگاوی ئیمانی دامەزراوەوە..

منیش لەو خەوە سەیرەدا بەعەرەبی پێم وت: بە ڕاستی ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بۆ تۆ ئاسانە، کە تۆ توانیوتە زاڵ ببیت و دوژمنانت ژێر خەیت، کاتێك ڕێگات گرتە بەر بە ڕێنمایی پەروەردگارت و خواش سەرکەوتنی پێبەخشیت، بەڵام من هێشتا گیروگرفت لە ڕێما ماوە و، کێ دەزانێ کەی دڵنیاییم دەست دەکەوێ؟ ئەویش بە عەزم و جەزمەوە، پاش کەمێك بیرکردنەوە سەیری کردم و دەستی موبارەکی بە توندی خستە سەرسنگم و بە زمانی عەرەبی کە هەموو وشەکانی لە گوێما دەزرنگێتەوە فەرمووی ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا﴾ النبأ: ٦ - ٨.

منیش بە تەنگە نەفەسی و ئازارەوە وتم: (من ناتوانم بنووم، ناتوانم ئەو نهێنیانە ئاشکرا بکەم کە بەپەردەی ئەستوور داپۆشراون، ڕێنمایم بکە ئەی (محمد)، ڕێنمایم بکە ئەی پێغەمبەری خوا)..

دەنگێکی پچڕ پچڕ لەگەروم دەهاتە دەرێ، هەروەك خنکابم لە ژێر باری ئەو خەوەدا، ئەشترسام پێغەمبەرﷺ زویر ببێت، ئنجا هەستم کرد هەروەك لە بەرزاییەکەوە بکەومە خوارێ، لە پڕ لەخەو خەبەرم بووەوە عەرەقم لێدەچۆڕا، خەریك بوو دڵم بوەستێ، ئنجا هێمنی و کش و ماتییەکم بەسەردا هات هەروەك کش وماتی سەر قەبران و هەستم بە تەنیایی کرد..

لە ڕۆژی جومعەی داهاتوودا چووم بۆ مزگەوتی گەورەی (دەلهی)، جلی هندیم لەبەر کردبوو، هەموو ئەو (ویسامانەی) کە سوڵتانە تورکەکان دابوویانمێ کردم بە سنگمەوە.. نزیکەی چوار هەزار کەس ئامادەی نوێژ بووبوون و بە خشوعەوە بەڕیزی ڕێك و پێك دانیشتبوون و پاش بانگ گوێیان لەوتاری هەینی گرت و نوێژیان خوێند..

پاش نوێژ (عبدالحي)ی برادەرم دەستی گرتم بەرەو دوانگەکەو چوومە سەر پلەی حەوتەمی و ڕووبەڕووی ئامادەبووان کە هەموو چاویان تێبڕیبوم وتم: (بەڕێزینە، من لە دوورە وڵاتەوە

هاتووم، بەدوای زانستێکدا کەلای خۆمان دەست ناکەوێت، هاتووم شتێکم دەستکەوێت کە ڕۆحم بەپەرۆشە بۆی، ئێوەش هاوکاریتان کردم) ئنجا باسی ئەو دەورەم کرد کە ئیسلام بینیویەتی لە مێژووی جیهاندا و باسی ئەو موعجیزانەم کرد کە خوا دابووی بە پێغەمبەرﷺ، پاشان باسی حاڵی موسڵمانان و هەستانەوەیانم کردو وتم: ئەوەش وەستاوەتە سەر ئیرادەی خوا لە کاتێکدا کە دەفەرموێت ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ الرعد: ١١.

من لەسەر قسەی خۆم بەردەوام بووم و لە هەموولایەکەوە دەنگی (الله أكبر) بەرزبووەوە..

لەسەر دوانگە دابەزیم و خەڵکی باوەشیان پیادەکردم و ئەیانویست سەرم ماچ بکەن و داوای دوعای خێریان لێدەکردم..من خۆم بەشەرمەزار دەزانی، دەبێ من چیبم ئەوانە ئاوا سەیری من دەکەن؟!..

ئیتر گەڕامەوە ماڵەوەو خەڵکیش لە ڕۆژی دواتردا پۆل پۆل دەهاتن بۆ پیرۆزبایی موسڵمان بوونم و ئەوەندە خۆشەویستیان دامێ کە بەشی هەموو ژیانم دەکات..

دکتۆر عبدالكريم دەڵێت: ئیسلامم لا خۆشەویست بوو، کە دینی پاکی‌یە، پاکی لاشەو ڕەوشت و هەست، چەندەها گەوهەرم دۆزیەوە لە دڵی موسڵماناندا کە لەژێر بەنرخترن، موسڵمانان خۆشەویستی و برایەتیان دامێ و فێری کاری خێرو فەرمان دان بە چاکەو جڵەو گیری لە خراپەیان کردم...

موسڵمانان پێویستە لەسەریان کە دان بگرن بەو ڕەوشتە بەرزانەدا کە هەیانەو، بەشەوارە نەکەون بە بریق و باقی ڕۆژئاوا، چونکە بریق و باقێکی بێ نرخ و پووچە..

لە ڕێنماییەکانی ئیسلامدا یەك وشە نیە ڕێگربێت لەبەردەم پێشکەوتنی موسڵماناندا..

لە ڕێنماییەکانی ئیسلامدا شتێك نیە نەتوانرێ پیادە بکرێ، بەڕاستی ئیسلام موعجیزەیەکی گەورەیەو بەوەش جیاوازە لە بەرنامەو ڕێبازەکانی تر، ئیسلام ئاینی ڕۆشنبیرانەو نەشبێتە بیروڕای ئازادەکان.[١]

---

١- ل: ٨٠ لماذا أسلمنا- عبدالحميد السحيباني.

## سێیەم: قیبتیەکان لە میسر

لە وڵاتی میسردا (٦٦) ملیۆن موسڵمان هەیە، چوار ملیۆنێکیش کەمایەتی تر هەیە کە قیبتیەکانیش بەشێکن لەوان و ساڵانە چەند هەزارێکیان لێ موسڵمان دەبێت، بۆ نمونە: ئەندازیار سەمیر خوشکەزای باباشنودە موسڵمان بووە، ئافرەتێکیش کە ناوی (إجلال)ە و خزمی ناوبراوە بەهەمان شێوە موسڵمان بووەو چووشە بۆ حەجی ماڵی خوا..

قەشە بیشوب کە هاوکاری باباشنودەیە لە ڕاپۆرتێکی ناوخۆیی خۆیاندا دەڵێت: ساڵی هەشت هەزارێکمان لێ موسڵمان دەبێت..

دەزگاکانی هەواڵ لەم دواییەدا لە میسر سەرگەرمی کێشەی (وفاء قسطنطين) بوون کە هاوسەری قەشەیەکەو کوڕو کچێکی هەیە، کوڕەکەی ئەندازیارە.. (وفـــاء) چەند ساڵێك لەمەوبەر لە ئەنجامی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی میسرییەوە کە باسی (ئیعجازی قورئانی) کردووە موسڵمان دەبێ و حەڤدە جزم قورئانیش لەبەر دەکات و تەنها کچەکەی بە موسڵمان بوونەکەی دەزانێت..

سەرەنجام ماڵ و حاڵەکەی بەجێ دەهێڵێ و موسڵمان بوونەکەی ئاشکرا دەکات، بەمەش هەڵایەکی گەورە بەرپابوو، باباشنودە مانگرتنی خۆی ڕاگەیاند و لیژنەی تایبەت لە قیبتیەکان دانیشتنیان لەگەڵ (وفاء)دا کرد، تا قەناعەتی پێبکەن پەشیمان بێتەوە، (وفاء)یش وتی: من موسڵمانم و ئەوەتە حەڤدە جزم قورئانیشم لەبەرە، هەرچیان کرد سوودی نەبوو لەوەندە مەسەلەکە گەورە بوو تەنانەت قیبتیەکان داوای یارمەتیان لە سەرۆك (بۆش) و (شارون) کرد فشار بخەنە سەر حکومەتی میسری..

سەرەنجام کە هیچ شتێك سوودی نەبوو بۆ گەڕانەوەی (وفـــاء)، قیبتیەکان (وفـــاء)یان فڕاندو، لەلای خۆیان بەندیان کردووەو لە ژێر ئەشکەنجەو ئازاردا دەیانەوێت پەشیمانی بکەنەوەو تا کاتی ئەم نووسینە دەنگ و باسی دیار نیە!..[1]

---

١- دکتۆر زەغلول نەجار لەم دواییەدا دەڵێت شەهیدیان کردووە.

## چوارەم: موسڵمانبوونی قوتابیەکی دکتۆرا

موسڵمانان لە بنکەی ئیسلامی لە (کییف) لە ئۆکرانیا ڕاهاتوون لـە سـەر ئـەوەی کـە هەرچەند ڕۆژێك و یەکێك لە ئۆکرانیەکان دێت لە مزگەوتـدا موسـڵمان دەبـێ.. بـەڵام ئـەمجارە هـەروا ئاسـایی و سـادە نـەبوو. گـەنجێکی ئـۆکرانی کـە نـاوی (دیـمیتری بولیـاکوف)ەو قوتـابی دکتۆرایە لە بواری فیزیادا، هاتە مزگەوت و لە تەنیشت ئیمامەوە دانیشـت دوای نوێـژ، یـەکێ لە لاوە چالاکەکانی مەکتەبی ناساندنی ئیسلامی مەرکەزەکەشی لەگەڵدا بـوو، ئیمـام هەنـدێ قسەی کرد وەك پێشەکی‌یەك و، پاش ماوەیەکی کەم (دیمیتری) بە دوایدا شایەتمانی هێنا(أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمداً رسول الله).. بەڵێ.. دیمیتری باسی موسڵمان بوونەکەی بـۆ ئامادەبووان کرد، کە لە ڕێی زانستی فیزیاوە موسڵمان بووە.. ناوبراو دەڵێـت: لەگـەڵ تیمێکـی لێکۆڵینـەوەی زانسـتی دا کاردەکـات لـە بـورای فیزیـای بۆشـایی دا (الفیزیــــاء الفراغیــــة)، بەسەرپەرشتی پرۆفیسۆر نیکۆلای کوسینیکوف، کە یەکێکە لە گەورە زاناکانی ئەو بـوارە، لـە لێکۆڵینەوەکەیاندا چەند نموونەیەکیان وەك زەوی دروستکرد و تاقیکردنەوەیەکیان لەسـەر کـرد، تاوەکو دیراسەی بـیردۆزی تـازەی خولانـەوەی زەوی بکـەن بـەدەوری تەوەرەکەیـدا، بیردۆزەکـەی پرۆفیسۆر کوسینیکوف دائەنرێ بـە تـازەترین و بـە جورنـەترین بـیردۆز لـە تەفسـیری دیـاردەی خولانەوەی زەوی بە دەوری تەوەرەکەیدا

تیمەکەی هەستان بە دروستکردنی چەند تۆپێکی تایبەتی وەك زەوی کە ناوەوەی پـڕ بـوو لە کانزایەکی تواوە، کـە لـە بـوارێکی موگناتیسـی تایبەتـدا دەخولانـەوە..هـەروەك زەوی کـە بەهۆی بواری موگناتیسی خۆرەوە (کە پەیوەندی هەیە بـە چـڕی وزەی خـۆرەوە) دەخولێتـەوە.. کە ئاڕاستەی قوتبی باکور دەوەستێتە سەر ئەو بوارە..

وە تێبینی کراوە کە خێرایـی قـوتبی موگناتیسـی زەوی تـا سـاڵی (١٩٧٠) بـە خێرایـی ١٠کـم لـە سـاڵێکدا دەجـوڵا، لـەم سـاڵانەی دواییـدا ئـەو خێراییـەی گەیشـتۆتە (٤٠) کـم لـە ساڵێکدا.. تەنانەت لە ژێر ئەو بوارەدا موگناتیسیەدا بەیـەکجار لـە سـاڵی (٢٠٠١)دا قـوتبی موگناتیسی زەوی (٢٠٠)کـم خـزاوە.. ئەمـەش وا دەکـات کـە لـە داهـاتوودا هـەردوو قوتبـە موگناتیسیەکەی زەوی جێگۆڕکێ بکـەن و بەمـەش زەوی بـە پێچـەوانەوە بخولێتـەوە، ئەمـەش یانی هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.

بەڵێ.. دیمیتری ئەم تاقیکردنەوانەی بە چاوی خۆی بینی، وە کە زانی پێغەمبەرﷺ باس لە ڕووداوی وا دەکات لە فەرموودەدا، کە دەفەرمووێت: هەرکەس پێش هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە تەوبە بکات خوا تەوبەکەی لێوەردەگرێت.. یان کە دەفەرمووێت: لە ئاخر زەمانداکە دەجال دێت و چل ڕۆژ دەمێنێتەوە، درێژی یەکێ لە ڕۆژەکانی ساڵێك دەبێت و ڕۆژێکیشی درێژییەکەی مانگێك دەبێت و ڕۆژێکیشی درێژی یەکەی هەفتەیەك و ڕۆژەکانی تریشی وەك ڕۆژی ئێستای لێدێتەوە (قلنا يا رسول الله وما لبثه فى الأرض؟ قال أربعون، يوما كسنة ويوم كشهر ويوم كجمعة وسائر أيامه كأيامكم، قلنا يارسول الله فذلك اليوم الذى كسنة أتكفينا فيه صلاة يوم؟ قال: لا أقدروا له قدره)[1].. واتە: پێغەمبەر باسی هاتنی دەجالی کرد بۆ هاوەڵان ئەوانیش پرسیان چەند دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: چل ڕۆژ، ڕۆژێکی بەقەدەر ساڵێکەو ڕۆژێکیشی بەقەدەر مانگێکەو ڕۆژێکیشی بەقەدەر هەفتەیەکەو باقی ڕۆژەکانیشی وەك ڕۆژی ئاسایییە، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ڕۆژەی کە بەقەدەر ساڵێکە هەر نوێژی ڕۆژێکی تیا بکەین؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر لەسەر ڕۆژی ئاسایی حسابی بۆ بکەن.. (هەر بیست و چوار سەعات و پێنج فەرزەکەی تیا بکەن)، دیارە ئەمەش پەیوەندی بە خاوبوونەوەی زەوییەوە هەیە، چونکە زانایان لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆرەوە بۆیان دەرکەوت کە زەوی لە سەرەتاوە ئەوەندە خێرا سوڕاوەتەوە کە شەووڕۆژێك چوار سەعات بووە و وردە وردە خاوبۆتەوە بە ملیار ساڵ تا گەیشتۆتە ئێستا کە شەووڕۆژێك بیست و چوار سەعاتەو بەردەوامیش لە خاوبوونەوەدایە هەرچەند بڕەکەی زۆر کەمە ساڵانە، ئەگەر لە چوار سەعاتەوە بوویێت بە بیست و چوار سەعات ئاسایییە کەببێ بە حەوت بیست و چواری و ببێ بە سی بیست و چواری و ببێ بە سێ سەدو شەست و پێنج بیست و چواری و، ئنجا بە پێچەوانەشەوە بخولێتەوەو خۆر لە خۆر ئاواوە ببینین کە هەڵدێت، بەڵام کەی و چۆن؟ ئەوە خوا دەزانێت..

ئەمانە وای کرد کە دیمیتری بێتە بنکەی ئیسلامی (کییف) و لە مزگەوتەکەیدا موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیەنێت و.. ئێستاش کە بەردەوام دەبێت لە سەر ئامادەکردنی نامەی دکتۆراکەی، بە گوڕوتین و بیروبۆچوونێکی ترەوە کاردەکات، کە گوڕو تینی زانایەکی فیزیایی خواناسی موسڵمانە کە لە کارەکانیدا دەسەڵاتی خوای پەروەردگاری باڵادەست دەبینێت.

---

١- مسلم.

ڕەنگە چەند ساڵێك لەمەوبەر ئەم ڕاستی‌یە بەلای زۆرێك لە خەڵكیەوە سەیر بوویێت و جێی گومان و پرسیار بوویێ، بەڵام ئەمڕۆ زانستی سەردەم بە دنیای ڕاگەیاند، بەڵێ.. هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە كەلەسەر زەوی شاوا دەبینرێت ڕاستییەكی زانستیەو عەقلی زانستی سەردەم دانی پیا دەنێت و تەصدیقی دەكات.. كە ئەمەش موعجیزەیەكی گەورەی پێغەمبەرە كەباسی ئاوای كردووە لە چواردە سەدە لەمەوبەرەوە..

بەڵێ.. ژیان لەسەر ئەم ڕووی زەوی‌یە فرسەتە، تەمەن فرسەتە، بۆ كارو كردەوەی چاكە، بە ڕاستی پێغەمبەرﷺ چاكی فەرمووە كە دەفەرمویێت: فرسەت بێنن لە پێنج شت (اغتنم خمساً قبل خمس): گەنجی پێش پیری، دەوڵەمەندی پێش هەژاری، ساغی پێش نەخۆشی، ژیان پێش مردن، دەست بەتاڵی پێش سەرقاڵی.. هەروەها دەفەرمویێت (بادروا بالأعمال ستاً: طلوع الشمس من مغربها)[1]. دەست ویرد بكەن بۆ كاری چاكە پێش ئەوەی شەش كارەسات بێت كەیەكێ لەوانە هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە..

## پێنجەم: موسڵمان بوونی ملقاە فقادو:

ناوبراو لەبارەی موسڵمان بوونیەوە دەڵێت: چەند ساڵ لەسەرگەردانیدا ژیام، نەم ئەزانی قەدەر چی بۆ شاردومەتەوە، خزمەتی كەنیسەم كرد وپلە بەپلە سەركەوتم تا گەیشتمە پلەی بەرزو بووم بەیەكێ لە سەركردەكانی كەنیسەو بەرپرسێتی گەورەم هەبوو..

حەزم زۆر لە خوێندنەوە بوو، هەرچی لەبارەی ئینجیلەوە بوو خوێندمەوە، هەندێ كتێب ئەو پرسیارەی تیابوو ئایا دینی ئیسلام ئاینێكی ئاسمانیە یان نا ؟؟، منیش ئەمەم لا دروست بوو، پاش ماوەیەك پەڕاوێكم دەستكەوت كە تەفسیری قورئان بوو بەزمانی (أمهری)، كەوتمە بەراوردكردنی لەگەڵ ئەوانەی پێشتر خوێندبوومەوە، تا توشی گومان بووم لەوانەی كە دەمزانی وقەناعەتم پێی بوو لە پێشتردا، تا بەتەواوی دڵنیابووم كەمن لەسەرگەردانیدام وتەنها ئیسلامە كە هەق وڕاستیە و دینی خوایە، بۆیە موسڵمان بووم وناوی خۆم كردبە (محمد سعید فقادو)كەوتمە دیراسەی ئیسلام و پەڕاوێكم ئامادەكرد لەسەر ئەوەی كە بۆچی موسڵمان بووم و هەڵەكان و تەحریفاتەكانی ئینجیلیشم خستە ڕوو.. ئەو نوسینەشم پێشكەش بە مەجلیسی ئیسلامی ئەعلا كرد لە ئەدیس ئەبابا.

---

[1] - رواه بخاري.

کەنیسە هەروا نەوەستا و بێدەنگ نەبوو، چۆن بێدەنگ بن کەمن فضحم کردن، کەوتنە جم و جۆڵ و پیلان گێڕان و، لە زەمانی دەسەڵاتی کۆمۆنیستی (منگستو) دا بە گرتیان دام بۆ سێ مانگ لەبەر ئەوەی موسڵمان بووم.

دوای هاتنە دەرەوەم لە سجن زیاتر لە دووسەد و هەشتا کەسم موسڵمان کرد، بۆیە جارێکی تر (کارلویوس) سەرۆکی قەشەکان بەرتیلی دا بە دەسەڵاتداران و گرتیانمەوە، زانیم ئەمجارە ڕزگار بوونم نیە..

خوا کردی (د. عبدالله عمر نصیف) ئەمینی عامی رابیتەی عالەمی ئیسلامی سەردانی أثیوبیای کردو بەمەسەلەکەی زانی و هەوڵی زۆری بۆ دام لای بەرپرسیاران تا ئازاد کرام..

بەڵێ، قەشە فەقادو باوکی جولەکە و دایکی گاور بوو، لە لادێ یەکی أثیوبیا لە دایك بوو، هەر لە منالیەوە وریاو لێهاتو بوو، حەزی بە شارەزابوون دەکرد لە تەورات و ئینجیلدا..

تەورات و ئینجیلی بینی تەنها کۆمەڵێ چیرۆك و بەسەر هاتەو دەستی مرۆڤ و تەحریفی پێوە دیارە، ڕقی لە ئیسلام بووکە هەردەم دڵیان کرمێ دەکرد بەرامبەری، کەچی ئەمە وای لێنەکرد کە هەروا دانیشێ و خوا بۆی ئاسان کرد کە دیراسەی ئیسلام بکات.. هەرچەند پلەو پایەی باشی هەبوو، سەیارە، ماڵ، مووچەی باش، بەرێزەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرا، دەستی ماچ دەکرا.. بۆ خوا وازی لە هەمووی هێنا وئەو کارەی کەلە کەنیسەدا شەش ساڵیخایاند دەست بەرداری بوو.

یەکێك لە هۆکانی موسڵمانبوونی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە شەوێك لە خەویا پیاوێك لێی نزیك بووەوەو دەنگێکی گوێ لێ بوو کە شەهادەت (أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمداً رسول الله) هەروەها سورەتی أخلاص ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾ ی فێر دەکرد.. بەترسەوە لە خەو هەستاو نەیدەزانی ئەم خەوە چیە لە خواوە یە یان لە شەیتانەوەیە.

دوو شەوی تر خەوەکە دووبارە بووەوە، لەشەوی سێەم دا ڕووناکیەکی بینی لەبەردەمیەوە و پیاوێکی بینیەوە کە شەهادەت و سورەتی ئیخلاصی بۆ دەخوێند، زانی کە ئەوە لە خواوەیەو لە شەیتانەوە نیە.. ئەو نورەی بینی لە دڵیا جێگیر بوو بۆیە موسڵمانبوونی ڕاگەیاندو، کاتێ بە ژنەکەی وت ئەویش موسڵمان بوو هەروەها سێ منالەکەشی.. بەڵێ.. ناوی خۆی کرد بە

(محمد سعيد) محمدی بەختەوەر و، ڕۆژی موسڵمان بوونەکەی دانا بە ڕۆژی لە دایك بوونی ڕاستەقینەی، هەموو ئەوانەی پێیان دابوو لێیان سەندەوە، ئاشکرایە عەقیدەو بیروباوەڕ قوربانی دانی دەوێ، هەروەك هاوەڵان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لەسەربێ.

محمد سعيد دەڵێ: بەهۆی شارەزایی زۆرم لە تەورات و ئینجیلدا توانیم زۆر موعجیزەی قورئان هەست پێ بکەم و قورئانیشم زۆر لەبەر کرد..

لەبەر ئەوەی کە قەشەیەکی ناودارو چالاك بوو، شارەزایی زۆری هەبوو، هەموو ئەوانەی سوود لێوەرگرت بۆ بانگەواز کردن بۆ ئیسلام و، دەڵێ :ئاواتم ئەوەبوو کە دایك و باوکم موسڵمان بن و ببمە شۆڕەسوارێکی بانگەوازی ئیسلامی و بتوانم خزمەت بە ئیسلام بکەم..

کەنیسە وازیان لێ نەهێنا لەبەر ئەوەی زۆر چالاك بوو ترسان خەڵکی ناوچەکە هەموو موسڵمان بکات.. ویستیان بە پیلانێك لە ناوی بەرن، بۆیە مەکتەبی رابیتەی عالەمی ئیسلامی لە ئەثیوبیا ڕزگاریان کردو هێنایان بۆ مەککە تا لە زانکۆی ئوم القری بخوێنێ و زیاتر شارەزای ئیسلام بێت..

لەبەر ئەوەی زۆر بە توانا بوو لە ماوەیەکی کەم دا فێری زمانی عەرەبی بوو.. پیاوێکی خواناسی لێدەرچوو کە هەردەم لە خۆشی ئیمان و ئیسلام فرمێسکی شادی ئەڕشت..

بەدوورکەوتنەوەشی هەر وازیان لێ نەهێناو بە پیلانێك کچی بەرپرسی کەنیسەی أپیوبیایان بۆ نارد گوایە موسڵمان بووەو لە دەست کەس وکاری هەڵهاتووە وکەس شك نابات هانای بۆ بەرێت.. ئەویش پێیان خەڵەتاو هاوکاری کردو لەسەر داوای خۆشی مارەیکرد، ماوەیەکی کەم هاوسەری بوو، تومەز ئەم کچە ئایدزێتی و بۆ ئەوە نێردراوە ئەمیش توشبکات و بەوە لەناوی بەرن،بەم جۆرە ئەم پیاوە خواناسە توشی ئایدز بوو ژنەکەی خۆشی تووش بوو هەردوکیان شەهید بوون ولە مەککە ناشتیانن.

## شەشەم: موسوڵمانبوونی ئافرەتێکی یابانی

ئافرەتێکی یابانی سەرگوزەشتەی خۆی باس دەکات و دەڵێت:

من کیژێکی یابانی تەمەن بیست ساڵم، جوانی و قەشەنگیەکی کەم وێنەم هەیە، من بیرم ئەکردەوە کە بەم جوانیەی خۆم لاوان کەمەندکێش ئەکەم و ئەوەی خۆم بمەوێ بە دەستی دێنم، ئەم جوانیەم ببوە هۆی بەخیلی کیژانی هاوتەمەنم، من وام زانی ئەم جوانییە بەختەوەریم بۆ دێنێ، هەرگیز بیرم لەوە نەئەکردەوە کەلەوانەیە کلۆڵی وکوێرەوەریم بۆ بێنێ.

لە تەمەنی پانزە ساڵاندا تووشی ئازار ئەبووم بەهۆی توانج و قسە وچاوی لاوانەوە، لەتەمەنی هەژدە ساڵاندا تووشی ئیغتصاب بووم، لە ئەنجامی ئەو ئازارو ناڕەحەتییەوە تووشی ئازارێکی دەروونی بووم و، بۆ ماوەیەك ڕۆیشتمە نەخۆشخانەی دەروونییەوە تا حاڵەتی دەروونییم چاك ببێتەوە، پێنج مانگ پاش ئەوەی کە هاتمە دەرێ جارێکی تر تووشی زەوتکردن بوومەوە.. ئەمە ئەوەندەی تر ڕووخاندمی.. نەمدەزانی چی بکەم؟ ڕوو لە کوێ بکەم و پەنا بۆ کێ ببەم؟

وتم: لەوانەیە ئەمە هۆی ئەو قژە خاوو جوانە بێ کە جوانیەکەی جوانتر کردووم، با لە بنوبێخدا بیبڕم بەڵکو رزگارم ببێ و لەدەست تیری ژەهراوی چاوی چاوبرسیەکان ڕزگارم ببێ، کە جەستەمی هەموو کون کون کردبوو، بەڵێ، هەروام کرد، پاك سەرم تاشی و و قژە جوانەکەم بەسەرمەوە نەهێشت، بەڵام هەرجوان بووم.

من ئەمویست وەك ئافرەتێك دایکی منداڵ بم و، نەم ئەویست وەك کاڵایەك هەر ڕۆژەی لەبەر یەکێکا و بەدەست یەکێکەوە بم، حەزم لە سەقامگیری وحەوانەوەبوو لە پەنای مێردێکا، نەم ئەویست ببمە خوشکانی کەنیسەو بەڕەبەنی بمێنمەوە و تەرکی دنیا بکەم، ئەمویست وەك سروشتی ئافرەتی خۆم ژیان بەسەر بەرم.. بۆیە دنیام لێ تاڵ بوویوو، نەمدەزانی ڕوو لەکوێ بکەم و چۆن چارەسەرێ بۆ خۆم ببینمەوە..؟!

ڕۆژێکیان لەو بازاڕەی شتومەکم تیا ئەکڕی ئافرەتێکی جوان و نازەنینی داپۆشراوم بینی، ئەم ئافرەتە لەچکێکی بەسەریا دابوو، بەرگێکی باڵا پۆشی لەبەر کردبوو، پیاوان بەشێوەی گورگی برسی سەیریان نەئەکرد، ئەبێ ئەمە چ نهێنیەکی هەبێ، کە لە یەك کاتا جوانییەکەی شاراوەو ئاشکرایشە؟! بێگومان هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەرگەی پۆشیویەتی.. بیرم لەو ئەکردەوە، تۆ بڵێی ئەمە لە ئافرەتانی کەنیسە بێ؟ لەوەڵامدا بە خۆمم ئەوت: بڕواناکەم، چونکە ئەمە منداڵێکی جوانی پێیە،واتە: شووی کردووەو خێزانی هەیە.

بێ هیچ بیرکردنەوەیەك چووم لەچکێکم کڕی و دام بەسەرما، ئەڕۆیشتم بە ڕێدا و هەموو گیانم متمانە بوو بەخۆم، بەڵام کۆمەڵێ پرسیارم بۆ دروست بوویوو، ئەبێ هۆی چی بێ ئەو ئافرەتە جوانە ئەو بەرگەی پۆشیوە؟ لە دڵی خۆمدا ئەموت: لەوانەیە ویستبێتی بەو کردەوەیەی خۆی لە تیری چاوی پیاوان بپارێزێ.. ماوەی دە ڕۆژ لەسەر یەك ڕۆیشتم بۆ بازاڕەکە تەنیا بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە ببینمەوە، بەڵکو وەڵامی ئەو پرسیارانەم دەستکەوێ.. تا دواین ڕۆژیان

بینیم و خۆم پێ نەگیرا بە دەنگی بەرز وتم: ئەرێ.. ! ئەوە خۆیەتی، خەڵکیش سەیریان ئەکردم و وایان زانی شێت بووم، بەڵام گوێم بەوە نەدا خەلکی چی ئەڵێن و چۆن بیر ئەکەنەوە! بە گورجی پێم هەڵگرت و بە سۆزو شەوقێکەوە بەرەو رووی رۆیشتم، بەو هیوایەی خۆمی پێ بناسێنم و وەڵامی پرسیارەکانی زوو لێ وەرگرم..

پێی گەیشتم.. باسی خۆمم بۆ کردو، پاشان پرسیارم لێکرد: هۆی چیە سەرت داپۆشیوە؟ وام ئەزانی ئەڵێ بۆ ئەوەی (خۆم لە تیری چاوی لاوان وقسەو قسەلۆکیان بپارێزم)، بەڵام شتێکی تری وت، کە تیایدا سەرسام بووم!

وتی: ئەمە فەرمانی خوایە!

لەدەروونی خۆما بیرم کردەوە ئەبێ ئەو خوایەکێ بێ؟ ئەو پەیامەی ئەو لەبارەیەوە ئەدوێ ئەبێ چی بێ ؟ ئەبێ موحەمەد کێ بێ؟ ئەو بەردەوام باسی ئیسلامی ئەکرد، شاخۆ ئەم ئیسلامە چی بێ کە باسی ئەکات؟! بۆ من هەموو ئەمانە کۆمەڵە وشەیەکی نوێ بوون، خۆمم وەك ئەو قوتابیە ئەهاتە پێش چاو کە ئیمتیحان لە شتێکا ئەدات و هیچی لێ نازانێ و نەی خوێندووەو.. ئەنجامی ئیمتیحانەکەیشی پاشەڕۆژو داهاتوی دیاری ئەکات. لەبەر ئەوە دەستم کرد بە هەڵدانەوەی لاپەڕەی کتێبەکان و گەڕان بە ناودڵی ئینتەرنێتا، ئەوسا ئیسلامم ناسی و زانیم پێغەمبەری ئەوئاینە کێیەو، قورئان چ پەیامێکە.

قورئانێکی بۆ یابانی وەرگێردراوم بۆ ماڵەوە بردەوە.. چۆن؟ نازانم.. تەنیا ئەوەندە ئەزانم من لەبەر دەم ئەم پەڕاوە دانیشتووم بەردەوام ئەیخوێنمەوەو، وەك بە شوێن شتێکی ونبودا بگەڕێم ئاوەها بینم بە خوێندنەوەی گرتبوو، ئەگەڕام و ئەمویست زیاتر و زیاتر شارەزا ببم و، لێی بێزار نەئەبووم، تا ڕۆژی دواتر هەر خەریکی خوێندنەوەی بووم و توانای خەوم نەبوو.. ئەمەی بەردەستم چیە؟! وا لە هەموو ژیانما بابەتی وا خۆشم نەخوێندۆتەوە!.

ڕۆژی دوایی بە گورجی ڕۆیشتم بۆ بازارەکە بەڵکو ئەو ئافرەتە موسڵمانە ببینمەوەوە کە بەڵێن بوو لەوێ ببینم، ئیتر بیری ئەوەم نەبوو کە من لە خۆشیا دوو سەعات پێش کاتی دیاریکراو هاتووم. لەوێ مامەوە و، چاوەڕوان بووم. قورئانەکەشم بەدەستەوە بوو، بە هیوای زیاتر شارەزا بوون بە ئارەزوومەندیەوە ئەم خوێندەوە، ئیتر هەستم بە ڕۆیشتنی کات نەئەکرد، شیرینی وشەکان بەرەو خۆیان کەمەندکێشیان کردبووم، هاوڕێ موسڵمانەکەم هات.. پێش هەموو شتێ هەواڵی تەندروستیم پرسی و.. لە هەگبەکەما چی پرسیارێکی تیا هەبووو خاڵیم

کردەوە، بە هیوای وەلآمدانەوەی.. ئەویش چەندەی ئەزانی وەلآمی دامەوە، ئەوەشی کە نەیدەزانی بەڵێنی دا کەسێکم پێبناسێنێ کە وەلآمی لابێ.. لەو کاتەدا ئەوەی بەخەیاڵمدا هات ئەوەبوو، کە ئەم بات بۆ (کەنیسەی ئیسلامی)! چونکە ناوی مزگەوت و زانای ئاینیم نەبیستبوو.

بەڵێ ڕۆیشتین بۆ لای زانا ئاینیەکە، ئەویش کوڕێکی لاوی پاکی ڕواڵەت جوان بوو، لە کاتی پێك گەیشتنا بە ئەدەبێکی زۆرەوە مەعزەرەتی بۆ هێنامەوە کە ناتوانێ تەوقەم لەگەڵ بکات، چونکە لە ئاینی ئیسلامدا حەرامە پیاو دەستی لە دەستی ئافرەتی بێگانە بکەوێ.. لە ماوەی ئەو هەموو کاتەدا سەیری منی نەئەکردو، ئەوحاڵەتەش منی سەرسام کردبوو .

بۆ ماوەی چەند چرکەیەك لە قسەکانی بێئاگابووم، ئەویش بۆ ئەوەبوو تا بەراوردێك لە نێوان ئەم لاوەو ئەوانەدا بکەم کەمن ئەم ناسین.. بەڵێ لە ماوەی چەند سەعاتێکا وەلآمی بەشی زۆری پرسیارەکانی دایەوە.. وەك شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو کە پێش ئەوەی بەجێی بێڵم ئەم پرسیارەم کرد؟ چۆن من بێمە ناو ئەم ئاینەوە ؟ لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵەدا خۆشییەکی وام لە ڕواڵەتیا بەدیکرد، کە هەرگیز ئەم بینیبوو، پاش ئەوە ڕێنمایی کردم بۆ ئەوەی پێویستە و، منیش کردم وموسڵمان بووم.

پاش ئەو ماوە دوورو درێژە لە ماندوویی و ونبوون، ڕێی خۆمم دییەوە، ئەوسا حاڵی بووم کە ئامانج لە هاتنە دنیای مندا چیە؟ چونکە ئەوماوە دوورو درێژەی ژیانم ئەم ئەزانی مەبەست لە ژیان چیە!! تێگەیشتم چۆن بە ئاشتی و ئاسوودەیی و دڵنیاییەوە بژیم دوور لە چاوی تەماعکاران ولەسایەی خواوە بە ماوەیەکی زۆر کورت خوام ناسی و شارەزای ئیسلام بووم.[١]

## حەوتەم: موسوڵمانبوونی موحەمەد یوسف

ئەمساڵ یاریزانی ناوداری کریکێتی پاکستانی (محمد یوسف) یەکەم چالاکی ئەم وەرزەی لە ژێر ناوێکی نوێ و ئاینێکی نوێدا ئەنجام دا.. محمد یوسف یا - یوسف یوحنا- ی پێشوو تەنیا یاریزانێکی فەڵە بوو لەناو تیپی کریکێتی نیشتمانی پاکستانیدا و، ئەویش لە مانگی ئابی ڕابردوودا موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کردو، ئێستا بە موسڵمانبونی یوسف لە ناو تیپی

١- سەرچاوە: سایتی مامۆستا حەسەن پێنجوینی.

کریکێتی نیشتمانیدا جگە لە تەنیا هیندۆسیەك بە ناوی: دانیش کانیرا، هەموو ئەندامانی تیپەکە موسڵمانن..

ئێستاش لەگەڵ تیپەکەیا خۆی بۆ یەکەم یاریکردنی نێو دەوڵەتی ئەم وەرزە لە بەریتانیا ئامادە کردووەو، ئەمەش یەکەم یاری نێودەوڵەتی‌یە پاش ڕاگەیاندنی موسڵمانبوونی خۆی، یوسفی تەمەن (٣١) ساڵ وتی: (بەنیسبەت منەوە، موسڵمان بوونەکەم سەرەتایەکە بۆ ژیانێکی نوێ و، موسڵمان بوونم هەموو ژیانی گۆڕیوە).

لە ٢٠٠٥/١١/١٢ بە هەواڵنێری هەواڵەکانی فەڕەنسەی ڕاگەیاند کە بەویستی خۆی ئیسلامی هەڵبژاردووەو، هیچ گوشارێکی لەسەر نەبووە بۆ گۆڕینی ئاینەکەی، چ لەلایەن تیپەکەیەوەو، چ لە لایەن جەماوەریەوە، تەنیا ئەوە نەبێ لەکاتی ڕاگەیاندن و ئاشکراکردنی موسڵمان بوونی خۆیدا، کەسوکارو بنەماڵەکەیان بە ئاسانی بۆیان قبوڵ نەکراوە، تا گەیشتە ڕادەیەك دایکی‌هەڕەشەی خۆسوتاندنی لێ کرد ئەگەر لەو بڕیارە نەگەڕێتەوە. محمد یوسف دەڵێت: بێگومان ئەو هەواڵە سەختبوو بۆیان و، کاری تێکردن، بەڵام ئاواتە خوازم کارەکە باشتر ببێت وهێور ببێتەوە..

شایانی باسە سێ ساڵ پێش ئەوەی محمد یوسف لە شابی (٢٠٠٥) دا موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا بکات، بەتەواوی موسڵمان بوو‌بوو، بەڵام چاوەڕێی بارورزوفێکی گونجاو بوو کە تیایا ڕایبگەیەنێت..

ناو گۆڕین:

تەنگژە ولەمپەرێك کە هاتۆتە ڕێی‌ناو گۆڕینەکەیەتی لەو سجلانەی کریکێتی جیهانی دامەزراوەی (ویسدن ئەڵماناك)، کە زانیارییە تایبەتەکان بە کریکێت و یاریزانەکانەوە بڵاو ئەکاتەوە و مەڵبەندەکەشی لە بەریتانیادایە.

وتە بێژێك بەناوی ئەو دامەزراوەیەوە ڕایگەیاند کە: (سیاسەتی گشتی لە وێسدن ئەڵماناکدا ئەوەیە کە ویست و ئارەزووی یاریزانەکان لە ژوور هەموو شتێکی ترەوەن، بەڵام ئێمە ناتوانین سجلە کۆنەکان بگۆڕین).

وتی: (لەبەر ئەوە لەم یاریکردنەدا کە لە نێوان پاکستان و بەریتانیادا ئەنجام ئەدرێت لە تۆمارگاکانی ئێمەدا بەناوی محمد یوسف یوحەناوە ئەبێت).

یوسف لەناو خێزانێکی هەژاردا چاوی هەڵهێناوەو، خێزانەکەیان لە ماڵێکی یەك ژووریی لە شاری لاهووری پاکستاندا ژیاون و، لەسەرەتای ژیانیەوە حەزێکی بێسنووری لەیاریکریکێت بوو..

باوکیشی ویستویەتی کوڕەکەی بخوێنێ و لەناو کۆمەڵگەدا پلەیەکی کۆمەڵایەتی بەدەست بێنێ و لەو حاڵەتە ڕزگاریان ببێت، بەڵام محمدیوسفی ئەویندار یاری کەمترین ئارەزووی لە خوێندن نابێت و، لە قوتابخانەوە هەڵدێت بۆ یاریگاکانی کریکێت..

باوکی قەناعەت پەیدا ئەکات کە کوڕەکەی خوێندنی ناوێ، ئەیبات بۆ لای بەرگدروویەك تا فێری دروومان ببێت، بەڵام لەوێش هەرکات هەلی بۆ هەلکەوتایە بەرەو یاریگا هەڵدەهات، تا باوکی بەتەواوی لێیبێ هیوا ئەبێت و وازی لێ دێنێت، محمدیوسف بە ئاواتی خۆی گەیشت و ئەو ڕۆژەی بۆ هاتە دی کە ببێتە یاری زانێکی لێزان و لەناو تیپی نیشتمانی کریکێتی پاکستانیدا شوێنێك بۆ خۆی بکاتەوە. لەو کاتەوە ڕۆژ بە ڕۆژ ئەستێرەکەی بەرز ئەبوەوە تا بووە یەکێك لە ناودارترین یاریزان لە تیپەکەیدا..

محمد یوسف پاش دەرخستنی موسڵمانبوونی خۆی، موسڵمانبوونی ژن و منداڵەکانیشی ڕاگەیاند، وتی: خێزانی کە ناوی (تانییە) بووە، پاش موسڵمانبوونی ناوی فاتیمەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، هەروەها وتی: من و خێزانم سوپاس بۆ خوا پێنج فەرزە نوێژەکان ئەکەین و، لەخواش داواکارم هەموو خەڵکی دنیا ڕێنموویی بکات.[1]

## هەشتەم: نەخشەی کەنیسە بۆ گاورکردنی مسوڵمانان لە جیهاندا

* موسڵمانبوونی یەکێك لە گەورە قەشەکانی ئەفریقیا کە لە سەر دەستی ئەو لە ماوەی دوو ساڵدا زیاتر لە (١٥٠) هەزارکەس و (٢٥٠٠) قەشە هاتوونە ناو ئیسلام .

* ئاشکرا بوونی هاوپەیمانیەکی قێزەون لە نێوان کەنیسەی ڕۆژئاواو عیلمانیەتی ڕۆژهەڵات .

ئەشۆك کۆلن یانق لە چەند دێڕێکدا :

---

١- سەرچاوە: سایتی ئیسلام ئۆن لاین.

لە شاری یـرول ی ناوچـەی بوحـەیرات لـە خـوارووی سـۆدان لـە دایـك بـووە و خوێنـدنی سەرەتایی هەر لەوێدا تەواو کردووە .

خوێندنی ناوەندی و دوا ناوەندی لە ئۆغەندە تەواو کردووە .

زانیاری لاهوتی لە ویلایەتی تەکساسی ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەواو کردووە .

بـاوکی بەرپرسـی کەنیسـە بـووە لـە ڕۆژهـەلآت وناوەڕاسـتی ئـەفریقیا کەبنکەکـەی لـە ئوغەندەیە.

چەندەها شەهادەی دبلۆمی وەرگرتووە لە بوارەکانی خوێندن و نەخشەکێشانی کەنەسـی و بە گاورکردن و گەشەسەندنی کۆمەڵ لە نەرویج و کینیاو خەرتووم.

ماجستێری بە دەست هێناوە لە زانیاری لاهوتا لە زانکۆی ئۆکسفورد لە بەریتانیا .

بۆتە خاوەن زۆرێك لە پلەو پایە کەنەسیەکان لەوانە:

بەڕێوەبەری ڕێکخراوی نەرویجی بۆ یارمەتیدانی کەنەسی.

بەڕێوەبەری ڕێکخراوی نەرویجی بۆ یارمەتی و گەشەی منالآن .

بەڕێوەبەری ڕێکخراوی لادان و نەهێشتنی ڕوداوەکان بووە لـە سـۆدان، کـە ڕێکخراوێکـی هاوبەشی سویدی و دانمارکی و هۆڵەندیە .

قەشە بووە لە کەنیسەی ئەسقەفی لە خەرتوم .

بەڕێوەبەری بەرنامەی گەشەسەندن بووە لە سۆماڵ کە سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانە.

ئەمینداری گشتی کۆڕی کەنیسەی جیهـانی بـووە بـۆ ڕۆژهـەلآت و ناوەڕاسـتی ئـەفریقیا (١٩٩٢-١٩٩٣ز).

لێپرسراوی خوێندنی بالآی کەنیسە بووە لە ناوەڕاست و ڕۆژهەلآتی ئەفریقیا.

بەڕێوەبەری کۆلیجی نیل بووە بۆ دیراساتی لاهوتی لە سۆدان .

ئەمینداری گشتی ڕێکخراوی لاوانی مەسیحی بووە لە( ١٩٨٧ و ١٩٨٨ز).

ئەمینداری گشتی ڕێکخراوی یەکگرتنی مەسیحی بووە لە ئەفریقیا.

لە ساڵی (٢٠٠٢)ز بووە بە موسڵمان ولە(٢٠٠٣)ز دا بووە ئەمینداری گشتی ڕێکخراوی یەکگرتنی ئیسلامی بۆ گەشەسەندن وئاوەدانکردنەوەی سۆدان.

دوای ئەوەی کە گەورەترین هیوای کەنیسە بوو بۆ بڵاوبونـەوەی مەسیحیەت، حەقیقـەتی دۆزیەوەو زۆرێکیش لە ڕاستیە شاراوەکانی دەربارەی کەنیسەو نەخشـەکانی کەنیسـەی ئاشـکرا کرد .

دوای چەندەها دیراسەو لێکۆڵینەوەو خوێندن لە ئاینی کەنەسیدا، گەشـتە ئـەو ڕاسـتیەی کە تەنها دینێك ڕاست بێ و نەشێوێنرابێ ئاینی ئیسلامە .

دوای ئەوەی کە نوێنەری کەنیسە بوو بۆ چەندەها شوێن، بووە نوێنـەری ئیسـلام و ژیـانی خۆی تەرخان کرد بۆ خزمەتکردنی ئیسلام.

خوای گەورە دەفەرمویێت بەرامبـەر گاورەکـان: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ ثَلَٰثَةٌ ۚ ٱنتَهُوا۟ خَيْرًا لَّكُمْ ۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ النساء: ١٧١ واتە: واز بێنن لە بە خوا کردنی عیساودایکیو سێ خـوایی ئەوە باشترە بۆ ئێوە...

بە ڕاستی بووە یەکێك لەوانەی کە باشترین و چاکترینی هەڵبژارد لە ژیانیدا.

دوای ئەوەی کە هیوای هەرە گەورەیان پێی بوو کە خوارووی سـۆدان هـەمووی بکـات بـە گاور، لە ماوەیەکی کەمی مسوڵمان بوونیدا زیاتر لە (١٥٠) هەزار کەسی کـرد بـە مسـوڵمان کە (٢٥٠٠) لەوانە قەشەو شارەزابوون لە ئاینی نەسرانیدا .

هەروەها ڕووی قێزەونی هەندێ لە عیلمانیەکانی هەڵماڵی کە چۆن بـۆ دژایـەتی ئیسـلام ئامادەن لە گەڵ هەموو کەس و لایەنێکدا هەماهـەنگ بـن و کـارو پیشـەیان تـەنها دژایـەتی کردنـی ئیسـلامە ئـیتر بـە هـەر شـێوەیەك بێـت. گۆڤـاری(المجتمع)ی کـوەیتی ژمـارە (٦٢٩) چاوپێکەوتنی کرد لەگەڵ (اشوك كولن يانق)دا کە زۆر خاڵی گرنگی لەخۆ گرتووە :

ئەمینـداری گشـتی پێشـووی کەنیسـەکانی جیهـانی بـۆ ڕۆژهـەڵات و ناوەڕاسـتی ئاسـیا مەترسی هەمەلایەنـەی نەخشـەکانی کەنیسـەی دەرخسـت کـە ئەیانـەوێت بیگرنـە بـەر بـۆ بـە گاورکردنی گەلانی مسوڵمان لە ڕێگەی چەندەها ڕێکخراو کە بە بەرگی مرۆیی داپۆشراون و بـە هۆی چەکی یارمەتیدان یان فشار بۆ سـەر دەوڵەتـە ئیسـلامیەکان هەوڵـدەدەن داواکاریـەکانیان جێبەجێ بکەن، لە چاوپێکەوتنەکەدا ئەشوك ئەوەی ڕاگەیاند کە بەشداری کۆبونەوەیەکی نهێنی ڕێکخراوە کەنەسیەکانی کردووە لە ویلایەتی تەکساسـی ئـەمریکی، بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە حـاڵی هەموو دەوڵەتە ئیسلامیەکان هـەر یـەك بـە جیـاو چۆنیەتی بـە گاورکردنیـان و هـەوڵ دان لـە

گەڵیاندا تاکو واز لە ئاینی ئیسلام بێنن، ئەوەشی ڕوونکردەوە کە پەیوەندیەکی بەهێز هەیە لە نێوان ڕێکخراوە کەنەسیەکان و عیلمانیەکانی عەرەبدا، بەوەی کە بە هە موو شێوەیەك یارمەتی عیلمانیەکان ئەدەن بۆ لێدانی ئیسلامیەکان و، وتی: لە لایەن کەنیسەی هۆڵەندیەوە داوام لێکرا کە هەڵسم بە گەیاندی بڕی ملیۆنێك و (٨٠٠) هەزار دۆلار بۆ کەنیسەی میسری، ئەویش بە مەبەستی بەخشین و دابەشکردنی بە سەر بزوتنەوە عیلمانیەکان و بە تایبەت ئەو کەسایەتیە عیلمانیانەی کە زۆر توندو تیژن بەرامبەر بە ئیسلام لە بەرامبەر فشار خستنە سەر تەوژمی ئیسلامی و گرتنی چەندەها لە سەرانی بزوتنەوەی (الاخوان المسلمین) بە شێوەیەك کە زۆریان لە گرتوخانەکان توند بکرێن وتەنانەت تیرۆرکردنیان ئەگەر پێویستی کرد .

هەروەها ڕوونی کردەوە کە هەرچی پارەو سامانی یارمەتی ڕۆژئاوا هەیە لە وڵاتانی ئیسلامی بۆ چالاکیە کەنەسیەکان ئەڕوات و سەرف ئەکرێت، هەروەها کە چۆن شەپۆلێکی بەرفراوانی بە گاورکردن وڵاتانی ئیسلامی گرتۆتەوە :

## بفەرموون ئێوەو دەقی چاوپێکەوتنەکە:

-دەوری ئەو ڕێکخراوە خێرخوازیە ڕۆژئاواییانە چیە لە جیهانی ئیسلامی بە گشتی وئەفریقا بە تایبەتی ؟

* لە ڕاستیدا ئەوانە ڕێکخراوی کەنەسین و لە ژێر پەردەی ڕێکخراوە مرۆییەکاندا کار دەکەن، بەڵام ناوەڕۆکی کارەکەیان بە گاورکردنی مسوڵمانان و دورخستنەوەیانە لە دینەکەیان بە چەندەها ڕێگەو شێوازی جیاواز .

- ژمارەی ئەو ڕێکخراوانە چەندن کە کۆڕی کەنیسەی جیهانی بەڕێوەیان دەبات و چاودێریان دەکات؟

* سەر ژمێری کردن و ژماردنیان ئاسان نیە، بەڵام ئەتوانم بڵێم کە ژمارەیان لە چەند هەزار تێپەڕ ئەکات، تەنها لە سوداندا (٥٠٠) ڕێکخراوی کەنەسی هەن کار بۆ کەنیسە ئەکەن .

-ڕێکخراوە کەنەسیەکان چۆن هەڵئەسن بە کاری بە گاورکردنی مسوڵمانان ؟

* ڕێکخراوە کەنەسیەکان، یان ڕاستر بڵێین نەسرانیەکان، لە خۆوەو کوێرانە هەڵناسن بەو کارە، بەڵکو بە پێی نەخشەیەکی دارێژراوو ورد کار ئەکەن، لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو وڵاتە یان

ئەو شوێنە ئەکەن کە ئەیانەوێ کاری تیا بکەن، بە پێی نەخشەی ئەو ئاینانـەی کـە تیایـەتی و شوێن کەوتەی هەر ئاینێك، پەیوەست بونی خەڵکەکەی بە ئاینەکەیانەوە، پێویستی ئەو خەڵکە بە خزمەتگوزاریەکان وەك پارەو خواردن و تەندروستی و خوێندن و خزمەتگوزاریەکانی تر...

هۆکارەکانی بە گاورکردنیش زۆرن، بە پێی ئاینی ئەو کەسەی کـە ئەیانـەوێ بیکـەن بـە گاورو ئەندازەی وابەستە بونی بە ئاینەکەیەوە ئەگۆڕێت، ئەو کەسە چەندە پێویسـتی بـە پـارەو ماڵ و یارمەتی و چارەسەرکردنی باری گوزەران و تەندروسـتی هەیـە، بـۆ نموونـە: بـێ دینـەکان هیچ گرفتێکیان نیە لـەوەی کـە بـبن بـە گـاور ئەگـەر پێویسـتیەکانیان بـۆ ئـەنجام بـدەن، بـەڵام مسوڵمانەکان ڕێکخراوە کەنسیەکان لـە دوو ڕووەوە کاریـان لەسـەر ئەکـەن: یـان کردنیـان بـە گـاوور، یـان دورخسـتنەوەیان لـە ئاینەکـەیان ئەگـەر نـەبوون بـە گـاوور، وە هۆکارەکـانی بـە گاورکردنی مسوڵمانان پلە پلەو قۆناغ قۆناغەو ئەڕۆن لە گەڵیداو هەڵیئـەنێن و ئیغـرای ئەکـەن بە زۆر شت.

- ئێوە چۆن کەسێکی مسوڵمانتان لە ئاینەکەی دوور ئەخستەوە؟

* ئەگەر پابەند بوایە بە دینەوە ئـەوە لـە ڕێگـەی ئیغراکـردن و هـەواو ئارەزووەکانـەوە- شەهەوات- ئەچینە ژورەوە، وەك پێدانی شوهرەت و ناوبـانگ و دەسـتەبەرکردنی خوێنـدن یـان پلەوپایـە یـان ئـافرەت، یـەکێك لـە شـارەزاکانمان بـەردەوام هاوڕێیـەتی دەکـات، هـەموو پێویسـتیەکانی بـۆ جـێ بـە جـێ دەکـات و بـەردەوام لـە گەڵیـدا دەبێـت بـۆ شـیکردنەوەو چارەسەرکردنی گشت گرفتەکانی تا وای لـێ دێـت دەبێتـە کۆیلـەی دەسـتی ئێمـەو لـە هـەموو کارێکیدا دەگەڕێتەوە بۆ لامان، ئیتر وردە وردە لە گەڵیدا خەریك دەبین تاکو زۆر بە ئاسانی یان دەبێتە گاورو دێتە نـاو ئاینەکـەوە، یـان لـە ئاینەکـەی خـۆی دوور ئەکەوێتـەوەو بـاوەڕی پێـی نامێنێ.

- ئەی ئەگەر لە هەندێ وڵاتدا سەرنەکەوتنایە لە مەبەستەکانی خۆتاندا چیتان ئەکرد؟

* ئەگەر ئەوە سەری نەگرتایەو سـەرکەوتوو نەبوینایـە، ئـەوە چـەندەها هۆکـاری ترمـان ئەگرتە بەر وەك فشار خستنە سـەر ئەو حکومەتانـەی کـە بـە تـەوجیهاتی کەنیسـە نەئەڕۆشـتن بەڕێوە، لە ڕێی چەند وڵاتێکی ڕۆژئاواییەوە ئـەو حکومەتـە ئاگـادار ئەکرایـەوەو، هەڕەشـەمان ئـەکرد بـە بـڕینی ئـەو یارمـەتی و خزمەتگوزاریانـەی کـە ئەمانـدا بـە گەلـەکانیان.. ئـەو خزمەتگوزاریانەی کە نەیانئەتوانی وازیان لێ بێنن و زۆریان پێویست پێی بوو، یان ڕێگەیـەکی

ترمان ئەگرتە بەر ئەویش دانانی جۆرێك لە گەمارۆی ئابوری لە سەریان، یان دروستکردن و نانەوەی ئاژاوەی تایەفەگەری و ئاینی لە ناویاندا.

- دەربارەی سەرچاوەی ئەوپارانەی کەنیسە دەستی ئەکەوێت وئەیبەخشێت چی هەیە؟

* لە ڕۆژئاوادا بە پێی ئەو یاسایەی کە هەیە ڕێژەی ٥٪ هەموو ئەوانەی کە لە وێ کار ئەکەن ئەڕوات بۆ کەنیسەو ڕێکخراوە کەنەسیەکان، ئەمە جگە لەوەی کە زۆریەی ئەو دامەزراوە ڕۆژئاواییانەی ئەفریقیاو ئاسیا کەنەسین بە پلەی یەکەم، بە مانای ئەوەی کە پارەکانیان بۆ بەرژەوەندی کەنیسەو چالاکیەکانی کەنیسە ئەڕوات و کەنیسەش لە لای خۆیەوە بۆ چالاکی وکارەکانی خۆی بەکاری دێنێ، بۆ نموونە: کەنیسەی میسری زیاتر لە (١٠) هەزار قوتابی لە خوارووی سۆدان لە خۆی گرتووەو یارمەتیان ئەدات، تا لە داهاتوودا ببنە قەشە یان شارەزا لە ئاینی نەسرانیدا .

- زانراوە کە تۆ زۆرێك لە پلەو پایەی کەنەسی بەرزت هەبوو، هەستت بە چ جۆرە ژیانێك کردووە لە ناویانداو چۆن ژیاویت؟

* ڕێکخراوە ڕۆژئاواییەکان بێ لێپرسینەوە پارەیان بۆ ئەڕشتین و هەموو پێویستیەکیان بۆ دابین ئەکردین، دوا مۆدیلی سەیارەو خانووی چاك و هەرچی پێوستیەکەی ژیان بوو لە بەر دەستمانا بوو، سەفەرکردنمان بە سەرانسەری دنیادا ئازاد بوو پارەکەشی دەدرا، لە خۆشی و ژیانێکی بێ وێنەدا بووین، بەڵام لە گەڵ ئەوانەشدا بەردەوام هەستم بە بێزاری و دڵەڕاوکێ ئەکرد، هەستم ئەکرد کە ئەم کارانەی من ئەیکەم لە گەڵ سروشت و فیترەی مندا ناگونجێن، قەت هەستم بە هێمنی و ئارامی دەروونی نەئەکرد.

- چۆن ئەم ژیانە خۆش و ڕابواردنەت واز لێ هێناو بەرەو ئیسلام هاتی؟ چۆن قەناعەتت بە ئیسلام کرد؟

* سوپاس بۆ خوا ڕێگەی ڕاستم دۆزیەوەو هەموو خۆشی وشتەکانم بە جێهێشت بۆ کەنیسە، بە ڕاستی هەستم کرد تازە لە دایك بووم، دوای ئەوەی لە ساڵی (٢٠٠٢) بوومە موسوڵمان وئیسلامم قبوڵ کرد ئیتر تەواو دەروونم کەوتە ئارامی و خوشیەوە لە گەڵ ئەوەشدا کە لە چاو حاڵی پێشومدا ژیانێکی ئێجگار نەبوونی و دەست کورت ئەژیم، شارەزای ئیسلام بووم لە ڕێگەی بەراوردکردنی ئاینەکانەوە و، لە کاتێکا کە دیراسەی ماجستێرم ئەخوێند بەم دەرەنجامانە هاتمە دەرەوە:

قورئان ناوی نووسەری هەڵنەگرتووە وەك لە ئنجیلەكاندایە و هەر یەكە بە ناوێكەوەیە .

قورئان فەرموودەی خوای گەورەیە، باس لە ژیانی پێغەمبەران ئەكات هەر لە گەورەمان ئادەمەوە تاكو محمد ﷺ.

ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ دوپاتی دەكاتەوە كە ئیسلام یەكەم ئاین و دواترین ئاینیشە.

هەموو پێغەمبەران بانگەشەی تەوحیدو یەكتاپەرستیان كردووە، ئەمەش تەنها لە ئیسلامدا بەو شێوەیە ڕوون كراوەتەوە.

هەر پێغەمبەرێك گرنگیەكی تایبەتی هەبووەو بۆ گەلێكی تایبەت نێرراوە، بەڵام پێغەمبەری ئیسلام بۆ هەموو مرۆڤایەتی ڕەوانەكراوە.

لەكتێبە پێشووەكاندا ناتوانین جیاوازی بكەین لە نێوان وتاری خواو وتاری پێغەمبەرەكەو وتاری نووسەرەكەدا، هەرچی ئەماخوێندەوە: یوحەننا وتی، بوترس وتی، وە هەروەها..

بەڵام لە ئیسلامدا فەرموودەی خوا ڕوونە كە قورئانی پیرۆزەو، قسەی پێغەمبەریش ئاشكرایەو زانراوە، ژیانیشی هەمووی نوسراوەتەوەو ون نەبووە، زانایانی ئیسلامیش قسەكانیان ڕوونە (هیچ كام لە فەرموودەی خواو پێغەمبەرو قسەی زانایان تێكەڵ بە یەكتری نابن) ئەمانە بەڵگەن لە سەر پاراستنی خوا بۆ ئەم دینە .

ئیسلام دادپەروەری و یەكسانی تیایە بۆ هەموو موسوڵمانەكان بە بێ جیاوازی، بەڵام لە مەسیحیەتا یەكسانی نیە، من زۆر شت هەبوو جێگەی شەرمم بوو بە هۆی ڕەنگی پێستم، چونكە من شەرمم بە خۆم ئەهاتەوە لە بەر ڕەش پێستیم لە بەرامبەر سپی پێستەكانا، سەرەڕای ئەوەی كە مرۆڤ لە مەسیحیەتدا چەند جۆرو پلەیەكن، ڕەشەكان بۆ خۆیان نوێژ ئەكەن، سپی پێستەكانیش بۆ خۆیان، لە كەنیسەكانی ئەمریكادا ڕەش پێستەكان ناتوانن لە كەنیسەی سپی پێستەكاندا نوێژ بكەن، وەزیری دەرەوەی ئەمریكا (كۆلن پاول) ناتوانێت بچێتە كەنیسەیەكی سپی پێستەكان و قسەیان بۆ بكات، بەڵام لە ئیسلامدا ئەم جیاوازیە نیە، هەر كەس زوتر گەیشتە مزگەوت ئەوە ڕیزی پێشەوەی بەر ئەكەوێت، مرۆڤەكان لای خوا یەكسانن، زۆر ئاساییە ئەگەر ئیمامەكە سپی پێست بێت یان ڕەش پێست بێت و هیچ گرفتێك نیە، بەڕێزترین كەس لای خوا ئەوەیە تەقواو خواناسی زیاتر بێت بێ گوێدانە زمان و ڕەگەزو وڵات.

- چۆن كەنیسە هەواڵی ئیسلامەتی تۆیان پێ گەیشت؟

* زۆر بێزار بوون و توشی هەڵچوونێکی زۆر بوون، بە هەموو شێوەیەك هەوڵیان دا کە پەشیمانم بکەنەوە لە ئیسلام، سەرەتا بە هەڵنان و ئیغرا کردن، هەموو شتێکیان خستە پێشم تاکو پاشگەز ببمەوە، وەعدو پەیمانی زۆر شتیان پێدام، کۆمەڵێ شاندی زۆر لە ناوەوەو دەرەوەی سۆدان هاتن بۆ لام و پاڵەپەستۆیەکی ئێجگار زۆریان کردە سەرم، بەڵام کە زانیان بێ سوودە و من بە تەواوی لە ئیسلام تێگەشتووم، ئیتر کەوتنە هەڕەشە لێکردنم بە کوشتن، تەنانەت هەڕەشەکە لە قسەو گوفتار تێی پەڕاندو ویستیان بە کردەوە جێ بەجێی بکەن، تا ئێستە چەند جارێك هەوڵی کوشتنیان داوم، ئێستە من ناوێرم سەفەر بکەم بۆ وڵاتە ڕۆژئاواییەکان لە ترسی ئەوەی نەوەك بمکوژن، هۆزەکەم بەردەوام بەرگریم لێ ئەکەن، لەو کاتەوە هاتومەتە ناو ئیسلام هەست ئەکەم لە پارێزگاری پەروەردگاردام، دڵنیایی تەواوم بۆ دروست بووە کە مردن و ژیان بە دەستی خوایە، لە بەر ئەوە لە مردن ناترسم، ئەوەی لە پێناوی بەرگری لە ئیسلامەکەیدا بکوژرێ شەهیدە، پاداشتێکی گەورەو نەبڕاوەی لای خوای گەورە هەیە، گاوورو جووەکان زۆر سوورن لە سەر ژیان و ژیانیان زۆر خۆش دەوێت، بەڵام مرۆڤی موسوڵمان ئاینەکەی لە ژیانی خۆی خۆشتر دەوێت و هەرچیەکی بە سەر بێت لە پێناویدا پێی ڕازیە.

- دوای ئەوە کە مسوڵمان بوویت.. چ نەخشەیەکت بۆ داهاتوو کێشا؟

* هەندێ کتێبم نووسی لەوانە (بۆچی مسوڵمان بووم؟) و کتێبێکیش لە سەر نەرم و نیانی و سەمەحاتی ئیسلام، دانەیەکی تریش لە سەر شتە داهێنراوەکانی مەسیحیەتی نوێ و، ژیانی خۆمم تەرخان کرد بۆ بانگکردنی ناموسوڵمانەکان بۆ ئیسلام و، بۆبەشداری کردنی کردەوەیی و بە بەرهەم لە بنیادنان و نوێکردنەوەی سۆداندا لە ڕێگەی ڕێکخراوی (یەکگرتنی ئیسلامی بۆ گەشەپێدان و ئاوەدانکردنەوەی سۆدان) کە خۆم سەرپەرشتی ئەکەم .

- کتێبی (بۆ مسوڵمان بووم) گرنگترین باسەکانی چین؟

* بەراوردێکم کردووە لە نێوان ئیسلام و ئاینەکانی تردا، دژایەتی نێوان ئەو ئاینانەی ترم ڕوون کردۆتەوەو دەرم خستووە لە بەرامبەر جێگیربوونی ئیسلام، بە ڕاستی ئەوەی کە زۆر سەرنجی ڕاکێشام و پێی سەرسام بوون بەرنامەی میراتە لە ئیسلامدا کە بە چ شێوەیەکی ڕێك و دروست دانراوە، لە ئاینی جوولەکەدا یاسای میرات هەیە، بەڵام نارێك و پێکەو ناتەواوی زۆری تیایەو دادپەروەرانە نیەو، لە مەسیحیەتا یاسای میرات هەر نیە، بەڵام ئیسلام بە شێوەیەکی زۆر ووردو ڕێك وپێك چارەسەری کردووە، تەنانەت هۆزی -دینکا- کە من ئەگەڕێمەوە بۆی و

مەسیحین، چەندەها ساڵ کێشەی بەشکردنی میرات هەبوو لە نێوانیانداو، جێبەجێکردنی یاسای میرات لە ئیسلامدا بووە هۆی چارەسەرکردنی کێشەکانیان و ناکۆکیان کۆتایی هات .

- ژمارەی ئەوانە کە دوای مسوڵمان بونت شوێنت کەوتوون چەندن ؟

* بە فەزڵی خوای گەورە تاکو ئێستە ژمارەی ئەوانەی کە لە سەر دەستمدا موسوڵمان بوون گەیشتۆتە (١٥٠) هەزار کەس، کە (٢٥٠٠) یان لە گەورە قەشەو ڕێبەرانی نەسرانین، کە هەموویان لە خوارووی سۆدان و شاخەکانی نۆبەو ناوچەی ئەنجسنان.

- چۆن قەناعەتت بەو ژمارە زۆرە کردووە کە بێنە ناو ئیسلامەوە؟

* زۆر ئاسانە وا بکەیت ناسوڵمانەکان قەناعەت بە ئیسلام بێنن، چونکە هیچ شتێکی وایان پێ نیە، دوای ئەوە بۆم ڕوون کردونەتەوە کە ئیسلام ئاینێکە هیچ گومانێکی تیا نیە، ئاینێکە خوا تایبەتیەکی پێداوەو هەر ئەو دینە لای خوای گەورە قبوڵەو وەرئەگیرێت: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴾ آل عمران: ١٩ و دواندن و خیتابی بۆ هەموو مرۆڤایەتیە بە گشتی، ئاینێکە چارەسەری هەموو گرفتەکانی ژیان ئەکات، هەروەها هەڵساوم بە ناردنی چەندەها نامە بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە مەسیح هەیەو ئەم شتانەم بۆ نووسیون:

خوا تەنهایەو هیچ هاوەڵێکی نیەو، خوا سێ بەش نیەو تاك و تەنهایە .

عیسا سەلامیلێبێت مرۆڤێکەو پێغەمبەرێکە، خوا ناردویەتی بۆ گەلەکەی، نە خوایەو نەکوڕی خواشە.

عیسا پێغەمبەری خوایە بۆ نەوەی ئیسرائیل بە تەنهاو، پێغەمبەرێك نیە بۆ گشت مرۆڤایەتی و ئاینی نەسرانی تەنها بۆ نەوەی ئیسرائیل بوو، کوڕی خوا نیەو هاتبێتە خوارێ بۆ ئەوەی هەڵبواسرێ و ببێتە قوربانی لە پێناوی تاوانەکانی مرۆڤ و گەڕابێتەوە بۆ لای خواو لە لای ڕاستی باوکیەوە دانیشتبێ!، بەڵکو بەندەو پێغەمبەری خوایە.

- ئەی باشە حاڵ و وەزعی ناهەمواری موسوڵمانان بێزاری نەکردیت و وای لێنەکردی کە نەیەیتە ناو ئیسلامەوە؟

* بە ڕاستی واقم وڕما، کاتێك کە موسوڵمان بووم بینیم موسوڵمانان ئیسلام لە ناو خویاندا جێبەجێ ناکەن، بە ڕاستی خوای گەورە دووسەرچاوەی ڕاست و دروستی بۆ ژیانی مەدەنی و سیاسی داناوە کە ئەوانیش قورئان و سوننەتن، بەڵام بە داخەوە موسوڵمانەکان لە

ژیانی خۆیاندا جێبەجێی ناکەن و فەرمانڕەوایی پێناکەن، وە حکومەتەکانیش لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا پابەند نین بە یاسای ئیسلامەوە، لاوازی موسوڵمانان لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەیان لە ئاینەکەیانەوە دروست بووە، وە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ دینەکەیان ئەوا بە هێز دەبنەوەو سەرکەوتوو دەبن.

- لە ئەنجامی ئەو شارەزاییە کە هەتە لە کەنیسە، ئایا هیچ پەیوەندیەك لە نێوان ڕێکخراوە کەنەسیەکان و زایۆنیزمی جوولەکەدا هەیە ؟

* چەندەها جار سەردانی ئیسرائیلم کردووە لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندیە بە هێزەی کە لە نێوان ڕێکخراوە کەنەسیەکاندا هەیە بۆ بەرگری لە ئیسرائیل و پاراستنی، تەنانەت من وام لێهاتووە کە ئێستە بە تەواوی ئەتوانم بە عیبری قسە بکەم و، هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان ئیسرائیل و ئەو ڕێکخراوە کەنسیانەدا، هەدەف و مەبەستیان هاوبەشە، ئەویش دروست نەکردنی دەوڵەتێکی فەلەستینی ڕاستەقینەیە چونکە ئەبێتە مەترسیەك بۆ سەر ئیسرائیل، لە بەر ئەوە هێرشی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا لە بەرژەوەندی ئیسرائیلە و بە هەموو شێوەیەك هەوڵی پاراستنی زایۆنیزم ئەدەن، هەربۆیە ئەو دەوڵەتانەی کە نزیکترن لە ئیسلام زیاتر لە ژێر تەوژم و هێرشی ڕۆژئاوادان وەك ئەفغانستان و سۆدان، جا ئیتر ئەگەر ملیان نەدا بۆ داواکاریەکانی ڕۆژ ئاوا ئەوا تووشی سەپاندنی گەمارۆی ئابوری ئەبن.

- ئەو یارمەتیانەی کە ئەمریکا ئەیداتە میسر هیچ وڵاتێکی تر بەو شێوەیە وەری ناگرێت، بۆچی؟

* لە بەر شوێنی ئیستراتیجی میسر بۆ پاراستنی ئیسرائیل، بۆیە میسر ناتوانێت هیچ داواکاریەکی ئەمریکا ڕەت بکاتەوە چونکە بۆتە کوێلەی یارمەتیەکانی ئەمریکا، ئەمریکا سەپاندی بە سەر میسردا کە سەفارەتی ئیسرائیلی بکاتەوە لە گەڵ ئەوەشدا کە هەموو گەلی میسری ناڕازی بوون و دژی ئەوە بوون، ئەتوانم بڵێم کە ڕۆژئاواو کەنیسەو زایۆنیزم هەرسێکیان یەکیان گرتووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئیسلام، هەریەکەیان بارێکی هەڵگرتووەو کارێکی لە ئەستۆ گرتووە، کەنیسە هەڵئەستێ بە نەخشەکێشان، ڕۆژئاواش هەڵئەستێ بە جێبەجێکردن و، ئەگەر کەنیسە سەرنەکەوت لە کارە بە گاور کردنەکانیداو لە هەر شوێنێکدا توشی نسکۆ هات، ئەوا یەکسەر لە ڕێی وڵاتە ڕۆژئاواییەکانەوە پاڵەپەستۆنەخرێتە سەر ئەو دەوڵەتە تاکو بێتە ژێر بارو بە مەرجەکانی کەنیسە ڕازی بێت و داواکاریەکانی جێبەجێ بکات.

- حەز ئەکەین کە باسی هەندێ لەو چالاکیانەمان بۆ بکەیت کە بەشداریت تیاکردوون دژی ئیسلام.

* لە ساڵی (١٩٨١) کۆنگرەیەکی نهێنی لە بنکەی لێکۆڵینەوەی ستراتیجی لە ویلایەتی تەکساس گیرا، من یەکێك بووم لە ئەندامە کاراکانی ئەو کۆنگرەیە، دروشمەکەی بریتی بوو لە: "چۆن بەرەنگاری شەپۆلی ئیسلامی ببینەوە؟" لەوێدا وڵاتە ئیسلامیەکانمان جیاکردەوەو پۆلێنمان کردن بۆ ئەو وڵاتانەی کە زیاتر کاریگەری ئیسلامیان تیایەو پێشکەوتوترن وەك میسرو عیراق و پاکستان و، وڵاتانێکیش کە زیاتر خۆشەویستی ئیسلامیان هەبێت وەك ئەفغانستان و تاجیکستان و شیشان و سودان و ئەشادو تورکیا.

کۆنگرەکە هەر وڵاتەی بە تەنیا خستە ژێر دیراسەو لێکۆڵینەوەی تایبەتەوە، لێکۆڵینەوەکەش بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێکی گرنگ بوو ئەویش: چۆن بچینە ناو ئەو وڵاتانەوەو کار بکەین بۆ بەگاورکردنیان؟ وە ئەگەر لەو مەبەستەمان سەرکەوتو نەبوین و توشی نسکۆ هاتین، ئەوا کەنیسە هەڵئەسێت بە نانەوەی ئاژاوەی ناوخۆیی، ئەمەش بە کردار کەنیسە بە یارمەتی وڵاتانی ڕۆژئاوا پێی هەڵساو سەرکەوتوبوون لەو خاڵەداو توانیان کە فیتنەو ئاژاوەی ناوخۆیی لە ئەفغانستاندا دروست بکەن و یارمەتی هەموو کۆمەڵە شەڕکەرەکانیان ئەدا تاکو دژایەتی یەکتری بکەن.

هەروەها لە ئێراندا هەوڵیاندا بۆ ئەوەی کە سوننەو شیعە بکەن بە گژ یەکاو یەك نەگرن و، ئەو ئەمەو مژو ناکۆکی و تایەفەگەریەی کە لە ئێران و وڵاتانی کەنداودا هەیە ئەنجامی هەوڵ وتەقەلای ئەو ڕێکخراوە کەنەسیانەیەو، کاتێك هاتنە سۆدان بینیان کە ئیسلام ئاینی بەرچاوو بڵاوە لە خوارووی سۆدانا، سەیریان کرد کە سۆدان دراوسێی کۆمەڵێ وڵاتی ئیسلامیەو کاریگەریان هەیە لە سەر خەڵکەکە، فەرمانڕەوای ئەو کاتەی ئینگلیز هەڵسا بە دانانی یاسایەك بە ناوی "ناوچە کەفالەت کراوەکان" کە بە پێی ئەو یاسایە قەدەغە بوو خەڵکی سەروو بچێتە بەشی خواروو، وە خەڵکی خوارووش بڕوات بۆ ناوچەکانی تر، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانن کە مەسیحیەت بە تەواوی لە خوارووی بڵاو بکەنەوەو ئیسلامی تیا ڕیشەکێش بکەن، ئەم یاسایە کاری پێ کرا تا سەردەمی سەربەخۆیی ساڵی (١٩٥٦)، و ئەوەی ویستیان کردیان، ئێستاش کەنیسە بە هەموو هەوڵێکی ئەیەوێت کە لە دەسەڵاتی ئیسلامی بدات لە سۆداندا، چونکە باوەڕی وایە کە بەرامبەر شەپۆلی ئەنسیری وەستاوە.

- ئەی نەخشەی کەنیسە چی بوو بۆ ئەو وڵاتانەی کە خستبونیە ژێر پۆلێنی پێشکەوتوتری وڵاتەکان لەو کۆنگرەیەدا کە لە ساڵی (١٩٨١) بەسترابوو؟

* لەو وڵاتانە عێراق و میسرو پاکستان، ڕۆژ ئاوا بە ئیعازی کەنیسە خستنیە ژێر ورد بینەوە تاکو بتوانێت حوکمیان بە سەردا بدات، ئەوەش لە ڕێگەی دروستکردنی گرفت و کێشەی ناوخۆیی لە لایەك وخولقانی ناکۆکی و شەڕو بێ متمانەیی لە گەڵ دراوسێکانیان لە لایەکی ترەوە، مەبەستەکەش وەستان و پەککەوتنی پێشکەوتن و گەشەسەندنی زانستی و تەکنۆلۆجی ئەو وڵاتانە بوو ئەویش لەبەر خزمەتی قەوارەی زایۆنی، بە تایبەت عێراق کەسەرانی داگیرکەری کۆنی عێراق بەریتانیا هاتن بۆ لای سەددام و بە پێی ئەو نەخشە کۆنانەی کە هی سەردەمی داگیرکردنیان لایان مابۆوە، توانیان سەددام قەناعەت پێبکەن کە کوێت بەشێکە لە عێراق و پارێزگایەکی عێراقی بووە لە کۆندا، هەڵیان نا تا لە سەر داگیرکردنی کوێت سور بێت، ئەمریکاش دەورێکی زۆر گەورەی هەبوو لە هەڵنانی سەدامدا بۆ داگیرکردنی کوێت، ئیتر دوای ئەوەی سەدام بەو شێوەیەی کرد کە ئەمریکا ویستی، ئەمریکاش ڕێگەی بۆ خۆش بوویکەوێتە جێ بە جێکردنی چەندەها سیناریۆ کە ئێستە لە بەر چاومانەو هەندێکیان دەبینین .

- چ دەورێکت پێ سپێرا کە پێی هەڵسیت و، ئەو لایەنانە چی بوون کە کارت لە گەڵ ئەکردن؟

* ڕاسپێری کۆنگرەکە ئەوەبوو کە پێویستە عیلمانیەکان بە کار بێنین بۆ کەمبونەوەو بەربەست کردنیئیسلامیەکان لە جیهانی ئیسلامیدا، ئەویش لە ڕێگەی پاڵپشتیکردن و یارمەتیدانی کۆمەڵە عیلمانیەکان و، فشارخستنە سەر وڵاتە ئیسلامیەکان کە سەرانی بزوتنەوە ئیسلامیەکان لە گرتوخانەکان توند بکەن، تەنانەت ئەگەر پێویستیش بکات سەرانیان لە ناو بەرن و تەسفیەیان بکەن.

جا لەم بوارەدا دەوری من کورت کرابۆوە لەوەی واسیتە بم لە نێوان کەنیسەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتدا تاکو بتوانین یارمەتی عیلمانیەکان بدەین دژی ئیسلام، هەستام بە گەیاندنی بڕی ملێۆنێك و (٨٠٠) هەزار دولار لە کەنیسەی هۆڵەندیەوە لە شاری ئەمستردام بۆ کەنیسەی میسری تاکو بە سەر سەرانی عیلمانی میسردا بیبەخشن بۆ ئەوەی کە ئیسلامیەکان بگرن و ئەگەر پێویستیشی کرد تەسفیەی لاشەییان بکەن، بە تایبەت بەرامبەر کۆمەڵی "الاخوان

المسلمون" ئەم پارەیەش لە نێوان ساڵەکانی (١٩٩٦- ١٩٩٨) تەسلیمم کردووە، ئنجا یەك لە دوای یەك ڕاپۆرتەکانمان پێ ئەگەیشت، ئەو کۆمەڵانەش کە ئەم کارانەیان ئەنجام ئەدا هیچ کامیان بەوی تریانی نەئەزانی.

- کێ بوون ئەو کەس و لایەنانەی کە لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوون؟

* نوێنەرانی کەنیسەکانی ولاتە عەرەبی و ئیسلامیەکان و، ولاتە ڕۆژئاواییەکان، تەوەرەی کاری کۆنگرەکەش بریتی بوو لەوەی کە چۆن کەنیسە بتوانێت زاڵ بێت بە سەر ولاتە عەرەبی و ئیسلامیەکانداو کاریان تیا بکات، یان لە ژێر پەردەی یارمەتیدانی مرۆیی، یان ئەگەر لەو ڕێگەوە بەروبومی نەبوو لە ڕێی فشارخستنە سەر حکومەتەکان وەك باسم کرد .

- ئایا وا نابینیت ئەم قسانەی ئەیکەیت ژیانت بخەنە مەترسی یەوە؟

* بەڵێ هەست بەوە ئەکەم و ئەزانم، بەڵام ویستم کە چەند نێهنیەکی کەنیسە کە لە دووتوێی لاپەڕە شاراوەکانی خۆیاندایە دژی ئیسلام ئاشکرایان بکەم، بە تایبەت دوای ئەوەی کە بوومە موسوڵمان هیچ لە مردن ناترسم بە تایبەت ئەگەر بەرگری بێت لەم ئاینە پیرۆزە.

- کام ولاتی عەرەبی و ئیسلامی ڕێکخراوو بانگەوازی بە گاورکردنی تێدایە؟

* زۆربەی ولاتە عەرەبی و ئیسلامیەکان شەپۆلی بەهێزی بە گاورکردن گرتویەتیەوە، بۆ هەر ولاتێك بەرنامەی تایبەتیان هەیە، ڕۆژئاوا ئەتوانێت بە چەندەها شێوازو هۆکار چەند کەنیسەی بوێت لەو ولاتانەدا دروستی بکات.

-لە چوارچێوەی ئەوەی کە ناو ئەبرێت بە ئیرهابی نێودەوڵەتی دیارە کەوا نەخشەیەك هەیە بۆ لێدانی کارەخێرخوازیە ئیسلامیەکان، سیناریۆی ئەم نەخشەیە چۆن ئەبینیت؟

* پەرەسەندن و زیادبونی کارە خێرخوازیە ئیسلامیەکان کەنیسەی بێزارو بێتاقەت کردبوو، لە بەر ئەوە هەڵساوون بە ئەنجامدانی چەند بەرنامەیەك بۆ نەمانی کاری خێرخوازی ئیسلامی لەوانە:

- تەوجیهی ولاتە ئیسلامیەکان و ئاگادارکردنەوەیان بەنەهێشتن و بن بڕکردنی کارە خێرخوازیە ئیسلامیەکان .

- کارکردن بە هەموو شێوەیەك بۆ ڕاوەستان و پەکخستنی ڕێکخراوە خێرخوازە ئیسلامیەکان، تاکو گورەپانەکە چۆڵ بێت بۆ ڕێکخراوە کەنەسیەکان و بتوانن بە ئارەزووی خۆیان هەرچیان ئەوێت بیکەن.

- پەرەپێدان و گەشە پێکردنی ڕێکخراوە ڕۆژئاواییەکان کە لە ژێر پەردەی ڕێکخراوە مرۆییەکاندا کار ئەکەن، تاکو هەڵسن بە کاری سیخوری و هەواڵنێری و کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر ئەو وڵاتانەی کە کاریان تیا ئەکەن.

- ئەگەر کەنیسە سەرنەکەوت لەوەداو فەشەلی هێنا، ئەوە هەندێ لە شوێن کەوتوو ئەڵقە لە گوێکانی خۆی بە کار دێنێ لە دروست کردن و هەڵگیرساندنی فیتنەو ئاژاوەی ئەهلی و ناوخۆیی، تاکو ئاسایش و هێمنی تێك بچێت و ببێتە هۆی دەست تێوەردانی وڵاتە ڕۆژ ئاواییەکان .

- بە بۆچونی تۆ.. هۆی چیە ئەم هەموو هێرشە ئەکرێتە سەر ڕێکخراوە خێرخوازە ئیسلامیەکان و، ئەم هێرشانە لە کەیەوە دەستی پێکردووە؟

* لە بەر ئەوەی بڵاوبونەوەی ئیسلام بەم شێوە خێرایە ئەمریکاو ئەوروپای تووشی مەترسی کردووە، کەنیسە بە هەموو توانایەکیەوە هەوڵ ئەدات بۆ بەرگریکردن و قەدەغەکردنی ڕێکخراوە ئیسلامیەکان لە کارەکانیانداو وشك کردنی سەرچاوەکانیان، ئەگەر هەر بە تەواویش پەکی نەخرا ئەوا سنووردارکردنی کارەکانی و، ئەم نەخشەکێشان و هەوڵانە ئەوە بۆ ماوەی (٢٠) ساڵە دەستیان پێ کردووەو ئێستە لە قۆناغی کۆتاییدان و ئەیانەوێت هەرچی ڕێکخراوە خێرخوازیە ئیسلامیەکان هەیە هەمووی دابخەن، چونکە ئەم ڕێکخراوانە دەورێکی گەورەو بەرچاویان هەیە لە بڵاوکردنەوەی ئیسلام و دابینکردنی پێویستی موسوڵمانان، بۆیە لە کاتێکا ئەبینین ئێستە ڕێکخراوە کەنەسیەکان لە شوێنە لیقەوماوو بێ دەرەتانەکاندا کار ئەکەن، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا شمشێریان لە سەر وڵاتە عەرەبی و ئیسلامیەکان بەرز کردۆتەوە بۆ قەدەغەکردن و کەنارکردنی هەموو ڕێکخراوە ئیسلامیە خێرخوازیەکان تاکو نەتوانن پەیامی خۆیان بگەیەنن و خزمەتی مسولمانان بکەن، ئەوەش بۆ ئەوەیە کە بەر بەرەڵا بکرێت بۆ ڕێکخراوە کەنەسیەکان بە ئارەزووی خۆیان بێ مونافیس کار بکەن.

- چ پەیامێکت هەیە کە پێت خۆش بێت بیگەیەنیت بە موسوڵمانان؟

* بە برا موسوڵمانەکانم ئەڵێم: خوای گەورە نیعمەت و بەختەوەری ڕشتووە بەسەرتانا بەم ئیسلامە، دوور مەکەونەوە لێی و کەمتەرخەمی تیامەکەن، چونکە بە ڕاستی ڕۆژئاوای مەسیحی هەموو مەبەستێکی لە ناوبردن و پوکانەوەی ئیسلامە، ئەم ئیسلامەش گەورەترین دەسمایەو سەروەتی ئێمەیە، ئەگەر ئیسلامتان لە ژیانی خۆتاندا جێبەجێ کرد ئەوە بە هێز ئەبن

و ڕۆژئاوا لێتان نەترسێت، تەنها ئەوەی کە لەسەرتانە ئەوەیە کە گرنگی بدەن بە زانست و زانیاری تا بتوانن بنەمایەکی پتەوو بە هێز دروست بکەن و بتوانن بە شێوەیەکی ماددی و مەعنەوی بەرەنگاری ئەو هەموو هێرشە ببنەوە کە ڕووبەڕووی خۆتان و ئاینەکەتان ئەبێتەوەو، بە بیروڕای من ئەگەر مسوڵمانەکان ۱۰ ٪ لە ئاینەکەیان جێبەجێ بکەن، ئەوە زاڵ ئەبن بە سەر ڕۆژئاواداو، زۆربەی گرفتەکانیان چارەسەردەکرد، دەی چۆن ئەبێت ئەگەر هەموو ئیسلام جێ بە جێ بکەن![1]

## نۆیەم: موسوڵمانبوونی دکتۆر مۆریس بۆکای:

ناوبراو پزیشکێکی جەراحی فەڕەنسی ناودارە و سەرۆکی بەشی نەشتەرگەرییە لە زانکۆی پاریس، لە ساڵی (۱۹۸۲) موسڵمان بووەو باسی گەڕانی خۆی دەکات بە دوای هەق و ڕاستیدا و دەڵێت: هەرکەسێکی موسوڵمان بهاتایەو عەمەلیاتم بۆ بکردایە پاش عەمەلیات و چاکبوونەوەی لێم دەپرسی ڕات چییە بەرامبەر قورئان، ئایا لەلایەن خواوە نێردراوە بۆ محمد، یان قسەی محمدەو بەدەم خواوە هەڵی بەستووە؟

وەڵامیان ئەدامەوە کە قورئان لەلایەن خواوەیەو محمدیش پێغەمبەری خوایە؟

منیش ئەموت: من وانازانم لەلایەن خواوە هاتبێ! من ئەمەم دەووت و بەرامبەرەکەشم بێدەنگ دەبوو! تا جارێك مەلیك فەیسەڵی کوڕی عبدالعزیز هات بۆلام و نەشتەرگەریم بۆکرد، هەمان قسەشم بەو وتەوەو، ئەویش وتی: ئایا قورئانت خوێندۆتەوە؟ وتم: بەڵێ وەرگێڕانەکەیم خوێندۆتەوە بە زمانی ئینگلیزی، وتی: چاك وایە بەزمانی عەرەبی بیخوێنیتەوە، چونکە وەرگێڕ ناتوانێ هەقی قورئان بدات و ڕەنگە هەڵەشی کردبێت.. وەڵامەکەیم بەلاوە پەسەند بوو، وتی: پەیمانم بدەرێ کە فێری عەرەبلی ببیت و وەك خۆی بیخوێنیتەوە، منیش دەستم خستە دەستیەوەو پەیمانم دایە، ئنجا چووم بۆ زانکۆیەکی فەڕەنسی و داوام لە مامۆستایەك کرد کە بەپارە فێری زمانی عەرەبیم بکات.. بەڵێ بە دووساڵ نزیکەی حەوت سەدو سی سەعات عەرەبی پێووتم تابە چاکی فێربووم، ئنجا قورئانم بە زمانی عەرەبی خوێندەوەو بۆم دەرکەوت کە بە ڕاستی قورئان تاقە پەڕاوە کە ڕۆشنبیری ئەم سەردەمە ناچار بکات دان بنێ بەوەدا کە لە خواوەیەو یەك پیتی دەستکاری نەکراوەو زیادوکەمی نییەو، بۆشم دەرکەوت کە تەورات و هەر

---

۱- پێگەی زاگرۆس.

چوار ئینجیلەکەش تەحریف کراون و درۆی زۆریـان تیایـەو ناگونجێـت زانایـەکی ئـەم سـەردەمە بڕوایان پێبهێنێ.

جا کاتێك لاشەی مۆمیـاکراوی فیرعـەونیان هێنـا بـۆ فەڕەنسـا لـە سـاڵی (١٩٨١)دا و، سەرۆکی فەڕەنسی وبەرپرسان وەك سەرکردەکان لە فڕۆکەخانە پێشـوازیان لـە مۆمیاکـە کـرد و پاشان خرایە بەر دەستی مۆریس بۆکای تا دیراسەتی لە سەر بکات، ناوبراو وتی ئەمە لە ئاودا خنکاوەو لـە نـاو سـکیا قـەوزەو خـوێی دەریـا هەیـە، کـەپێیان وت: ئـەوە فیرعـەونـەو قورئـان دەفەرموێت: لە دەریادا خوا غەرقی کردووەو خنکاوە، سەری سوڕماو زانی کە ئـەوە تـەنها لـە عیلمی خوادا بووەو هەر ئەو لەقورئانا بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاندووەولەپێش هـەزارو چوارسـەد ساڵدا، لە کاتێکدا کە ئەو مۆمیایە لەساڵی ١٨٩٨ ی زایینیدا دۆزرایەوەوکەس هیچـی لـەوەو پـێش لـە بـارەوە نـەدەزانی، تەنانـەت تـەورات و ئینجیلـیش باسی دەرهێنانـەوەی لاشـەی فیرعەونیان نەکردووە، ئەمەش بووە هۆی موسوڵمان بوونی.. دکتۆر مۆریس بۆکای لە وتارێکدا لە ئەکادیمیەی علومی فەڕەنسی لە پاریس لە بەردەم کۆمەڵێکی زۆر زانادا وتـی (ئایـا نـەکرێ پێم بڵێن محمد ئەم زانستە نوێیـانەی لە کوێ هێنا؟ لە کاتێکدا کە بەڕاستی ئێوە دڵنیابوون ئەی زانایانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا پـاش دیراسـەو باسـی زۆر کـە ئـەوەی لـە تـەورات و ئینجیلدایـە دەستکاری کراوەو ناگونجێت لە گەڵ زانستی نوێدا، دیارە تـەنها وەڵام هـەبێت ئەوەیـە کـە ئـەو زانستەی قورئان لەلایەن خواوە نێردراوەو محمدیش پێغەمبەری خوایە)..

دکتۆر پاش دەساڵ دیراسە پەڕاوێکی نووسی بە نـاوی (القرآن والتوراة والانجیل والعلم.. دراسة الکتب المقدسة فی ضوء المعاریف الحدیثة) و پەڕاوێکی تریشی نووسی بـەناوی (القـرآن الکریم والعلم العصری) کە خەڵاتی (التاریخ)ی لە ئەکادیمیەی فەڕەنسی لـە سـاڵی (١٩٨٨) دا لەسەر وەرگرت.. شایانی باسیشە دکتۆر دادەنرێت بە ڕەمزی پرشنگداری فەڕەنسا کـەوەك خـاڵ دیارە بەڕووی فەڕەنساوە .

ناوبراو دەڵێت پاش دەساڵ دیراسە بۆم دەرکەت کە قورئان ﴿ لَّا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾ فصلت: ٤٢

لـە سـاڵی (١٩٨٢) دا دکتـۆر چـوو بـۆ کۆنگرەیـەکی پزیشـکی لـە سـعودیەو باسی دۆزینەوەکەی خۆی کرد کە پاش دیراسەی مۆمیای فیرعەون بۆی دەرکەوتووە کـە فیرعـەون لـە

دەریادا خنکاوە، کە ئەم ئایەتـەیان لـە قورئانـدا پیشـان دا ﴿ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴾ یـونس: ٩٢ بـە دەنگـی بـەرز لـە بەردەم ئامادەبوواندا وتی: من ئیمانم بەم قورئانە هێناو موسڵمان بووم..[1]

شایانی باسە کاتێك کتێبی یەکەمی نووسی بۆ چەند زمـان وەرگێـڕدراو بـە ڕۆژهـەلات و ڕۆژئاوادا بڵاوبۆوە، زۆرکەس ویستی وەڵامی باتەوە، یەکێ لەوانە دکتۆر ولیام کامبـڵ بـوو کـە کتێبێکی نووسی بە ناوی (قورئـان و کتێبـی پـیرۆز لـە ڕۆشـنایی زانیـاری و مێـژوودا) ئـەوەی سەیرە نەك هیچی پێنەکرا بەڵکو پاش ماوەیەك دکتۆر ولیام کامبڵ بۆ خۆشی موسڵمان بوو.[2]

## دەیەم: پاپا قایل نابێت بە ئاشکرا دانوستان بکات:

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾ آل عمران: ٦٤ واتە: ئەی خاوەنانی کتێـب وەرن بـۆ لای وشـەیەك کە یەکسان بێت لە نێوان ئێمە و ئێوەدا کە هیچ کەسێك نەپەرستین تـەنها الله نـەبێت و، هـیچ هاوەڵێکیشی بۆ بڕیار نەدەین،ئەمە بانگەشەیەکی خواییە بۆ هـەموو ئەوانـەی کـە بانگەشـەی ئەوە ئەکەن کـە خـاوەن بەرنامـەن کـە وەرن بـا بیەك وشـە هـەڵگرین کـە یەکتاپەرسـتی خـوای گەورەیە.

کاتێك پێغەمبەرﷺ نامەی بۆ هیرەقلی گەورەی ڕۆم -کـە لەسـەر ئـاینی نەسـرانی بـوو- نارد بۆی نوسی: (أسلم تسلم والا فان عليك اثم الاريسيين) واتە: موسوڵمان ببـە سـەلامەتیت، ئەگەر نا ئەوا هەموو تاوانی دەست و پێوەندو کەسانی ترت لە ئەستۆیە.

ئەگەر سەیرێکی مێژووی بابەوی بکەین جگە لە یەك حاڵەت نەبێت ئیتر هەمیشە بابا لە بـەردەم وەرگـرتنی ئـاینی خـوای گـەورەدا وەسـتاوەو وەك دیـوارێکی ئەسـتور نەیهێشـتووە شوێنکەوتوانی ئاینی ڕاستی خوایان پێبگات.

---

١- المجتمع ژ ١٧٤٨.

٢- www.knewsdaily.net

کاتێك هیرەقل نامەکەی پێغەمبەری پێگەشت، ئەویش یەکسەر نامەی نووسی بۆ حیبری ئەعزەمی ڕۆما، کە نامەی پێغەمبەر گەیشت بە حیبر وخوێندیەوە، زانی کە ئەمە نامەیەکی ئاسایی نیەو خاوەنی ئەم نامەیە پێغەمبەری خوایەو ئیتر خۆی لە ڕۆماوە هات بۆ لای هیرەقل لە سوریا، دوای تاوتوێکردنی ناوەڕۆکی نامەکە بابا ئیعلانی باوەڕبونی خۆی کرد، بەڵام ئەوانی تری دەوری هیرەقل ئەمەیان پێ وەرنەگیراو هەر لەوێ کوشتیان و بوو بە شایەتێك بە سەریانەوە، ئەوەبوو هیرەقلیش ویستی ئیمان بێنێت بەڵام دەسەڵات و دەستوپێوەندو قەشەکانی دەوروبەری بونە ڕێگری و پەشیمان بۆوە (پەڕاوی لە خزمەت قورئاندا - بەشی کۆتایی/نووسەر).

لەو کاتەشەوە (پۆلس)ی جوولەکە توانی ئاینی نەسرانی لە ئاینی یەکتاپەرستیی یەکخواییەوە بەرەو سێ خوایی و بەو شێوەیە بەرێت کە ئێستە هەیە، ئیتر مێژووی کەنیسە بووە چەواشەکردنی حەقیقەت و چەوسانەوەی خەڵك بە ناوی ئاینەوە.

گەورەترین ستەم شاردنەوەی ڕاستیەکانە، گەورەترین ڕاستیش ناسینی خوای پەروەردگارەو شوێن کەوتنی دوایین پێغەمبەرە کە محمدە ﷺ، لە گەڵ ئەو هەموو بەڵگە ڕۆشن و ڕونانەی کە لە بەر چاوون، بەڵام هەمیشە باباکان و ئەوانیش لە دوای ئەوانەوە هاتوون ڕاستیەکانیان لە شوێنکەوتووەکانی خۆیان شاردۆتەوەو چەواشەیان کردوون، لە کاتێکا زۆر بە دڵنیاییەوە ئەزانن کە محمد ﷺ پێغەمبەری خوایەو مەسیح علیە السلام مژدەی هاتنی پێ داوە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ﴾ البقرة: ١٤٦.

ئەوانەی کتێبمان پێ داوون ئەو پێغەمبەرە ئەناسن هەر وەك چۆن منداڵەکانی خۆیان ئەناسنەوە بۆیە کاتێك گاورەکانی نەجران هاتنە خزمەت پێغەمبەر دوای مشت ومڕێکی زۆر، دوای ئەوەی ئەو ئایەتەی سەرەوەی بۆ خوێندنەوە ئیتر داوای موباهەلەی لێ کردن (واتە: کۆبوونەوەی هەردوولا بە ماڵ و منداڵەوەوپاڕانەوە کە لەعنەتی خوا لە درۆزنان بێت) بەڵام ئەوان نەیانوێرا، بۆ؟ لە بەر ئەوە لایان ڕۆشن بوو کە محمد پێغەمبەری خوایەو ڕاست ئەکات و ئەترسان لەوەی کە خوا نهێنیان هەڵماڵێت و ناودڵیان کەشف بکات.

یەکێك لە گەورەترین و ترسناکترین ستەمی پاپا بۆ شوێنکەوتوانی بڕیاردانی ئەوەو فرستادەیە بۆ خوای گەورە - پەنا بە خوا - سەری تاوانیش لێرەدا پاپایە، ڕوون و ئاشکرایە کە

مەسیح (علیه السلام) بە یەکتاپەرستی هاتووە بۆ نەوەی ئیسرائیل، وە داوای لێکردوون کە تەنها خوا بپەرستن و بەس، بەڵام دوای مەسیح بە چەند سەد ساڵێك پۆلس هات (جولەکەیەکی دوژمن بوو بە نەسرانیەکان)، بەردەوام ئەشکەنجەو ئازاری شوێن کەوتووانی مەسیحی دەدا، بەڵام سەیری کرد چەند توند بێت لە سەریان هەر زیاتر ئەبن و گەشە ئەکەن، ئیتر وتی پێویستە من بە شێوازێکی تر ئەم دینە لە ناوبەرم، ئەویش بەوەی دەبێ بنچینەی ئاینەکە لەتەوحیدو یەکتاپەرستیەوە بکەم بە ئاینی شیرك و هاوەڵگیری، ئەوەبوو بڵاوی کردەوە کە من تا ئێستە جولەکە بووم بەڵام لە ئێستە بە دواوە ئیتر بۆم دەرکەوتووە کە ئاینی مەسیحی ڕاستەو بوومە گاور، ئەوە بووە خاڵی وەرچەرخانی ئاینی نەسرانی لە ئاینێکی یەکخواناسیەوە بۆ ئاینی سێ خوایی، پۆلس توانی ئەوەی بە ئەشکەنجەو ئازار بۆی نەکرا، بەم شێوەیە بیشێوێنێت ولە ناوەرۆکی خۆی دوری بخاتەوە، ئیتر لەو کاتەوە تاکو ئێستەش ئەم ئاینە بۆتە سەرچاوەی شیرك و هاوبەش پەیداکردن، کاتێك کە مەسیح دێتە زمان ئەڵێت: من بەندەی خوام ﴿إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ﴾ مريم: ٣٠ و ناڵێت من کوڕو فرستادەی خوام!، بەڵام ئەمانەی ئێستە فەرمان ئەدەن بە دوومليار مەسیحی کە بڵێن عیسا کوڕی خوایەو ناردویەتیە سەر زەوی لە پێناوی تاوانی مرۆڤایەتیداو زۆرێك لەو قسە بێ بنەمایانە.

ئەگەر تۆزێك بە مێژوودا بچینە خوارەوە ئەبینین کە پاپا دەورێکی ئێجگار خراپی هەبووەو، هەمیشە دەسەڵاتێکی توندو تیژو داپڵۆسینی بە کارهێناوە.

قوستەنتینی دەسەڵاتداری ڕۆما پێش ئەوەی ببێ بە نەسرانی، بت پەرست بوو، کاتێکیش ئەم ئاینەی وەرگرت، هەر سەرەتا بە لاری وەری گرت و ئەم ئاینە شێواوەی کە تێکەڵاو بوو بە بیروبۆچونی بت پەرستی، بووە بەردی بناغەی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی و تا ئێستەش سەری ڕمە لە دوژمنایەتی کردنی خوای گەورەدا و ئەم دوژمنایەتیەش تا ڕۆژی دوایی هەر بەردەوامە، بەم شێوەیە ئەم ئاینە تێکەڵاو بە هەواو ئارەزوی قوستەنتین وهەواو ئارەزوی بابای ئەو کاتە بووە ئاینی ڕەسمی ئیمبراتۆری ڕۆمان. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا سێ کۆچکەی پاشاو دەرەبەگ و بابا دەستیان لە بینەقاقای هەژاران و خەڵکی داماوی ئەوروپا نابوو، بە شێوەیەك کە مێژوو شەرم ئەکات باسی بکات، چۆن دینێك کە بابا گەورەترین نوێنەریەتی ودەستی لە گەڵ زوڵم و

ستەمدا تێکەڵاو کرد، چۆن نوێنەری خوا لە سەر زەویدا گەشتە شەوەی کە بەهەشت مەتربە مەتر بفرۆشی کە بە "پسوولەی لێخۆشبوون" ناسراوە لە مێژوودا..!

نموونەی زوڵم و ستەمی کەنیسە بە نوێنەرایەتی بابا لە مێژوودا کەم بووە، بەڵکو ئەتوانین بڵێین هاوشێوەی نەبووە، دوای ئەوەی کە دەوڵەتی ئیسلامی لە ئەندەلوس ڕوخاو خاچ پەرستەکان زاڵ بوون، سەربڕینگایەکیان دانا بە ناوی دادگاو ناویان نا (محاكم التفتيش - دادگای پشکنین) کە مێژوو سەردانەخات کاتێك باسی ئەکات، چۆن ژن و منداڵ و گەورەو بچوك بە هەموو شێوەیەك سزا دراون وزۆریان لێ کراوە کە دینی خۆیان بگۆڕن ئەنا ئەکوژرێن و چەندەها چیرۆکی دڵتەزێن کە مێژوو تۆماری کردووە بە شێوەیك کە دوای چەند ساڵێکی کەم تاکە مسوڵمانێك بەئاشکرا لەو وڵاتانەدا نەما.

کەنیسە بە نوێنەرایەتی پاپا چەندی لە تواناندا ببوایە هەوڵی ئەدا کەس لە ئینجیل نزیك نەبێتەوە تەنها خۆی نەبێت، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا قەدەغە بوو هەر کەسێکی تر جگە لەبابا و قەشەکانی تر ئینجیل بخوێننەوە هەرچەند خوێنەواریش کەم بووە، کاریگەری خراپی ئەم فەتواو دەسەڵاتەی بابا وای کرد کە بزوتنەوەیەکی چاکسازی لە ناو خودی مەسیحیەکاندا دروست ببێت کە مارتن لۆسەر ڕابەرایەتی ئەکردو کۆمەڵێ داواکاری کە لە (٩٢) خاڵ پێك هاتبون بیخەنە بەردەم پاپاو لە دوایشدا کەنیسەی پرۆتستانت بە تەواوی پێکهات و لە کاسۆلیك جیابونەوە، یەکەمین داواکاریشیان ئەوە بوو کە نابێت لە نێوان خواو مرۆڤدا هیچ واسیتەیەك هەبێت و هەموو کەسێکی مەسیحی بۆی هەیە ڕاستەوخۆ ئینجیل بخوێنێتەوەو شارەزای ببێ، کە ئەمەشیان لە مسوڵمانەکانەوە وەرگرتبوو، چونکە کاتێك لە هێرشی خاچ پەرستەکاندا بینیان وا موسوڵمانەکان هەموویان خۆیان قورئان ئەخوێننەوەو تێی ئەگەن، ئیتر وتیان بۆ ئێمەش وەك ئەوان نەکەین، بۆچی ئینجیل هەر ئەبێ لای قەشە بێ و هەر ئەو شارەزایی هەبێت تیایدا.

کەنیسە بە نوێنەرایەتی پاپا جەنگێکی بێ بەزەیی بەرپاکردبوو دژی هەرچی زاناو شارەزاو ڕۆشنبیر هەیە، بە ناوی خواوە تا سەر ئێسقان دوژمنایەتی زانست و زانایانی ئەو کاتەی ئەکرد، سەرەتا خەڵکی لایەنگری کەنیسە بوون، بەڵام وردە وردە کەنیسە لاواز بوو تاکو بەم شێوەیەی ئەمڕۆ لە چوار دیواردا خۆی بینیوەتەوەو پیرو داماوو پەك کەوتەکان نەبێت کەس هاتو چۆی ناکات.

لە سەدەکانی ناوەڕاستا کەنیسە بە نوێنەرایەتی بابا سەری ڕم بوو دژی جیهانی ئیسلامی ئەو کاتە، پاپا توربانی دووەم وەك مەکوك ئەگەڕا بە سەر وڵاتەکانی فەرەنسەو بەریتانیاو وڵاتانی تردا تاکو توانی هەموو ئەوروپا یەك بخات بۆ هێرش کردنە سەر جیهانی ئیسلام، ئەوە بوو هێرشەکانی شەڕی خاچ پەرستی دروست بوو کە پاپاکانی ئەو کاتە دەوری سەرەکیان هەبوو تیایدا و هەستی ئاینی پاڵنەریان بوو، ئەو کاتەش ئەوروپا چاوی تەماعی بڕیبووە بەرووبومی جیهانی ئیسلامی، لە یەکێك لە قسەکانیاندا وتویانە: بە ڕاستی وڵاتی موسوڵمانەکان هەنگوین و گەزۆی لێ دەبارێ..ئەمەش بووە هۆی هێرشێکی درێژخایەن بۆ سەر مسوڵمانان و، وەك مێژوو دەڵێت: تەنها لە قودس دا حەفتا هەزار کەسیان کوشت و سەریان بڕین، تەنانەت یەکێکیان کە لەو کاتەدا سەردانی بیت المقدس ی کردووە دەڵێت: نەمتوانی قاچ هەڵگرم لە بەرسەری ئەو موسوڵمانانەی کە سەربڕابوون و لێکرابونەوەو خوێن لە هەندێ شوێن تا خوار ئەژنۆ هاتبوو، بەم شێوەیە جیهانی نەسرانی ئەو کاتە لە شەڕو کوشتن و بڕین زیاتری نەئەزانی، تاکو تێکەڵاوبوون لە گەڵ موسوڵمانان و سەیریان کرد کە موسوڵمانان خاوەنی شارستانی و زانیاری و خوێندن و کۆمەڵێ شتی ترن کە ئێستە جێگەی باسی نیە، ئیتر وردە وردە هەوڵیان دا کە خۆیان خەریکی خۆیندن و خوێندەواری بکەن، چونکە تا ئەو کاتە ڕەنگە بە پەنجەی دەست خوێنەوارەکانی ئەوروپا بژمێردرانایە، نەك خوێندەواری بگرە دژی خوێندنیش بوون و هەر کەسێك خاوەن تێڕوانین و تیورێکی زانیاری بووایە توشی ئەشکەنجەو ئازار دەبوو.

بە ئاگاداری کەنیسەو بە فەرمانی پاپا سەدان زاناو ڕۆشنبیرو هونەردۆست و بیریاری ئەو کاتەی سەدەکانی ناوەڕاست لە سێدارە دران یان سوتێنران یان نەفی و دەربەدەرکران، نمونەکانی وەك برۆنۆ کە سوتێنراو گالیلۆ کە پاپا فەرمانی دەرکرد کە نابێت کەس بیدوێنێت و تەنانەت ژنەکەشی لێ قەدەغەکرد، تاکو لە دواییدا بە ملکەچی پەشیمان بۆوەو هاتەوە دەستی پاپای ماچ کرد، تاوانەکەشی تەنها ئەوەندە بوو کە باوەڕی بە خولانەوەی زەوی هەبوو کە پێچەوانە بوو لە گەڵ بۆچونەکانی کەنیسە کە باوەڕیان وابوو زەوی وەستاوەو ناخولێتەوە. فشاری کەنیسە لە سەر زاناو ڕۆشنبیران هێندە توندو تیژو بە هێز بوو تاکو گەشتە ڕاددەیەك کە هەموو ئەوروپا هەڵسا لە کەنیسەو بە یەکجار شۆڕشیان بەرپاکرد کە تێوری پەرەسەندی داروین و کتێبەکەی "بنچینەی جۆرەکان" خاڵی وەرچەرخان بوو لە مێژووی دژ بە کەنیسەداو بۆ دوا جار خەڵکی ڕووی کردە ئیلحادو بێ باوەڕی.

بۆچی ئەوروپا ئیلحادو بێ دینیان هەڵبژارد؟ بۆچی بەهەموو شێوەیەك کەوتنە دژایەتی کردنی کەنیسە؟

لە بەر ئەوەی کەنیسە هێمای دواکەوتویی و نەخوێنەواری بوو، بە هەموو هێزو توانایەکەوە بەرگری لە نەخوێندەواری ئەکرد، کەنیسە هێمای دەرەبەگایەتی بوو، هەمیشە قەشەکان ودەرەبەگەکان لە یەك ئاستا ئەژیان،هەندێك لە قەشەکان پێشبڕکێیان ئەکرد لەوەی کە کامیان درەنگتر خۆی ئەشوات یان دەم و چاوی ئەشوات تاکو لە مەلەکوت نزیکتر بێتەوە، جا ئاینێکی ئاوەها بە حەق تلیاکی گەلانەو پێویستە بخرێتە ناو چوار دیوارەوە.

کاتێك ئەو کێشەیە بە سەرکەوتنی عیلمانیەت و بێ دینی لە ئەوروپا کۆتایی هات، یەکەمین دەوڵەتی ئیلحادو بێباوەڕی لە فەڕەنسە دروست بوو کە لە سەر بناغەی دژایەتیکردنی ئەو دینە پێکهاتبوو کە پاپا و شوێنکەوتوانی نوێنەری بوون، بۆیە هۆی سەرەکی ئیلحادو بێباوەڕی ئەوروپا ئەگەڕێتەوە بۆ پاپاو قەشەکان کە بە هەمرو شێوەیەك بە ناوی دینەوەو بە ناوی خواوە دژایەتی هەموو زانست و زانیاریەکیان ئەکرد.

پاپای پێشتر یەکێك بوو لە بەناوبانگترین پاپاکانی کەنیسە لە مێژوودا، لە بەر ئەوەی مامۆستا بوو لە دەروونناسیدا، ئەیزانی چۆن وشە هەڵبژێرێت و چۆنیش خۆی لێ دەرباز بکات، یەکێك لە دروشمە گەورەکانی کە بەرزی کردبۆوە حیوارو گفتۆگۆ بوو لە گەڵ مسوڵماناندا، بە تایبەت لە دوای ساڵانی هەشتاکانەوە لە زۆر شوێندا باسی ئەوەی ئەکرد کە پێویستە گفتوگۆ بکرێت لە گەڵ موسوڵمانەکاندا، بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستی پاپا گفتوگۆ نەبوو، بەڵکو بە گاورکردنی موسوڵمانەکان بوو، هەرکاتێك پاپاچوبێتە وڵاتێك کە زۆرینەی مسوڵمان بوبێت (پاپای پێشووزیاتر لە بیست وڵاتی ئیسلامی گەڕاوە)، بانگەشەی گفتوگۆو حیواری کردووە لە گەڵ مسوڵمانەکاندا، بەڵام کاتێك کە دەرفەت لە بار بووە بۆ گفتۆگۆی ڕاستەقینەو بێ پەردە دەربارەی ئەو دوو ئاینە گەورەیە، پاپا خۆی دزیوەتەوەو گوێی لێ خەواندووە، ئەم قسەیەش لە خۆمانەوە ناکەین و لێرەدا حەز ئەکەم نموونەیەکی زیندوو بهێنمەوە لە سەر ڕاستی بانگەشەی پاپاو کەنیسە لە مەڕ دانوستان لە گەڵ موسوڵمانەکان، ئایا بە ڕاستیانە یان هەر فرت و فێڵێکە بۆ لە بار بوونی ئاوو هەواوی گونجاو تاکو موسوڵمانەکان بەرەو مەسیحیەت بڕۆن .

مامۆستا ئەحمەد دیدات لە نامیلەکەی (خمسون ألف خطأ في الكتاب المقدس و حوار مع البابا) لاپەڕە (١٦) بەناونیشانی (حوار البابا يعني التحول) دەڵێت: ئێمە ئەزانین کە بە

ڕاستی پاپا نایەوێ حیوارو گفتوگۆ بکات، لە ڕاستیدا ئەو بانگەشە بۆ مژدەدەرەکانی ئەکات تاکو بڕۆن و موسوڵمانەکان بگۆڕن بەرەو مەسیحیەت، بەڵام ئەگەر وشەی گۆڕینی بەکارهێنا ئەوا مسوڵمانان ئاگادار ئەبنەوەو بەرگری لە دینەکەیان ئەکەن، ئەو زۆر بە وردی و لێهاتوییەوە وشەی گفتوگۆ -الحوار- بە کاردێنێ لە بریتی وشەی گۆڕین -التحويل-.

جا بۆ لابردنی ئەم گومانە بە سەر قوداسەتی پاپاوە، ئێمە بە دەم داواکەیەوە هاتین و ویستەکەیان بە جێهێنا لە کردنەوەی گفتوگۆیەکی ڕاستەقینە و بانگەشەمان کرد کە ئێمە ئامادەین بە گرتنی حیوارێکی کراوە لە گۆڕەپانی قدیس بوتروس لە ناو فاتیکاندا لە ڕۆما لە کات و مێژووی لە باردا کە ئەوان پێیان قبوڵە تاکو ئەرکی سەرشانی قوداسەتی پاپا قورستر نەکەین و، نامەیەکمان بۆ نوسی لە بەرواری (١) رەمەزانی ساڵی (١٤٠٤) کۆچی، بەرامبەر بە (١) یونیوی (١٩٨٤)ز.

**پاپا پەشیمان بووەوە:** دوای سێ نامەی ترو بروسکەیەك لە ئابی (١٩٨٤)دا کە بۆمان نارد،پاپا وەڵامی دایەوە بەوەی بە شێوەیەك ڕازیە کە لە سکرتاریەتی پاپا گفتۆگۆکە ئەنجام بدرێت و لە دانیشتنێکی تایبەتیشدا بێت. منیش لە (١٧) سێبتەمبەری (١٩٨٤) بەم نامەیە وەڵامی قوداسەتی پاپام دایەوە:

"بەڕاستی ئێجگار دڵخۆش بوین بەوەی کە ئێوە بارودۆختان بۆ یەکتربینینمان ئامادە کردووە، بەڵام ئێمە ئەوە زۆر گرنگە بە لامانەوە کە هەروەك نامەکەمان بۆتان گشتی و ئاشکرایە، بەو شێوەش بە یەکگەشتنەکەمان گشتی و ئاشکرا بێت، وە من خۆم ئەو پێشنیارەم کرد کە بە یەکگەشتنەکە لە گۆڕەپانی القديس بگیرێت، چونکە گفتۆگۆ لە نێوان مەسیحیەت و ئیسلامدا، جێی گرنگی پێدان و خولیای شوێن کەوتەی هەردوو ئایینە گەورەکەیە کە ژمارەیان دەگاتە دوو ملیار کەس زیاتر، جا لە پێناوی ئەوانەدا، وە لە پێناوی حەقیقەت و ڕاستیدا، وە بۆ ڕەزامەندی خواش، پێویستە خۆمان بە دوور بگرین لە گۆشەگیری و دانیشتنێکی بە تەنهایی کە هیچ پێویست ناکات، ئێمە زیاتر لە چاوپێکەوتنێکمان مەبەستە کە لە سکرتاریەتی ئێوە بکرێت وەك لە پێشنیارەکەتاندا هاتووە، بە شێوەیەك ئێمە تەنها لە خوارووی ئەفریقیادا ئەوەندە کەس هەیە کە مەبەستیەتی و حەز ئەکات کە ئاگاداری ئەو حیوارو گفتۆگۆیە ببێت کە سێ تەیارەش نایانگرێت، کە لە (جوهانسبیرگ و دوربان و کیب

تاون)ەوە دێن. ئومێدەوارین ئاگادارمان بکەن لە گونجانی سکرتاریەتی ئێوە بۆ شوێنی ئەو هەموو خەڵکەی کە دێن و ئەمە لە گەڵ هەزاران کەسی تریش کە ڕەنگە بیانەوێت بەشداری بکەن لەو چاوپێکەوتنەدا، هەروەها لە پێناوی ئەوەی کە هەزاران کەسی تر هەن کە ناتوانن بێن و بەشدار بن داوانەکەم و هیوادارم کە ڕەزامەندی بنوێنن بۆ ئەوەی کە بتوانین بابەتەکانی گفتوگۆکە بە شریتی ڤیدیۆ تۆمار بکەین تاکو گفتوگۆکەمان بگاتە ئەوانیش، وە ئەگەر وا نەبێت ئەوا ئێمە سوودی ئەو گفتوگۆیە لە خەڵکی ئەبڕین و بێ بەشیان ئەکەین .

دوای ئەوەی کە پاپامان لە قافا گرت، بێ دەنگ بوو (وەڵامی نەدایەوە)؟!

ئیتر دوای دوو مانگ چاوەڕوانی بروسکەیەکی ترمان بۆ نارد لە (٢٩) نۆڤەمبەری (١٩٨٤)، بۆ سکرتاریەت و بۆ خودی پاپا، وە دوای مانگێکی تر لە (٢٧) سێبتەمبەر دوو بروسکەی ترمان بۆ نارد بەڵام بێ سوود بوو، ئیتر بۆ دوا جار لە هەوڵێکی بێ ئومێدیدا بروسکەیەکی تریشمان بۆ خودی پاپا ناردو بە ناو خەڵکیشدا بڵاومان کردەوە ((بە ڕاستی ئێمە نەمانزانی کە بانگەشەکردنی پاپا بۆ حیوارو دووبارەکردنەوەی ئەم وشەیە: ئێمە حیوارمان ئەوێت، ئێمە حیوارمان ئەوێت، تەنها فێڵێکی گەورەیەو هیچی تر، وە بە ڕاستیش ئێمە هەڵسابین بە وەڵامی فێڵەکەی و سەلماندمان بۆ جیهان کە ئەمە تەنها بۆ پێکەنینەو هیچی تر، بە ڕاستی پاپا ئەو گفتوگۆیەی کە هەر باسی ئەکرد لە ناوی بردو هەڵیوەشاند، وە ئێمە بێ تاقەتین بە شکستی پاپا و وەڵام نەدانەوەی، بەڵام ئەمە تووشی هەڵچون و بێزاریمان ناکات)).

ئەمە دەقی نامەو قسەکانی مامۆستا دیدات بوو کە بۆ سەری کەنیسەی کاسۆلیکی نوسیبوو، وە ئامادەی حیوارو گفتوگۆ بوو لە گەڵ پاپا و لە مەیدانی فاتیکاندا، ئەمەش حەقیقەتی بانگەشەی پاپا بوو بۆ حیوارو گفتۆ گۆ لە ئەگەڵ ئیسلامدا.

### لێرەدا چەند خاڵێك كۆئەبێتەوە:

یەکەم: ئەو هەموو بانگەشەیەی پاپا ئەیکرد بۆ حیوار و گفتوگۆ لەگەڵ مسوڵمانەکاندا لە ڕاستیدا جگە لە فرت و فێڵ هیچی تر نەبوو.

دووەم: دوای ئەوەی کە بۆی دەرکەوت کە مسوڵمانەکان بە جدی ئەیانەوێت بە شێوەیەکی ئاشکراو لە بەر چاوی ملیۆنەها کەس ئامادە بن، پاشگەز بۆوەو ویستی بە شێوەیەکی نهێنی لە سکرتاریەتی پاپا خۆی بێت.

سێیەم: پاش ئەوەی بەوەش ڕازی بوون، پاپا خۆی لەوەش دزیەوەو نەهات بە دەم داواکەیانەوە..

پاپای فاتیکان ترسناکترین پەیاننامەی مۆرکرد لە تەمەنی خۆیدا کە بێ بەری کردنی جولەکە بوو لەخوێنی مەسیح، ئێمە ئەزانین کە خوای گەورە پێش (١٤٠٠) ساڵ جولەکەی بێ بەری کردووە لەو خوێنەو بڕاندویەتیەوە کە مەسیح (علیه السلام)، نە کوژراوەو هەڵنەواسراوە ﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ ﴾ النساء: ١٥٧، بەڵام ئەمەی پاپا کردی بەرامبەر بە جولەکە، مانای ئەوەیە بە درێژایی (٢٠٠٠) ساڵی مێژووی کەنیسە بە درۆ بوهتانیان بۆ جولەکە کردووە، دوای ئەوە ئەگەر جولەکە بەرین لە خوێنی مەسیح و هەڵیان نەواسیوە ئەی ئیتر ئەو خاچە چی ئەگەیەنێت و چ مانایەکی ئەبێت؟! بەڵام لە لایەکی ترەوە کاتێك هات بۆ سوریاو داوایان لێ کرد کە داوای لێبوردن بکات لە هێرشە خاچپەرستیەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ سەر موسوڵمانان، ئامادە نەبوو داوای لێبوردنی نەکرد، هەروەها ئامادەش نەبوو کە بچێتە سەر گۆڕی صلاح الدینی ئەیوبی، پاپا ئامادەیە جولەکە بەری بکات کە بە هەموو توانایەکیانەوە دژی مەسیح (علیەالسلام) و حەواریەکانی شوێن کەوتەی بوون و هەمووجۆرە سزادانێکیان بە کار هێنا لە دژیان، بەڵام ئامادە نیە داوای لێبوردن لە موسوڵمانان بکات کە زیاتر لە ملیارێکن و لە شەڕەکانی خاچ پەرستەکاندا ئەوان هێرشیان هێنایە سەر وڵاتانی ئیسلامی و قودسیان داگیر کرد!

لە کۆتاییدا ئەوەمان لە بیر نەچێت کە پاپا یەکێك بوو لە پاپا گەڕۆکەکان وبە (پاپای گەڕۆك ناسراوە) و لە کۆتاییەکانی ژیانیشدا هەموو هەوڵێکی تەرخان کردبوو بۆ بڵاوکردنەوەی ئەسرانیەت لە وڵاتانی ئیسلامدا، بە تایبەتی عێراق و ویستی لە سەردەمی بەعسدا بێت بۆ عێراقیش بەڵام لەبەر باری ئەمنی نەیتوانی، یەکێك لە قسە گرنگەکانی دەربارەی عێراق دوای داگیرکردنی لە لایەن ئەمریکاوە دەڵێت: " إن الأجواء في العراق مهيأة للتنصير كأفضل ما يكون"باروددۆخ لە عێراقدا زۆر گونجاوە بو تەنسیرکردن و بە گاورکردنی موسوڵمانان، هەروەها بە ماوەیەکی کەم پێش لە ناوچون و مردنیشی جێگرێکی تازەی دانا بۆ ئیشوکاری بابەوی لە نیوەدورگەی عەرەبدا کە وڵاتەکانی بەحرەین و سعودیەوە کویت و قەتەرو ئیمارات و عومان و یەمەن ئەگرێتە خۆ.

ئەگەر پاپا ئیمانی بە خوای تاك و تەنها بێنایەو شوێن پێغەمبەرەکەی بکەوتایە، جێگەی بەهەشتی بەرین ئەبوو لە دوارۆژدا ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَٰهُمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ المائدة: ٦٥ بەلام تاوانی خۆی و هەموو شوێن کەوتووەکانیشی لەگەڵ خۆی بەرەوقیامەتی هەتا هەتایی برد.[١]

## یازدەیەم: هەزاران نەمساوی ڕوودەکەنە ئیسلام:

(تووشی سەرسوڕمان بووم و واقم وڕما لەوبەرنامە خواییەی لە دوتوێی سورەتی بەقەرەدا هاتووە، کە وای لێکردم هەست بە بوونی خوا بکەم و ئیمان لە ناخمدا کلپە بکات و سەرهەڵدات...) بەم وشانە بەرپرسی دەستەی ڕاگەیاندنی بنکەی ئسلامی لە نەمسا باسی چۆنیەتی مسوڵمانبوونی خۆی کرد.

ئامینە بیگاتی یەکێکە لە هەزاران نەمساوی کە ساڵانە دێنە بنکە ئیسلامیەکانی نەمساو ئیسلامەتی خۆیان ڕادەگەیەنن، ئەوەی جێی سەرنجە لە دوای ڕوداوی سێبتەمبەری (٢٠٠١) وە پرسیار دەربارەی ئیسلام بۆتە دیاردەیەکی بەرچاو بۆ خەلکی نەمسا بە تایبەت چینی ئافرەتان و بەردەوام دێنە بنکە ئیسلامیەکان بە تایبەتی لە ڤیەننا ی پایتەخت و دوای خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە لە ئاینی ئیسلام ئیسلامەتی خۆیان ئاشکرا دەکەن.

بەپێی ئەو لێدوانەی دکتور فرید الخوتی بەڕێوەبەری بنکەی ئیسلامی لە شاری ڤیەننا بۆ پەیامنێری (ئیسلام ئۆن لاین) تەنها ئەمساڵ بنکەی ئیسلامی پێشوازی لە (٥٠) هەزار هاوڵاتی نەمساوی کردووە بە مەبەستی شارەزابوون و تێگەیشتن لە ئاینی ئیسلام.

هەروەها وتی: کە زۆرێك لە زانکۆکان و قوتابخانەو بنکە کۆمەڵایەتیەکان داوایان کردووە کە زیاتر شارەزای ئیسلام بن و لەگەڵ مسوڵماناندا یەکتر ببینن و ڕاگۆڕینەوە بەردوام هەبێت.

هۆی مسوڵمان بونی زۆرێك لە نەمساویەکانیش ئەگەڕێتەو بۆئەوەی کە هیچ توندوتیژی و گرژیەك نابینن لە وەلامدانەوەی پرسیارەکانیان کاتێ پرسیار لە هەر بابەتێکی ئیسلامی ئەکەن، لە کەش و هەوایەکی ئازادو سەربەخۆدا وەلام ئەدرێنەوە.

---

١- پێگەی زاگرۆس.

هۆکاری دیکەش هەن بۆ نموونە وەك شوکردنی هەندێ لەکچانی نەمساوی بە مسوڵمانەکان، یان وتوویژو ڕاگۆڕینەوەو قسەکردن لەسەر ئیسلام لە کاتی ئیشکردندا لە کارگەو شوێنەکانی دیکەدا.

شایانی باسە کە ئاینی ئیسلام خێراترین ئاینە لە بڵاوبونەوەدا لە نەمسادا و بە ڕەسمی ناسێنراوە.

ژمارەی مسوڵمانەکان لە نێوان (٣٥٠) تا (٤٠٠) هەزار کەس ئەبن لە کۆی دانیشتوانی نەمسا کە هەشت ملیۆنن و، مسوڵمانەکان لە هەر نۆ ویلایەتەکەی نەمسادا بڵاوەیان کردووە بە تایبەت لە ڤیەننای پایتەخت.

لە نەمسادا تەنها یەك مزگەوت هەیە کە منارەی هەبێت ئەویش مزگەوتی ڤیەننایە، بەڵام زیاتر لە (٢٠٠) شوێنی نوێژکردن هەیە کە وەك مزگەوتی بچوك نوێژیان تیادەکرێت.

هەروەها جێی باسە کە زۆربەی ئەوانەی دێنە ناو ئیسلام لە ئەورووپاو شوێنانی تریش لە ئافرەتانن، ئەمەش ئەوە ئەسەلمێنێ کە ئاینی ئیسلام مافی گەورەی داوە بە ئافرەت و لە شوێنی گونجاوی خۆی دایناوەو ئەو پڕوپاگەندەو هێرشانەی کە ئەکرێنە سەر ئیسلام کە گوایا مافی ئافرەتانی پێشێل کردووە، هیچ بنەمایەکی زانستی نیەو کۆمەڵێ مەبەستی دەرەکی یان تێ نەگەشتنی لە خۆگرتووە..

لە ساڵی (٢٠٠٤) بە پێی سەرژمێری کۆڕی موفتیانی ڕوسیا زیاتر لە بیست هەزار کەس لە مۆسکۆو دەوروبەری بوونە مسوڵمان کە ٧٠٪ یان ئافرەتن. ئەمە ئەگەر بەڵگە بێت لە سەر شتێك بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئافرەتان بە تایبەتی مافی خۆیان لەم ئاینە پیرۆزەدا ئەدۆزنەوە.[1]

## دوازدەیەم: هەڵمەتی بەگاورکردن لە چەند سەرژمێریەکدا!

ماوەیەکە لێرەو لەوێ باس لە بە گاور کردن دەکرێت لە کوردستاندا، جێگەی باسە لە دوای جەنگی عێراقەوە چەندین ڕێکخراوی بە گاور کردن هاتونەتە عێراق و کوردستان و،

١- پێگەی زاگرۆس.

چەندەها کتێب و نامیلکە بڵاودەکەنەوە بە مەبەستی بە گاورکردنی عێراق بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی و سەرجەم گەلانی ناوچەکە.

شایانی باسە ئەم هەڵمەتی بە گاورکردنە وەکو باس دەکرێت سەرجەم ناوچەکانی کوردستانی گرتۆتەوە بە ناحیەو قەزاکانیشەوە.

بۆیە بە پێویستی دەزانین سەرژمێرییەك بڵاوبکەینەوە سەبارەت بە کاری تەبشیرو کاریگەرییان لەسەر خەڵکی، کە تیایدا دەردەکەوێت لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبونەدا کەوا دەدرێت لە هەموو جیهاندا بۆ بە گاورکردن، بەڵام چونکە خوای گەورە بەڵێنی داوە کەوا پاشەڕۆژ هەر بۆ ئیسلامە دەبینین ئاینی ئیسلام لەگەڵ ئەو هەموو کێشەو گرفتانەدا ڕۆژ بە ڕۆژ لە بڵاوبوونەوەدایە و بە پێچەوانەوە ئاینی خاچپەرستی و جوولەکە ڕۆژ بە ڕۆژ لە هاتنە دواوەو کەمبوونەوەدان.

ئێستاش با سەیرێکی ئەو سەرژمێرییە بکەین کەوا دەربارەی هەر سێ ئاینەکە (ئیسلام، مەسیحییەت، جوولەکە) بەسێ قۆناغ لە نێوان ساڵانی (١٩٧١-٢٠٠١-٢٠٢٥)دا کراوە.

١- بڕی یارمەتی دیاری کراو بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحیەت لە ساڵی (١٩٧٠)دا گەیشتۆتە (٧٠ ملیۆن) دۆلاری ئەمەریکی و، لە ساڵی (٢٠٠١)دا بڕی ئەو یارمەتییە گەیشتۆتە (٢٨٠بلیۆن) دۆلاری ئەمەریکی، وە پێشبینی دەکرێت کەوا لە ساڵی (٢٠٢٥)دا ڕێژەکە بگاتە (٩٥٠ بلیۆن) دۆلاری ئەمەریکی .

٢- ڕێژەی تاوانکردن کەوا لەساڵی (١٩٧٠)دا لە کەنیسەکاندا تۆمار کراوە (٥ملیۆن) تاوان بووە، وە لە ساڵی (٢٠٠١)دا ڕێژەکە گەیشتۆتە (١٧ملیۆن) تاوان، پێشبینی دەکرێت کەوا ڕێژەکە تا ساڵی (٢٠٢٥) بگاتە (٦٥ملیۆن) تاوان.

٣- ژمارەی ئەو ڕێکخراوانەی کەوا نێردراون بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت لە ساڵی (١٩٧٠)دا (٢٢٠٠) ڕێکخراو بووە، لەساڵی (٢٠٠١)دا ژمارەکە گەیشتۆتە (٤١٠٠) ڕێکخراو، وەپێشبینی دەکرێت تا ساڵی (٢٠٢٥) بگاتە (٦٠٠٠) ڕێکخراوی بە مەسیحیکردن.

٤- ژمارەی ئەو کەناڵە ڕاگەیاندنانەی (ڕادیۆوتەلەفزیۆن) کە بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحییەت کراونەتەوە لەساڵی (١٩٧٠)دا (١٢٣٠)کەناڵ بووە، لەساڵی (٢٠٠١)دا ژمارەکە بووە بە (٤٤٥٠) کەناڵ، پێشبینیش دەکرێت تاساڵی (٢٠٢٥) ژمارەی کەناڵەکان بگاتە (٥٤٠٠) کەناڵ.

٥- ژمارەی گوێگرانی کەناڵە مەسیحییەکان لەساڵی (١٩٧٠)دا (١٥٠ملیۆن) گوێگربووە، لەساڵی(٢٠٠١)دا زیادی کردووە بۆ (٦١٩) ملیۆن گوێگر، وەپێشبینی دەکرێت تاساڵی (٢٠٢٥) بگاتە (١٣٠٠) ملیۆن گوێگر.

٦- ژمارەی ئەو نەخشانەی کە دانراوە بۆ بە مەسیحی کردنی گەلان لە ساڵی (١٩٧٠)دا (٥١٠) نەخشە بووە، لەساڵی (٢٠٠١)دا ژمارەکە زیادی کردووە بۆ (١٥٤٠) نەخشە، وا پێشبینی دەکرێت کەوا تا ساڵی (٢٠٢٥) بگاتە (٣٠٠٠) نەخشە.

ئێستاش بە سێ قۆناغ ژمارەی شوێنکەوتووانی هەرسێ ئایین (ئیسلام-مەسیحییەت-جوولەکە)کەوا لەو لێکۆڵینەوەیەدا ڕوونکراوەتەوە لە نێوانی ساڵانی (١٩٧٠-٢٠٠١-٢٠٢٥) دا بڵاودەکەینەوە، تا ڕوون وئاشکرا بێت کەوا لەگەڵ ئەو هەڵمەتە گەورەیەدا کە دەستی پێکردووە بۆ بە مەسیحیکردنی گەلانی موسوڵمان تاچەندێك ئاینی ئیسلام بەرەو پێش و ئاینی مەسیحی بەرەو دوا گەڕاونەتەوە:

١- ژمارەی موسوڵمانانی هەموو جیهان لە ساڵی (١٩٧٠)دا (٥٥٣,٥٢٨,٠٠٠) موسوڵمان بووە، وە لە ساڵی (٢٠٠١)دا بووە بە (١,٢١٣,٣٧٠,٠٠٠) موسوڵمان، وە پێشبینی دەکرێت تا ساڵی (٢٠٢٥) بگاتە زیاتر لە (٣,٨٤٨,٧٦٠,٠٠٠) موسوڵمان.

٢- ژمارەی مەسیحییەکانی هەموو جیهان لە ساڵی (١٩٧٠)دا (١,٢٣٦,٣٧٤,٠٠٠) مەسیحی بووە، وە لەساڵی (٢٠٠١) بووە بە (٢,٠٢٤,٩٢٩,٠٠٠) مەسیحی، پێشبینی دەکرێت تا ساڵی (٢٠٢٥) بگاتە (٢،٢٦١,٦٦٧,٠٠٠)مەسیحی.

٣- ژمارەی جوولەکەکانی هەموو جیهان لە ساڵی (١٩٧٠)دا (١٤,٧٦٧,٠٠٠) جوولەکە بووە، وە لە ساڵی (٢٠٠١)دا بووە بە (١٤,٥٥٢,٠٠٠) جوولەکە، وە پێشبینی دەکرێت تا ساڵی (٢٠٢٥) بگاتە (١٦,٠٥٣,٠٠٠)جوولەکە (جوولەکە خەڵك بانگ ناکەن بۆ ئاینەکەیان).

بە سەرنج دان لەو سەرژمێریانەی سەرەوە ئەو ڕاستیانەمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە کەوا خۆری ئیسلام بە بێژنگی مەسیحییەت ناگیرێت و، نووری ئیسلام بە فووی دەمیان ناکوژێتەوە

ئەگەر هەڵمەتەکەیان زۆر لەوە گەورەتریش بکەن. بۆیە ئێمەی موسوڵمان دەبێت زۆر گەشبین بین، چونکە خوای گەورە بەڵێنی داوە کەوا پاشەڕۆژ هەر بۆ ئیسلام و موسوڵمانانە.[1]

## سیازدەیەم: بەرزبوونەوەی ڕێژەی موسوڵمانان لەهندستان :

لە تازەترین سەرژمێریدا ئاشکرا کرا موسڵمانەکان نموونەی خێراترین نەتەوەن بۆ بڵاوبوونەوەو تەشەنەکردن لە هیندستان، لە کاتێکدا ئاینەکانی دی بە تایبەت هندۆسەکان بەرەو دوا دەکشێنەوە و ژمارەیان بەرەو کەمبوونەوە دەچێت.

لەو سەرژمێرییەدا ئاشکرا کراوە کە ژمارەی موسوڵمانەکان بوەبە (١٣٨ملیۆن) و ڕێژەیان دەکاتە (١٣,٤٪)ی سەرجەمی دانیشتوانی هندستان کە ژمارەیان (١,٠٢٨ملیار) کەسە.

لە هەمان سەر ژمێریدا هاتووە کە هندۆسەکان بەپێی دروست بوونیان زۆرینەی دانیشتوانی هندستان پێك دێنن، کە دەکاتە(٨٠,٥٪)، بە پێی هاوکێشەی زیاد بوون و بڵاوبوونەوەیان لە هندستان لە ساڵی (١٩٩١تا ساڵی٢٠٠١) واتە لە ماوەی (١٠ساڵدا) ڕێژەکەیان بەرەو کەمبوونەوە چووە لە چاو ساڵانی تردا. ئەمەش بە پێی ئەو سەرژمێریانەی کەلەو ماوەیەدا کراوەو کۆکراوەتەوە لە لایەن لیژنەی پسپۆڕەوە لە هندستان.

مامۆستا (ئەستیش بوزی) پسپۆڕ لە بواری سەرژمێری دانیشتوان لە بابەتێکدا کە لە سایتی (الجزیرە نت)دا بڵاوکرایەوە دەڵێت: ژمارەی دانیشتوانی موسڵمانان بە شێوەیەکی زۆر خێرا ڕوو لە زیاد بوون دەکات، ئەویش بە هۆی بەکارهێنانی ڕێگای بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی خێزان وە بەرزبوونەوەی هاوکێشەی دایك لە نێوانیاندا، لە بەرامبەردا کەمبوونەوەی هاوکێشەکانی زۆر بوون و نەشونماکردن لای هندۆسەکان بەڕێژەی (٤,٨٪) لە ماوەی ساڵانی (١٩٩١تا٢٠٠١)، واتە لە (١٠ساڵدا) بە جیاوازی لە چاو ساڵانی پێشودا. وە لەگەڵ ئەمەشدا بەرزبوونەوەی ڕێژەی موسڵمانەکان بە ڕێژەی (١,٥٪) لە هەمان ماوەدا.[2]

---

١- پێگەی زاگرۆس.

٢- پێگەی زاگرۆس.

## چواردەیەم: موسڵمانەکان لەپشت کەمبوونەوەی تاوانن لە هۆڵەندا :

لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابوردووەوە کۆچکەرە مسوڵمانەکان تاك تاك و کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو وڵاتانی ئەوروپی کۆچیان کردووە کە ئەمە وردە وردە بۆتە هۆی دروستکردنی دیاردەیەکی ئیسلامی لە ڕۆژئاوا.

هوڵەندە یەکێك بووە لە وڵاتە داگیرکەرەکانی سەدەکانی ڕابوردوو کە بە درێژای سێ سەدە دەوری بووە لە داگیرکردنی هەندێ لە وڵاتانی ئیسلامی، بەڵام لە گەڵ دەرکەوتنی ئەستێرەی وڵاتانی دیکە بە تایبەت دوای جەنگی جیهانی دووەم ئیتر دەستی کێشاوەتەوەو بۆتە وڵاتێکی فرە ڕەگەزو فرە ئایین کە هەموو کەسێك مافی ژیانی تیا ئەبینێتەوە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە زۆرێك لە کۆچکەرەکان ڕووی تێ بکەن و ببێتە جێی حەوانەوەو کارکردنیان.

ئەمڕۆ یەکێك لە گرفتە گەورەکانی ڕۆژئاوا بە گشتی بریتی یە لە زۆری تاوان بە گشت جۆرەکانیەوە، تاوانی کوشتن یان زۆرلێکردنی جنسی یان لێدان و داپڵۆسینی ژن لە لایەن مێردەوە، بە شێوەیەك کە هەندێ لە کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوا بۆ نموونە ئەمریکا بۆتە کۆمەڵگەی تاوانکردن و لە شەوورۆژێکدا سەدەها تاوانی جۆر بە جۆر ڕوونەدات، ئەمە لە گەڵ ئەو ڕێکوپێکی و توندوتۆڵیەی یاسا کە هەیەو پولیس هەمیشە لە خزمەتی کۆمەڵگەکەدایە.

لە سەدەی ڕابردوودا پۆلیسی هەندێ لە ویلایەتەکانی ئەمریکا ئامۆژگارکارە مسوڵمانەکانیان دەبردە گرتوخانەکان تاکو ئامۆژگاری ئەوانە بکەن کە هەمیشە خەریکی تاوان بوون و جار لە دوای جار ئەگیرێن لە بەر تاوان، تاکو واز بێنن و بگەڕێنەوەو، ئەم ئەزموونە تا ڕادەیەك کاری خۆی کرد و خەڵکێکی زۆری لە تاوان گێڕایەوە .

هۆڵەندەش هەستی بەوە کردووە کە هەستی ئاینی و بیروباوەڕی ئاینی دەوری بەرچاوی هەیە لە کەم کردنەوەی تاوان و واز لێهێنانی، لە بەر ئەوە یارمەتی دەوری مزگەوت وشوێنانی تر ئەدات بۆ زاڵ بوون بە سەر گرفتی تاوان لە ناو کۆمەڵدا. پێگەی (الاسلام اليوم) چاوپێکەوتنێکی لە گەڵ بەڕێوەبەری بنکەی ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی لە شاری ڕوتردام لە هۆڵەندە کردووە، کە لە چەند خاڵێکی کورتدا باسی دەکەین:

١- ژمارەی دانیشتوانی هۆڵەندە نزیکەی (١٥) ملیۆنەو ڕێژەی مسوڵمانان١٠٪ یە .

٢- هۆڵەندە بە کۆمەڵگەیەکی ئازاد دادەنرێت بە تایبەت شارەکانی و پەیوەندیـەکی زۆر لاوازیان بە ئاینەوە هەیە، تەنها ٢٢٪ی ئەوانـەی ژن دێـنن ئەچـنە کەنیسـەو ژنـەکانیان مـارە دەکەن، ئەوانەش سەردانی کەنیسە ئەکەن چەند کەسێکی کەم و پیرو پەککەوتەن.

٣- بە پێی سەرژمێری کە لە بنکەی نەتەوەیی سەرژمێری هۆڵەندیەوە دەرچووە لە ساڵی (٢٠٠٣) ژمارەی مسوڵمانەکان لە هۆڵەندە یەك ملیۆن دەبێت .

٤- ئەوانەی کـە مسـوڵمانبوون لـە خـەڵکی هۆڵەنـدە نزیکـەی (١٠) هـەزارن کـە ٦٥٪ ئافرەتن و ٣٥ ٪ لە پیاوانن .

٥- گەلی هۆڵەندە بـە دڵفراوانـی و وەرگـرتنی ڕای بەرامبـەر ناسـراوەو گـەلێکی ڕەگـەز پەرست نیە لە لایەنی ئاینیەوە و کراوەو فرە ڕەگەزە .

٦- لە هۆڵەندە (٤٠٠) مزگەوت و (٣٦) قوتابخانەی سەرەتایی هەیـە بـۆ مسـوڵمانەکان کە یارمەتی لە حکومەتەوە وەردەگرن و یاساین.

٧- لە ئەنجامی بڵاوبونـەوەی تـاوان و خراپەکاریـەکی زۆردا لـە کۆمەڵگـەی هۆڵەنـدیدا، حکومەت یارمەتی ڕێکخراوە ئاینیەکان ئەدات وەك مزگەوت و شوێنەکانی تر تاکو بتوانن زاڵ بن بە سەر دیاردەی بڵاوبونەوەی تاوان لە ناو کۆمەڵگەی هۆڵەندیدا.[1]

## پازدەیەم: موسڵمانان دەبنە زۆرینە لە ئەوروپا لـە کـۆتـایی سـەدەی بیسـت و یەکـدا:

ئاینی ئیسلام ئەو بەرنامەیەیە کە مرۆڤایەتی ڕزگار کرد لە تاریکیـەوە بـەرەو ڕووناکی و، ئیسلام تاکە بەرنامەیە کـە گونجـاوە بـۆ هـەموو سـەردەم وکاتێـك چـونکە وەڵامـی هـەموو پرسـیارێکی لایـەو، چارەسـەری هـەموو کێشـە وگرفتـە کۆمەڵایەتیـەکان، سیاسـیەکان، ئابووریەکان.. .. هتد، لای دەست دەکەوێت و، لەگەڵ کارپێکردنیدا مرۆڤایەتی بەرەو ئـارامی دەبات، ئەگەر چاوێکیش بە مێژووی ئیسلامدا بخشێنین ئەو ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، بۆیە دەبینین ڕۆژ بە ڕۆژ خەڵکی لە هەموو شـوێنێکی سـەرزەوی یـەوە بـەرەو ئیسـلام دێـن، ئـەوەتا چـەندەها زانـا و پسـپۆر لـە وڵاتـانی ئـەوروپا و ئـەمریکا لەسـەر ڕۆڵ و کاریگـەری ئیسـلام ومسڵمانان دەنووسن و قسـە دەکـەن، هەفتـەی ڕابـردوو (برنـارد لـویس) کەکەسـێکی شـارەزاو

---

١- پێگەی زاگرۆس.

پسپۆڕە لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دووپاتی کردەوەو ڕایگەیاند کە ئەوروپا لە کۆتایی سەدەی بیست و یەکدا ڕێژەی موسڵمانان دەبنە زۆرینە تیایدا، ئەمەش لەسەر بنچینەی ئەو دیموکراسیەی کە لە ئەوروپادا هەیە..

(برنارد لویس) مامۆستا یە لە زانکۆی (برنستۆن) و خاوەنی چەندەها کتێب و نووسراوە دەربارەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (یڤیلی) ئەڵمانی دا دەڵێت ئەوروپا دەبێت بەبەشێك لە مەغریبی عەرەبی و، من یەك دەنگم لەگەڵ ئەو هەواڵەی لە دەزگای هەواڵی سعودی دا (وابین) بڵاوکرایەوە، کە تیایدا چەند هۆکارێك دیاریدەکەن کە وا کۆمەڵگای ئەوروپا بەرەو کۆمەڵگەیەکی موسڵمان دەبات، لەوانەش:

١- هۆکاری کۆچکردنی لاوان لە وڵاتانی ئیسلامییەوە بەرەو ئەوروپا کە ئێستاش ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لە زیاد بوونە، ئەمەش دەبێتە هۆی سەر هەڵدانی ڕابوونێکی ئیسلامی بەهێز و پتەو لە ئەوروپاو، تێکەڵاوبوونی بە کۆمەڵگای ئەوروپی لە هەموو ڕوانگەکانی ژیانەوە کە دەتوانن کاریگەری تەواو دروست بکەن لە ماوەیەکی کورتدا لە داهاتووداو، هەروەها کردنەوەی چەندەها بنکە و ڕێکخراوی ئیسلامی و لەهەمووشیان گرنگتر ئەو ژمارە بەرچاوانەیە لە مزگەوت کە لە هەموو شارو شارۆچکەیەکی ئەوروپی دا بڵاوبووەتەوە، کە دەورێکی باڵایان هەیە لە بڵاوکردنەوەی ئیسلامدا.

٢- ئەوروپیەکان لەئاستێکی درەنگی تەمەنیاندا خێزان پێکەوە دەنێن و،کاتێکیش کە خێزان پێکەوە دەنێن ژمارەیەکی کەم منداڵیان دەبێت، بەڵام بەپێچەوانەوە موسڵمانان لە ئەوروپا لە تەمەنی لاوێتی دا خێزان پێکەوە دەنێن و ژمارەیەکی زۆرتر منداڵیان دەبێت.

٣- لە تازەترین توێژینەوەشدا کە ئامادەکراوە، ئاماژە بۆ ئەوەکراوە کەدوای (١٠) ساڵی تر ڕێژەی خانەنشینان لە ڕیزی ئەوروپیەکاندا زۆر زیاد دەکات وئەوانەی شوێنیان دەگرنەوەو پۆستەکانیان پردەکەنەوە بریتین لەموسڵمانەکان و هاوڵاتیانی وڵاتی سێهەم، ئەمەش واتە موسڵمانان دەچنە ناوجەرگەی هاوکێشە ئابووریەکانی ئەوروپاوە، کە ئەوروپاش پێی وایە کە ئاسایشی ئابووری هەروەکو ئاسایشە سیاسیەکەی وایە.

هەروەها (لویس) لە چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیەکەیدا دەڵێت: واپێشبینی دەکرێت وە بەپێ ئەو ڕاستیانەی کە ئێستا دەبینرێت ئەورووپا دەبێتە ئەورووپایەکی موسڵمان کە زۆربەی دانیشتوانەکەی موسڵمان دەبن لە کۆتایی سەدەی بیستویەکدا.[1]

## دواوتەی ئەم بەشە:

هەندێ لێکۆڵینەوەی تازە کە لە سەر هەندێ کەسی خۆبەخش ئەنجام دراوە لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، دەری خستوە کە گوێگرتن لە قورئانی پیرۆز دەبێتە هۆی گۆڕانکاری فسیۆلۆجی و خۆنەویست لە مرۆڤدا. یارمەتیدەرە لە هێمن کردنەوەی باری تێکچونی دەروونی و،لێکۆڵەرەوەکان دەریان خستوە کەگوێگرتن لە قورئان ئارام کەرەوەی لە ٩٧٪ ئەو حاڵەتانەیە کە تاقیکردنەوەکانیان لە سەر ئەنجام داوە و بۆتە هۆی هێمن کردنەوەی باری دەروونی ئەو خۆبەخشانەی کە تاقیکردنەوەکانیان لە سەر ئەنجام دراوە لە کاتێکدا کەسیان زمانی عەرەبی نازانن و، تاقیکردنەوەکان دەریان خستووە لە کاتی گوێگرتنی قورئاندا پلەی پێوەری نەخشەی مێشکیان لە خێرایی (١٢- ١٣) لە خولەکێکدا دابەزیوە بۆ پلەی هێواشی (٨-١٠) کە ئەمەیان حاڵەتی ئارامی تەواوی دەروونەو، لێکۆڵەرەوەکان تێبینی ئەوەیان کردوە ئەو خۆبەخشانەی کە زمانی عەرەبی نازانن لە کاتی گوێگرتن لە قورئان هەستیان بە ئارامیەکی قوڵ کردوە کە ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی قورئان هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله تعالى يتلون كتاب الله ويتدارسونه بينهم إلا نزلت عليهم السكينة وغشيتهم الرحمة وحفتهم الملائكة وذكرهم الله فيمن عنده"[2].

خوای گەورە بەم قورئانە پێغەمبەری پایەبەرزکرد﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴾ الشرح: ٤ هەرکەسیش شوێنکەوتەی قورئان بێت بە هەمان شێوە پایەبەرز دەبێت ﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴾ الزخرف: ٤٤، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (ان الله تعالى ليرفع بهذا القرآن اقواما ويضع به آخرين) ابن حبان عن عمر، هەرکسیش بانگەوازی بۆ بکات باشترین

١- پێگەی زاگرۆس.

٢- رواه مسلم.

کردەوە دەکات بۆ دنیاو قیامەتی ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ فصلت: ٣٣.. کەواتە با هەوڵبدەین بانگخوازبین وهەرچیمان بۆ دەکرێت بیکەین لەم بوارەدا و چاو لە هیممەت بەرزان بکەین تالەگەڵ ئەواندا حەشر بکرێین..

بانگخوازێك لە دەروازەی شاری (میونخ)ی ئەڵمانی لەوحەیەکی گەورە دەبینێت نووسراوە (تۆ نازانیت تایەی یوکوهۆما چ تایەیەکە)، ئەویش لەلایەوە لەوحەیەکی گەورەی دانا کە لەسەری نووسرابوو (تۆ نازانی ئیسلام چ ئاینێکە، ئەگەر دەتەوێت شارەزابیت بەم ژمارەی تەلەفونانە پەیوەندیمان پێوە بکە)..

خەڵکێکی زۆری ئەڵمانی پەیوەندیان پێوەکردو ئەویش وەڵامی گشت پرسیارەکانیانی دانەوەو لەسەر دەستیا لەساڵێکدا هەزار ئەڵمانی ژن و پیاو مسوڵمانبوون.. ئنجا بەهەوڵ و کۆششی هەموان مزگەوتێك و بنکەیەکی ئیسلامیان کردەوە کەبەردەوام دەرگای لەسەر پشت بێت بۆ هیدایەتی خەلکی.[1]..

بانگخوازێکیش لە هۆڵەندا هەرکات بواری ببوایە سواری شەمەندەفەر دەبوو ئنجا هەرکەسێکی بەدی بکردایە کە بەتەنها دانیشتووەو بە کەلکی ئەوە دێت ئیسلام وەرگرێت دەچووە لایەوەو باسی ئیسلامی بۆ دەکردو لەوسەریش کە دەگەڕایەوە بە هەمان شێوە دەچووە لای کەسێکی ترەوە، بەم ڕێگایەش چەندەها کەسی مسوڵمان کرد..

بانگخوازێکی تریش لە وڵاتێکی کەنداو کە خەڵکی بیانی زۆری لێیە، بە چەند زمانی وەك ئینگلیزی و بەنگلادیشی و یابانی و چینی لەسەر لەوحەیەك کەدائەنرێت لەبەردەم جامی ئوتومبێلدا بۆ گەرما لە کاتی وەستاندا نووسیبووی: ئەگەر دەتەوێت فێری ئیسلام ببیت پەیوەندیم پێوەبکە، بەمەش کە دەهاتەوە چەند کەس بیویستایە لێی کۆدەبوونەوەوئەمیش سندوقی ئوتومبیلەکەی بۆ دەکردنەوە کە چەندەها کتێبی تیابوو بەو زمانانە و دەیخستە بەردەستیان، چ کتێبێکت دەوێت بیبە، کەئەمەش زۆر جار دەبووە مایەی هیدایەتیان.

بە کورتی و بە کوردی هەرچیت بۆ دەکرێت بۆ دینی خوا بیکە ئەمڕۆ دنیایەو سبەینێش مەحشەر، تەنها خوا دەزانێت کەی و لە کوێ تەواو دەبین، ئاشکرایە هەمووشمان مردنێك قەرزارین..

---

١ - گۆڤاری (الرسالة)، ژمارە: ٢٦.

باشە لەفەرموودەدا نەهاتووە هەرکەس زانستێکی لابێت و بیشارێتەوەو نەیگەیەنێت، خوا لە قیامەتدا لغاوی ئاگرین دەکاتە دەمی، باشە لە فەرموودەدا نەهاتووە کە لە قیامەتدا خوای پەروەردگار گلەیی لە بەندەی خۆی دەکات و دەفەرموێت: یا عبدي استسقيتك فلم تسقني؟ ئەی بەندەی من داوای ئاوم لێکردی و نەتدامێ؟ ئەویش دەڵێت: پەروەرگار کەی تۆ پێویستت بە ئاو بووە تا من بتدەمێ؟ پەروەردگاریش دەفەرموێت: فلان عەبدم داوای ئاوی لێکردی و نەتدایە ئەگەر بتدایەتێ ئێستا لای من دەستت دەکەوتەوەو وەکو دابێتت بەمن وابوو!

باشە ئەگەر کەسێك تینووی ئیمان و باوەڕبێت کە دنیاو قیامەتی وەستاوەتە سەری و فریای نەکەوین، ئەبێ خوای پەروەردگار چەند سەرزەنشتمان بکات؟

بەڵێ با هەردەم لە یادمان بێت کە بوونمان بەهۆی هیدایەتی کەسێك بەهێنەدەی دنیاو هەرچی تیایە خێرمان دەست دەکەوێت ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ فصلت: ٣٣.. بە تایبەت لەم سەردەمەدا کە دوژمنان بە هەموو شێوەیەك خەریکن خەڵکی لەڕێی ڕاست دووربخەنەوە.. ئەوەتا سەرۆکی ئەمریکی نیکسۆن لەپەڕاوەکەیدا (نصر بلا حرب)دا دەڵێت (گێژەڵویەکی ئیمانی لەرۆژهەڵاتەوە هەڵیکردووە، ئەگەر نەتوانین ڕێی لێبگرین هەوڵدەدەین ڕێرەوەکەی بگۆڕین) بۆیە دەبێت هۆشیاربین ونەکەوینە داوی دوژمنانەوەو بەرچاوڕوون بین لە بانگەوازەکەماندا و کۆڵنەدەین.. هەرشادبن .

## پێشەکی:

سوپاس و ستایش بۆخوای پەروەردگاری‌جیهان و درودو سەلامیش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یارویاوەران و شوێنکەوتوان..

هاتن بەرەو ئیسلام، هاتنە بەرەو دوابەرنامەی خوایی بۆ مرۆڤایەتی، کە تەواوترین وڕاسترین بەرنامەیە و، ئەو ڕێبازەیە کەخوا ڕازی لەسەرە پەیڕەوو پرۆگرامی شادەمیزاد بێت هەتا ڕۆژی قیامەت ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴾ المائدة: ٣.

بەڵێ.. قورئان گەورەترین نیعمەتی خوایە کەبەخشیویەتی بەمرۆڤ چونکە ئارامی وناسوودەیی دنیاو قیامەتی بۆ دێنێ.. ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴾ طه: ١٢٤. ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨.

هەرکەسێ بەوردانەوە سەیری باروگوزەرانی خەڵکی ئەم سەردەمە بکات بە ئاشکرا دەبینێت دوور لەخوایی یانی چی؟! ئەوەتا نەخۆشییە زایەندییەکان وەك ئایدزو ئەوانی تر بەملیۆنەها مرۆڤ لەناو دەبەن و تاوان و کوشتن و بڕین و دەست درێژی‌کردنە سەرناموسی ئافرەتان وچەوساندنەوەی گەلان و سووخواردن بە ملیۆنەهای تری داماو و سەرگەردان کردووە.

کێشمەکێشی نێوان هەق و ناهەقیش بەردەوامەو دوژمنان لێناگەڕێن کەبڕواداران هەروا دانیشن و، خەڵکی بە خواهێشتی خۆیان دوای هەق و ڕاستی بکەون، شەو و ڕۆژ لەهەوڵدان و بەردەوام پیلان دادەنێن ﴿ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ﴾ سبا: ٣٣.

لە کۆبونەوەیەکدا باس لەوە کرا کەعبە بڕوخێنن، یەکێ لە ئەحبارەکانی جوولەکە کە ناوی(شاحوم مینان)ە وتی: (من وەك ئێوە بیر ناکەمەوە (کەعبە)ی پەرستگای موسڵمانان بڕوخێنین، چونکە ئەوە زیاتر ڕقیان هەڵدەستێنێ وهەست وهۆشیان دەهەژێنێ، بەڵام ئەتوانین وایان لێبکەین کە پیرۆزی کەعبەیان لانەهێڵێن و وەك بینایەکی بەردی کەلەپوری باوباپیران سەیری‌بکەن و، هەروەها وایان لێبکەین کەلەگەڵماندا ڕووبکەنە (قدس الاقداس) لەشاری قودس).

موسڵمانان لاواز و ژێردەستەن چونکە لەم کێشمەکێشەدا دەستیان لە بەرنامەکەی خوا بەرداوەو دوای بەرنامەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کەوتوون، لە کاتێکدا گاورەکان ساڵانە سێسەد ملیار دۆلار کۆدەکەنەوە بۆ بەگاورکردن و جولەکەکانیش تابتوانن پابەندی بیروباوەڕی خۆیانن.

کاتێك (بیگن) هاتە میصر بۆ بەشداریکردن لەناشتنی (سادات)دا، لە (منصە)کەوە بۆ (ئوتێل)ەکەی کەسێ کیلۆ مەتربوو ڕازی نەبوو سواری ئۆتۆمبێل بێت و، وتی: ئەمڕۆ ڕۆژی شەممەیەو لەڕۆژی شەمماندا ئێمە سواری ئوتۆمبیل نابین، چەند تکاو ڕجایان لێکرد سوودی نەبوو، وتی: ئەگەر وانەبێت دەگەڕێمەوە، ئەمەش ئیحراجیەکی زۆری بۆحکومەتی میسری دروستکرد کەناچاربوو لەو ڕێگا دوورودرێژەدا پۆلیس و ئاسایش بڵاوبکاتەوە بۆ پاراستنی ناوبراو. ئەمە بێجگە لەوەی لە (کنسیت) تەورات ناخوێنێ تا (کڵاوە) ڕەشەکە نەکاتە سەری.[1]

ئەوان ئاوا پابەندن بە خورافیات و جەهالەتی خۆیانەوە و، ئاوا خۆشیان پیشان دەدەن، جائەوە چارناکرێ مەگەر بەعەقیدە و بیروباوەڕێکی وەك ئیسلام کە بڕواداران بەچاکی پابەندی بن.

لەم بەرگی دووەمەی بەرەو ئیسلام بەناوی (ئاسوودەیی) باس لە پیلانی دوژمنان و گەورەیی ئیسلام وهاتنیخەڵکی بەرەو ئیسلام دەکەین کە هیوادارین جێی سوودو ڕەزامەندی هەموولایەك بێت.

## حاڵی ئوممەت :

دکتۆر عبدالله النفیسی کە پیاوێکی سیاسەتمەداری کوەیتی‌یە لە وتارێکیدا لەژێر ناونیشانی (أي مستقبل للأمة في زمن الاحتكارات)دا دەڵێت: نیزامی دەولی بەلای منەوە دوو ئەڵقەیە، یەکەمیان ناوی ئەنێم وڵاتانی مەرکز(دول المركز) کە ئەمەریکاو ئەوروپای ڕۆژئاوایەو، ئەڵقەی دووەمیشیان کە فراوانترە ناوی دەنێم وڵاتانی دەوروبەر (دول الأطراف) کە هەموو وڵاتانی تر دەگرێتەوە بێجگە لە ئەمەریکا و ئەوروپای ڕۆژئاوا.. جا وڵاتانی مەرکەز (ئەمریکا و ئەوروپا) بەچوار هۆکار دەستیان گرتووە بەسەر باقی وڵاتانی تردا:

---

١- موقع العودة الاسلامي: /٢٠٠٦/٣/٢٧.

## یەکەم: قۆرخ کردنی هەموو تەکنیکی سەربازی بۆخۆیان:

ئەمریکاو ئەورووپای ڕۆژئاوا ئەوهەقەیان داوە بەخۆیان کەپیشەسازی چەك و تەقەمەنی بەهەموو جۆرەکانیەوە قۆرخ بکەن بۆخۆیان و،قەدەغەیە ولاتانی تر بێجگە لەخۆیان دەست بخەنە ئەوپیشەسازی‌یە گرنگەوە.

ئەمریکا و ئەورووپا شپرزەبوون کاتێك نجم الدین ئەربکان وەزیری پیشەسازی بوو لەتورکیا، بەتایبەت کاتێك ناوبراو داوای لە ئەنجومەنی وەزیران کرد کە دەست بکرێت بەدروستکردنی فیشەك وگوللە تۆپ واتە (زەخیرەی چەك) بۆ سوپای تورکی، بەهەموویان کەوتنە فشارخستنە سەرحکومەتی تورکی و بە پیلانێك ئینقلابێکی سەربازیان بەسەر نجم الدین ئەربەکاندا کردو لەبەندیخانە توندیان کرد، ئەمە لەبەر ئەوەی کە ئەربەکان تەنها بیری لەو بوارەکردەوە و بەمەترسیان زانی لەسەرخۆیان.

چەك وتەقەمەنی، دروستکردنی، فرۆشتنی، بلاوکردنەوەی، بەخشینی، نەبەخشین و قەدەغەکردنی‌ئەبێت بەدەست ئەمریکاو ئەورووپای ڕۆژئاوا بێت و سەرجەم ولاتانی تریش لەسەریانە ئەو چەك و تەقەمەنی یە سەرف بکەن.

دیارە ئەوەی‌تەحەکوم بەچەك وتەقەمەنی بکات، هەرئەوە تەحەکوم بەجەنگ دەکات و هەرئەویشە تەحەکوم بەئەنجامی جەنگ و کاتی بەرپابوون و وەستانی دەکات.

هەرلێرەشەوەیە کە ڕێیان داوە بەحکومەتی ئیسرائیل چەکی ئەتۆمی هەبێت و هەروەك دەلێن (٢٥٠) کلاوەی ئەتۆمی هەیە لە مەفاعیلی دیمونا لە بیابانی نەقەب و، ڕێنادەن ولاتانی ئیسلامی هیچیان هەبێ، تاهەردەم ئیسرائیل زاڵ بێت بەسەر عالەمی ئیسلامیدا.

من وانازانم جولەکە دەستی کێشابێت بەسەر ئەمریکاو ڕۆژئاوادا، ئەو ئەوەندە مەزن نی‌یە بتوانێ کاری وابکات، بەلکو بەلای منەوە جولەکە عەسای دەستی ئەمریکایەو هەرکاتێ بیەوێ عەرەبی پێ سەرشکێن ئەکاو ئەگەر سنوری سوریان بەزاند تەمێیان دەکات.

دەست گرتن بەسەر تەکنیکی سەربازی دا مایەی سەیتەرە کردنە، ولاتانی ئێمە والایە لەبەردەم دوژمناندا، هەرکاتێك بیانەوێ تازەترین چەك بەسەرمانا تاقی دەکەنەوە..

لەساڵی (١٩٧٥)دا کاتێك ولاتی عەرەبی سعودی ودەوڵەتی ئیماراتی عەرەبی ویستیان نەوت نەدەن بە ئەمریکا لەزەمانی (فیصل کوری عبدالعزیز)دا، ئەمریکا هەڕەشەی لە ولاتانی

کەنداو کرد، کە ئەگەر وابکەن ئەوا شریتی نەوت لە کوەیتەوە تا سەڵتەنەی عومان دەگرێت، وە ئەمەشی خستە بەردەست کۆنگرێسی ئەمریکی و، ئێستاش ئەو پلانە بڵاوکراوەتەوەو هەرکەس بیەوێ دەتوانێ بیخوێنێتەوە.

دوای هێنان و بردن و ڕاگۆڕینەوە کۆنگرێسی ئەمریکی وتی: پێویست بە داگیر کردنی سەربازی ناکات، چونکە ئەو وڵاتانە بەنرخی گونجاو نەوت ئەدەن بە ئەوروپاو ئەمریکای ڕۆژئاوا..

بەڵا ئەمریکاو ئەوروپا لەڕێی حیلفی ئەتڵەسی‌یەوە کە لیژنەی تایبەت و شارەزای زۆری هەیە چاودێری ئەو وڵاتانەی تر دەکات کەئەبنە خاوەنی تەکنیکی سەربازی و هەردەم لەدواوە بن لەو بوارەدا..

## دووەم: دەست گرتن بەسەر مەوادی ئەوەلی و خامدا:

### ١- دەستگرتن بەسەر نەوت دا:

وڵاتانی مەرکەز (ئەمریکاو وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا)، دەیانەوێت هەموو کێڵگەکانی نەوت و بیرە نەوتەکان لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندا بێت، دیارە عێراقیش لەپێش هەموانەوەیە، خۆئەم جەنگەی دوایی تەنها بۆ لابردنی (صەددام)ی دیکتاتۆر نەبوو، لەبەر چاوی کاڵی عێراقیەکانیش نەبووکە ئەمریکا هەزاران سەربازی خۆی بەکوشت دا، بەڵکو بۆدەست گرتنە بەسەر نەوتدا، لە دەرهێنان و گواستنەوە و فرۆشتن و نرخ داناندا..

ئەم وڵاتانەی خۆمان ڕاستە نەوت بەرهەم دێنن بەڵام تائێستا بۆیان نییە کەشتی بارهەڵگری نەوتیان هەبێ، بۆیان نییە سوود لەو نەوت گواستنەوەیە وەرگرن، هەموو ئەوانە (دەرهێنان، گواستنەوە، فرۆشتن، نرخ) بەدەست حەوت کۆمپانیای ڕۆژئاواوەن و دەستیان گرتوە بەسەر نەوتی سەرووی ئەفریقیاو عێراق و نیوە دورگەی عەرەب دا..

کەواتە تا ئێستا ئەو نەوتە بەکاردێت بۆ بەرژەوەندی ئابوری وڵاتانی مەرکەزو، بەکارنایەت بۆ تەنمیە و بەرەو پێشچوونی وڵاتانی خاوەن نەوت، نەوت ئەمڕۆ تەنها بۆدەستکەوتنی ووزە نییە، بەڵکو بۆ (نفوذ) و دەسەڵاتی نێو دەوڵەتییە.

پیشەسازی چین دێوەزمەیە بۆ ئەمریکا و، پێویستی بەنەوتی زیاترە لە عێراق و کەنداودا، بەڵام چونکە ئەمریکا دەستی گرتووە بەسەر ناوچەکەدا، ئەوا دەست دەکێشێتە

پەیوەندی نێوان چین و وڵاتانی نەوتەوە، بەمەش تەوق دەکاتە گەردنی تەنیەوپیشەسازی چینەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەمریکا بەوریایی و دوودڵیەوە لەگەڵ کێشەی کۆریای باکوردا مامەڵە دەکات، لەترسی ئەوەی ئەك وڵاتی چین بێتە سەرخەت و هاوکاری کۆریای باکور بکات و هەردووکیان بەهێز بن، ئەمریکا دەیەوێت (چین) سەرقاڵ بکات بەجۆرێك کە نەبێتە مونافیسی.

هەروەها (یابانیش) هەمان مەسەلەیەو ئەویش پێویستی بەنەوتەو ئەوەندە مەوادی ئەوەلی و خاماتی نیە مونافەسەی وڵاتانی تربکات، هەرچەندە دەستی کارکردنی زۆرە وتەکنیکی پێشکەوتووە.. یابان پێویستی زۆری بەنەوتە و نەوتیش لەژێر دەستی ئەمەریکا و ئەوروپای خۆرئاوادایە لەجیهاندا.

ئەوروپای خۆرئاواش پێویستی زۆری بەنەوت هەیە بۆ بەرەو پێشچوون و تەنیە، ئەمەریکاش ئەوەندە ڕێ بەوان نادات کە لە بەرژەوەندی هاوسەنگی ئیستراتیجی خۆی و ئەوروپادا بێت و، ئەبێ ئەوەش بزانین کە جیاوازی گەورەو ڕاجیایی زۆر هەیە لەنێوان ئەمریکاو ئەوروپادا.

کیسنجەریش کە ئەندازیاری سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکایە زۆری لەم بارەیەوە نوسیوە، بەتایبەت پەڕاوە گەورەکەی (الشراكة المضطربة)، کەباس لەجیاوازی نێوان ئەمریکا و ئەوروپا دەکات.

تائێستا ئەوروپا ناتوانێ پیاوانی ئاسایشی تەواو دابین بکات بۆ پاراستنی شارە سەرەکیەکانی و وەزعێکی شپرزو شێواویان هەیە و تا ئێستا لەژێر سێبەرو باڵی ئەمریکیەکاندا دەژین و ئەترسن بدەن بە ئەمەریکاداو، حیلفی ئەتڵەسیش وا لە ژێر ئیرادەی ئەمریکادا.

٢- دەست گرتن بەسەر گەنم دا:

کیسنجەر لەساڵی (١٩٧٥)دا سەری دا لەنیوە دورگەی عەرەب و، لەباسەکانیاندا چوونە سەر مەسەلەی چاندنی گەنم لە وڵاتی سعودیەدا، بە بێزاریەوە پرسی: گەنم بۆ دەچێنن؟ ئێمە دەتوانین گەنمتان بۆ بهێنینە میناى جدە بەنرخێکی کەمتر لەوەی کەلای ئێوە تێی دەچێت، ئیتر بۆچیتانە؟ پێیان وت: مەلیك فەیصەڵ کوڕی عبدالعزیز دەیەوێت ئیکتیفای زاتی خۆراك بکات لە سعودیەداو، زەوی باشمان هەیە بۆ ئەو مەبەستەو بەچاکی دەزانین سوودی لێوەرگرین.

ئەمریکا لەمە بێزار بوو، کیسنجەر لە فرۆکەخانەی ریاج کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی گرت وبەزمانێکی هەڕەشە ئامێز وتی: (چیتان ئەوێ بیکەن لە نیوە دوورگەی عەرەبدا، دوارۆژ بۆتان دەردەکەوێت کە ناتوانن نەوت بخۆنەوە)، مەبەست ئەوەبوو ئەگەر ڕازی نەبن دەست بگرین بەسەر نەوت و گەنم دا دوارۆژ واتان لێدەکەین پەشیمان ببنەوە.. بەڵێ.. بەدەست گرتن بەسەر نەوت دا دەستیان گرتوە بەسەر تەنیەدا و، بەدەست گرتن بەسەر گەنم دا دەستیان گرتووە بەسەر گەدەی خەڵکیداو کەی بیانەوێ برسیان دەکەن.

## هۆکاری سێیەم:

**شەرعیەتی دەولی:** کە ئەمرۆ لە نەتەوە یەکگرتوەکاندا خۆی دەبینێتەوە، وڵاتانی مەرکەز (ئەمریکاو ئەوروپای خۆرئاوا) نەتەوە یەکگرتوەکان وەك ئالەتێك یان قەڵغانێکی یاسای نێو دەوڵەتی بەکاردەهێنن بەرامبەر بەجیهان، ئەوان دەستیان گرتووە بەسەر مەجلیسی ئەمن داو هەقی (ڤیتۆ)یان هەیە، کەی ویستیان بڕیار دەدەن کە ئەم دەوڵەتە لەیاسا دەرچووە، ئەو دەسەڵاتە دیکتاتۆرە و،ئەو وڵات و دەسەڵاتە ڕێئەدرێ بمێنێ و، ئەو وڵات و دەسەڵاتەش نابێ بمێنێ.

ئەم دەست بەسەرا گرتنەش لە دانانەوەی (بطرس غالی)دا دەرکەوت کە لە بەرژەوەندی وڵاتانی ترو فەرەنسادا بوو کە بمێنێ و لە بەرژەوەندی ئەمریکاو ئەوروپادا نەبوو، بۆیە فشاری زۆریان دروستکردو کوفی ئەنانیان دانا بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیەکانیان.

## هۆکاری چوارەم: عەولەمەی ثقافە و ڕاگەیاندن :

ئەمریکا و ئەوروپای رۆژئاوا لەرێی عەولەمەی ثقافە و ڕاگەیاندنەوە دەستیان گرتووە بەسەر وڵاتانی تردا، ماوەیەك لەمەوبەر لەناوچەی کەنداو (شریتی نەوتی لەکوەیتەوە بۆ سەڵتەنەی عومان) بەداخەوە پێشوازی (لیز چینی) کچی (دیك چینی) کرا هەروەك دەرگای داهاتوومان بۆبکاتەوەو، فەتحمان بۆ بکات!

بەڕێزیشیان لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا وتی: (من شووم نەکردووە وشووش ناکەم، من (سحاق)یم و بڕوام بە شووکردنی ژنە بە ژن و پیاوە بە پیاوو هەتا ئەشمرم هەروا ئەبم) ئەم عاجباتیە بەرپرسان و وەزیرەکان پێشوازیان لێکرد و ئەویش بەوپەڕی جورئەتەوە پیێ وتن:

(پێویستە چاو بە بەرنامەکانی خوێندنتانا بگێڕنەوە و پێویستە ئەوە فێری منداڵەکانتان بکەن و ئەوەشیان فێرنەکەن)..

(لیز) گەڕا بەسەر وەزارەتەکانی پەروەردەو فێرکردندا لە وڵاتانی کەنداوداو چاوپێکەوتنی کرد لەگەڵ لیژنەکانی مەنهەجی خوێندنداو پێی ڕاگەیاندن: (ئەبێ ئەم پەڕاوە بخوێنرێ و ئەو پەڕاوەش نەخوێنرێت! ئەبێ ئێوە گرنگی بدەن بەثقافەی موستەقبەل و خۆشەویستی نێوان گەلان! ئەم ئایەتانەش کەباسی جولەکە دەکەن لەقورئاندا ڕق و قین دروست دەکەن لەناو گەلاندا، بۆیە دەبێت هەریەتەواوی لایبەن و لەبیری عەرەب وموسڵمانانی بەرنەوە)..بەڕاستی مامەڵەی ئەمریکا لەگەڵماندا بەم لووت بەرزییە بەڵگەی گەورەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (کما تکونوا یُوَلَ علیکم).

هەرچۆنێك بێ کاربەدەستانیشتان وادەبن! دیارە ئێمە موستەحەقی ئەوەین، ئێمە وازمان هێناوە لەهەقی خۆمان و لەناسنامەو عەقیدەو داهاتومان! تا وامان لێهات ئەم عاجباتییە ببێتە ڕێنماییکار ومامۆستامان و ئەو ڕێمان بۆ دانێ چی‌بکەین وچی نەکەین، چ سوکی و ڕیسواییەکە ئێمە پێی گەیشتوین؟! بەڕاستی گەیشتوینەتە حاڵێك کە هەقە ئیتر وریابینەوە! ئێستا لە قەتەر دەزگایەك هەیە بەناوی (ڕاند کوربریشن) کە چەترێکی گەورەی دەزگای سیخوڕی ئەمریکایە بۆ یاری کردن و دەست وەردان لەبەرنامەی خوێندنی شریتی نەوتی (کوەیت تا سەڵتەنەی عومان).

(شاریل بنار) کە ئافرەتێکی نەمساوییەو لەقەتەر دانەنیشێ و هاوسەری (زەڵمای خلیل زاد)ی سەفیری ئەمریکایە لەبەغداد، دیراسەیەکی بڵاوکردەوە لەدەزگای (ڕاند) ەوە بەناوی ئیسلامی دیوکراتی! کەتیایا دەڵێت: چۆن مامەڵە بکرێت لەگەڵ ئیسلامداو، هەروەها چۆن مامەڵە بکرێت لەگەڵ حەرەکاتی ئیسلامیدا، گوایا هەندێ حەرەکاتی ئیسلامی هەیە دەبێت دوور بخرێنەوە و هەندێکی تر هەیە نزیك بخرێنەوە و هی واش هەیە ئەبێ ڕیشە کێش بکرێن..

جا ئەم دیراسەیە بۆتە بەرنامەی دەزگاکانی ئاسایشی وڵاتانی کەنداو و بەموو لێی لانادەن!.

بەڕاستی ئەوەیە واقیعی نیزامی دەولی کەتیایدا ئەژین، دەستگرتن بەسەر چەك و تەقەمەنی و پیشەسازی سەربازیداو، دەستگرتن بەسەر نەوت و گەنم ومادده خامەکانداو دەستگرتن بەسەر شەرعیەتی دەولی و عەولەمەی ثقافی و ڕاگەیاندندا.

ئەمریکا بۆ چەسپاندنی ئەم دەسەڵاتە لە کۆنگرسەوە چەندەها یاسای دەرکردووە، وەك یاسای پاراستنی کەمایەتییەکان لەجیهاندا،کە بەهۆیەوە کەی بیەوێ گورزی خۆی دەوەشێنێ بەناوی پاراستنی کەمایەتیەکانەوە لە وڵاتاندا.

ئەمریکا سەرپەرشتی کۆبوونەوەیەکی کرد بۆ توندڕەوە قبتییەکان لەئەمریکاو پاڵپشتی خۆی بۆ ڕاگەیاندن کە هەرچی دەکەن بیکەن و لە کەس نەترسن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان هەڕەشەیان لەمیسر کرد، لەکاتێکدا ئەو ماف و دەسەڵاتەی کە قیبتییەکان هەیانە لە میسردا لەهیچ وڵاتێکی ڕۆژئاوادا نیانە.

نامیلکەیەکی بچکۆلە کە مارۆنی مەسیحی (ڤیکتۆریا سحاب)ی لوبنانی نوسیویەتی و هەر ئەویش پێشکەشی کردووم، بەناونیشانی (کێ گاورە عەرەبەکان دەپارێزێ)، لەو نامیلکەیەدا دەیسەلمێنێ کە بە درێژایی مێژوو، ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامی گاورە عەرەبەکانیان پاراستوە نەك ڕۆژئاواو خاچپەرستان کە لە ڕۆژئاواوە هاتن، تەنانەت خاچپەرستان بوونە مایەی نارەحەتی و ئازاری زۆر بۆ گاورە عەرەبەکان.

لەکوەیت دا گاوری کوەیتی نیە، بەلاّم (١٩٢) کەسی گاور لەفەلەستین و عێراق و شامەوە لەسییەکان و چلەکانەوە، کەپزیشك و پەرستیار (ممرضة) و وەرگێڕ بوون، بۆئیش کردن هاتنە کوەیت و ژیانێکی خۆشی پڕ ڕەفاهیەت دەژین و جنسییەی کوەیتیشیان وەرگرتوە، کەچی (٣٥) کەنیسەیان بۆ بنیاتنراوە، واتە هەر پێنج کەس و کەنیسەیەك (ئەمە بێجگە لەوەی ئێستا داوای کردنەوەی کەنیسەی تریش دەکەن) !! ئاخر باشە ئەمە مانای چی؟!

ئەمە مانای وایە کە ئەمریکا دەیەوێت بەهۆیەوە دەست بکێشێتە ناو کوەیتەوە و مەسەلەکە سیاسیە نەك ئاینی، ئێستا ئەمریکیەکان لە داگیرکردنەوە بەرەو نیشتەجێ بوون دەچن لەم وڵاتە ئیسلامیانەدا!

جاران لە فرۆکەخانەکانمان پێشوازی ئەمریکیە سورو سپی‌یەکانمان دەکرد بەخۆیان و جانتاکانیانەوە، کە بەعەقدی ئیش کردن دەهاتن! بەلاّم ئێستاخۆیان ومالّومندالّیان دێن لەئەمریکاو ئەوروپای ڕۆژئاواوە بۆ نیشتەجێ بوون لەکەنداودا.

ئەوان زۆر هەولّیاندا بۆ دەستکاری کردنی یاسای ئەم وڵاتانە تا بتوانن هەقی مولّکداری و مانەوەی بەردەوامیان هەبێ!

هەقە بپرسێ مەبەست چییە لە هاتنی ئەم هەموو ئەورووپی و ئەمریکی‌یە بۆ ولاتانی کەنداو؟ با دوو حالەتتان بۆ باسبکەم لە سنغافورەو تەیموری ڕۆژهەلات:

ئێستا سنغافورە دەولەتەو لەسالی (١٩٦٥ز) دا دامەزرا، بەلام چۆن دروست بوو؟!

سنغافورە بەشێك بوو لە فیدراڵیەتی ئیسلامی مالیزی، جا ڕەنگە بزانن کە دوو نەتەوە هەیە لەمالیزیا (مالیلیە) و (چینی یەکان)، کاتێك ئینگلیز زانی ئەبێ سنغافورە بەجێ بهێلێ، هانی چینی ڕەگەزەکانیان دا کە کۆچبکەن بۆ سنغافورە، ئەوانیش ژمارەیەکی زۆریان کۆچیان کرد بۆ ئەو ولاتەو، لەبەرئەوەی کەلەژێر دەسەلاتی بەریتانیادابوو دەرگایان بۆ خستنە سەر پشت و کاتێك چینیەکان زۆر بوون پێیان وتن: (ئێستا ئێوە زۆرینەن و حەقی دیاریکردنی چارەنووسی خۆتان هەیە).

ئینگلیز پەیوەندیان کرد بە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە و هێنایانن بۆ ناو مالیزیا بۆ ڕاپرسی، بەو جۆرەو بەنەخشەی ئینگلیز چینی‌یەکان بڕیاریان دا جیاببنەوە لە فیدراڵیەتی ئیسلامی مالیزی ولاتێکی تازە لەدایك بوو لە سالی (١٩٦٥) ز دا بە ناوی سنغافورە و سەرۆك وەزیرانی(لیکوان یو) بوو کە ئەصلی چینی‌یەو، من دەیناسم بەهۆی ئەوەی کەئەو دەرچوی کۆلێجی (چەرچڵ)ە لە (کامبریدج)، کەمنیش هەر لەوێ دەرچووم و زۆر قسەو باسمان کردووە بەیەکەوە و جەختی ئەکردە سەر ئەوەی کە ئینگلیز سنغافورەیان دروستکرد بۆ لاوازکردنی مالیزیا.

تەیموری ڕۆژهەلاتیش، لەناوەڕاستی ئەرخەبیلی ئیسلامی ئەندەنوسیا بوو، ئەندەنوسیاش گەورەترین دەولەتی جیهانی ئیسلامی یە لەژمارەی دانیشتواندا، ڕۆژئاوا کەوتنە پیلان گێڕان و کەنیسەو مەجلیسی کەنائیسی جیهانیان جولاند لەگەڵ مەجلیسی ئەمن دا، ئنجا بارو وەزعێکیان درووستکرد کەبووە مایەی جیابوونەوەی تەیموری ڕۆژهەلات لە ئەندەنوسیا و لە ژێر حیمایەتی نێو دەولەتیدان.

بەڕاستی ئێستا حالەتێك هەیە لە ولاتانی کەنداو و نیوە دورگەی عەرەبدا، کە دەمانەوێت هەموان ئاگادارکەینەوە لێی، ئەوەش ئەوەیە کەئەمریکاو ئەورووپیەکان وەکو وتمان لەحالەتی داگیرکردنەوە — کە هەموو ئەو ولاتانەیان داگیرکردووە و بڕیاری ئیستراتیجی بەدەستی ئەمریکایە نەك کاربەدەستان - دەڕۆن بەرەو حالەتی نیشتەجێبوون، کێ دەلێ سنغافورەکە دووبارە نابێتەوە؟ من بۆخۆم سێ سال لە ئیمارات دەمخوێند لەسالی (١٩٨١) تا

(١٩٨٤) و که به شەقامەکانی دوبەی دا دەڕۆشتم وام هەست دەکرد بە شەقامێکی لەندەن دا دەڕۆم، ئەوەندەم بیانی دەبینی!

جارێکیش چووم ئۆتۆمبیلێک بکرم، تا ئۆتۆمبیلەکەم وەرگرت هەرچیم بینی لە کۆمپانیاکەدا هەرهەمووی بیانی بوون!

دەڵێن دانیشتوانی ئەسڵی دوبەی لەسەدا پێنج یان لەسەدا حەوت دەبن، دیارە ئەمەش کێشەیەکی ئەمنی دروست دەکات، ئەگەر ئەو بیانیانە بیانەوێ هەر بەبێ چەك و بەچەپلە هەموو خەڵکی دوبەی دەکەنە دەرەوەو، شۆڕشێکی سپی دەکەن بەسەریاندا!

یەمەن و سعودیەش تائێستا باشترن کە ئەمریکاو ئەوروپا لەلایەنی ثقافی و کۆمەڵایەتیدا نەیانتوانیوە زۆر کاریان تێبکەن، ئەمەش خۆیان باش لێی حاڵی بوون، بۆیە ئەمریکا لە ڕێگەی (راند کورپریشن)ەوە دەیەوێ دینداری یەمەن و نیوە دوورگەی عەرەبی هەڵوەشێنن، لەڕێی هاندانی ئافرەت و دەوری سیاسی زیاتری ئافرەتان، بۆیە لەپڕ بینیمان هەندێ لەبەرپرسە عەرەبەکان کە تائێستاش لەعەصری عەباسیدا دەژین وهێشتامافی پیاوانیان نەداوە، باس لەمافی ئافرەتان دەکەن..

ئێمە واین لە دووڕیانێکی مێژووییدا، منظمەی تیجارەی عالەمی دەیەوێت هەموو ئەم وڵاتانە بکاتە بازاڕ بۆ ئەمریکاو دەیانەوێ دنیا ملکەچ بێت بۆیان! (لێرەدا قسەکانی نەفیسی تەواو بوو) .(بۆ زانین ئەم دەزگای راندە ئیستراتیجیەتی جەنگی ساردی (٢٠٠٧) ی کە بۆ خۆی دیاری کردبوو بریتی بوو لە هەڵوەشاندنی ئیسلام لەناوەوەی خۆیدا لە عەقیدەو شەریعەتدا، بەڵام خەیاڵیان خاوە وەعدی خوایە کە کافران بێهیوان لە هەوڵەکانیان و مێژووش شایەتە ﴿ ۞ ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ المائدة: ٣.

## دەزگاكانی لێكۆڵینەوە:

لەرۆژئاواو ئەمریكادا بیریارو توێژەرەكانیان بەردەوام لە دیراسەو لێكۆڵینەوەدان و زۆر پەراوو لێكۆڵینەوەی گرنگ ناو بەناو دەخەنە بەردەست و، بۆئەم كارەش بەملیۆنەها دۆلار خەرج دەكرێت، لەو لێكۆڵینەوانەش:

(بات بۆكانان) كەخۆی هەڵبژاردووە بۆ سەرۆكایەتی ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لەساڵی (١٩٩٢) و (١٩٩٦) داو، نزیك و راوێژكاری سیان لەسەركردە ئەمریكیەكان بووە و خاوەنی چەندەها پەراوەو لەیەكێكیاندا دەڵێت: ئەمریكاو ئەورووپا بەرەو مردن و تیاچون وتوانەوە دەچن ئەگەر بەخێرایی بە سیاسەت و وەزعی خۆیاندا نەچنەوە و راستی نەكەنەوە، گەورەترین مەترسیش كە هەرەشەیان لێدەكات لە دوو خاڵدا خۆی دەبینێتەوە، كەمبوونەوەی رێژەی لەدایك بوونی منداڵ و زۆری شەپۆلی كۆچكردن بۆ ئەمریكاو ئەورووپا لە ولاتە ئیسلامیەكانەوە.

كەمبوونەوەی رێژەی منداڵ بوونیش دەگەرێتەوە بۆ بیروبۆچونێكی كۆمەلایەتی كە گوایە ژیان و مەبەست لەژیان لەززەت و رابواردنە بەهەموو جۆرەكانیەوە وخێزانیش بۆتە بارێكی گران و كەم كەس شان ئەداتە بەری، بەتایبەت كە تێركردنی هەواو ئارەزوو بەربەرەلایەو لەهەموو لایەكەوە دەست دەكەوێت.

جا چینێكی بەرفراوان هاتونەتە پێشەوە كە بروایان بە هاوسەرگیری نەماوە و هەموو هەوڵیان پارە پەیداكردن و بازرگانی ودەوڵەمەند بوونە و، ئافرەتانیش لەبەر ئیشی ناوكارگەكان و دەرەوەی كارگەكان نایانپەرژێتە سەرماڵ و منداڵ وخێزان و منداڵ بوون.. لەم لاشەوە كۆچكردنی بەردەوامی موسڵمانان بۆرۆژئاوا و رێژەی منداڵبوونی زۆریان، بەڵگەو ئاماژەیەكی ئاشكرایە لەسەر تیاچوون و قربوونی رۆژئاوا.

بەڵێ.. ئەمریكاوئەوروپای رۆژئاوا لەرێی لێكۆڵینەوەی زۆریان لەهەموو بوارێكدا دەستیان گرتووە بەسەر جیهانداو لەم پێناوەش دا سوود لە رۆشنبیرو كەسانی پسپۆرو شارەزا وەردەگرن..

## لەڕێ لادانی ئافرەتی ئەمریکی:

پەڕاوێکی نووسەری ئەمریکی (دکتۆر هنری ماکور) بەناوی (لەڕێ لادانی ئافرەتی ئەمریکی) (فسوق المرأة الأمريكية) هەرایەکی گەورەی نایەوە، کەئەمەش لێکۆڵینەوەو باس و تێڕوانینی نووسەرە لەسەر حاڵی ئافرەتی ئەمریکی و پاشان بەراووردکردنی لەگەڵ ئافرەتی مسوڵماندا. دکتۆر هنری مامۆستای زانکۆیەو پسپۆڕە لە مەسەلەی ئافرەتان و بزوتنەوەکانی ئازادبوونی ئافرەتاندا.. ئەم پەڕاوە دەریدەخات کە مرۆڤێك ئەگەر بەئینصاف بێت چۆن دان ئەنێت بە ڕاستییەکاندا و خۆی دوور دەگرێت لە دەمارگیری کوێرانە.

دکتۆر هنری دەڵێت: لەسەر دیواری نوسینگەکەم دوو وێنە هەیە، یەکەمیان وێنەی ئافرەتێکی باڵاپۆشی موسڵمان و بەتەنیشتیشیەوە وێنەی ئافرەتێکی ئەمریکی کە بەشدار بووە لەپێشبڕکێی جوانانداو بەرگێکی زۆر کەمی‌لەبەردایە، یەکەمیان بە تەواوی‌داپۆشراوەو دووەمیشیان بە پێچەوانەوە.. ئەمە مەدخەلی پەڕاوەکەی ناوبراوەو لەوێشەوە ئینجا باسی هەڵسوکەوت و ڕەوشت و خووی ئەو دووکەسایەتیە جیاوازە دەکات.

پاشان نووسەر دەچێتە سەر هۆکاری شاراوەی هێرشی ڕۆژئاوا بۆسەر موسڵمانان کە بریتیە لەجەنگێکی سیاسی و ثقافی و ئەخلاقی، ئەم جەنگەش لەبەر بەرژەوەندی ئابوریە و بۆ دەستگرتنە بەسەر خێروخێراتی ئەم وڵاتانەدا، لەم جەنگەشدا دەیانەوێت کەئەو شێوە ئافرەتە باڵاپۆشە بگۆڕن بەو نموونە ڕووت وقوتەی لای خۆیان..

نووسەر بەردەوام دەبێت لەسەر قسەکانی و دەڵێت: دیارە ئافرەتی مسوڵمان ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لەسەر ڕۆشنبیری و ڕۆژئاواش دەیەوێت ئەو ڕۆڵە گرنگەی نەهێڵا، جا شان بەشانی ئەوەی کەدەیانەوێ دەست بگرن بەسەر بیرە نەوتەکاندا لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەیانەوێت ئاین و خووڕەوشتی خەڵکی ئەم ناوچەیەش بگۆڕن.

نووسەردەڵێت: نموونەی یەکەم کەئافرەتی مسوڵمانی داپۆشراوە سوورە لەسەر ماڵ و خێزانی و گرنگی دەدات بەپەروەردەی نەوەی نوێ و هەردەم باوەشێکی گەرمە بۆ کۆرپەکانی و بۆ هاوسەرەکەی.. کە بەپێچەوانەوە نموونەی دووەم لەبەردەم ملیۆنەها کەسدا دەوەستێت لە شاشەکانی تەلەفزیۆنەوەو جوانی خۆی عرج دەکات و مولکی ماڵ و مێرد و منداڵی خۆی نییە بەڵکو مولکی عامەیەو دەیەوێت جوانی و شۆخ و شەنگی بفرۆشێ بەبەرزترین نرخ

لەمەزادکردنێکی ئاشکرای پێشبڕکێدا. لە ئەمریکا پێوەری نرخی ئافرەت لە جاذبیەت و جوانی و سەرنج ڕاکێشانیایەتی، کەبەمەش بەڕاستی زوو نرخی دادەبەزێت و ئەو ئافرەتانە سەر قالدەبن و ئەعصابیان دەسوتێ بۆچاکتر خۆدەرخستن و خۆ نمایشکردن.

ئینجا دکتۆر هنری دەچێتە سەر ئافرەتە هەرزەکارە موراهیقەکانی ئەمریکاو دەڵێت: ئەوانە مامۆستا و سەرمەشقیان گۆرانیبێژێکی وەك (بریتنی سبیرز)ە کە نیمچە ڕووتەو، ئەوەی لێوە فێردەبن کاتێ خۆشەویست دەبن کەخەریکی ڕابواردن و تێرکردنی هەواوئارەزوو بن لەدەرەوەی خێزان و هاوسەرگیری شەرعیدا، هەروەها وایان لێدێت سیفاتی ئافرەتانەیان ون دەکەن و لاسایی پیاوان دەکەنەوە و زیاتر بەرەو شەڕەنگێزی دەچن..

دکتۆرهنریدەڵێت: ئەم هەموو هەراو وهوریایەی ئازادکردنی ئافرەتان درۆن کەئەمریکاو ڕۆژئاوا بانگەشەی بۆ دەکەن وخەڵەتاندنێکە لەخەڵەتاندنەکانی نیزامیعالەمیتازە، کە بووە بە مایەی نەهێشتنی بەرزی و گەورەیی ئافرەتان و لەخشتە بردنیان و پاشان وێرانکردنی شارستانیەتی ڕۆژئاوا..

## نەخۆشی ئایدزو چەند ئامارێك:

لەجیهاندا ڕۆژی یەکی دیسەمبەری هەموو ساڵێك دانراوە بەڕۆژی جیهانی بۆنەهێشتنی نەخۆشی ئایدز، کە ناودەبرێت بەتاعونی سەردەم، چونکە زۆر بەخێرایی بڵاودەبێتەوەو چارەسەریشی زۆرگرانە بەتایبەت لە وڵاتانی ئەفریقیادا کەبەدەست هەژاری و نەبوونی یەوە دەناڵێنن.

لەئەفریقیا ڕۆژانە شەش هەزار کەس دەمرن بەهۆی ئایدزەوە، کە ئەم ژمارەیەش زیاترە لەژمارەی ئەو کەسانەی کە بەهۆی کارەساتەکانی ترەوە دەمرن ڕۆژانە لەجیهاندا.

خوارووی ئەفریقیا دووچاری مەترسیەکی گەورە بۆتەوە کە هەڕەشە لەهەموو دانیشتوان دەکات بەتیاچوون، کە لە چل وپێنج ملیۆن کەسی دانیشتوان نزیکەی پێنج ملیۆنیان تووشی ئەو نەخۆشییە بوون، کە ئەمەش زۆرترین ڕێژەی توشبوونە لەجیهاندا.

ئەم نەخۆشییە کاری کردۆتە سەر بواری خوێندن و تەنها لە ساڵی (٢٠٠٤) دا چوار هەزار مامۆستای کوشتووە.

لەئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش دا ئەم نەخۆشییە ئابوری ئەم وڵاتانەی خستۆتە مەترسییەوەو، تا ساڵی (٢٠٢٥) ئەگەر چارەسەر نەکرێت لەسەدا سی و پێنجی دەستکەوتی ئەو وڵاتانە دەبات، هەرچەندە هەندێ وڵات ڕێژەکەی هێشتا زۆرکەمە بەتایبەت ئەوانەی کە خەڵکەکەی پابەندی ئاینی پیرۆزی ئیسلامن، چونکە ئەم نەخۆشییە ٩٥٪ ی بەهۆی پەیوەندی سێکسی نامەشروعەوە بڵاودەبێتەوە.

ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ڕایگەیاند کەچل و دوو ملیۆن کەس توشی ئەم نەخۆشییە بوون لەسەرتاسەری جیهاندا و لەساڵانی ڕابردووش دا نزیکەی سی ملیۆن کەس بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە مردوون و بەردەوامیش ڕێژەی تووشبون زیاد دەکات و لە ساڵی (٢٠٠٢)دا (٤,٥) ملیۆن کەس بووە و، لە ساڵی (٢٠٠٤)دا بووە بە(٤,٩) ملیۆن کەس..

ئەمە بێجگە لەوەی ڕۆژانە شەش هەزار منداڵ و گەنجی تەمەن ( ١٤ تا ٢٤) ساڵ توشی ئەو نەخۆشییە دەبن لەجیهاندا.

ئەو ڕێکخراوە لە ڕاپۆرتێکیدا دەڵێت: ساڵانە ملیۆنەها منداڵ لەدایك دەبن و هەڵگری ڤایرۆسی ئایدزن و ساڵانەش شەش سەد هەزار منداڵ توشی ئایدز دەبن.. ئەمە بێجگە لەوەی کە مناڵانێکی زۆر هەتیو دەکەون بەهۆی مردنی دایك وباوکەوە بە ئایدز، کە ئێستا ژمارەی ئەو مناڵانە دائەنرێت بە (١٣) ملیۆن منداڵ لە جیهاندا.. هەروەها ڕاپۆرتی ئەو ڕێکخراوە دەڵێت: لە ٦٠٪ ی توشبوان ئافرەتن لە خوارووی بیابانی ڕۆژئاواو، لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیاش ٥٦٪ و لەئەوروپای ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئاسیاش دا ڕێژەی بڵاوبوونەوە لە ئافرەتاندا بەرزبۆتەوە بۆ ٤٨٪.

بەڵێ بەم جۆرە ئایدز بڵاودەبێتەوە و هەڕەشە لە سەرجەم مرۆڤایەتی دەکات، لە کاتێکدا کە بەڕەحمی خوا هەرچەند ڤایرۆسی ئایدز بچوکتریشە لە ڤایرۆسی مەلاریا کەچی لە ڕێی مێشوولەوە ناگوێزرێتەوە.[1]

١- موقع الحقائق.

## عەولەمەی بەدڕەوشتی:

ئەمریکاو ئەورووپای ڕۆژئاوا لـە ڕێی عەولەمـەوە دەیانـەوێت بـەرەڵای و بەدڕەوشـتی لـە وڵاتە ئیسلامیەکاندا بڵاوبکەنەوە، تا لەم ڕێگایەشەوە زیاتر توانـای لاوانیـان بەهـەدەر بدەن و ژێردەستەیان بکەن.. ئەمەش دیارە سیاسەتی ئەمڕۆیان نیـە، کاتێـك نـاپلیۆن هێرشـی هێنایـە سەر میسر لەگەڵ کەشتیە جەنگیەکاندا کەپڕبوون لە سـەربازو تفـاقی جـەنگ، کەشـتی پـڕ لـە ئافرەتی سۆزانی و بەدڕەوشتیشی لەگـەڵ خۆیـدا هێنـاو، کەپرسـیاریان لێکـرد لەوبارەیـەوە کـە ئەمانەت بۆ هێناوە، وتی: ئەم ئافرەتانە لەسوپاکە کاریگەرترن بۆ نەهێشـتنی ڕەوشـت وخـووی بەرزو دەست گرتن بەسەر میسردا.

بەڕاستی دوژمنان لە ڕێی هەواو هەوەس و ئارەزووپەرستیەوە دەیانـەوێ هێڵـی بـەرگری موسـڵمانان بشـکێنن ودەستەمۆیان بکـەن، قورئـان دەفـەرموێت: ﴿وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلًا عَظِيمًا﴾ النســـاء: ٢٧. واتـە: ئەوانـەی کـە دوای هـەواو ئـارەزوو شەهەوات کەوتوون دەیانەوێت کە زۆر بەخراپی لە ڕێی ڕاست لاتان بدەن.

بـەڵێ..ڕۆژئـاوا لـە ڕێی عەولەمـەی بەدڕەوشـتیەوە دەیـەوێت ڕاسـتیەکان لای خـەڵکی ئاوەژوو بکاتەوەو بیروبۆچونی خەڵکی بگۆڕێت و، بەیاساو لـە ڕێی فشـارەوە بۆسـەر دەوڵـەت، تاوانبارو فاحیشەکاران بپارێزێت و هەرکـەس داوای پـاکی وڕەوشـت بـەرزی بکـات نامۆبێـت و دژایەتی بکرێت، هەروەك زەمانی پێغەمبەری (لوط) سەلامی‌خوای لێبێت کە ڕایەکی گشـتیان دروست کردبوو، کە داوای دەکرد ئەوانەی سەر بە (لوط)ن لە وڵات شاربەدەرکرێن ﴿أَخْرِجُـــوا آلَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ النمل:٥٦.

واتە: ئالی لوط لـە وڵات دەربکـەن چـونکە ئـەوان کەسـانێکن داوای پـاکێتی و ڕەوشـت بەرزی دەکەن.

نموونەیەك بۆ دەست وەردانی ئەمریکا لە کاروباری وڵاتە ئیسـلامیەکان، ئـەو نامەیەیـە کەئەندامانی کۆنگرسـی ئـەمریکی ئاڕاسـتەی بـاڵوێزی دەوڵـەتی ئیمـاراتی عـەرەبی کـرد لـە واشنتۆن، لەسەرئەوەی کە دەوڵەتی ئیماراتی عـەرەبی بیسـت و شـەش کەسـی بەدڕەوشـت کـە لەئوتێلەکانی أبوظبی خەریکی کاری گەلی لوط بوون گرتنی، لەنامەکـەوە تێدەگـەین کـە ئـەم وڵاتانە گەیشـتونەتە چ پلەیـەك لەکۆیلایـەتی، بـەجۆرێك کـە لـە ئیجرائـاتێکی ئـاوا ئاسـاییدا

ئەمریکا فشار دروستدەکات لەسەریان، دیارە کەپێشتر وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بەو گرتنە دەربڕیوەو ئنجا ئەندامانی کۆنگرسی ئەمریکیش دەنگی خۆیان دەخەنە پاڵ دەنگی وەزارەتی دەرەوەو ئەوانیش هەڕەشەی خۆیان دەکەن، نامەکەش دەڵێت:

١٩ کانونی یەکەم /٢٠٠٥ ز
بەڕێز عصری ظاهری – باڵیۆزی دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو
باڵیۆزخانەی دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبیی یەکگرتوو
(٣٥٢٢) دادگای نێودەوڵەتی NW
واشنتۆن دی سی (٢٠٠٨)

جەنابی باڵیۆز..

ئێمە ئەمەت بۆ دەنوسین تاپاڵپشتی خۆمانت بۆ دەرخەین بۆناڕەزاییەکەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی لەسەر مەسەلەی گرتنی (٢٦) کەسی عەرەبی (شاذ)، کەپولیس لە دوبەی هەڵی کوتایە سەریان لە ئوتێلێکی ئەبوظبی.

ئێمە دەزانین کەئەو پیاوانە دادگایی دەکرێن و ڕەنگە حوکم بدرێن بەبەندکردن، یان جەڵدەلێدان، جاهەروەك لە قسەوباسی وەزارەتی ناوخۆتانەوە دەردەکەوێت کەهاوڵاتییەکی ئیماراتی ئەگەر ڕازی بێت بەچارەسەری هۆرمۆنی ئەوا سزاکەی کەم دەکرێتەوە.. ئەگەر ئەمەڕاستە، ئێمە وادەزانین کە ئەمە کارێکی زۆر لێکردنەو ناگونجێ لەگەڵ یاسا نێو دەوڵەتییەکاندا..

هەروەها دەشترسین لەوەی کەئەم گرتنانە بەشێك بن لە هەوڵێکی فراوانی بەرنامە بۆ داڕێژراو بۆدۆزینەوەو گرتنی(شاذ)ەکانی وڵاتەکەتان، کە لە ڕاستیدا پاش ئەو گرتنانە وەزیری دادوکاروباری ئیسلامییتان ڕایگەیاند کە: (کاری شازو گەلی لوط لەسەر خاکی دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبی جێی نابێتەوە).

هەروەها ئاوبراو لەبانگەوازەکەیدا بۆ باوکان و دایکان کە ئاگاداری لادانی منداڵەکانیان بن، نامەیەکی ئاشکرابوو بۆ (شازەکان) کەنەك هەر بێزراون لە وڵاتدا، بەڵکو دژایەتی کردنیشیان سیاسەتێکی گشتییەو ئەولەویەتی هەیە. ئێمە حەز دەکەین ئاگادارت بکەین کەئەم

هەولآنەی ئیمارات بۆدۆزینەوەی شازەکان کە ئازاری کەس نادەن و دادگای کردنیان، ئەوە نیە کەئێمە لەنێوە چاوەڕێی بووین کە ولآتێکی هاوپەیمانن، هەروەها هانت دەدەین کەهەر ئێستا ڕابگیرێ!

ئێمە وادەزانین کە ئەم هەولآنە نەك هەرهەلّەیەکی ڕەوشتین، بەلّکو مەوقفی ولآتەکەتان لەکۆمەلّگای نێودەولّەتیدا دەڕوخێنێ کەلەهەولّدان بۆئەوەی وەبەرهێنانی بیانی بهێننە لای خۆتان و لەهەولّی بەردەوامدان بۆئەوەی ببنە بنکەی ڕۆژهەلآتی ناوەڕاست بۆ هۆکانی گواستنەوە و ڕاگەیاندن و گەشتیاری.

ئەوەش (دوبەی) کەزۆر خێرایە لەسەرئاستی جیهاندا لەڕووەکانی گەشتیاری کە دەستکەوتی گەشتیاری تیایدا ١٧٪ ی دەسکەوتیانە..ئێمە ئاواتە خوازین کەتێبگەن کە بەدواداچوونی ولآتەکەتان بۆ(پیاوە شازەکان) و دادگای کردنیان دەبێتە بێزاری بۆ زۆر لەو گەشتیارانەی جیهان کە دەتانەوێ ڕوویکەنە ولآتەکەتان، هەروەها دەبێتە بێزاری بۆ زۆر لەحکومەت و دەزگاکان، کەوا دادەنێنن ئەم ڕەفزکردنە ترسناکە بۆ ئەو تاکانەی کۆمەلّ لەسەر مەیلی جنسیان شتێکە قبولّ ناکرێت. ئەوانەی کە واژۆیان کردووە.

| | |
|---|---|
| النائب بارنی فرانك | النائبة إليانا روس ليتينين |
| النائب توم لانتوس | النائبة سو كيلي |
| النائب جيمس ليتيش | النائبة جاري أكرمان |
| النائب كريستوفر شيز | النائبة كارولين مالوني |

شایانی باسە چوارکەس لەم هەشت کەسە جولەکەن!

## بەندیخانەکانی ئەمریکا :

پەیامنێری وەکالەتی ڕۆیترز (آلن أليستر) لەپەڕاوە تازەکەیدا (دەرگاکانی ستەم) باسی کۆمەلآ زانیاری دەکات لەسەر بەندیخانەکانی ئەمریکا کە نەك خەلّکی بەگشتی بەلّکو ئەمریکیکان خۆشیان زۆربەیان نایزانن.

ئەو ئامارانەی کە (آلن أليستر)دەیهێنێ سەرسوڕهێنەرە، بەتایبەت کە دەلّێت: (٢,٢) ملیۆن کەس لەبەندیخانەکانی ئەمریکادان، کە ئەمەش زۆرترین ڕێژەی بەندکراوە لەچاو

دانیشتوانیاندا له وڵاتێکی ئاوا پیشەسازیدا، بۆ نموونە: له بەریتانیا (٧٠٢) بەندکراو هەیەو له فەڕەنساش کەمترە..

نووسەر وتەیەکی جیسی جاکسون لە کتێبەکەیدا باس دەکات کە دەڵێت: (ئێمە هەمیشە باس لەوە دەکەین کە وڵاتی چین وڵاتێکی دیکتاتۆرەو مافی خەڵکی پێشێل کردووە، لەکاتێکدا لای خۆمان لە ئەمریکا ژمارەی دانیشتوانمان یەك لەسەر چواری دانیشتوانی ئەوانە، پێنج سەدهەزار بەندکراومان لەوان زیاترە.. هەروەها لای ئێمە هەژاران و نەخوێندەواران و مودمینەکان دەخەینە بەندیخانەو هیچی ئەوتۆیان بۆ ناکرێت لەچاو ئەو وڵاتانەی کە هەوڵی چاککردن و چارەسەرکردنی بەندکراوەکانیان دەدەن).

شایانی باسە کە ئەم بەندیخانانە پارەیەکی زۆریان بۆدادەنرێت کە دەگاتە (٥٧) ملیار دۆلار لەساڵێکدا لە کاتێکدا کە لە ساڵێکدا تەنها (٤٢) ملیار دۆلار دەدرێت بە وەزارەتی پەروەردە، ئەو پارەیەش کە بۆ پەروەردەو فێرکردن دانەنرێت دیارە کەمەو بەش ناکات و واش دەردەکەوێت کە لە کالیفۆرنیادا ساڵی (٦) هەزار دۆلار بۆ قوتابیەکی زانکۆ سەرف دەکرێت و بۆ بەندکراوێکیش (٣٤) هەزار دۆلار لەساڵێکدا کە نزیکەی شەش قاتە..

لە ئامارێکدا دەرکەوتوە کەژمارەی فەرمانبەرانی بەندیخانەکان زیاترن لەژمارەی کارمەندانی هەر سێ کۆمپانیای گەورەی ئەمریکی (جنرال موتورز) و (فورد) و (وول مارت). مامەڵەی بەندکراوەکانیش تابڵێی خراپەو زیاتر بەرەو توندو تیژیو توندڕەویان دەبات وکۆمەڵە عەصابەی گەورەیان لێدروست دەبێت و ئەو بەندکراوانەی بەسەزمان و بێ دەسەڵاتن دەچەوسێنرێنەوە وتەنانەت کاری فاحیشەشیان لەگەڵ دەکەن.. ئەمە بێجگە لەوەی کەمادده بێهۆشکەرەکان بەئاسانی لەبەندیخانەکاندا دەبرێت ودەهێنرێت و حکومەتیش زۆر گوێی ناداتێ. جالەبەرئەوانە ئەوکەسانەی کەماوەی سزاکەیان تەواودەکەن و دێنە دەرەوە زیاتر لەجاران و بەئەزموونێکی زیاترەوە دەکەونە تاوان کردن و بەمەش کۆمەڵگا زیاتر گیردەخوات بەدەستیانەوە.

وەزعی ئافرەتانیش خراپتر نەبێ چاکتر نیە لەپیاوان و ژمارەیان نزیکەی (٢٠٠) هەزار ئافرەتەو دوو لەسەر سێشیان دایکن و بەردەوام توشی چەوساندنەوەو لێدان و سووکایەتی و ڕووداوی ناخۆش دەبن لەسەر دەستی فەرمانبەرانی بەندیخانەو پاسەوانەکاندا.

(أليستر) دەڵێت: بەرپرسی یەکەم لەم بارو وەزعەش هەردوو حیزبی (جمهوری) و (دیموکراتی)یە کە لە ساڵانی حەفتاکانەوە دروشمی توندو تیژیان بەرزکردۆتەوە بەرامبەر تاوان وسەرەنجامەکەشی زیادبوونی بەندکراوەکانە کەچوار قات زیادی کردووە..

ئەوانەی کە گیراون دوو لەسەر سێیان لەسەر مادده بێهۆشکەرەکان گیراون لە ڕەش پێست وخەڵکانی ئەمریکای باشور، لەکاتێکدا سپی پێستەکان حکومەت کەمتر دەیانگرێو بەندیان دەکات، ئەم چاوپۆشینەش لە سپی پێستەکان بۆتە مایەی زیادبوونی هاتنە ناوەوەی تلیاك بۆناو ئەمریکاو بازرگانی پێوەکردنی.[1]

## ئاسوودەیی لە خواناسیندایە

قورئان دەفەرموێت ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴾ طه: ١٢٤. واتە: هەرکەس پشت بکاتە یادی مـن و بەرنامەکەم، ژیانێکی تەنگ و تاڵی دەبێت و لە قیامەتیشدا بە کوێری حەشری دەکەین..

گۆڤاری (حیاة) ژمارە (٢) لە ڕاپۆرتێکدا دەڵێت: ژیانی ناوداران دنیایەکی پڕ سەیروسەمەرەیەو، لە بەرچاوی جەماوەریان بەوپەڕی کەشخەیی دەردەکەون کە چاکترین مۆدێلی جلی ئەمریکی و ئەوروپی لە بەریاندایەو، خاوەنی جوانترین و بەرزترین مۆدێلی ئۆتۆمبێلن کە کۆمپانیا گەورەکانی ئۆتۆمبێل بەرهەمیان هێنابێ و، لەچاوپێکەوتنیشدا زەردەخەنە لەسەر لێویانەو وادەردەخەن کە زۆر بەختەوەرو دڵخۆش وئاسوودەن، کەچی لە ڕاستیشدا وانیەو ژیانی زۆربەی ئەوانە بەخۆکوشتن یان شێت بوون یان تەنهایی لەخانەی پیراندا کۆتای پێدێت، کە ئەمەش لەئەنجامی نەبوونی بیروباوەڕێکی ڕاستەوەیە لە ژیانداو، لە ئەنجامی دووریانە لەخواوە.. نموونەش بۆئەم حاڵەتە زۆرە لەوانە:

یەکەم: ڕۆمان نوسی بەناوبانگی ئەمریکی (ئەرنست همنگوای) کە بەهۆی چیرۆکی بەناوبانگی (الشیخ والبحر)ەوە خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت لە ئەدەبدا، لە کۆتایی ژیانیدا لەگەڵ ئەو هەموو ناوبانگەی هەیبوو، هەستی بەتەنهایی دەکردو نەخۆشیش سەری هەڵدابوو لێی،

---

١- پێگەی (مفكرة الاسلام).

بۆیە بڕیاریدا کۆتایی بەژیانی خۆی بێنێ‌و، تفەنگە کۆنێکی هەبوو لەماڵەوە خۆی پێ‌کوشت لەساڵی (١٩٦١) ز دا.

دووەم: (دایل کارینجی) خاوەنی پەڕاوی (دع القلق وأبدأ الحياة) و (كيف تكسب الأصدقاء وتؤثر في الناس) ە و زۆر بنەمای جوانی بۆمامەڵەو هەڵسوکەوت داناوە تامرۆڤ لە دڵەڕاوکێ ڕزگاری بێت وبزانێت چۆن لە ژیاندا هەڵسوکەوت دەکات،لەگەڵ هەمووئەوانەشدا دڵەڕاوکێ زاڵبوو بەسەر ژیانیاو ئەمیش بەرگەی ژیانی نەگرت وڕۆژگاریخۆیکۆتایی پێهێنا.

سێیەم: وێنەکێشی بەناوبانگی هۆڵەندی (فان چوخ) کە تابلۆکانی لەمەزادا لە لەندەن وپاریس بە ملیۆنەها دۆلار دەفرۆشرێن، تەنانەت تابلۆی گوڵەبەڕۆژەکانی بەشەش ملیۆن دۆلار فرۆشرا لەم دواییەدا.

لەسەرەتای ژیانیەوە قەشەبوو، ئینجا کەوتە وێنەکێشان و، لە بواری هونەری تەشکیلیدا لەسەر ئاستی جیهان بووە کەسێکی ناودارو ناسراو، بەڵام ئەوانە هەمووی نەیانگەیاندە بەختیاریو لەساڵی (١٩٨٠) دا پەنای بردە بەرخۆکوشتن و بەمەش کۆتایی بەژیانی هات و تابلۆی گوڵە بەڕۆژەکەیان بردە سەر قەبرەکەی.

چوارەم: نووسەری میسری (ئیسماعیل ئەدهەم) دکتۆرای لە بیرکاریدا هێنا لە زانکۆی مۆسکۆ لە گەرمەی دەسەڵاتی شیوعیەت و مارکسیەتدا. کاتێ گەڕایەوە میسر بیروبۆچونی مارکسیەتی بڵاودەکردەوە لە بارەی ژیان و بونەوەرو مێژووەوە و،چەندەها پەڕاوی نووسی لەوانە (بۆچی من مولحیدم)کە هەرایەکی گەورەی نایەوە لە و زەمانەدا.

ناوبراو چەند زمانێکی دەزانی و چەندەها دیراسات و نووسراو و لێکۆڵینەوەی هەیە، بەڵام دیارە هەموو ئەوانە ئاسوودەیان نەکردو زانی ژیانی بێ‌ئامانجەو ئەو فەراغە ڕۆحی یەی هەیەتی پڕنابێتەوە، بۆیە لە (٢٢ یولیو ١٩٤٠) دا خۆی هەڵدایە دەریاوە لە ئەسکەندەریە ولەجلەکانیدا نامەیەکی تیابوو کە لەژیان بێزار بووە بۆیەخۆی کوشتووە..

پێنجەم: (کریستینان ئوناسیس) کچی ملیۆنەری یۆنانی (ئوناسیس)ە کە خاوەنی چەندەها دوورگەو کەشتی وفڕۆکە بوو، یەکێ بوو لە دەوڵەمەندەکانی جیهان، کریستینان تاقە کچی بوو، هەموو ئەو سامانەی بۆ بەجێما، کەچی ئاسوودە نەبوو، چەند جار شووی کرد سەرکەوتوو نەبوو، دواجار شووی بە کۆمۆنیستێ کردو چوو لە گەڕەکێکی هەژاری مۆسکۆدا

دانیشت، هەر بەختەوەر نەبوو، ئەمیش بۆڕاكردن لەو باروزروفە دەروونییەی تیا دەژیا كۆتایی بەژیانی خۆی هێناو خۆی دەرمان خوارد كرد !

شەشەم: گۆرانی بێژی بەناوبانگ (دالیدا) لە گەڕەكێكی شەعبی قاهیرەوە سەری هەڵداو، لەساڵی (١٩٥٦ز)دا چوو بۆ فەرەنساو ناوبانگێكی دەركرد كە هیچ گۆرانی بێژێكی عەرەب پێش خۆی نەیگەیشتبوویە.. لەماوەی بیست ساڵدا شەش سەد گۆرانی بەهەشت زمان وت كە نزیكەی (٨٥) ملیۆنی لێ فرۆشرا.. چەندەها خەلاتی جیهانی وەرگرت، ئەمانە هیچی بەختەوەریان نەكردو سەرەنجام لەساڵی (١٩٨٧ز) دا خۆی دەرمانخوارد كردو نامەیەكی لای خۆیەوە بەجێهێشت كە تیا نوسرابوو (الحياة لاتُحتمَل سامــــحــــونــــي).

حەوتەم: دكتۆرە (دوریە شەفیق) لەپاریس دكتۆرای هێناو، كە گەڕایەوە میسر یەكەم حیزبی ژنانی دامەزراندو چەندەها گۆڤاری دەركردو چەندەها خۆپیشاندانی سازدا بۆ ئازادی ئافرەتان، سەرەنجام ئاخر شەڕ بوو، نەك ئازادی و بەختەوەری بۆكەس نەهێنا بەڵكو نەیتوانی خۆشی بەختەوەر بكات و لە داخی دنیا لە شوققەكەیەوە كە لە نهۆمی شەشەم بوو خۆی فڕێدایە خوارەوەو كۆتایی بەژیانی هێنا. (شایانی باسە ئەكتەری بەناوبانگیش (سوعاد حوسنی) پاش ئەوهەموو ناوبانگە بەهەمان شێوەی دوریە كۆتایی بەژیانی هات).

ئەمانە هەموو بەدوای ناوبانگدا ڕایان كرد لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، هەرچەندە گەیشتنە پلەوپایەو پارەو ناوبانگ، بەلام نەگەیشتنە ئاسوودەیی و بەختەوەری، خوای گەورە بەحیكمەتی خوایەتی خۆی، بە دادپەروەری خۆی، ئاسوودەیی و بەختیاری نەخستۆتە پارەو سامان و ناوبانگەوە، چونكە دیارە خەلكانێكی كەم لەچاو هەموو خەلكیدا دەگەنە ئەو پلەوپایەو ناوبانگ و دەولەمەندی یە..

ئەوانە هەمووی (متاع) و هۆكارێكی ڕووكەشی دنیان و ڕۆحی مرۆڤ ئاسوودە ناكەن، تەنها ئیمان و بڕوایە كە مرۆڤ بەڕاستی ئاسوودە بكات و هەمووكەسیش دەتوانێت بیگاتێ ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨ هەروەها تەنها ئیمان و ئیسلامە تەفسیری ژیان و مردن و قەزاوقەدەر بكات. خوای گەورە دەیەوێت بڕوادار نە بەبوون لە ئایم دەرچێ و نە بەنەبوون و زیان لێكەوتنیش بەخەفەت خۆی بكوژێ، ئەمەش دەبەستێتەوە بە قەزاوقەدەرو ئیرادەی خواوە تادەرگا لەسەر شەیتان داخرێو لە ڕێی وەسوەسەوە مرۆڤ توشی ئائارامی و

دڵەڕاوکێ نەکات، ئەوەتا قورئان زۆر بەجوانی و زۆر بە ڕوونی جەخت دەکاتە سەر ئەم ڕاستیە و دەفەرموێت: ﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾ الحديد: ٢٣.

لە زانکۆی تایوا لە ئەمریکا دیراسەی حاڵی (٥٥٠) کەسیان کرد کە تەمەنیان لە سەرو (٦٥) ساڵەوە بوو بۆیان دەرکەوت کە ئەوانەی بڕوادارن و سەردانی پەرستگا دەکەن زیاتر دڵئارام و ئاسوودەن وبەرگری لەشیان زیاترە بۆ نەخۆشی و ئەوانە ٣٥٪ زیاتر ژیان لەوانەی کە بڕوایان نەبوو..کە ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرای گرنگە لەسەر ڕۆڵی ئیمان لە ژیاندا..[1]

## کەوتنە خوارەوە و تیاچوون :

خوای گەورە مرۆڤی لەچاکترین و جوانترین شێوەدا دروست کردووە، ڕێزی تایبەتی لێگرتووە ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ ﴾ الإسراء: ٧٠، هەروەها دەیەوێت ئەو ڕێزداریو پلەبەرزییەی بمێنێت لە دنیاو لە ئاخیرەتدا، بۆیە بەهەزاران پێغەمبەری ناردووە سەلامی خوایان لێبێت، تادەستی مرۆڤ بگرن و ڕێنمایی بکەن بۆهەرچیەك کە لە بەرژەوەندیەتی لە دنیا و لە ئاخیرەت دا، جانەگەر لەو ڕێبازەش ترازا سەرەنجامی کەوتنە خوارەوەو مل شکان و تیاچوونە: ﴿ حُنَفَاءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴾ الحج: ٣١ واتە: ئەوەی هاوەڵ و شەریك بۆخوا بڕیار بدات، وەکو ئەوە وایە لەئاسمانەوە بەربێتەوەو باڵندە پەلاماری بدات و پارچە پارچەی بکات، یان ڕەشەبایەکی بەهێزو گەردەلولێك بیفڕێنێت و بیبات بۆ شوێنێکی دووروقووڵ لەوێ بیدات بە زەویدا..

خوای پەروەردگار سوێند دەخوات لەسەرئەو ڕاستییەی سەرەوەو دەفەرموێت: ﴿ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ﴾ التين: ١ - ٨ واتە: سوێند بەهەنجیرو زەیتون، بەکێوی

---

١- پێگەی التوابون

طوری سینا (كه خوا گفتوگۆی لەگەڵ پێغەمبەری موسا لەوێدا کرد)، سوێند بەم شارە ئەمینە کە مەککەیە، بەڕاستی ئێمە مرۆڤمان لەجوانترین و ڕێکوپێکترین شێوەدا دروستکردووە، ئەگەر ڕێبازی خوانەگرێت دەیخەینە نزمترینی شوێنە نزمەکانەوە لەدۆزەخ دا، جگە لەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، پاداشتی هەمیشەو نەبڕاوەیان بۆ ئامادەیە.

جانیتر ئەی مرۆڤی سەرکەش چی وای لێکردووی باوەڕت بەڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە نەبێت، ئایا خوا چاکترین دادپەروەرو فەرمانڕەوا نییە؟!

بەڵێ.. ئەی پەروەردگارمان هەر تۆ چاکترین ودادپەروەرترین فەرمانڕەواو دەسەڵاتداریت، لەدادی تۆوەیە کە دەبێت قیامەت بێت، بۆئەوەی هەرکەس پاداشتی خۆی وەرگرێت و هەقی کەس بەسەر کەسەوە نەمێنێت..

مرۆڤ کەهەوڵ بدات بڕوادارو چاکە خوازبێت بەپلەکانی ئیمان و ئیسلامەتیداسەردەکەوێت، بەهەشتیش پلە پلەیە (درجات)ە، بە پێچەوانەشەوە دۆزەخ (درکات)ە و دابەزینەو قوڵاییەو ئەویش چەند بۆی دابەزی سزاکەی سەختتردەبێت و دووڕووەکانیش وان لە پلەکانی خوارەوە و سزای زۆر سەختدا چونکە بەڕووکەش موسڵمانن و لە دڵیشدا بێباوەڕن ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾ النساء: ١٤٥.

بەردەوام کێشمەکێش هەیە لەنێوان هەق و ناهەق داو، ناحەزان بەشەو و بەڕۆژ لەهەوڵدان و پیلان دادەنێن تامرۆڤ لەو پلەوپایە بەرزەدا نەبێت و سەرەنزێ بێت و بکەوێتە خوارەوە و لەدنیادا سەرگەردان و لەقیامەتیشدا دۆزەخی بێت.

ئەمڕۆ هۆکارەکانی ڕاگەیاندن گەورەترین کاریگەرییان هەیە لەسەر دڵ و دەروونی خەڵکی بۆ سەرگەردان کردنیان، بەتایبەت لاوەکان کە کەم ئەزموونن و هەواو ئارەزوویان لە دوا پلەدایە.. بۆنموونە: بەرنامەیەکی وەك (سوپەر ستار) کۆمپانیایەکی ئەمریکی سەرپەرشتی دەکردو خەڵکێکی زۆری سەرقاڵ کرد، پێنج ملیۆن کچ وکوڕی هەرزەکار ناوی خۆیان تۆمارکردو، بەچەندەها قۆناغی تاقیکردنەوەدا بران تاوەکو یەکێك ببێتە (سوپەر ستار) و خەڵات وەرگرێت.. دیارە هەڵبژێراوان گۆرانیان دەوت و خەڵکیش لەهەموو ولاتانەوە دەنگیان بۆئەدان.. لە ئامارێکدا هاتووە کە هەشتا ملیۆن پەیوەندی تەلەفۆنی کراوە، لەمیسرەوە بیست

و سێ ملیۆن پەیوەندی و لە وڵاتی سعودیەوە نزیکەی یانزە ملیۆن و لە لوبنانەوە نزیکەی هەژدە ملیۆن و لە سوریاوە شانزە ملیۆن و... هتد.. دەڵێن تەنها لە وڵاتی سعودیە حەڤدە ملیۆن کەس سەیری ئەو بەرنامەیەیان کردووە و نزیکەی دووسەد چێشتخانە شاشەی گەورەیان دانابوو تائەوانەی لەو چێشتخانانەدا نانیان دەخوارد سەیرکردنی بەرنامەکەیان لەکیس نەچێت؟!

تا بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر چەند گۆرانی بێژو ئەکتەرێك دەگەڕێنەوەو لە خراپەکاری دوور دەکەونەوە، ئەوان بەم بەرنامە شەیتانیە سەدان کەس دروست دەکەنەوە.. بەرنامەی سوپەر ستارو هاوشێوەکانی وا داڕێژراون کەنەوەیەکی لاوو تازە پێگەیشتوو سەرگەردان بکەن و لە بەرنامەی خوا دووریان بخەنەوە، کە ئەمەش ئاواتی ڕۆژئاواو جولەکەیە..

ڕۆژنامەکانی جولەکە زۆر گرنگیان دەدا بە دەنگوباسی ئەم بەرنامەیەو چەندەها لاپەڕەیان بۆ تەرخان دەکرد، تاعەرەب و موسڵمانان خەریکی گۆرانی و سەمابن وخۆشیان خەریکی بەرهەمهێنانی بۆمبی ئەتۆمی بن..

(جلعاد شالوم)ی وەزیری جولەکە لە ڕۆژنامەی (هارتس)ی جولەکە لە ٢١/٨/ ٢٠٠٣ دا دەڵێت: ئەو بەرنامەیە لەوبەرنامە چاکانەیە کە پەیوەندی نێوان عەرەب و ئیسرائیل خۆش دەکات..

هەروەها (دوری گۆڵد)ی ڕاوێژکاری سیاسی شارۆن بە ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆست) ی ئەمریکی وت لە ٢٢/ ٨/ ٢٠٠٣ دا کە: بەرنامەی سوپەر ستار زۆر شتی سەلماند، گرنگترینی ئەوەیە کە تێگەیشتین ئێمە دوژمنمان موسڵمانان نین (چونکە ئەوەتا بە بەرنامەیەکی ئاوەها سەرقاڵ دەبن و بیری دین وئیمانیان نامێنێ)،بەڵکو دوژمنمان ئیسلام و ڕێنماییەکانیەتی..

هەروەها ڕۆژنامەنوسی جولەکە (دایفید سلیفان)یش لە ڕۆژنامەی (جیروزالم پۆست) لە ٢٢/ ٨/ ٢٠٠٣ دا بڵاوی کردەوە: واقیع ئەوەی دەرخست کە ئەوانەی بڕوایان بە نەهێشتنی جولەکەیە زۆر کەمن و بەرنامەی سۆپەر ستار هیوای داینێ کە نەوەیەکی عەرەبی موسڵمان هەیە نەرمەو ڕازی یە بەپێکەوە ژیان لەگەڵ دەوڵەتی جولەکەدا!

پرسیار کرا لە وەزیری بەرگری (شاۆول مۆفاز): میستەر مۆفاز، ئایا کەس و کاری بەندکراوە فەلەستینیەکان داوای ئازادکردنیان ناکەن؟ وتی: نەخێر، کەسوکاریان سەرقاڵی سەیرکردنی سۆپەر ستارن[1]..

## ئەیانەوێ نووری خوا بکوژێننەوە :

تاچەند ساڵێك لەمەوبەر زانینی هەڵوێستی ئەمریکا بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان وردبوونەوەو گەڕانی دەویست، بەڵام ئەمڕۆ دژایەتی ئەمریکا و پیلانەکانی زۆر ئاشکران وجارویاریش بە ناوی لە دەم دەرچوونەوە کەئەستەمە لەدەم دەرچوون بێت ڕاستی ئەدرکێنن، هەروەك (بۆش) لەدوای یانزەی سێپتەمبەر وتی: جەنگی خاچپەرستان سەری هەڵداوەتەوە..

(کابلان) ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکیەو لە بڵاوکراوەیەکی هەفتانەی ئەمریکیدا باسێکی بڵاوکردەوە بەناوی (القلوب والعقول والدولارات)، کەپاش چوار مانگ گەڕان توانیبوی کۆی بکاتەوە، باس لەپرۆژەیەکی تازەی ئەمریکی دەکات بەناوی (گەیشتن بۆ عالەمی ئیسلامی) و هەرچەند لەلایەن لێکۆڵەوەران و حکومەتەوە بڵاونەکراوەتەوە ونەویستراوە بڵاوبێتەوە، کەچی ناوبراو توانی بگاتە ئەو پرۆژەیەو بڵاوی بکاتەوە، کە سیاسەتێکی نوێی ئەمریکایەو بەرژەوەندی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە، بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە ئەم هۆکارانە دانراون:

١- بودجەی تایبەت بۆ جێبەجێکردنی کە بە ملیۆنەها دۆلارە..

٢- پرۆژەکە بریتی دەبێت لە هەڵمەتێکی جەنگی سیاسی هەروەك سەردەمی جەنگی سارد..

٣- چەندەها پسپۆڕی بواری جەنگی دەروونی کاری بۆدەکەن.

٤- چەندەها عەمیلی نهێنی ( سی، ئای، ئەی) کاری بۆدەکەن.

٥- چەندەها دەزگای لێکۆڵینەوە کاری بۆدەکەن.

٦- هۆکارەکانی ڕاگەیاندن کاری بۆدەکەن کە ئەمریکا پاڵپشتیان دەکات، وەك کەناڵەکانی (الحرە) و(تیم بی سی)

٧- پرۆژەکە گرنگی دەدات بەبڵاوکردنەوەی بەها ئەمریکیەکان، دیموکراتیەت و لێبوردەی و ئازادی ئافرەتان و پروپاگەندە بۆ شێوازی ژیانی ڕۆژئاوا.

---

١- موقع: حماسنا.

٨- ئاژاوەنانەوە لە نێوان کۆمەڵە ئیسلامیە میانڕەو و کۆمەڵە ئیسلامیە توندڕەوەکان و، هاوکاری میانڕەوەکان بۆدژایەتی ئەوانی تر.

٩- شێواندنی سومعەی ئەو کۆمەڵە ئیسلامیانە و ئەو سەرکردە ئاینیانەی کە لە خەتی ئەوان لائەدەن لەلایەن پیاوانی (سی، ئای، ئەی) ەوە.

١٠- گۆڕینی پرۆگرامی خوێندنی قوتابخانەو پەیمانگا ئیسلامیەکان و لابردنی هەر بابەتێك کە بەلای ئەوانەوە هۆکاری توندڕەوی بێت.[1]

هەزاران ڕەحمەت لە نووسەری شەهید (سید قطب) کە لە شەستەکانی ئەم سەدەیەوە لە وتارێکدا باس لەوە دەکات کە ئەمریکا دەیەوێت ئیسلامێکی ئەمریکی بێنێتەکایەوە، ئیسلامێك کەپەڕوباڵ کرابێت و بەدڵی خۆیان لە قاڵبیان دابێت.

بەڵێ ڕاستە ئیسلام نەرم ونیانەو هەوڵی دەستەبەرکردنی مافەکانی مرۆڤ دەدات و دەیەوێت زوڵم و ستەم نەمێنێت، بەڵام ئەمە مانای وانیە کەجیهادی ڕاستەقینە نەکرێت لە شوێن و کاتی پێویستدا، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إني لم أبعث باليهودية ولا بالنصرانية، ولكن بُعثت بالحنيفية السمحة، والذي نفسي بيده، لغدوة أو روحة في سبيل الله خير من الدنيا وما فيها، ولمقام أحدكم في الصف خير من صلاته ستين سنة)[2]. ئەمەش جەخت کردنە لەسەر ئەوەی ئاینی ئێمە هەرچەند سنگ فراوانەو ئازادی تەواو دەدات و، کێ دەیەوێت بڕوا بێنێ و کێ نایەوێ زۆری لێناکرێت ﴿ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ الكهف: ٢٩، بەڵام جیهادیش بەهەموو جۆرەکانیەوە بەرامبەر دوژمنانی ئەم ئاینە فەرزەو، گەورەترین پلەوپایەیە لەدینی خوادا کەسێك بیەوێ دەستی بکەوێت..

ناحەزان و دوژمنانی ئەم ئاینە دەیانەوێت جیهاد لە بیر موسڵمانان ببەنەوەو دەستەمۆیان بکەن و هەرچیان کرد بەرامبەریان فزە نەکەن و ئەگەر شتێکیان کرد لەوە زیاتر نەبێت کە نارەزایی دەربڕینێك بێت کە هیچ لەواقیع ناگۆڕێت، هەروەك ئێستا هەیەو دەکرێت..

---

١- سایتی المختار الاسلامي.

٢- فتح الباري/١/٩٤.

بەڵێ، دەیانەوێت چ ئایەتێك باس لەخراپی وڕابردووی جولەکە دەکات لایبەرن وچ ئایەتێك باسی جیهادو بەرەنگار بوونەوە دەکات لە بەرنامەی خوێندنەکاندا بیسڕنەوە،بەوەش ئیسلامێك بهێننەکایەوە کەبەوان بخوات و بەدڵی ئەوان بێت..

(بۆ نموونە: لەم دواییەدا ئەمریکاو ئەوروپا فشاریان خستە سەر تورکیا کە وتارخوێنەکانی لە وتاری هەینیدا﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾ آل عمران: ١٩ نەخوێنن و لە جیاتی ئەوە فەرموودەیەك یان شتێکی تر بڵێن جا بۆئەم کارەش کۆمەڵێ زانای بەناو موسڵمان بەکاردێنن تا ئاسایی بێت لای خەڵکی و پیلانەکانیان بۆ بچێتە سەر، ئەمانەش ئەو بانگخوازانەن کە بەناو موسڵمانن و خەڵکی بانگدەکەن بەرەو دۆزەخ، چونکە کارەکانیان لێشێواوەوحەق بەناحەق دەبینن و ناحەقیش بەحەق دێتە بەرچاویان، پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بەحاڵێکی ئاوەها دەکات و دەفەرموێت: (كيف بكم إذا طغى نساؤكم وفسق شبابكم وتركتم جهادكم ؟! قالوا: وإن ذلك لكائن يارسول الله؟ قال: نعم والذي نفسي بيده وأشدُ منه سيكون. قالوا: وما اشد منه يارسول الله؟ قال: كيف انتم إذا لم تأمروا بالمعروف و لم تنهوا عن المنكر ؟ قالوا: اوكائن ذلك يا رسول الله؟ قال: نعم والذي نفسي بيده وأشدُ منه سيكون.قالوا وما اشد منه يارسول الله؟.. قال: كيف انتم اذا رايتم المعروف منكرا ورأيتم المنكر معروفا ؟، قالوا: وكائن يا رسول الله؟ قال: نعم وأشدُ منه سيكون...)[1]

واتە: ئایا حاڵتان چۆن دەبێت کاتێك ئافرەتانتان لەسنور دەردەچن و لاوەکانتان فاجیرو خراپەکاردەبن و واز لە جیهادەکەتان دێنن؟، وتیان: بۆشتی وادەبێت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە لەوەش خراپتر دەبێت... وتیان لەوە خراپتر چی‌یە ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: حاڵتان چۆن دەبێ کاتێك فەرمان نادەن بەچاکەو جڵەوگیری ناکەن لەخراپە؟ وتیان: بۆشتی وادەبێت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە لەوەش خراپتر دەبێت... وتیان: لەوە خراپتر چی‌یە ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: حاڵتان چۆن دەبێت کاتێك چاك بەخراپ و خراپیش بە چاك دەبینن! وتیان: بۆشتی وادەبێت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی بەڵێ: لەوەش خراپتر دەبێت و خوا

---

١- ابن ابي الدنيا/كنز العمال: ٨٤٧٠ .

دەفەرموێت: ئاڵەوکاتەدا توشی فیتنەیەکیان دەکەم کە ژیرەکانیان دۆش دادەمێنن ﴿يقول الله لأتيحن لهم فتنة يصير الحليم فيها حيران﴾.

ئێمە کەباسی پیلانی دوژمنان و نیەتی خراپیان دەکەین بۆئەوەیە بەرچاوڕوون بین وخۆمانی لێبپارێزین و نەخەڵەتێین و سەرگەردان نەبین، هەروەك چۆن حوزەیفەی کوڕی یەمان کە نهێنی پارێزی پێغەمبەر بووﷺ، پرسیاری لە پێغەمبەر کرد ﷺ لەبارەی ئەو بارودۆخە خراپەی کە دێت بەسەر موسڵماناندا، بخاری لە حوزەیفەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی:خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا دەکرد لەبارەی خێروچاکەوە تابیکەن و پاداشتیان دەستکەوێت، بەڵام من پرسیارم لێدەکرد لە بارەی خراپەوگوناهو ناڕەحەتیەك کە پێش دێت تاخۆمی لێبپارێزم، بۆیە بە پێغەمبەرم وت ﷺ: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەنەفامی و شەڕدا بووین و خوا ئەم خێرەی بۆناردین، ئایا دوای ئەم خێرە شەڕ هەیە؟

فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئەی دوای ئەو شەڕە خێر هەیە؟ فەرموی: بەڵێ بەڵام تەواو نیەو ساخ نیەو خەوش وخاڵی تیایە! (قال: فيه دخن)، وتم: (دخن)ەکەی ناتەواوی وساف نەبوونی چیە؟ فەرمووی:کەسانێك دێن کە کارەکانیان جێی گومانەو چاك و خراپیان تێکەڵکردووە (قوم يهدون بغير هدي تعرف منه وتنكر).

وتم: دوای ئەو خێرە هەرچەند تەواویش نیە، شەڕ دێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ‌بانگخوازانێك دێن لەبەر قاپی دۆزەخن و هەرچی وەڵامیان بداتەوەو بەدەنگیانەوە بچێت فڕێی ئەدەنە ناوی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بۆمان وەسف بکە، فەرمووی: ئەوان لەئێمەن و بەزمانی ئێمەش قسە دەکەن.. وتم: ئەگەر گەیشتمە ئەو دەوروزەمانە چی بکەم؟ فەرمووی: (تلزم جماعة المسلمين وإمامهم) واتە: لەگەڵ کۆمەڵی موسوڵمانان وپێشەواکەیاندا بە! وتم: ئەگەر کۆمەڵ و ئیمام نەبوو! فەرمووی: لەهەموو کۆمەڵە خراپەکان دوورکەوەرەوە ئەگەر واشت لێهات بەتاقی تەنها بمێنیتەوە و باوەش بکەی بەقەدی دارێکدا...(ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە بوون لەگەڵ کۆمەڵی موسڵماندا پارێزەرە لە فیتنە، کاری بە کۆمەڵ مەسەلەیەکی زۆر گرنگە کەبەداخەوە تا ئێستا زۆربەی موسڵمانان باش لێی حاڵی نەبوون)[1].

---

١- المختار الاسلامی ٢٠٠٦/٢/٤

## سەربازی نەناسراو :

خوای گەورە فەرمانی داوە بەم ئوممەتە کە درێژە پێدەری خەباتی پێغەمبەران بێت، هەر لە ئادەمەوە سەلامی خوای لێ بێت تا محمد ﷺ، ئنجا ئوممەتێك بیەوێت پێشەوایەتی بکات و سەر قافلەی بەشەریەت بێت بەرەو خێرو خۆشیو بەرەو بەهەشت ئەگەر چاو لەوان نەکات ئەی چاو لەکێ بکات...

ئەمڕۆ ئەمەریکیەکان دەیانەوێ ئیمبراتۆرێتیەك دروست بکەن بەڵام هەر بە عەقڵیەتی ئیستعماریەیە کۆنەکەو هەندێ بۆیاخ و مکیاجیان بۆ کردووە، لای ئەوان (الغاية تبرر الوسيلة) ئینجا زۆر بەلێزانانە جەماوەری بێتاگا تاودەدەن کە گیانیان دەرچووە لەژێر باجدا، باجێك کە دەگاتە ٢٥٪ ی دەسکەوت و ڕەنج و عەرەق و ماندوو بوونیان و لەم لاوە لە شەڕو داگیرکردن و یارمەتی دانی ئەو حکومەتانەی سەربەخۆیانن سەرفی دەکەن...

دیارە ئەمە بەرنامەی ئوممەتی ئیسلام نیە و ناشبێت مەگەر قورئان نافەرموێت: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾ آل عمران: ١١٠ ئێوە باشترین ئوممەتێکن کە خوا لەنەبوونەوە هێناونێتیە بوون، بۆچی؟! کاری چییە؟! ﴿ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴾ آل عمران: ١١٠. فەرمان دەدەن بە چاکەو جڵەو گیری دەکەن لە خراپەو بڕواتان بە خوا هەیە...

ئەم ئوممەتە بەرنامەی هەیەو کاروانێکی بەردەوامەو هەرگیز نابچڕێت لە واقیعی ژیان، تا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت.. هەمووکات ئەبێ چاو لە پێغەمبەر بکەن ﷺ لە هەموو شتێکداوجێ پێی ئەو هەڵگرن ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴾ الأحزاب: ٢١

پێغەمبەریش کە سەرقافڵەو مامۆستاو پێشەوامانە، چاو لە مامۆستایانی پێش خۆی دەکات ﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ ﴾ الأنعام: ٩٠. ئەو پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێبێت خوا هیدایەتی داوون و لەسەر ڕاستە شەقامی ئیمان و ئیسلامەتی بوون تۆش ئەی محمد ﷺ چاو لەوان بکە.

لە ئەمریکا کە ئەم زریانەی ریتا هات و وەك کۆڕەوەکەی خۆمـان خـەڵکی ڕەوی کـرد، زۆر کەس بەفرسەتی زانی لەو گەلە بە ناو پێشکەوتووە، کەوتنە تالآنی و جـەردەیی... لاشتمان سەیرنەبێت لەبـەریتانیادا چـوار ملیـۆن کـامێرا موراقەبـەی خـەڵکی دەکـات تـادزی نەکـەن و مخالەفات نەکەن، کاتێـك کارەبـا دەکوژێتـەوە بـۆ چـەند خولـەکێك بـە هـەزارەها دزی دەکرێـت لەوچـەند خولەکـەدا، لـە کاتێکـدا ئیسـلام بـەجۆرێك مـرۆڤ پـەروەردە دەکـات کەهەسـت بـە موراقەبەی خوا بکات و ئەمەش دادەنێ بەپلەی الاحسان..

وترا: ئیحسـان چـییە؟! پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ئیحسـان ئەوەیـە کـە خـوا بپەرسـتی هەروەك ئەوەی ببینی، خۆ ئەگەر تۆ ئەویش نەبینی ئەو تۆ دەبینێت.

ئەم ئومەتە لە خشتە برا، هەروەك مەسەلەی بێچووە هەڵۆکەی بە سەرهات؟!

کـە دەڵـێن: منـاڵێکی جەربـەزە، هێلکـەی هەڵۆیـەك دەهـێنێ و دەیخاتـە لای هێلکـەی مریشکی ماڵەوەیان کە کڕکەوتووە لە سەریان، کاتێك کـە بێچـووە هەڵۆکـە لەهێلکەکـە دێتـە دەرێ هەروەك جووجەڵەکان هەڵسوکەوت دەکات و دەکەوێتە کرم خـواردن و هـەر چـاوی بـەرەو خوارەوەیەو بەدوای ڕۆزی خۆیدا دەگەڕێت لەسەرە نوێلکەکاندا..

زیاتر گەورە دەبێت، ڕۆژێك سەرێك بۆ ئاسمان هەڵدەبڕێت هەڵۆیەك بە ئاسمانـەوە دەبـینێ، ئاواتی پێدەخوازێ، ئەو بۆ وا بەرز دەفڕێ و ئەم بۆ وایە! ئادۆستێك قسەی بۆ دەکـات ودێتـەوە ئایم وقەناعەت دەکات کە هەڵۆیەو ئەمیش دەداتـە شـەقەی بـاڵ و، کـاتێ بـەخۆی دەزانـێ لـە ئاسماندا گەشت دەکاو جیهانی مریشك وجوجەڵە بەجێدەهێڵێ..

موسوڵمانانیان چەواشە کرد، پێیان وتن: ئێـوە کۆنەپەرسـتن، دوای بەرنامەیـەك کـەوتوون باوی نەماوە، دنیای ڕۆژئاوا پێشکەوتون و پێشکەوتنیشـیان بەوەیـە وازیـان لـە ئـاین هێنـاوە، دیارە ئەمانەش هیچی وادەرنەچوون، چـونکە زوڵـم و زۆری کەنیسـەی ئـەوان و وەزعـی ئـەوان مەسـەلەیەکەو لای ئێمەش جۆرێکی ترە..

لەئومەتی ئیسلامدا کە سانێك دەردەکەون، کەمایەی ژیانـەوەو تـازە بوونـەوەی ژیـانن، خۆیان دەمرن و ژیان بـۆ خـەڵکی دەهێـنن، شـەوغونی دەکـەن تـا خـەڵکی بحەوێنـەوە، قورئـان لەبارەیانــەوە دەفــەرموێت: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا﴾ الأحزاب: ٢٣

بەڵێ هەیانە ئەمانەتەکەی دایەوە بەپەروەردگاری‌و خوای گەورە لێی وەرگرتەوەو ناویان هەر زیندووە، هەشیانە ماون و بەردەوام لە هەوڵ و کۆشش و خەباتدان.

ئەو خەباتکارانە چاو لەخالید دەکەن لە سەرکردایەتی سوپادا و، چاو لە ئەبو عوبەیدە دەکەن لەئەمینیداو وەك ئەبوبەکریش هەوڵی ڕاستگۆیی دەدەن و، وەك عومەریش دەیانەوێ دادپەروەربن.

پێغەمبەر ﷺ نموونەی ئەو جۆرە کەسانەی بۆباس کردوین، کە هەموو مەبەستیان ڕەزامەندی خوایە ودەفەرموێت: (طوبى لعبد آخذ بعنان فرسه، أشعث رأسه مغبرة قدماه، يطير على ظهره عند كل هيعة)[1]، واتە: خۆشی بۆئەو سوارەی کە لغاوی ئەسپەکەی بەدەستەوەیەو، سەروقژی شێواوەو پێکانی تۆزاوییەو باڵدەگرێ لەسەر پشتی ئەسپەکەی هەرکاتێك بانگ بدرێت بۆ جیهاد.

بەڕاستی ئەم جۆرە کەسانەن کە هەمیشە ئامادەن و جیهادوهەوڵ و تێکۆشانیان لاپیرۆزەو بەواجبی خۆیانی دەزانن، دیارە بەهەشت بەئاسانی‌و بەقاڵەی دەم دەست ناکەوێت و هەوڵ و تێکۆشانی بەرنامەداری دەوێت، خۆماندووکردنی دەوێت ﴿ وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴾ الإسراء: ١٩.

پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەکی تردا سیفاتی تری ئەو سەربازە نەناسراوانە باسدەکات (طوبى لعبد آخذ بعنان فرسه، مغبرة قدماه، أشعث رأسه، إذا كان في الساقة كان في الساقة، إذا كان في الحراسة كان في الحراسة، إذا شفع لايُشفع، وإذا استأذن لايُؤذن له)[2].

ئەم سەربازە نەناسراوە بەڕووت و ڕەجاڵی و نەبوونیشەوە کۆڵنادات لەخەبات بۆ دینی خواو، لەسوپادا بەپێ بڕوات گوێ ناداتێ‌و لەحەراسەتدا داینێی حەرەسی چاکە، هەرچەند لە کۆمەڵگاشدا حسابی بۆنەکرێت، ئەو قارەمانە ئەوەندە باسی خۆی ناکات بناسرێ و کارەکانی شاراوەن، بۆیە شەفاعەت بکاو تکا بکا بۆ کەسێك بەقسەی ناکەن وئەگەر داوای شتێکیش بکاو ڕوخسەت وەرگرێ ڕێی پێنادرێت.. ئەم پیاوە (طوبى)ی بۆهەیە، کە شوێنێکی بەهەشتە یا درەختێکە کەسوارێك سەدساڵ بەژێریا بڕوات نایبڕێت..

---

١- رواه بخاري.

٢- بخاري وابن ماجه.

لەفەرمودەیـەکی تریشـدا زیـاتر سـیفاتی ئەوخواناسـە تێکۆشـەرە لـەخۆبووردووەمان بۆباسدەکات و دەفەرموێت: (إن أغبط أولياني عندي لمؤمن خفيف الحاد ذو حظ مـن صـلاة، أحسن عبادة ربه، وكان غامضاً في الناس، لايُشار إليـه بالأصـابع، فعجلت منيتـه وقَـلَ تراثـه وقَلَت بواكيه)[1] واتە: خۆشەویست ودۆستم، بڕوادارێکی بارسوکە کـە نوێـژەکانی دەکـا وهـەقی دەداتی‌و بەچاکی پەرستشی پـەروەردگاری دەکـات و، نادیـارە لـەناو خەڵکیـدا وکـەس پەنجـەی بۆڕاناکێشێ‌و زوودەمرێ یان شەهید دەبێ‌و میراتی کەمەو کەسیش نی‌یە بۆی بگری!

ئەو بڕوادارە:

١- باری سوکەو قەسروقسوری نیە خەمی بێدوای خـۆی بۆکـێ بێـت؟! خـۆ بـوون باشـە بەڵام نابێ لەپێناویشیدا دنیا پەرست بێت، دەبێت لە دەسـتیا بێـت نـەك لـەدڵیا، نـەپارەی لای کەسەو نەکەسیش داوای هیچی لێدەکات.. لەیەکەم بانگی جیهادا لەڕیزی پێشەوەیە.

٢- گرنگی دەدات بەنوێـژو هـەروەك پێغەمبـەر ﷺ هەوڵـدەدات (قـرة عـين) بێـت بـۆی ( چاوی گەش دەکاتەوەو دڵی ڕۆشن دەکات)..

٣- بەچـاکی پەرستشـەکانی ئـەنجام دەدات، هـەروەك خـوای گـەورە ببینـێ خۆنەگـەر نەشیبینێ خۆئەو ئەم دەبینێ !

٤- لەناو خەڵکدا پەنجەی بۆ ڕاناکێشرێت، ئەم کـاری بـەوەش نیـەو، نـەبووە بـەدەنگ و باسی مەجلیسەکان، واتە سەربازی نەناسراوە..

٥- لەجیهادا گیان فیدایە، هێرش بـەرو چاونەترسـە، بەخـەی مـردن دەگرێـت و بـەدوای مردندا ڕادەکات نەك لەمردن ڕابکات!

٦- بۆیە کەشـەهید دەبێـت لەغەریبیـدا، لەسـاحەی جەنگـدا، کـەس نییـە بـۆی بگـری‌و فرمێسکی خۆشەویستی بۆ دابارێنێ، هەروەك حەمزە کە لەئوحـدا شـەهید بـوو پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی (لكن حمزة لابواكي له) حەمزە بەڕاستی کەسـی نییـە بـۆی بگـری، چـونکە کـەس و کارو خزمانیان هەموو لە مەککە بوون. جەعفەری ئامۆزای پێغەمبەریش ﷺ هـەروابوو لەگـەڵ ڕۆمدا جەنگاو کەس فرمێسکێکی بۆنەڕشت.. ئەوانە بەغـەریبی ژیـان و بەغـەریبیش سـەریان نایەوە، باڵی قرتا لەشەڕداو خوای گەورە لەبەهەشتدا باڵی ئاڵتونی بۆکرد.

---

١- ذكره المقدسي في مناهج القاصدين.

سوپای موسڵمانان لەگەڵ ڕۆم دەجەنگان لای شام و پێغەمبەریش لەمەدینە وتاری دەدا، خوا ئاگاداری کرد بەوەحی و فەرمووی بە ئامادەبووان، ئەوا جەعفەر شەهید بوو، ئەوا زەید شەهید بوو، ئەوا عبداللە کوڕی ڕەواحەش شەهید بوو، سێ سەرکردەی دانابوو، هەرسێکیان یەك بەدوای یەکدا شەهیدبوون، ئنجا فەرمووی ئەوا شمشێرێك لە شمشێرەکانی خوا ئاڵاکەی گرتە دەست و موسڵمانانی ڕزگارکرد.

ئەویش خالید بوو کەژیرانە کشایەوە لەجەنگەکەو نەیهێشت یەك قوربانی هەبێت، لەکاتێکدا زۆرترین کەس لە کشانەوەی جەنگدا دەکوژرێن.. ئنجا پێغەمبەر ﷺ چوو بۆماڵی جەعفەری ئامۆزایو منالە وردەکانی هاتن بەرەوپیری، باوەشی پیاکردن و فرمێسکی ڕشت و، ئنجا هەواڵی شەهیدبوونیدابە خێزانەکەیو دیارە هاوسەرەکەشی زۆر شپرزبوو بۆیە بە دەرودراوسێکەی فەرموو: ئاگاداری ماڵ ومنداڵی جەعفەربن و بەدەمیانەوەبن!

بەڕاستی ئەم سیفەتە سەیرە (لە غەریبی سەردەنێتەوە و کەس نیە فرمێسکی بۆبڕێژێ).. ئەو هەموو صحابەیە لەفەتحی وڵاتاندا لە بوخارا و سەمەرقەندو ئەفغانستان و فارس و ڕۆمدا شەهید بوون و کەس نەبوو ژوور سەریان بگرێ، کەس نەبوو قومێ ئاو بکات بەدەمیانەوە.. کەس نەبوو فرمێسکێ بڕێژێ بۆیان.. جا لە ڕاستیشدا فرمێسکیان بۆچی یە ؟؟ کەسێ خوا خۆشی بوێو ئەو گیانەی کە ئەمانەتەو ئەبێ بیداتەوە بەو شێوەجوانە بەختی بکات لەڕێی خوادا ئیتر باکی چییە؟! ئەمە هەر مەسەلە دنیایە ! ئەگینا بڕوادار لەهەرکوێ بێت دۆست و هاوەڵی مەلائیکەتی لەگەڵدایەو، مژدەی خێری ئەداتێ ﴿ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴾ فصلت: ٣١.

یەکێ لەو ئەبەردانە پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، لە شەڕی یەرموك دا هاتە لای ئەبوعوبەیدە کە ئەمیریان بوو وتی: هیچ ڕاسپاردەو کارێکت نییە لای پێغەمبەرﷺ؟! وتی: بۆچی؟! وتی: من دەزانم شەهید دەبم و دەچم بۆلای پێغەمبەر ﷺ لە قیامەتدا! ئەگەر ڕاسپاردەیەکت هەیە بابیگەیەنم. ئەبو عوبەیدەش وتی: سەلامی ئێمەی پێبگەیەنەو بڵێ (قد وجدنا ماوعدنا ربُنا حقا). ئەوەی خوا وەعدی دابوینێ لەسەرخستنی ئیسلام وابینیمان و هەق بوو!

ئەو قارەمانە لەجەنگدا ئەوەندەی نەبرد شەهیدبوو، مێژوونوسان دەڵێن یەکەم شەهیدی یەرموك بوو کە لەپێش هەمواندا هەواڵەکانی گەیاندە پێغەمبەر ﷺ لەقیامەتدا.

کەس نازانێ ناوی چیەو، چ کارەیەو لەچ بنەماڵەیەکە؟!

عومەری کوڕی خەتاب چاوەڕێی بەریدی دەکرد کەهەواڵی فەتحی نەهاوەندی بۆ بهێنێ، ئەوکەسەی هەواڵەکەی هێنا عومەر لێی پرسی کێ شەهیدبووە ؟؟ کابراش وتی: نوعمانی کوڕی موقرن شەهیدبووەو فلان و فلانیش لەسەرکردەکان و هەندێ کەسیش لە سەربازان کە کەس نایان ناسێ! عومەر بەچۆکا هات و گریاو فەرمووی: مەلا کەس نایان ناسێت!! چ باکیانە ئەگەر عومەری کوڕی خەتاب نەیانناسێ وخوایەك لەسەرو حەوت ئاسمانەوە بیانناسێ و شەهیدی بکات بەنسیبیان!..

ئەوانە سەربازی نەناسراو بوون و وەك ڕەگ لەسەرسەریان درەختی ئیسلامیان ڕاگرتبوو هەرچەند کەسیش نەیدەبینین.[1]

هاوەڵان بەیعەتێکی بێسنووریان دابوو بەپێغەمبەر ﷺ نەك هەرلەژیانی خۆیدا بەڵکو دوای کۆچی موبارەکیشی هەرلەسەر عەهد و پەیمانەکە بوون..

سەعدی کوڕی موعاذی تەمەن (٣٥) ساڵ، نوێنەری ئەنصار بوو، لە جەنگی بەدردا پێغەمبەر ﷺ کە بەتەمای کاروانەکە بوو، تووشی سوپای کافران هات، حەزی نەکرد یەکسەر بجەنگێ، بۆیە ڕاوێژی لە گەڵکردن کە ئایا بجەنگن یان نا؟ سەعدیش وتی: ئێمە باوەڕمان پێت هێناوە، متمانەمان پێداویت، شایەتیمان داوە ئەوەی تۆ هێناوتە ڕاستە، لەسەر ئەو بنەمایەش پەیمان و بەڵێنمان داوە کە گوێڕایەڵت بین، ئەی پێغەمبەری خوا بڕۆ بۆ ئەو مەبەستەی خۆت دەتەوێت، سوێندم بەو کەسەی تۆی بەهەق ناردووە، ئەگەر بمانکەیت بەگژ ئەو دەریایەدا لە گەڵت دێین و، یەك پیاومان دواناکەوێت و ناترسین لەوەی سبەینێ بچین بەگژ دوژمندا، ئێمە لەم جەنگەدا ئارام دەگرین، ڕاستگۆین لە ڕووبەڕووبوونەوەدا، بەڵکو خوای گەورە بەهۆی ئێمەوە شتێکت نیشان بدات کە دڵ و چاوتی پێ خۆشنوود بێت، بمانخەرە ڕێ لەسەر بەرەکەتی یەزدان.

ئەوەیە هەڵوێست، دیارە هەر ئەوەشی لێ چاوەڕێ دەکرێت، معاذ ئەو هیممەت بەرزە بوو کە تەمەنی هەموو ئیسلامەتیەکەی حەوت ساڵێك بوو، لە جەنگی خەندەق دا بریندار بوو، پاش ماوەیەك برینەکەی ئەزیفی بەربوو بەشەهیدی سەری نایەوەو عەرشی خوای بۆ هاتە لەرزە.[2]

---

١- ل: ٦٩خواطر دعوية /أحمد قطان.

٢- (گولاوی سەرمۆر).

# گەڕان بەدوای ئاسوودەییدا

## یەکەم: سەعید زەیانی:

شێخ سەعید زەیانی باسی ژیاننامەی خۆی دەکات و دەڵێت: منیش وەکو خەڵکی عەودالی بەختەوەری بووم و وامدەزانی کە بەختەوەری وا لە ماڵ و سامان و پلەو پایەدا، لەمنالییەوە بەشداریم کرد لە بەرنامەی منالاندا لە تەلەفیزیۆندا و کە گەورەش بووم ئەکتەروگۆرانیبێژێکی بەناوبانگم لێدەرچوو، زۆر لە کاربەدەستان بوونە هاوەڵم وەك سەرۆك وەزیرانی مەغریب کەزوو زوو سەردانم دەکردو، زۆر لە هونەرمەندانیش بوونە هاوەڵم وەك (عبدالحليم حافظ)، بەخۆمم دەوت: باشە ئەگەر بشگەمە (عبدالحليم) خۆ ئەوەتا خۆی دەڵێ بەختەوەر نیە، پاشان مردنی ناوبراو زۆر کاری تێکردم و، هەردەم بیرم لای گەیشتن بوو بە ئاسوودەیی و بەختەوەری.

جارێکیان لە ساڵی (١٩٧٤) دا ڕۆژنامەنووسێك پرسیاری لێکردم و وتی: تۆ ناوت (سعید)ە ئایا گەیشتوویتە سەعادەت و بەختەوەری؟ منیش وتم: ناوەکەم لە چوار پیت پێکهاتووەو سێ پیتی (سعى)یەو هەوڵە بەدوای دۆزینەوەی پیتی(د)دا تا بەتەواوی بگەمە بەختەوەری، پەیمان بێت کە گەیشتم هەواڵت بدەمێ.

بەڵێ پارە و سامانم زۆربوو، ناو و شۆرەتم زیادبوو، سەردانی ڕۆژئاوام کرد، کەچی هەر بەختەوەرنەبووم. شەیتانیش وەسوەسەی پێدەکردم و هانی دەدەم کەمادەم ناگەمە بەختەوەری و ئاشادم خۆم بکوژم!

لەو ماوەیەدا پەڕاوێکی نووسەرێکی فەرەنسیم دەستکەوت کەباسی خۆکوشتنی دەکردو ئاماری زۆری تیابوو، لام سەیربوو کە ڕێژەی خۆکوشتن لە سوید زۆر زۆر بوو، لە کاتێکدا زۆر ژیان ئارام و خۆشە لەو وڵاتەدا.. تەنانەت پردێکیان هەیە پێی دەووترێت پردی خۆکوشتن، ئەوەندە خەڵکی لەژیان بێزار خۆیانی لێ فڕێدەدەنە خوارەوە..هەر لەو ماوەیەدا پەڕاوێکی ترم خوێندەوە لەبارەی ئەو کەسە ناودارانەی لە ڕۆژئاوا موسڵمانبوون، وەك گۆرانی بێژی بەریتانی کات ستیڤنس، کەناوی خۆی کرد بە یوسف ئیسلام. ئەوانە بە بەرنامەی خوا گەیشتنە لوتکەی بەختەوەری..

براکەشم بە هۆی کۆمەڵێ برادەری بانگخوازەوە لە هۆڵەندا بوو بە پیاوێکی خواناس و بەتەواوی ژیانی گۆڕدرا و، زۆر هەوڵیشیان لەگەڵ من دا، بۆیە منیش بڕیارم دا تەوبەبکەم و پەیڕەوی بەرنامەی خوا بکەم.. بەمەش گەیشتمە ئەو بەختەوەری و ئاسوودەییەی کە بە دوایا وێڵ بووم، کە ئەوەش ئاواتی دایکم بوو کەهەمیشە دەست بەدوعابوو خوا هیدایەتم بدات..ئنجا نامەم نووسی بۆئەو ڕۆژنامەنووسەی کە کاتی خۆی پرسیارەکەی لێکردم، وتم: وا پاش دوانزە ساڵ لە پرسیارەکەت لە سایەی خواوە پیتی چوارەمی ناوەکەمم دۆزیەوە و لە سایەی بەرنامەکەی خواوە بەختەوەربووم.[1]

## دووەم: شادیە:

هونەرمەندی میسری شادیە هەتا تەمەنی (٥٥) ساڵی ئەستێرەی گەشی ئاسمانی هونەرو گۆرانیبێژی موراهیقەکان بوو، بە چل ساڵ کاری هونەری لە سەد فلیمدا بەشداری کردو (٤٠٠) گۆرانی تۆمارکردو، لەساڵی (١٩٨٤) دا شانۆگەرییەکی زۆر سەرکەوتووی پێشکەشکرد بەناوی (ريا و سكينة) وە..لە لوتکەی سەرکەوتنندا بۆی دەرکەوت کە دوای سەراب کەوتووە و، کاتێ لە (١٩٨٤) دا چوو بۆ حەج بۆی دەرکەوت کە بەختەوەری و ئاسوودەیی وا لە بەرنامەکەی خواداو لە هیچ لایەکی ترەوە دەست ناکەوێت..

لەتەمەنی (٥٥) ساڵیدا لەبەردەم ئارامگەی ڕەسوولی ئازداردا بڕیاری گۆرانی دا، شادیە دەڵێت: ئەو ڕۆژە خۆمم دۆزیەوە و زانیم بۆچی دەژیم و بەرچاوم ڕوون بوو، هەستم بە ئاسوودەیی و بەختەوەری ڕاستەقینە کرد.. زۆر جار دەیانەوێت لە ڤیستیڤاڵی ناوخۆو جیهانیدا خەڵاتم بکەن لەسەر کارەکانی ڕابردووم منیش نامەوێ چونکە لە هەموو ڕابردووم پەشیمانم ئیتر چۆن خەڵاتی لەسەر وەرگرم.

---

١- سایتی (التوابون)

# لە موعجیزەکانی قورئان و فەرموودە

## یەکەم: دۆزینەوەی ئنجیلی یەهوزا:

ئینجیلەکان بەگشتی و ئینجیلی بەرنابا بەتایبەتی مژدەی زۆری تیایە بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ، هەر لە زووەوە کەنیسە خوێندنەوەی ئینجیلی بەرنابای حەرام کرد و زۆر لەو مژدانەی تریش وا تەفسیر دەکەن کە دووری بخەنەوە لەوەی ببێتە مایەی هیدایەتی خەڵکی.

ڕۆژنامەی (واشنتۆن تایمز) لە (٦ ی ئیبریلی ٢٠٠٦) وتارێکی کۆمەڵەی جوگرافیای نێودەوڵەتی بڵاوکردەوە، کە لە بارەی ئینجیلی یەهوزایە کە لەساڵانی حەفتاکاندا لە شاری (المنیا)ی میسر دۆزرایەوە وگەیشتە سویسرا. پاش دە ساڵ دیراسەو وەرگێڕان بۆ زمانی ئینگلیزی ئەمساڵ چاپکراو بڵاوکرایەوە.. ئەم ئینجیلە لە کۆتاییەکەیدا وتەیەکی پێغەمبەری عیسای تیایە کە فەرموویەتی بە حەوارییەکانی کە یەهوزا جیاواز دەبێ لە حەوارییەکانی تر بەوەی کە دەچێتە سەر شێوەی پێغەمبەری عیساو دەبێتە قوربانیو لە جێی ئەو لە خاچ دەدرێت..

مەسیحیەکان دەڵێن: گوایە یەهوزا خیانەتی لە پێغەمبەری عیسا کردووە بۆیە چۆتە شێوەی پێغەمبەری عیساوە، لەوە دەچێت وانەبێ..بەهەرحاڵ گرنگ ئەوەیە ئەمە بەڵگەیە کە یەکێکی تر چۆتە سەر شێوەیپێغەمبەری عیسا و لەجیاتی ئەو لە خاچ دراوە هەروەك قورئان باسی کردووە ﴿ وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا ﴾ النساء: ١٥٧. واتە: جوولەکەکان دەیان وت: ئێمە عیسای کوڕی مەریەمی پێغەمبەریخوامان کوشت، نەکوشتوویانەو نە لەخاچیان داوە، بەڵکولێیان تێکچووەو هاوشێوەکەیان کوشتووە، بەڕاستی ئەوانەی کە بیرو بۆچوونی جیاوازیان لەو کێشەیەدا هەیە خۆشیان لە گوماندان تیایداو ئەوانە هیچ زانستێکی ڕاستیان نیە لەو بارەیەوە جگە لە شوێن کەوتنی گومان نەبێت و بە دڵنیاییەوە نەیانکوشتووە، بەڵکو خوا بەرزی کردەوە بۆ لایخۆی، خوا هەمیشە بالادەست و دانایە ﴿ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴾ النساء: ١٥٨.

ئەم ئینجیلە دەستخەتە لەسەر ئەوراقی (بردی) لە سەدەی سێی زاینیدا نووسراوەتەوە، واتە چوارسەد ساڵێك پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ. بەڵێ هەروەك چۆن لە دایکبوونی پێغەمبەری عیسا موعجیزە بوو چوونەوە بۆ ئاسمانیشی و هاتنەوەی بۆ سەرزەوی هەر موعجیزەیەو، کە قورئانیش باسی دەکات و ڕاستیەکان دەخاتە ڕوو گەورەترین موعجیزەیە و ئەگەر کەسێك تۆزقاڵێك ژیرو بەویژدان بێت، شایەتانی هەق دێنێ و دەبێتە شوێنکەوتەی ئەم ئاینە بەرزە پیرۆزە کە بەردەوام موعجیزاتی دەردەکەوێت ﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ فصلت: ٥٣ .

## دووەم: بەنداوی مەئرەب:

قورئان باسی بەنداوی مەئرەب دەکات و دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ ۖ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ ۖ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ ۚ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴾ سبا: ١٥ واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی بۆ خەڵکی سبأ لە وڵاتی خۆیاندا بەڵگەونیشانەی دەسەڵاتی خوا ئاشکرایە، کە ئەویش دووباخی زۆر گەورە بوو لەلای ڕاست و لای چەپی ناوچەکەدا، فەرمانیان پێدرابوو کە: بخۆن لە ڕزق و ڕۆزی پەروەردگارتان وسوپاسگوزاری بن، وڵاتێکی خۆش و ئاوەدان، پەروەردگارێکی لێخۆشبوو و لێبووردە.. ﴿ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴾ سبا: ١٦ جا ئەوان لەجیاتی شوکرانە بژێری وخواپەرستی پشتیان هەڵکردوو بەدەم بانگەوازی خواوە نەچوون، بە هۆی ئەوەوە ئێمەش لافاوی وێرانکەری بەنداوەکەمان ناردوو، ئەوسا چی کشتوکاڵ و باخاتیان هەبووهەمووی فەوتا و بوو بە دووباخی دڕکاوی بەروبووم تاڵ و درەختی بێبەری وەك دارگەزۆو کەمێك درەختی (سدر) یش کە بەروبوومی کەمی هەیە..تا بەو جۆرە سەختە تۆڵەمان لێسەندن بەهۆی ئەوەوە کە بێباوەڕو سپڵە بوون، ئایا ئێمە تۆڵە هەر لەکافرو سپڵە ئاسێنین ﴿ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا ۖ وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴾ سبا: ١٧.

ئەو بەنداوە (١٦) مەتر بەرز بوو (٦٠) مەتریش پان بوو (٦٢٠) مەتریش درێژ بوو، (٩٦٠٠) هێکتار زەوی ئاو دەدا، کە (٥٣٠٠) هێکتاری لە دەشتی خواروو، باقیەکەشی دەشتی باکوور بوو، ئەم دوو شوێنەش لە نووسینە کۆنەکانی سەبەئیەکاندا کە تازە دۆزراوەتەوە

به (مأرب) و (سهلان) ناوبراوه، ئەمەش ئەو دووناوچەیەیە کەقورئان بە دوو (جنــة) نـاوی دەبات (جنتين عن يمين وشمال)، ئەم بەنداوە لە سەدەی پێنجەم و شەشەمی زاییندا تـەعمیریان کردو، خەڵکی ناوچەکە لە بواری کشتوکاڵ و ئاودێریدا زۆر پێشکەوتوو بـوون وبـارو گـوزەران و ئابووریان زۆر باش بوو، تا لە ئەنجامی کوفرو زیادەڕویانەوە خوا غەزەبیلێگرتن و لافـاوێکی بـۆ بەنداوەکە نارد لە ساڵی (٥٤٢) زاییندا و وێرانی کرد وناوچەکە غـەرقی ئـاوبوو، هـەموو مـاڵ وێران بوون، ئەمەش پەندوعیبرەتە بۆ هەرکەسێ دڵی هوشیار بێت..

دیارە ئەم ڕووداوە لە تەورات و ئینجیلدا باس نـەکراوە چـونکە نزیکـەی (١٥٠) سـاڵێك پێش هاتنی پێغەمبەر ڕوویداوە، جاقورئـان زۆر بـە وردی باسـی دەکـات و دۆزینـەوەکانی ئـەم ساڵانەی دوایش لەو ناوچەیەدا موعجیزەی قورئان دەسەلمێنن، زانای ئاپاری مەسیحی (وورنـر کیلر) خاوەنی پەڕاوی (الكتاب المقدس كان صحيحا) دەڵێت: ئەولافاوی بەنداوە (سـيل العـرم)ە ڕوویداوە لەو ناوچەیەدا هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە، تیاچوونی ناوچەکە هەمووی بە هۆی ئەوەوە بووە، کە ئەمەش ئەوە دەسەلمێنیَ ئەو نموونە قورئانیـە لـەبارەی ئـەو گەلـەوە کـە خاوەنی ئەو هەموو باخ و باخاتە بوون بەڕاستی ڕوویداوە).

باشە پێغەمبەر لە مەککەوە چیداوە لە باسێکی ئـاوا وردی سـەدو پـەنجا سـاڵێکی پـێش خۆی لەبارەی گەلی(سبأ) ەو، ئەگەر خوا بەوەحی بۆی نەناردبێت؟! مرۆڤی ژیـر لـەبەر دەم ئـەم ڕاستیانەدا دەڵێت: شـایەتی ئـەدەم کـە ئـەم قورئانـە لـە خواوەیـە و محمـدیش ﷺ پێغەمبـەری خوایە...[1]

## سـێیـەم: دۆزینـەوەکـانی شـاری ئور لـە عـێراق:

دۆزینەوەکانی (ئور) لە عێـراق ئاشـکرای کـرد کـە خـەڵکی وادی ڕافیـدەین لـە زەمـانی کۆنەوە مـانگ و خۆرو ئەستێرەیان بە پیرۆز زانیـوە و پەرستویانن، بـە تایبـەت خـوای مـانگ کەناوی (سن) بووەو پەیکەریان لەبەرد بۆ تاشیووەو لـە سـەر بـەرد وێنـەیان بـۆ کێشـاوە، کـە وێنەکەش وەك دۆزراوەتەوە بریتی بووە لەپیاوێکی ڕیش درێـژ کـە مـانگ لـە شـێوەی هیلالـدا لەسەر دەستێتی، ئەم بت پەرستیەش چەند هەزارساڵی خایاند.

---

١- پەڕاوی/الأمم البائدة/هارون يحيى، لا:١٢٠.

باشە هاتنی پێغەمبەری ئیبراهیم چەند هەزار ساڵ پێش پێغەمبەر بووە، پێغەمبەر لە کوێ زانی گەلەکەی ئیبراهیم چیان پەرستووە؟ ئنجا دۆزینەوەکان لەم دواییەدا پاش هەزاروچوارسەد ساڵ شایەتی ئەدەن لەسەر ڕاستێتی قورئان کە لەبارەی گەلی ئیبراهیمەوە دەفەرموێت ئەستێرەو مانگ و خۆریان پەرستووە: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّىٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴾ الأنعام: ٧٤ – ٧٨.[١]

یان بۆ گەلی (سبأ) دەفەرموێت کە خۆریان پەرستووەو دۆزینەوەکانی سەردەمیش لە یەمەن ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن.. یان بۆ گەلی نوح دەفەرموێت پێنج بتیان پەرستووەو ناوی هەریێنجیانیش دەبات و دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴾ نوح: ٢٣

## چوارەم: کوژانەوەو ساردبوونەوەی مانگ:

قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ وَكُلَّ شَىْءٍ فَصَّلْنَٰهُ تَفْصِيلًا ﴾ الإسراء: ١٢

ئیبن عباس دەڵێت (کاتی خۆی مانگیش وەکو خۆر ڕووناك و دیاربوو، کە ئایەت و بەڵگەی شەوە، ڕووناکیەکەی نەماو ئەو ڕەشیەی دەیبینن لە مانگدا ئەوەیە) بەڕاستی جوانی پێکاوە، ئەوەتا لە سەدەی بیستدا زانایان پاش ئەوەی چوونە سەرمانگ و دیراساتی زۆریان لەسەرکرد دەڵێن: لە سەرەتای دروستبوونی مانگدا کە پێش نزیکەی (٤,٥) ملیار ساڵە، یەك پارچە گڕوگەرمی بووەو ڕووناکی داوەتەوە وەکو خۆر، بەهۆی ئەو گڕکانە زۆرانەی کەتیادەتەقینەوە

---

١- موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة.

وشەویش دنیا وەکو ڕۆژ ڕووناك بووەو، دواتر کە سارد بۆتەوە ئەو ڕووناکی‌یەی نەماوەو، بەهۆی ئەو ڕووناکی‌یەوە دەبینرێت کە لە خۆرەوە دەکەوێتە سەری و ئەیداتەوە[1]..

## پێنجەم: موعجیزەیەك لە سورەتی یوسف دا:

قورئان لە سورەتی یوسف دا دەفەرموێت: ﴿ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِي سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ لَّعَلِّيٓ أَرْجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴾ یوسف: ٤٦ - ٤٩

کاتێك پاشاخەوەکەی بینی وکەس نەبوو بۆی لێکبداتەوە، یەکێکیان نارد خەوەکەی بۆ یوسف گێڕایەوە: یوسف ئەی ڕاستگۆ ئەم خەوەمان بۆ لێك بدەرەوە، حەوت مانگای قەڵەو لە لایەن حەوت مانگای لاوازەوە خوراون، هەروەها حەوت گوڵە گەنمی سەوزوجوان و حەوتی تری وشك، بۆمان لێکبدەرەوە بۆئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای خەڵکی تا وەڵام بزانن.

یوسف وتی: حەوت ساڵی بەردەوام کشتوکاڵ دەکەن ودانەوێڵە دەچێنن، ئەوەی دروێنەی دەکەن و لێتان زیادبوو بەگوڵەکەیەوە بیهێڵنەوە، مەگەر ئەو کەمەی کەدەیخۆن، پاشان لە دوای ئەوە حەوت ساڵ گرانی و سەختی پێشدێت، ئەوەی کە هەڵتان گرتووە بۆ ئەو ساڵانە هەمووی دەخۆن، مەگەر کەمێکی نەبێت کە هەڵی دەگرن بۆ تۆو. لەوەودوا ساڵێکی باراناوی و پڕ بەرەکەت دێت کە خەڵکی بەروبوومی زۆریان پێدەبەخشرێت، میوە دەگوشن و شەربەتی لێ دروستدەکەن.

دکتۆر عبدالمجید بلعابد دەڵێت:

١- لە ئایەتەکەوە دەردەکەوێت کە حەوت ساڵی باراناوی تۆوەکە هەڵگیرێت و حەوتی تریش کە بێ بارانیە و ساڵێکی تریش کە وەزعەکە چاك دەبێت، ئەمە پانزە ساڵ کە ڕەنگە هەندێ لە تۆوەکان دوای ئەو ماوە زۆرە بەکاربێت، زانستی سەردەم سەلماندویەتی کە تا پانزە ساڵ تۆو بە کەڵك دێت هەڵگیرێت و بتوانرێ بچێنرێت.

---

١- سایتی مەکنون.

٢- شێوازی هەڵگرتنەکەش بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە چاکترین شێواز ئەوەیە کە بە گوڵەکەیەوە هەڵبگیرێت و بەو ڕێگایە ٣,٢٠٪ ی کێشی ون دەکات بە هۆی نەمانی ئەو ئاوەی کەتیایەتی، بەمەش وشك دەبێت و بۆگەن ناکاو خراپ نابێت. (فذروه فی سنبله). ئەم ڕێگای هەڵگرتنەش میسری‌یەکان نەیان دەزانی ودیارە خوای گەورە بەوەحی فێری پێغەمبەری یوسفی کردووە.

٣- لە خەوەکەدا ئیشارەتی تیانیە بۆ ساڵە خۆشییەکەی دوایی ئەمەش هەرخوا ئاگاداری کردووەو دواییش هەمووی وا دەرچوو..

٤- ئنجا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ خوا ئاگاداری نەکردبێت، ئەم وردەکاری‌یە زانستیە چووزانێت کە بە هەزاران ساڵ پێش خۆی بووە و لەژیانی پێغەمبەری یوسفدا ڕوویداوە.[1].

## شەشەم: ئومەتی ئیسلام ولاسایی کردنەوەی گەلانی تر

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لاتقوم الساعة حتی تأخذ أمتی مأخذ القرون قبلها، شبرا بشبر، و ذراعا بذراع. فقیل له: یارسول الله كفارس والروم؟ قال: ومَن الناس الا أولئك)[2]. واتە: قیامەت نایەت هەتا ئومەتم شوێن پێی گەلەکانی پێش خۆی هەڵنەگرێت، بست بە بست و باڵ بە باڵ، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا، وەك فارس و ڕۆم ؟ فەرمووی: خەڵکی کێن هەر ئەوان نین!

هەروەها دەفەرموێت: (لتتبعن سنن من قبلكم شبرا بشبر وذراعا بذراع، حتی لو دخلوا جحر ضب لاتبعتموهم، قلنا: یارسول الله، الیهود والنصاری؟ قال: فَمَــن)[3]، واتە: شوێنی گەلانی پێش خۆتان دەکەون بست بەبست و باڵ بەباڵ، تەنانەت ئەگەر بچنە کونی بزن مژەشەوە بە دوایانا دەچن (کە کونەکەی زۆر بۆگەنە) وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا جوولەکەو گاور؟ فەرموی: ئەی کێ!.. لە فەرموودەیەکی تریشدا کەحاکم ڕیوایەتی‌کردووە، ئەوەشی‌فەرمووە: ئەگەر یەکێ لەوانە لە سەر جادە بچێتە لای ژنەکەی لاسایی دەکەنەوە.. (وحتی لو أن أحدهم جامع امرأته بالطریق لفعلتموه).

---

١- نینتەرنیت.

٢- رواه بخاري.

٣- رواه بخاري ومسلم.

هەركەس ئەمڕۆ سەیریحاڵی موسوڵمانان بكات ئەم ڕاستییە بە ئاشكرا دەبینێت لە لاسایی كردنەوەی ڕووت و قووتی و فەسادو خراپەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، جا ئەگەر پێغەمبەر بەوەحی لە خواوە ئاگادار نەكرابێ، چۆزانێ ئوممەتەكەی كە لە زەمانی خۆیدا لەو پەڕی فەرمانبەری و ئیلتیزامدا بوون لە پاشەڕۆژدا دوای خۆی ئاوایان لێدێت؟؟ ئایا ئەمە بەڵگە نیە لەسەر پێغەمبەرێتی ئەو زاتە پایە بەرزە؟

## حەوتەم: مەرگی موجافات:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (ان من أمارات الساعة أن يَظهر موت الفجـأة)[1]. واتە: لە نیشانەكانی قیامەت دەركەوتنی مردنی كوتوپڕە..ئەم فەرموودەیە موعجیزەیەكی زانستی پزیشكی تیایە كە شایەتی دەدات لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەرﷺ. ئامارەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان دەڵێن: ژمارەی ئەوانەی بە جەڵتەی دڵ و دەماغ دەمرن ڕوو لە زیادبوونەو، نەخۆشیەكانیدڵ هۆكاری یەكەمی مردنن لە جیهاندا لەم سەردەمەدا.

ئەگەر خوای گەورە فێری نەكردبێت پێغەمبەر چۆزانێت كە مەرگی موجافات زیاد دەكات و ئەبێتە دیاردەیەك؟

مەرگی موجافات دیاردەیەكی تازەیە، یەكەم دیراسە لە ساڵی (١٩٤٨) فرامنغهام كردی، بۆی دەركەوت كە ئەو كەسانەی نەخۆشی دڵیان هەبوو، وە تەمەنیان لە نێوان (٤٥) و (٧٥) ساڵدا بوو لە ٦٠٪ یان لەپڕ مردوون..زانایان دەڵێن: مردنی كتوپڕ ئەو مردنە چاوەڕوان نەكراوەیە كە لەماوەیەكی كورتی كەمتر لە سەعاتێكدا ڕوودەدات.

ئامارەكان دەڵێن: كە یەكەم هۆكاری مردن لە ئەمریكا نەخۆشیەكانی دڵ و جەڵتەیە و ڕێژەكەی دەگاتە ٢٨٪ ی حاڵەتەكانی مردن، لەساڵی (٢٠٠١) دا (٧٠٠) هەزار كەس لە ئەمریكا بە نەخۆشی دڵ مردوون، كە زیاتر لە ٣٠٠ هەزاریان مردنیان كتوپڕ بووە..ئەم ژمارەیەش لە ئەمریكاو لە گشت جیهاندا ڕوو لە زیادبوونە..ئەمە بەمەرجێك لە ئەمریكاو جیهاندا ساڵانە بە ملیۆنەها دۆلار بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشییە سەرف دەكرێت.

ڕەنگە یەكێ بڵێت: ئەوساش ئەو نەخۆشییە هەبووەو زانراوە! نەخێر تەنها پەنجا ساڵێك دەبێت باسی لێوە دەكرێت و وەك پێغەمبەر دەفەرموێت دەردەكەوێت!

---

١- رواه الطبراني.

جا ئەگەر بزانرایە باسدەکراو هیچ نەبێ شاعیرەکان شیعریان لـە بارەیـەوە دەووت، ئنجا ئەوەتە پێغەمبەر دای دەنێت بە نیشانەیەك لە نیشانەکانی نزیك بوونەوە لە قیامەت، ئەگەر ئەو نەخۆشی‌یە بزانرایە لەو زەمانەدا چۆن کافرەکان نەیانـدەکرد بەهـەرا لێ‌یو نـەیان دەووت: وانیە ئەوە نیە ئێستا هەیە ئیتر نیشانەی قیامەتی چی؟ ئاشـکرایە کـافران لـە پـەرێزدا بـوون بۆی و خواخوای بچوکترین شتیان بوو بەدرۆی بخەنەوە.

جگەرەخواردن وباری دەروونی وخەم وخەفەت هۆکارن بۆئەو نەخۆشی یە و، ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش هانی مرۆڤ دەدات کە دوریکەوێتەوە لە هەر شتێك کـە تەندروسـتی تێـك بـدات، ئنجا زۆر هانیشی دەدات لەسـەر ئـارامی دڵ و دەروون، کـە ئـەوەش بـە یـادی خـوا دەبێـت، قورئـــان دەفـــەرموێت ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ الرعد:٢٨. هەروەها بەبڕوابوون دەبێت بە قەزاو قـەدەر کـە سـڕێکە لـە ئەسـراری خوا. (أن تؤمن بقضاء الله وقدره خيره وشره).

## هەشـەم: پێغـەمبـەر ﷺ شـەهیـدە:

لــە ئــەنجامی لارولــەوێری و پــەیمان شــکێنی جوولەکــەوە، پێغەمبــەر ﷺ ســوپای کۆکردەوەوچووە سەر قەڵاکانی خەیبەر، ڕۆژی یەکەم ئاڵا بەدەسـت(ئەبوبـەکر)ەوە بـوو قەڵاکـە فەتح نەکرا، ڕۆژی دووەمیش بە دەست (عمر)ەوە بوو هەر فەتح نەکرا، پێغەمبـەر فـەرمووی: سـبەینێ ئاڵاکـە ئەدەمـە دەسـت پیاوێـك کـە خـواو پێغەمبـەری خـۆش دەوێـت و خـواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت و قەڵاکەش فەتح دەکات، هەموو هاوەڵان ئاواتە خوازبوون ئەوکەسە بن کە ئاڵاکەیان پێئەدرێت، بۆ بەیانی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کوا عەلی؟؟ وتیـان: چاوی نووساوەو ئاساغە، فەرمووی: بیهێنن، کە هێنایان تفی موبارەکی دا لە چاوی و دوعای بەسەردا خوێند، دەم و دەست چاك بوو، هەردەتووت نەخۆشیش نەبووە، ئنجـا ئاڵاکـەی دایـە دەستی وتوانی فەتحی قەڵاکە بکات هەروەك پێغەمبەر فەرمووی، قـەڵاکانی تـریش خۆیـان دا بەدەستەوەو لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێکەوتن. ئنجا ژنێکی جوولەکە بەناوی زەینــەب کـە خێزانـی سـەلامی کـوڕی مشـکم بـوو، مەڕێکی سـەربڕی و لێـی ئـاو ژەهـری پێـوەکرد بەتایەبـەت دەسـتەکەی کـەزانی پێغەمبـەر حـەزی لێدەکات، کـە بۆیـان دانـان هاوەڵێـك بـەناوی بیشر

کوڕیبەرا و پارووبەکی لێخواردوو پێغەمبەریش کەخستیە دەمیەوە فەرمووی: ئەم گۆشت و ئێسقانە دەڵێت: مەخۆ ژەهرم پێوەکراوە، کاتێك ژنەکەیان هێنا دانی نا بە تاوانەکەیداو وتی: ژەهرم پێوەکردو وتم: ئەگەر پێغەمبەر بێت خوا دەیپارێزێت و ئەگەر واش نەبێت لە کۆڵمان دەبێتەوە، پێغەمبەر پێی فەرموو: خوا ناهێڵێ ئەوەت بۆ بچێتە سەر و تۆ ناتوانی من بکوژیت. هاوەڵان وتیان بیکوژین، پێغەمبەر نەیهێشت، بەڵام کە بیشر مرد درایە دەست کەس و کاریو لە تۆڵەی ئەودا کوشتیان .

هەرچەند پێغەمبەر گۆشتەکەی نەخوارد بەڵام هەر زیانی لێداو ساڵانە ئازاری بۆ دەهاتەوە و ئەنەس دەڵێت: کاریگەری ژەهرەکەم دەبینی لەسەر پووك و پێشەوەی زمانی پێغەمبەردا.

پێغەمبەر ﷺ لەم بارەیەوە لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا دەفەرموێت: (ما زالت أكلة خيبر تعتادني كل عام، حتى كان هذا أوان قطع أبهري)[1]، هەروەها لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا بە عائیشەی فەرموو: (ما أزال أجد ألم الطعام الذى أكلت بخيبر، فهذا أوان وجدت انقطاع أبهري من ذلك السم)[2]. واتە: بەردەوام هەست بە ئازاری ئەو خواردنە دەکەم کە لە خەیبەر خواردم، ئێستاش کاتی ئەوەیە کە خوێنبەرم بەو ژەهرە دەتەقێت.

دکتۆر مجاهد أبو المجد لە میسر سێ سەعات لەگەڵ زانایانی بواری شەریعەو زانایانی بواری پزیشکیدا تاووتووی ئەم فەرموودەیەیان کردو گەیشتنە ئەوەی کە موعجیزەیەکی گەورەی تیایە: زانایان وتیان لە کۆنەوە (زەرنیخ و ڕەصاص) وەك ژەهر بەکار هاتووەو ئەو ژەهرەش سەلماوە کە لە خوێنبەردا دەنیشێ و دەیتەقێنێت، ئنجا ئەم نەخۆشیە (١٤) ڕۆژێك دەخایەنێ و لە نیشانەکانی سەریەشەو ئارەق کردنەوەی زۆرو بێهێزییە، کە هەمووی لە پێغەمبەردا دیاری داو چواردە ڕۆژێك بەوحاڵەوە مایەوەو ئارەقی زۆری دەکردەوەو سەری دەیەشاو دەچوونە ژێر باڵی..باشە پێغەمبەر چۆن زانی کەکاتی ئەوە هاتووە بەهۆی ژەهرەکەوە بۆری خوێنبەری بتەقێت؟ ئەگەر خوا ئاگاداری نەکردبێت؟!

---

١- أبو نعيم فى الطب.

٢- رواه بخاري.

لە کاتێکدا بۆ یەکەم جار لە سەرچاوە پزیشکێکاندا لەساڵی (١٨٢٦)ز دا باسی خوێنبەرو جەڵتەو تەقینی ئیشارەتی پێدراوەو لە ساڵی (١٩٥١)دا زیاتریاسکراوە، بەڵێ ئاماژەکردنی پێغەمبەر بۆ ئەو مەسەلەیە پێش چوارده سەدە موعجیزەیەکی گەورەیەو بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرێتی ئەو زاتە پایە بەرزە. کە بەمەش بێجگە لە پلەی پێغەمبەرێتی پلەی شەهیدیش خوا کردی بە نسیبی.[1]

## نۆیەم: نووستن لەسەر لای ڕاست:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اذا اتیت مضجعك فتوضأ وضوءك للصلاة، ثم اضطجع علی شقك الایمن)[2]، دکتۆرێکی ئوسترالی وگۆڤاری تایمیش کە دیراسەیەکی بەریتانی بڵاوکردەوە جەخت دەکەنە سەر ئەوەی ئەو منداڵانەی لە سەردەم دەنوون ڕێژەی مردنی کتوپڕیان سێ ئەوەندەی ئەو منداڵانەیە کە لەسەر لایەکیان دەنوون..هەروەها دکتۆر (ظافر العطار) دەڵێت: نووستن لەسەر دەم و لەسەر پشت زیانی بۆ تەندروستی هەیە و باشترین نووستن ئەوەیە کەلەسەر لای ڕاست بێت.. تاقیکردنەوەکانی زانایان (غالتیة و بوتسیة) سەلماندیان کە خواردن لە (٢،٥ تا ٤،٥)کاتژمێری دەوێت کە لە گەدەوە بچێت بۆ ڕیخۆڵە ئەگەر ئەو کەسە لەسەر لای ڕاست بنوێت، بەڵام ئەگەر لەسەر لای چەپ بنوێت (٥ تا ٨) کاتژمێری دەوێت.

ئەمەش موعجیزەیەکی ترە لە موعجیزەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر ئەو زاتە موبارەکە لە خواوە فێرنەکرابێت چووزانێت نووستن بە چ بارێکدا باشەو هەقی چییە بەسەر ئەو مەسەلەیەوە؟؟[3]

## دەیەم: خواردن و خواردنەوە بە دانیشتنەوە باشترە

قەتادەو ئەنەس دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەوەی کە بە پێوە ئاو بخورێتەوە، قەتادە وتی: ئەی خواردن؟ فەرمووی: ئەوە خراپترە.[4].

---

١- کەناڵی إقرأ.

٢- رواه بخاري و مسلم.

٣- (سایتی الاسد. نیت).

٤- رواه مسلم.

دکتۆر عبدالرزاق گەیلانی و دکتۆر راوی دەڵێن: باشترین حاڵەت بۆ خواردن و خواردنەوە ئەوەیە کە بەدانیشتنەوە بێت چونکە لەش زیاتر لەباری هاوسەنگی و نارامیدایەو کەمتر دەبێتە مایەی قورحەی گەدە.[1]

## یانزەیەم: هاتنەوەی خەلافەتی ئیسلامی:

بلازەری پورتوگالیش دەڵێت: بەڕاستی ترسی ڕاستەقینە لەسەر ژیارەکەمان لەو کاتەدایە کە موسوڵمانان دەیانەوێ دنیا بگۆڕن، پێیان وت: جارێ سەرقاڵی جیاوازی نێوان خۆیانن، وتی: ئاخر بیریارو گەورە پیاوانی ڕۆژئاوا باس لە هوشیاربوونەوەی موسوڵمانان دەکەن و دەترسن کە موسوڵمانان دەسەڵات پەیدابکەنەوە، بن گۆریۆنی جوولەکە دەڵێت: (ئەوەی کەزۆر لێی دەترسین ئەوەیە کە محمدێکی تازە بێتەوە).

یەکێکی تریان دەڵێت: بەڕاستی ئەو موسوڵمانەی کە بۆ سەدان ساڵ خەوتبوو وا وریا بۆتەوە و هاواردەکا: من نەمردووم، من واگەڕامەوە بۆ ژیان و نامەوێ لە پایتەختی وڵاتە گەورەکانەوە هەڵمسوڕێنن.

دەترسین کەسێك بێت هەموو جیاوازی وخیلافاتەکانیان ڕووپێبکاتە ئێمە.. ڕۆژهەڵاتناس (جب) یش دەڵێت: موسوڵمانان هەرئەوەیان کەمە کە سەلاحەدینێکی نوێیان تیا دەرکەوێت.[2]

لە ڕاپۆرتێکدا کە مەجلیسی قەومی بۆ بحوث و دیراساتی ئیستراتیجی سەر بە سی ئای ئەی ئەمریکی ئامادەی کردووەو هەزار خەبیر کاری تیاکردووە، هاتووە کە لە ساڵی (٢٠٢٠) ز دا خەلافەتێکی تازەی ئیسلامی دێتە کایەوە، ترسی گەورەشیان لەوە نیە کە ئەدۆڕێن لەجەنگیاندا دژی ئیسلام، بەڵکو ترسی گەورەیان لەوەدایە کە فیکری ئیسلامی فیکری سەرمایەداری دەڕوخێنێ و شۆڕشێك بەرپا دەبێت کە مێژوو بەخۆیەوە نەیبینیوە لەچوونی خەڵکی بەلێشاو بەرەو ئیسلام. هەروەها خەبیرەکان دەڵێن: (ئەو دیموکراتیەیەی کە کە گەیشتە ئەوەی ببێتە نموونەو لە جیهاندا چاوی لێبکرێت، حەیای چوو بەهۆی هەڵس و کەوت و ڕەفتاری ئەمریکا و بەریتانیاوە لە جیهاندا، کە زۆر خراپترن لەو دیکتاتۆرانەی کە لە مێژوودا ناویان

---

١- (ئینتەرنێت/ نووسینی محمد ابراهیم صبحي: ١٤٢٦/٥/١٦ ك).

٢- (المختار الاسلامي/وتاری: لاتیاس فالنصر قادم/محمد المنجد).

تۆمارکراوە...ئەوەی کە موسولمانان نەیانتوانی لە پەنجا سالدا بیکەن دژی دیموکراتیەت، ئەمریکا کردی لە ماوەیەکی کەمدا لە دوای (١١)ی سێپتەمبەر..).

باشە ئەمە تەصدیقی ئەو فەرموودەیە نیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ثم تكون خلافة على منهج النبوة)[1]. واتە: خەلافەتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە پاش ئەو هەموو لادانانەی کە ڕوودەدات. کە ئەویش وەعدی خوایە بۆ ئەم ئوممەتە ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ النور: ٥٥.

دوژمنان کاتێك دەبینن سێ ملیۆن کەس دەچێ بۆ حەج و لەڕەمەزانیشدا سێ ملیۆن ئەچن بۆ عومرەو ئەگەر ڕێ بدرێت چەند قاتی ئەوە دەچێت و، لە کوەیتیش تەنها لە مزگەوتە گەورەکەیدا (٢٥٠) هەزارکەس بە کۆمەڵ تەراویح دەکەن،کە بەردەوام وێنەی مزگەوتەکەو نوێژخوێنانی پیشان دەدرێ لە کەناڵی (العفاسی)دا، باش دەزانن ئەم ئوممەتە ڕووەو هەستانەوە دەچێت و کاتی بۆ دیاری دەکەن، باشە ئەوەی بڕواناکات سالّی (٢٠٢٠)ز بێت یا (٢٠٤٠)ز بێت، یا (٢١٠٠)ز بێت گرنگ ئەوەیە دێت یان نا؟ ئاخر ئەوە وەعدیخوایەو کەسیش لە خوا بە توانا تر نیە لەسەر هێنانەدی وەعدەکانی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ فَٱسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعْتُم بِهِۦ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ التوبة: ١١١.[2]

**دوانزەیەم:** لەم سەردەمەدا موسولمان دەبینی کە خوا سەروەت و سامانی زۆری داوەتێ و بە ئوتومبێل دێت بۆ مزگەوت و خێزانەکەی و کچەکانیشی جلی تەسك و کورتیان لەبەردایەو هەردەڵێی هیچیان لەبەردا نیە و قژیشیان لە صالۆنەکان لەسەر مۆدێل چاك دەکەن

---

١- رواه أحمد.

٢- (سایتی مجلة العصر) تەعقیب لەسەر وتاری/هل يشكل الإسلام خطرا على الغرب.. د. عبدالله النفيسي.

و تەرتیبی دەکەن و بەرزی دەکەنەوە، باشە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ خۆ تەنها وشترو وڵاخ هۆکاری هاتوچۆبووە، چۆن ئاوا باسی هۆکاری تازە دەکات کەوەك وڵاخ وحوشترە و پێی دێن بۆ مزگەوت، ئنجا ئەوسا ئافرەتان داپۆشراوبوون، پێغەمبەرﷺ ئەگەر خوا ئاگاداری نەکردبێت چۆن ئەتوانێ هەواڵی داهاتووی ئاوابدات، هەروەك دەفەرموێت: (سيكون في آخر أمتي رجال يركبون على السروج كأشباه الرحال، فيترلون على أبواب المساجد، نساؤهم كاسيات عاريات على رؤوسهن كأسنمة البُخت العجاف، ألعنوهن فأهن ملعونات)[1]

## دەنگوباسی بڵاوبوونەوەی ئیسلام

لە سایتەکانی ئینتەرنیت دا بە سەدان هەواڵ دەبینین لە بارەی بڵاوبوونەوەی ئیسلامەوە، ئاخر دینێك چۆن بڵاونابێتەوە کە مایەی ئازادی و بەختەوەری و ئاسوودەیی بێت و بەردەوامیش موعجیزەکانی دەریکەون.

**یەکەم: دەزگایەکی لێکۆڵینەوەی مەسیحی لە بەریتانیا دەڵێت:** ژمارەی ئەوانەی دەچن بۆ مزگەوت لە ساڵی (٢٠٤٠)ز دا دەبنە دوو ئەوەندەی ئەوانەی کە دەچن بۆ کەنیسەکان و، ژمارەی ئەوانەی دەچن بۆ کەنیسەکان لە سی ساڵی داهاتودا کەم دەبێتەوە بۆ یەك لەسەر سێ و لە ئەنجامی ئەوەوە هەژدە هەزار کەنیسە دەرگاکانی دادەخات..[2]

**دووەم: ڕۆژنامەی (معاريف)ی عیبری لە ڕاپۆرتێکیدا دەڵێت:**

بە هۆی ئەو هەموو فشارەی کە توندڕەوە جوولەکەکان دەیکەنە سەر موسوڵمانان لە فەرەنسا، ٨٠٪ی ئەوانەی موسوڵمان دەبن لە فەرەنسا جوولەکەن.. چونکە ئەو فشارە وادەکات زۆر جوولەکە بپرسێت ئەم فشارە لەبەرچی دەکرێت و ئەمەش وای لێدەکات دیراسەی ئیسلام بکات، کە دیراسەشی کرد زۆریان موسوڵمان دەبن. ڕۆژنامەکە داوا لە بەرپرسان دەکات کە بە هەر جۆرێك بێت ڕێبگرن لەموسوڵمانبوونی جوولەکەکانی فەرەنسا.[3]

---

١- رواه أحمد وابن حبان.

٢- (ڕۆژنامەی تليگراف أون صندەی/ بەریتانی) گۆڤاری المجتمع /٢٠٠٥/٩/١٧.

٣- (المجتمع/٢٠٠٦/١/٧).

**سـێیەم: سـەرۆکی مەجلیسـی شـیوخی ئیتالی (مارشیلو بیرا)**: داوای کرد کە ڕێبگیرێت لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ئەوروپاداو ئاماژەی بە وتەیەکی ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی کرد کە لە ڕۆژنامەی(کوریری دیلا سیرا)ی ئیتالیدا بڵاوکراوەتەوە کە دەڵێت: سەد ساڵی تر ئەوروپا موسوڵمان دەبێت.[1]

**چـوارەم: دکتـۆر (عبـداللّه ئیمـام) سـەرۆکی لیژنـەی موسوڵمانبوون لە ئەزهەر دەڵێت**: لە دە ساڵی ڕابردوودا یەك ملیۆن و دووسەد هەزارکەس موسوڵمانبوون لە بەردەم ئەو لیژنەیەدا، کە زۆربەیان خەڵکی ئەوروپا و ئەمریکا و وڵاتانی ئاسیای ڕۆژهەڵات و ئەفریقیا بوون. ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە هێرشێکی ڕاگەیاندنی نارەوای زۆر دەکرێتە سەر ئیسلام و، ئەوهێرشە لە ماوەیەك دوای (١١)ی سێپتەمبەر کاریگەری هەبوو، بەڵام وردە وردە کاریگەرییەکەی کەم بووەوەو ئێستا خەڵکی زۆر زیاتر لە جاران ڕوودەکەنە ئیسلام.[2]

**پێنجـەم: مەجلیسـی پەیوەنـدی ئیسـلامی ئـەمریکی لەسـەرەتای ٢٠٠٦ز دا ڕایگـەیانـد**: بیست هەزار ئەمریکی داوای قورئانی ڕاڤەکراوی ئینگلیزیان کردووە کە بۆیان بنێرن بە مەبەستی شارەزابوون لە ئیسلام.[3]

**شـەشـەم: ڕۆژنامەی سلوبودنا دالماسیای کرواتی دەڵێت**:

کرواتیەکان بەژمارەی زۆر دەچن بەرەو ئیسلام و زۆربەیان ئەوانەن کە هاتوچۆی کەنیسەکانیان دەکرد، هەموو ئەوانەی کە موسوڵمان بوون و ڕۆژنامەکەمان چاوپێکەوتنی لەگەڵ کردون جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە نەچوونیان بۆ کەنیسە کفرکردن نیە بەخوا بەڵکو بڕوا هێنانە بە خوایەکی تاك و تەنها کە نە لە کەس بووە و نە کەسیشی لێدەبێت، یەکێ لەو کەسانەی موسوڵمان بووەو ناوی (بوغدان رادونیتش)ەو ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ یوسف دەڵێت: هەموو ئەو

١- هەمان سەرچاوە.

٢- سایتی: (التوابون) ٢٠٠٦/١/٢٣

٣- سایتی: (التوابون).

پرسیارە ئیمانیانەی هەمبوون لە ئیسلامدا وەڵامەکانیم دەستکەوت و واشدەزانم کە خەڵکێکی زۆر لەکرواتیەکان دێن بەرەو ئیسلام).[1]

**حەوتەم: ئەمساڵ (٢٠٠٦) لە ئەمریکا ٢١٢ هەزار گەنج و تازە پێگەیشتووی کورو کچ کۆبوونەوە** لە باخچە گەورەکانی واشنتۆن و پەیمانیان دا لەسەر داوێنپاکی و (١٥٠) کەسیان چوون بۆ چاوپێکەوتنی سەرۆك بۆش بە جلی سپیەوە کە نیشانەی پاکێتیە و ناڕەزاییان دەربڕی لەسەر ئەو بەرەڵاییەی کە هەیە.

لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا (٢٥) هەزار کوڕو کچ لەبەردەم کۆشکی سپیدا وەستان سروودی داوێن پاکییان دەوت لە کاتێکدا بارانیش دەباری..

لێکوڵینەوەکانیش دەریان خستووە کە ٨٠٪ی ئافرەتە ئەمریکیەکان حەز دەکەن بگەڕێنەوە سەر خوو ڕەوشتی بەرزوداوێن پاکی. لە دیراسەیەکی تردا کە لەسەر (٤٠٠٠) ئافرەت کرا دەرکەوت کە ٦٠٪ حەزناکەن ئازادی بێ سنوور بدەن بە کچەکانیان و ٧٥٪ یشیان حەز دەکەن بگەڕێنەوە بۆ ژیانی خێزانی و داوێنپاکی، ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە ٨٧٪ی ئەو ئافرەتانە نەیاندەویست یەکسان بن لەگەڵ پیاواندا. ئەم دەنگوباسانەش هۆشیاربوونەوەی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایەو گەڕانەوەیە بۆ فیترەت و مژدەشە بۆ داهاتوویەکی گەش بەگەڕانەوە بەرەو ئیسلام کە فیترەتەو، ئیتر خەڵك بەشەوارە ناکەوێت بە بریق و باقی ئەوان وئیتر زوڕنا ژەنەکانی نەفامی ئەبێت بێدەنگ بن و سەریان داخەن لە شەرمدا.

**هەشتەم: زۆربەی ڕۆژنامە فەڕەنسی و مەغریبیەکان:** لە ٢٠٠٦/٣/٢٤ دا هەواڵی موسوڵمانبوونی ڕاهێنەری بەناوبانگی تۆپی پێی فەڕەنسی (فیلیپ ڕۆسییە)ی بڵاوکردەوە کەناوی خۆی گۆڕی بۆ عومەرو هاوسەرەکەشی کە ناوی خۆی کرد بە ئامینە. شایانی باسە لە ساڵی (٢٠٠٢) دا ناوبراو هەڵبژێردرا بە چاکترین ڕاهێنەری ئاسیا، عومەر و هاوسەرەکەی پاش موسوڵمانبوونیان دوومناڵی بێباوکیان کەفالەت کرد کەناویان (سەلما و مەریەم) بوو.[2]

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢- (إسلام نون لاين).

یاریزانی فەرەنسی تییری هنری و ئەنیلکا هێرشبەری ڕیاڵ مدریدیش پێشتر موسوڵمان بوون و چەند یاریزانێکی تری فەرەنسیش موسوڵمان بوون و هێشتا لەبەر فشارو تەنگپێهەڵچنین ئیعلانیان نەکردووە، هەرچەند بڵاوبۆتەوە کە فییرا و تییری هنری لەم دواییەدا لەگەڵ ئەنیلکادا چوون بۆ مەککە بۆ عومرەکردن.

**نۆیەم: سەرۆك كۆماری گامبیا**: لەدایك و باوكێكی موسوڵمان لە دایك بووەوپاش ئەوەی دەچێتە ڕۆژئاوا بیرو بۆچوونی دەگۆڕێت و دەبێتە گاور و پاش ئەوەی وڵاتەكەی ئازاد دەكات و دەبێتە سەرۆك كۆمار دەگەڕێتەوە سەر فیترەتی و موسوڵمان دەبێتەوەو، لەم بارەیەشەوە دەڵێت: هەمیشە هەستم دەكرد وەك دوودڵم هەبێت، دڵێك هانی دەدام بەرەو سیاسەت و دیراسەت و سەرۆكایەتی و دڵێكیش بەرەو خۆ دۆزینەوەو ئیمان وهەردەم هانی دەدام هەروەك چۆن لە جەنگی دەرەوەدا سەركەوتووم ئاوەهاش لە جەنگی دەروونیمدا سەركەوتووبم، هانی ئەدام خۆم بتەكێنم لە تۆزو خۆڵی عیلمانیەت و گاورێتی، زانیم كە ئەم دڵەم ڕاست دەكات لەگەڵماو گەڕامەوە سەر بیروباوەڕی ڕاست و خۆمم دۆزیەوە. شایانی باسە ناویشی لە (دیفید كیربا)وە گۆڕی بۆ ناوەكەی زووی كە (داود جاوارا) بوو.[1]

**دەیەم: دكتۆر ئەحمەد نەسیم سوسە**: دكتۆرای هەبوو لە ئەندازەی ئاودێریداو، لەجوولەكەكانیعێراقەو چەند پەڕاوی بەنرخی هەیە وەك: (مفصل العرب واليهود في التأريخ) و (في طريقي الى الاسلام) لەم پەڕاوەیدا باسی ژیانامەو موسوڵمانبوونی خۆی دەكات و دەڵێت: حەزكردنم بۆ ئیسلام بوون دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كاتەی كە بۆ یەكەم جار قورئانم خوێند، زۆر كاری تێكردم وهۆگری بووم و بەخوێندنەوەی گەشامەوە.

زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن كە تەورات تەحریف كراوەو تەنها قورئانە كەوەك خۆی ماوەو دەستكاری یەك پیتی نەكراوە. لە قورئاندا هاتووە كە زاڵ و سەرپەرشتیارە بەسەر كتێبەكانی پێش خۆیدا، بەهۆی ئەو هەموو ڕاستیانەی باسی دەكات لە بارەی ئەو كتێبانەوە، ئەمە بێجگە لەوەی كە دەستكاری و هەڵەكانیان ڕاست دەكاتەوە.. ئەو هەموو بیرو بۆچوون و تەشریعات و باسانەی لە قورئانایە ئەستەمە كەسێك بتوانێ شتی وا هەڵبەستێ و لە خۆیەوە بیڵێت.

---

[1] - (سایتی هدى الإسلام).

ئایا کەسێك هیچ چارێکی دەمێنێت نەڕوات بەرەو موعجیزەی قورئان، پاش ئەوەی کەزانی پێغەمبەر نەخوێندەوار بووە و پاش ئەوەی کە لە ژیاننامەی پێغەمبەر ورد بۆوە..بەڕاستی موعجیزەی قورئان لەم سەردەمی زانستەدا زیاتر دەردەکەوێت، بە پێچەوانەی سەردەمەکانی نەفامی و جەهالەتەوە)[1].

**یانزەیەم: ئارسەر میلاسنتوس:** دکتۆرای هەیە لە لاهونداو، کەسایەتی سێیەم بوو لە(مجمعی کەنائیسی قارەی ئاسیادا). باسی موسوڵمانبوونی خۆی دەکات و دەڵێت: لە کاتی کارکردنمدا لە بە گاورکردنی خەڵکدا وتم: چی دەبێت ئەگەر قورئان بخوێنمەوە تا بتوانم ڕەدی موسوڵمانان بدەمەوە. بۆیە داوام لە موسوڵمانێك کرد کە قورئانێکم بداتێ ئەویش بۆی هێنام، کاتێك خۆێندمەوە بۆ یەکەم جار هەستم بە کێشمەکێشێکی گەورەکرد لە ناخمدا، دەنگێك لە ناخمەوە هانی دەدام موسوڵمان ببم و بچمە سەر ئەو ئایینەی کە پەیوەندی مرۆڤ ڕاستەو خۆیە لەگەڵ خواداو پێویست بە قەشە ناکات لەنێواندا بێت و پسووڵەی لێخۆشبوون بفرۆشێت. ڕۆژێك دەستنوێژم شت و قورئانم گرت بە دەستمەوەو ئەم ئایەتەم خوێندەوە ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾ محمد: ٢٤، موچڕکەم پیاهات و پاشان ئەم ئایەتەش ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴾ المائدة: ٣ ڕۆحی پەرۆشمی ئارامکرد وهەستم کرد تازە لەدایك بووم، بۆیە هەرئەوشەوە چووم بۆ لای هاوەڵە موسوڵمانەکەم و موسوڵمان بووم..[2].

**دوانزەیەم: لەم دواییەدا گۆرانیبێژی ڕووسی ناودار یولیان** موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند لە مزگەوتی شاری غودرمیس لە شیشان، ئەم مزگەوتە تازە دروستکراوەو ڕووبەرەکەی (٢٥٠٠) مەتر دووجایەو منارەکەی (٥٣) مەتر بەرزە و سێ هەزار نوێژخوێن نوێژی‌تیادەکەن.

**سیانزەیەم: کرست راجا زانایەکی گاورەو خەڵکی ویلایەتی تلماندۆی خوارووی هیندە و،** شارەزایی تەواوی هەیە لەپەڕاوە

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢- هەمان سەرچاوە، ئەویش وەری گرتووە لە پەڕاوی (بحث محمدا ولم أخسر المسيح) د.عبد المعطي الدالاتي.

پێشینەکانداو، وای دەزانی قورئان لە تەورات و ئینجیلەوە دزراوەو حەزی دەکرد موسوڵمانان هەموو بن بە گاور. ڕۆژێك زانایەکی موسوڵمان دەکەوێتە گفت و گۆ لـە گـەڵیاو پێـی دەڵێـت: هیچ شتێك نابینی لە قورئاندا کە عەقڵ وفیترەت نەیانەوێت، ئەمەش وای لێکـرد کـە دووجـار تەرجومەی قورئان بەزمانی تامیلی بخوێنێتەوەو سەرەنجام دڵنیابوو کە قورئان ڕاستەو تەورات و ئینجیل تەحریف کراون، بۆیە دەستی لە نازو نیعمـەت و مـاڵ و سامانی کەنیسـە هـەڵگرت و موسوڵمان بوو بۆ خوا. ئنجا هاوسەرەکەی‌و سێ منالەکـەی موسـوڵمانبوون و چـەندەها کەسـی تریش لەسەر دەستیا ئیمانیان هێناو بەردەوامیش شارودێ دەگەڕێت بۆ گەیانـدنی دینـی خـواو دەڵێت: هەرکەس هەموو قورئان بخوێنێتەوە موسوڵمان دەبێت..

**چـواردەیەم: دکتـۆر سـەرحان بەرپرسـی نووسـینگەی ڕابیتەی عالەمی ئیسلامی لە جۆهانسبێرگ**: لـە خـوارووی ئـەفریقیا باسـی موسـوڵمان بـوونی منـاڵێکی ئـەمریکی دەکـات و دەڵێـت: لـە شـیکاگۆ لـە ئـەمریکا قەشەیەکی کاسۆلیکی مناڵێکی وریای دەبێت و زۆر هەوڵدەدات کە لـەژێر سـایەی کەنیسـە دا پەروەردە ببێت و لە کتێبخانەی کەنیسە زۆرجار دای دەنا تا بە ئارەزووی خـۆی سـەیری کتێـب بکات و حەزی لە خوێندنەوە ببێت، منالەکـە لەسـەر ڕەفەیـەك ئینجیلـی بـەرنابا دەبینـێ کـە دەیکاتـەوە چـەند دێڕێـك دەکەوێتـە بـەر چـاوی کەنوسـراوە: مەسـیح دەڵێـت (دوای مـن پێغەمبەرێك لە عەرەب دێت کەناوی ئەحمەدە).

ئەم قسەیەی لا سـەیردەبێ و بـۆ بـاوکی دەگێڕێتـەوەو ئـەویش هەرچـۆنێك بێـت دەیـەوێ لەبیری بەرێتەوەو گرنگی نەدات بەوباسە، منالەکە کۆڵنەداو خواردنگەیەکی عەرەبەکان دەبینـێ لەشارەکەی خۆیان و هەندێ پرسیاریان لێدەکات و ئەوانیش دەینێرن بۆ مزگـەوتێك لـەو نـاوە و منالەکە دەچێت و پرسیار دەکات و ئەوانیش دەڵێن: ئەوەی تۆ لەو ئینجیلـەدا خوێندوتـەوە لـە قورئانیشـدا هەیـە، لـە قورئـانێکی وەرگێـڕدراوی ئینگلیزیـدا ئـەم ئایەتـەی پیشـان دەدەن

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ الصف: ٦. منالەکـە لـە ئایەتەکە ورد بۆوە وتی: کەواتـە مەسـیح ڕاسـتی فـەرمووەو ئینجیلەکـە تـەواوەو بـاوکم درۆی لەگەڵ کردووم، ئنجا وتی: من ئەمەوێ ببمـە شـوێنکەوتەی ئـەو پێغەمبـەرە، ئـەوانیش فێـری

شایەتمانیان کردو وتی: اشهد ان لااله الاالله واشهد ان محمدا رسول الله، ناوی خۆشی گۆڕی بۆ محمد.

منالّە بەخۆشییەوە هاتەوەو وتی: باوکە موسولّمانانم دۆزییەوە کە شوێنکەوتەی ئەوپێغەمبەرەن و منیش موسولّمان بووم.. هەروەك هەورە تریشقە ئەم هەوالّە لە باوکیدا، ماوەیەك لەمالّەوە نەیهێشت بچێتە دەرێ، دوایی ترسا لەوەی کە هاوەڵەکانی هەوالّی بپرسن و حکومەت پێ بزانێ، بۆیە ناردی بۆ لای دایك و باوکی خۆی لە تەنزانیاو مەسەلەکەی بە تەلەفون تێگەیاندن و پێی وتن کە بەهیچ جۆرێك نەیەڵن پەیوەندی بکا بە موسولّمانانەوەو ئەگەر هەر بۆشیان چارەسەر نەکرا لە ناوی بەرن، منالّە لە تەنزانیاش مزگەوت و موسولّمانانی دۆزیەوەو ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر شارەزا دەبوو، موسولّمانانی ئەو ناوچەیەش بە مەسەلەکەیان زانی و خۆشیان دەویست. باپیرەی و نەنکی پاش هەولّی زۆر کە زانیان بۆیان چارەسەر ناکرێت ژەهریان بۆکردە خواردنەوەو، هەرنەوەندە منالّەکە هەستی بە ئازاری ناوسکی کرد بەدزییەوە بە هەرحالّێك بوویەپەلە خۆی گەیاندە مزگەوت و ئەوانیش بردیانە خەستەخانەو چارەسەریان کردو پاشتر ناردیان بۆ أثیوبیا و لەوێشەوە بۆ خوارووی ئەفریقیا، لەوێ موسولّمانان گرتوویانەتە خۆیان و ئەویش بلیمەتێکی لێدەرچووە باسی ئیسلام بۆ خەلّك دەکاو بۆتە بانگخوازیکی بچکۆلەی هیممەت گەورە بۆ دینی خوا.[1]

## پانزەیەم: بانگخوازێك ئەزموونی خۆی دەگێڕێتەوەو

**دەڵێت:** لەجەنگی کەنداوی سێیەمدا ویستمان هەولّبدەین لەگەلّ سەربازەکانی کەتیبەیەکی چینیدا، بەڵکو لە کوفر و شیرکەوە بیانهێنین بەرەو یەکخواپەرستی، خوا بەرەکەتی خستە بانگەوازەکەمانەوەو ژمارەیەکی باشیان موسولّمان بوون و نوێژەکانیان بە ڕێکوپێکی ئەنجام دەدا، بۆ نوێژی بەیانیش کە زۆر سووربوون لەسەر ئەوەی لە کاتی خۆیدا بیکەن، سەعاتیان دەخستە سەر جەرەس.

دەنگی جەرەسەکان سەربازی تریشی خەبەردەکردەوە لەخێمەکانیاندا بۆیە ئەفسەرەکانیان سەعاتەکانیان لێسەندن. ئەوانیش بیریان کردەوە لەڕێگایەکی تر بۆ هەستان بۆ نوێژی بەیانی؟! هەریەکەیان پێش نووستن بڕێکی باش ئاوی دەخواردەوە بۆ ئەوەی شەو خەبەری ببێتەوەو،

---

١- سایتی: (بوابة الإسلام).

کاتێك خەبەریان دەبۆوە سەیری سەعاتیان دەکرد ئەگەر کاتی نوێژ بوایە نوێژیان دەکردو، ئەگەر کاتی نوێژیش نەبوایە ناوی تریان دەخواردەوەو دەنووستنەوە، بەو شێوەیە تا خۆیان ڕاهێنا لەسەر نوێژی بەیانی کە بەداخەوە هەندێ موسولمان لە مالی خۆیدایەو لەهیچی کەم نیە، کەچی هەلناستێ بۆ نوێژو شەیتان میز دەکاتە گوێیەوە هەروەك پێغەمبەر) فەرموویەتی.[1]

**شانزەیەم: ویسام عبدالله خەلکی میسرەو،** بیست سالە لە ئەمریکا دەژی و پسپۆرە لە تەورات و ئینجیلداو لە ماوەی پێنج سالدا لەڕێی ئینتەرنێتەوە کە لە پالتۆکدا ژوورێکی هەبوو بەناوی (إظهار الحق) و ئێستاش ناوەکەی کردووە بە (الحوار الإسلامي المسيحي)، توانی شەش سەد کەس موسولمان بکات لە سەتاسەری جیهاندا.

خۆزگەمان بەخۆی بە هەریەکێکیان بەهێندەی دنیاو چی تێدایە خێری بۆ دەنووسرێت.[2]

**حەڤدەیەم: بانگخوازێك لە دێیەکی دوورەدەستی ولاتی مالی لە ئەفریقیا** خەمی بلاوکردنەوەی دینی خوای دەبێت، بۆیە ئێستگەیەك لە مالەوە تەرتیب دەکات و بەیانیان دووسەعات و ئێوارانیش دووسەعات بەرنامەکانی خۆی پەخشدەکات کە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر خەلکی دێیەکە هەیەو ئەگەر لەمالیش نەبێت چەند کاسێتێکی تۆمارکراو بۆ خێزانەکی بەجێدەهێلێ کە بلاوی بکاتەوە.[3]

**هەژدەیەم: لەشەمەندەفەری قاهیرە بۆ ئەسکەندەرییە لەسالی (١٩٨٠)زدا پیاوێکی خواناس بەناوی علی** کە بانگخوازیی بە ئەرکی سەرشانی دەزانی، چاوی بەلاوێك کەوت کە ناوی (رضا طعيمة) بوو، سەرتاپای لاسایی کردنەوەی ئەوروپییەکان بوو، بازن لە دەستیا و ملوانکە لەملیاو وەك کۆلارە لە هەوای خۆیدابوو!

ناوبراو لەبواری نواندن و دەرهێناندا کاری دەکردو خەوخەیالی ئەوەبوو چۆن ببێ بە دەرهێنەرێکی جیهانی.

شێخی بانگخواز لێی پرسی: برام موسولمانی؟

وتی: بەلێ لەسایەی خواوە موسولمانم. ئنجا شێخ ئەستەلەیەکی پێشکەش کرد و، پاشان لێی پرسی: برام چیت بۆ یەکەم شەوی گۆڕ ئامادە کردووە؟

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو..

٢- سایتی: التوابون

٣- سایتی: المختار الاسلامي

هەروەك لە بانێك بەری بدەنەوە، گۆڕی چی و خۆ ئامادەکردنی چی؟ بەیەك چارەك قسەکردن، شێخ علی توانی (١٨٠) پلە بیگۆڕێ و ڕێی ڕاستی دۆزییەوەو توانی کارەکانی والیێکات کە خزمەت بە دینی خوابکەن و، چەندەها کاری هونەری پوختی ئیسلامی بەرهەم هێناو لە کتێبخانەکەیدا چوار هەزار پەڕاوی ئیسلامی هەیەو سەردانی پەنجا وڵاتی کردووە بۆ بانگەوازکردن و یەکەم بانگخوازە کە چوو بۆ ئەلبانیا دوای ڕزگاربوون لە کۆت و پێوەندی پەنجا ساڵەی شیوعیەت،ئەمە بێجگە لەوەی کە چەندەها پەڕاوی بڵاوکردۆتەوەو ئێستا لە کەناڵی (الحکمة) و (الرحمة)دا بەرنامەی هەیە.

من نازانم چ ئیخلاس و بۆ خوا سوڵحانێکە، لە تەنها پانزە خولەکدا جەنابی شێخ عەلی ئەم هەمووەت لە باردا بوو بۆ دینی خوا، دیارە ان شاء الله خوا ئیرادەی خێری پێتە بۆیە تاوا تەوفیقی داویت و بەکاری هێناوی بۆ بانگەوازەکەی، بەڕاستی بانگەوازکردنیش ڕزقێکەو خوادەینێرێت مەگەر ڕەسوولی نازدار ﷺ نافەرموێت: (اذا أراد الله بعبد خيرا استعمله، فقيل كيف يستعمله يارسول الله؟ قال يوفقه لعمل صالح قبل موته) ئەنەس گێڕاویەتیەوەو (صحیح)ە.[1]

## بانگخوازوەك خۆروایە ..

بانگخواز لە خۆر دەچێت لە چەند ڕوویەکەوە:

١- خۆر بەردەوام لە جووڵەدایەو ناوەستێ بانگخوازیش بەهەمان شێوە و هەر ڕۆژەو شتێك زید دەکات، چونکە باش دەزانێ (من استوى يوماه فهو مغبون)، هەرکەس ئەمڕۆو دوێنێی وەك یەك بوو خەسارەتمەندە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی.

٢- خۆر دنیا ڕووناك دەکاتەوەو بانگخوازیش بەهەمان شێوە دوعا دەکات کە خوا لەهەموو لایەکیەوە ڕووناکی بداتێ و تەنانەت خۆشی بکات بەنوورو ڕووناکی (اللهم اجعل في قلبي نورا، وفي سمعي نورا وفي بصري نورا وعن يميني نورا وعن يساري نورا وفوقي نورا وتحتي نورا واجعلني نورا)، هەروەها دەیەوێت دەستی خەڵکی بگرێت و لە تاریکاییەکانەوە بیانبات بەرەو ڕووناکی.

---

١- سایتی مشکاة. نیت

٣- خۆر بۆ هەموو خەڵکیە بەبێ جیاوازی، بانگخوازیش هەر وایە چونکە شاگردو جێگری ئەو پێغەمبەرەیە کە ڕەحمەتە بۆ عالەم﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبياء: ١٠٧

٤- خۆر داوای پاداشت لەکەس ناکات و بانگخوازیش ویردی سەر زمانی ﴿ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ الشعراء: ١٠٩

٥- خۆر ئیجازە وەرناگرێت و هاوین وزستانی بۆ نیە، بانگخوازیش ﴿ فَإِذَا فَرَغۡتَ فَٱنصَبۡ ﴾ الشرح: ٧ لە کارێك بووەوە خەریکی خواپەرستی و کارێکی تر دەبێت.

٦- هەروەك بەری خۆر بەبێژنگ ناگیرێت، بەهەمان شێوەش کەس ناتوانێت کایگەری بانگخواز نەهێڵێت چونکە نوری ئیمان و ئیسلامی پێیە کەهەر لەو خوایەوەیە کە نووری خۆری دروستکردووە. جاهەروەك چۆن خۆر کاتێك شوێنێك بەجێدەهێڵێت شوێنێکی تر ڕووناك دەکاتەوە، کاتێك برایان لە میسر دەربەدەر کران بانگەوازیان لەو وڵاتانەدا بڵاوکردەوە کەبۆی چوون.

٧- هەروەك چۆن خۆر تا قیامەت بەردەوام دەبێت، بانگخوازانیش کاریان تا قیامەتە (لاتزال طائفة من امتي ظاهرين على الحق، لايضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله وهم كذلك)[1].

جیاوازیەکیش ئەگەر هەبێت، بانگخواز شان ئەداتە بەر ئەمانەتی بانگەواز کە گەورەترین و گرنگترین کارە لە هەموو بوونەوەردا و نەك هەر خۆر تەنانەت زەویش نەیانتوانی شان بدەنە بەر ئەو ئەمانەتە، قورئان دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ﴾ الأحزاب: ٧٢.
پێشەوا ئیبن تەیمیە دەڵێت: ئەو ئەمانەتە ئەوە نیە من شتێك لای تۆ دانێم و بمدەیتەوە، بەڵکو ئەو ئەمانەتە ئەمانەتی بانگەوازە.

---

١- رواه مسلم.

زۆر پێویستە لە گەورەیی بانگەواز تێبگەین و هەموو بانگخوازین، هەموو لە خەمی گۆڕیندا بین و تەسلیم نەبین، بەدەست دەتوانی بەدەست، بەدەست ناتوانی بەزمان، بەزمانیش ناتوانی بەدڵ، دوای ئەمە باش بزانە ئیمانت لە خەتەردایە؟ تادەگاتە بێ ئیمانی (ولیس وراء ذلك حبة خردل من الايمان).

## وریابە دینی خوا سووك مەكە:

ئەگەر هەموودنیاشت بدەنێ هەرکەمە، نەکەی ئیمان و دینەکەت بفرۆشی، باش بزانە کە خوا چاودێرە بەسەرتەوەو ئەوەی کە دێ بەدڵتا و کەس ئاگای لێنیە ئەو ئاگای لێیەو مسقاڵە زەڕەیەکی لێ وون نابێت ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴾ لقمان: ١٦ .

بەڵێ دەنکە خەرتەلەیەك لەناو بەردا بێت یان لە ئاسمانەکانا بێت، یان لەزەویدا بێت خوا ئاگای لێیەتی، چونکە بەڕاستی خوا زاناو داناو ئاگادارە﴿ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى ﴾طە: ٧نەك هەر نهێنی کە شتێکە لەنێوان تۆو کەسێکدا، بگرە لە نهێنی نهێنی تریشی ئاگا لێیە، کە ئەویش ئەو نهێنییەیە کە لای کەس نەت درکاندووە. ئنجا باش بزانە وای لە ژێر میکرۆسکۆبی خەڵکیداو یەك ڕەفتاری نابەجێ بەسە کۆمەڵێکی پێ سەرگەردان بێت.

ڕەفتاروهەڵسوکەوت زۆرگرنگە، کەسێك با خۆی بەبڕواداریش بزانێت، بەدرۆکردن و دەستپاك نەبوون و بێ وەعدی دەبێتە مونافیق! هەروەك پێغەمبەر فەرموویەتی و هەمووشمان دەیزانین؟!

یان ئازاردانی خەڵکی بەتایبەت دراوسێ، بە پێغەمبەریان وت: ژنێك بەڕۆژ بە ڕۆژووەو بە شەویش شەونوێژ دەکات، بەڵام خراپە لەگەڵ دراوسێکەیدا، فەرمووی: ئەوە جێی دۆزەخە!! نەك هەرئەوەندە بگرە ئازاردانی گیانلەبەرانیش سزای هەیە، مەگەر ئەو پیرێژنەی پشیلەکەی لە برسا کوشت، پێغەمبەر نافەرموێ جێی دۆزەخە؟؟

هەموو کردارو ڕەفتارێکی خراپ مایەی دوورکەوتنەوەی خەڵکییە لەم دینەو، بەوەش ئەبێ تاڵاوی سزاکەی بچێژین ﴿ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ النحل: ٩٤، واتە: نەکەن

پەیمان وسوێندتان بۆ پیلان و فێڵ بەکابهێنن لە ناو خۆتاندا، تاپێ هەڵنەخلیسکێت دوای ئەوەی کە قایم وەستابوو، هەتا تاڵاوی ناخۆش نەچێژن کاتێك بەهۆی ئەو کارەتانەوە ئەبنە بەربەست لەبەردەم دینی خوادا، ئەگەر وابکەن ئەو کاتە سزایەکی گەورەتان بۆ ئامادەیە.

چەند ساڵێك لەمەوبەر مامۆستای مزگەوتێك لە بەریتانیا، سواری پاص دەبێت وپارەی کرێکە دەدات، سایەقەکە (٢٠) بەنسی زیاتر ئەداتەوە لە هەقی خۆی! مامۆستاکە بیری کردەوە کە پارە زیادەکە بگێڕێتەوە چونکە هەقی ئەو نیە، ئنجا هات بە خەیاڵیدا: خۆ بڕە پارەکە ئەوەندە نیە بۆ بیگێڕمەوە، کێ گوێ دەداتە ئەوە، دوای ئەوەش کۆمپانیای ئەو پاصانە پارەی باشیان دەست دەکەوێت، خۆ پەکیان لەوە نەکەوتووە، بۆ بیاندەمەوە وائەزانم ڕزقێکەو خواناردوویەتی. پاصەکە وەستاو لەو شوێنەدا کە مامۆستا دەیویست دابەزێ، لە دەم دەرگاکەدا ئەفرەتی لە شەیتان کردو پارەکەی دایەوەبەسایەقەکەو وتی: ئەوەت بەزیاد داومەتەوە. سایەقەکە بەزەردەخەنەوە وەری گرت و وتی: تۆ مامۆستای تازەی ئەم ناوچەیە نیت؟ وتی: بەڵێ، وتی: من ماوەیەکە دەمەوێت بێم بۆ مزگەوتەکەتان تا لە ئیسلام شارەزا ببم و، بە ئەنقەست زیادم دایتەوە تا تاقیت بکەمەوە..مامۆستا کە دابەزی قاچی هەڵینەدەگرت، بۆیە دەستی گرت بە عەمودێکەوەو سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمان و بەگریانەوە وتی: خوایە گیان خەریك بوو ئیسلام بە (٢٠) بەنس بفرۆشم؟!

## چێژی ماندوبوون بۆ خوا..

دکتۆر عبدالرحمان السمیط، لە ناوەندی بوو لە وڵاتی کوێت، حەزی دەکرد لە ئەفریقیادا کاربکات بۆ خوا، ساڵ لە دوای ساڵ تێپەڕی و کۆلێژی پزیشکی تەواوکرد، خوا بە نییەتی خۆی لەگەڵ کرد و ژنێکی خێرخوازی کوەیتی بڕە پارەیەکی بۆ نارد کە مزگەوتێك دروست بکات لە شوێنێکدا کە پێویست بێت، ئەویش چوو لە ناوچەیەکی ئەفریقیادا دروستی کرد، بەمەش ناسراو خێرخوازان هاوکاریان کردو، کاری چاکی پێشکەش کردو، بە ملیۆنەها کەسی موسوڵمان کرد. ناوبراو باسی ئەزموونی خۆی دەکاتو دەڵێت: بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر کە دەستمان کرد بەکارکردن لە ئەفریقیا، لەو بڕوایەدا نەبووین کە ئەو هەموو زەحمەت و ناڕەحەتیەمان بێتە ڕێ، کە هەرچەند بیر لە پاداشتەکەی دەکەینەوە لای خوا لەززەتی لێوەردەگرین. بڕوام نەدەکرد لەگەڵ کۆمەڵێك مانگادا لە پشتی لۆرییەکدا سواربم کە هەموو

گیانی ژانی دەکردوسی ساڵ بوو لۆری بوو، ڕۆژوو دوو ڕۆژ نا بەڵکو دە ڕۆژی ڕەبەق لە ڕێگایەکی خۆڵی پڕ چاڵ و چۆڵیدا. من دڵخۆش بووم بەهاوەڵەکانی سەفەرم (مانگاکان) کە ناوبەناو هەر تەوقە سەرم خۆڵاوی ببوایە سەریان بۆ دەلستمەوە؟!

جارێك گرتیانم و لە بنکەیەکی پۆلیسدا چەند سەعات بە پێوە ڕایان گرتم چونکە ئەفسەری بنکەی پۆلیسەکە گاورێکی توندڕەو بوو.

بەڕاستی من نامەوێ بچمە سەر ئەو باسە بە دووروردرێژی کە لە زەلکاوەکان و نووستنی ناو کوخەکان و ڕۆیشتنی زۆر بەپێ وتینوێتی و برسێتی تووشمان بووە وچەندەها جاریش تەقەمان لێکراوە لەو ناوچانەدا کە شەڕی ناوخۆی تیابووە.

ئەگەر لۆری قسەی بکردایە ئەو لۆرییە شایەتی بۆ ئەداین کە لایەنێك دای پێمان ولە حەڤدە ساڵ کارکردندا دووجار سووتانیان و چاکمان کردەوەو ئێستەش ئیشی پێدەکەین.

جارێك لۆرییەکیان سووتانین کە چیمەنتۆی بارکردبوو بۆ بیناکردن و ئاوەدان کردنەوەو، سایەقو بانگخوازەکەمان بەهەزار حاڵ ڕزگاریان بوو، هەشتا کیلۆمەتر بەپێ ڕۆیشتن تاگەیشتنە شارێك، چیمان هەبوو سووتا لە لۆرییەکەدا لە پەساپۆرت و شتی تر، ئەوەی زیاتر نیگەرانی کردم ئەو فەردە شەکرەبوو کە دەمانویست بیبەین بۆ خەڵکی ناوچەکە کە ڕەمەزان بوو بە ڕۆژووبوون و هەشت ساڵ بوو تامی شەکریان نەکردبوو.

نامەوێ باسی ئەو بانگخوازانەشمان بکەم کە لە خوارووی سوّدان و لیبیریاو سیرالیۆن و مۆزەنبیق و صۆماڵ و شوێنەکانی تردا گیانی خۆیان بەخت کرد بۆ خوا کە منیش شوێن پێی ئەوانم هەڵگرتووە.

من پەشیمان نیم لەکارکردن لەم بوارەدا، چونکە بەقەناعەتەوە هەڵم بژاردووەو ڕازیم بە قەزاوقەدەری خوا، بەڵام بەزەییم بەوانەدا دێتەوە کە خەریکی دنیان و نازانن لەززەتی کارکردن و خۆڕەنجاندن بۆ خوا چۆنەو چەند پیرۆزو پڕ خێرە.[1]

---

١- سایتی: صەیید

## هەرچيت بۆ دەكرێت بيكە:

هەركەسەو بەپێى لێهاتن و تواناى خۆى چى بۆ دەكرێت با بيكات بۆ خزمەتى ئيسلام، ژيان كورتەو مردنيش غەيبەو كوتوپڕ دێت، بۆيە بادانەنيشين و نەوەستين، چونكە مردن وا بەدوامانەوەيەو ئەگەر لێشى غافڵ بين ئەولە ئێمە غافڵ نابێت، هەروەك پياوباشێك دەڵێت: (لاتقعدوا فراغا فان الموت يطلبكم).

ئەمەش چەند نموونەيەك لە بوارى هەوڵ و كۆششدا:

١- زەيدى كوڕى ثابت كە تەمەنى حەوت ساڵ بوو، پێغەمبەر ﷺ لێى پرسى: سريانى دەزانى؟ وتى: نەخێر، فەرمووى: فێرى ببە، چونكە نووسراوم بۆ دێت بەو زمانە .

زەيد ئەوەندە بليمەت و وريابوو تەنها بە حەڤدە ڕۆژ فێرى زمانەكەيان بوو !!

هەروەها فەرمانى دايە فێرى زمانى جوولەكەش ببێت، لە پانزە ڕۆژدا ئەويش فێر بوو!

٢- بوخارى بەمناڵى كوێربوو دايكى ئەوەندە لە خوا پاڕايەوە چاوى چاك بكاتەوە، دوعاكەى گيرا بوو چاك بووەوە، تەمەنى شانزە ساڵ بوو كە مامۆستاكەى (ئيسحاق كوڕى ڕاهەوەى) لەمەجليسێكدا ئاواتى خواست كەسێك بيوايە فەرمووده ڕاستەكانى پێغەمبەرى كۆبكردايەتەوە، ئەميش لە دڵى خۆيدا سوێندى خوارد كە ئەو كارە مەزنە بكاو، خواى گەورەش يارمەتيداويە شانزە ساڵ كۆى كردەوەو تا قيامەت صەحيحى بوخارى ڕۆڵى گەورەى خۆى دەبينێت و ئەويش خێرو چاكە دەچێتە سەر خەرمانى كردەوەكانى.

٣- لەزەمانى (صلاح الدين)دا شارێكى موسوڵمانان ئابڵوق درابوو بەكەشتى خاچپەرستان، صلاح الدين يش بۆ ئەوەى پارەو يارمەتى و نامەيان بۆ بنێرێ و هانيان بدات بۆ خۆگرى و نەخشە دانان، پێويستى بە كەسێك بوو ئەم كارەى بۆ بكات، پياوێك بەناوى عيسى كە مەلەوانێكى زۆر چاك بوو بەم كارە هەستاو، نامەو پارەو يارمەتى دەخستە نايلۆنەوەو دەيبەست بە پشتيەوەو بەشەو بە مەلە بە ژێر كەشتى دوژمناندا دەڕۆيشت و شتەكانى دەگەياندە موسوڵمانان. تا شەوێك لە ئاوەكەدا بەڵايەكى بۆ بوو شەهيد بوو، زۆر چاوەڕێيان كرد ديارنەبوو پاش سێ ڕۆژ لاشەكەى سەر ئاو كەوت و موسوڵمانان دەريان هێنا، خواى گەورە ويستى وابوو بە مردوويش ئەمانەتيەكانى بگەيەنێت!

٤- ئافرەتێکی باڵا پۆش لە پێشبڕکێی (کچی ئەمریکا)دا یەکەم دەرچوو، بەوەی لەزۆر لایەنی زانستی و خووڕەوشتدا یەکەم بوو، بەمە توانی وێنەیەکی جوان وێنا بکات لە بارەی ئیسلام و ئافرەتی باڵا پۆشەوە. لە چاوپێکەوتنێکدا لە بارەی باڵا پۆشیەوە پرسیاریان لێکرد، لەوەلامدا وتی: بەلای ئێمەوە ئافرەت گەوهەرێکی زۆر بەنرخەو دەیپارێزین بۆ ئەوەی نەدزرێت.[1]

بە کورتی و بە کوردی ئەم ئایینە هەر لەبەرەبەیانی ئیسلامەتیەوە ئیعلانی کردووە کەئاینێکی جیهانییەو بۆ هەموو بەشەریەتە ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٨٧ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ﴾ ص: ٨٧ - ٨٨، بۆیە عوزرو بیانووی بۆ کەس نەهێشتۆتەوەو ئەگەر تاقە ئایەتێکیش بزانێت دەبێت بیگەیەنێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (بلّغوا عني ولو آية).

---

١- سایتی: المختار الاسلامي.

# پێشەکی:

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەدگارو دروودو سەلامیش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یارو یاوەران و شوێنکەوتوان..

کاتێك نووسەرێك پەڕاوێك دەنووسێت، تا لە ژیاندا بێت هەرچی بۆ بکرێت دەیکات بۆ پەڕاوەکەی لە پڕوپاگەندەو بردنە پێشەوەی لەلای خەڵکی، هەر پەڕاوێکیش کە دەردەچێت هەزار، دووهەزار، سەد هەزار، ئەگەر ملیۆنیشی لێچاپ بکرێت دوای چەند ساڵێك ئەو ڕەونەقەی نامێنێت و، پەڕاوی ترسەرنجی خەڵکی بۆلای خۆی ڕادەکێشێت.. ئەمە بۆ هەموو نووسراوێکی بەشەری وایە..

تەنها قورئانە کە جیاوازە لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار (حي قيوم)ە و بەردەوام ئاگای لە بوونەوەرەکەی خۆیەتی و بۆ هەناسەیەکیش لێی غافڵ نابێت، هەمیشە دەستی خێری بە قورئانەوەیەو بەردەوام بەڵگەو نیشانەکانی دەخاتە بەر چاوی خەڵکی تابۆیان دەرکەوێت و دڵنیا بن کە هەقەو لە خواوەیە، هەروەك دەفەرموێت ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ فصلت: ٥٣..

هەروەهائەوانەی کەشوێن ئەم پەڕاوە بکەون دەبنە دۆست و خۆشەویستی خواو خۆی بەرگریان لێدەکات و دوژمنانیان لەدنیاوقیامەتدا ڕیسوادەکات لەفەرمودەی قودسیدا هاتووە(من عادى لي وليا فقد آذنته بالمحاربة) لەفەرمودە یەکیشدا پێغەمبەر دەفەرموێت (أهل القرآن أهل الله و خاصته) واتە: ئەهلی قورئان ئەهلی خواو بەندەی تایبەتی خوان..

لەم بەرگی سێیەمەشدا وەك بەرگەکانی پێشوو، باسی موعجیزاتی قورئان و سوونەت و هاتنی بەردەوامی خەڵکی لە چوار قوڕنەی دنیاوە بەرەو ئیسلام دەکەین، تا هەموو بگەینە دڵنیایی و یەقین و پارێزراوبین لە شوبوهات و گومان و پڕوپاگەندەی ژەهراوی دوژمنان..

## دڵنیایی:

قورئانی پیرۆز دەیەوێت بڕوادار بەرەو دڵنیایی و یەقین بەرێت، ئەویش بەهۆی ئەوەی کەپەروەردگار بەردەوام ئایەت و بەڵگەو نیشانەکان پیشانی مرۆڤ ئەدات لە نەفسی خۆیان و لە بوونەوەردا و بەردەوامیش هانی مرۆڤ دەدات کە بیر بکاتەوەو بیرکردنەوەش عیبادەتە، کە ئایەتی ﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ آل عمران: ١٩ هات بۆ پێغەمبەر ﷺ، زۆرگریاو سێجارفەرمووی: وەیل بۆکەسێك کە بیخوێنێتەوەو بیرنەکاتەوە.. یەقین و دڵنیایش چەند جۆرێکەو چەند پلەیەکە.

## جۆرەکانی دڵنیایی

**یەکەم:** (علم اليقين)، واتە: زانینێك کە لێی دڵنیا بیتو لەسەرچاوەیەکی تەواوی راستەوە وەرتگرتبێ.

**دووەم:** (عين اليقين)، واتە: راستیەك کە بەچاوی خۆت ببینی.

لەبارەی ئەم دوو جۆرەوە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت ﴿ كَلَّا لَوۡ تَعۡلَمُونَ عِلۡمَ ٱلۡيَقِينِ لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ﴾ التكاثر: ٤-٧، واتە: (نەخێر ئەگەر زانینێکی تەواوو یەقینتان هەبوایە، هەرگیز دنیاو زیاد کردنی ماڵی دنیا ئاوەها سەرقاڵی نەدەکردن، بێگومان دۆزەخ دەبینن، بێگومان دۆزەخ دەبینن بەچاوی خۆتان).

یەکێك لە پیاوچاکان دەڵێت: ئەوەی پێغەمبەری خواﷺ لە میعراجدا بینیویەتی زیاتر متمانەو بڕوام پێیەتی لەوەی کە خۆم ببینیایە، چونکە ئەو خوا لەبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴾ النجم: ١٧ من بوومایە رەنگە چاوم بگێڕایە بەملاو بەولادا، یان چاوم رەشکەو پێشکەی بکردایەو چاك دیمەنەکانم وەك خۆیان نەبینیایە !؟.

هەروەها رۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ قەرزی جولەکەیەکی لا دەبێ دەیداتەوەو کەس ئاگای لێنابێ، جولەکەکە دێتو داوای قەرزەکەی لێدەکاتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ

دەفەرموێت: فلانە رۆژ دامیتەوە، ئەویش دەڵی: کێ شایەتە بابێت، لەوێدا (خوزەیمە) کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو وتی: من شایەتم کە پێی داویتەوە، کابرا شەرم دایگرتو رۆیشت. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: خوزەیمە خۆ تۆ لەوێ نەبووی چۆن شایەتی وات دا؟

ئەویش وتی: قابیلە ئێمە بڕوات پێبکەین کە هەواڵی ئاسمانان بۆ دێنیو بڕوات پێنەکەین کە قەرزی ئەو کابرایەت داوەتەوە؟!، بێگومانم کە راست دەفەرمویت.

پێغەمبەریش ئەو یەقینەی خوزەیمەی زۆر نرخاندو فەرموی: هەر کەس خوزەیمە شایەتی بۆ بدات بەسیەتی...

دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ کە قورئان کۆکرایەوە، هەموو ئایەتێك دەبوایە نووسرابێتەوەو دوو کەسیش لەبەری بوایە، ئینجا تۆماریان دەکرد، تەنها یەك ئایەت نەبێت کە نووسرابوو، بەڵام تەنها خوزەیمە لەبەری بوو، لەبەر قسەکەی پێغەمبەرﷺ ئایەتەکەیان تۆمار کردو وتیان: شایەتی خوزەیمە بەسمانە.

## سێیەم: حق اليقين:

﴿ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ الْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ ﴾الواقعـــــة: ٩٣-٩٥،

واتە: (خراپەکاران دەچنە ناو دۆزەخەوە، کە ئەمەش بەڕاستی (حق اليقين)ە...

چونکە رەنگە لە زانینەکەیو دەنگو باسەکەیدا دوو دڵییەك بووبێت، یان لە بینینەکەیدا چاویان بە چاکی نەیبینیبێو گومانێکی کەمیان هەر مابێت، بەڵام کە چوونە ناو دۆزەخەکەوە مسقاڵە زەڕرەیەك گومانیان نامێنێو دەبێ بە یەقینی هەقو تەواوی لەسەدا سەد.

ئیبن مەسعود لە پێناسەی یەقیندا دەڵێت: (یەقین بریتییە لەوەی کە خوا لە خۆت نەڕەنجێنی بۆ ڕازیکردنی خەڵکیو، ئیرەیی (حەسەد) بەکەس نەبەیت کە خوا ڕزقو ڕۆزییەکی پێدابێتو، لۆمەی کەس نەکەیت لەسەر شتێك کە خوا پێی نەداویت. بەڕاستی ڕزق نە (حرص)ی کەس دەیهێنێو نە پێناخۆشبوونی کەس دەیگێڕێتەوە، بەڕاستی خوا بە عەدالەتی خۆی خۆشیو شادی لە یەقینو ڕازی بووندا داناوەو، خەمو دڵتەنگیشی لە گومانو قیندا داناوە)[1]

---

١- رسائل شباب الدعوة، لاپەڕە: ٥٣٥

## چوارەم: یەقینی درۆی بێسوود :

جولەکەکان یەقینیان هەبوودڵنیابوون کە (محەمەد) پێغەمبەری خوایە، هەروەك چۆن دڵنیا بوون لە کورو منداڵی خۆیان، کەچی چونکە یەقینەکەیان راست نەبوو، بەرەو هەقو راستی نەبردن، قورئان دەفەرموێت:﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ﴾ البقرة: ١٤٦.

ئەم جۆرە یەقینە خراپەو پێچەوانەکەشی کە (یەقینی صادق)ە زۆر گرنگە، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ دوعای دەکردو دەیفەرمو: (اللهم إني أسألك إيمانا كاملاً و يقيناً صادقاً)، واتە: (خوایە من داوای ئیمانێکی تەواوو یەقینێکی راستت لێدەکەم).

هەروەها دەیفەرموو: (پەروەردگارا... یەقینێکمان بدەرێ کە دەردو مەینەتیو بەڵای دنیامان لەسەر سووك بكات)

## پێنجەم: (یەقین)ێك كە هەردەڵێی گومانە، وەك یەقینی مرۆڤ بە مردن:

رۆژانە خەڵك دەبینین، یان دەبیستین کە دەمرن، وە چاکیش دەزانین سەرەی ئێمەش دێتو یەقینمان هەیە، کەچی هەر دەڵێی یەقینەکە گومانەو نایگرینە خۆمانو بیرمان دەچێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (مارأيت يقينا أشبه بالشك كيقين الأنسان بالموت)، واتە: هیچ یەقینێکم نەدیوە لە گومان بچێت، وەك یەقینی مرۆڤ بە مردن)...

## سەرنجدان و بیرکردنەوە:

سەرنجدانو بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی پەروەردگار، بە تایبەت مانگو خۆرو ئەستێرەکانو هەسارەکان، مرۆڤ زیاتر بەرەو دڵنیاییو یەقین دەبات، هەروەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴾ الانعام: ٧٥ ئاوەها پیشانی (ئیبراهیم)مان دا بەڵگەو نیشانە گرنگەکان، لە ئاسمانەکانو زەویدا، بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیای بکەینو زیاتر لە دەستی قودرەتی پەروەردگار تێبگات...

ئەمرۆش کە زانستو زانیاری زۆر پێشکەوتووە، تێگەیشتن لە بوونەوەر ئاسانترەو، زانایان زۆر شتی سەرسوورهێنەریان بۆ دەرکەوتووە لە بارەی فراوانی ئاسمانەکانو زۆری و

بێشوومارى ئەستێرەكان، كە ئەمەش واى كردووە كە لە نێو زانا گەردوون ناسەكان (فلكي)دا نیە بڕواى بە خواى پەروەردگار (بەدیهێنەرى ئەم بوونەوەرە) نەبێت.

بۆ نموونە لەسەر كاغەز بە مللیمەترو بە سانتیمەتر شت دەپێوین، یان نەخشە دەكێشین، وە لەسەر زەویش بە مەترو بە كیلۆمەتر، بەڵام لەبەر فراوانی و بێ ئەندازەیی ئاسمانەكانو بوونەوەر، كە دێینە سەر باسی دووری نێوان ئەستێرەكان بە ساڵی رووناكی پێوانەی دەكەین، كە دەوترێ ساڵی رووناكی، واتە ئەو دووری‌یەی كە رووناكی لەماوەی ساڵێكدا دەیبڕێت، كە: (٩,٤٥×١٠ ١٢) كیلۆمەترە، واتە: (٩,٤٥ × ملیۆن × ملیۆن كیلۆمەتر)... ئینجا كە ئەستێرەیەك ملیۆنەها ساڵی رووناكی لێمانەوە دوورە، دەبێ دووری‌یەكەی چەند بێتو پاشان ئەم بوونەوەرەش چەند فراوان بێت... كە ئەمەش شایەتی‌یەكی مەزنە لەسەر بەتوانایی‌و دەستی قودرەتی پەروەردگار.[١]

## نهێنی ئەستێرەكان:

(كە لە كاروانێكی دوورەوە بەرەو مەنزڵ دێیتەوەودرەنگ دەكەویت، بەرەبەرە دەكەویتە ئامێزی دنیای خامۆشو كشوماتەوەو، شەوەزەنگت بەسەردا دێتو ئینجا بە تێڕامانێكەوە سەر هەڵدەبڕیت بۆ ئاسمان، دەكەویتە بیركردنەوەیەكی قووڵو ئەندێشەیەكی سەیرەوە، لە دڵی خۆتدا پرسیار دەكەیت لەم دیمەنە خواكردانەی ئاسمان كە چەرخاو چەرخە مێشكی مرۆڤیان هەژاندووە... جا پارێزگاری كردنی ئەم ملیارەها ملیار ئەستێرانەو، دابینكردنی وزەیان بێ كەموكووڕیو، رێنمەدان بە تێكچوونو بەیەكدامالێن لەسووڕگەكانیانداو، بەڕێوەبردنیان لە ملیاران ساڵەوە تاوەكو ئێستا بەهەمان یاساو دەستوور، ئەوە دەگەیەنن كە كردگاری ئەمانە زۆر بەهەیبەتو شكۆدارە...

بۆ نموونە خۆر نزیكەی پێنج ملیار ساڵە تیشكو رووناكی‌و گەرمی دەدات، بەهۆی گەرمە كارلێكە ناوكی‌یەوە (التفاعلات الحرارية)، كە لە هەر یەك چركەیەكدا (٦١٦) ملیۆن

---

١- بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە نهێنی ئەستێرەكان چاك وایە پەڕاوێكی وەك (نهێنی ئەستێرەكان) بخوێنیتەوە كە (حسين دەمیرقان) بە توركی نووسیویەتی‌و تا ساڵی (١٩٨٥) پانزەجار لە چاپ دراوەتەوەو، مامۆستا(محسن علی) لە ساڵی(١٩٩٠)دا لە عەرەبی‌یەوە وەریگێڕاوەتەوە سەر زمانی كوردی.

تەن هایدرۆجین دەبێت بە (٦١٢) ملیۆن تەن هیلیۆم و بە بۆچوونی زانایان ڕەنگە خۆر بتوانێت تا پێنج ملیار ساڵی دیکەش گەرمی بداتو کارلێکەکان بەردەوام دەبێت.

لەلایەکی دیکەوە هەموو ئەو ئەستێرانەی کە لەشەودا بە ئاسمانەوە دەیبینین، بەشێکن لە گەلە ئەستێرە گەورەکەمان کە (ڕێی کاکێشان)ەو بریتیە لە (٢٠٠) ملیار ئەستێرە؟!..[١]

ئەم بوونەوەرە پڕ سەیرو سەمەرەیە، کە مرۆڤ چەندە لێی بکۆڵێتەوە هێشتا هەر کەمە، قورئان زۆر بە جوانی هانمان دەدات لەسەر تێفکرینو وردبوونەوە لێی، هەروەك دەفەرموێت:

﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ ۖ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ﴾ الملك: ٢-٤

واتە: ئەو خوایەی کە حەوت ئاسمانی دروستکردووە، یەك لەسەر یەك، تۆ لە دروستکردنیدا هیچ ناڕێکیەك نابینیت، ئەگەر گومانێکت هەیە چاو بگێڕەو بزانە هیچ ناتەواویەك دەبینیت؟ ، دووبارە چاو بگێڕە، یەك لەدوای یەك، چاوت بە نائومێدی دەگەڕێتەوە بۆ لات و هیچ نادۆزێتەوە لە کەموکوڕی و ناتەواوی...

یان دەفەرموێت: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾ق: ٥-٨، واتە: (ئایا لەوئاسمانەی بەسەریانەوەیە وردنابنەوە کە چۆن دروستمان کردووەو ڕازاندوومانەتەوە، بە جۆرێك کەموکوڕی و کەلێنی تێدا نیە؟!... هەروەها زەویمان ڕاخستووەو کەژو کێومان لەسەری دامەزراندووە، وە لە هەموو جۆرە ڕوەکێکی جوانو بۆنخۆشو ئامدارمان تێدا ڕواندووە، ئەمانە هەمووی بۆ یادخستنەوەوچاوکردنەوەی هەموو بەندەیەکە کە بۆ لای ئێمە بێتەوە.

ئەوانەی بەدوای یەقیندا دەگەڕێن لەزەویدا بەڵگەو نیشانەی زۆر دەبینن ولە نەفسی خۆشیاندا بە هەمان شێوە، قورئان دەفەرموێت:

﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ وَفِي أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ الذاریات:٢٠-٢١..

---

١- سەیری پەڕاوی نهێنی ئەستێرەکان بکە.

ئەوانەی کە ئارامگرن و یەقینیان هەیە خوای گەورە دەیانکاتە پێشەواو مامۆستاو خەڵکی ڕێنمایی دەکەن بە پێی بەرنامەی خوا ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ السجدة: ٢٤

ئەوانەی بڕوادارن و یەقینیان هەیە بە ڕۆژی دوایی ئەوانە سەرفرازو سەرکەوتوون ﴿ وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُولَٰئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ البقرة: ٤ - ٥

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (صلاح أول هذه الامة بالزهد واليقين، ويهلك آخرها بالبخل والامل)[١].

## پشتگیری خوا بۆ بڕواداران:

تەنها ئیسلام ئایینی پەسەندکراوی لای خوایە کەتاقیامەت بەرنامەی بەشەرییەت بێت، بۆیە هەروەك چۆن پشتگیری پێغەمبەرانی دەکرد ئاواش پشتگیری پێغەمبەری کردﷺ و، بەهەمان شێوەش پشتگیری شاگردان و ئازیزانیپێغەمبەر دەکات.

خوای گەورە هەر لەبەرەبەیانی مرۆڤایەتیدا کە گەلی نوح سەرکەشیان کرد و نەچوون بەدەم ئەو هەموو هەوڵ و کۆششەی نوحەوە وئەویش داوای سەرخستنی کرد لەخوا، بەفەرمانی خوا ئەوەندە بارانباری و ئەوەندەش ئاو لەزەوییەوە هەڵقوڵا کە ئاوی زەوی و ئاسمان دای لەیەك و، لافاوێك هەستا کە بێجگە لەموسوڵمانان هەرچی هەبوو ڕای ماڵیو زەوی پاکردەوە لێیان، هەروەك قورئان دەفەرموێت :

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَىٰ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَاهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ القمر: ٩ - ١٥ هەر زووش بە پێغەمبەری فەرموو: ﴿ يَا أَيُّهَا

---

١- ئیمام ئەحمەد.

ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ المائدة: ٦٧

پیاوێکی بیانی دەڵێت: مرۆڤ درۆ و چاوڕاو لە هەموو خەڵکی بکات لەخۆی ناکات، پێغەمبەر ﷺ کە ئەم ئایەتەی بۆ هات، پاسەوانەکانی ئیزن داو فەرمووی خوا دەمپارێزێت، ئەوەش کەسەیری ژیاننامەی موبارەکی بکات ڕاستی ئەم پەیمانە خواییەی بۆ دەردەکەوێت کە لەماوەی بیست و سێ ساڵدا پاراستی.

خالید یەکێ لە هۆکانی موسوڵمانبوونی ئەوە بوو کە وتی: من بۆم دەرکەوت کە پێغەمبەر و موسوڵمانان کەس دەستی نایانگاتێ و ناتوانێت لە ناویان بەرێت..

خوای گەورە بە هەمان شێوە بڕواداران ڕزگاردەکات وئەوە بە هەقێك دادەنێ لەسەر خۆی ﴿ ثُمَّ نُنَجِّى رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ یونس: ١٠٣.

## ئەبو موسلیمی خەولانی :

یەکێکە لە گەورە تابیعینەکان و زۆر هەوڵی دەدا کە پێشبڕکێ بکالەگەڵ هاوەڵاندا، بۆ ئەوەی لە قیامەتدا هاوەڵان پێغەمبەر بەتەنها بۆ خۆیان نەبەن وبزانن کە پیاویان دوای خۆیان بەجێهێشتووە، ئەوەتە دەڵێت: (أيظن أصحاب محمد ﷺ أن يستأسروا بـه دوننا، فوالله لنزاحمنهم عليه زحاما حتى يعلموا أنهم خلفوا رجالا) .

ئەبو موسلیم خەڵکی یەمەن بوو، دوعای گیرا بوو، کاتێك ئەسوەدی عینسی ئیدیعای پێغەمبەرایەتی کرد، ئەم دژی وەستا، بۆیە ڕۆژێك ئاگرێکی زۆر گەورەی کردەوەو لەبەرچاوی خەڵکێکی زۆر پێی وت: شایەتی دەدەیت محمد پێغەمبەری خوایە؟ وتی: بەڵێ..

وتی: شایەتی دەدەیت من پێغەمبەری خوام؟ وتی: نەخێر. بۆیە فڕێیاندایە ئاگرەکەوە، کەچی بەفەزڵی خوا نەسوتاو بەسەلامەتی هاتەدەرەوە. شوێنکەوتوانی ئەسوەد تەگبیریان بۆ کرد کە لە یەمەن نەیهێڵێت بۆ ئەوەی خەڵکی لێهەڵنەگێڕێتەوە، ئەویش زۆری لێکرد کە ناوچەکە بەجێبهێڵێت، بۆیە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە.. ڕۆژێك عومەر لێی پرسی ئەسوەدی دوژمنی خوا چی کرد لەو کەسەی کە نەسووتا.. وتی: ئەوە کەسێك بوو ناوی عبدالله ی کوڕی ثوب بوو، ویستی خۆی ئاشکرا نەکات، عومەر گومانی لێکردو وتی: توخوا تۆ ئەو کەسە نیت؟ وتی: بەڵێ من ئەوم.. عومەر ناوچەوانی ماچ کردو لە نێوان خۆی و

ئەبوبەکردا داینا و وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە نەیمرانم تا ئەو کەسەی پیشان دام لە ئوممەتی محمد ﷺ کە وەك حەزرەتی ئیبراهیمی بەسەر بێت و هیچی لێنەیەت.

ئەبو موسلیم لەگەڵ برادەرێکیدا دەبێت و لەژێر لێوەوە یادی خوای دەکرد، یەکێك بەلایاندا تێدەپەڕێت و بە برادەرەکەی دەڵێت: چی‌یە ئەوە شێت بووە؟ ئەمیش وەڵامی ئەداتەوەو دەڵێت :برام ئەوەی دەیبینی چارەسەری شێتی‌یە!

## مسوڵمانانی حەبەشە:

دکتۆرعبداللە موسلیح لە وتاری(أمة لاتزول)دا وتی: موسوڵمانانی حەبەشە (أثیوبیا)، چەندەها ساڵ گیریان خواردبوو بەدەست دیکتاتۆر هیلاسیلاسی‌یەوەکە بەئاگروئاسن سەرکوتی دەکردن ولەبەردەم کۆنگرسی ئەمریکیشدابەشانازی‌یەوەباسی هەوڵی لەناوبردنی ئیسلام وموسوڵمانانی کرد، ئەونەماو مەنگستۆی کۆمۆنیست هاتەجێی، بارووەزعەکە هەروەك خۆی بوو، تا ساڵێکی بێبارانی هات و گاورەکان چوونە لای مەنگستۆو داوایان لێکرد کە ڕێیان بدات بە کۆمەڵ دوعا بکەن بۆ بارانبارین ئەویش ڕێی دان و چەند ڕۆژ دوعایان کردو هیچ نەباری، ئنجا شێخ محمد سعید بەنوێنەری موسوڵمانان چووە لای ناوبراوو داوای لێکرد ڕێیان بدات بەکۆمەڵ نوێژی بارانبارین بکەن، ئەویش ڕێی دان و لەسایەی خواوە پاش ماوەیەکی کەم بارانێکی باش باری، ئەمەش پشتگیری خوابوو بۆ موسوڵمانان و بەمەش بارو وەزعیان گۆڕدراو، ڕێیاندان کەمزگەوت دروست بکەن و مەجلیسی باڵای کاروباری ئیسلامیشیان دامەزرێنن..

## بارانێك پاش دوعای حاجییان:

شێخ عباس سیسی کە یەکێکە لە برا دێرینەکانی برایانی میسر و لەم ساڵانەی دواییدا وەفاتی کرد، لەیادەوەری‌یەکانیدا دەڵێت: لەساڵی (١٩٤٣)دا کەوتمەنووسینی یادەوەری‌یەکانم و بەیانیەکیان نووسیم: ئەمڕۆ هەستام بۆ نوێژی بەیانی‌و ڕووم کردە کەعبەی پیرۆز قیبلەی موسوڵمانان، ویستم وەسفێکی کەعبە بکەم هەرچیم کرد هیچم بۆ نەهات چونکە کەعبەم نەدیبوو، هەروەك دەنگێك پێم بڵێ: ئەی باشە بۆ ناچی بۆ حەج و بەچاوی خۆت کەعبە ببینی، بڕیارمدا بچم بۆ حەج و خوای گەورەش ئاسانی کردو هەر ئەو ساڵە گەیشتمە ئاواتی خۆم و حەجم کرد.. کە لەوێ بووم چەند ساڵێك بوو باران نەباری بوو لەوڵاتی سعودیە، بۆیە مەلیك

عبدالعزیز ئال سعود داوای له حاجیان کرد که نیو ملیۆنێك دەبوون لەسەر کێوی عەرەفە کە نوێژی بارانبارین بکەن، دوای ئەوەی نوێژەکە کرا لە گەڕانەوەماندا بۆ موزدەلیفە بارانێك باری کە دەشت و دەری تێرئاو کردو ئەوەندە زۆر بوو تەنانەت ڕێگاوبانەکانی تێکدا..

## نوورسی و یارمەتی پەروەردگار:

١- نوورسی بەڕەحمەت بێت لە بارەی ئەزموونی خۆیەوە لەم بوارەدا دەڵێت: من تا ئێستاش سەرسامم چۆن توانیم پاش چەند ڕۆژێکی کەم هەڵبێم لەدەست ڕووسەکان، نازانم چۆن توانیم بەپێ ئەو هەموو ڕێگایە ببڕم لەماوەیەکی کەمدا کە بە ساڵێك نابڕێت!! بەمەرجێ زمانی ڕووسیشم نەدەزانی، ڕزگارم بوو لە دیلی بە شێوەیەکی سەیری سەر سوڕهێنەر بەفەزڵ و یارمەتی خوا کە فریایی منی داماوو بێدەسەڵات کەوت و، گەیشتمەوە ئەستەنبوڵ لە ڕێی وارسۆ و ڤییەناوە .

٢- نوورسی زۆر گرنگی دەدا بە نوێژەکانی و حەزی دەکرد هەرکەبانگی دا نوێژەکەی بکات، جارێك لەگەڵ هاوەڵانیدا پێنج خولەکی مابوو بگاتە ناو شار بانگی دا، داوای لە هاوەڵانی کرد یەکسەر نوێژەکەیان بکەن و دوای نەخەن تادەگەنە ناو شار..

جارێك کەلەپچەی لەدەستا دەبێت و دوو پۆلیس لەگەڵیا دەبن دەیبەن بۆ شاری بەتلیس، لەڕێگا بانگیدا، مامۆستا داوای لێکردن کەلەپچەکەی بکەنەوە بۆ ئەوەی نوێژەکەی بکات، پۆلیسەکانیش بە قسەیان نەکرد، پاش تۆزێك بینیسان کەلەبچەکەی کرایەوەو هەڵیدایە بەردەمیان و نوێژەکەی کرد!! پۆلیسەکان سەریان سوڕماو زانیان ئەوە کەرامات بوو خواپێی دا، بە مامۆستایان وت: تا ئێستا ئێمە پاسەوانی تۆ بووین ئیتر ئێمەخزمەتکارتین!!

جارێك لێیان پرسی چۆن ئەو کەلەپچەیە کرایەوە؟؟ وتی: منیش نازانم، بەڵام دیارە کەرامەتی نوێژ بوو!

٣- چەندجار لەکاتی بەندیدا ژەهریان بۆ کردە ناوخواردنەوە بە تایبەت لە بەندیخانەی ئەفیون، خوای گەورە پاراستی.[١].

٤- لە کاتی شۆڕشی ئیتحادو تەرەقیدا بەسەر خەلافەتی ئیسلامیدا، نوورسی و پیرەمێرد کە لەو کاتەدا لە تورکیا بوو، دەگیرێن و لە بەندیخانە توندیان دەکەن، هەردووکیان

---

١- سایتی: قدوة، وتارێکی محمد موسا الشریف لەبارەی نوورسییەوە.

بڕوا ناکەن بە ئاسانی ڕزگاریان بێت، چونکە لەو باروزروفە شێواوەدا بە سەدان کەس هەڵدەواسران و دەکوژران، دیارە نوورسی کارێکی مەزنی لەسەر شان بوو کە ئەویش پاراستنی ئیمان بوو،خوای گەورە ئیرادەی وابوو کە بیهێڵێتەوە بۆ ڕوو بەڕووبونەوەی ئەتاتورك و دەستەودایرە فاسیدەکەی، شەوێك نوورسی خەو بە کاك ئەحمەدی شێخەوە دەبینێ کەمژدەی ڕزگاربوونی ئەداتێ ودڵنیای دەکات، ئەویش بەیانی خەوەکە بۆ پیرەمێرد دەگێڕێتەوەو پاش ماوەیەك بە فەزڵی خوا ڕزگاریان دەبێت، پیرەمێرد ئەم بەسەرهاتەی بە چەند دێرێك هۆنراوە بۆ تۆمارکردووین لە دیوانەکەیدا لاپەڕە (١١٢) کە دەڵێت :

کاك ئەحمەدەکەی خۆشەویستی خوا
زۆرکەس بەسایەی تۆوە نان ئەخوا

لەوانە زیاتر من تۆم خۆش ئەوێ
هەر تۆی سەربەرزی قەومەکەت ئەوێ

کە لە زیندانیان تێك خزاندبووین
سێدارەیان بۆ داچەقاندبووین

تۆ چووبوویتە لای بدیع الزمان
مژدەت دابوویە بە ژیان و مان

فەرموویبووت ئێوە نامرن ئەمێنن
تاسەر ئازادی گەلتان ئەبینن

خۆ من باوەڕم بەوە کردووە
بەوەسیەت ناوی ئەوەم بردووە

بەلام وا ئەمرم بەو ئاواتەوە
بشمرم گۆڕم دەنگ ئەداتەوە

## صلاح الدين و پاراستنی پەروەردگار :

چەندەها جار صلاح الدين تووشی مەوقیفی خەتەرناك بووەو بە هەموو حسابێكی بەشەری ئەبوایە تیابچوایە كەچی خواپاراستی تابینێ بۆ فەتحی قودس، لەم بارەیەوە خۆی دەڵێت: (لقد أشرفنا على الهلاك غير مرة وما أنجانا الا الله لأمر يريده هو سبحانه)..

نەخۆش دەكەوت وبە ئازارەو لە جێگادا بۆی دەكەوت، كاتێ دەچوو سوپاكەی بەسەر بكاتەوەوسواری ئەسپەكەی دەبوو ئازاری نەدەما..

## دكتۆرێك لە نیوە شەودا :

شێخ محمد حسان كە بانگخوازێكی میسرییە دەڵێت: جەندرمەكانی حكومەت شەوێك ئەدەن بەسەر ماڵی بانگخوازێكداو ڕاپێچی دەكەن بۆ بەندیخانە، دیارە هەرچیش گیرا مەگەر خوا بزانێت كەی وچۆن ڕزگاری دەبێت ؟؟!!

ئەو شەوە مناڵە بچووكەكەی زۆر نەخۆش دەبێت و تایەكیقورسی لێدێت، هاوسەرەكەی بەو نیوە شەوە لەبەرهەژاری و بێكەسی دەستی بەكەسدا ناگات، سەعات دوانزەی شەو لە دەرگاكەیان دەدرێت، كە دەیكاتەوە دكتۆرێكە سەلام دەكات و دەڵێت: كوا نەخۆشەكەتان؟؟ ئەویش مناڵەكەی بۆ دێنێت، فەحسی دەكات و هەندێ دەرمانیشی دەداتێ، چاوەڕێ دەكات هەقی فەحسەكەی بداتێ، ژنەكە دەڵێت: بەخوا هیچمان نیە بتدەینێ و، مێردەكەشم گیراوە.. شەڵێ: ئەی تۆ تەلەفونت نەكرد؟ ئەمە شوققەی ژمارە چەندە؟ دوایی بۆی دەردەكەوێ دراوسێكەیان نەخۆشیان هەبووەو تەلەفونیان بۆ كردووەو ئەم بە قەدەری خوا شوققەكەی لێتێك چووە بۆ ئەوەی چارەسەری مناڵەكەی بۆ بكات! دكتۆرەكە ئەوەندە پیاو دەبێت لەبەرخوا مانگانەی بۆ دەبڕێتەوە تا مێردەكەی بەردەبێت! جا ژنەكە هەر كاتێ هیچیان نەبوایە بۆ خۆشی بە مێردەكەی دەوت: ناشیەن بتبەن بەندت بكەن و خوا دەرووومان لێبكاتەوە ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴾ الزمر: ٣٦ - ٣٧

## لەموعجیزەکانی قورئان و سوننەت

قورئان و فەرمووده ئاماژەی زانستی زۆریان تیایە کە وردە وردە لەگەڵ پێشکەوتنی زانستدا هەستیان پێدەکرێت و بەردەوام دەبنە مایەی هیدایەت بۆ خەڵکانێکی زۆر کە بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێن بۆ نموونە:

**یەکەم: بۆهەموو گەلێك پێغەمبەر نێردراوە،** ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴾ النحل: ٣٦

واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لە ناو هەرگەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێ: تەنها خواپەرستن، خۆتان دووربگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر، جا هەبوو لەو خەڵکە شایەنی هیدایەت بوو خواش هیدایەتی دا، هەشبوو خۆی شایستەی گومڕاییدەکرد، کەوابوو بگەڕێن بەزەویداو سەرنج بدەن، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو کەسانەی بڕوایان بەبەرنامەی ئێمە نەبوو..

گەڕان بەزەویدا و دۆزینەوەکان هەموو شایەتی ئەدەن لەسەر ڕاستیەکانی قورئان، لە ساڵی (١٩٧٥) ز دا پاشماوەی گەلی ئیبیلا دۆزرایەوە لە شام، کە خاوەنی دەوڵەتێکی پێشکەوتوو بوون و بازرگانیان کردووە لە گەڵ وڵاتانی دەوروبەرداو مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ (٢٥٠٠) ساڵ پێش زایین، واتە (٤٥٠٠) ساڵ پێش ئێستا.. ئەم مەملەکەتە لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە تا دیمەشق بووە و خاوەنی شارستانێتیەکی پێشکەوتوو بوون، تەنانەت کتێبخانەی گەورەیان بنیات ناوەو زۆر لە ڕێکەوتننامەی بازرگانی وزانیاری گرنگیان لەسەر لەوحی سوورەوەکراوی قوڕیندا تۆمارکردووە بە نووسینی مسماری بەزمانەکەی خۆیان کە پێی دەوترێت زمانی (ئیبیلیت) .

لەوحەکان دووهەزاردانەن وزانای بەناوبانگ جیوفانی باتیناتو لە زانکۆی ڕۆما لە ئیتالیا توانی بیانخوێنێتەوە، جا لەوحەکان نەك هەر وەك کەلەپوورێك گرنگە بەڵکو لەلایەنی ئاینیشەوە زۆر گرنگە، چونکە زانای کەلەپووری ئەمریکی دیفید نویل فریدمان بۆی دەرکەوت

کە لەو لەوحانەدا ناوی پێغەمبەران ئیبراهیم و ئیسماعیل و داوود هاتووە سەلامی خوایان لێبێت.. هەروەها ناوی میکائیل و شالوم هاتووە کە هاوکاری داوود بوون لە بانگەوازدا..

باسی سینا و غەزەو قودسیش هاتووە کە نزیکن لەو مەملەکەتەوە، ئەمەبێجگە لە ناوی سەدوم و عامورا کە لە گوێ دەریای مردوو بوون وگەلی لوگ تیایا ژیاون.. هەروەها باسی شاری ئیرەم کراوە کە گەلی عاد تیا ژیاون و ئەم باسکردنەش هاندەربوو بۆ دەرهێنەری ئەمریکی کلاپ کە بگەرێت بەدوای ئەو شارەداولەسالی (١٩٩٠) تنا سالی (١٩٩٦)ز دۆزییەوە لەنیوە دوورگەی عەرەبدا، هەروەك لە بەشی یەکەمی ژیانەوەدا باسم کردووە..

ئەمە یەکەم جارە ئاوا باسی ئەو پێغەمبەرانە بدۆزرێتەوە لە شارستانیەتە کۆنەکاندا، کەبەڵگەیە پێغەمبەریش بۆ ئەو گەلە ڕەوانە کراوەو ئەوانیش ناوی پێغەمبەرانیان زانیوە، تەنانەت وتارێکی گۆڤاری (ڕیدەرس دیجست) دەڵێت: لەسەردەمی پاشا ئیبرۆم دا مەملەکەتی ئیبیلا گۆڕان بەسەر ئایینەکەیاندا هاتووەو ناوی خوایان بۆ ناوەکانی خۆیان زیادکردووە تاناوی خوا بەرز ڕابگرن، (هەروەك چۆن ئێستا لای خۆمان عبدالرحمان وعبدالله هەیە)..

باسی ئیبراهیم لە (٤٥٠٠) ساڵ پێش ئێستەدا بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەزۆر لە پێش زەمانی موساو عیسادا بووە، جا بۆیە کە جوولەکەکان دەیان وت ئیبراهیمیش یەهودی بووە قورئان وەڵامی دانەوە و فەرمووی: ﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ آل عمران: ٦٧ واتە: ئیبراهیم نە جوولەکە بووەو نە گاور بەلکو ملکەچ و فەرمانبەردارو موسوڵمان بووەو لە دەستەی موشریکەکان نەبووە..

کە ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لە سەر ڕاستی قورئان ئەگینا پێغەمبەر ﷺ چوزانێت پێغەمبەری ئیبراهیم پێش پێغەمبەری موساو پێغەمبەری عیسا بووە سەلامی خوایان لێبێت[1]..

**دووەم: کۆمەڵێك لە ئەهلی کیتاب دان دەنێن بەوەدا کە قورئان هاوشێوەی نیەو لە خواوەیە:** ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾ سبا: ٦ . واتە: ئەوانەی زانست و زانیاریان

---

١- مەوقیعی: www.islamz.com

پێدراوە چ زانستی ئاینی وەك گاورو جوولەکەکان یان زانستی ماددی، چاك دەزانن ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت ڕەوانە کراوە هەرئەوە هەقەو، هیدایەت و ڕێنمونی بەخشە بۆ ڕێبازی پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات و شایستەی سوپاس و ستایش..

تازەترین بەڵگەش پرۆفیسۆر أوری روبین ی جوولەکەیە کە مامۆستای زمانی عەرەبی یە لەزانکۆی تەل ئەبیب، ناوبراو دووساڵ زیاترە خەریکی وەرگێڕانی قورئانە بۆ سەر زمانی عیبری، چونکە ئەو وەرگێڕانەی تر کە لەبەر دەستایە کەم و کوری زۆریان تیایە، أوری پاش وەرگێڕانی نیوەی قورئان خۆی بۆ ناگیرێ و ناچاردەبێت کە لەبارەی قورئان و کاریگەری زۆری یەوە بڵێت (بەڕاستی قورئان سیحرێکی گەورەی هەیە لە شێوەی پیتەکانی و بەهۆی داڕشتنیەوە کە بە شێوەیەکی پەخشانی زۆر هاوسەنگ داڕێژراوەو ئیقاعێکی مۆسیقی زۆر تایبەتی هەیە.. قورئان بابەتی هەمەچەشنی تیایە، وەك باسی دۆزەخ کە بەشێوەیەکی ئەوەندە ترسناك باسی دەکات کە لێی دووربکەویتەوەو، بەشێوەیەکی ئەوەندە خۆشیش باسی بەهەشت دەکات کە هەوڵی بۆ بدەیت، ئەمکە بێجگە لە شەرع و یاسا کە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ ڕیکدەخەن. من گەیشتومەتە ئەوەی کە قورئان دەیەوێت مرۆڤێکی تەواو دروست بکات لەسەر زەوی، ئەمەش بە پەیڕەویکردنی فەراهەم دێت، قورئان کلیلی ڕێگای گەیشتن بە کامیل بوون و پێگەیشتن و تێگەیشتن دەدات بەمرۆڤ).. ئەمەش وای لێکرد کەدان بنێ بەوەدا کە وەرگێڕانی قورئان زۆر کارێکی گرانە..[1]

دیارە بەهەزاران شایەتی لەم جۆرە هەیە، هە لەبەرەبەیانی ئیسلامەتیەوە تا ئەمڕۆ ئەوەتا کاتی خۆی وەلیدی کوڕی موغیرە کە زۆر دەسەڵاتدارو پارەداربوو لە مەککەدا و مامی ئەبو جەهل بوو،کە گوێی لە قورئان بوو بە گەلەکەی وت: ئەوەی محمد دەیڵێ شیرین و ڕازاوەیە و سەرەوەی میوەدارەو بنکەکەی ڕەگوڕیشەدارە، بەخوا ئەو وتەیە سەردەکەوێ و هیچ شتێك بە سەریا زاڵ نابێت.. قوڕەیشیەکان کە ئەم شایەتیە گەورەیەیان لێبیست وتیان: بەخوا وەلید شێت بووە ؟؟!![2]

---

١- سایتی إسلام زید.

٢- ل ١٤٣ ژیانی پێغەمبەری مەزن / پاڕەزانی..

**سـێیەم: جوولەکـەکانی ئەصـفهان**: پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: (یتبع الدجال سبعون ألفا من یهود أصـفهان علـیهم الطیالسـة)[1] واتـە: حـەفتا هـەزار لـە جوولەکەکانی ئەصفهان کە عەبا (شاڵێکی ئاودامان) داوە بە شانیاندا شوێن دەجال دەکەون..

جوولەکە ئێستا ژمارەیان سی هەزاردەبێت لە ئێرانداو، لە سێ شاردا نیشتەجێ بوون کە تاران و هەمەدان و ئەصفەهانە، خاکی ئێران بەلایانـەوە خـاکی پاشا کۆرشـە کـە کـاتی خۆی رزگاری کردن و بابلی داگیر کـرد، گوایـە بنیـامین بـرای یوسـف و دانیـال پێغەمبـەریش لـەوێ نێژراون .

جالەو کاتەوە کە کۆرش بابلی گرت و جوولەکە چوون بۆ ئێران زۆریـان قایـل نـابن ئێـران بەجێبهێڵن. جا هەرچەند یەهودیەتی عالـەمی فشـاری زۆری خسـتە سـەریان بـۆ ئـەوەی بچـنە فەلەستین، ئەوان تەسلیم نەبوون و کەمیان لێ چوو بۆ ئیسرائیل .

پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خوا ئاگاداری نەکردبێت هەقی چیە بەسەر ئەم باسەوە، بـۆ نالێـت جوولەکەکانی نیوە دورگەی عەرەب، یان جوولەکەکانی ئـەوروپا، یـان جوولەکـەکانی عێـراق؟؟! شایانی باسە هەر لە ساڵانی پەنجاکانەوە جوولەکە عێراقیەکان لە ئـەنجامی فشـاری یەهودیـەتی عالەمیەوە کە هەرخۆیان بۆمبیان ئەخستە ماڵەکانیانەوە و لێیان دەکوشـتن، ناچـاربوون بچـن بۆ ئیسرائیل !!

ئەصفەهان دەکەوێتە ناوەڕاستی ئێرانەوەو وادانێ لەو سی هەزار جوولەکەیـەی ئێـران دە هەزاریان لەو شارەدایە زۆر مەنطقیە کە تاقیامەت ئەوەندە زۆر بن کە حەفتا هەزاریان شـوێن دەجال بکەوێت. ئنجا ئەو وەسفە وردەی پێغەمبەر کەباسی عـەبای سـەر شـانیان دەکـات، کـە ئێستە بەفیعلی عادەتیانە ئەو عەباو شاڵە ئەدەن بەشانیاندا..

**چـوارەم: تێپـەڕبوون وەك هـەورە بروسـکـە**: پێغەمبـەر ﷺ لـە فەرموودەیەکدا باسی هەندێ لەو کەسانە دەکات کەوەك هەورە بروسکە بەسەر پردی صیراگ دا دەپەڕنەوە لە چاو تروکاندنێکدا (فیمر أولکم کالبرق) ئەبوهورەیرە وتی: (بأبي أنت وأمـي أي

---

١- مسلم.

شیء کمر البرق)، فەرمووی: (ألم تروا الى البرق کیف یمر ویرجع فی طرفة عین)[1]، واتە نابینن کە چۆن هەورە بروسکە دێت و دەگەڕێتەوە لە چاو تروکاندنێکدا..

تازەترین لێکۆڵینەوەی زاناکان لە بارەی هەورە بروسکەوە دەڵێت: هەورە بروسکە چەندقۆناغێکی زۆر کورتە گرنگترینیان (القائد المار) ( Stepped leader) کە ئەو تیشکەیە کە لەهەورەکەوە دێت بەرەو زەوی کەبریتی‌یە لە بارگەی‌سالیب و، پاشان گەڕانەوەی (شرارە)یەکە لە بارگەی موجەب بەرەو هەورەکە کە پێی دەوترێت(الضربة الراجعة) کە هەورە برووسکەکە زۆرتر لەمەوە درووست دەبێت (Return stroke) کە ئەمەش ماوەکەی ئەوەندە کورتە هەستی پێناکرێت و دەڵێن یەك لەسەر سەدی چرکەیەکە.. باشە ئەگەر خوا پێغەمبەری ئاگادار نەکردبێت چۆن ئاوا بەچەند وشەیەك تالیەتی هەندەسی وردی ئەوکردارە فیزیایی‌یە دەتوانێت باس بکات و تەنها لە سەدەی بیستیش دا زانایان بیدۆزنەوە ؟! ئەوەی سەیرە زانایان هەمان تەعبیری پێغەمبەر بەکاردێنن کە هاتن و گەڕانەوەیەوماوەکەش هەر چاو تروکاندنێکە !!

هەورە بروسکە شتێکی ترسناکەو هەرلەکۆنەوە مرۆڤ لێی ترساوەو تەنانەت ئیغریقیەکان دەیانووت ئەوە چەکی (خوای زیۆس)ە و هەزاران خورافات و ئەفسانەیان لەبارەوە دانابوو .لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەوە تا سەدەی بیست واتە دووسەدەو نیو دیراسات و تاقیکردنەوە کرا و بە هۆی کامێرەی زۆرو بە هۆی مانگە دەستکردەکانەوە بە هەزاران باس و لێکۆلینەوە سەری هەڵدا، لەساڵی (٢٠٠٠) ز دا توانیان وێنەی هاتن و گەڕانەوەی هەورە برووسکەکە بگرن پاش ئەوەی توانیان کامێرەی زۆر پێشکەوتوو بۆ ئەم مەبەستە دروست بکەن. شایانی باسە لە هەر چرکەیەکدا سەد هەورە برووسکە دەبێت لەئاسماندا واتە ڕۆژی (٨,٦) ملیۆن هەورەبرووسکە.. هەورە برووسکەیەکیش تەبیارێکی (١٠٠) هەزار تا (٢٠٠) هەزار ئەمپێر دروست دەکات و ڤۆڵتیەکەشی نزیکەی (١٠٠) ملیۆن تا هەزار ملیۆن ڤۆڵت دەبێت..[2]

**پێنجەم: شەو نوێژ:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (علیکم بقیام اللیل، فانە دأب الصالحین قبلکم، وقربة الى الله عزوجل، ومنهاة عن الاثم، وتکفیر للسیئات، ومطردة

١- مسلم.

٢- سایتی: موسوعة الإعجاز العلمي فی القرآن والسنة.

للداء من الجسد)[1]، واتە: شەونوێژ بکەن، ئەوە ڕەفتاری چاکانی پێش خۆتانەو نزیکبوونەوەیە لە خواو گەڕانەوەیە لە گوناهو پاکبوونەوەیە لە خراپەو، دوورخستنەوەی نەخۆشیە لە لەش.

زانستی سەردەم پاش چوارده سەده جەخت دەکاتە سەر ئەم ڕاستی‌یە و کۆمەڵێك نووسەری ئەمریکی لە پەڕاوەکەیاندا بەناوی (الوصفات المنزلية المجربة وأسرار الشفاء الطبيعية) کە لەساڵی (١٩٩٣)دا چاپ کراوە دەڵێن: هەستان لە جێگا لە شەوداو هاتو چوونێك بەناو ماڵداو هەندێ مەشقی وەرزشی کەم وشتنی دەستو قاچ بە ئاوو، هەناسەی قووڵ سوودی تەندروستی زۆری هەیە (کە ئەمانەش هەمووی لە شەونوێژدا دێنەدی). زانایان دەڵێن: شەونوێژ دەبێتە هۆی کەم دەردانی‌هۆرمۆنی کۆرتیزۆل (کە ئەویش کۆرتیزۆنی سرووشتیە بۆ لەش)، کە ئەویش دەبێتە هۆی پاراستن لە زیادبوونی لەپڕی شەکر لە خوێندا و هەروەها زیادبوونی لەپڕی فشاری خوێنیش کەم دەکاتەوەو مرۆڤ دەپارێزێت لە سەکتەی دەماخ و جەڵتەی دڵ.. شەونوێژ چارەسەرە بۆ نەخۆشی (الاجهاد الـزمني) وبیرو هۆشیش تیژ دەکات بەهۆی ئەو قورئانەی کە لەونیوە شەوە کشوماتەدا دەخوێنرێت.ئەمە بێجگە لەوەی کە نەخۆشی دەنگدانەوەی گوێ(مرض طنين الاذن) کەمدەکاتەوە..[2]

**شەشەم: سێ ڕۆژ بەڕۆژووبوون**: دکتۆرێك لە شاری میامی لە ئەمریکا لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر سجلی ڕووداوەکانی خەستەخانەو بنکەی پۆلیسەکان، بۆی دەرکەوت زۆربەی ڕووداوەکانی تاوان و کارەساتی ئوتومبیل و خۆ کوشتن لەو ڕۆژانەدایە کەمانگ پڕە، واتە (١٣ و١٤ و١٥)ی مانگی عەرەبی، ئەمەشی بۆ ئەوە گێڕایەوە کە دیارە پەیوەندی‌یەك هەیە لەنێوان ئەو ڕووداوانە و باری مانگدا.. ڕەنگە ئەمەش تەفسیری ئەوە بێت کە پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژانەدا بەڕۆژوو بووەو هانی موسڵمانانیشی داوە بەڕۆژوو بن، دیارە ڕۆژووش دەبێتە مایەی دامرکانی مرۆڤ وکەم بوونەوەی ئاو لە لەشیدا، جا ڕەنگە چۆن مانگ کاردەکاتە سەر ئاوی دەریاکان و (مد وجزر) دروست دەکات بەهەمان شێوەش کاریکاتە سەر ئاوی لەشی مرۆڤ .[3]

---

١- أحمد.

٢- قورئان نۆن لاین. یو ئێس (وتاری دکتۆر صلاح أحمد حسین، مامۆستای زانکۆی اسیوط لە میسر).

٣- سایتی إسلام زید..

## یەکەم: زانای گەورەی فەڕەنسی کۆستۆ:

نزیکەی سی ساڵ لەتەمەنی لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر دەریاکان و پاش ئەوەی دەریای سوورو دەریای عەرەبیشی دیراسەکردو گەیشتە (باب المندب) دۆزینەوە گرنگەکەی ڕاگەیاند، کە دەڵێت: کە دوودەریا بەیەك دەگەن تێکەڵ نابن و نێوەندێك لە نێوانیاندا دروست دەبێت، هەروەك چۆن هەردوو دەریاکە لە ڕێژەی خوێ و جۆری ماسی و جۆری ڕووەکدا جیاوازن لە یەکتری بەهەمان شێوەش ئەو نێوەندە لە هەموو شتێکدا جیاوازە لە هەردووکیان.. هەروەها بەیەکگەیشتنی ڕووبارودەریاش وایەچونکە تێکەڵنابن وچرپیان جیاوازە و کەسیان ناتوانن ئەوی تر نەهێڵن. ئەو شەوەی کە ئەوەی ڕاگەیاند موسوڵمانێك کە خەڵکی باکووری ئەفریقیا بوو، لەگەڵ ناوبراودا لە کەشتیەکەدا ئیشی دەکرد، چووە لای کۆستۆو دەست خۆشی و پیرۆزبایی دۆزینەوەکەی لێکردوو، ئەوئایەتانەشی پیشاندا کە لە قورئاندا ئاماژە بەو ڕاستیانە دەکات، کە دەفەرموێت: ﴿أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ النمل: ٦١ ﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ﴾ الرحمن: ١٩ - ٢٠ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا﴾ الفرقان: ٥٣

کاتێك ئەو زانایە مانای ئینگلیزی ئەو ئایەتانەی خوێندەوە، بۆی دەرکەوت کە بەڕاستی قورئان کەلامی خوایەو محمدیش پێغەمبەری خوایەو حەزی کرد لە ئیسلام شارەزابێ، بۆیە داوای کرد کە کەسێکی بۆ بنێرن کە شارەزای بکات لە ئیسلام، دکتۆر عبداللە موسڵیحیش کەسێکی شارەزای نارد بۆ لای کە زۆر چاك باسی ئیسلامی بۆ کردو وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە.. کۆستۆ پێش ئەوەی بمرێت موسوڵمانبوو ویستی ڕایگەیەنێ بەدنیادا، دەسەڵاتدرانی فەڕەنساو ئەودەزگا زانستیانەی کاری لەگەڵ دەکردن نەیانهێشت و، وتیان: بۆ خۆت موسوڵمان دەبیت ببە بەڵام بۆت نیە ئیعلانی بکەیت؟؟!! (دیارە ئەوان بە ملیۆنەها دۆلاریان خەرج کردووە تا گەیشتوونەتە ئەو ڕاستیە چۆن دەیەڵن هەروا بە ئاسانی ببێت بە دەستکەوت بۆ موسوڵمانان..).

## دووەم: دکتۆر عەلی بلوسین :

گۆڤاری المجتمع چاوپێکەوتنی کرد لەگەڵ بانگخوازی ڕووسی علی بلوسین داو ناوبراو لە بارەی موسوڵمانبوونیەوە وتی: من دکتۆرام هەیە لە فەلسەفەی شیوعیەتدا ودبلۆمم هەیە لە دیراساتی ئینسانیدا، لەگەڵ ئەوەدا کەچەند ساڵ مامۆستای فەلسەفە بووم لە زەمانی یەکێتی سۆڤیەتدا، کەچی دڵنیانەبووم لە فیکری مارکسی وگومانی زۆرم هەبوو، دەمووت هەرگیز ناگونجێ دنیا لە خۆیەوە بووبێ وپەروەردگارێکی گەورە نەبێت بیبات بەڕێوە ؟؟ بۆیە بۆ چەند ساڵێك بووم بە گاورو بوومە قەشەیەکی گەورە لەکەنیسەی (الارثوذکسی)ی ڕۆژهەڵات و دواتر کەنیسە هەڵیبژاردم بۆ پەرلەمان وبوومە سەرۆکی لیژنەی ئاینەکان لە پەرلەمانی ڕووسیداو یاسای ئازادی بیروباوەڕم لە پەرلەماندا دەرکردو دوای چوار ساڵەکەش گەڕامەوە سەر قەشەیەتیەکەم لە کەنیسە و شانزە ساڵ بە دڵسۆزی لەو بوارەدا کارم کرد..

من زۆر بیرم دەکردەوە لە یەکخواناسی و بەبێ ئەوەی ئیسلامیش ببیستم بڕوام بە یەکخوایی هێنا و خۆم بە یەکتاپەرست دەزانی.. تارۆژێك تەلەفیزیۆنی ڕووسی بەرنامەیەکی لە بارەی جەژنی قوربانەوە پێشکەشکرد و باسی‌ئیسلامیان کرد کە دینی یەکتاپەرستییە، بەرنامەکە زۆر کاری تێکردم و دڵم ئاوی خواردەوە، لەوەوە بڕیارم دا موسوڵمان ببم و، وتارێکم نووسی‌و لە گۆڤارێکدا بڵاوم کردەوەو موسوڵمانبوونی خۆمم ڕاگەیاند، کەئەمەش حەوت ساڵ لەمەوبەر بوو..

ئەم وتارە هەرایەکی گەورەی نایەوە چونکە من کەسێکی ناودارو دیاری کەنیسە بووم زۆر لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کردم و تەنانەت کەناڵێکی تەلەفزیۆنی داوای لێکردم بۆ دووساڵ بەرنامەیەك پێشکەش بکەم. کەنیسە زۆر زویر بوو، تا گەیشتە ڕادەیەك کە داوایان لە کەس و کارو دۆستانم کرد دەنگ دابڕن لێم، نەك هەرخۆم بەڵکو لەعنەتیان لە حەوت نەوەشم کرد!!

بوومە بانگخواز هەرچەند کەمیشم دەزانی لە بارەی ئیسلامەوە، وردە وردە بەدەم بانگەوازکردنەوە بە هۆی بانگخوازانەوە فێری ئیسلام بووم بە چاکی و یەکەم پەڕاوم نووسی بەناوی (ڕێگای ڕاست بۆ لای خوا) کە تیایا سەرگوزەشتەی موسوڵمابوونەکەم باسکرد و سەد هەزار نووسخەی لێ چاپکراو بە هەزاران ڕووسی موسوڵمان بوون.. پەڕاوی دووەمیشم (مقدمات الشرك) بوو کەباسی فەلسەفەی تەوحیدم کردو شەریك بۆ خوا پەیداکردنم هەڵوەشاند، پەڕاوی

سێیەمیشم (الانجيل بعيون مسلم جديد) بوو کەزۆر بە ئەدەبەوە موناقەشەی ئینجیل دەکات و ناتەواویەکانی دەخاتەڕوو. چەندەها وتاریشم بڵاوکردۆتەوە کە لە سایەی خواوە سوودی گەیاندووە .

من دەمەوێ لەگەڵ عەقڵی ڕوسیدا بدوێم و، ڕوانینی ئیسلامیان پێبگەیەنم لە بارەی ژیان و مێژوو فەلسەفەوە، هەروەها دەمەوێ تەفسیرێکی جوان بۆ قورئان بکەین بەزمانی ڕووسی و دەمەوێ ڕاو بۆچوونی ئەو زانا ڕووسیانەی کە بەویژدان بوون و دیفاعیان کردووە لە ئیسلام بخەمە بەر باس و لێکۆڵینەوە، وەك لیو تولستوی و دوستویفسکی..

ئێستا بێجگە لەوەی ڕاوێژکاری شاینی موفتی ڕووسیاو سەرۆکی یەکێتی ڕۆژنامەنووسانی موسوڵمانی ڕووسیام، سەرۆکی کۆمەڵەی (ڕێگای ڕاستی)م لە مۆسکۆ کە تایبەتە بە بانگەوازکردن و گرنگی دان بە موسوڵمانە تازەکان و پێگەشمان هەیە لە سەر ئینتەرنێت .شایانی باسە تەنها لە مۆسکۆدا زیاتر لە دەهەزار نۆ موسوڵمان هەیە کەزۆریان پزیشك و ئەندازیارو مامۆستای زانکۆن.[1]

## سێیەم: ئەکتەری میسری حنان تورك ..

ماوەیەکی زۆرە لە خەیاڵی ئیلتیزام و خۆداپۆشیندایەو، ئامادەی دەرس و دەوری خوشکانی موسوڵمان دەبوو، پێنج جار عەمرەی کردووەو پاریش حەجی ماڵی خوای کرد، کە لە بەرازیل گەڕایەوە لەگەڵ علاء ولی الدين ی ئەکتەری هاوەڵیدا کە پێکەوە چەند لەقتەیەکی فلیمێکیان تۆمارکرد، مردنی علاء دوای دووڕۆژ لە گەڕانەوەیان بووە هاندەری حنان کە خۆی داپۆشێ لە مانگی ( ٥ ی ٢٠٠٦)دا.. ئەم هەواڵە بواری هونەری هەژاندو حنان بڕیاری دا کە ئەو دەورەی دەیبینێ لە زنجیرەی (اولاد الشوارع)دا بە داپۆشراوی دەیبینێ، تەلەفزیۆنی دوبەیش کە بەرهەمهێنەری ئەو کارە هونەریەن بەم داوایەی حنان قایل بوون..[2]

---

١- گۆڤاری المجتمع ژ ١٧٠١- ٢٠٠٦/٥/١٣..

٢- سایتی: پانیت

## چوارەم: ئەکتەری میسری عفاف شوعەیب

ناوبراودەڵێت: من پەیمانگای باڵای هونەری شانۆم ساڵی (١٩٧٣) تەواو کردوەو، لە خێزانێکی خواناسدا گەورە بووم و باوکم ئەفسەرێکی ئەندازیار بوو، نزیکەی (٢٥) فلیم و (٧٥) موسەلسەلم پێشکەش کردووەو چەندەها خەڵاتی هونەریم وەرگرتووە .

سێ ڕۆژ پێش بوومەلەرزەکەی دووشەممەی (١٢ ئوکتوبەری ساڵی ١٩٩٢) بڕیارمداخۆم داپۆشم بۆ خواو، زیاتر پابەند بم بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە، ئەو ڕۆژە لەدایك بوونی دووەمم بوو، کەڕێی ڕاستم تیادۆزیەوەو خۆم تیاناسیوخۆم دۆزیەوە .بوومەلەرزەکەش زیاتر هەست وهۆشی هەژاندو بووە مایەی دامەزراوی زیاتر بۆم، کە ئەوەش هەمووی فەزڵ و میهرەبانی خوایە بەرامبەر من: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴾ النور: ٢١.[١]

## پێنجەم: گۆرانیبێژی میللی میسری دکتۆرە لیلی نظمی

پاش ئەوەی کە بە چل ساڵ ناوبانگێکی باشی دەرکردو سەدان گۆرانی تۆمارکرد و دکتۆرای هێنا لە مێژووی پەرەسەندنی گۆرانی میللیدا، بڕیاری دا خۆی داپۆشێ و واز لەگۆرانی وتن بێنێت.. ناوبراو دەڵێت :من پرس و ڕام بەکەس نەکرد لەم بڕیارەمدا، بە قەناعەتی تەواوەوە پاش دیراسەو لێکۆڵینەوەی تەواوخۆم داپۆشی و زۆر بەختەوەر ودڵخۆشم، چونکە بەڕاستی چی لەوە گرنگترە کەمرۆڤ لەپەروەردگاری نزیك ببێتەوە و بڵێ: (سمعناوأطعنا).. . بەڕاستی خۆداپۆشین فەرزێکی دیارو ئاشکرایە و ئایەتەکان لەو بارەیەوە ئەوەندە ڕوونە پێویستی بە لێکدانەوە نیە،

﴿ وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوۡ ءَابَآئِهِنَّ أَوۡ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآئِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ

---

١- گۆڤاری المجتمع ژ ١٧٠٢ /٢٠٠٦/٥/٣١

يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ النور: ٣١ .

ئەم ئايەتانە ئەوەندە ڕوونن، هەرئەوەندەی دەوێ مرۆڤ یەکسەر پابەند بێت پێوەی، بەلاّم بەداخەوە شەیتانەکانی ئینس و جین ئایەڵن بە ئاسانی کەسیان لەدەست دەرچێت و بەهەزاران بەربەست و ئیغراتات لەبەردەمیا دادەنێن..

ئەوەش کە کەس ناتوانێت نکوڵی لێبکات ئەوەیە کە هەموو دەبێت بمرین ئەمرۆ بێت یان سبەی، ئەوەش کە لە پاش مرۆڤ دەمێنێتەوە تەنها کاروکردەوەی چاکە ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ الجمعة: ٨.

بەڕاستی پیلان و نەخشەی دوژمنانی ئیسلام زۆربەی بریتی‌یە لە ئیش کردن لەسەر ئافرەتی موسوڵمان بۆیە دەبێت زۆر ئاگای لە خۆی بێت، چونکە دەیانەوێت بیکەن بەلاشەیەکی بێ عەقڵ یان عاقڵێکی بێ ڕێز..

سوپاس بۆ خوا لەگەڵ ئەو هەموو پیلانە خراپەشدا، ڕابوونێکی جوان و ژیرانە هەیە لە ناو ئافرەتانداو دەگەڕێنەوە بۆ سەر بەرنامەی ئیسلام. لە هەموو لایەکیشەوە بەڵگەی ڕاستی ئەمە دەبینین، بۆیە دوژمنان ئاوا بێتاقەت و شپرزن و هەموو تواناکانیان خستۆتە کار.. سوپاس بۆ خوا ئێستاهەزارقات خۆشتر دەژیم و ئاسوودەترم لە چاو ڕابردوودا و ئێستا زیاتر دەتوانم هەقی ماڵ و مناڵ ومێردەکەم بدەم لە سایەی خواوە مناڵەکانیشم سەرکەوتوون لە ژیانداو کچەکەم یەکەمی زانکۆی ئەمریکی وکوڕەکەشم ئێستاپاڵەوانی جیهانە لەکاراتیدا.[1]

**شەشەم: تیری هنری:** هەواڵەکان لە لەندەن باس لە موسوڵمانبوونی یاریزانی هەڵبژاردەی فەڕەنسی و یانەی ئەرسنالی ئینگلیزی(تیری هینری) دەکەن، لەزۆر کەناڵی ڕاگەیاندندا بەبێ قسە لەسەرکردن وێنەی ناوبراو بلاوکرایەوە کە لە گۆڕەپانی یاریدا سوژدەی بردووە..

١- المجتمع ٢٠٠٦/٦/٥.

شایانی باسە ناوبراو هاوەڵی هێرشبەری فەرەنسی ئەنیلکایە کە پێشتر موسوڵمان بووەو کاریگەری زۆری لەسەرێتی، دەڵێن بەیەکەوە چوون بۆ عومرە..[1]

ڕۆژنامەی فەرەنسی (لاکسبریس) بڵاوی کردەوە کە ژمارەی ئەوانەی موسوڵماندەبن ڕوولەزیادیە لە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵدا،ڕۆژنامەکە باسی کریستۆف دەکات کەتەمەنی نۆزدە ساڵەو بە هۆی هاوڕێیەکیەوە سەردانی مزگەوتی کرد لە ساڵی (٢٠٠١) داو، ئەمەش بووە هۆی موسوڵمان بوونی خۆی و (صابرینا)ی خوشکی..

لەڕاپۆرتێکی وەزارەتی ناوخۆی فەرەنسی دا هاتووە کە ڕۆژانە دەیان فەرەنسی موسوڵمان دەبن. (ماری)یش کچی پیاوێکی کۆمۆنیستەودوای تەواو بوونی نوێژیمزگەوتی (لیون) لە بەردەم ئیمامی مزگەوتەکەدا شایەتمانی هێناو بوو بە موسوڵمان. ماری دەڵێت: ئێمە ڕەخنەمان لە ئیسلام دەگرت کە دژی ئافرەتانە، بەڵام دوایی بۆمان دەرکەوت کەوانیەو ئیسلام زیاتر لە هەموو ئایینەکان ڕێزی گرتووین، قورئان جەختی کردۆتە سەر یەکسانی لە نێوان پیاووئافرەتدا لە ماف و ئەرکدا. کە بەداخەوە ئافرەتان ئەمڕۆ دەچەوسێنرێنەوە لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا.[2]

## حەوتەم: باڵاپۆشی لەزانکۆکاندا:

لەگەڵ ئەو هەموو شوبهات و پەڕاوەی دژی ئیسلام بڵاودەکرێتەوە، لەگەڵ ئەو هەمووهێرشەی دەکرێتە سەرباڵاپۆشی لە کەناڵە جیاجیاکانەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ئاسانکاریەی بۆ کەسانی سەر بە لایەنەکان دەکرێت، هەواڵەکان دەڵێن ئەمساڵ، چل کیژی قوتابی لەزانکۆی سلێمانی و بیست و پێنجیش لەزانکۆی سەلاحەدین جلی باڵاپۆشیان لەبەرکردووە. ئەو بەڕێزانە هەرچەند لەلایەن کەسوکارو تەنانەت هەندێ لە مامۆستاکانیانەوە فشاریان خراوەتە سەر سوورن لەسەر پابەندبوونیان بە فەرمانی خواوە..

١- سایتی یەکگرتوو.

٢-سایتی: شرقیة نون لاین.

**هەشتەم: صەنداى تايمز وتارێكى نيكولاس هيلين و كريستوفەر مورجان ى بڵاوكردۆتەوە**، كە دەڵێن: چوارده هەزار بەريتانى سووروسپى موسوڵمان بوون، كە زۆربەيان لە كەسايەتيەكانى كۆمەڵگەن، وەك مامۆستاى زانكۆو خاوەن زەوىو زارەكان وناودارەكان، زۆربەى ئەوانەش پەڕاوى (الاسلام وقدر الانسان)ى تشالز لو جاى نيتۆن كارى تێكردوون، كە ناوبراو لە پەڕاوەكەيدا دەڵێت (بەڕاستى مەسيحيەتى ئەمڕۆ تەنازولاتى گەورەى كرد لەبەردەم هێرشى شارستانێتى سەردەمداو، زۆربەى گاورەكان لەو بڕوايەدان كە مەسيحيەت ئاسوودەيى ڕۆحيان پێنابەخشێ، لەكاتێكدا ئيسلام ئەو تنازولاتەى نەكردووە)..[1]

**نۆيەم: خەڵكى ئەسڵى ئوستوراليا چەوساوەترين چينن لەو وڵاتەدا**، بۆيە زۆريان بێكارەن و ئالوودەى مەى و مادە بێهۆشكەرەكان دەبن و سەرەنجامى ئەوانەش دووچارى بەندیخانەو ناڕەحەتى زۆر دەبن. ئامارەكان وادەردەخەن كە ژمارەيەكى زۆر لەوانە ڕوويان كردۆتە ئيسلام و بە قەناعەتەوە موسوڵمان بوون ودەڵێن: بەڕاستى ئيسلام هێزێكى دەروونى گەورەمان دەداتێ بەرامبەر ئەو هەموو ناڕەحەتى و چەوسانەوەيەى كە تووشى دەبين.شايانى باسە سەدو پەنجاساڵێك دەبێت ئوستوراليەكان ئيسلاميان ناسيوە،بەهۆى قافڵەى ئەو ئەفغانيانەى كە چوونەتە ئەو وڵاتە.[2]

**دەيەم: ڕۆژنامەى (نيويورك تايمز)ى ئەمريكى لەوتارێكيدا دەڵێت:** بەڕاستى ئيسلام خێراترين ئاينە لە بڵاوبوونەوەدا لە ئەفريقيا، ڕۆژنامەنووس (مارك لاسى) لە وتارێكيدا كە لەو ڕۆژنامەيەدا بڵاوى كردۆتەوە دەڵێت:بەڕاستى ڕەفتارى خراپى هەندێ لە قەشەكان و دەورى خراپيان لە قەتڵ و عامەكەى سڵاڵى نەوەدەكاندا كە هەشت سەدهەزار كەسى تيابوونە قوربانى، واىكرد هەزاران ڕواندىگاور ڕووبكەنە ئيسلام وبەردەوام هات و چۆى مزگەوت بكەن.

ئەو ڕۆژنامەنووسە چاوپێكەوتنى كرد لەگەڵ هەندێ لەوانەدا كە موسوڵمان بوون، (يعقوب جومعە نيزيا) ى بيست و يەك ساڵ كە لە ساڵى (١٩٩٦)دا موسوڵمان بووە دەڵێت

---

١- سايتى برسوميات.

٢- سايتى: برسوميات.

(ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی داماو کوژران لە کەنیسەکەمانداو، بەداخەوە قەشەکەمان هاوکاری بکوژانیان کرد، بۆیە منیش دڵم گۆڕدراو گەڕام بەدوای بەدیلدا)..

لە ڕواندا (٥٠٠) مزگەوت هەیەو موسوڵمانان یارمەتی هۆتۆیان نەدا دژی توتسیەکان هەرچەند قەومی خۆشیان بوون و، نەیان هێشت نەموسوڵمان ونەغەیرە موسوڵمانیش لە ناوچەکانی ئەواندا بکوژرێن لە توتسی و هەرچی بچوایەتە لایان دەیانپاراست لەساڵی (١٩٩٤) دا..

موسوڵمانان زۆر شارستانیانە مامەڵەیان کرد، (رمضان روغیما) سکرتێری تەنفیزی رابیتەی موسوڵمانانی ڕواندا دەڵێت:(یەك كەس نەكوژرا لە مزگەوتداو، ڕێمان گرت لە چەكدارەكان و زۆرمان ڕزگاركرد لەوانە كەموسوڵمانیش نین).[1]

**یانزەیەم: دەرهێنەرێکی سینەمایی فەڕەنسی ئیسلامبوونی خۆی ئاشکرا ئەکات:** (کریستیان ماری بیل) دەرهێنەری بەناوبانگی سینەمایی فەڕەنسی نەیدەزانی کەلەپاش مسوڵمان بوونی لەوڵاتەکەی ناچارئەکرێت کە بەجێی بهێڵێت و ڕوویکاتە سوریاو لەوێ خێزان پێکەوە بنێت بەتایبەتیش کاتێك کەوڵاتەکەی ئەو پەڕی بانگەشە بۆ ئازادی و یەکسانی ڕەگەز و بیروباوەڕو مافی مرۆڤ ئەکات، کریستیانی تەمەن (٥٦) ساڵ کەلەپاش مسوڵمان بوونەکەی ناوی خۆی گۆڕی بۆ (عیسا أبوالهدی) دەڵێت کاتێك کەلەپایتەختی ڕۆمانیا بوخارست بووم تووشی چەندین تەنگ پێهەڵچنین بووم کە پێش ٤ ساڵ بەهۆی مسوڵمان بوونەوە چووبووم.

هەروەها دەڵێت لەپاش گەڕانەوەشم بۆ وڵاتەکەی خۆم تووشی هەمان گیروگرفت بوومەوە چوونکە ئەوانەی کەلەگەڵم کاریان دەکرد نەیان ئەتوانی کەلەبڕیارەکەی تێبگەن و قبوڵی بکەن بەتایبەتیش کەئەو لەپاش (١١ ی سێبتێمبەری ٢٠٠١) وە ئەم بڕیارەم دابوو کەلەگەڵما زۆرێك لەمسوڵمانانی ڕۆژئاوا توشی دەردەسەری و گومان بووین .

هەروەها أبو الهدی زیاتر لەسەری دەڕوات و دەڵێت من وەك دەرهێنەر و سینارست و بەرهەمهێنەر کارم کردووە لەبواری سینەماداو نزیکەی (٧٠) بۆ (٨٠) فیلمم هەیە لەنێویشیاندا دووفیلمی بەناوبانگن کەلەگەڵ هاوڕێیکۆچکردووم (ئەنتۆنی کوین) ئەنجامم داوە،

---

١- گۆڤاری المجتمع ٢٠٠٦/٦/٣

من ژیانێکی دەوڵەمەندانەم هەبووە و ژیانم زیاتر پڕ بووە لەگەشت و گەڕان لەنێوان لوس ئەنجلوس و نیۆرك وپاریس و ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا بەڵام ئەمانە هیچیان دەروون و ڕۆحمیان ئارام نەکرد تا نەبووم بەئیسلام.

چیرۆکی مسوڵمان بوونی ئەم دەرهێنەرە فەرەنسیە دەگەڕێتەوە بۆ پێش چوار ساڵ کاتێك لە بوخارستی پایتەختی ڕۆمانیا جەڵتەی دڵ لێی دەدات و پلەی گەرمای لەشی بەرز دەبێتەوە و بینایشی بۆ چەند چرکەیەك لەدەست ئەدات و لەم کاتەدا تەنها هاوڕێیەکی دەبێت کە بەئەسڵ سەر بەهۆزەکانی جەزائیربووە داوام لێکرد کەبمبات بۆ مزگەوتێك لە بوخارست و ئیتر لەوێ هەستم بە ئارامی ڕۆحم کرد تیایدا بەڵام توشی چەندین زۆر لێکردن بوومەوە لەلایەن ئەوانەی کەکارم لەگەڵدانەکردم و بۆ یەئەوێم بەجێهێشت و ڕووم کردەوە پاریس و چوونکە ئەوان ئەیان ئەتوانی قبوڵی ئەوە بکەن کەمن بۆچی ئاینەکەم گۆڕیوە و منیش ئەم ئەتوانی تێیان بگەیەنم .

لەفەرەنساش ئەو زۆر و تەنگ پێهەڵچنینەی کەبەرامبەر بەسوڵمانان ئەکرا لە دوای ١١ ی سێپتێمبەر زۆر زیادی کردبوو بەڵام من هەر مامەوە و خۆم گرت و لەمزگەوتدا زۆر ئەمامەوە و قورئانم ئەخوێند و نوێژم ئەکرد و هەروەها وانەشم لەبارەی ئیسلامەوە ئەوتەوە، ئیتر لەچاوجاراندا تەواو هەڵس وکەو تم گۆڕابوو بەهیچ جۆرێك شارەزووم لە خواردنی گۆشتی بەراز و مشروبات و هەروەها زینا کردن ئەما. بەڵام زۆر لێکردنەکەی بەڕادەیك زیادی کرد کەئیتر لەتوانایدا ئەماو بڕیاری دا کەفەرەنسا بەجێبهێڵێت.

بۆیە پەیوەندی ئەکات بەکۆمپانیایەکی فڕۆکەوانی سوری یەوە تا بیگەیەنێتە سوریا بەڵام ئەوان پێی ئەڵێن کە پێویستە فیزەی ئەوێت پێ بێت و بۆیە ئەمیش پەیوەندی ئەکات بە سەفارەتی سوریا لەفەرەنسا و ئەوانیش کار ئاسانی بۆ ئەکەن و فیزەی شەش مانگی ئەدەنێ هەرچۆن بێت وەك خۆی باسی ئەکات دەڵێت : (پاش ئەوەی کەگەیشتمە سوریا خوای گەورە کاری بۆ ئاسان کردم و بە هۆی شۆفێرێکی تەکسیەوە توانیم کە ئوتێلێکی پاك و هەرزان بدۆزمەوە و لێرەشەوە ڕۆژانە بەهۆی سەردانی بەردەوامم بۆ مزگەوتی (أبو النور) توانیم تێکەڵ بە خەڵکی سوریا ببم)، وەپاش جێگیر بوونی لەسوریا بۆ ماوەی دووساڵ خێزانی پێکەوەنا لەگەڵ ئافرەتێکی سوری مسوڵمان لە بنەماڵەیەکی دیار و منداڵێکیشیان بوو ناوی نا(نور)، و

دەڵێت: خێزانەکەم حیجابە و داپۆشراوە و باوکیشی پیاوێکی لەخواترسەو هەموو بەیانیەك لە مزگەوت نوێژنەکات.

لەبارەی کاری ئێستایەوە دەڵێت: کەناڵی فجر ڕای سپاردووم کە زنجیرەیەکی (٣٠) ئەڵقەیی بەڵگەنامەیی بۆ بەرهەم بهێنم و هەروەها چەندین کۆمپانیای تریش بۆ بەرهەمهێنانی وێنەی جوڵاو ڕایان سپاردووم و هەروەها لەم دواییانە شدا سیناریۆیەکم نووسیوە لەسەر پەیوەندیەکی سۆزداری نێوان ڕۆژهەڵاتیەکی مەسیحی و ئافرەتێکی عەرەبی مسوڵمان و هیواشی وایە کە پاش ساڵێك ئەم بەرهەمەی دەربهێنێت بۆ زیاتر ناساندنی ئیسلام و پاکی ڕێنماییەکانیەوە لەڕێگای ئەم پەیوەندی یەوە، هەروەها وتی کەنازانم لە دیمەشق دەمێنمەوە یان ڕوودەکەمە یەکێك لەولاتەکانی کەنداو یان هەر شوێنێکی تر بۆ ئەنجامدانیکارەکەیەوە و لەکۆتایشدا وتی کەئەمە پەیوەندی بە ویستی خوای گەورەوە هەیە.[1]

## دوانزەیەم: زانای جیۆلۆجیای ئەلمانی ئەلفرێد کرونیر

زاناو پرۆفیسۆر ئەلفرێد کرونیر یەکێکە لە زانا گەورە و بەناوبانگەکانی بواری جیۆلۆجیا لەجیهاندا.. لەکۆلێجی زانستی زەوی لەزانکۆی مەلیك عبدالعزیز ئامادەبوو.. منیش لێی نزیز بوومەوەو بەفرسەتم زانی تاچەند پرسیارێکی ئاراستە بکەم کە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، بەهەرحاڵ پێم وت: ئایا ئێوە وەك زانایان هیچ هیچ ڕاستیەکتان لایە سەبارەت بەوەی کە ناوچەی دوورگەی عەرەبی بەم هەموو بیابان و وشکیەوە کە دەیبینن، باخ و باخات و ڕەزو ڕووبار بوویێت، وتی: بەڵێ ئەمە بابەتێکی زانراوە لامان و یەکێکە لە ڕاستیە زانستی یەکان و زانایانی جیۆلۆجیا ئەیزانن.. چوونکە ئەگەر تۆ ئێستا چاڵێك لە هەرجێگایەك لەجێگاکانی ئەم ناوچەیەدا هەڵبکەنیت ئەوا بۆت دەردەکەوێت کەئەم ناوچەیە لەپێشتردا ئاوەدان بووە و باخ و باخاتی تیادا بووە، سەرباری ئەمانەش بەڵگە یەکجار زۆرە لەو بارەیەوە بۆ نمونە گوندی فاو کەلەژێر بیابانی (ربع الخالي) دۆزراوەتەوە.. پێم وت باشە هیچ بەڵگەیەکت بەدوەستەوەیە کەئەم ناوچەیە سەرلەنوێ بگەڕێتەوە بۆ باخ و باخات و ڕووبار؟

وتی: بەڵێ ئەمەش ڕستیەکە جێگیرەو ئێمەی جیۆلۆجی ناسان ئەیزانین و وەبەردەوامیش ئەیپێوین و حسابی بۆ ئەکەین و ئەوکاتەش بە بۆچوونی ئێمە هێندە دوور نیە، چوونکە ئێمە

---

١- سایتی: هدی الاسلام

دراسەی مێژووی زەوی مان کردووە و بۆمان دەرکەوتووە کەئەم مێژووە دابەش ئەبێت بەسەر چەند قۆناغێکدا لەوانە قۆناغێك تێپەڕیوەکە بڕێك لەناو بەستوویەتی بووە بە بەستەڵەك و بەمەش بەچاخی بەستەڵەك ناودەبرێت و بەشێك لەم بەستەڵەکە لە جەمسەری باکور ماوەتەوە و بەستوویەتی و پاشان ئەم مێژووە دووبارە ئەبێتەوە ئەم جارە ئەم سەهۆڵ بەندی یە بەرەو باشوور ئەکشێت و لە چوارچێوەی ئەم گۆڕانکاری یەش کە لە ناو هەوادا ڕوودەدات لە سەر زەوی ناوچەی دوورگەی عەرەبیش ئەگرێتەوە و کەش و ناوهەوا سارد ئەبێت و ئەم ناوچەیەش یەکێك ئەبێت لە و ناوچانەی جیهان کەزۆرترین بارانی لێ ئەبارێت و ئەبێت بەڕووبار. کەبە بۆچوونی من واخەریکە سەرەتاکانی دەردەکەوێت. پێم ووت ئەتوانی جەختمان لەسە رئەمە بۆ بکەیتەوە.

وتی: بەڵێ ئەمە ڕاستی یەکە گومانی تیادا نی‌یە. پێم ووت: کەواتە گوێ بگرە باشە کێ محمدی فێری ئەمە کرد و ئەمەی پێڕاگەیاند کەئەمانەی تۆ ووتت هەمووی لەحەدیسی پێغەمبەردا هاتووە ﷺ.کەفەرموویەتی (لاتقوم الساعة حتى تعـود الارض العـرب مروجـا وأنهارا) واتە: ڕۆژی دوایی نایەت هەتا زەوی عەرەبی ئەگەڕێتەوە بۆ باخ و بێستان و ڕووبار؟! بیری کردەوە و پاشان ووتی لە ڕۆمانەکانەوە فێری بووە. وتم ئەی باشە کێ پێی وتووە کە ئەم ناوچەیە سەر لەنوێ ئەگەڕێتەوە بۆ باخ و باخات و ڕووبار؟! ئەم جارەش قوڵتر بیری کردەوە و پاشان وتی بەڕاستی ئەمە ئەبێت لەئاسمانەوە بێت. بۆ یەپێم وت دەی باشە بینووسە بۆمان بۆ یەبەخەتی خۆی نووسی: (بەڕاستی ئەو ڕاستیە زانستیانەی کە لەقورئان و لە فەرموودا پیرۆزەکانی پێغەمبەری ئیسلامدا هەیە، کەهیچ کەسێك نەیتوانیوە پێشتر دەرکی پێبکات لەم کۆتایی یەدا نەبێت و ئەویش بەڕێگای زانستی نوێ دۆزراونەتەوە کەئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر محمد ﷺ خۆی نەگەیشتووە بەم زانستە جگە لەوە نەبێت کە بە وەحی لەلایەن پەروەردگارەوە بۆی هاتووە).

لێرەدە زندانی کەئەم باسەمان بۆ دەگەڕێتەوە دەڵێت: بەڕێزان ئەمە هەڵوێستی بێباوەڕێکی گەورەی ئەلمانی بوو کەبەڕاستی تەواو هەستمی جۆشدا لەبەرامبەر ڕۆڵەکانی جیهانی ئیسلامیدا لەبەرامبەر ئاینەکەیان، وەمن وائەبینم کە سەرکردایەتی زانا گەورەکانی جیهان ئەگەر ڕاستیەکانیان پێبلێین نەك هەر مسولمان ئەبن بەڵکو دەست ئەکەن بەبلاو کردنەوەی ڕاستیەکان و لەکتێبەکانیاندا ئەینووسنەوە بەبێ منەتی بۆیە بەخۆمم وت: ئەگەربێت

و كارێكی جدی بكرێت لەناوڕۆڵەكانی جیهانی ئیسلامی و لەناو زانكۆكانیدا ئەو كات تەنها چەند سالێكی كەم تێپەڕناكات دەبینین كەزۆر بەی زانا گەورەكانی جیهان مسوڵمان ئەبن. واللە ی لەنێوانی من و ئەم زانا زۆر گەورەیەدا تەنها دووسەعات و نیو تێپەڕی تائەم هەموو شتانەی وت، بەڕاستی ئەوەی كەبەدەستی ئێمەوەیە ڕاستەو دووره لەدرۆ بۆ یە پێویستمان تەنها بە گەڕانێك هەیە بەنێو زانایانی گەورەی جیهانی، ئەمڕۆهەموو شتەكان بۆ زانست دەگەڕێتەوە كەچی گەڕانەوەی زانست بۆ قورئان لەسەرەتادایە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ فصلت: ٥٣

پوختەیەك لەبارەی ئەلفرێد كرونیر: یەكێكە لەهەرەگەورەترین زانا بەناوبانگەكانی جیهان لەبواری جیۆلۆجیادا، مامۆستای زانستی چینەكانی زەوی و سەرۆكی بەشی زانستی چینەكانی زەوی یە لەپەیمانگای جوسینسیس، لەزانكۆی یوهانس گۆتنبیرگ و میستر و ئەڵمانیا.

یەكێكی تر لەو وتە بەناوبانگەكانی (محمد ئەمەی لە كوێوە هێناوە.... بەڕاستی من لەو باوەڕەدام كەئەمە لەشێوەی مستحیلدایە كە ئەم بەم بابەتانیزانیبێت لەوانەش بنەڕەتی هاوبەشی كەون، لەبەرئەوەی زانایان ئەمەیان تەنها چەند ساڵێكی كەمە ئەمەیان دۆزیوەتەوە،ئەو یش بەڕێگای زانستی و تەكنۆلۆجیای پێشكەوتوو).[1]

## سیانزەیەم: مامۆستایەكی زانكۆی ڕووسی د.ئالا ئۆلینیكۆڤا

من ڕووسیم لەشاری (لینین گراد) لەدایك بووم ئەو شارەی كەبەناوی لینین ناونراوە ئەو شیوعیەی كە بەهەزاران مسوڵمانی كوشت لە كۆمارەكانی یەكێتی سۆڤیەتی جاران .

لەخێزانێكی فەقیردا گەورەبووم و خوێندنم تەوو كرد و فێربووم، كە جگە لە ڕاوەماسی كەپیشەی باوكم بوو لەكۆنەوە هیچی ترمان نەبوو.

لەمۆسكۆ زانستی پزیشكیم خوێند و دەرچووم، و پاشان ماجستێرو دكتۆراشم تەواوكرد، دوای ئەمەش دەرسم لەزانكۆكانی مۆسكۆ و كییف و لینین گراد وتەوە .

---

١- سایتی: هدى الإسلام .

ژیانم لەژێر سایەی شیوعیەتدا زۆر خراپ بوو، هەرگیز لەگەڵ فیترەتی مرۆڤ دا یەکی نەدەگرتەوە کە بەئاشتی و ئازادی و ئەمن وخۆشی بژی.

من لەناوەوە سەیری ئەم بابەتەم نەکردو نەم نەتوانی کەقسەبکەم، وەك خەڵکی تر، ئەگەرنا ئەوا تووشی زیندانی و ئازاردان و نەفی کردن ئەبوویتەوە بۆ سیبریا.

ژیانمان بەڕاستی جەهەنەمێکی داگیرکراو بوو، پڕبوو لەستەم و کۆیلایەتی و زۆر لێکردن و ناچارکردن بە ژیانێك کەهەرگیز لەگەڵ فیترەتی مرۆڤدا نەدەگونجا. تەنانەت لە پەرستشیش ڕێگریان کردین و ناچاریان دەکردین کە کوفر بکەین و هەڵسوکەوتی بێباوەڕی ببینین.

دیارە ئێمە زیاتر لەڕۆژهەڵاتیەکان لەبارەی ئیسلامەوە دەزانین ئەمەش بەچەند هۆکارێك لەگرنگترینیان نزیکیمان لە کۆمەڵگای مسوڵمانان و هەروەها لەبەر ئەوەش کەسۆڤیەت زیاتر لە (٦٠) ملیۆن مسوڵمانی تیادا دەژیا و ئەم کەسانەش لەگەڵمانا لەسەرجەم ناوەندەکانی وڵاتدا کاریان ئەکرد.

ئیسلامم ناسی لەهەندێك لەو مسوڵمانانەی کەکاریان دەکرد لەگەڵماندا، تێبینی هەڵس و کەوتی ئەو قوتابیانەشم ئەکرد کە لەوڵاتە ئیسلامیەکانی وەك سوریا و کوەیت و لیبیا و عێراق و یەمەنەوە ئەهاتن.

هەروها ئیسلامم زیاتر ناسی لەڕێگای قوتابیەکی سوری کەخەڵکی شاری حمص بوو لەسوریا ئەم زانستی پزیشکی لەزانکۆی کیف دەخوێند، ئەم کەسایەتی یە جیاواز بوو ئارەقی نەدەخواردەوە و گۆشتی بەرازی نەدەخوارد و هەروەها پەیوەندی لەگەڵ ئافرەت نەدەبەست و ئەخلاقی یەکجار بەرزبوو، تەواو دەست پاك و ڕاست گۆبوو، لە (مترلا)یەکی زۆر متوازیع دا ژیانی بەسەر ئەبرد هەموو کاتێك لەبارەیەوە ئەیووت ئەمە مترلای منە و هەروەها مزگەوتیشە. بەڕاستی ئەخلاق و هەڵس و کەوتی ئەم قوتابیە دڵنیای کردم کەئەمە ئەخلاقی ئیسلامە. پاشان ئەم قوتابیە کتێبێکی لەبارەی فێربوونی ئیسلامەوە پێشکەش کردم لەپاش باش خوێندنەوەی ئەم کتێبە زیاتر زانیاری لەسەر ئیسلام زیاد کردم و، لە ساڵی (١٩٩٢) بەشێوەیەکی کاتی وازم لە کار کردن هێناو سەفەرم کرد بۆ سوریا و لەوێ پەیوەندیم کرد بە کۆلێجی الدعوە و لەوێ ئیسلامم خوێند و پاشان لە ساڵی (١٩٩٥) دا لەوێدەرچووم.

ئیسلام ئاینێکی زۆر گەورەیە، ئەم ئاینە لەپێش هەزار ساڵەوە گەیشتۆتە وڵاتەکەمان کەچی شیوعیەت زیاتر لە حەفتا ساڵ نەیتوانی بەردەوام بێت.

بەڕاستی تێبینی برایەتی و خۆشەویستی و ئاڵ و گۆڕی ئامۆژگایم کرد لەنێوان مسوڵمانانداً، گەشانەوەی ئیسلام زیاتر لەڕەمەزاندا دەردەکەوێت ئەو مانگەی ئەو سیستەمە جوانەی ئارامگری و سۆزداری و یارمەتیدانەی کە کۆمەڵگا نامسوڵمانەکان لەدەستیان داوە لێرەدا دەیبینیت.

ئیسلام چاودێری دنیاو قیمەت ئەکات ئەمەش بابەتێکە کەلەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتی دا یەك دەگرێتەوە .

ئێستاش لەپاش بالا پۆشیمەوە هەوڵ ئەدەم ئانەتوانم تێکەڵ بەپیاوان نەبم .، ئێستاش زیاتر خەریکم بەدەرکردنی کتێبێکەوە لەبارەی ئیسلام لەڕووسیا و لێرەوە هەوڵ ئەدەم کە هەموان بەم ئاینە گەورەیە بناسێنم کەمن لەڕێگایەوە نوورم بینی .بەڕاستی ئەگەر کۆمەڵکەمان ئیسلام بەباشی بناسن و جێبەجێی بکەن ئەوا تاوان و گەندەڵی و مافیاو تلیاك و بێکاری نامێنێت.. لەبەرئەوەی ئیسلام هەرچی زیان بە مرۆڤ خۆی و دەورو بەری بگەیەنێت حەرامی کردووە، ئیسلام بریتی یە لە ڕزگاری مرۆڤایەتی و شیفادەرە بۆی لە نەخۆشی یە کانی سەردەم وەتیایدا چارەسەری سەرجەم کێشەکانی کۆمەڵگاجیاوازەکانی تیایە .

شیوعیەت تێك شکاو چووە زبڵدانی مێژووە و دەسەرباری ئەو هەموو بانگەشەو دیعایەیەی کەبۆ یان ئەکرد. تەنها ئیسلام مایەوە کەشیوعیەکان زۆر هەوڵیاندا لەناوی بەرن بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕۆڵەکەی زیاتر بوو وەئەمڕۆ لەڕووسیا بەر فراوانتریش بووە. کەئەمەش بەڕاستی دەرس و عیبرەتی تیایە بۆ ئەوانەی کە ئەیانەوێت عیبرەت وەربگرن. هەمان سەرچاوە

## چواردەیەم: زانای دەروونناسی ئەڵمانی فیلی بوتولو

ئەم کەسایەتی یە مامۆستای دەروون ناسی یە لەزانکۆی میونخ لەئەڵمانیای ڕۆژئاوا.. بەهۆی پسپۆڕیەکەیەوە وەك توێژەرێك لە بواری دیاردەی ئاینە جیاوازەکاندا دراسەی لەسەر قورئان کرد و پاشان لە تصوفی ئیسلامیدا ڕۆچوو.. لێرەوە ئاینی ئیسلام تەواو کاری تێکرد هەروەك خۆی دەڵێت: (من لەئیسلامدا ئارامی دەروونم بینیەوە، ئەو ئارامیەی کەئەك ئەڵمانیای ڕۆژئاوا لەدەستی داوە بەڵکو هەموو ئەوروپاشی گرتووە تەوە).

پاشان چیرۆکی مسوڵمان بوونەکەی دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

هەستکردنم بە ڕاکێشانم بەرەو ئیسلام و سەرسام بوونم بەم ئاینە ئەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ.. بەڵام ویستی خوای گەورە وابوو کەکارکردنم وەك مامۆستای دەروون ناسی لەزانکۆی "میونخ" ببێتە سەرەتایەك بۆچوونە ناو ئیسلامەوە، لەچوارچێوەی کارەکەمەوە دەستم کرد بە قۆناغی گەڕان و لێکۆڵینەوە لەبارەی سەرجەم ئاینەکانەوە لەسەرجەم وڵاتانی جیهانەوە و هەروەها دیاردە ڕۆژئاوایی یەکان لەسەرجەم ئەم ئاینانەدا.

لە دیراسەکردنی ئیسلامدا بەپلەی یەکەم ئەوەی کە لەقورئاندا هەبوو زۆر سەرنجی ڕاکێشام و پاشان بەپلەی دووەم تەصەوفی ئیسلامی ئەمەش لەڕێگای شیکاری بنەڕەتی عەقیدە و پرۆگرامەکانی ئیسلام، لە دراسەکردنی تەصەوف دا ماوەکی زۆر ڕۆچووم، تادەرەنجام گەیشتمە ئەو ڕاستیەی کەئیسلام چارەسەری مرۆڤ ئەکات لەناوە و دەرەوەشیدا.. ئەمە ئاینێکە کەبانگەشە بۆ خاوێنی ڕووخسار و پاکی ناوەوە ئەکات.. لەنێو مرۆڤەکاندا خۆشەویستی برایەتی و پێکەوە بەستن و سۆزداری درووست ئەکات، بەپێچەوانەی شەوەی کەلەکۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوادا ئەیانبینین، کە هەر کەسەو بۆ دنیای تایبەتی خۆی دەژی کۆمەڵگاکان هیچ پێکەوە بەستنێکی ڕۆحی و ئاینی پێکیانەوە نابەستێت هەروەك لای مسوڵمانان هەیە.

لە چبوارچێوەی دراسەکەمەوە لەسەر تصەوف بۆم دەرکەوت کاتێك سۆفی یەکان کۆدەبنەوە بۆ زیکری خوا هەموو لەسەر خۆشەویستی خوایە کە کۆبوونەتەوە، لەسەر ڕێگای پاکی ڕۆح و ویژدان ئەڕۆن و چەندین ویردی دیاری کراویش لەپاش هەر نوێژێکەوە دەڵێن، کەئەمەش وایان لێدەکات بردەووام بەستراو بن بە ڕێساکانی ئاسمانەوە.

پاشان دەڵێت: (زۆر گرانە لە ئەوروپا کۆمەڵگایەك ببینی ئەم سیفاتانەی تیابێت، بۆیە هەستم کرد کەپاڵنەرێکم تیایە بۆ مسوڵمان بوونم بەڵام وام بەباش زانی کەوا پێویست ئەکات مسوڵمان بوونەکەم بۆ ماوەی ساڵێك بشارمەوە، لەبەرئەوەی کەتۆ ئەگەر بتەوێ لەوڵاتێکدا مسوڵمان ببی کەسەرجەم هۆکارەکانی ڕاگەیاندن لەدژ یەتی ئەوە کارێکی کیەکجار گرانە بەڵام پاش ئەوەی کەبیروباوەڕەکە لە دڵمدا چەسپا ئیسلام بوونی خۆی بەئاشکرا ڕاگەیاند و هیچ باکم بەوانە نەبوو کەدژایەتی ئیسلامیان ئەکرد).

پاشان کۆتایی بەوتەکانی هێناو زۆر بە حەماسەوە پەنجەکانی ڕاوەشاند و وتی: (من جەخت ئەکەمەوە لەسەر ئەوەی کە بەبێ قورئان و تەصەوف کەدادەنرێت بەلقێك لقەکانی

زانستی دەروونناسی کە لەزانکۆکاندا دەخوێنرێت نەمنەتوانی کەئاینەکەم بگۆڕم لەبەر ئەوە من ئاینەکەم لەسەر متمانەو باوەڕێکی تەواو گۆڕیوە..)

پاشان بەپێکەنینێکەوە وتی: (ئیسلام تەواو ژیانی ڕۆژانەمی گۆڕی و زۆر بەتەواوی و بەسەرسوڕمانەوە ڕێکی خستم، من لەڕابردوودا بێ ئامانج بووم بەڵام ئێستا واتای هەیە و ئامانج و شیرینی خۆشی هەیە.... ئێستا لەسەرجەم هەڵس و کەوتەکانمدا لەخوای گەورە ئەترسم و وەئەزانم کە پەروەردگارێکم هەیە لێپرسینەوەم لەگەڵدا ئەکات لەهەر کاتێکدا بێت لەکارەکانم). لەپاش ئەمانەش ناوی "أبي حسن" بۆ خۆی هەڵبژارد بەتایبەتی لەبەرئەوەی کەئەو خۆشەویستترین جەمسەری سۆفی گەورە أبا حسن شازلی یە هەروەك لە ووتەکانیدا ڕوونی ئەکاتەوە.[1]

## پانزەیەم: نووسەری ئەمریکی ماگریت مارکۆس:

ناوبراو ئافرەتێکی ئەمریکی بە ڕەچەڵەك جوولەکەیە و، چەندین کتێبی داناوە لەوانە (الإسلام في مواجهة الغرب) و (رحلتي من الكفر إلى الإيمان) و (الإسلام و التحديد) و (الإسلام في نظرية والتطبيق) .

ئەڵێت: (ئیسلام چارەسەری بۆ سەرجەم کێشەکانم و پرسیارەکانم لەبارەی مردن و ژیان داناوە و، لەو باوەڕەدام کە ئیسلام تاکە ڕێگایە بۆ ڕاستگۆیی، ئەمە سەرکەوتووترین چارەسەرە بۆ دەروونی مرۆڤایەتی، هەر لەسەرەتای قورئان خوێندنەوەم بۆم دەرکەوت کەئاین هەر بەتەنها بۆ ژیان پێویست نی‌یە بەڵکو ئەم ئاینە بۆ خۆی ژیانەو، هەتا من لەدیراسەکردنەکەمدا زیاتر قووڵ ئەبوومەوە زیاتر بۆم ڕوون ئەبۆوە کە بەڕاستی ئیسلامە وای لەعەرەب کردووە کەببنە ئومەتێکی گەورە و خاوەن شارستانی کەجیهان بەڕێوەبەرن، چۆن ئەچیتە ناو قورئانی پیرۆزەوە ئاواش پێویستە بچیتە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، لەسەر ژنانی مسوڵمان پێویستە دان بنێن بەو نیعمەتەی خوا بەسەریانەوە کەکردوونی بەمسوڵمان و ئەم دینەی پێبەخشیون کە ڕێساکانی کەسایەتیان ئەپارێزی و پایەیان بەرز ئەکاتەوە وداوێنیان پاك ڕائەگرێ و لەدەست درێژی و لێك هەڵوەشانی خێزان ئەیانپارێزێ.

---

[1] - هەمان سەرچاوە.

## شانزەیەم: زانای کۆمەڵناسی ئینگلیزی حسین ڕەئوف:

ئەوانەی کە بەدواچوون بۆ بزووتنەوەی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی ئیسلام ئەکەن لەوڵاتانی ئەوروپی و ئەمریکیدا، وائەبینن زۆرترین ڕێژەی ئەوانەی کەمسوڵمان ئەبن لەم وڵاتانە بریتین لە زانایانی بواری کۆمەڵناسی و ئەوانەی کەلەبوارەکانی چاکسازی کۆمەڵایەتیدا کاردەکەن ئەمەش لەبەر ئەو دراساتانەی کە ئەنجامی ئەدەن لەسەر ئاینزا و بیروباوەڕەکان بەبەردەوامی، وەبەتایبەتی لەسەر کاریگەریان لەکۆمەڵەکان و توانایان لەچارەسەری ئەو کێشانەی کەتووشی تاك و کۆمەڵگاکان ئەبێت و چۆنیەتی بەشداری لەسوك کردنی ڕوودانیدا وە کاریگەری ئەم بیروباوەڕانەش لەسەر سلوك و بەها کۆمەڵایەتیەکان.

لەودراساتانەش دیارە ئەم زانایانە دراسەو توێژینەوە لەسەر بەها باڵاکانی ئیسلام ئەکەن و لێرەوە زۆرێکیان کەخاوەن دەروونێکی ڕاستگۆو پاکن پێی سەرسام ئەبن و مسوڵمان ئەبن.

دیارە "حسین ڕەئوف" یەکێکە لەزانا کۆمەڵایەتی‌یەکانی ئینگلیز کە ئاین و ئاینزا کۆمەڵایەتی یە جیاوازەکانی شیکار کردووە و لێکۆڵینەوەی لەسەریان ئەنجام داوە و پاشا ڕۆچوون و ورد بوونەوە گرنگی و گەورەیی ئیسلامی بۆ دەرکەوتووە و زۆر سەرسام بووە بەو توانا عەجیبە لەچارەسەرکردنی کێشەکاندا کە تاك و کۆمەڵگاکان پێوەی دەناڵێنن وە گونجاندنی زۆر باشی ئەم ئاینەش لەگەڵ تەواوی ژینگەو شارستانی یەتەکانی تردا.

بۆیە مسوڵمان ئەبێت و زۆر بەتوندیش خۆی بۆ هیلاك دەکات تائەم ئاینە پاکە بگەیەنێتە خەڵکی و وەڵامی هەموو ئەوانەش بداتەوە کەبەناڕەوا بوختان و درۆ بۆ ئەم ئاینە هەڵئەبەستن.

دیارە ئەم کەسایەتی یە لەسەرەتای کارەکانیدا دەستی کردووە بە توێژینەوە لەبارەی بیروباوەڕی دایك و باوکیەوە، کە یەکێکیان مەسیحی و ئەوی تریان جوولەکە بوو، پاشان دستی کردووە بەدراسەکردنی هندۆسی و فەلسەفەی ئەم بیروباوەڕە بەتایبەتی ڕێسانوێکانی "یوبانیشادو فیدانتا" و پاشان بیروباوەڕی بوزی دراسەکردووە، لەگەڵ بەراوورد کردنی ئەمانە بەهەندێك لەبیروباوەڕی یۆنانی کۆن. هەروەك هەندێك لە تیۆریاو ڕێبازی کۆمەڵایەتی نوێی دراسەکردووە، بەتایبەتی بیرو باوەڕی فەیلەسوفی فەڕەنسی "تولستوی".

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە زۆر درەنگ دراسەی ئیسلامی کردووە لەچاو ئاینەکانی تردا سەرباری ئەوەی کەلەچەندین وڵاتی عەرەبیدا ماوەتەوە لەماوەی کار کردنیدا، یەکەم ناسینیشی بۆئیسلام لەڕێگای خوێندنەوەی قورئانێکی ترجەمە کراوەوە بوو کە (رودیل) وەری گێڕاوە ئەم خوێندنەوەیەی بۆ کاریگەری تێنەکرد چوونکە تەرجەمەکە ڕاست گۆنەبوو وەدەست پاکیش نەبوو بوو لەوەرگێڕانەکەیدا، ئەمەش وەك زۆرێك لەو ترجمانەی قورئان کەبەڕاستی هەوڵی تێکدان و لەناوبردنی ماناکانی قورئانیان داوە بەمەبەستی دووژمنکارانە.

بەڵام دواجار یەکێکی لەبانگخوازە چالاکەکان ناسی و ئەم کەسایەتی یەتوانی زۆر تێگەیشتنی بۆ ڕاست بکاتەوە و هەروەها ترجەمەیەکی قورئانی پیرۆزی ئەداتێ کەیەکێك لەزانایانی مسوڵمان وەری گێڕاوە کەئەم ترجەمەیە تەفسیرێکی عەقلانی گەورەشی لەگەڵدابووە سەرباری ئەوەش کەچەندین واتای تیادا ڕوون کرابۆوە کە لەئینگلیزیداواتایەکی دیارینیە، هەروەك چەندین کتێبی ئیسلامیشی دایە و ئەمانەش سەرجەم ڕێگایان بۆ خۆش کرد تا بیرێکی سەرەتایی ڕاستی بۆ درووست ببێت لەبارەی ئیسلامەوە. لەپاش لێکۆڵینەوە و ورد بوونەوەی زیاتری بۆ ئەم ئاینەتێکەڵبوونی بەچەندین کۆمەڵەی ئیسلامی و تێڕوانینی بۆ کاریگەری ئیسلام لەڕووی کۆمەڵایەتی یەوە لەسەریان گەیشتە ئەو ڕاستی یەی کەئیسلام چەندە گەورەیەو بەهەموو بیروباوەڕی خۆیەوە باوەڕی بەم ئاینە کرد.

بۆ خۆشی بەم جۆرە لەبارەی ئەو ئەزموونەوە ئەدوێت کەزیاتر هانیدا بۆ مسوڵمان بوونی:

(ڕۆژێکیان لەساڵی (١٩٤٥) دا بوو بانگ کرام بۆ بینینی نوێژی جەژن، و پاشان بۆ خواردن لەپاش نوێژ، لەو بۆنە جوانەدا زۆرێکم لە خەڵکی بینی کە لەسەرجەم وڵاتانی جیاجیای جیهانەوە هاتبوون و تەواوی چینە جیاوازەکانی کۆمەڵیشی کۆکردبوووەوە بەتەواوی ڕەنگ و ڕەگەزەکانیانەوە.... لەوێدا چاوم کەوت بە ئەمیری تورکیا کەلەم لاو ئەولایەوە زۆرێك لە بانگکراوەکان دانیشتبوون کەچی هەموویان پێکەوە نانیان ئەخوارد، یەکسانییەکی ڕاستگۆیانەم بینی کە بەڕاستی لەچاوی دەوڵەمەندەکانەوە دەبینرا نەك وەك دەوڵەمەندەکانی تر کە بەزۆر خۆیان واپیشاندەدەن کەلەگەڵ خەڵکی یەکسانن و هەروەها هیچ جیاوازیەکم نەبینی لەنێوانی سپی پێست و ڕەش پێست یاخود ئەو جیاوازییە ناڕەوا و ناشرینەی کەپێی دەڵێن

چینایەتی کۆمەڵایەتی بەرچاو نەکەوت، ئەمە بەڕاستی هەستێکی زۆر گەورەی بەرامبەر بەم ئاینە لەلا درووست کردم).

پاشان دەڵێت: (لەوەی سەرەوە کەباسم کرد ڕوون بۆوە بۆچی من بووم بەمسوڵمان، بەڵام ئەمە تەنها بەس نی‌یە بۆ پاڵنانی من بەشانازی کردنم بەئیسلامەوە ئەم هەستەم بەردەوام لەگەشەکردن و نەش ونمادایە بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار و زیاد بوونی ئەزموونەکانم لەسەر ژیان... شارستانیەتی ئیسلامیم لەزانکۆی ئینگلیزی خوێند و بۆیەکەم جار بۆم دەرکەوت و بەتەواوی باوەڕوە کەشارستانیەتی ئیسلامی بووە ئەوروپای لە لەسەدەتاریکەکان دەرهێناوە و مێژووی جێگیر کردووە، بینیم کەزۆرێك لە ئیمپراتۆریەتە گەورەکان ئیسلام بوون لەمێژوودا، وەزۆرێکیش لەزانستە نوێکان فەزڵەکەی بۆ ئیسلام و شارستانیەتەکەی دەگەڕێتەوە. کاتێکیش هەندێك خەڵك دێن و پێم ئەڵێن من بە مسوڵمان بوونم ڕێگای دواکەوتەیم هەڵبژاردووە گاڵتەم بەو نەزانیەیان دێت وکەچەندە کاڵ فامن و چۆن سەرەتاو دەرەنجامیان تێکەڵ کردووە.

پاشان ئاماژە بە ڕەوشتی بەرزی مسوڵمانانی ڕاستەقینەو ڕێزیان ئەکات،وەباس لەتوانای سەرسوڕهێنەریان ئەکات لەچارەسەرکردنی ئەوکێشانەی کەکۆمەڵگاکان لەناو ئەبەن و ئەڵێت: ( زۆر گەشتم کردووە بۆ وڵاتان و ناوچەکانی مسوڵمانان، لەم گەشتانەمدا باش بۆم دەرکەوتووە کەچۆن ئەمانە ڕێزی بێگانەو غەریب ئەگرن لەسەرجەم شوێنەکاندا و چۆن هەڵس و کەوتی لەگەڵدا دەکەن بەڕێزەوە ؟ چۆنیش سوودی پێئەگەیەنن و یارمەتیت ئەدەن، من لەبێجگە لەمسوڵمانان هەرگیز ئەم هەڵسوکەوتەم نەبینیوە و نیە کە ڕێزی غەریب بگیرێت بەبێ بەرامبەر).[1]

## حەڤدەیەم: گۆرانیبێژی ئەڵمانی کریستیان باکر

گۆرانیبێژ و بێژەری بەناوبانگی کەناڵیMt vبەناوبانگی ئەوروپی مسوڵمانبوونی خۆی ڕادەگەیەنێت و مانای ڕاستەقینەی ژیان ئەدۆزێتەوە و دەڵێت: (لە چلە پۆپەی ناوداری دا بووم بەڵام ئەمە بەڕاستی ئەزموونێکی ڕۆح تێك دەر بوو، نەمئەتوانی بەردەوام بم).

کریستیان باکر لەخێزانێکی مەسیحی پرۆتستانتی لەدایك بووە و لەهامبۆرگی ئەڵمانیا گەورەبووە، کاتێك لەتەمەنی (٢١)ساڵیدا ئەبێت لەڕادیۆی هامبۆرگ وەك بێژەر لەو ڕادیۆیە

---

١- سایتی: هدی الاسلام.

وەرگیراوە، پاش دوو ساڵ لەنێوان هەزاران لەوانەی کەپێشکەشیان کردبوو بۆ بێژەری هەواڵ لە کەناڵی Mtv ئەوروپی هەڵبژێردراوە و پاشان ڕووی کردۆتە لەندەن، خۆی دەیگێڕێتەوە دەڵێت (لە بیستەکانی تەمەنمدا زۆر زیرەك بووم لە نوتینگ هیل،ژیانم بەسەر برد و ئەوکاتە کچێکی نوێ بووم لەو شارەدا و بۆ هەموو شوێنێك بانگ دەکرام، وێنەگران بەردەوام وێنەیان دەگرتم و ڕۆژنامەوانان بەردەوام بەدوامەبوون، زۆرێکم لە بەناوبانگان بینی و کاتیشم زۆر بەخۆشی بەسەر ئەبرد زۆربەی پارەکانم لەجل و بەرگدا سەرف ئەکرد و سەرجەم ئەوروپاگەڕام و باشترین وخۆشترین شوێنەکانیش چووم .

ئافرەتی پێشەنگ و یەکەم بووم لە کەناڵی Mtv و بەدرێژایی کات لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دەرئەکەوتم لەسەرجەم ئەوروپا خەڵکی منی ئەناسی، کاتێك لەسەر مەنەصە لەبەرامبەر حەفتا هەزارکەس وەستام.. لەماوەی حەوت ساڵدا زۆر بەرنامەم پێشکەش کرد و زۆرێکیشم لە ئەستێرەکانی گۆرانی مقابەلەکرد،من سەرباری ئەم ژیانەم لەجیهانی بەناوبانگیدا هەستم ئەکرد کەپێویستیم بە دنیای ڕۆحیش هەیە هەمووکات بەرەو دنیای ڕۆحی ڕائەکێشرام بەڵام هیچ هەنگاوێکی عەمەلیم بۆ ئەو جیهانە نەئەنا. تا لە ساڵی (١٩٩٢) چاوم بە (عمران خان) لەتیپی کریکتی پاکستانی کەوت کە ئەمە یەکەمجار بوو چاوم بەمسوڵمان کەوتبێت و بەتایبەتیش من لەوکاتەدا بەدوای ڕاستی ئیماندا ئەگەڕام لەنێوانماندا زۆرێك لە گفتوگۆو مناقەشە ڕوویدا لەبارەی ئیسلامەوە و عمران خان چەند کتێبێکی لەبارەی ئیسلامەوە دامێ و منیش کەوتمە خوێندنەوەیان، پاش ئەوەی ئەم کتێبانەم خوێندەوە و پاشان قورئانیشم خوێندەوە تێگەیشتم هەمرو شتێك ئیدی مانای هەیە و پاشان چەند لایەنێکی گرنگی ئیسلامم تاوتوێ کرد و دراسەم کرد لەوانەش بابەتی ژن لەئیسلامدا بۆیە من وەك ئافرەتێکی ڕۆژئاوایی سەردەم و خاوەن پلەو هەروەها زانستیش بێگومان پێویستم بەوە بوو بزانم بۆچوونی ئیسلام لەبارەی ژنەوە چی‌یە نەئەکرا کەقبوڵی بکەم ستەمم لێبکرێت،بەڵام بۆم دەرکەوت کە کەنامەی ئیسلام پشتگیرە بۆ ژن و بەهەمان شێوە بۆ پیاویش لەئیسلامدا ژن مافی دەنگدانی هەبووە هەر لەساڵی (٦٠٠)ز و چۆن پیاوان جل و بەرگی داپۆشراو لەبەرئەکەن ژنیش لەبەری ئەکات، بۆهیچ کاملم لەم دوو ڕەگەزە حەلاڵ نەکراوە بەئارەزوو سەیری یەکتری بکەن بەڵکو هەریەکەو پێویستە لەئاستی ئەویتر چاوی بگرێت، من هەرگیز ئەوە بە دیاردەیەکی تەندروست نازانم کەخەڵکی بەئارەزووی خۆیان سەیری یەکتر بکەن و بۆ ئارەزوو شەهوەتە جنسیەکانیان،

کەئەمەش جارێکی تر شەهوەت بەهەڵە ئەجولێنێت.. ..) لەکۆتاییشدا مسولمان بووم من ئێستا پێنج فەرز نوێژەکانم ئەکەم و ڕەمەزان بەڕۆژوو ئەبم و جاران ئارەقم ئەخواردەوە لەپاریس بەڵام ئێستا هەر دەستیشی لێنایەم و لەساڵی (٢٠٠١) چووم بۆ مەککە بەڕاستی ئەمە ئەزموونێکی زۆر جوان و بەرز هەستم بەخۆشی دڵ ئارامیەکی زۆر کرد. پاش گەڕانەوەم دەستم کرد بەخوێندن لەزانکۆی ویست مینستر، زانستی پزیشکی سروشتی و گژوگیاو پزیشکی چینیم خوێند ئەم کۆرساتی خوێندنە لەبەرۆدەمدا دەرگای تری کردەوە بۆ جیهانێکی زۆر سەرسوڕهێنەر تێڕوانینێکی تر بۆ مرۆڤ و سروشت و تەندروستی و نەخۆشی و بەڕاستی ئەمانە هەموو پەیوەندی دارن. لەکۆتاییشدا دەڵێت (ئیسلام گەورەترین دیاری یە کەبەدەستم هێنابێت)[١]

## هەژدەیەم: ڕاهێنەری کاراتی جیهانی أحمد کمال أوکاموتو

هیچ ڕۆژێك لەخەیاڵی ئەستێرەی بەناوبانگی کاراتی (هدیکۆ اوکاموتو) دانەبوو کەببێتە مسولمان ئەو سەرباری ئەوە هیچیشی لەبارەی ئیسلامەوە نەئەزانی جگە لەوەنەبێت کەئەیزانی ئاینێکەو کۆمەڵێك لەخەڵکی پێڕەوی ئەکەن کە لەڕووی شارستانیەتەوە دواکەوتوون .

لەبارەی چیرۆکی مسولمانبوونی پاڵەوانی جیهانی لە بواری کاراتی أحمد کمال أوکاموتووە و دەربارەی ئەوەی کەئیسلام چی بۆ زیادکردووە و وەگرنگترین ئەو ڕێگریانەش کەلەدوای مسولمان بوونەکەیەوە تووشی بووە و چەندین پرسیاری تر ئەم پەیڤینەی لەگەڵداکراوە:

* ئەکرێت خوێنەرانمان بەکەسایەتی خۆت بناسێنی؟

- من لەدایك و باوکێکی بوزی لەدایك بووم کەزۆر بەتەنگ تەربیەتی منداڵەکانیانەوە بوون بەشێوەیەکی بەهێز باوەڕپێکراو، هەرلەمنداڵیەوە حەزم بەکاراتی بوو وە لە بەناوبانگترین و گەورەترین قوتابخانەی یابانیدا پسپۆڕدا فێری ئەم یاریە بووم، هەر لەم قوتابخانەیە بڕوانامەی خەبیرم لەم یاریەدا وەرگرت وەبەردەوام بووم بەدوای نهێنیەکانی ئەم یاریەدا تا ئەو کاتەی پلەی دکتۆرام وەرگرت بەپێی یاساکانی ئەم یاریە تیایدا، بەم جۆرە ناسناوەکانی ئەم یاریەم بڕی پلەکانم بەرزبۆوە تائێستا بوومەتە خبیری پلەیەك و چوارەم کەس لەجیهاندا لەڕووی پلەوە،

---

١- هەمان سەرچاوە.

ئێستا وەك بەڕێوەبەری هونەری کاراتی هەڵبژاردەکانی میصر کاردەکەم و هەروەها وانەش بۆ ڕاهێنەرانی کاراتی لەناوچە عەرەبی یەکاندا دەڵێمەوە،وەبە مسوڵمان بوونیشم ناوی خۆم گۆڕی لە هدیکو اوکامو بۆ أحمد کمال اوکاموتو .

* چۆن هاتیتە ناوچە عەرەبی یەکان ؟

- لەساڵی (١٩٧٠) دا لەدەرەنجامی سەرکەوتنم لەیاری کاراتی و کالەتی گەشەپێدانی نێودەوڵەتی یابانی هەڵیبژاردم بۆ ئەوەی یاریەکە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست بڵاوبکەمەوە و بەتایبەتیش بۆ ناوچە عەرەبی‌یەکان، یەکەم جێگام کە بۆی چووم وەك خبیری کاراتی وەزارەتی ناوخۆی سوریا بوو، لەماوەی شەش ساڵدا دەستم کرد بەڕاهێنان لە سوریا و عێراق و ئەردەن و لوبنان و فەلەستین و میصر و لەساڵی (١٩٧٦) چووم بۆ میصر بۆکارکردن لەسەرداوای سەرۆکی کۆچ کردوو انور سادات وەك خبیر کاراتی و ڕاهێنەر لە یەکێتی میصر، ئەرکی یەکەمم لە وانەوتنەوە لەسەر بنەڕەتەکان و هونەری یاری یەکە و شێوازەکانی بەکارهێنانی تێپەڕی نەئەکرد، لەم ماوەیەدا ڕێگام گرتەبەر لەبارەی چۆنیەتی ناسینی ئیسلام وەك ئاین و بەڕاستی زۆر سەرسام بووم و ئەوەی کەحسابم بۆ نەککردبوو ئەوەبوو، چوونکە من وام ئەزانی کە بۆلای گلانێك هاتووم کە لە جیهانیان جیادەکاتەوە بە دەیەها ساڵ و ڕەنگ بێت چەندین هەڵس و کەوتی ناشارستانی یان هەبێت، بەڵام خۆم بینیەوە لەناو گەلانێکدا کە بەڕاستی ئەخلاق و هەڵس و کەوتێکی هێندە شارستانی‌یان هەیە کە لەهیچ گەلێکی تر لەم جیهانەدا ئەوە بەدی ناکەی و کاتێك باش بیرم لەمە کردەوە بۆم دەرکەوت کە ئەمە سەرچاوەکەی لەئاینەوە سەرچاوەی گرتووە و ئاینی ئەم خەڵکە هۆکاری ئەم هەڵس و کەوتەیانە. ئیدی لێرەوە بەجدی بیرم کردەوە کە لەم ناوچەیە بمێنمەوە و ئاینی ئەم خەڵکەش هەڵبژێرم، لەسەرەتادا بڕیارم دا کە کەس و کار و خێزانەکەم و یابان واز لێبێنم و لەمیصر جێگیر ببم و لەنێوان وڵاتانی عەرەبیشدا هاتوچۆ بکەم وەك خبیری یاری کاراتی و وانەبڵێمەوە لە خولی ڕاهێنەراندا و تازیاتر لەبارەی ئەم ئاینەوە شارەزاببم، خوای گەورەش سەرکەوتووی کردم کە بێمە ناودینی ئیسلامەوە ئەمەش بەتەواوی قەناعەت و خۆشەویستی خۆمەوە بوو بۆ ئەم ئاینە، و بەتایبەتیش پاش ئەوەی لەگەڵ مسوڵمالنان هەڵس و کوتم کرد و لە داب و نەریت و هەڵس و کەتەکانیان نزیك بوومەوە و پاش ئەوەش کەزۆر زۆرم لەسەر ئیسلام خوێندەوە.

* چۆن بڕیارتدا ببیت بە مسوڵمان؟

- هەرلەمنداڵیمەوە دایك و باكم لەسەر لێبووردەیی و سۆزداری و یارمەتیدان پەروەردەیان كردووم، بەڵام بەڕاستی من دووفاقیەكی گەورەم دەبینی لەنێوان ئەوەی لەسەری پەروەردەكراوم و لەنێوان ئەو هەڵس و كەوت و شیعارانەی ئاینەكە كەپێڕەوم ئەكرد بەو پێیەی كەمن بوزی بووم. وەكاتێك هاتمە ناوچە عەرەبی یەكان و لەگەڵ مسوڵمانانندا هەڵسو كەوتم كرد و ژیام لەنزیكەوە و دەستم كرد بەخوێندنەوە لەبارەی ئیسلامەوە بینیم كەئەمانە هەموو بەستراونەتەوە بەگیانی كۆمەڵەوە و ئەمانە لە نوێژەكانیاندا بەكۆمەڵن و لەحەج كردنیاندا بەكۆمەڵن وەكاتێكیش كەبەڕۆژوو دەبن هەموو بەكۆمەڵ بەیەكەوە بەڕۆژوو دەبن بۆیە بەڕاستی لەئیسلامدا ئەوەم دۆزیەوە كەبۆی دەگەڕام لەئەخلاقیاتی گشتی، بانگەوازكردن بۆ سۆزداری و لێبووردەیی لە بنەماكانی ئەم ئاینەیە، وەجیاكردنەوەی ڕق و توڕەیی و ڕەگەزپەرستی لەنێوان مسوڵمانانندا شتێكە كەدین خۆی لێ لاداوە، لەڕابردوودا جگەلە تاك گەرایی هیچی ترم لەبەردەمی خۆمدا نەئەبینی لەسەرجەم هەڵس و كەوتەكانی ژیاندا: لەنوێژكردنی بوزی دا هەر كەسەو نوێژ بەتایبەتی بۆ خۆی ئەكات و سەربەخۆیە، وەهەركاتێك بیویستایە ئەچووی بۆ خانەی پەرستش، بۆیە ئەمانە وایان لێكردم كەڕام بكێشێ بۆ ئەوەی زیاتر هەوڵبدەم لەم ئاینە و سروشتی و پرەنسیپەكانی و ئەخلاقیاتەكانی شارەزا ببم، بۆیەبڕیارم كردەوەكەبچم بۆلای كەسانی شارەزا و زانیانی ئەم ئاینە كەمسوڵمانان متمانەیان پێیان هەیە بۆ یەچوومە لای شێخ متولی شعراوی خوا لێی خۆش ببێت و لەپاش چەند دانیشتنێكی كەم لەگەڵیدا تەواو دڵنیا بووم لەم ئاینە بەرزەو لەدڵما جێگیر بوو و لەبەردەمی ئەو و لەبەردەمی سەرجەم مسوڵمانانندا مسوڵمان بوونی خۆم ڕاگەیاند سوپاس بۆخوا و ناوی خۆمم گۆڕی بۆ احمد كمال.

* لەسەرەتای ژیانتدا چیت لەبارەی ئیسلام و خەڵكی مسوڵمانەوە ئەزانی؟

- جگەلەوەی كەئەمزانی ئاینێكەو كۆمەڵێك خەڵكی كەم بەدەوریەوەن و پێڕەوی دەكەن و لەبارەشیەوە زۆرێك لەگومان و هەیەو ئەخلاقیاتی ناڕاست فێری دواكەوتوانی ئەكات و ئەم كەسانەش كەپێڕەوی ئەكەن لەڕووی شارستانی یەتەوە زۆر دواكەوتوون و هەڵس و كەوتیشیان زۆر كۆنە پەرستانەیە، من زۆر خۆشم بەمەوە خریك نەئەكرد تا زیاتر لەبارەی ئەم ئاینەوە بزانم و لایەنە ڕاستیەكانیم لاناشكرا بێت هەتا ئەگەر هەوڵیشم بدایە نەمئەتوانی چوونكە سەرچاوە لەسەر ئەو بابەتە لەیاباندا زۆركەمە یان هەرنی‌یە. یابان یەكێكە لەو وڵاتانەی زۆر محرومە لەوەی كە دام ودەزگاكانی بانگەوازی ئیسلامی ڕووی تێبكات و ئەمانە هیچ هەوڵێكیان نەداوە

بۆی، ڕەنگە هەرئەوەندە بەس بێت کە هەتا ئەگەر ببیت بەمسوڵمانیش ناتوانی بەباشی شارەزا ببیت لە ڕێساکانی ئاین و بنەماکانی چوونکە هیچ نووسراو کتێبێك نابینی کە وەرگێڕدرابێتە سەر زمانی یابانی، تەنانەت واتاکانی قورئانی پیرۆزیش بۆسەرزمانی یابانی زۆرکەمەو بڵاونەبۆتەوە وەك پێویست و نوێشە لەدەرچوونیدا .

* ئایا هیچ تووشی بەرتەنگی و زۆر لێکردن بوویتەتەوە لە نێوەندە وەرزشی یەجیهانیەکاندا ؟

ئازادی بیروباوەڕ لەڕۆژئاوا بەشێوەیەکی گەورە ڕێگای پێدراوە، هیچ جارێك سەردانی نێوەندێکی گەورەی وەرزشی جیهانیم نەکردووە هەتا خۆمم وەك مسوڵمان نەناساندبێت ئەمەش لەبەردووهۆکار، یەکەم: تاهیچ خواردنێك یان هەڵس و کەووتێکم بەرامبەر نەکەن کەلەگەڵ داب ونەریتی ئیسلامیدا یەك نەگرێتەوە، دووەمیش من شانازی ئەکەم بەئاینەکەمەوە کە ئیسلامە و هەتاك و بەشکم یەکێکیشیان لەوێ بکەونە مناقەشەلەگەڵمداو منیش ئەوەی ئەیزانم لەبارەی گەورەیی و پرەنسیپە باڵاکانی ئیسلامەوە بۆی شەرح بکەم و بەشکم خوای گەورە هیدایەتیان بدات، ئەمەش زۆر جار ڕووی داوە و ڕەنگە خوێنەران باوەڕنەکەن ئەگەر بڵێم کەزۆرینەی زۆری وەرزشە وانانی جیهانی هیچ لەبارەی ئیسلامەوە نازانن هێندەنەبێت کە من لەپێش مسوڵمان بوونمدا ئەمزانی یان کەمتریش.

* ئەو ئاواتانەت چی یە کەحەزنەکەیت بەدەستی بێنیت لەماوە داهاتوودا ؟

ژیانی داهاتووم هیوادارم لەنێوان ئەم خەڵکەدا بێت لەمسوڵمانان کەخۆشم ئەوێن لەوڵاتانی ئیسلامی و هەروەها هیوام وایە کەبەتایبەتی بەمەستی حەج کردن سەردانی زەویە پیرۆزەکان بکەم و پاشان سەردانیئارامگای سەروەرمان پێغەمبەر محمد ﷺ بکەم .[1]

## نۆزدەیەم: ئەو پیاوەی کەلەسەردەستیدا زیاتر لە (٦٠٠) مەسیحی مسوڵمان بوو:

ئەم کەسایەتی یە ناوی ویسام عبدالله یەو خەڵکی وڵاتی میصرە، سەفەری کرد بۆ ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێش نزیکەی بیست ساڵ لەمەو بەر و لەوێ پسپۆڕی وەرگرت

---

١- گۆڤاری المجتمع.

لە خوێندنی کتێبی پیرۆز (کتێبی مەسیحیەکان)، و لێرەوە لەگەڵ زۆرێك لە قەشەو راهیب و خاوەن پلەکانی کەنیسەی مەسیحیدا کۆنگرەی بەستووە و گفتگۆو پەیڤینی لەگەڵداکردوون.

لەم دواییانەدا لەسەر ژووری (پاڵتاك) لەئینتەرنێت ژوورێکی تایبەتی داناوە بۆ بانگەواز کردن و بانگەشەکردنی مەسیحیەکان بۆلای ئیسلام بەناونیشانی (دەرخستنی ڕاستیەکان) و ئێستاش ژوورێکی تری هەیە بەناوی (پەیڤینی ئیسلامی مەسیحی) Muslim Christain Dialougeلێرەوە خوای گەورە یارمەتیداوە توانیویەتی زیاتر لە (٦٠٠) کەس لەماوە پێنج ساڵدا لەمەسیحیەوە بکات بەمسوڵمان بەپیاو و ژن و منداڵەوە، ئەم پیاوە تائێستا لەسەر ئەم ئەرك و تێکۆشانەی ڕۆژانە بەردەوامە لە سەرف کردنی هەوڵ و پارەو لەڕاستکردنەوەی ئەو (تشویـه) و تێکدانانەی کە لەدژی ئیسلام و مسوڵمانان ئەکرێت لەلایەن دووژمنانی ئەم دینەوە، لەجوولەکە و مەسیحی و بێباوەڕانەوە.

ئەم بانگخوازە توانیویەتی ئەنتەرنێت لە دەرگای فەسادو خراپەکاری یەوە بگۆڕێت بۆگولاوی سەرمۆر و هەموو ئەوانەی کەتینوی ئیمانن وبەدوای ڕاستیدا ئەگەڕێن بکاتە ڕۆشنایی .[1]

**بیستەم: بانگخواز نبیل العوضی** دەڵێت: لە کاتێکدا لە ئەمریکا وتارم ئەدا، دوای وتارەکە یەکێ لە ئامادەبوان وتی: مامۆستا بەڵکو شایەتانی ئەم برادەرە دابدەیت، برادەرەکە هاتە بەر دەمم و وتی دەمەوێت موسوڵمان بم، وتم: چۆنە وا ئیسلامت هەڵبژاردووە؟ وتی: من دەوڵەمەندم و خاوەنی کۆمپانیاو پارەی زۆرم و هەست بە خۆشی و ئاسوودەیی ناکەم، کەچی کرێکارێکی هیندیشم لایە هەرچەند هەژارە چی دەیبینم دەم بە پێکەنینە و دڵشادە، ڕۆژێك لێم پرسی: بۆچی تۆ هەمیشە دڵت خۆشە؟؟ وتی: من موسوڵمانم و ئەوە تێگەیشتووم کە لە خۆشیدا سوپاسی خوا بکەم و لە ناخۆشیدا ئارام بگرم، بەمەش هەردوو حاڵەتەکە دەبێتە خێر بۆ بۆم، هەروەك پێغەمبەرﷺ ئامۆژگاری کردوین (عجبا لامر المؤمن ان أمره كله خير، ان أصابته ضراء صبر فكان خيرا له وان أصابته سراء شكر فكان خيرا له) ..

---

١- سایتی: التوابون.

ئنجا شایەتمانم وت و بە دوامدا وتیەوە (أشهد أن لا اله الا الله وأشهد أن محمدا رسول الله) پاشان گریا لێمان پرسی بۆ دەگریت؟ وتی: ئێستا وا بۆ یەکەم جار هەست بە خۆشی دەکەم..[1]

بەڕاستی ئەمە ئەو دڵفراوانی و خۆشیەیە کە قورئان لە بارەیەوە دەفەرموێت:

﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ الأنعام: ١٢٥

﴿ أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ الزمر: ٢٢

ئەوانەی موسڵمان دەبن زۆر وتەی جوانیان هەیە کە شایەنی ئەوەن لەسەریان بوەستین لێیان ورد بینەوە، یەکێك لەو تازە موسوڵمانانە کە پێشتر گاور بوو دەڵێت: محمدم بردەوەو مەسیحیشم نەدۆڕاند.. بەڕاستی ئەوەی موسوڵمان دەبێت بێجگە لەوەی کەئیمانی بە پێغەمبەرە ئیمانی بەهەموو پێغەمبەرانیشە، سەلامی خوایان لێبێت.. .

بانگخوازشێخ محمد حسێن یعقوبیش دەڵێت :لە پیاوێکی گاورم پرسی لە حەج کەموسوڵمان بوو بوو، هەستت بەچی کرد کەموسڵمان بووی ؟؟ وتی: وەك کوێرێك بووم کەلەناو دەریادا لە بەلەمێکدا سەوڵ لێبات بەبێ ئەوەی دەوروبەری ببینێ و بزانێ بەرەو کوێ ئەچێ و لەپڕ چاوی چاك بێتەوەو دنیای ڕوون ببینێ.. بەڕاستی ئیسلام گەورەترین نیعمەتە کە خوا بەخشیویەتی بە مرۆڤایەتی، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ ﴾ المائدة: ٣ .

## بیست و یەك: لیوپۆلد ڤایس

جوولەکەیەکی نەمساوی بوو، فەلسەفەو هونەری لە زانکۆی ڤییەننا خوێندووەو پاشان لە بواری ڕۆژنامەوانیدا کاری کردووەو زۆر سەرکەوتوو بووە.. بۆتە پەیامنێری چەند ڕۆژنامەیەك لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا وماوەیەکیش لە قودس ژیاوە.

---

١- سایتی: أوراق.

ناوبراو چۆتە قاهیرەو لەگەڵ شێخ موستەفای مەراغیدا قسەوباسی زۆری کردووە لەبارەی ئیسلامەوە، تا گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە لە ئیسلامدا ڕۆح و جەستە وەك دووڕووی پارەیەك وان، پاشان فێری زمانی عەرەبی بوو لە ئەزهەردا لەگەڵ ئەوەدا کە هێشتا هەر جولەکە بوو..

لیوبولد زۆر پرسیاری دەکردوو دەگەڕا بەدوای ڕاستیدا، زۆر خەمی دەخواردو بەلایەوە سەیر بوو کە موسوڵمانان دواکەوتوون، لەکاتێکدا کە ئاینەکەیان هەموو هۆکارێکی پێشکەوتنی تیایە، ڕۆژێك لەگەڵ کۆمەڵێك موسوڵماندا قسەی دەکردو لۆمەی کردن لەسەر ئەوەی کە لە کاروانی شارستانی دواکەوتوون بەهۆی دووریان لە ئیسلامەوە .موسوڵمانێکیان پێی وت: (تۆ بەم قسانەت لەوە دەچێت موسوڵمان بوویت و بەخۆت نەزانیبێت)!! ئەویش پێکەنی و وتی: مسوڵمان نیم، بەڵام ئەوەندەم جوانی لە ئیسلامدا بینیوە، ڕقم هەڵدەستێ کە دەبینم شوێنکەوتوانی پەیڕەوی ناکەن..

قسەکانی ئەو موسوڵمانە هەست و هۆشی هەژاندو خۆی بینیەوە لەبەردەم ئەو ڕاستیەی کەلێی ڕای دەکرد، نەیتوانی لەوە زیاتر دوابکەوێت بۆیە موسوڵمان بوو شایەتمانی هەقی هێنا(أشهدأن لااله الا الله وأشهد أن محمدارسول الله) . ناوی خۆشی کرد بە محمد أسد.. محمدی شێر، بەڕاستی وەك شێربوو بۆ خزمەتی ئیسلام و بەرگری کردن لێی.. ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە کە هەموو کەس بەشی خۆی خێری تیایە گرنگ ئەوەیە بواری بۆ بڕەخسێت و دەربکەوێت..

پاش موسوڵمان بوونی حەجی ماڵی خوای کردوو بەشداری جیهادی عمر المختاریشیکردو دژی داگیرکەران جەنگا .ئنجا چوو بۆ پاکستان و سەردانی شاعیری گەورەی ئیسلام دکتۆر محمد ئیقبال ی کرد، ئنجا بوو بە سەرۆکی پەیمانگای دیراساتی ئیسلامی لە لاهور و چەند پەڕاوێکی نووسی وەك: (الاسلام علی مفترق الطرق) و (الطریق الی مکة)، هەروەها مانای قورئانی لێکدایەوە بە زمانی ئینگلیزی و فەرموودەکانی بوخاریشی کرد بە ئینگلیزی.

محمد أسد دەڵێت: ئیسلام وەك نوورێك دزەی کردە ناو دڵی تاریکمەوە بۆ ئەوەی هەتا هەتایە تیا بمێنێتەوە، ئەوەی ڕایکێشام بەرەو ئیسلام ئەوەبوو کە ئیسلام بینایەکی گەورەی تەواوی جوانە کەناتوانرێ بە تەواوی وەسف بکرێت، بینایەك کە هەر بەشێکی تەواوکاری

بەشەکانی تریەتی، تا ئێستاش ئیسلام گەورەترین هۆکاری هەستانەوەی تیایە هەرچەند ڕێگری زۆریشی لە ڕێدابێت..

بەڕاستی ئیسلام مرۆڤ دەبات بەرەو یەکتاپەرستی لە هەموو لایەنێکی ژیاندا، وەگرنگی ئەدات بەدنیاو بە ئاخیرەت وەك یەك، گرنگی ئەدات رۆح و جەستە، بە تاك و بە کۆمەڵ، ئیسلام ڕێنمایمان دەکات کە چاکترین سوود وەرگرین لە تواناکانمان، ئیسلام ڕێگایەك نیە لە ڕێگاکان بەڵکو تاکە ڕێگایە، پێغەمبەریش ﷺ کە ئەم ڕێنماییانەی هێناوە ڕێنمایکارێك نیە لەڕێنماییکاران بەڵکو تاقە ڕێنماییکارە کەکەس ناتوانێت هاوشانی بێت .

پێغەمبەر ﷺ ئەو پایەبەرزەیە کە خواناردی ڕەحمەت بێت بۆ عالەم، جا ئەگەر ئێمە شوێنی نەکەوین، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە ڕەحمەتی خوامان ناوێت .

ئیسلام فەلسەفەیەك نیە، بەڵکو بەرنامەی ژیانە و، لەناو هەموو ئایینەکاندا تەنها ئیسلام ڕایدەگەیەنێت کە مرۆڤ دەتوانێت خۆی کامیل بکات لە ژیانی دونیادا، هەروەها تەنها ئیسلامیشە کە بوار بۆ مرۆڤ دەڕەخسێنێت کە خۆشی لە ژیان ببینێت و خۆشیە ڕۆحیەکانیشی لەدەست نەدات .

لە ئیسلامدا پێویستە لەسەرت کە تادوا پلە سوود لە ژیانت وەرگریت و تواناکانت بخەیتە کارو هاوکاری خەڵکانی تریش بکەیت کە سوود لە تواناکانیان وەرگرن..

ناوبراو باسی کاتی گەڕانەوەی دەکات لە عەرەفات و دەڵێت: ئەوا ئێمە بەپەلە دەگەڕێینەوە بە خۆشیەکی زۆری بێ سنوورەوە، با دەنگێکی خۆش ئەدات بەگوێمدا، تۆ ئیتر غەریب نابیت.. ئەوە براکانمە لەلای ڕاست و لای چەپەوە، هەرچەند هیچیان ناناسم، کەچی هیچیان غەریب نین لەلام !! ئێمە هەموو لە یەك ڕێرەوداین و وەك یەك لاشە دەڕۆیین بەرەو یەك ئامانج، لە دڵماندا ئەو بڵێسەی ئیمانە هەیە کە لەدڵی هاوەڵانی پێغەمبەردا هەبوو، براکانم ئەزانن کە کەمتەرخەمیان هەیە بەرامبەر ئاینەکەیان، بەڵام هەر لەسەر پەیانن ووەعدو پەیانی خۆیان دەبەنە سەر..

(لبیك اللهم لبیك).. تەنها شت کە لە عەقڵمدا گوێم لیێەتی دەنگی (لبیك)ە .

ئنجا چووم بۆ تەواف وبووم بە بەشێك لە لافاوێکی بازنەیی !!بووم بە بەشێك لە جووڵەیەك لە خولگەیەك دا!! خوولەکەکان پێپەڕین.. زەمەنیش هێدی بووەوە.. ئەم شوێنەش بووە تەوەرەی عالەم..

ئنجا محمد ئەسەد ئیشك دەخاتە سەر ڕزگاربوون لەو واقیعە خراپەی کەتیادەژین و دەڵێت: (ڕزگابوونمان نیە لە شوورەیی ئەو دواکەتوویەی تیایا دەژین مەگەر بەیەك ڕێگا، ئەویش ئەوەیە ئەبێ هەست بە خۆمان بکەین کە لە چیدا دەژین وشەوو ڕۆژ لەبەرچاومان بێت و تالاّوی بچێژین.. ئنجا ئەبێ بە پێوەرو پێوانەی عەقلی ڕۆژئاوا سەیری ئیسلام نەکەین، پێویستە بزانین کە ئیسلام خۆی پێوەرو تەرازووی خۆی هەیەو لە ئیسلامەوە سەیری دنیا دەکەین.. هەروەها دەبێت بە هوشیاری و عەزیمەتەوە کار بە سوننەتی پێغەمبەر بکەین)..

لە کۆتایدا ئامۆژگاریمان دەکات کە (دەبێت موسوڵمان بەسەربەرزی بژی، وە ئەبێت بیسەلمێنێت کە نموونەیەکی باڵاو بەرزە، وە ئەبێت شانازی پێوەبکات کەوایە و ئازایانە ڕایبگەیەنێت)..[1]

## بیست و دوو: مسولمان بوونی بەڕێوەبەری دریم پارکی ئەمریکی

ئەوەی کەسەرنجی ڕاکێشام بۆلای ئیسلام وتەی شۆفێرەکەم بوو کەناوی (ئەیمەن)بوو پێی وتم: (تۆدڵت باشە هەروەك دڵی مسوڵمانان) لێرەوە کەوتمە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون لەبارەی واتای ئیسلام و لەسەریم خوێندەوە تا مسوڵمان بوونی خۆم ڕاگەیاند، وەهیچ بەربەستێکم بۆ درووست نەبوو، پاشان بە کەسایەتی گەورەمان یوسف سەرسام بووم و بۆیەناوی خۆم نا یوسف لەوەش کە لەپێشتردا کردوومە پەشیمان نیم، بەڵام هەرگیز ئەو کات بەم گیانەوە نەژیاوم کەئێستا ئەژیم ئیسلام شتێکی نوێی پێبەخشیم تیایدا باوەڕم بەقەزاو قەدەر هێنا و ڕەمەزان بەڕۆژوو بووم و هەروەها بەجەژنە نوێکان دڵخۆش بووم و نیەتمە سەردانی ماڵی خوابکەم و هەروەها کەسانی تریش بۆ ئیسلام بانگەواز بکەم.

بەم شێوەیە مستەر ولیم یان (یوسف) چیرۆکی مسوڵمان بوونی خۆی ئەگێڕێتەوە بۆ زیاتر ئاشنا بوون پێی ئەم دیدارەمان لەگەڵدا ساز کرد.

سەرەتا ئەمانەوێت بتناسین؟

ناوم ولیەم فرنسیس یوسف کیلی و بەڕەگەز ئەمریکیم لە ولایەتی نیوجرسی لە ساڵی (١٩٤٦) دا لەدایك بووم و تیایدا گەورەبووم و زانکۆی (لیلاتۆفا) لە ولایەتی پەنسلڤانیا

[1] - موسوعة الإعجاز العلمي في القران والسنة..

ئابووریم تەواو کردوە و بەڕێوەبەری کۆمپانیای دڵنیایی لەسەر ژیان بووم بۆ ماوەی (١٠) ساڵ لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پاشان چوومە ناو بواری پیشەسازی بۆماوەی بیست ساڵ و ئێستاش بەڕێوەبەری شاری دریم پارك م کەیەکێکە لە پرۆژەکانی دریم لاند ە لەپێشتردا خێزانم پێکەوە ناوە بەڵام بەبێ ئەوەی منداڵمان ببێت لە یەکتری جیابووینەوە وەلە ساڵی (١٩٩٩)دا سەردانی میصرم کردووە.

- گۆڕان لەژیانتانداچی‌یە؟

کاتێك هاتم بۆ میصر من لەڕۆژئاوا لەسەر ئەوە ڕانەهاتبووم کە کاتێك خەڵکیم ئەدی گوێیان لەبانگە لەیەك شوێندا کۆدەبوونەوە و نوێژیان ئەکرد ئەمە بەلامەوە زۆر سەرسوڕهێنەر بوو لەسەرەتادا، پاشان چەند ئەندازیارێك و هاوڕێیانم لەمیصر کەوتنە قسە بۆکردنم لەبارە ئیسلامەوەو هەستم بەوەکرد کەئمانە لەناو دڵیاندا جۆر ئارامیەکی جۆری هەیە کەلەپێشتردا هەستم پێنەکردبوو کەهەرئەمەشە هۆکاری دەستگرتنیان بەم ئاینەوە، ئەمەش وای لێکردم کە بیربکەمەوە لە ئیسلام و هەروەها لەبارەیەوە بخوێنمەوە و بەراوردی بکەم بە مەسیحیەت، لەڕێگای خوێندنەوەم و ئەو ئەزموونەش کە لە ڕێگای هاوڕێ مسوڵمانە کانمەوە هەستم پێی ئەکرد بوم بەمسوڵمان، لەگرنگترین ئەو کتێبانەی لەبارەی ئیسلامەوە خوێندمەوە بریتی بوون لە کتێبەکانی [تفسيرمعاني القران] بەزمانی ئینگلیزی و کتێبی (دین الحق) و (الزواج في القانون الاسلام) و چەندین کتێبی تر کە شەرحی ئیسلامی ئەکرد، هەروەك من هەموو کاتێك قورئانێکم پێیە و هەڵ ئەدەم زمانی عەرەبی فێرببم تا بتوانم قورئانی پیرۆز بخوێنمەوە.

- چۆن مسوڵمان بوونی خۆتت ڕاگەیاند؟

لەپێش مسوڵمان بوونمەوە لەبارەی ئیسلامەوە بیستبووم بەڵام بەشێوەیەکی تەواونا، وەپاشان کەوتمە خوێندنەوەی جدی لەسەری و هاوڕێ مسوڵمانەکانشیم پێیان ڕاگەیاندم گرنگ ترین شت لەبارەی ئیسلامەوە لەسەرەتادا بریتی‌یە لە مانای ساناو ساکار و مەرج نیە بنەماو ڕێساکانی بەقوڵی بزانیت لەسەرەتادا، پێیان وتم ئەگەر چەند شتێکی قورس و گران هەبێت لەلات ئەوە لەدواییدا بەرەبەرە ڕادێیت و تێی ئەگەیت و ئەیزانیت، مسوڵمان بوونی خۆمم لە پێش ڕەمەزانی ساڵی ڕابردوو ڕاگەیاند و چووم بۆ ئەزهەر و بۆئەوەی منیش وەك مسوڵمانانم لێبێت لە هەموو شتێکدا و ناوەکەی خۆشم نەگۆڕی بەڵام پاشگری یوسف م بۆزیاد کرد لەبەرئەوەی من سەرسام بووم بە کەسایەتی گەورەمان یوسف و لەپێش و لەپاش مسڵمان

بوونەوە لەبارەیەوە خوێندمەوە و ڕێزم لێی گرت و ناوەکەیم خۆش ویست بەڵام ناوی خۆمم نەگۆڕی لەبەرئەوەی ئەوە ناسناوی باوکم بوو بەهەرحاڵ من ئێستا شانازی بەهەردوو ناوەکەوە ئەکەم.

هەڵوێستی خیزانەکەت چۆن بوو لەبارەی گۆڕانی ئاینەکەتەوە؟

باوکم و دایکم بۆ خۆیان مەسیحین و هەروەها منیشیان زۆر خۆش ئەوێت کاتێک کە مسوڵمان بوونی خۆمم پێڕاگەیاندن بەهۆی ئەوەی کەهیچیان لەبارەی ئیسلامەوە نەئەزانی چووبوون بۆ کەنیسەو چەند پرسیارێکیان لەقەشەکردبوو لەبارەی ئەم ئاینەوە و سەرەنجام پێیان وتم تائەو کاتەی تۆدڵت سپی بێت و نەفسێکی باشت هەبێت و ئەم ئاینە نوێیەش هیچ ئەمانەت پێنەگۆڕێت ئێمە لاریمان نیە لێی، هەرچی هاوڕێیەکانیشمە ئەوان دڵنیابوون لەوەی کەئەم ئاینەم بۆیە هەڵبژاردووە تا زیاتر دڵ و دەروون چاك نەكات و هەروەها باوەڕم زیادنەکات بۆیە هەڵوێستەکەیان وەرگرت بەڵام بەباشی تێنەگەیشتن.

- ئایا بەمسوڵمان بوونت هیچ بەربەستێکت هاتەڕێ؟

کاتێك بووم بەمسوڵمان هیچ ڕێگرییەکم تووش نەبوو وە لەلایەن کەسانی دەورووبەریشمەوە قبولکرا بەڵام باش لێ تێنەگەیشتن سەیرم ناکەن ئێمە لە ڕۆژئاوادا کاتێك کە نوێژنەکەین بۆنمونە بەڵکو ئەوان تەنها سەیری لایەنی توندوتیژی ئەکەن لای مسوڵمانان و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن شتانێکی زۆر ناڕاستیان بۆ ئەگوازنەوە و وێنای ڕاستەقینەی ئیسلام باس ناکەن، کە ڕەگەزپەرستی و توندوتیژی هیچی پەیوەندی بەئیسلامەوە نیە بەڵام بەداخەوە ڕۆژئاوا ئەوە نازانێت و جگە لەمەش هیچی تر نابینن، من لەئەمریکادا هیچ توشی گرفت نەبووم بەهۆی مسوڵمان بوونەوە بەڵام هەندێ جار ڕوبەڕووی خەڵکانێك دەبمەوە کە لە هەڵوێستی من تێناگەن.

- چۆن فێربووی بنەماکانی ئاینی ئیسلام جێبەجێبکەیت؟

بەداخەوە نەمتوانی فێری زمانی عەرەبی ببم بەڵام پێیان وتم مادەم تۆ لەبەردەم خوای گەورەدا دەوەستیت لەکاتی نوێژەکاندا و دڵی خۆتی بۆدەکەیتەوە ئەوە نوێژەکەت دروستە، من کاتێك ئەڵێم الله اکبر وا هەست ئەکەم کە من لە خوای گەورەوە زۆر نزیکم و نوێژەکەشم وەرگێراوە هەروەك زانایانی ئەزهەر پێیان وتم کەبابەتەکە بۆ خۆی هەنگاو بەهەنگاو دێت، هاوڕێیانی مسوڵمانم زۆر نوێژم پێئەکەن، بەڵام من کاتم زۆر نیە بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی

چوونکە ڕۆژانە (١٢) بۆ (١٦) کاتژمێر کار ئەکەم بەنیسبەت ڕۆژووگرتنیشەوە کارێکی ئەوتۆو گران نیە بەلامەوە چوونکە من لەڕێگای کارەکەمەوە ڕاهاتووم لەسەر خواردن نەخواردن هەرچەندە لەسەرەتاشدا چەند کێشەیەکم بۆ درووست بوو بۆ دوورکەوتنەوە لەخواردن لەماوەی بەڕۆژووبوونمدا بەڵام الحمدلله ڕاهاتم و نیەتە سەردانی ماڵی خوابکەم بەهاوڕێیەتی خێزانەکەم (منی) کە پاش مسوڵمان بوونم بووین بەهاوسەر و ئێستا من زۆر دڵخۆشم بەم ژیانی خێزانداری‌یەی ئێستام .

- چ تازەگەری‌یەك هەیە لە ژیانتاندا لەپاش مسوڵمان بوونتەوە؟

ئیسلام هێزی پێبەخشیم و وای لێکردم کە لە هیچ کەسێك نەترسم لە خوانەبێت، گرنگیش بەهیچ کێشەیەکی دنیایی نەدەم هەرچی‌یەك بێت هەتا ئەوکاتەی کە ئەو کێشەیەکی دنیایی بێت و پەیوەندی بەدواڕۆژەوە نەبێت و کارنەکاتە سەر ژیانمان لەپاش مردن، ئەمەشە کە تێبینیم کردووە لە ڕێگای هەڵس و کەوتمەوە لەگەڵ هەندێك لە هاوپیشەکانمدا، بۆنمونە لەپاش ئیسلام بوونمەوە خوشکە پچووکەکەم مرد ئەمەم بەسانایی پەسەند کرد چوونکە زانیم ئەمە لەخواوەیە، پێویستە لەسەرم کە باوەڕ بە قەزاو قەدەر بکەم، وەئەگەر ئەمە لەپێش مسوڵمان بوونمدا بووایە ئەکەوتمە پرسیار کردن لەسەری و بەرەنگار بوونەوە و کەئەمە چۆن ڕوویداوە و چۆن وادەبێت.

ئایاهیچ جیاوازیەك دەبینی لەنێوان ئیسلام و مەسیحیەتدا؟

بەڵێ جیاوازی زۆر هەیە، ئیسلام هێمنی و ئارامی و ئاشتی پێبەخشیم، ئیسلام ئەو ئاینەیە کەوەك خۆی ماوە، بەڵام ئاینی مەسیحی گۆڕانکاری تیا کراوە و دەستکاری دەقەکانیشی کراوە لەلایەن قەشەو کاهینەکانەوە، تیایاندایە کەعیسابەخوا ئەزانێت کەئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە چونکە عیسا بەندە و پێغەمبەری خوایە، ئێمە وەك مسوڵمان باوەڕ بەسەرجەم ئەو پێغەمبەرانەدەکەین و پێشمان وایە کە عیسا یەکێکە لەپێغەمبەرانی خوای‌گەورە، باوەڕپەو ئاینە ئەکەین کەئەو هێناویەتی بەڵام مەسیحیەکان تەنها باوەڕبەمەسیح ئەکەن و باوەڕیان بەهیچی تر نیە.

## بیست و سێ: بانگ کلیلی هیدایەتی ئەکتەرێکی ئەلبانی بەناوبانگە

ڕازیبوونی بەوەی کەڕۆڵی پاڵەوان ببینێ لەفیلمی (خۆشەویستی پەرستشدا)و وەهەوڵدانی بۆ دیراسەکردنی کەسایەتی و لایەنی دەروونی پاڵەوانی مسوڵمانی فیلمەکە هۆکاری سەرەکی بوو لە گۆڕانی ڕێڕەوتی ژیانی ئەکتەری بەناوبانگی ئەلبانی میروشی قاباشی و پەسەندکردنی فەرزەکانی ئیسلام لەلای و ڕەمەزانی ساڵی ١٤٢٥ك یش یەکەم ئەزموونی ڕۆژوو گرتن بوو لەژیانیدا .

بابەتی ئەم فیلمەش کەبووە هۆی مسوڵمان بوونی (میروشی قاباشی) گەورە ئەکتەری ئەلبانی، باس لە چیرۆکێکی ڕاستەقینەئەکات لەبارەی گەنجێکی ئەلبانی کە خوێندنی لەیەکێك لەئامادەیی یە ئاینی یەکان تەواو کردووە و پاشان لە یەکێك لەمزگەوتەکانی شاری بیرات لەباشووری ئەلبانیا وەك بانگ دەر دادەمەزرێت بەڵام قەدەر وائەبێت کەسیستەمی شیوعیەت لەو وڵاتەدا دێتەسەر حوکم لە ساڵی (١٩٦٧) دا و فرمانی ئەوە دەرئەکەن کەنابێت هیچ دیاردەیەکی ئاینی هەبێت و زۆرێك لە مزگەوتەکان دەڕووخێنن و تێکی ئەدەن.

ئەم گەنجە وەك پێشەواکانی تر سوور ئەبێت لەسەر ئەوەی کەنوێژەکانی خۆی بکات و هەروەها خەڵکی بانگ بکات بۆلای ئیسلام و درێژە بدات بە پەرستشەکانی لەزینداندا بۆیە پاش ئەوەی (٨)ساڵ لەزینداندا تەواو ئەکات لەبەر سوور بوونی لەسەر بەندایەتی نیزامی شیوعی ئەلبانی (٨) ساڵی تریشی بۆدووبارە ئەکاتەوە.

پەیامنێری ئیسلام ئۆنلاین لەبەلقان ئەڵێت هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی ئەلبانی گرنگیەکی زۆر ئەدەن بەبڵاو کردنەوەی ئەو گۆڕانکاری یەی بەسەر ژیانی ئەو ئەکتەرەدا هاتووە لەدوای مسوڵمان بوونیەوە بتایبەتی کە ئەمە کەسایەتی‌یەك بووە لەسەردەمی شیوعیەت دا گەشەی کردووە و پەروەردە بووە و بۆی ئاسان و گونجاو نەبووە وەك ئەلبانی یەکانی تر کە لەئیسلام شارەزا ببێت هەروەك باوك و دایکی مسوڵمان بوون .

بۆیە قاباشی ئەیویست کە لە کەسایەتی و لایەنی دەروونی ئەم گەنجە مسوڵمانە ئەلبانی‌یە تێبگات کە (٨) ساڵ زیندانی پێ باشتر بوو لە وەی کەلە نوێژ و بەندایەتی بۆخوای گەورە دابڕێت.

ئیدی قاباشی لێرەوە دەستی کرد بەخوێندنەوەی کتێبە ئیسلامیەکان و خۆی ڕاهێنا لەسەر بانگ دان لەڕێگای کڕینی چەند کاسێتێکی بانگ دانەوە بەچەندین جۆر دەنگی جیاواز و ئەوەی ڕەت کردەوە کە دەرهێنەرەکەی پێشنیاری بۆی کرد لە فیلمەکەدا بانگ بە کاسێت دابەزێت، بەڵکو جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کەئەبێت بانگەکە بەدەنگی خۆی بێت، ئەمەش نەك لە خۆشەویستی بۆ بانگەکە بەڵکو لەبارەی ئەوەی کەزۆر بەتەنگ جوانی وڕێك و پێکی و کامڵ بوونی کارەکەیەوە بوو، ئەمەش زیاتر پاڵی پێوەنا تالە ماناکانی بانگ بکۆڵێتەوە و تەنها بەوە واز نەهێنێت کە لەبەری بکات و بیڵێتەوە.

ڕۆژنامە ئەلبانی‌یەکان باس لەوەئەکەن کە چووە بۆ مزگەوتی (طباق) لەپایتەختی ئەلبانیا (تیرانا) بۆ زانیاری لەبارەی ئیمامی ئەو مزگەوتەو نوێژکەرانەوە و وەبۆ پرسیار لێکردنیان لەبارەی ئیسلامەوە و وەچۆنیەتی ڕۆژبەسەربردنی مسوڵمان، نووری خوایی چووەتەدڵی، دیارە کەسانی ئەم مزگەوتەش لەوانە (إمام الفیس) و (بلیدار مفتاری) جێگری مفتی ئەلبانیا بەخێر هاتنێکی گەرمیان لێی کردووە و وەڵامی تەواوی پرسیارەکانیان داوەتەوە لەبارەی ئوصولی ئیسلام و سروشت و دەوری بانگ دەر و وەبەهای ئیمان و ئەخلاق بەنیسبەت مسوڵمانانەوە .

لەماوەی ساڵ و نیوێکدا لەهاتوچۆی بەردەوامی قاباشی بۆ ئەم مزگەوتەو گوێگرتنی بەردەوامی لە وانەکان و هەروەها ووتاری هەینی، وای لێکرد کە سەرسوڕمانێکی یەکجار گەورەی هەبێت لەبارەی ئەوەی کەلە بارەی ئیسلامەوە ئیبیست بۆیە ئەمە کاریگەری باشی لەسەر دەرونی درووست کرد، کەبەتێپەڕبوونی کات زیاتر ئەبوو بۆیە لەپاش تێپەڕبوونی شەش مانگ بڕیاریدا کە التزام بکان بەڕێساکانی ئیسلامەوە و وە پارێزگاری لەنوێژەکانی بکات و لەکاتی خۆیدا بەئەنجامیان بگەیەنێت و بەکۆمەڵ و لەمزگەوت.

پاش ئەمانەش لە شوێنێکی چۆڵەوانیدا و لەبەردەم ئیمام دا توانی بەشێوەیەکی زۆر باش بانگ بدات بەجۆرێك کەئیمام تەوەقعی نەئەکرد و بەم جۆرە بەردەوام بوو تا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٥)ی کۆچی دا بۆیەکەم جار لەژیانیدا بەرۆژوو بوو.

قاباشی باسی لەوە کرد کەزۆر بەداخە بۆ ئەوەی کەچۆن هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی ناوخۆیی و جیهانی بەردەوام لەهەوڵی ناشرین کردنی ئەم ئاینە پیرۆزەدان و جەختی لەسەرئەوە کردەوە بۆزانینی ڕاستێتی ئەم دینە و بەدرۆخستنەوەی ئەو تاوانانەی کە دەدرێتەپاڵ ئەم دینە

هێندەبەسە کە مرۆڤ چەند کتێبێکی کەم بخوێنێتەوە یاخود پرسیار لە چەند کەسایەتی‌یەکی دیاری ئاینی بکەن .

هەروەها بەڵگەی ئەمەش بەوە ئەهێنێتەوە کەئەو لێبوردنە ئاینی یەی کەچەندین سەدە لەنێوان ڕڵەکانی ئەلبانیا هەبووە لەمسوڵمان و مەسیحی کاسۆلیك و ئرسۆدۆکسی چۆن فەزلەکەی بۆئیسلام دەگەڕێتەوە کە مسوڵمانان زیاتر لە ۷۰٪ ی گەلی ئەلبانی پێك ئەهێنن.

هەروەها لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: پێویست ناکات من زۆر ئیسلام بناسێنم بەڵام هێندە ئەڵێم هەروەك چۆن سەحرا پێویستی بەئاو هەیە ئاواش لەم سەردەمەی ئێستاماندا پێویستیمان بەئیسلام هەیە، ئێستا من لەئیسلام تێگەیشتم، بەڕاستی فیلمی خۆشەویستی پەرستش هۆکاری سەرەکی بوو بۆ ناسینی ئیسلام، ئێستا تێئەگەم کە ئیسلام چەندە بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگا گرنگە.

قاباشی لەساڵی (۱۹۹۷)دا خەڵاتی باشترین ئەکتەری لە مهرەجانی قاهرەی دەولی بۆ فیلم و شانۆگەری وەرگرت و ئەمەسەرباری ئەوەی کەچەندین خەڵات و مەدالیای‌تری جیهانی وەرگرتووە.

هەروەها باسی ئەوئەکات کە لەساڵ (۱۹٤۳)ز دا کاتێك شیوعیەکان حوکمیان لەئەلبانیا گرتەدەست بەسەرکردایەتی ئەنوەر خۆجە کە بەتەواوی هەوڵی ئەوەی ئەدا کە ئیسلام بسڕێتەوە بەپاڵپشتی سیستەمی ستالینی ئەوکات و، ئەنوەر خۆجە دیوارێکی ئاسنینی بەدەوری ئەلبانیادا کێشاو وای لێکرد کەلەهەموو جیهان دابڕێت، و ئەلبانیای لەتاکە دەوڵەتی ئیسلامی ئەوروپی یەوە کرد بەتاکە دەوڵەتی بێدینی نەك هەر لەئەوروپا بەتەنها بەڵکو لەهەموجیهانیشداو، دژی هەموو ئاینەکان ئەجەنگا و، لە ماوەی ئەو ساڵانەی حوکمیدا زۆر بڕیاری دا بەوەی کە نابێت ڕێساکانی ئاین بەهیچ جۆرێك جێ بەجێ بکرێت وهەروەها بە گۆڕانی مزگەوتەکان بە مۆزەخانە و مەخزەن و شوێنی بازرگانی و هەروەها بە شوێنی سەما کردن.

## بیست و چوار: ئەو ئەمریکی‌یەی لەپاڵ دیواری کەعبەدا مرد

کاتێك چوو بۆ عەرەبستانی سعودی هەرگیز لەخەیاڵیدا نەبوو کە بیر لەئیسلام بکاتەوە، ئەو فەرمانبەرێکی گەورەبوو لەکۆمپانیایەکی گەورەداو هەروەها شوێنێکی یەکجار دیاریشی هەبوو وە ژیانیشی پڕبوو لەکاری جدی و ڕێك و پێك و ئەمەش وای لێکردبوو کەچەندین بڕوانامەی بەدەست هێنابێت و هەروەها چەندین پیادا هەڵدان و وەسفیشی هەبێت لەلایەن لێپرسراوانی گەورەی کۆمپانیاکەی و هەروەها دەوڵەتەکەشی یەوە کە ئەمریکایە .خۆی لەم بارەیەوە ئەڵێت (پێش ئەوەی بێم بۆ ریاض لێپرسراوێکی گەورە بووم لە کۆمپانیایەکی ئەمریکیدا ئەوەی بیرم لێنەکردبێتەوە ئاین و دەق و ڕێساکانی بووە، ژیانم هەمووی ماددە و کارکردنێکی وەزیفی سەرکەوتووانە بووە و لەکاتی پشووەکان و ئیجازەکانیشم دا ئەچووم بۆ ڕابواردن و هەروەك زۆرێك لە ملیۆنەها مرۆڤ لەم جیهانەدا کە ژیانیان بەم جۆرە بەسەردەبەن.

چەندین مانگم بەسەربرد لەکارە نوێیەکەمدا لەشاری ریاض و بەڕاستی ڕۆچووبووم لەبارودۆخی کارەکەمدا و خەریکی ئەرکی خۆم بووم ، ئارەزووی یەکەمم بریتی بوو لەوەی کەسەرکەوتن بەدەست بهێنم تا زیاتر جێگای خۆم ڕۆشن بکەم لەو کۆمپانیایەی کارم تیادا دەکرد و جێگایەکی دیاریش لەناو سەرکەوتووەکانی وڵاتە گەورەکەمدا بۆ خۆم بگرم ئەو وڵاتەی کە کۆنترۆڵی هەموو جیهانی کردووە بە هێزی سەربازی خۆی و بەدەست خستنە ناوکارو باری خەڵکی وڵاتانی تر.

ڕۆژێکیان لەکاتی پشوودانا دانیشتبووم، بۆ یەکەم جار بینیم کە ژمارەیەکی زۆر لە سعودی و غەیرە سعودی ڕوونەکەنە مزگەوتێکی گەورەی نزیك بەو شوێنە، کە گوێم لەبانگ بوو هەستم بەشتێك کرد کەپێشتر هەستم پێی نەکردبوو، خۆشیەك بەلەشم دا هات کەناتوانرێ وەسف بکرێت، لێرەوە لەبیرم دا پرسیارێك درووست بوو: بۆچی ئەم خەڵکە بەم شێوەیە ئەکەن، چ شتێك پاڵ بەمانەوە ئەنێت بەم جۆرە ڕوو بکەنە مزگەوت، هەروەك ئەوەی کە پێش بڕکێ بکەن بۆ شوێنێك کەپارە و دیاری بەنرخیان بدەنێ.

ئەم پرسیارە کاریگەریەکی قووڵی لە دەروونمدا درووست کردو، پاڵی پێوەنام کە گرنگی بدەم بە موتابەعەکردنی زیاتر، کاتێك گوێم لێبوو ئیمامەکە وتی (السلام علیکم) سەیری دەرگای مزگەوتەکەم کرد بینیم کە نوێژکەرەکان بە هورووژم لەدەرگاکە دێنە دەرەوە و، بەجۆرێك

هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریاندا قسەی دەکرد کە ئەمە کاریگەری لەدەروونمدا درووست کردو، خۆمم بینی کەبەدەنگی بەرز ئەڵێم: ﴿ئای لەو سیستەمە جوان و گەورەیە﴾ ئەمەش سەرەتای چوونە ناوەوەم بوو بۆ ناو جیهانی جوانی ئیسلام و لەپاش ئەمەش هەموو شتێك فێربووم و وەڵامی ئارام بەخشم دەست کەوت بۆ زۆرێك لەو پرسیارانەی کەئەو رۆژە پرسیم و من تووڕەبووم، کاتێك لە بازارەکانی (ریاض)دا دەسوڕامەوە ئەمویست کە شتێك بکڕم بەپەلە بەڵام بینیم سەرجەم شوێنەکانی شت فرۆشتن دەرگاکانیان داخراون، هەرچەند هەوڵمدا کە خاوەنی یەکێك لەو شوێنانەی شتم لێی ئەکڕی ڕازیبکەم بەوەی کە بووەستێت تۆزێك و چاوەڕوان بکات بەڵام ئەو پشتی تێکردم و وتی إنشاءالله دوای نوێژ، لەوکاتەدا زۆر تووڕەبووم و وام ئەبینی کەئەوە کارێکی ناشرینە کەئەیکەن بەڵام پاش ئەوەی مسوڵمان بووم زانیم کە ئەوە چ پاڵنەرێکی دەروونی یە لەناو دەروونی ئەو بازرگانەدا کەپاڵی پێوەدەنێت بەو شێوەیەبێت.

ئەم ئەمریکی‌یە سپی پێستە کە خوای گەورە دڵی ڕووناك کردەوە بەنوری باوەڕ، وە هەستی بەشیرینی باوەڕکرد، دەستی کرد بە قسەکردن بۆ هاوڕێکانی لەبارەی ئەو هەستە هەڵچووە جوانەی کە لایەنەکانی دەروونی گرتۆتەوە، وەئەو خۆشی یەی کە هەرگیز لەپێشتردا هەستی پێنەکردووە، وەپاش تێپەڕبوونی دوومانگ بەسەر مسوڵمان بوونیدا ئاوەزووی سەردانی ماڵی خوای کرد بەمەبەستی عەمرەکردن و نوێژکردن ڕاستەوخۆ لەبەرامبەر کەعبەدا، وەکاتێك چوو دوو هاوڕێی کارەکەی کە سعودی بوون لەگەڵیا بوون، کە کاتێك گەیشتە کەعبە ئیدی تەواو ڕۆچوو لەبەندایەتی و بەرزکردنەوەی گیانی ڕۆحی خۆیدا و چەندین دیاردەی سەیریان لێبینی بوو لە بەندایەتی و دوعاکردن و گریان داو بە دوو هاوڕێکەی ووتبوو چەندین خەڵك لەم جیهانەدا هەیە کەلەم کەش و هەوا ڕۆحی‌یە گەورەیە بێبەشن. پێش نوێژی خەوتنان عەمرەکەی تەواو کردو زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی لەکاتی نوێژەکانیشدا لە ڕیزی یەکەمدا بێت، ئەم ئەمریکیە مسوڵمانە لەحاڵەتێکی زۆر عەجیبدا بوو لەخشوع.

یەکێك لەهاوەڵانی ئەڵێت: کاتێك هەستاینەوە لە تەحیاتی یەکەم هەڵنەستایەوە، واگومانم برد لەدەرەنجامی ڕۆچوونی لەخشوعدا لە حاڵەتی ڕۆحی گەورەدا بیری چۆتەوە هەستێتەوە، بۆیە دەستێکم دا لەسەری تا بەئاگای بێنمەوە کە هەستێتەوە بەڵام هیچ جووڵەیەکی نەکرد و، کاتێك چووینەوە رکوع بینیم بەلای ڕاستدا خەریکە دەکەوێت، ئیمام

سەلامی نەدایەوە تا تەواو بۆمان دەرکەوت کە گیانی سپاردووە، باشترین گیان دەرچون، ئەو رۆح و گیانەی کە پەیوەستیەکی زۆر گەورە و ڕاستگۆیانەی بەخوای گەورەوە هەبوو لەو شوێنە پاك و بەرزەدا، بەرز بووەوە بۆلای خوای گەورە. هاوڕێکەی دەڵێت: بەڕاستی هەستم بە فەزڵ و گەورەیی خواکرد بەسەر ئەو پیاوەوە خوارەحمی پێبکات، ئەو کات بەتەواوی هەستم کرد بە مانای قوڵی باشی کۆتایی، لەبەردەممدا بەڕاستی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ خۆی دەنواند کە ئەیفەرموو لەبارەی پیاوێکەوە کە کاردەکات وەك خەڵکی ئاگر تائەو کاتەی کە لەنێوانی ئەوو ئاگردا تەنها باڵێك دەمێنێت و پاشان کتابێکی پێش ئەکەوێت و دەست ئەکات بەکارکردن وەك خەڵکانی بەهەشت ئەچێتە بەهەشتەوە، منیش ئەم پیاوە ئەمریکیەم ناسی لەپێشدا کە بێباوەڕ بوو پێش ئەوەی کە مسوڵمان بێت و، کاتێك کە مسوڵمان بوو بینم چۆن دەم و چاوی گۆڕا و خشوعم تیادا بینی لەنوێژەکانیدا و بینیشم کە لە ساحەی حەرەمی مەکەی پیرۆزدا و، بینیم کە کفن کراو شارایەوە و لەمەکەش نێژدرا پاش ئەوەی ئیزنی کەس و کارەکەی وەرگیرا لەئەمریکا .

یەکێکیتر لەهاوڕێکانی دەڵێت: پاش ئەوەی کە ئەم هەواڵە لەلای هاوڕێکانی بڵاو بۆوە یەکێك لەهاوڕێ ئەمریکی یەکانی وتی من بەڕاستی بەغیلی بەو مردنە ئەبەم، وتم بۆچی: وتی چونکە ئەو لە گرنگترین جێگای ئەم سەرزەویەدا و لە گەورەترین شوێنێکدا مردووە کە گرنگترین شوێنە لە ترازووی دینی ئیسلامیدا.

# پێشەکی:

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهان و دروودو سەلامیش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یارویاوەران..

(اللهم لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك وعظيم سلطانك).. خوایە سوپاسوستایش هەر بۆ تۆیە لەسەر نیعمەتی ئیمان و ئیسلامەتی، لەسەر نیعمەتی بانگخوازی..

خوایە هاوکارمان بە بتوانین پەیامە پیرۆزەکەی تۆ بەباشترین شێوە بگەیەنین، لەم سەردەمەدا کەموسڵمانان بەگشتی غافڵ و دەست کورت و،نەیارانیشیان وریاودەوڵەمەندن و، بەملیارات دۆلار خەرجدەکەن لەپێناو دژایەتی ئاینەکەی تۆدا..

خوایە.. خۆت ئاگاداری کە هەرچی وتارو بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفیزۆن و نوسینمان هەیە لەبەر ڕەزامەندی تۆیە و زۆر خەمانە کەنیەتمان بۆ تۆ بێت.. بەفەزڵ و کەرەمی خۆت ئەم تواناو هەوڵە کەمە وەرگرە لێمان وبیکەرە مایەی بەهاری دڵ و پتەوی ئیمان و هاتنی زیاتر بەرەو ئیسلام..

خوایە گیان.. ئێمە بەم نابووتی وهیچ لەبارەنەبوویەی خۆمانەوە ئەمانەوێ شوێن پێی پێغەمبەران و بانگخوازانی بۆتۆ سوڵحاو هەڵگرین، ناویەناو سەرسم دەدەین، ڕێگرەکان زۆرن و کەسی زۆر بەهیمەتی ئەوێ کۆڵ نەداو سارد نەبێتەوەو ڕزگاری بێت.. خوایە دڵمان بەهاوکاری و پشتگیری تۆخۆشە، بەڕەحمی خۆت پشتمان بگرە، مەگەر خۆت نەت فەرموەوە: ﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ البقرة: ٢٥٧ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ﴾ الحج: ٣٨، ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ﴾ الطلاق: ٣.

خوایە ئێمە هەر لەسەرەتاوە زانیومانە کەتۆ کاری بەکۆمەڵت پێخۆشە بۆیە تواناکانمان لەگەڵ کۆمەڵێك موسڵماندا گونجاندووە تاخزمەتێکی باشتر بەئاینەکەت بکەین، خوایە ئەو هەوڵەمان لێوەرگرە و کەم وکوڕیمان بۆ بپۆشە.. چونکە ڕامان گەیاندووە کە(ئێمە نالێین بێ عەیبین، بەڵکو دەڵێین: خوایە ستری عیوبمان بکە)..

خوایە.. ئێمە ئەگەر زۆر باشیش نەبین ئەمانەوێ لەخەڵکی تر باشتر بین و پەروانەی دەوری چرای ئاینەکەت بین.

خوایە.. ئەگەر ئێمە ئەهل نەبین بۆ ڕەحمەتی تۆ، خۆ ڕەحمەتی تۆ هەموو شتێکی گرتۆتەوەو ئێمەش شتێکین لەو شتانەی کە بەدیهێنەریانیت، هەروەك فەرمووتە: ﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ الأعراف: ١٥٦ ﴿ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ ﴾ غافر: ٧.

خوایە بەڕەحم ومیهرەبانی خۆت ڕەحمان پێ بکە و بەبانگخوازی بمان ژیەنەو بەبانگخوازیش بمانمرێنەو لەگەڵ ڕەسولی نازداریشدا حەشرمان بکە.ئامین..

## فیتنەو تاقیکردنەوە :

ئیبن القیم کە بانگخوازێکی‌خواناسی‌خاوەن ئەزموونە دەڵێت:

(وكم من مغروربستر الله عليه، مفتون بثناء الجُهال عليه، مُلَبس عليه بقضاء الله حوائجه، وهو عند الله ملعون ولايشعر).. واتە: چەندها کەس هەیە لەخۆی بایی بووە بەوەی کەخوا گوناهەکانی پەردە پۆش کردووە، تووشی فیتنە بووە بە شیعرو شانامە وپیاهەڵدانی نەفامەکان بۆی، کارەکانی لێشێواوە و، خۆی بەباش دەزانێ بەوەی کە خوا پێویستی‌یەکانی بۆ جێبەجێ دەکات، لەڕاستیش دا ئەو کەسە لای خوا مەلعونە و بەخۆی نەزانیوە..

ئالێرەوە پێویستە لەسەر هەریەکەمان کە بە خۆماندا بچینەوە بەشیعرو شانامەی کەس نەخەڵەتێین چونکە ئەوان ڕووکەشمان دەبینن وخۆمان چاکتر دڵ و دەروون و ناخی خۆمان دەناسین، ئاشکراشە شیعرو شانامەی خەڵك هیچ سوودی نیە وخوای گەورە سەیری سەروسیما وجەستەی مرۆڤ ناکات بەڵکو سەیری دڵ وکردەوەکانی مرۆڤ دەکات هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( إن الله لاينظر الى صوركم ولا الى احسامكم ولكن ينظر الى قلوبكم)

ئاشکراشە کەخوا ئاگای لەخیانەتی چاوی مرۆڤە و ئەزانێ چی لە سنگیا شاردۆتەوە ﴿ يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ ﴾ غافر: ١٩، ﴿ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى ﴾ طه: ٧، واتە: خوا لەنهێنی و لەنهێنی نهێنی تریش ئاگادارە!!

کەسی وا هەیە ئەوەندە ڕاستگۆیە و بەدوای ڕاستگۆیی دا دەگەڕێت، تا لەلای خوا ناوی بەڕاستگۆ تۆمار دەکرێت، هی واش هەیە ئەوەندە درۆ دەکات وبەدوای درۆدا دەگەڕێت تالای خوا بەدرۆزن ناوی تۆمار دەکرێت..

## سەرەنریْ بوون و کەوتنە خوارەوە :

کەسی واهەیە لەدینداری دا دامەزراونیە و خۆشی نازانیْ خەریکی چیە ! ئەگەر جادەکەی پان بوو، هەموو شت بەدڵی ئەو بوو ئەوا لافی دینداری لیْدەدات و، ئەگەر تووشی ناڕەحەتی و بەڵاو موسیبەت و شەهەوات و شوبوهات بوو خۆی پیْ ناگیریْو بەسەرا دەکەویْتە خوارەوە، هەروەك کەسیْك کە لەسەر بەردیْکی مۆلەقی قەراغی چیایەیەك خواپەرستی بکات، ئەگەر تووشی خیْرو خۆشی بوو دامەزراو بیْت و ئەگەرتووشی ناخۆشی و فیتنەیەکش بوو بەسەرابکەویْتە خوارەوە:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةَ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴾ الحج: ١١ پیاو باشیْك دەڵیْت: دڵتان باوەك ئیسفنج نەبیْت، ئەگەر تووشی شوبوهات و گومانیْك بووهەڵی مژیْ،بەڵکو دڵتان باوەك شوشە بیْت کەنەك هەر ئەو شوبوهاتە نامژیْ بەڵکو پیْی پاك وڕوون دەبیْتەوە. دڵ کەپیْی دەوتریْت (قلب) لە(تقلب) وگۆڕین و ژیْرەو ژوور بوونەوە هاتووە، فیتنەو وبەڵاو موسیبەت کاری تیْدەکات، بۆیە حەزرەت ﷺ دوعای دەکرد کەخوا دڵی دامەزراو بکات لەسەر ئیمان وئیسلامەتی (اللهم يامقلب القلوب ثبت قلوبنا على دينك)..

ئەگەر ئەو پیْغەمبەری مەعصوم بیْت وابڵیْ ئەی من وتۆی داماوی گیرخواردوو بەدەست هەواو ئارەزوو شەیتانەوە ئەبیْ بڵیْین چی و چەندە بەکوڵ ودڵ بپاڕیْینەوە لەم سەردەمەدا کەلەهەموو لایەکەوە بەڵاوموسیبەت وفیتنە ئەباریْت!

ئەم سەردەمە سەردەمی داخورانی ئیمانە، چەند پیْویستە پاریْزگاری لەئیسلام وئیمانەکەمان بکەین و دڵمان چاکتر وباشتر بکەین، مەگەر ڕزگار بوون بە چاکی دڵمان نیە؟؟

﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ۝٨٨ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴾ الشعراء: ٨٨ – ٨٩.

## جۆرەكانی فیتنە:

١- فیتنەی ئافرەت، كە دەبێتە مایەی وروژاندنی لایەنی زایەندیو مرۆڤ لەڕێ لادەدات وتووشی هەڵەی دەكات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (ماتركت فتنة أضر علی الرجال من النساء) مسلم

٢- فیتنەی دونیا، بریق و باق وخۆشی دنیا فیتنەیە و مرۆڤ لەخشتە دەبات و بەرەو ڕێی حەرام و كۆكردنەوەی حەرامی دەبات و بەجۆرێك سەرقاڵی دەكات خوای لەبیر دەباتەوە، بۆیە پێغەمبەرﷺ دوعای دەكرد كەخوا لەفیتنەی دنیا بیپارێزێ (أعوذ بك من فتنة الدنیا..) بەئێمەش دەفەرموێت: ( فأتقوا الدنيا واتقوا النساء)..

٣- فیتنەی ماڵ وسامان: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ التغابن: ١٤ - ١٦.

واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەندێك لە هاوسەرانتان و منداڵانتان دوژمنتانن، جا ئێوەش وریابن خۆتان بپارێزن لێیان، جائەگەر چاوپۆشیان لێبكەن و لێیان ببورن ئەوە چاك بزانن كەخوا لێخۆشبووە و میهرەبانە.. دڵنیابن كەماڵ وسامان و ڕۆڵەكانتان فیتنەو تاقیكردنەوەن بۆتان، خوای گەورە پاداشتی گەورەی داناوە بۆ ئەوانەی كەلە فیتنەوتاقیكردنەوە دا سەركەوتوو دەبن)..

كەواتە هەتا دەتوانن پارێزكارو خواناس بن، گوێڕایەڵ وفەرمانبەرداربن، خێر وچاكەش بكەن، ئەوانە هەمووی بۆ خۆتان چاكە، جائەوەی خۆی بپارێزی لەچروكی ورژدی نەفسی خۆی، ئائەوانە هەرخۆیانن سەرفراز..

پارەوماڵ فیتنەیە هەر چەند نەبوونیش هەر فیتنەیە بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (اللهم إني أعوذُ بك من شرِّ فتنة الغنى، وأعوذبك من شرّ فتنة الفقر)..

٤- فیتنەی ئازاری دوژمنان:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِىَ فِى ٱللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ ۚ أَوَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِى صُدُورِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ العنكبوت: ١٠

واتە: هەندێك لەخەڵكی هەن كە دەڵێن: باوەڕمان بەخوا هێناوە، جاكاتێك یەكێك لەوانە لەپێناوی خوادا تووشی ئازارو ناخۆشی كرا بەرگەناگرێت و ئارامی نیە و وادەزانێت سزاو ئەشكەنجەی خەڵكی وەك سزای خوا وایەو، واز لە دین دێنێت، ئینجا ئەگەر پەروەردگارت سەركەوتنێكی بەخشی، دووڕووەكان بەگەرمی دەڵێن: خۆئێمەش بێ گومان لەگەڵتان بووین و هاوكارتان بووین، (بۆئەوەی بچنە پێشەوەو غەنیمەتیان دەست بكەوێت)، مەگەر خوا خۆی نازانێت چی لەدڵی هەموو خەڵكی جیهاندا هەیە؟! ﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ ﴾ العنكبوت: ١١، (سوێند بێت خوا ئاگادارە بەوانەی باوەڕیان هێناوە، هەروەها ئاگادارە بەوانەش كە دووڕوون و ڕاست ناكەن)..

بڕوادار دەبێت چاك بزانێ كەدوژمنان كۆڵ نادەن و واز ناهێنن لەئازاردانی خواناسان، چارەش تەنها دامەزراوی و ئارام گرتنە ﴿ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾ آل عمران: ١٨٦..

واتە: سوێند بێت بێگومان تاقی دەكرێنەوە لەماڵ و دارایی ونەفسی خۆشتاندا، هەروەها سوێند بێت لەوانەی پەڕاویان بۆ هاتووە لەپێش خۆتاندا ولەوانە كەموشریكن ئازارێكی زۆر دەبیستن، جا ئەگەر ئارام بگرن و پارێزكار بن، بەڕاستی ئەوە لە كارە پەسەند و گەورەكانە..

ئەم ئەزیەت و ئازاردانە دەگاتە كوشتن ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ﴾ البقرة: ٢١٧، واتە: بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا لەدین وەرتانگێڕن ئەگەر بۆیان

بکرێت .جائەوەی لە دین وەرگەڕێت کارەکانی پوچەڵ دەبێتەوە و بمرێت بەکافری دەمرێ و دۆزەخ جێیەتی ﴿ ..وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ البقرة: ٢١٧..

## ترسناکترین چەك ..

جاران فیرعون چەکی سیحری بەکاردەهێنا بۆ دەستەمۆکردنی خەڵك و لەخشتە بردن و ترساندنیان، قورئان دەفەرموێت ﴿قَالُوٓاْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴾ الأعراف: ١١١

حاشیەو دارودەستەکەی فیرعون پێیان وت: جاریٚ وازی لێبهێنە لەگەڵ براکەیداو چەند پیاوێك بنێرە لەشارەکەدا تاهەموو جادووگەران کۆبکەنەوە﴿ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴾ الأعراف: ١١٢ هەرچی جادووگەری زانا هەیە بیانهێنن بۆت.. بەڵێ لەرۆژی دیاری کراودا خەڵکی کۆکرانەوە و شارەزاترین جادووگەر هات، ویستیان خەڵکی بترسێنن و بیان تۆقێنن بۆیە جادوویەکی زۆر گەورەیان کرد ﴿ قَالَ أَلْقُوٓاْ ۖ فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴾ الأعراف: ١١٦..

سەرەنجام خوای گەورە موسای سەرخست بەسەریانا و جادووەکەیانی بەتاڵ کردەوە و عەساکەی مووسا بەئەمری خوا بوو بەمارێکی گەورە کە هەمووشتەکانی ئەوانی قوت دا، ئەوانیش کەمامۆستاو سەرمەشقن لەجادوودا زانیان کە ئەوەی مووسا جادوو نیە و موعجیزەیە بۆیە موسڵمانبوون و بێباکانە ڕوویەڕووی فیرعون بوونەوە و تەحەدایان کرد و وتیان: باکمان نیە لەکوشتن وهەڵواسین و ئێمە بڕوامان بە خوای تاك و تەنهای بەدیهێنەری بوونەوەر هێناوە و ئومێدەوارین لێمان خۆشبێت..

﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴾ الأعراف: ١١٧ - ١٢٢.

## ڕاگەیاندن چەکی سەردەمە:

دوژمنانی ئیسلام هەر لەکۆنەوە زانیویانە کە ڕاگەیاندن گەورەترین چەکە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانان و لە خشتە بردنیان، کاتی خۆی شاعیرێك بەقەدەر کەناڵێکی ئاسمانی دەوری هەبوو، بۆیە ئەوان زمانی شاعیرانیان خستبوە کارو (حەسان)یش بەرپەچی ئەدانەوەو هەڵی وەشانبوون..

جارێکیان شاعیرێك بەناوی (أعشی) لەیەمەنەوە هات موسڵمان ببێت، هەرئەوەندە کافران پێیان زانی چوونە لای و پێیان وت: تۆ نازانی ئەگەر موسڵمان بیت، ڕێی مەی خواردنەوەت لێ دەگرن، ئەویش وتی: مەی خواردنەوە شتێکی خراپە و مرۆڤ ئەقڵی لەدەست دەدات..

وتیان: باشە ئەی نازانی ڕێی زیناکردن و ڕابواردنت لێ دەگرن؟! وتی: من پیرم وکارم بەو شتانە نەماوە..

کەزانیان بەوانە ناگەڕێتەوە، وتیان ئەڵێی چی سەد وشترت بدەینێ و بگەڕێیتەوە، کابرا ئەوەندە (عرض)ە کە گەورە بوو ڕازی بوو، وشترەکانیان دایە و گەڕایەوە بەرەو یەمەن، کەنزیك یەمەن بووەوە لە وشترێکیان کەوتە خوارەوە و بەکافری مرد و خێری لە ماڵەکەی نەدی..

بەڕاستی سەیرە.. سەد وشتر یانی بەزمانی ئەمڕۆ سەد (مۆنیکا) کە کەم کەس هەیە خۆی لە بەردەمدا بگرێت.. باشە شاعیرێك ئەوەندە گرنگ بووە ئەوەندەی بدەنێ تابگەڕێتەوە؟! دیارە باش تێی گەیشتوون وچاك دەزانن کە ئەوە جۆرێکە لە ڕاگەیاندن و زۆر کاریگەری دەبێت..

ئەمەش تەسدیقی قورئانە کە دەفەرموێت کافران ماڵ وسامانیان کە بەنگی جەرگیانە سەرفی دەکەن لەپێناو دوور خستنەوەی خەڵکی لەدینی خوا، ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴾ الأنفال: ٣٦

هەروەها کافرەکان گەڕان بەدوای کەسێکدا کەدەم وزمانی خۆش بێت وهەقایەت خوان بێت، تا بەباس و هەقایەتەکانی خەڵکی بۆلای خۆی ڕاکێشێ ولەپێغەمبەر ﷺ بتەکنەوە، بۆ ئەمەش کەسێکیان دۆزیەوە لە (طائف) بەناوی (نضر کوڕی حارث) کەگەشتی کردبوو بۆ

وڵاتی فارس و ڕۆم و هەقایەت و سەرگوزەشتەی زۆری ئەزانی، قەناعەتیان پێکردو (إستیراد) یان کرد بۆ دژایەتی پێغەمبەر، لەسەرەتادا وەك هەموو شتێکی تازە پیلانەکەیان سەری گرت و بووە هەقایەت خوانی خەڵکی و دەیووت: هەقایەتەکانی من خۆشترن یان هی (محمد)، بەمەش کەسانی ساویلکە و نەفام ماوەیەك خەڵەتان و دواتر ڕاستیەکان بۆ خەڵکی دەرکەوت و دەوری نەما، بەڵام ئەوەندە ئازاری پێغەمبەری دا کەدواتر فەرمانی دا ئەگەر دەستی بە قوڵفی کەعبەشەوە بێت ئەبێ بکوژرێ !.

## ڕاگەیاندن لە زەمانی عەولەمەدا :

لەم زەمانی عەولەمەیەدا هیچ شتێك نیە کاریگەر بێت بە هێندەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، ڕۆژنامەو گۆڤارو تەلەفزیۆن و ڕادیۆو ئینتەرنێت وکەناڵە فەزاییەکان.. . ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕایگەیاند کە (وەکالەتی دەنگوباسی تەلەفزیۆنی سی‌ئێن ئێن ئەندامی ژمارە شەشە لە مەجلیسی ئەمن دا) .

ئێستا بە ئاسانی ئەتوانی ئەوەی دەتەوێت بیگەیەنی بە ملیۆنەها کەس لەرێی بەریدی ئەلەکترۆنی و، لەرێی چاوی‌کامێرایەکی بچوکەوە لەسەرتاسەری جیهاندا.

جاران دەیان وت: خەڵکی لەسەر ئاینی پاشاکانیانن، بەڵام ئەمڕۆ دنیا گۆڕدراوەو خەڵکی لەسەر ئاینی ڕاگەیاندنن، لەبەر ئەوەشە دەسەڵاتداران سوورن لەسەر دەستگرتن بەسەر هۆکارەکانی ڕاگەیاندن دا.. سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیلی پێشوو (شەمعون پێریز) باسی دەسەڵاتی ڕاگەیاندن دەکات و دەڵێت (ئێمە ناتوانین وڵاتانی عەرەبی بگۆڕین، ئەوەی دەتوانێت بیانگۆڕێت ئەو(صحن)ە بچکۆلەیەیەکە دایدەنێن بۆ وەرگرتنی کەناڵە ئاسمانیەکان)، هەروەها دەڵێت: (تواناکانی ڕاگەیاندن زیاترە لە تواناکانی سوپا، بۆیە ناتوانرێت پشتگوێ بخرێت، بڵاوکردنەوەی تاکە ڕووداوێك لەرێی تەلەفزیۆنەوە ڕەنگە هەڵایەکی گەورە بنێتەوە و کاریگەرێکی دەبێت لەسەر دوژمن کە بە جەنگێکی گەورە ڕەنگە نەتوانی ئەوەندە ئازاری بدەیت)..

بۆ نموونە شەهید کردنی محمد دورە لەپەنا باوکیا لەلایەن سەربازە جوولەکەکانەوەو بڵاوبوونەوەی لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا ڕووزەردی‌یەکی بۆ جوولەکە دروست کرد کەنەیدەزانی چۆن لێی دەرچێت..

## جوولەکە ڕاگەیاندنی هەر لەکۆنەوە بەکارهێناوە بۆ هێنانەدی مەرامەکانی بۆ نموونە :

١- لەسەدەیەك لەمەوبەردا هێرشێکی گەورەی ڕاگەیاندنی کردە سەر سولّتان عەبدول حەمیدو بە سولّتانی سوور ناویان دەبردو، بەدەولّەتی عوسمانیشیان دەوت پیاوە نەخۆشەکە و سەرەنجام پاش چەند ساڵێك لە پیلان گێڕان خەلافەتی ئیسلامیان ڕووخاند..

٢- لە ساڵی (١٩٨١)دا ڕۆژنامەی صندای تایم لەزمانی ڕۆژنامەنووسی جوولەکەی ئەمریکی سارە ئیهرمانەوە بڵاوی کردەوە کە دەزگای فشاری جوولەکە (ئیباك) لەڕێی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە توانی ڕای خەڵکی ئەمریکاو تووڕەییان لە بیست و چوار سەعات دا بگۆڕن، لەپاش ئەوەی کە ئیسرائیل ئەوەویەکەی عێراقی بۆردومان کرد[1]

٣- ئێستاش بەتەمان کەناڵێکی سێکسی بەزمانی عەرەبی بۆ وڵاتە عەرەبیەکان دابمەزرێنن و بەئاسانی لە هەموو شوێنێکەوە وەرگیرێت، تابەمەش لاوان سەرگەرمی فەسادو خراپە بن ونەچن بەرەو ئیمان و رابوونی ئیسلامی.

جوولەکە تەنها لە ئیسلام دەترسن و بە دێوێکی بەنجکراوی دەزانن و دەترسن بە ئاگا بێتەوە، کاتێك کارتەر لە هەڵبژاردندا سەرکەوت، رابینی جوولەکە پێی وت: بەڕاستی دێوەکەی ئیسلام خەریکە جوولەجوڵ بکات.. نیکسۆنی سەرۆکی ئەمریکاش وتی: ئێمە هەوڵی دواخستنی هوشیاربوونەوەی دێوەزمەی ئیسلام دەدەین !![2]

## جوولەکەکانی کەنەدا :

ژمارەی جوولەکە ئێستا لەکەنەدا نزیکەی (٢٦٠) هەزار کەسە و، پێش پەنجا ساڵ کەڕەنگە ژمارەیان چەند هەزارێك بوبێت، کۆنگرێسێکیان بۆ خۆیان دامەزراند بۆ ئەوەی چەترێك بێت بۆ کۆکردنەوەی جوولەکەکان و پارێزگاری کردنی بەرژەوەندیەکانیان، هەر لەزووەوە گرنگیان داوە بەبواری ڕاگەیاندن، بۆیە ئێستا بەو ژمارە کەمەیانەوە لە(٦٠٪) ی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان ولە (٣٠٪) ی کەناڵەکانی تەلەفیزیۆن بەدەست ئەوانەوەیە و بەکاری دێنن بۆ دژایەتی ئیسلام و پڕوپاگەندە بۆ خۆیان.. ڕۆژنامەی (ناشیۆناڵ پۆست) لە (٥٠٪)ی هی

---

١- (المجتمع).

٢- (المجتمع) ٣٠ /١٢/٢٠٠٦

ملیۆنەری جوولەکەی توندڕەو (ئیسرائیل ئیسار)ە ونیوەکەی تریشی هی کابرایەکی کەنەدی بەڕەگەز جوولەکەیە کەناوی (کورنیل بلانك)ە و لەئینگلتەرە دەژی.

موسڵمانانیش لەکەنەدا ئێستا (٥٠٠) هەزار کەس دەبن، لەچاو جوولەکەدا زۆر درەنگتر کۆنگریسی ئیسلامیان دروستکرد و هیچ ڕۆڵێکی ئەوتۆشیان نیە لەڕاگەیاندن دا، بەڵام هیوا وایە لەگەڵ ڕابوونی ئیسلامی سەرتاسەری جیهاندا ئەوانیش بکەونە خۆیان، بەتایبەت کەوا چاوەڕوان دەکرێت تاساڵی (٢٠١٠) زۆر زیادبکەن.. ئێستا (٢٥٠) قوتابخانەی ئیسلامیان هەیەو ڕەنگە بتوانن زیاتر کاریگەرلەسەرکۆمەڵگا دروستبکەن وبانگی ئیسلامی بدەن بەگوێی کەنەدی‌یەکاندا.

## دەستگرتنی جوولەکە بەسەر ڕاگەیاندندا:

شەبەکەی تەلەفیزیۆنی (سی ئێن ئێن، ئەی بی سی، سی بی ئێس، ئێن بی سی) کە ٩٥٪ ی دەنگوباسی جیهانی لەوانەوە بڵاودەبێتەوە، بەدەست جوولەکەوەیە. سێ دەزگای ڕۆژنامەی کاریگەریش لە ئەمریکادا بەدەست جوولەکەوەیە، وەك دەزگای نیویورك تایز کە سی‌وشەش ڕۆژنامە و دوانزە گۆڤار دەردەکات و سێ دەزگای چاپکردنیشی هەیە. هەروەها ئەم دەزگایە هەواڵی ڕۆژانە ئەدات بە پێنج سەد ڕۆژنامە.

ڕۆژنامەی وڵ ستریت جۆرناڵ کە سیاسیەکان وخاوەن کۆمپانیاکان و خەڵکانێکی زۆر دەیخوێننەوە نزیکەی دوو ملیۆنی ڕۆژانە لێدەردەچێت و بەدەست جوولەکەوەیە. زۆر گۆڤاری گرنگ وەك (تایم) کە هەفتانە نزیکەی چوار ملیۆنی لێدەردەچێت و(نیوزویك) کە (٢،٣) ملیۆنی لێچاپ دەکرێت بەهەمان شێوە بەدەست جوولەکەوەیە..

چەندەها دەزگای بڵاوکردنەوەی گەورەش بە دەستیانەوەیە وەك دەزگای تایم بۆکس و دەزگای ڕاندم هاوس.

---

١- (گۆڤاری المجتمع: ٢٦ /١١/٢٠٠٦) .

# لەموعجیزەکانی قورئان و فەرموودە

## ١- بگەڕێن بزانن بوونەوەر چۆن هاتووەتە بوون:

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا﴾ الكهف: ٥١. واتە: وەنەبێت من لەکاتی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا ئەوانم ئامادەکردبێت و ئاگاداربووبن لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و دروستبوونی خۆشیان، بەڕاستی من هەرگیز ئەوانەی خەڵك گومڕادەکەن نەمکردووە بەیارمەتیدەری خۆم وپشتم پێ نەبەستوون .تەنها ئەم ئایەتە بەسە کە بەڵگەبێت لە سەرئەوەی قورئان لەخواوەیە ئەگینا کێ لە دنیادا باسی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی ومرۆڤی کردووە و، چ کەسێك ئیشی بەوباسەیە، ئەمە باس و بابەتێکە کە کاری مرۆڤ نیە.. ئنجا مەبەستیشی ئەوەیە کەدروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و دروستکردنی مرۆڤ لەکاتێکدا بووە کەزانستەکەی لای خوایە و هەر خۆی دەزانێ چی کردووەو چۆنی کردووە، بۆیە ئەبێ هەر ئەو هەواڵمان بداتێ و هەرقسەو وتاری ئەویش ڕاستە لەو بارەیەوە..

بەڵام ئەوەی سەیرە لەئایەتێکی تردا هانمان دەدات کەبگەڕێین بەزەویدا و دیراسات و لێکۆڵینەوە بکەین تا بزانین چۆن بوونەوەر و ژیان دەستی پێکردووە، کەئەمیش وەك ئەوئایەتەی پێشوو ئەگەر لەخواوە نەبێت مرۆڤ چۆن دەتوانێت شتی وابڵێت ؟! ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ العنكبوت: ٢٠..

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: بگەڕێن بەزەویدا، تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستکراوانی بەدیهێناوە، لەوەودواش هەر خوا سەرلەنوێ دروستیان دەکاتەوە (بەشێوازی تر)، بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەمووشتێکدا هەیە.. هەواڵە زانستیەکان دەڵێن: زانایان دەیان ساڵە خەریکی گەڕانن و دیراسات و لێکۆڵینەوەی بەردەوامن و بەملیۆنەها دۆلاریان خەرج کردووە تا بزانن چۆن بوونەوەر بەدیهاتووە..

پانزەملیار ساڵ لەمەوبەر چۆن گەردێکی بێکۆتایی لەچرپیدا تەقیوەتەوەو خوای گەورە پێی فەرمووە: ببە (کُنْ)، بووە بەبوونەوەر (فکان)! زانایان توانیویانە گەردیلە بەش بکەن بۆ یەك لەسەر ملیارێکی مللیمەترێك بەخێراییەك کەدەگاتە یەك لەسەر ملیارێکی چرکەیەك، کەئەمەش نەمن و نەتۆ تێی ناگەین کە چۆن وایە؟!

لەنزیك شاری جنیف لە سویسرا لەژێر زەویدا تونێلێك هەیە کە درێژییەکەی (٢٧)کم، ئامێری زۆر زۆر پێشکەوتووی تیایە کە گەردیلە بەخێراییەکی زۆر زۆر دەدات بەیەکا، کە بەمەش وزەیەك دروست دەبێت و وزەش دەبێت بەماددە، کە ئەمەش یەکەم جارە بگەنە ئەوەی ووزە بکەن بەماددە.. واتە ئەو وزەیەی کە بەخێراییەك دەڕوات عەقل تەصەوری ناکات دەبێت بەماددە! کەئەمەش تەفسیری سەرەتای دروستبونی بوونەوەر دەکات، پاش تەقینەوە گەورەکە لەماوەیەکی زۆر کورت دا کەیەك لەسەر ملیارێکی چرکەیەکە ؟!

ئەم بنکەیە کە نۆزدە دەوڵەتی ئەوروپی تیایدا بەشدارە لەساڵی (١٩٥٢) ەوە وناوی زانستی دەزگاکەش (سیرن)ە کەکورتکراوەی فەرەنسی (المجلس الأوروبي لأبحاث النووية) یە.. کەلەمانگی شەشی (٢٠٠٦)دا کردیانەوە بۆ خەڵکی.. شایەنی باسە لە ساڵی (١٩٩٨) دا ڕێیان دا منداڵان سەیری بکەن و وێنەی بوونەوەر بکێشن بەخەیاڵی خۆیان لەسەرەتای دروست بوونیدا..

زانایان دەیانەوێت بزانن هەروەك لەکاتی تەقینەوەکەدا لەوێ بووبن کەچۆن ئەو تەقینەوە گەورەیە بووە؟! کەبەڕاستی ئەوەش داوای قورئانە لەزانایان و گەورەترین بەڵگەشە لەسەر ڕاستێتی قورئان..[1]

## ٢- ئاسمانی چنراو:

لەسەرەتای ساڵی (٢٠٠٦)دا زانایان بەهۆی (سوپەر کۆمپیوتەر)ەوە توانیان وێنەی سێ دووری (ثلاثية الأبعاد)ی بونەوەر بکێشن، ئەوەی سەرسوڕهێنەر بوو بینیان کە هەسارەکان (المجرات) هەروا لەبوونەوەردا دابەش نەبوون، بەڵکو ئەڵێی لەسەر دەزوون و دەزووەکانیش بەگرێ بەیەکەوە بەستراون وبەمەش ئەڵێی چنراون ! واتە چنینێکی (گەردوونی)هەیە ! پاش دیراساتی زۆر و لێکۆڵینەوەی تازە دەرکەوت کە ئەمە لەسەدا سەد ئەوەیەکە قورئان ناوی

---

١- (ڕۆژنامەی شرق الأوسط اللندنية).. www.٢٠at .com

دەبات بە (حُبك)و سوێندی پێدەخوات ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ﴾ الـذاريات: ٧، بەتایبەت کە زانایانی زمان وقسەی موفەسیرین جەخت دەکەنەسەر ئەوەی وشەی (ٱلْحُبُكِ) ئاماژەیە بۆ چنینێکی چاك وپتەو.. لەتەفسیری (طبري) دا هاتووە: (عیکرمة) دەڵێت: (ألم تر الى النساج إذا نسج الثوب فأجاد نسجه، يقال منه حبك الثوب يحبكهُ حبكاً، أي أجاد نسجه) .

إبن الأعرابی دەڵێت: (كل شيء أحكمته وأحسنت عمله فقد أحتبكته)، لە تەفسیری إبن كثير دا هاتووە کە (حسن البصري) دەڵێ: (ذَاتِ ٱلْحُبُكِ واته: حُبكت بالنجوم)

زانایانی زمانی عەرەبیش وەك (إبن منظور) لەمیعجەمەکەی (لسان العرب)و لە (معجم قاموس المحيط)یش داهاتووە کە وشەی (ٱلْحُبُكِ)، مەبەست چنینە بەچاکی و بەقایمی هەروەکو چنینی جل و بەرگ.

بەڵێ زانایان بۆیان دەرکەوت کە هەسارەکان ژمارەیان نزیکەی سەد ملیارەو هەر هەسارەیەکیش سەدان ملیار ئەستێرەی تیایە، زانایان ویستیان بزانن وێنەی بوونەوەر کە لە دەرەوە سەیری بکرێت چۆنە، هەموو ئەو داتایانەی کەپێویست بوون خستیانە کۆمپیوتەری سوپەرەوە گەیشتنە ئەوئەنجامەی کە دابەش بوونیان هەر ئەڵێی قوماشێکە وچنراوە.

سوپەر کۆمپیوتەریش ئەو کۆمپیوتەرەیە لەساڵی (٢٠٠٠ز) دا دروست کرا، کەخێرایی لە حساب کردندا زیاترە لە(١٢) تریلیۆن کرداری حسابی لەیەك چرکەدا و، ئەم جیهازەش کێشەکەی (سەد تەن)ە وکارەبایەکی دەوێت بۆ ئیش کردن کە (١،٢ میگاوات)ەو قەبارەکەشی بەهێندەی دوو یاریگای تێنس کردن دەبێت. بەڕێوەبەری کۆمپانیای (IBM) کە دروستی کردووە دەڵێت: ئەوەی ئەم کۆمپیوتەرە دەیکات لەیەك چرکەدا، مرۆڤ بەحاسیبە بە ملیۆنەها ساڵ ناتوانێت بیکات..

## گەورەترین کرداری حساب کردن:

زانایانی ئەڵمانیا و بەریتانیا وئەمریکا و کەنەدا دە ملیار زانیاریان خستە ئەو کۆمپیوتەرە مەزنەوە، کە لەبارەی نزیکەی (٢٠) ملیۆن هەسارەوە بوو، جێبەجێ کردنی کارەکەو ڕێکخستنی زانیاریەکان وکێشانی وێنەی بوونەوەر و دابەش بوونی هەسارەکان (٢٨) ڕۆژی خایاند ! .

پرۆفیسۆر کارلۆس فرینك لە زانكۆی (درهام) لە بەریتانیا كە بەڕێوەبەری ئەم بەرنامەیەیە دەڵێت: (ئەوە گەورەترین ئیشە تائێستا كردبێتمان، لەوانەشە گەورەترین بێت لە (الفیزیاء الحاسوبیة)دا، ئێستا ئێمە بۆیەكەم جار نوسخەیەكی (طبق الأصل)ی بوونەوەرمان لەبەردەستایە، كە لەبوونەوەری ڕاستەقینە دەچێت)..

ئەوەی كەدۆزیویانەتەوە لەداوی جاڵجاڵۆكە دەچێت و زانایان پێی دەڵێن (النسیج الكوني).. دەركەوت كەهەر تاڵێكی ئەو چنینە بە هەزاران هەسارەی لەسەر ڕیز بووە و زۆر چاك وقایم چنراوە.. ئەم زانایە دەڵێت (ئەم كۆمەڵە هەسارانە زۆر دەدرەوشێنەوەو زۆربەتوندوتۆڵی ڕیزكراون و دانراون و چنراون).

چەمكی (النسیج الكوني) چەمكێكی تازەیەو، زانایان كاتێ بەكاریان هێنا كە بینیان هەسارەكان ڕیز دەبن لەسەر تاڵی باریكی گەردوونی، كەئەڵێین تاڵی باریك لەچاو قیاساتیگەردوونی دا، ئەگەر ئەستێرەیەك لەفەزادا چەند چركەیەكی ڕووناكی درێژ ببێتەوە، ئەوە (خیطي كوني) ملیاران ساڵی ڕووناكی درێژ دەبێتەوە. ئەگەر (خیطي كوني) بچوك بكەینەوە تاتیرەكەی ببێ بەیەك مللیمەتر ئەوا درێژیەكەی سەدان مەتر دەبێت! كەواتە لەمەوەیە كەدەڵێین تاڵی باریكە، زۆرقایمەو بەهێزی گەردوونی ڕاكێشراون و توندكراون.. دیارە ئەم تاڵانەش كە ئەم گەردوونەی پێچنراوە زۆرگرنگە بۆیە پەروەردگار سوێندی پێدەخوات. زانایان دەستەواژەی قورئان بەكاردێنن كەئەویش وشەی ئینگلیزی (weave)ە كە مانای (حبك)ە لەعەرەبی دا..

ڕەنگە هەندێ بڵێن زانست لەگۆڕان و بەرەوپێش چوونی بەردەوامدایە و قورئان نەگۆڕە، چۆن دەبێت تەفسیری قورئان بەوەبكەین، لە وەڵام دا دەڵێین: هەندێ مەسەلەی زانستی كە بینراو هەقیقەتی دەركەوت ئیتر گومانی تیا نامێنێ، ئەوەتا زانای بەناوبانگ دكتۆر (بول میلر) جەخت دەكاتە سەر ئەو ڕێگایەی كە ئەستێرەكان لەسەری دەڕۆن و لەسەری كۆدەبنەوە تا(هەسارە) دروست بكەن، ئینجا باسی تاڵ (خیوط =filament) وگرێ (عُقد=nodes) و تۆڕ (نسیج= web) دەكات كە ئەوانەش هەمووی لەمانای (حبك)دا یەكدەگرنەوە..

ئەم زانا فەلەکی‌یە جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە ئەو چنینە وئەو تۆڕەی بینیوە و دەڵێت (ئێمە بەڕاستی گومانمان نیە لەوەدا کە بۆ یەکەم جارە ئەو تاڵی کەردوونی (خیط کـــوني) یـە دەبینین).

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەئەم قورئانە خوا ناردوویەتی‌و بـەعیلم وزانسـتی خۆی دایبەزاندووە ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ الفرقـــان: ٦...[1]

## ٣- گـرنـگـی رۆژوو:

قورئـانی پـیرۆز لـەبارەی ڕۆژووەوە دەفـەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ البقرة: ١٨٣..

ئەگەر ئەم قورئانە لەخواوە نەبێت، پێغەمبەر ﷺ چووزانێت کەلەسەر گەلانی پێشتریش فەرزکراوە، تەنها ئەم ئایەتە گەورەترین بەڵگەیە کەقورئان لەخواوەیە، تەوەتا ئێستا لەئەنجامی وەرگێڕانی پەڕاوی زاناو نووسەرە کۆنەکانەوە، دەرکەوتووە کە حوکەمای ئیغریق لەپێش هەزاران ساڵەوە باسی سوودی ڕۆژوویان کردووە لـەو دەستخەتە کۆنانـەدا کەئێسـتا لەمۆزەخانـە کـانی جیهاندان.. هەروەها پزیشکەکان لەکۆنەوە ئامۆژگاری نەخۆشەکانیان کردووە کە بـەڕۆژوو بـن، وەك (سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ و جالینۆس)، ئەمانـە جـەختیان کردۆتـە سـەر ئـەوەی کـە ڕۆژوو چارەسەرێکی سروشتی‌یە بۆ نەخۆشیەکان..

دکتۆرێکی بەناوبانگیش کـە بیانی‌یـە و موسـڵمانیش نیـە، بـەڕۆژوو نـەخۆش چارەسـەر دەکات و دەڵێت ( ڕۆژوو بریتی‌یە لە: کێشێکی کەمتر، پێستێکی جوانتر، نـەمانی ژەهـر، کـەم بوونەوەی ئازار و ئیلتیهابات، زیاد بـوونی تـەرکیز کـردن، هەسـت کـردن بـەوەی کـە کـارێکی گرنگت کردووە بۆ چاکردنی تەندروستیت) ئەمـەش قورئـان لـەم ئایەتـەدا ئامـاژەی پێـدەکات ﴿ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقـــرة: ١٨٤.. دیراسـەیەکی وڵاتـی نـەرویج ئاشکرای کرد کە ڕۆژوو چارەسەرێکی باشە بۆ ئیلتیهـابی جومگـەکان بەمـەرجێ چـوار هەفتـە بخایەنێت! ئەمەش هەر هەمان ئەو ماوەیەیە کە ئیسلام دایناوە..

---

١- (موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة)

هەروەها لەلێکۆلینەوەیەکدا کە لەسەر دەهەزار نەخۆش کرا لەولاتە بیانیەکان دەرکەوت کە ڕۆژوو باشە بۆ:

- فشاری بەرزی خوێن .
- نەخۆشی شەکرە .
- نەخۆشیەکانی کۆئەندامی هەناسەدان .
- نەخۆشیەکانی دڵ و ڕەق بونی بۆریە خوێنەکان .
- نەخۆشیەکانی جگەر .
- نەخۆشیەکانی پێست (ئەکزیما و حەساسیەت) .
- خۆپاراستن لەبەردی گورچیلە .
- نەخۆشی شێرپەنجە .

ئەمەبێجگە لەوەی کە چەکی ژمارە یەکە لە (طب وقائي) دا..

پێغەمبەرﷺ ئاماژە بەچەکی ڕۆژوو دەکات کەمرۆڤ دەتوانێ خۆی بپارێزێت و دەفەرموێت (الصومُ جُنَّة)، لە موعجەمی مختار الصحاح دا دەڵێ (الجُنَّة: هو السلاح الذي يستتر به المرء).. بەڵێ.. ڕۆژوو ئەو چەکەیە کە نابینرێت و کاری خۆی لەناوەوەی مرۆڤدا دەکات و دەیپارێزێت لە هێرشی میکرۆب و ڤایرۆسات، کە ئەم دەستەواژەیەش بەڕاستی موعجیزەیە پێغەمبەرﷺ بەکاری هێناوە.[1]

## ٤- شیردان بەمناڵ:

قورئانی پیرۆز داوا لەدایکان دەکات شیری خۆیان بدەن بە منداڵەکانیان، ئاشکرایە کە شیردانی سرووشتی زۆر بەسوودە بۆ چاك پێگەیشتنی مناڵ و دروستبوونی بەرگری تەواو لەلەشیدا، ماوەی شیردانەکەش قورئان دیاری دەکات بەدووساڵ ئەگەر دایکێك بیەوێ شیری تەواو بدات بە مناڵەکەی، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾ البقرة: ٢٣٣. لەئایەتەکەدا فەرمان دەدات بەدایکان کەدووساڵی تەواو شیر بدەن، ئەگەر بیانەوێ شیری تەواو بدەن..

---

١-(هەمان سەرچاوە)

ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە ئەگینا کێ چواردە سەدە لەمەوبەر توانیویەتی باسی ماوەی شیردانی تەواوو چاك بکات کەمنداڵ تیایدا لەشی بەرگری تەواو پەیدا دەکات، ئەوەتا لەم دواییەدا پاش هەزاران لێکۆڵینەوە و خەرج کردنی ملیۆنەها دۆلار ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە کۆنفرانسێکدا بەناوی (complementary feeding) لە ساڵی (٢٠٠١) دا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەدووساڵی یەکەمی تەمەنی منداڵ ماوەیەکی زۆر گرنگە کەتیایدا بینای گەشەی خۆی دەکات و شیرخواردنی مناڵیش لەم ماوەیەدا زۆر گرنگە و هیچ خواردنێك نیە بتوانێ جێگای ئەو شیرە بگرێتەوە.. لێکۆڵینەوەکانیش ئەوەیان سەلماندووە کەدایك کاتێك دووساڵ شیردەدات بەمنداڵەکەی دوور دەبێت لەمەترسی شێر پەنجەی هێلکەدان، بەڕێژەی یەك لەسەر سێ...

هەروەها لێکۆڵینەوەکان کە لە ٣٠ دەوڵەت دا کراوە دەریان خستووە کە ئەو دایکەی شیر دەدات بەمنداڵەکەی کەمتر تووشی شێرپەنجەی مەمك ڕەحم دەبێت.. هەروەها شیردان یارمەتی دایك دەدات کەقەڵەو نەبێت و ئینجا وەك (مسکن) وایەو یارمەتی دایك و مناڵیش دەدات لەسەر هێوربوونەوەو خەوتن.. ئەمە بێجگە لەوەی شیردانی سروشتی لەبارەی ئابووریەوە زۆر گرنگە، ئەوەتا لە ئەمریکا (٣٦٠٠) ملیۆن دۆلار بۆ شیری مناڵ ساڵانە خەرج دەکرێ، ئەگەر شیری دایك بدرێت بەمناڵ ئەوبڕەپارەیە دەگەڕێتەوە.[١]

## ٥- پۆلێن کردنی ئاو:

قورئانی پیرۆز ئاوی سەر زەوی پۆلێن دەکات بەئاوی پاکی دڵۆپێنراوی بێ تامی پاکەرەوە کەئاوی بارانە و وشەی (طهورا) ی بۆ بەکار دەهێنێت، کە چەند سەدەیەك لەمەوبەر کەژینگە خاوێنتربوو ئاوی باراناوپاکتربوو، قورئان بۆ ئەم جۆری یەکەمە دەفەرموێت ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا﴾ الفرقان: ٤٨..

ئاشکرایەپزیشکەکان ئاوی(مقطر) بەکاردەهێنن بۆ پاکردنەوەی برین و شتی تر.. بەڵام دوایی کەدەچێتە ناو زەویەوە کانزا و غازاتی تیا دەتوێتەوە تام پەیدا دەکات و قورئان بە(عذباً

١- هەمان سەرچاوە.

فراتا) ناوی دەبات و دەفەرموێت ﴿ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴾ المرسلات: ٢٧. (فرات) بە واتای (الماء المستساغ المذاق) ئەو ئاوەی کە تامەکەی خۆشە و مرۆڤ حەز بەخواردنەوەی دەکات..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ﴾ فاطر: ١٢، واتە: ڕووبارو دەریا وەکو یەك نین، یەکێکیان ئاوی سازگارو خۆش، ئەوی تریان زۆر سوێرە.. (لە زمانی عەرەبیدا کە دەڵێ (بحران) لێرەدا بەناوی گەورەکەوە کە دەریایە بچوکەکەش ناو دەبات کە ڕووبارە)..

ئنجا لێرەدا بۆ دەریاکە نافەرموێ خوێی تیایە(ملــح)، بەڵکو دەفەرموێ خوێی زۆرە (ملح اجاج)، چونکە لەناوی ڕووباریش دا بڕێکی کەم خوێ هەیە کە هەستی پێناکرێت، بەڵام لەدەریا دا زۆر زۆرە تاوەکو ئاوی دەریاکان بۆگەن نەکەن و مرۆڤ بتوانێ لەسەر زەوی بژی..

چەندە تەعبیراتی قورئان وردە، دیارە کەئەمەش موعجیزەیە ئەگینا کەسێکی نەخوێندەواری چواردە سەدە لەمەو بەر چی داوە لەم پۆلێن کردنەی ئاو ئاوا بەوردی، ئەمەش کەهاتووە لەقورئاندا بەتەنها بەسە کە بەڵگەبێت لەسەر ڕاستی قورئان[1]..

## ٦- گرنگی سیواك:

پێغەمبەرﷺ لەژیانی پڕ خێرو بەرەکەتیدا گرنگی زۆری داوە بەدەم ودان پاکردنەوە بەسیواك و زۆر فەرموودەش لەبارەیەوە هەیە کەدەفەرموێت: (السواك مطهرة للفم مرضاة للرب) .

سیواك دەم ودان پاکژدەکاتومایەیڕەزامەندی پەروەردگارە، یان دەفەرموێت (أكثرت عليكم في السواك) واتە: زۆر جەختم کردۆتە سەر سیواك کەبەکاری بهێنن..

باشە ئەگەر ئەم ئاینە پایەبەرزە نەبێت، کەسێکی نەخوێندەواری چواردە سەدە کاری چییە بەگرنگی سیواك کە مایەی ڕەزامەندی خوایە؟ بەتایبەت کە لەم سەدانەی دواییدا گرنگی سیواك دەرکەوت لە ئەنجامی پێشکەوتنی زانست و لێکۆڵینەوەوتاقیکردنەوەی زۆرەوە.. گۆڤاری (ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات) لەژمارەی چواری ساڵی (١٩٦١ز)دا وتارێکی زانای بەناوبانگ (روادارت) ی بڵاو کردەوە کە بەڕێوەبەری پەیمانگای جراپیم بوو لەزانکۆی روستۆك، کە تیایدا

---

١- هەمان سەرچاوە

دەڵێت: لەبارەی سیواکەوە کە عەرەبەکان وەك فلچەی دان بەکاریان هێناوە لەپەڕاوی ئەو گەشتیارانەی کەچونەتە نیوەدوورگەی عەرەب خوێندمەوە، ئەو گەشتیارانە بەگاڵتە پێکردنەوە وەك نموونەیەکی دواکەتوویی ئەو گەلانە باسی سیواك کردنیان کردبوو، کە چۆن ئەمە لەسەدەی بیستدا دەگونجێت، بەڵام من بیرم کردەوە، وتم: کێ دەڵێت حەقیقەتێکی زانستی لەپشت ئەم مەسەلەیەوە نیە؟ یەکسەر دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوە لەسەر سیواك، داری سیواکەکەم هاڕی و تەڕم کرد بە ئاو ئنجا خستمە سەر کێڵگەیەکی جراپیم لەتاقیگەدا، بۆم دەرکەوت کە دەوری (پەنسلین) دەبینێت..

پزیشکێکی تریش بەناوی (دکتۆر فرید فیستر) دەڵێت: حەوت ساڵە من تەنها سیواك بەکار دێنم بۆ دەم ودانم.

بەڕاستی ئەمە موعجیزەیە ئەگینا پێغەمبەرﷺ ئەمەی لەکوێ هێنا، بۆچی بەردەوام سیواکی دەکرد بۆ نوێژەکان و کاتێ دەهاتەوەماڵەوە، تەنانەت لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا وپێش ئەوەی چاولێك بنێ سیواکی کرد ئنجا گیانی پیرۆزی سپارد..[1]

## مسوڵمانبوونی بەردەوام

### ١- بانگخوازی بەرازیلی ئەنطوان:

لە ساڵی (١٩٧١) لەدایك بووە و خەڵکی ویلایەتی (ساوپاولۆ یە لەبەرازیل، بەمناڵی لەقوتابخانەی کاسۆلیکی دەیخوێندو باوکیحەزی دەکرد ببێتە قەشە، کەچی کەچووە زانکۆ، بەهۆی ئەوەی کە لەو کاتەدا مارکسیەت بەزانکۆکاندا بلاودەبۆوە بووە مارکسی و، بووە ئەندامێکی چالاك لەحیزبی شیوعی بەرازیلیدا و خۆی بە پاڵپشت و هەق سێنی چینی چەوساوە دەزانی .

ئەنطوان بلاوکراوەی زۆری مارکس و لینین و ستالینی بە خوێندنگاکاندا بلاودەکردەوە و لەبەر چالاکی زۆری بوو بەسەرۆکی بەشی ڕۆشنبیری و زمان حاڵی حیزبی شیوعی لە دوو دواناوەندی گەورەدا و هەمیشە دەیوت: دڵمان کە سوورە، مانای ئەوەیە مرۆڤ بەفیترەت شیوعییە؟!

---

١- هەمان سەرچاوە .

لەکۆتایی هەشتاکاندا کە حیزبی شیوعی بەرازیلی (باولوفریری) کاندید کرد بۆسەرۆك کۆماری، ئەنطوان لەبەرئەوەی کە بڕوایەکی پتەوی هەبوو بەمارکسیەت، ئەرکێکی زۆری گرتە ئەستۆی خۆی بۆ هەڵمەتی هەڵبژاردنەکە .

ئەنطوان دەڵێت ( لەگەڵ هاوەڵێکمدا گوێمان لە گۆرانیەکانی (عبدالحلیم، أم كلثوم) دەگرت، بۆ ئەوەی لێیان تێبگەم بڕیارمدا فێری زمانی عەرەبی ببم و، داوام لەهاوەڵەکەشم کرد کە هاوکاریم بکات، ئەویش بردمی بۆ مزگەوتێکی شاری (تاوبتە)، ئیمامی مزگەوت کە زۆر بەشەخسیەت بوو ناوی (محمد حسان عجاج) بوو، پێشوازی لێکردین، لەوەوە ناسیم و سەردانم کرد تافێری عەرەبی ببم.. لەم کەش وهەوایەدا کەوتمە هەڵسەنگاندنی مەسیحیەت و مارکسیەت و ئیسلام، تا بەقەناعەتەوە ئیسلامم هەڵبژارد کە زۆر ئاسانەوکەی بتەوێت دەتوانی لەخوای خۆت بپاڕێیتەوە و پێویستت بەقەشەو کاهین نیە تا لەبەردەمیا دان بەهەڵەکانتدا بنێیت، قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ البقرة: ١٨٦..

بەڵێ بەقەناعەتەوە شایەتمانم هێناو بەشداریم کرد لە خولێکی زانستە شەرعیەکاندا کە وڵاتی سعودیە کردبویەوە لە بەرازیل، پاشان چووم بۆ زانکۆی ئیسلامی لەمەدینە تا بەچاکی لەئیسلام شارەزابېم، هەشت ساڵ لە وڵاتی سعودیە مامەوە و پاشان گەڕامەوە بەرازیل بۆ بانگەوازکردن بۆ ئاینی بەرزی پیرۆزی ئیسلام.. کەوتمە وتاردان لەقوتابخانە وزانکۆ و مزگەوتەکاندا، تەنانەت لەپەرستگای جولەکەو گاورەکانیش قسەم دەکردو، لە یانەی ماسۆنیەکانیش چەند جار وتارم داوە، ئەمەش بەهۆی ئەو ئازادی بیروباوەڕەی کەلەیاسای بەرازیلدا هەیە...

شایانی باسە ئەنگوان پاش موسڵمانبوونی ناوی خۆی گۆڕی بۆ(انطوان علي الأشقر) و لەسەر تۆڕی ئینتەرنێتیش هەوڵێکیزۆردەدات بۆبڵاوکردنەوەی ئیسلام..[1]

---

١- هەمان سەرچاوە.

## ٤- گەڕانەوەی عەمر خالید:

خوای گەورە (الشكور)ە، واتە ئاگای لەکاروکردەوەکانە و لەسەر کاروکردەوەی چاکیش سوپاست دەکات، هەمیشە لەگەڵ ئەم سیفەتەیدا لە قورئاندا سیفەتی (علیم)یش هاتووە، (وكان الله شاكراً عليماً) تا بڕوادار دڵنیا بێت هەر کارێك بکات خوا ئاگادارێتی وبەزایە ناچێت ...

بۆ نموونە: تۆ دەچیتە ژووری باوکتەوە، باوکت نوستووە و لەسەر نووکی پێ دەڕۆیت بەئەسپایی و بەبێ دەنگ تا خەبەری نەبێتەوە و ئیزعاجی نەکەیت، دیارە ئەو بەم کارەت نازانێ تا سوپاست بکات..

دەچیت بۆ لای نەخۆشێك خەوتووە، حەزدەکەیت کەدوایی هەستا پێی بڵێن کە تۆ سەردانت کردووە!

ئەمە بۆ هەموو کەس وایە، تەنها خوای زانای بە دەسەڵات نەبێت کەهیچی لەم بوونەوەرەدا لێ ون نابێت و چاودێر و ئاگادارە بەهەموو شتێکی ئەم بوونەوەرە ورد بێت یان درشت !

خوای گەورە هانمان دەدات چاکەکاربین ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ الحج: ٧٧ کەواتە عیبادەتەکان وچاکەخوازی و چاکەکاری مایەی سەرفرازی یە..

کاتی خۆی لە مەککە، عوسمانی کوڕی تەڵحە، بازرگانێکی سەرکەوتوو بوو، کەسێکی ناودارو دەوڵەمەند بوو، بەڵام دژایەتی ئیسلامی دەکرد،تاکاتی هیجرەت هات و ئوم سەلەمە کەسوکارەکەی نەیانهێشت لەگەڵ مێردەکەیدا کۆچ بکات، تاقە کوڕێکیشی هەبوو، کەسوکاری مێردەکەی لێیان سەندەوەو بردیانە لای خۆیان، ئەم ئافرەتە یەك ساڵ لە مەککەدا مایەوە، مێردەکەی لە مەدینەو منداڵەکەی لەماڵە خەزورانی و، خۆشی لای کەس و کاری بەتەنها.

پاش مەینەتی و خەم و پەژارەی ئەو ماوە زۆرە بەزەییان پیاهاتەوەو ڕێیان دا بەخۆی و منداڵەکەیەوە کۆچ بکات، بەتاقی تەنها ڕێی مەدینەی گرتەبەر کە (٤٠٠) کم بوو، لەڕێگا (عوسمانی کوڕی تەڵحە) —کە هێشتا کافر بوو- بینی و کەزانی بەتەنها کۆچ دەکات، غیرەتی

قبوڵی نەکرد و سواری حوشترەکەی خۆی کردو بووە دەلیلی تا گەیاندیە نزیك مەدینە، ئوم سەلەمە زۆر باسی جوامێری و پیاوەتی (عوسمان) دەکات کە ئەو چاکە گەورەیەی لەگەڵ کرد..

پاش ماوەیەك (عوسمان) یش موسڵمان بوو، هاوەڵان دەڵێن: بەخوا هیچ هۆکارێك نابینین بۆ هیدایەتی عوسمان تەنها ئەو پیاوەتی و چاکەیەی نەبێت کەلەگەڵ ئوم سەلەمە کردی و خوای گەورەش پاداشتی دایەوە لەسەری ...

لەفەرمودەیەکی(مسلم)دا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: پیاوێك بەبیابانێکدا دەڕۆیشت هەورێکی بینی لە ژوورسەریەوەو گوێی لەدەنگێکیش بووکە وتی :هەورەکە بڕۆ زەوی فلان ئاو بدە !

پاشان هەورەکە دەبینێ لە دوورەوە لەسەر باخێك دەبارێت، ئەمیش دەچێتە لای خاوەن باخەکەو لێی دەپرسێت: پێم بڵێ تۆ چی دەکەیت لەم باخەت دا ... ئەویش دەڵێت: بەروبوومی باخەکەم دەکەم بە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ ماڵ و منالم، بەشێکیشی بۆ هەژاران، بەشێکیشی لەباخەکەدا سەرف دەکەمەوە، ئەویش وتی: دیارە خوای گەورە پاداشتت ئەداتەوە و ئاگای لە کارەکانتە، بۆیە ئاوا دەروی خێرت لێ دەکاتەوە و بارانت بەتایبەت بۆ دەبارێنێ !

عەمر خالیدیش لەم بوارەدا باسی ئەزموونی خۆی دەکات و دەڵێت: من پابەندنەبووم بەئیسلامەوە، تارۆژێك چووم بۆ (بورسعید)، لە شەقامێکدا پیاوێکی کەم ئەندامم بینی کەلەسەر کورسی کەم ئەندامەکان بوو، خۆی بۆ نەگیرابووەوە و کورسی‌یەکەی دابووی بە قەراغی شۆستەکەدا و کەوتبووە خوارەوە و کەس نەدەچوو بەلایدا، من زۆر بەزەییم پیا هاتەوەو چووم باوەشم پیا کرد و هەڵم ساندەوەو خستمەوە سەر کورسیەکەی و دڵم دایەوە..

من ئەمەم بۆ خوا کرد، دیارە خواش (شاکر علیم)ە، خوا ئاگادارە پاش یەك هەفتە بەیانی‌یەك لەخەو هەستام و دەستنوێژم شت و نوێژی بەیانیم کرد، هیچ هۆکارێکیش نابینم بۆ ئەو هیدایەتە، تەنها ئەوە نەبێت کە بەرامبەر ئەو کەم ئەندامە کردم !

بەڵێ.. عەمر خالید خوا هیدایەتی‌داو، کەوتە بانگەوازکردن و کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر خەڵکی، دیارە دەسەڵاتداران ئەمەیان پێ خۆش نەبوو، بۆیە هەڕەشەیان لێکرد و داوایان لێکرد کە بەپەلە میسر بەجێ بهێڵێ..

عەمر خالید لەم بارەیەوە دەڵێت: لە ڕەمەزانی ساڵی (٢٠٠٢) دا کە لەمیسر زۆریان بۆ هێنام و دەریان کردم، تەنها دەم توانی بچم بۆ وڵاتی سعودیە بۆ عەمرە، لەکاتی عەمرەکردندا، لەتەوافی یەکەمی کەعبەی ماڵی خوادا زۆر پاڕامەوە و وتم: خوایە دڵشکاوم، فریام بکەوە و دڵشکاویەکەم بۆ چارەسەر بکە، خوا ئاگادارە لەتەوافی دووەمدا، پیاوێك لە تەنیشتمەوە پێی وتم: ئەوە تۆ لەکوێی؟! من ژێر ئەرزت بەدوادا دەگەڕێم و تۆ لەسەر ئەرزیت؟! وتم: بۆچی؟ وتی: پێغەمبەرﷺ هاتووەتە خەوم کە پێت ڕابگەیەنم کە لەسەر هەقیو ئارام بگرەو بۆ ماوەی ساڵێك تووشی ناخۆشی دەبیت و پاشان دەرووت لێدەکرێتەوە! ئیتر لە خۆشیا زۆر گریام، پاش ئەوەش کە چوومە دەرەوەی حەرەم پیاوباشێکی تر تەلەفونی بۆکردم و وتی: فیزەی لوبنانمان بۆ وەرگرتووی دەتوانی بچیت بۆ ئەوێ..[1]

کە لەمیسر دەریان کردم ئەوەندە پەلەیان لێکردم بواریان نەدام تەلەفونێك بکەم بۆ باوکم، بۆیە لەمەککەوە پەیوەندیم پێوەکرد و هەواڵم دایە، باوکم گریاو زۆری پێناخۆش بوو، منیش زۆر کاری تێکردم و خەریك بوو ڕازی بم بەمەرجی حکومەت و ئیتر بێ دەنگ دانیشم؟! کەچی باوکم تەلەفونی کردەوە و وتی: کوڕم سووربە لەسەر مەوقیفی خۆت، ئەوە ڕێبازی پێغەمبەرانە و ئاساییە کە تووشی ئەو شتانە ببیت.

لەلوبنانیش لەگەڵ برادەرێکدا لەژوورێکدا دەژیاین و زۆر شەو بەیەکەوە لەتاو بێ وەزعیمان دەگریاین، زۆر دوعامان کرد تاخوا دەرگای خێری بەڕوومان دا کردەوە ...

بەڵێ.. بەڕاستی هەر وایە هەرکەس بۆ خوا بێت خواش بۆ ئەوە، دەرگا لەعەمر خالید کرایەوە بەجۆرێك کەبەهۆی بەرنامەکانی کەناڵە فەزاییەکانەوە بووە کەسایەتیەکی جیهانی، زیاتر لە ملیۆن و نیوێك لاو لەسەرتاسەری جیهانەوە بەشداریان کرد لە (صناع الحیاة)دا، کەبە هەمووان ژیان بنیات بنێینەوە و وڵات بەرەو پێش بەرن نەك هەر موسڵمان بەڵکو لاوە مەسیحیەکانیش بوون بەشوێنکەوتەی، ئەمە وای کرد کەڕێکخراوە نێو دەوڵەتییەکان وەك مونەزەمەی صحەی عالەمی هاوکاری بکەن بۆ کارە مەزنەکانی لە ڕووبەڕووبوونەوەی تلیاك و جگەرە و دیاردە نامۆکانی ناو کۆمەڵ. باشە ئەگەر ڕووناکی خۆر بەبێژنگ بەری نەگیرێ، ئەی بەچی دەتوانرێ و کێ دەتوانێ ڕێ لە نووری ئیسلام بگرێ، لەکاتێکدا کەخوای گەورەی

---

١- (ل:٦٢ بەناوی تۆوە دەژین/عەمر خالید) .

بالادەست دەیەوێت بگاتە سەرجەم مرۆڤایەتی؟! ﴿ يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾ التوبة: ٣٢.

## ٣- قورئان دڵان کەمەندێش دەکات:

خوای گەورە پەیمانی داوە کەقورئان بپارێزێ، ئەوەتا پاش چواردە سەدە ئەنجامی ئەو پەیمانە دەبینین کە قورئان پارێزراوە، لەپەڕاودا، لەدڵاندا، لەپەڕەکانی ئەنتەرنێت دا، قورئان تاکە پەڕاوە کە ملیۆنەها کەس لەبەریان کردووە، نەك ئەوانەی کە زمانی عەرەبی دەزانن، تەنانەت ئەوانەش کەهیچ لەزمانی عەرەبی نازانن، هەر ئەوانە نا کە خوێندەوارن بەڵکو ئەوانەش کە نەخوێندەوارن بەچاکی لەبەریان کردووە، جا نەك هەرکەسی خاوەن تەمەن وبالغ بەڵکو منداڵی حەوت هەشتساڵیش توانیویەتی هەمووی لەبەر بکات!! ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ القمر: ١٧ .

لەبەریتانیا زیاتر لەسەد هەزار منداڵی موسڵمان دوای تەواوبوونی خوێندنی ڕۆژانەی قوتابخانەیان ڕوودەکەنە حەوت سەدمزگەوت بۆ فێربوونی قورئان ولەبەر کردنی،ئەمە بێجگە لەوەی کە زیاترلە سەد و بیست قوتابخانەی ئیسلامی سەربەخۆ هەیە کە منداڵان فێری قورئان و ئیسلام دەکەن..

ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە ئەوروپا بۆ خۆی خزمەتی قورئانی کردووە، ئەوەتا لەساڵی (١٥٣٧)ی زاینیدا یەکەم نوسخە ی قورئان چاپ کرا لەشاری ڤینیسیا (البندقیة) لەئیتاڵیا، کە ئەو نوسخەیەش لەیەکێ لەکەنیسەکانی ئیتاڵیادا ماوەو پارێزراوە. پاش ئەوە چاپێکی چاکی تری قورئان بۆ یەکەم جار لەشاری (هامبۆرگ)ی ئەڵمانیا کرا لەساڵی (١٦٩٤) زاییندا، ئینجا شاژنی ڕووسیا لەساڵی (١٧٨٧) دا یارمەتی چاپکردنی دا، پاشان لەساڵی (١٨٧٧) زایین دا لە (ئاستانە) لە دەوڵەتی عوسمانی چاپکرا.. ئێستاش لەوڵاتی سعودیە لەشاری مەدینە لە کۆمەڵگەی شا فەهد کە لە ساڵی (١٩٨٤) دا دامەزراوە ساڵی زیاتر لە دە ملیۆن قورئان چاپ دەکرێ، بەڵام ئاخۆ دوژمنان ئاگایان لەمەنەبێ و هەروا دانیشتبن ؟نەخێر !

لەبەریتانیا ئێستا دەیانەوێت بەربەست دروست بکەن لەرێی قوتابخانەکانی سەر بەمزگەوتەکان، گوایە منداڵان باش مامەڵەیان لەگەڵدا ناکرێت؟! لەپاکستانیش کە دەهەزار قوتابخانە هەیە و (١،٧) ملیۆن قوتابیان هەیە، میری هەڕەشەی ئەوە دەکات هەر قوتابخانەیەك

لای حکومەت خۆی تۆمار نەکات دادەخرێت ... ئەمریکاش دیارە لەپشت ئەم کارەوەیە و بڕی (١٠٠) ملیۆن دۆلاری بۆپاکستان داناوە کە بەکاری بهێنێت بۆ ڕێگرتن لە قوتابخانە ئیسلامیەکان ...

شایەنی باسە لە پاکستان هەر سێ ماڵ و حافزێکی قورئانی تیایە، کە دەکاتە نزیکەی حەوت ملیۆن حافز ... لە ولاتانی تریش هەروایە، دکتۆر (محمد الراوي) کە خەڵکی میسرە و بانگخوازێکی گەورەیە وپێی دەڵێن (الرحل القرآني) دەڵێت: لە نەیجیریا بووم، پیاوێکی سەوزە فرۆش لەبەردەرگا سەوزەم لێ دەکڕی و یەك پیت لەزمانی عەرەبی نەدەزانی، حافزی قورئان بوو، سوورەتی ئەعرافی بۆ خوێندم، کە بەڕاستی خۆم حافیزی قورئانم سورەتی ئەعراف لەبەر کردنی زۆری دەوێت، خوا ئاگادارە بەجۆرێك خوێندی سەرسام بووم، تاقە هەڵەیەکی تەنانەت لە تەجویدیش دا نەکرد..

کاتێ لەولاتی سعودیەش لە زانکۆ وانەی قورئانم دەوتەوە، لە هۆڵی زانکۆ من قورئانم بۆ دەخوێندن و بۆم تەفسیردەکردن، زۆر لە قوتابییەکان هۆن هۆن فرمێسك دەهاتە خوارەوە بەچاویاندا..

لەم بارەیەشەوە ڕۆژهەلاتناس (لورا فاگلیری) دەڵێت: (تەنها لە میسردا ئەوەندە حافیزی قورئان هەیە کە ژمارەیان زیاترە لەوانەی کە لە هەموو ئەوروپادا دەتوانن ئینجیل بخوێننەوە)..

قورئان ئێستا بە زیاتر لە سەدو سی زمان واتای لێکدراوەتەوە و زۆرترین کەس بەدەستی دێنێ و زۆرترین کەسیش دەیخوێنێتەوە، لەکاتێکدا کەئینجیل ڕۆژ بەڕۆژ خوێنەرانی کەم دەبنەوە، هەرچەندە ماوەیەك لەمەوبەر قەشەیەکی ئینگلیزی بەناوی (هنتون) لە ئوستورالیا ئینجیلیکورتکردۆتەوەو ناوی ناوە (بایبل المائة دقیقة) واتە ئەو ئینجیلەی کەلە سەدخولەکدا دەخوێنرێت! ئینجا زۆر کەم کەسیش دەیخوێنێ و ئەوانەش کەبتوانن لەبەری بکەن هەر زۆر کەمن وەیان هەر نین؟!.[1]

---

١- (گۆڤاری المجتمع، ١١/٦/٢٠٠٦).

## ٤- موسولمان بوونی گۆرانی بێژی ئەمریکی سیلەرز:

ئەم گۆرانیبێژە دەڵێت: ڕۆژێك لە شاری فرجینیا بەلای مزگەوتێکدا تێپەڕیم گوێم لەدەنگێك بوو، وام زانی گۆرانی بێژە، کە نزیك بوومەوە، کابرایەك لەسوچێکدا دانیشتبوو شریتی دەفرۆشت، وتم: ئەوە دەنگی چ گۆرانی بێژێکە؟! وتی: ئەوە گۆرانیبێژ نیە، قورئان خوێنە؟! شریتەکەم لیٚ کڕی وتم: ناوی چی‌یە ؟! وتی: خالد القحطاني ...

لەسەیارەکەمدا گوێم لەشریتەکە گرت، نەمتوانی سەیارەکەم لێبخوڕم ناچار وەستام، بەدڵ گوێم گرت، تەواو هەست وهۆشی هەژاند و هەموو خانەکانی لەشم خۆشیەکەی چەشت..

دواتر چووم بۆ لای عازفی گیتاری تیپەکەمان کەناوی کریس بوو، موسڵمان بووبوو ناوی خۆی کردبوو بە (خەلیل).. چووم بۆلای تێمبگەیەنیٚ ئەو کاریگەرە گەورەیە چی‌یە کە قورئان هەیەتی لەسەر دڵ ودەروونم..

ئەویش شریتەکەی لێداو کەوتە وەرگێڕانی بۆم، ئەوەی سەیرە سورەتی (الشعراء) بوو، منیش بۆ خۆم (شاعیر)م.

موسوڵمانبوونی‌خۆمم ڕاگەیاندو ناوی خۆم کرد بە (هارون سیلەرز). بیرم کردەوە کە لە ڕێی دەزگایەکەوە خزمەت بەئیسلام بکەم بۆیە دەزگای (ئەوانەی بیر دەکەنەوە لەبەرهەم)م دامەزراند، ئنجا پەیوەندیم کرد بە شێخ (خالد القحطاني)یەوە، کەئایا ڕێم دەدات ئەو قورئانەکە بخوێنیٚ و ئێمەش ئایەت بەئایەت بە دوایدا بە زمانی ئینگلیزی ڕاڤەی بکەین، تا خەڵکی باشتر لە قورئان تێبگەن؟ ئەویش ڕازی بوو..[1]

## ٥- شیخ محمد حسان کە بانگخوازێکی میسریە ..

لە وتاری (وقفة مع النفس) دا دەڵێت: لە گەشتێکی بانگخوازیدا لە لوس ئەنجلوس وتارم دەدا، دوای وتارەکە برادەرێك داوای کرد کە هاوەڵێکی ئەمریکی‌دەیەوێت لەسەردەستما موسڵمان بێت، برادەرە ئەمریکیەکە هاتە پێشەوە، باسی بەسەرهاتی خۆی کرد کە خاوەنی کۆمپانیاو پارەوسامانی زۆرە و لەبەرئەوەی بەختەوەر نەبووە شانزە جار هەوڵی خۆکوشتنی داوەو ڕزگارکراوە، تا ڕۆژێك لەیەکیٚ لەکۆمپانیاکانی کارمەندێکی خۆی دەبینیٚ کە قاچی

---

١- ئەم ڕووداوە (نجیب الرفاعی) لەپەڕاوی (الذین تأثروا بقراءة القرآن)دا باسیکردووە ...

لەسەر دەست شۆر دەشوات، ئەمیش تووڕە دەبێ و دەڵێت: چۆن پێ دەخەیتە ئەو دەستشۆرەوە کەمن دەم وچاوی لەسەر دەشۆم؟! کارمەندەکەش دەڵێ: من ڕۆژی پێنج جار قاچم دەشۆم!! لای سەیر دەبێ، چۆن ئەو پێنج جار قاچی دەشوات لەکاتێکدا ئەم ڕۆژی یەکجار دەموچاوی دەشوات، بۆیە کەپرسیاری ئەمەی لێکرد لەوەڵاما وتی: من دەستنوێژدەشۆم بۆ نوێژکردن،وتی: بۆتۆ ڕۆژی پێنج جار نوێژ دەکەیت ؟! وتی: بەڵێ !..

وتی: دڵئارام و ئاسودەیت؟! وتی: بەڵێ، چونکە لای ئێمە ئەگەر تووشی خۆشی ببین سوپاسی خوای لەسەر دەکەین و خێرە بۆمان، ئەگەر تووشی ناخۆشیش ببین ئارام دەگرین بەوەش خێرمان بۆ دەنوسرێ، کەئەوەش فەرمودەی پێغەمبەرەکەمانە (عجباً لأمر المؤمن ان أمره كله خير، إن أصابه سراء شكر فكان خيراً له، وإن اصابه ضراء صبر فكان خيراً له)..

بۆیە بڕیارئەدات ئەمیش موسڵمان بێت..

جا کەئەمانەی باس کرد، شایەتمانمان فێرکرد و لەدوای منەوە وتیەوە: اشهد أن لااله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله.. پاشان لەشی کەوتە لەرزین و زۆر گریا، ئینجا وتی: ئەم وشانە چییان تیا دانراوە ئاوا کاریگەریان هەیە؟! وتم: دڵفراوانیو ئاسوودەیی و ئارامی تیادانراوە، وتی: بەخوا یەکەم جارە هەست بەو دڵفراوانی و ئاسوودەیی یە دەکەم..

## ٦- موسڵمانبوونی قەشەی مەدەغەشقەر ئەندریانا سۆلۆ:

قەشە ئەندریانا سۆلۆ فیکتۆر مسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند لە مەدغەشقەر و ناوی خۆی کرد بە(زەکەریا)، بەڕێوەبەری نووسینگەی(جمعية العون المباشر) لە مەدەغەشقەر چاوپێکەوتنی لەگەڵ سازکرد و لەهۆکاری موسڵمانبوونی پرسی، ئەویش وتی: لەماڵێکی گاوردا گەورە بووم کە ئەندامەکانی هەموو بەگەرمی هاتوچۆی کەنیسەیان دەکرد، تا لە کۆتایی ساڵانی هەشتاکاندا لەلایەن سەرۆکایەتی کەنیسەکانەوە کرام بەبەرپرسی کەنیسە.. من هیچی وام لەئیسلام نەدەزانی، ئەوە نەبێت کە لەکۆبوونەوەکاندا باس دەکرا کە خەڵکانێکی زۆری مەسیحی بەرەو ئیسلام دەچن، کاتێ مزگەوتی (امبادریکا) لە (لۆکۆمبی) دروستکرا زۆرمان پێناخۆش بوو، ئێمە زۆرمان لەخەڵکی دەکرد کە ڕێ لەمناڵەکانیان بگرن کە نەچن بەرەو ئیسلام، ئێمە هەرچیمان دەکرد سەرکەوتوونەبووین بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام. هۆی

موسڵمانبونیشم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەردەوام کۆبوونەوەمان دەکرد بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام، ئەم کۆبوونەوانە وایان لێکردم بیر بکەمەوە، باشە بۆچی دژایەتی ئەو دینە دەکرێت، بڕیارم دا موسڵمان ببم ودەست هەڵبگرم لەو هەموو نازونیعمەتەی‌کەکەنیسە خستبوویە بەردەمم، خولێك بۆ موسڵمانە تازەکان کرایەوە لەشاری (ساکوانا)، منیش کەوتمە ڕێ بۆ ئەو خولە، سیانزە کیلۆمەتر بەپێ ڕۆیشتم، لەخولەکەدا بەشداریم کرد، بڕیارم دا کە هەوڵ بدەم لەگەڵ کەسو کارو عەشیرەتم دا تا قەناعەت بکەن بەئیسلام و موسڵمان بن.[١] ..

ئەوەی جێی سەرنجە لە موسولمانبوونی ئەم کەسانەدا ئەوەیە، کە هەرنەوەندەی موسولمان بوون، دەمودەست دەیانەوێت خەڵکی بانگ بکەن بەرەو ئیسلام، کەبەڕاستی ئەمەش دەبێتە مایەی بڵاوبوونەوەی ئیسلام بە خێرایی، کەئەمەش دیارە مایەی ڕووسووری دنیاوقیامەتە، چونکە بانگەوازکردن باشترین هۆکارە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار ئەوەتا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (نضر الله امرءاً سمع منا حديثا فبلغه كما سمعه فرب مبلغ أحفظ من سامع).

## ٧- موسڵمانبوونی قەشەی میسری ئیسحاق هیلال مەسیحە:

ناوبراو لەبارەی موسڵمانبونیەوە دەڵێت: لە دایك و باوکێکی مەسیحی لەدایك بووم، کەهەر لەمناڵیەوە بەشیری دژایەتی ئیسلام گۆشیان کردم، بەڵام کاتێك گەورە بووم کەوتمە لێکۆڵینەوەی ژیانی پێغەمبەران، کەبەوەش ناثارامی‌یەکی دەروونیم بۆ دروست بوو، زۆر پرسیارم لا گەڵاڵە بوو کە لەناو قوتابیانی هاوەڵمدا باسم دەکرد، بەدوای وەڵامی ڕاست دا دەگەڕام، ئەمەش وای لە (بابا شنودە) گەورەو پێشەوای قیبتیەکانی میسر کرد کەپێش وەخت بکات بە قەشە تا دەمکوت ببم، زۆر لاشی لێ دەکردمەوە و خێروبێری بەسەرا دەڕشتم.. بەڵام من لەگەڵ هەموو ئەوانەدا سوور بووم لەسەر ئەوەی کە لەهەقیقەتی ئیسلام شارەزا ببم! بەنهێنی پەیوەندیم پەیداکرد لەگەڵ هەندێ موسڵمانداو کەوتمە دیراسەی ئیسلام، کاتێ داواشم لێکرا کە نامەی ماجستێرەکەم ئامادەبکەم لەسەر (بەراوردکردنی ئاینەکان)، نامەیەکی چاکم ئامادەکرد، کەچی سەرپەرشتیاری نامەکەم ڕازی نەبوو بەوەی کە وتبووم محمد ﷺ نێرراوی

١-(گۆڤاری الكوثر).

خوایە و عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) مژدەی داوە بە هاتنی.. نامەکە لەکەنیسەی ئینکلیکی لەقاهیرە وتوویژی لەسەرکرا، سەرەنجام باباشنودە نامەکەمی ڕەتکردەوەو چاودێرییەکی توندیشیان خستە سەرم کە نەمدەتوانی بەئاسانی پەڕاوی ئیسلامیم دەست بکەوێت..

ڕۆژێك ئەچووم بۆ یادکردنەوەی لەدایکبوونی مەریەم لە ئەسکەندەریە، پاش ئەوەی لە شەمەندەفەر دابەزیم سواری پاصێك بووم بە جل و بەرگی قەشەیەتیەوە، منالێك کەنامیلکەی دەفرۆشت سەرکەوتە ناو پاصەکەو نامیلکەکانی پیشانی دانیشتوان دەدا تا لێی بکڕن ومنی پەڕاند، لەدڵما گرێیەك دروست بوو، بۆ دایە دەست هەمووان و پیشانیدان من نەبێت، لێم پرسی: کوڕم بۆچی ئەو نامیلکانەت دایە دەست هەمووان من نەبێت ؟!

وتی؟! چونکە تۆ قەشەیت! ئینجا تێگەیشتم کەمن شایانی ئەوە نیم دەست بدەمە ئەو نامیلکەیە هەرچەند بچوکیش بوو! داوام لێکرد کە دانەیەکم پێبفرۆشێ، وتی: ئەم نامیلکانە ئیسلامین! ئینجا دابەزی لە پاصەکە، منیش هەروەك لەبرسا مردوویەك بەدوای ناندا ڕابکات دابەزیم بەدوایدا و بەزۆر دوو نامیلکەم لێکڕی.. کەگەیشتمە کەنیسە چوومە ژووری تایبەتی میوانداری، هەرچەند زۆر ماندووی سەفەر بووم سەیری یەکێکیانم کرد (جزمی عم) بوو، کردمەوە سوورەتی (ئیخلاص)م بینی، خوێندمەوە هەست وهۆشی هەژاندم، ئەوەندەم دووبارە کردەوە هاتە بەرم، هەستم بەدڵئارامی و خۆشییەکی زۆرکرد.. ئا لەو کاتە دا قەشەیەك هاتە ژوورەوەو بانگی کردم و وتی(أبونا إسحاق)، چومە دەرەوە و بەدەنگی بەرز بەڕوویدا بەبێ ئەوەی هەست بەخۆم بکەم (قل هو الله)م خوێند! چووم لەسەر کورسی ئیعتراف دانیشتم خەڵکی داماو دەهاتن لەبەردەمم دا دانیان ئەنا بەتاوانەکانیانا، گوایە من لێیان خۆش بم، من زمانم لاڵ بوو نەمدەزانی چیان پێ بڵێم، من چیم لەخەڵکی خۆش ببم، قل هوالله لەخەیاڵما بوو، کە خوایەکی باڵا دەست هەیە لەهەموان گەورەترە و لێخۆش بوون بەدەست ئەوە، بۆیە زۆر گریام، چومە لای یەکێ لەقەشە گەورەکان وتم: (من لەگوناهیخەڵکی خۆش ببم ئەی کێ لە گوناهی من خۆش ببێ؟! وتی: پاپا، وتم ئەی کێ لە (پاپا) خۆش ببێ؟

لێم ڕاست بووەوەو قیژانی بەسەرما(تۆ قەشەیەکی شێتی، ئەوەش کە تۆی دامەزراندووە هەرشێتە ؟!) پاش ئەمە بڕیاری پاپام بۆ دەرچوو کە بەند بکرێم!

جا هەر بەندکردن نەبوو بەڵکو کەبردیانم پێشوازیەکەم وابوو کە هەر قەشەیەك و دارێکی بەدەستەوە بوو کە بەلایا تێدەپەڕیم دارێکی پیادەماڵیم و دەی وت (ئەمە پاداشتی ئەوەیە کە ئاینەکەی و کەنیسەکەی بفرۆشیێ)!

پاش سێ مانگ ئەزیەت و ئازار بردیانم بۆلای گەورەی قەشەکان تا ئامۆژگاریم بکات، کەچی وتی (کوڕم.. خوا چاکەکاران ون ناکات، ئارام بگرە و چاوەڕێی پاداشتی خوا بە، ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ﴾ الطلاق: ٢ - ٣، لە دڵی خۆمدا وتم: ئەوە قسەی ناوکتێبی پیرۆز نیە و قسەی قەشەکان نیە، ئەوەندەی تریش سەرسامیم زیادی کرد کە وتی (کوڕم ئامۆژگاریم بۆت ئەوەیە کەخۆت دەرمەخەو خۆت ئاشکرا مەکە تا هەق ئاشکرا دەبێت، با زۆریشی پێبچێت). لە دڵی خۆمدا وتم: ئاخۆ مەبەستی لەم قسانە چی بێ؟..

زۆری نەخایەند لەقسەکانی حاڵی بووم ! بەیانیەکیان دواکەوت، چووم لەخەو خەبەری بکەمەوە، کە دەرگاکەم کردەوە بینیم وەك موسڵمانان نوێژی بەیانی دەکات، لە شوێنی خۆم وشك بووم، دەرگاکەم بەسوکی داخستەوە! دوایی کەزانی ئاشکرابووە لام، هات و وتی: کوڕم ئەوەی بینیت پەردەپۆشی بکە و سەترم بکە خوا سەترت بکات، بەڕاستی من وا بۆ (٢٣) ساڵ دەچێت ئاوام وخەو وخۆراکم قورئانە، بەڕاستی مرۆڤ ئەبێ دوای هەق و ڕاستی بکەوێت..

پاش چەند ڕۆژێك لەورووداوە فەرمانم بۆ دەرچوو کە بگەڕێمەوە کەنیسەیەکی ناوچەیەکی تر، ئنجا چووم لەگەڵ کۆمەڵێکدا بۆ مژدەدان لە ناوچەی (واو) لە سۆدان، پاش ئەوەی گەڕاینەوە لە کەشتیەکەدا ئەو چەند کەسەی بووبوون بەگاور و لەگەڵمان هاتبوون بەسەرم کردنەوە، ئەوەی سەیر بوو یەکێکیان کەناوی (محمد ئادەم) بوو بینیم وەك موسڵمانەکان نوێژ دەکات، قسەم لەگەڵ کرد زۆر سووربوو لەسەر ئیسلامەتیەکەی و وتی (ڕاستە من جەستەم فرۆشتوە بە ئێوە لە نەبوونیدا، بەڵام دڵ و عەقڵم موڵکی خوای تاك وتەنهایە و نایفرۆشم بە هەموو کنوزی دونیا، وە من شایەتی دەدەم کە (لا إله الا الله محمد رسول الله)..

پاش ئەمانە هەمووی ویستم موسڵمانبونی خۆم ڕابگەیەنم، ڕۆیشتم بۆ چەند بەڕێوبەرێتی‌یەکی ئاسایش تا موسڵمانبوونم بۆ تۆمار بکەن، نەیان کرد تا کۆمەڵێ قەشە هاتن وکەوتنە گفتوگۆ لەگەڵما، کە زانیان قسەکانیان سوودی نیە لە گەڵما هەڕەشەیان لێکردم کە چیم هەیە دەستی بەسەردا دەگرن، کەبایی چوار ملیۆن جونەیهی مصری دەبوو، ئەمە بێجگە

لەچەند دوکانی ئالتون کە هەمبوو، ناچار دەستم لە هەمووی هەلگرت لە پێناو خواو ئیسلامدا، کەنیسە بەوەش وازیان نەهێناوخوێنیان حەلاڵ کردم و سێ جار هەولی تیرۆرکردنم درا لەلایەن براکەم وئامۆزاکانمەوە کە گاور بوون، سەرەنجام فیشەکێ بەر گورچیلەم کەوت وئێستا بەیەك گورچیلەوە دەژیم و، باوك و دایکیشم کەزانیان موسلمان بووم لە داخا خۆیان سوتان ( ولا حول ولا قوة الا بالله)[1]

## ٨- لەکۆراڵی کەنیسەوە بۆ بانگخوازی ..

ئەمەش چیرۆکی موسولمانبوونی کەسایەتی‌یەکە کە لە کۆراڵی کەنیسەدا کاری کردووە و پاشان بووە بە موسلمان، ئەویش محمد سوماوی یە لە فلیپین، لە سەرەتادا بووە بە مەسیحی وزۆر بە توندی ئیلتزامی بەم ئاینەوە کردووەو، گرنگی داوە بە کاتەکانی نوێژی کەنیسەو سەرجەم رێ و رەسمەکانی تری ناو کەنیسە و، بووە بە سروودبێژی کەنیسەش لە چوار چێوەی کۆراڵی ئاینی و، دایك و باوکیشی زۆر پەیوەست بوون بەم ئاینەوە.

محمد سوماوی دەڵێت:

سەرەتای گەشتەکەم لەگەڵ هیدایەتدا دەگەرێتەوە بۆ سالی (١٩٩٠) کاتێك عێراق کوەیتی داگیرکرد، من لە بنەرەتدا باوەرم بەخوای گەورە هەبوو، کاتێك کە مەسیحی بووم پرسیاری زۆر روو بەرووم ئەبوویەوە، هەمووکات لەسەرجەم بۆنە ئاینییەکاندا بەشدار ئەبووم و ئەندام بووم لە تیپی کۆراڵی ئاینی کە سروودمان بۆخوا دەوت، عیسام بەخواو کوری خوا ئەزانی، لەمنداڵیمەوە ئەمە فێر بووبووم و خوێندبووم.

بەڵام هەروەك وتم پرسیاری زۆر لەلام درووست ئەبوو نەم ئەتوانی باوەر بەوە بکەم کە ئەیکەم، لەدوای ئەم هەموو بەندایەتی کردنەشمەوە هیچ ئارەزوویەکم نەبوو هێندە نەبێت کە وەك مەسیحیەکی کاسۆلیکی بژیم.

لەفلیپین ئاسنگەربووم و، شوفێریشم ئەکرد و بەرامبەر بە برێك پارەی کەم خەلکیم لەجێگایەکەوە بۆجێگایەکی تر ئەگواستەوە.

---

١- موقع: دیننا.

ڕۆژێك لە ڕۆژان بەخەیاڵمدا نەهاتبوو كە سەفەر بكەم بۆ دەرەوەی فلیپین، بەتایبەتی بۆ كوەیت تالەوێ كار بكەم، وام ئەزانی كە ئەم كارەم وام لێناكات سەفەریكەم بۆ دەرەوە وسەروزیادمە.

بەحیكمەتێك كەخوای گەورە دەیویست خوشكە گەورەكەم سەفەری كرد بۆ كوەیت تا لەوێ كار بكات پێش داگیركردنی كوەیت، وەلەو ماوەیەدا كە لەوێ بوو كوەیت داگیركرا لەلایەن عێراقەوە، بۆماوەی حەوت مانگ، هیچ خەبەرێكمان نەبوو لەبارەیەوە تادڵنیامان بكاتەوە و بزانین خەریكی چیە،ئەوەش كە زیاتر پەرۆشی كردین ئەوەبوو كە ئێمەچەند برایەك بووین وتەنها ئەوخوشكەمان هەبوو، لای دایك و باوكیشمان زۆر خۆشەویست بوو، لەوماوەیەدا خێزانەكەمان تەواو نارەحەتی باڵی بەسەردا كێشابوو و دایك و باوكیشمان زۆر پێوەی مەشغوڵ بوون، وەلەبەر زۆری ڕووداوەكان ئەو هیوایەمان لەدەستدا كە مابێت و من لەناو براكانمدا لەهەموویان گەورەتر بووم، بۆیە ئەركی سەرشانم بوو كە بەدوایدا بچم بزانم ماوە یان مردووە؟

ئەمەش هەروا ئاسان نەبوو، پێویست بوو بكەومە پرسیار كردن لەهەموو كەسێك كەپێش ئەو و دوای ئەویش لەوێبوون و، لەمانەش گرانتر ئەوە بوو ئەگەر مردبێت چی بكەم؟

یان ئەگەر ماوە لەكوێیە؟ ئەمەش هەمووی تەنها بۆ لای خوای گەورە دەگەڕایەوە.... دڵخۆشی دایك و باوكم ئەدایەوە تا هەرچۆن بێت فرمێسك نەڕێژن و ئاهێك بەبەریاندا بێنمەوە، بەهەرحاڵ ئێمە هیوامان لەدەستدا و هیچ ئاواتێكمان نەما كە بگەڕێتەوە بۆلامان.

پاش تێپەڕبوونی نۆ مانگ بەسەر دیارنەمانیدا نامەیەكمان پێگەیشت كە ئەم ماوەیە ماوەی لەدایك بوونی منداڵێكە ئەمەش وەك لەدایك بوونی ئەم خووشكەم وابوو بەلای ئێمەوە.

لەنامەكەدا باسی ئەوەی كردبوو كەئەو ماوە و ژیانی زۆر باشە و لەو ماوەیەدا بووە بە مسوڵمان و خوای گەورە هیدایەتی داوە و ناوی خۆشی گۆڕیوە و شووی بە كوەیتیەك كردووە، دیارە ئەمە بەلای ئێمەوە گرنگ نەبوو هێندەی ئەوەی كە زانیمان ماوە و سەلامەتە و لە ژیاندایە، هەموومان دڵخۆش بووین و،دایكم لەخۆشیدا دەستی كرد بەگریان و سوپاسی خوای كرد بۆ سەلامەتی خووشكەكەم .

پاش دوو مانگ بەسەر ئەم نامەیەدا نامەیەكی ترمان پێگەیشت كە تیایدا داوای لە من كردبوو كە پێویستی زۆری پێمەو دەیەوێت هەرچۆنێكە سەفەریكەم بۆلای بۆ كوەیت و لەلای بم، بەهەرحاڵ من لەناوەڕۆكی نامەكە تێنەگەیشتم هێندە نەبێت كەئەو پێویستی بەمنە.

دیاره هەروەك باسم کرد ئەو خوشکی تاقانەم بوو بۆیە پێویست بوو لەسەرم کە بچم و دڵنیابم لێی بەتایبەتی کەزۆر بیرم دەکرد و هەروەها بارودۆخیش گونجاو بوو بۆم .

خوای گەورە سەرجەم هۆکارەکانی بۆ ئاسانکردم بۆ ئەم سەفەرە و هەموو وەرەقە و جەواز سەفەر و بابەتەکانم ئامادەکرد و ناردم بۆ لای خوشکەکەم و پاشان ئەوە بوو ڕەزامەندیم بۆهاتەوە ئابچم بۆ کوەیت و، لە (٢٨ نۆڤەمبەری ١٩٩٢)دا سەفەرم کرد.

لەگەڵ گەیشتنم دا بۆ کوەیت چەندین پرسیار لە بارەی ئەم ژیانە نوێیەمەوە لە مێشکمدا درووست بوو، خوشکەکەم زۆر بە پەرۆش بوو، بۆ هەر یەکێکیشمان خەونێك بوو کە ئەویترمان ببینین، بۆیەکاتێك بینیمی زۆر گریا و چەندین جار دووپاتی کردەوە ئایا خەون نابینیّ، منیش باوەڕم نە ئەکرد کەئەو ببینم بۆیە زۆر سوپاسی خوای گەورەم کرد، خێرا ئەو دەستی کرد بەپرسیارکردن لێم لە بارەی باوکم و دایکم و براکانم ؟

پاشان لەگەڵ مێردەکەیدا بردیانەوە بۆماڵەکەیان کە لە ناوچەیەکدا بوو کۆمەڵێك تەلاری تیابوو، ماوەیەك لەگەڵیدا مامەوە و دەستیان کرد بەبانگەشەکردنم بۆئیسلام، هەروەك ئەوەی منی لەفلیپینەوە هێنابێت بۆ ئەو مەبەستە، پرسیارم لێکردن ئایا بوون بە مسوڵمان بەزۆرە ؟! زۆر بە ڕوونی وەڵامیان دامەوە کەئەخێر ئیسلام بەو جۆرە نیە و زۆرکردن لە ئایندا نیە، وتم: باشە کەواتە وازم لێبێنن تاخوای گەورە خۆی حوکم ئەدات بەسەرمدا!

لێتان ناشارمەوە دەستم کرد بەبیرکردنەوە لەئیسلام و لەوەی بۆچی خوشکەکەم چووەتە ناو ئەم ئاینەوەو ئێستا بۆ بانگەوازی بۆ ئەکات؟

داوام لێکردن کەئەمەوێت ئیسلام بخوێنم و، پێویستە کە هیچ نەبێت فرسەتێکم بدەنێ تالەم ئاینە تێبگەم، ئەوانیش ئەمەیان زۆر بەخۆشییەوە لێوەرگرتم و، ڕێزی ئارەزووەکەیان گرتم و دەستم کرد بەفێر بوونی بنەما و پرەنسیپەکانی ئیسلام، من پەلەم نەئەکرد لە گەڕان بەدوای ئاینی نوێدا و، ماوەی مانەوەم لەگەڵیاندا بەردەوام گوێم لەبانگ ئەبوو (الله اکبر– الله اکبر)، یەکەم شتێك کەزانیم بریتی بوو لەمانای ئەم بانگە کە مسوڵمانان بۆ نوێژکردن بانگ ئەکات لەچەند کاتێکی دیاریکراویڕۆژو شەودا. جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان بانگکردنی مەسیحی کە هەموو هەفتەیەك لە یەك شەمماندا زەنگ لێدەدرێت، لەگەڵ بانگکردنی ئیسلامدا کە لە ڕۆژێکدا پێنج جار بانگیان دەکات بۆ ملکەچی بۆخوای گەورە.

ڕۆژەکان تێنەپەڕین و کاتێك کە خوشکەکەم و مێردەکەیم دەبینی نوێژ ئەکەن بەیەکەوە هەستم ئەکرد کە ئەوان لەوپەڕی ئارامی و دڵنیایدان و لێرەوە وردە وردە خۆشەویستی ئیسلام چووە دڵمەوە.

ڕۆژێکیان خوشکەکەم و مێردەکەی چوون بۆ سەردانی هەندێك خزمیان و منیان لەماڵەوە بەتەنها بەجێهێشت و سەیری تەلەفزیۆنم ئەکرد بۆ زانینی هەواڵەکان و تا بزانم لەجیهاندا چی ڕوودەدات ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو کەتەلەفزیۆنەکەم داگیرساند لەسەر کەناڵی دووی کوەیت بوو کە بەرنامەکانی خۆی بە زمانی ئینگلیزی بڵاوئەکاتەوە، کە لەو کاتەدا مەوعیدی بەرنامەی (شێخ صلاح راشد)بوو، ئەمەش بەڕاستی قەدەرێك بوو لەلایەن خوای گەورەوە بۆم ڕێکخرا بوو﴿ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ البقـرة: ١١٧ لەو کاتەدا شێخ صلاح راشد ئەمینداری گشتی لیژنەی ناساندنی ئیسلام بوو، ئەمەش لەمانگی ڕەمەزانی پیرۆزی ساڵی (١٩٩٣)دا بوو، لەو بەرنامەیەدا باسی لە پەیوەندی ئیسلام دەکرد بە ئاینەکانی ترەوە و باسی لەئیسلام و مەسیحیەت کرد، باسی لەعیساو محمد ﷺ کرد لەئینجیلدا، لێرەوە بەجدی کەوتمە بەدواداچوونی ئەم بەرنامەیەو زۆر بە شەوقەوە هەموو ئێوارانێکی چوارشەممە چاوەڕێیم ئەکرد، لەم بەرنامەیەوە بیستم کە محمد ﷺ هەواڵی بەپێغەمبەر بوونی لە ئینجیل و تەوراتدا هاتووە وئەو لەدوای موسا و عیساوە ئەنێردرێت، کەوتمە گەڕان بەدوای ئەوەدا کە ئاخۆ محمد ﷺ بەڕاستی ناوی لە ئینجیلدا هاتووە چوونکە من ناوەکەیم لەعەهدی کۆن و نوێدا بەرچاو نەکەوتبوو.

ئیتر دەستم کرد بەگرنگی دانی زۆر بەئیسلام لەو لایەنەوە کەبانگەشە بۆ یەکتاپەرستی ئەکات، هەروەك شێخ صلاح راشد بۆی ڕوونکردەوە، ئەو شتەش کە زۆر سەرسامی کردم و نەمنەتوانی بەرەنگاری ببمەوە بریتی بوو لە ڕوونکردنەوەکانی لەبارەی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ لە ڕێگای کتێبی پیرۆزی مەسیحیەکانەوە پێش ئەوەی کەدەستکاری بکرێت، بۆئەمەش شێخ صلاح ئاماژەی بۆچەندین نمونە و بەڵگە ئەکرد لە ئینجیلدا .

بەڕاستی لەڕێگای شەرحەکانیەوە بۆم ڕوون بۆوە کە ڕاستی پەیامبەرێتی محمد ﷺ هاتووە لە ئینجیلدا پێش دەستکاری کردنی و، نەم ئەتوانی کە نکوڵی لەوە بکەم .

لێرەوە سەرەتای ڕازیبوونم بەئیسلام دەستپێکرد، بەرەبەرە دڵمی داگیرکرد و پڕی کردەوە و بەرەبەرە خۆشەویستیم بۆی زیادی کرد، گەیشتمە ئەو ڕاستیەی کە کەس ناتوانێت بەرگەی لێپرسینەوەی خوایی بگرێت و، پێویستە هەموو مرۆڤەکان لە خوای گەرە بترسن، خوای گەورەی هەموو جیهان و ڕێکخەری هۆکارەکان و خاوەنی زەوی و ئاسمانەکان .

ڕێگام بۆکرایەوە بەرەو ئیسلام بەئیرادەی خوای گەورە و بڕیارم دا کە لەگەڵ مێردی خوشکەکەم بچم لە لیژنەی ناسینی ئیسلام دا ئیسلامبوونی خۆم ڕابگەیەنم و، شایەتی بدەم بەتاك و تەنیایی خوای گەورە و بەوەی کە عیسا نێردراو و بەندەی خوایە و محمدیش ﷺ نێردراو و کۆتایی پێغەمبەرانە و پەیامبەری رەحمەتە بۆ هەموو جیهان.

ئیسلامبوونی خۆم ڕاگەیاند لە پانزەی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا لەئەوپەڕی ترسەوە لە سزای خوایی و لێپرسینەوەی و هەروەها لە ئەوپەڕی باوەڕبوونەوە بە تاك و تەنیایی خوای گەورە، ئیدی پەیوەندیم لەگەڵ برا نوێ موسڵمانەکاندا زۆر پتەوبوو.

ئیسلام گەورەمان عیسای لەجێگایەکی زۆر شیاودا داناوە کەبریتی‌یە لە نێردراوو بەندەو پەیامبەری خوایی هەروەك پێغەمبەرمان محمد ﷺ و جیاوازی لەنێوانیاندا ئەوەیە کە محمد ﷺ کۆتا پێغەمبەرە و ئەمەش لە قورئان و لە ئینجیلیشدا هاتووە و هەردووکیشیان بانگەشە بۆیەکتاپەرستی دەکەن و، پێغەمبەرمان محمد ﷺ خوای گەورە ناردوویەتی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی تاڕۆژی دوایی..

سوپاس بۆخوا، ئێستا بەسەر مسوڵمان بووندا چەندین ساڵ تێپەڕیوە کە تیایدا ئیسلامم ناسی، ئیمانم پتەوتر بوو پاش خوێندنی (التوحيد في الاسلام) و کە ئەمە باس لەچۆنیەتی ئیمان و تاك وتەنهایی خوای گەورە ئەکات.

هەروەها فێری ئەوە بووم کە چۆن مسوڵمان ئەوەی لەسەرێتی لەبەندایەتی جێبەجێی بکات، ئیسلام ئەوەی چاکە حەڵاڵی کردووە و ئەوەشی کەخراپە حەرامی کردووە، جا پێویستە لەسەر مسوڵمان کەچاودێری خوای خۆی بکات لەهەموو کاتێکدا.

بەڕاستی هیدایەتی من قەدەری خوای گەورە بوو کە هەرکەسی بوێت هیدایەتی ئەدات و ڕێنمونی ئەکات بۆڕێگای ڕاست، وەهەرئەو بوو لە فلیپینەوە هۆکارەکانی بۆ ڕێکخستم تا بچم بۆ کوەیت .

بەڕاستی چاکەی خوشکەکەم و مێردەکەی لەبیرناکەم دوای خوای گەورەو، هەروەها لیژنەی ناسینی ئیسلام کە ماوەیەکی درێژ هەوڵیان لەگەڵمدا بۆ فێربوونی ئیسلام و ئەمانەش دەرگای هیدایەت و نورور بوون لەدڵمدا، لەم جێگایەدا پیاوانێك هەبوون کە خۆیان تەواو تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی ئاینی خوا، داواکارم لەخوای گەورە کە پاداشتی ئەوان و هەموو ئەوانەش بداتەوە کە ئەم شوێنەیان دامەزراندووە بۆ بانگەوازکردن بۆ دینی خوا .

لەدوای ئیسلام بوونمەوە لەم لیژنەیەدا فێری ئیسلام بووم و بەشداری سەرجەم دەورە و وانەکانم کرد تیایدا و چەندین بڕوانامەم تیادا وەرگرت لەوانە: لە سەرەتادا دەرچووم بە جێگری بانگەوازکار بۆ جالیەی فلیپینی و ئێستاش وەك بانگخوازێك لە لقی لیژنەی ناسینی ئیسلام لە ئەحمەدی کار ئەکەم، سوپاس بۆخوای گەورە زۆر کەس لەسەردەستی مندا موسوڵمان بوون ئەمەش بەڕاستی فەزڵی خوای گەورەیە کە بەهەرکەسێکی بیەوێت ئەیدات و خوای گەورەش خاوەنی فەزڵی گەورەیە.

هەروەها بەشداریم لە زۆرێك لە گفتوگۆکانی نێوان مەسیحی و ئیسلامدا کردووە و چەند جارێکیش سەردانی ماڵی خوام کردووە بۆ حەج کردن و عەمرەکردن..

قەدەری خوای گەورە وابوو کەمن لە سروودبێژی لە کۆڕاڵی کەنیسەوە ببم بە بانگخوازێك بۆئاینی ئیسلام، کە ئەمە هیدایەتی خوای خاوەن فەزڵ و مالك الملك و ڕەحمان و ڕەحیمە، الحمد لله الذي هدانا لهذا وماكنا لنهتدي لولا ان هدانا الله .

## ٩- مسوڵمانبوونی ڕەفیق چانین سەرۆکی بیعسەی عێراق سەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کۆچ..

ڕەفیق چانین لەبارەی مسوڵمانبوونیەوە دەڵێت: هەرگیز نەئەچووە عەقڵمەوە کە خوای هەموو ئەم بوونەوەرە ماندووبوویی و هەموو شتێکی بۆ کوڕەکەی بەجێ هێشتبێت و نەتوانێ بەندەکانی خۆی یەکلایی بکاتەوە و کوڕەکەی بکات بەقوربانی تاله گوناهی هەموو بەشەریەت خۆش بێت !!. بۆیە لێرەوە ڕووم کردە کتێبخانەی مەرکەزی سویسرا و بەدوای ڕاستیدا دەگەڕام، کەوتمە هەڵاوێر کردنی لاپەڕەی چەندین کتێب لەبارەی ئاینە جیاوازەکانەوە تاخوای گەورە ڕێنمونی کردم و قورئانێکی وەرگێردراوی سەرزمانی ئەڵمانیم چاوپێکەوت، بەڕاستی بیرکردنەوەی لۆژیکی پاڵ ئەنێت بە بیریاران و ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاواوە بۆ ئیسلام ئەگەر ئارەزوو

بکەن، چونکە تەعالیمەکانی ئیسلام لەگەڵ فیترەت و زانستدا یەکدەگرنەوە و ئەمەش ئەو دەستەبژێرانە (النخبة) ڕادەکێشێت لەبەرئەوەی بیر ئەکەنەوە و تێڕامان ئەکەن، خۆ ئەگەر هات و ئەمانە بەجدی بگەڕێن بەدوای ڕاستیدا بێگومان ڕووئەکەنە ئیسلام.. پاشان ئەم کەسایەتی‌یە دەڵێت: ئیسلام تەنها لەسەر بنەمای ئاشتی و لێبووردەیی بنیات نەنراوە بەڵکو بانگەشەش بۆ دامەزراندنی داد پەروەری ئەکات لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگادا و هەروەها دژایەتی ستەم و دووڕوویی دەکات.

ئەمەش چاوپێکەوتنی گۆڤاری المجتمع ە لەگەڵ ناوبراودا:

* ئەگەر بمانەوێت بالۆیز ڕەفیق چاتێ بەخوێنەران بناسێنین ئەڵێین چی؟

لە سویسرا لەدایك بووم و تەمەنم پانزەساڵان بوو کەمسوڵمان بووم و پاش مسوڵمان بوونەکەشم ڕووم کردە پاکستان و پاشان بۆ چەند دەوڵەتێکی ترچووم و، بۆ هەرشوێنێك چووبێتم هێندەی پێمکرابێت پشتگیری و یارمەتیم پێشکەشی موسوڵمانان کردووە، ئەوەش کەمەبەستم ئەوە بووە کەمسوڵمانان هەمووکات هەوڵ بدەن لەخزمەتی یەکتردا بن بەتایبەتی لەکاتی قەیران و نەهامەتیەکاندا، بەنیسبەت بواری خوێندنیشمەوە من توانیومە کە پلەی ماجستێر لەبواری ئیدارەی کاردا بەدەست بهێنم، بەتایبەتی لەبواری ئیدارەی پارەو بانقدا.

لەبەر ئەوەی ئیسلام إن شاء الله هەمووکات لەدڵمدایە، نامەی ماستەرەکەمم تەرخان کرد بۆ (بانکەکان و بەرهەمهێنان بە ڕەزامەندی یاساکانی ئیسلام) و، هەتا زیاتر شارەزابم لەم بوارەدا بڕوانامەی دبلۆمم لە بواری بانکەکان و دڵنیایی ئیسلامیدا بەدەست هێناو، لەو بڕوایەدام ئەم بابەتە زۆر گرنگە ئەگەر هات و پێشکەشمان کرد بەخەڵکانی ترو بۆمان ڕوونکردنەوە ئەو کات باش تێئەگەن کەئیسلام چەندەئاینێکی گەورەیە.

کاتێك سەیری سیستەمە ئابووری یە جیهانیەکان ئەکەین دەبینین ئەم سیستەمانە یەك بەیەکیان ناکامڵن و چەندین کێشەو تێکەڵکردنی زۆریان تیادایە، ئەمە لە کاتێکدایە کە سیستەمی ئیسلامی سیستەمێکی ئابووری مرۆیی تێروتەسەلە کە شوێنکەوتوانی فێری پێشەنگی و ڕەوشتی بەرز ئەکات و جەخت لەسەر بەرژەوەندی هەمووان ئەکاتەوە .

ئێستاش من وەك سەرۆکی‌نێردراوانی سەر بە ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی بۆ کۆچ و پەنابەران کاردەکەم.

* هۆکارەکانی مسوڵمان بوونت چی‌یە؟

ئەوەی هانی منی دا بۆ ناسینی ئیسلام و پاشان مسولمان بوون، بیرکردنەوەی لۆجیکیانە بوو .

من دایك و باوکم مەسیحیەکی مولتەزیمی پرۆتستانت بوون و هەر لەتەمەنی زۆر منداڵیمەوە هەوڵی ئەوەیاندا کەفێری ئاینی مەسیحیم بکەن، لە هەرزەکاریمدا کەوتمە بیرکردنەوە لەوانەی کەلە بارەی مەسیحیەتەوە دەمخوێندو بۆم دەرکەوت کە زۆر لەوانەی کە خوێندوومە ئەکرێت بیانخەینە چوارچێوەی شتی نالۆجیکی و ناڕاستەوە.

بۆنمونە، بنەڕەت و ناوەرۆکی ئاینی مەسیحی ئەوەیە کە مرۆڤەکان خۆیان لەبنەڕەتدا بەخراپی لەدایك دەبن!! بەڵام خوای گەورە بەرەحمەتی فراوانی خۆی قوربانی بەکوڕە تاقانەکەیداوە تائەم خەڵکە لەهەڵەو تاوانەکانیان ڕزگاریان بێت؟، جارێکیان لە ڕاهیبێکم پرسی بۆچی پێویست بوو خوای گەورە کوڕەکەی بکابە قوربانی؟ ئاخۆ خوای گەورە توانای بەسەر هەمو شتێکدا نیە و ناتوانێ کەبەبێ تاوان دروستمان بکات و بەواتایەکی تر لێشمان خۆش بێت، وەڵامی ئەم ڕاهیبە زۆر ورووژاندمی، وتی کە ئەو لە ماوەی دیراسەکردنی زانستی لاهوتدا چەندین شەو ماوەتەوە و بەقوڵی کاری لەو بوارەدا کردووە بەڵام نەیتوانیوە بگاتە ئەنجام و وەڵام!! .

نمونەیەکی تر: جارێکیان کەباش لەبیرم نایەت تەمەنم چەند بوو دە ساڵان بووم یان دوانزە، مامۆستایەکمان وتی کە لە کۆندا خوای باوك هەبوە کە ئەو شتەکانی هەموو بەدەست بووە لەبوونەوەردا و لەپاشدا کوڕەکەی هاتووە کە ئیدی دەستی گرتووە بەسەر کارەکاندا. لەوکاتەدا دەستم هەڵبڕی ئیزنی ئەوەم خواست قسەبکەم، پرسیارم کرد، باشە چی لەپیاوە گەورەکەهات؟ ئایا لە بەڕێوەبردن و حوکم کردنی جیهان ماندوو بوو؟؟ بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە نەدرایەوەوهەڕەشەم لێکرا کەدەبێت بەڕێزەوە قسەبکەم.

بەم جۆرە دیراسەکردنم بۆ مەسیحیەت نەیتوانی کە دڵم جۆش بدات و ڕازیم بکات، هەرچۆن بوو نەمئەتوانی تەصەوری ئەوە بکەم کەخوایەك بەگەورەیی خۆی ماندووبێت و سەرجەم کاروبارەکانی بۆ کوڕەکەی بەجێبهێڵێت. وەئەم خوایە نەتوانێت لە هەموان خۆش ببێت ئەگەر بیەوێت و قوربانی بەکوڕەکەی بدات لەو پێناوەدا، لێرەوە ئیدی ڕووم لەکتێبخانەی ناوەندی سویسرا نا بۆ گەڕان بەدوای ڕاستیدا، کەوتمە هەڵدانەوە و تاوتوێ کردنی چەندین

کتێب لەبارەی ئاینەکانەوە تا خوای گەورە ڕێنموونی کردم بۆ لای کتێبێکی قورئانی تەرجەمەکراو بۆ سەر زمانی ئەڵمانی.

بەم جۆرە ڕێگام بۆ هاتنە ناو ئیسلامەوە خێراو ئاسان بوو، کاتێك کەسورەتی الفاتحەم خوێندەوە، دڵسۆزیەکم لەدڵمدا بینی وکاتێك کە ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝١ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾م دووبارە ئەکردەوە هەستم کرد کە ئەمە ئەوەیە بەدوایدا ئەگەڕێم ئەمە ئەو خوایەیە کە لەبەندەکانی لە مرۆڤ خۆش دەبێت بەبێ ئەوەی کە قوربانی بەکوڕەکەی بدات، ﴿الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝٣ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ بۆم دەرکەوت کە ئەمە ئەو خوایەیە کە هەموو گەردوونی درووست کردووە و دەسەڵاتیشی بەسەریدا هەیە تا ڕۆژی لێپرسینەوە، ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ الفاتحة: ٥ لێرەوە بۆم دەرکەوت کە پێویست ناکات پشت ببەسترێت بەچیرۆکی خێزان و کوڕ و باوك، ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ الفاتحة: ٦ بەڵێ، کێ هەیە کەهیدایەتمان بدات جگە لە بەدیهێنەرمان ؟، ﴿صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾، پاش خوێندنەوەم بۆ ئەم وشە بەرزو جوانانەی ئەم سورەتە بەڕاستی گۆڕام بەرەو ئیسلام وئارەزووم پەیدا کرد بۆ زیاتر شارەزابوون لەم ئاین و شەریعەت و بەهاو ئەخلاقە..

* خێزانەکەت چۆن هەواڵی ئیسلام بوونی تۆیان وەرگرت بەتایبەت تۆ کەئەو کاتە منداڵ بوویت؟

دیارە هەڵوێستی باوکم زۆر تەقلیدیانە بوو، پاش ئەوەی کەقورئانەکەی خوێندەوە سوتاندنی، دایکیشم ڕێگر بوو چونکە دڵنیا بوو لەوەی کەئەگەر ئەو قورئانە لەناو بچێت من نوسخەیەکی تر پەیدا ئەکەم و ئەیکڕمەوەو ئەمەشی بەپارە بەفیڕۆدان دائەنا .

من لەباوکم پرسی باشە هیچ هەڵەو خراپەیەکت لەناو قورئاندا بینی ئاوا ئەیسوتێنی؟ وتی نەخێر!! من هیچ شتێکی هەڵەم نەبینیوە تیایدا بەڵام من وەك مەسیحی باوەڕم بەوە هەیە کە پەیوەندی بوون بەخواوە ناکرێت ببێت مەگەر تەنها لەڕێگای مەسیحی کوڕی مەریەمەوە، لەپاشدا باوکم بۆچوونی گۆڕدرا کاتێك یەکێك لەقەشەکان وتبوی ئەکرێت مسوڵمانان لەدوایدا بخرێنە پلەیەکی نزمی بەهەشتەوە .

*خێزانی باڵوێز ڕەفیق چانین لەسێبەری ئیسلامدا چۆن دەژین؟

من ئافرەتێکی مسوڵمانم خواست و ماڵەکەم بە تەواوەتی ڕەنگی ئیسلامەتی گرت..

## ١٠- چوو بۆ ئەوەی خۆی بکوژێت بوو بە بانگخواز !!

لە شاری (سانفرانسیسکو) کە یەکێکە لە شارە بەناوبانگەکانی ئەمریکا، ڕووداوێك بەسەر قوتابی (جیف)دا هات، ئەم قوتابیە لە یەکێك لە هەرە زانکۆ بەناوبانگەکانی ئەو وڵاتە دەیخوێند، ڕۆژێکیان لە لایەن سەرۆکی زانکۆکەیەوە دەعوەت نامەیەکی بۆ هات تا لەئاهەنگێکدا ئامادەبێت بەمەبەستی پیرۆزبایی کردن لێی، بۆ بەدەست هێنانی پلەی ماجستێر بەپلەی نایاب و شەرەفی یەکەم و هەروەها بەهۆی ئەوەی کە بچووکترین قوتابیە لە ئەمریکا کە ئەو پلەیەی لەو بواری پسپۆڕیەدا بەدەست هێنابێت، ئەمەش لەڕاستیدا بۆ خۆی شتێکی بەدەستهاتووی زۆر گەورەبوو بۆ ئەو زانکۆیە و پێویستیش بوو کە(جیف)یش شانازی پێوەبکات چونکە ئەوە دەستکەوتێکی مێژوویی بوو بۆی .

پاش تەواوبوونی ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵ سەرۆکی زانکۆ، لە دەم و چاوی جیف دا بەتەواوەتی تێبینی ناڕەحەتی و خەم دەکرا لەجیاتی ئەوەی وەك خەڵکانی تر کاتێك کەئەم جۆرە هەواڵانە دەبیستن زۆر دڵخۆش ئەبن و تەنانەت جۆرێك لە خۆشیش دەردەبڕن.

سەرۆکی زانکۆکە بەمە سەرسام بوو بەڵام پرسیاری لێنەکرد بۆچی وایە.

ئەوەبوو لە ڕۆژی دیاری کراودا ئاهەنگی دەرچوونەکە گێڕدرا و (جیف)یش بە جلی تایبەتی و بە ڕۆبی دەرچوونەوە ئامادە بوو،خرایە شوێنی ئامادەکراو بۆی و چەندین جار گوێی لە ناوی خۆی بوو لە دەنگۆکانەوە لەگەڵ چەندین پیاهەڵدان و باسکردنی ئەو بڕوانامەیەی بەدەستی هێناوە، پاشان لەناو چەپڵە لێدان و هاوارکردن و دەستخۆشی بنەماڵەکەی و هاوڕێیانی و ئامادەبووانێکی زۆردا سەرکەوتە سەر مەنەصەی سەرەکی بۆ وەرگرتنی بڕوانامەکەی و، لە کاتی وەرگرتنی بڕوانامەکەیدا (جیف) دەستی کرد بەگریانێکی زۆر بۆیە سەرۆکی زانکۆ بە سەرسوڕمانەوە پێی وت: تۆ لەبەر زۆری خۆشیت لە بەدەستهێنانی ئەم بڕوانامەیەدا دەگریت؟؟

(جیف) وەڵامی دایەوە: نەخێر من لەبەر زۆری دڵ تەنگیمە دەگریم، سەرۆکی زانکۆ زۆر سەری سوڕما و پرسی بۆچی کوڕم؟ تۆ پێویستە لەمڕۆدا زۆر دڵخۆش بیت.

---

١- المجتمع ژ: ١٦٨٢

جیف وتی: من وا گومانم نەبرد کە لە بەدەستهێنانی ئەم سەرکەوتنەدا دڵخۆش دەبم بەڵام من هەست ئەکەم شتێکم نەکردووە بۆ خۆشگوزەرانی نەفسی خۆم، وە من هەست بەدڵتەنگی و نارەحەتیەکی زۆر ئەکەم کە نە بڕوانامە و نە پلەی زانستی و نەناهەنگ دڵخۆشم ناکات.

پاشان جیف بڕوانامەکەی هەڵگرت و زۆر بەخێرایی لەو شوێنە کشایەوە بەبێ ئەوەی چاوەڕێ بکات تاناهەنگەکە کۆتایی بێت و پیرۆزبایی لێبکرێت لەلایەن هاوڕێیان و نزیکانی یەوە.

(جیف)گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و بڕوانامەکەی ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد، پاشان کەوتە قسەکردن لەگەڵ بڕوانامەکەیدا و پێی وت من چیت لێبکەم؟

تۆ پێگەو کارێکی دیارو ڕازاوەت بەمن بەخشیوە لە ناو زانکۆدا و بوومەتە دەنگوباسی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بەڵام تۆ خۆشگوزەرانیت بەنەفسم نەبەخشیوە، من ئەمەوێت لەناخدا خۆشحاڵ بم، لە دنیادا هەموو شتێك هەر بڕوانامە و پلەو پایەو ناوبانگ و پارە نیە، بەڵکو شتێکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە کە دەبێت ئێمە دڵخۆش بین.

هیچ یەکێك لەنافرەت و خواردنەوە و ڕابواردن نەیانتوانی کە دڵی (جیف) خۆش بکەن و بە پێچەوانەوە ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر دڵی تەنگ ئەبوو بۆیە بڕیاری دا کە سنورێك بۆ ئەمە دابنێت و خۆی بکوژێت، بۆ ئەمەش ڕێگایەکی دۆزیەوە کە لەسەر جسری (گولدن گیت) واتە جسری دەرگای ئاڵتونی کە یەکێکە لە بەناوبانگترین جسرەکانی ئەمریکا و وەك لایەنێکی شارستانی ئەو وڵاتەش سەیری دەکرێت و یەکێکە لە گرنگترین لایەنەکانی پێشکەوتنی تەکنەلۆجی و زانستی ئەمریکا، خۆی فڕێبداتە خوارەوە، بۆئەم مەبەستە (جیف) بەرەو دەرگای ئاڵتونی کەوتەڕێ، لەوێدا چەند گەنجێکی خواناس هەبوون کە لە نزیك ئەو شوێنەوە لەبەر کەم دەرامەتی لە ژوورێکی بنی کەنیسەیەکدا دەژیان و بەمەستی خوێندن لە ئەمریکا بوون و خۆیان بۆخوا یەکلایی کردبۆوەو خەریکی بانگخوازی و خواناسی بوون، لەوکاتەدا کە (جیف) چوو بۆ خۆکوشتن ئەمانە لەنزیکی ئەو ناوچەیە بەمەبەستی بانگکردنی خەڵکی بۆلای ئیسلام بەجل و بەرگی ئیسلامیەوە دەسوڕانەوە و لەبەر زۆری سەجدە بردنیشیان بۆخوای گەورە ناوچەوانیان ئەگەشایەوە، کاتێك (جیف) ئەمانەی بینی زۆر پێیان سەرسام بوو، لەژیانیدا خەڵکانی وای نەبینیبوو نە بەو جلوبەرگانەوەو نە بەوجۆرە جازبیەتەش کە ڕایان ئەکێشا بەلای

خۆیاندا، بۆیە لێیان نزیك بۆوە و لێی پرسین: ئێوە کێن وبۆچی ئەم جۆرە جل و بەرگەتان لەبەرکردووە؟

یەکێکیان وەڵامی دایەوە و وتی:

ئێمە مسوڵمانین و، خوای گەورە پێغەمبەرمان محمد ﷺ ی ناردووە بۆلامان تا خەڵکی لە تاریکییەوە بەرەو ڕووناکی بەرێت و هەتا خۆشگوزەرانیو دڵخۆشی بۆ مرۆڤایەتی بێنێت لەدنیاو لە دوارۆژدا.. ..

کاتێك گوێی لەوشەی (خۆشگوزەرانی) بوو، هاواری کرد تا خۆشگوزەرانیان بۆبێنێت.. !! من بەدوای خۆشگوزەرانیدا دەگەڕێم ئایا لەلای ئێوە دەستم ئەکەوێت؟ وەڵامیان دایەوە کە ئیسلام ئاینی خۆشی و خۆشگوزەرانی یە، ئاینێکە هەمووی خێرە، دوامان بکەوە بەڵکو خوای گەورە هیدایەتت بدات بۆ سەردینەکەی و چێژی خۆشگوزەرانی بکەیت، ئەویش وتی لەگەڵتاندا دێم وناشزانم ئەو خۆشگوزەرانیەی کەباسی دەکەن خۆشگوزەرانی ڕاستەقینەیە یان نا. من پێش ئەوەی ئێوە ببینم بۆ ئەوە هاتبووم تا لەسەر ئەو جسرەوە خۆم فرێبدەمە خوارەوە و خۆم بکوژم، چونکە من خۆش گوزەرانیم نە لە پارەو نە لە ڕابواردن و نە لە بڕوانامەدا نەبینی کە بەدەستم هێناوە .

پێیان وت: وەرە لەگەڵماندا ئاینەکەمانت فێر ئەکەین بەڵکو خوای گەورە ئیمان بخاتە دڵتەوە و هەست بە خۆشی بکەیت خوای گەورەش توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.. ..

(جیف) لەگەڵ ئەو مسوڵمانانەدا چوو بۆ ژوورەکەیان و لەوێ ئیسلامیان بۆ باسکرد، قەناعەتی کردو وتی: بەڕاستی ئەمە ئاینێکی باشە، ئارۆم هەتا نەیەمە ناو ئاینەکەتانەوە، هەر لەوێدامسوڵمانبوونیخۆی ئاشکرا کرد .

جیف بینی کە خۆشگوزەرانی لە ئیسلامدایە، لە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەیدایە، پاشان زیاتر دڵخۆش بوو بەوەی کە بوو بە بانگخوازێك لە ئەمریکادا بۆ ئاینی خواوناوی خۆی گۆڕی بۆ (جەعفەر).

## ١١- خەدیجەی فەڕەنسی: ئیسلام هەموو شتێکی پێبەخشیم..

ئەم ئافرەتە یەکێکە لەو ژنانەی کە بە مسوڵمانبوونیان زۆر دڵخۆشن و شانازیەکی گەورەش بە مسوڵمانبوونەکەیەوە ئەکات سەرباری ئەو کێشانەی کە تووشی بووە، سوورە

لەسەر باوەڕداریەکەی و ناوی خۆشی لە (کاترین مورروا)وە گۆڕیوە بۆ (خەدیجە عبداللە) بۆ زیاتر ئاشکراکردنی مسوڵمانبوونەکەی و لەپێناو خزمەتی ئیسلامیشدا توانیویەتی کۆمەڵەیەك لەفەڕەنسا بەناوی (ئافرەتانی مسوڵمانی فەڕەنسا)و دابمەزرێنێت.

* پێمان خۆشە لێت بپرسین چۆن بوویت بە مسوڵمان؟ ئەمەوێت لەسەرەتادا بڵێم: ئەو هەستەی کە من ئەمڕۆ هەمە زۆر جیاوازترە لەوەی کە لەپێشتردا هەمبووە، من ئەمڕۆ مرۆڤێکی ترم، هەست بە خۆشگوزەرانی ڕاستەقینە دەکەم لە پەیوەندیدا لەگەڵ خۆم و لەگەڵ دەوروبەردا، ئیسلام بەنیسبەت ئێمەوە وەك فەڕەنسی ئاینێکی نامۆنیە و گەیشتنیشم بەئیسلام بە ڕێکەوت نەبووە چونکە ئێمە بە حوکمی ژیانی زانکۆ و هەندێك بابەتی تر بەردەوام لەگەڵ پەناهەندەی مەغریبی و مسوڵمانانندا هەڵسوکەوت ئەکەین، بۆ خۆشم چەندجارێك سەردانی وڵاتانی وەك مەغریب و تونس و جەزائیر و لیبیام کردبوو ئەوەی لەم کۆمەڵگا مسوڵمانانەدا زۆر سەرنجی ڕاەکێشام بریتی بوو لەو خۆجیاکردنەوە جوانەی کەلەم کۆمەڵگایانەدا هەبوو، سەرباری ئەوەی کەزۆر سادە بوون هەوڵی خۆیەگەورە پیشاندانیان ئەداو شتێکیان هەبوو کەشانازی پێوەبکەن وگەورەیان بکات کەئیسلام بوو،سەرسام بووم بەو یەقینەجوانەیکەلەچاوی ئەومرۆڤە سادانەوە ئەبینرا، ئەمەش بابەتێکی یەکجار گەورەبوو بۆ من.

پاشان وا ڕێکەوت کە داوەتنامەیەکم بۆهات لە مەغریبەوە تا لەوێ وانە بڵێمەوە، بۆیە سەفەرم کرد بۆ مەغریب و لەوێ ڕێم لە کەسێکی مەغریبی کەوت کە لە دوایدا بوو بەهاوسەرم ئەم کەسایەتییە زۆر شتی بۆ ڕوونکردمەوە و زۆر شتیشی بۆ ڕاستکردمەوە،لێرەوە بووم بە مسوڵمان بەڵام ئەم بڕیارەم نە بەپەلە بوو وە نە لێشی پەشیمانم بگرە زۆر شانازی پێوە ئەکەم، بڕیارێك بوو کە پاش قوڵبوونەوەیەکی یەکجار زۆرو بەو پەڕی باوەڕبەخۆبوونەوە هاتە کایەوە، لەبەر ئەوەی من لە ئیسلامدا ئەو ژیانەم دۆزییەوە کە پێویستم پێی بوو، ڕێز و بەرزی و خۆشەویستی خەڵکیم بینیەوە، بۆیە لەگەڵیاندا ئاوێتە بووم و هەرگیز لێیان جیانامەوە .

هەروەها لە ئیسلامدا من ڕێزی میوان و خۆشەویستی چاکەو دوورکەوتنەوە لە درۆ و دووزمانیم دۆزیەوە، لەئیسلامدا پیرۆزی دایك و باوکم بینی، ئەمانە سەرجەم وێنەی ئیسلامن کە منیان لە لەناوچوون پاراست، من مسوڵمانم و زۆریش دڵخۆشم بە ئیسلامەکەم، بۆیە لێرەوە ئیدی بیرم کردەوە کە ئافرەتانی تری فەڕەنسیش لەو لەناوچوونە ڕزگار بکەم بۆئەمەش کۆمەڵەی (ئافرەتانی مسوڵمانی فەڕەنسا)م دامەزراند، کەوا بۆ پێنج ساڵ ئەچێت سەرۆکایەتی

ئەکەم، ئایشارمەوە کە لە سەرەتادا تووشی چەند گیروگرفتێك بووم، هەموو بە (شێت)یان لەقەڵەم ئەدام کاتێك کەمسوڵمان بووم، بەتایبەتی کەسوکارم و هاوڕێیانم و تەنانەت قسەشیان لێ دابڕیم لەسەرەتادا، بەڵام لەدوایدا ورده ورده ڕاهاتن و ئێستا هەرچۆن بێت باوەڕیان بەوە هێناوە کەمن ڕێگایەکی ڕاستم هەڵبژاردووە.

* لەم ساڵانەی دوایدا چەند ئاڵوگۆڕێکی سیاسی بەسەر فەڕەنسادا هات بەتایبەتی کاتێك گەیشتە ئەوەی کە ڕێگەی باڵاپۆشی ئەدرێت لە خوێندنگاو دام و دەزگا ڕەسمیەکانی وڵاتدا..

* ئێوە وەك کۆمەڵەی ئافرەتانی مسوڵمانی فەڕەنسا چۆن ڕوویەڕووی ئەم یاسایەبوونەوە؟

من بڕوام وایە ترسناکترین ئەمانی ئازادی لە فەڕەنسادا دەرچوونی ئەم بڕیارەبوو کە ڕێگا نادات ئافرەتان بەئارەزووی خۆیان سەریان داپۆشن، ئەمە کۆتێکی ڕاستەقینەیە بۆ کەسەکانی ئەو دەوڵەتەی کە لە دەستورەکەیدا زیاتر لە سەد مادە باسی ئازادی تاکە کەسی و ڕێزی ئازادی بەرامبەر ئەکات.

ئەوەی جێگای داخە ئەوەیە ئەمە تەنها بڕیارێك نەبوو بەڵکو ئەمە موئامەرەیەکە لە بوونی فیعلی مسوڵمانان ئەکرێت لەفەڕەنسادا.

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە حکومەتی فەڕەنسا ئیجرائات لەسەر بوونی لۆبی جولەکە ناکات لە فەڕەنسا کە لە کۆتایدا نەك بۆ فەڕەنسا بگرە بۆ سەرجەم باشووری ئەورووپاش مەترسیان دیار و ئاشکرایە، بەجۆرێ کەئەمانە بەجۆرێکی زۆر نابەجێ دژی ئەوانەن کە داوای لێبووردەیی و ڕاستی ئەکەن لە ژیانی فەڕەنسادا.

ئەمەش لە دواجاردا بۆخۆی وەك ئینقلابێکی سیاسی وایە لە فەڕەنسادا و ئەوەشی کە سوودی لێدەبینێت تەنها جولەکەو ئەوانەیە کە بەرژەوەندیان لەگەڵ جولەکەدا هەیە لەفەڕەنسا و دوایش دەبێتە پەنگخواردنی ئازادی و، ئازادییەکان پێشێل ئەکرێن.

* خوشکە خەدیجە تۆ مامۆستایەکی زانکۆیت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە باڵاپۆشی بەزۆرە ملێ لەزانکۆ دەرکرایت و، ئەمەش ڕۆژانە چەندەها ئافرەتی مسوڵمانی فەڕەنسی تووشی ئەبێت، تۆ لەم بارودۆخە نالەبارەدا چۆن ئەژیت؟

بەڵێ من لەبەر باڵاپۆشیم لە زانکۆ دەرکرام، لەسەرەتادا سەرۆکی زانکۆکەم زانکۆی (برفانس) داوای لێکردم کە ئەگەر واز لەباڵا پۆشی بهێنم ئەوە پارەم بۆ زیاد ئەکرێت و چەند بەڵێنێکی لەم بارەیەوە پێدام بەڵام ئاشکرایە کە باڵاپۆشی بەنیسبەتی منەوە تەنها کردارێك نیە هەروەك هەندێك دەڵێن داپۆشینی سەرێت بەڵکو بریتیە لە هزر و بیر، باڵاپۆشی تەنها بریتی نیە لە جلوبەرگێك بەڵکو بریتیە لە باوەڕ و یەقینێك کە بۆیەکەم جار لە ڕێگایەوە هەستم کرد بەوەی کە من بوونم هەیەو مرۆڤم، لەبەر ئەوە هیچ کەسێك و هیچ شتێك نیە بتوانێ لەسەری مساوەمەم لەگەڵدا بکات !!

من سوپاس بۆخوا لەڕێگای ڕێکخراوەکەمەوە توانیومە ئێستا ئەو بۆشاییە تاڕادەیەکی باش پڕبکەمەوە و ئێستا لە ڕێکخراوەکەمدا چەندین ئافرەتی مسوڵمانی پسپۆری بوارە جیاجیاکانی کۆمەڵناسی تیایەو توانیومانە لەڕێگایەوە چارەسەری کێشەی چەندین ئافرەتی مسوڵمان بکەین و، چەندین ئافرەتی نامسوڵمانیش کە فەڕەنسین ڕامانکێشاون بۆناو ڕێکخراوەکەمان و هەندێکی زۆر لەوانە لەدوایدا بۆخۆیان بوون بەمسوڵمان و سوپاس بۆخوا لەگەڵمان ماونەتەوە، ئەمەش ئێمە بەئەرکی سەرشانی خۆمانی دەزانین چ وەك مسوڵمان چ وەك فەڕەنسیش و، توانیومانە زۆرێك لەو ئافرەتانە لەلای خۆمان کۆبکەینەوە کەتوشی ستەم بوون لەناو دامودەزگاکانی فەڕەنسادا و، توانیومانە ئەوە بکەین بە پرەنسیپ کە مسوڵمانانیش بەتایبەتی ئافرەتی مسوڵمان مافی خۆیەتی کە لە کۆمەڵگادا بە پێی یاسا ڕۆڵی خۆی ببینێت.

ئەمەوێت لەکۆتایدا ئەوە بڵێم من کاتێك شایەتمانم هێنا لەبەردەم ئیمامی مزگەوتدا لە پاریس بەڕاستی هەستم کرد کەتازە لەدایك بووم و، هەستم بە خۆشیەك کرد کەنازانم چۆن باسی بکەم، هەستم کرد گرێکانی ناخم دەکرێنەوە، بۆیەکەم جار لەژیانمدا هەستم کرد گەیشتوومەتە ئەو ئاواتەی کەچەندین ساڵە بەدوایدا دەگەڕێم.

لەوڕۆژەوە من زۆر گۆڕاوم و زۆر لێبووردەم لەگەڵ خەڵکانی تردا، بووم بە کەسێکی ئارامگر و لە خۆبردوو، ئێستا کاتەکانم لە شتی زیادەو بێمانادا بەسەر نابەم، ئێستا من ئامانجێکم هەیە ئەویش ماڵەکەم و منداڵەکانم و مێردەکەمە کە بۆ خۆم کردوومن بە بەهەشتێکی بچووك و تیا ئەژیم لەم دنیایەدا کەئەمەش تەنها بەهۆی ئیسلامەوە بوو.

من جاران زۆر دوودڵ و خەمبار بووم نەم ئەزانی چی بکەم، هەموو کات لەخۆمم ئەپرسی چارەسەر چی یە؟ ئێستاش من ئەو پرسیارە ناکەم چونکە ڕێگای ڕاستم دۆزیوەتەوە و خوای گەورە ڕێنمونی کردووم .

ئێستا کە خەڵکانێك ئەبینم بەدوای دنیادا ڕانەکەن و پێوەی خەریکن زۆر بەزەیم پیایاندا دێتەوە چونکە ئەزانم ئەوانە ئێستا لە ڕۆچوونێکی تەواوی نەفسی و ویژدانیان.

هیوائەخوازم کەیارمەتیان بدەم بۆئەوەی باوەڕبهێنن بەوەی من باوەڕم پێهێناوە و هەمووکات پێیان ئەڵێم: سەیری من بکەن ئیسلام نەك هیچی لێنەسەندم بەڵکو هەموو شتێکی پێبەخشیم. سوپاس بۆخوای گەورەش بۆ ئەو هەموو بەخششە.[1]

## ١٢- موسوڵمانبوونی ئافرەتێکی ئوستوراڵی:

سەلما ئافرەتێکی ئوستراڵییەو، خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی کەنیسەدا تەواوکردووەو، لەوێوە گەشەی کردووە و کاروانی ژیانی لە پشت دیوارەکانی کەنیسەوە دەست پێکردووە، گوێی بۆ ئاوازی دەنگی زەنگەکەی و سروودی نزاو پاڕانەوەی دەگرت.

لەم چەند دێرەی خوارەوەدا سەلما گەشتەکەی خۆمان بۆ دەگێرێتەوە کە چۆن لەتەنگەبەری ژیانەوە بەرەو فراوانی ئیسلام، ڕۆیشتووە و دەڵێت:

بیرو باوەڕی مۆرمەن:

من لە خێزانێکی ئوسترالی لە دایك بووم کە سەر بە تایەفەی (مۆرمەن) ن ئەو تایەفەیەش هەندێ بیر و باوەڕی تایبەت بە خۆیان و جیاواز لە مەسیحییەکانی تر هەیە، ئەم تاقمە پێیان وایە کە هەموو خەڵکی منداڵی خوان و مەسیحیش کوڕە گەورەی خوایە و، وەحی بەردەوامە و بەتیاچونی مەسیح کۆتایی نەهاتووە و ناو بەناو پێغەمبەر و پەیامێك لەم سەرو زەوییەدا پەیدا دەبێ، پێغەمبەری ئێستایان لە ئەمریکادایە..

پاش دەرچوونم لە کەنیسە بووم بە مامۆستا و دەرسم دەوتەوە، من لە ئاینەکەمدا بە تەواوی ڕۆچوویووم، ئەوەبوو لەناو کەنیسە دەرسم دەوتەوە و لە دەرەوەیشیا خەڵکیم بۆ بانگ دەکرد.

---

١- سایتی: المسلم.

ئافرەتانی کەنیسە:

لەگەڵ ئەو پابەندی و جدیەتەی هەمبوو لەبڵاوکردنەوەی ئاینەکەمدا، کۆمەڵێ پرسیارم هەبوو کە خەویان لێ زڕاندبووم، هەرچی لەبارەیانەوە پرسیارم دەکرد وەڵامێکم نەدەبیست قەناعەتیان پێ بکەم، من پرسیارم دەکرد: بۆ دەبێ خوا پێویستی بە واسیتەیەك هەبێ کەنوێنەرایەتی بکات؟ بەوە قەناعەتم نەدەکرد کە لەوەڵاما دەیان وت: خوا پێویستی بە یەکێك هەیە کەلێمان ببورێ... من هەستم دەکرد کە مەسیح لە ڕۆحیەتدا لەمن بەرزتر و بەهێزترە و پێغەمبەریشە، بەڵام نەم دەتوانی قەناعەت بەوە بکەم کە ئەو پێویستە هەڵبواسرێ تامن رزگارم ببێ، من هەستم وابوو کە دەبێ بەکردەوەی خۆم رزگارم ببێ..

## ئاسۆی زانیاری:

لەبارەی زانست و زانیاری خۆیەوە سەلما دەڵێ: فەلسەفە و ئەدەبم لە زانکۆدا تەواو کرد وسوور بووم لەسەر خوێندنەوەی بیری مارکسیو هیندۆسی و بوزی، من زۆر بایەخم بە تەناسوخوی ئەرواح و بزوتنەوەی ئافرەتان دەدا و، سۆزم بۆیان هەبوو،چونکە پێم وابووکە ڕۆژئاوا مافێك بە ئافرەت نادات و، بگرە لە ناوماڵی خۆشیا لەنێوان خزم وبراکانیا پارێزەری نییە، وەك لاشەیەکی بێ کەسایەتی و بێ ژیری سەیر دەکرێ.. ئافرەت لە راگەیاندنەکانا بەکاردێنرێ بۆ فرۆشتنی کەلوپەلی بازرگانی.. بەڵام بۆم دەرکەوت ئەو بزوتنەوانەش شتێکیان بۆ مرۆڤایەتی بەدی نەهێنا، چونکە هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوەبوو دەسەڵات لەدەست پیاو دەربێنن و بیدەن بە ئافرەت.

## سوورەتی مەریەم هەژاندمی:

سەیر ئەوەیە هۆی موسڵمان بوونم دەگەڕێتەوە بۆئەوکارەی لەکەنیسەدا دەمکرد وەك سەردانی خەڵکیی و بانگکردنیان بۆ مەسیحیەت..قەدەر وابوو سەردانی خێزانێکی لوبنانی موسوڵمانمان کرد بۆ ئەوەی بۆ ئاینەکەی خۆمان (مۆرمەن) بانگیان بکەین، بەڵام ئەوان بانگیان کردم تا گوێ لەسوورەتی مەریەم بگرم، منیش رۆیشتم و گوێم گرت، سەیری خۆمم کرد دەگریم وهەستەکانم دەهەژێنێ، پاشان وەرگێڕاوی ئینگلیزی یەکەیان بۆ خوێندمەوە، هەموو ئەو پرسیارانەی کەمن لە منداڵیمەوە بە شوێنیانا عەوداڵ بووم وەڵامەکەیانم لەو سوورەتەدا بە تەواوی دەستکەوت.. ئا لەوێدا هەستم کرد کە هەموو ژیانی ڕابوردووم راست و دروست

نەبووە، پاش گەڕانەوەمان ولە کۆبوونەوەی هەفتانەی کەنیسەدا ئاگادارم کردنەوە کەمن بڕیارم داوە واز لە کەنیسە بێنم.. چونکە ڕێیەکی ترم بۆ خۆم دیوەتەوە و سوپاسیشم کردن، چونکە کارکردنم لەگەڵ ئەواندا بووە هۆی ئەوە من ڕێی بەرەو خوا ببینمەوە..

پاش ئەوە دەستم بەخوێندنەوە کرد تا زیاتر لە ئیسلام شارەزا ببم، هەرچی زیاتر لەبارەیەوە ئەم خوێندەوە زیاتر پێوەی دەستگیر دەبووم ومتمانەم بۆ دروست دەبوو کە ئەم ئاینە حەقە، نیشانەکانی پرسیار لە زەینما بەتەواوی نەما، هەمەلایەنی و گشتگیری ئیسلام لەبەشی زۆری ئەو شتانە دووری خستمەوە کە جاران خولیایان بووم، سەیرم دەکرد ئیسلام هەموو گۆشەیەکی ژیان دەگرێتەوە، لەگەڵ ئەوەدا ڕووگەکانی تر تەنیا لایەنێك یاچەند لایەنێکیان بایەخ پێداوە و بەشێکی زۆریان وێڵ کردووە. ئەو هەستەم بۆ دروستبوو کە ئیسلام ئاینێکی گشتگیرە، و لە هەموو لایەنێکی ژیانەوە بەختەوەری بۆ مرۆڤ بەدی دێنێ، ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە بزوتنەوەکانی مافی ئافرەت لە ڕۆژئاوادا بۆیە دروست بووە چونکە ئافرەت مافێکی نەبووە، و ڕۆژئاوا هیچ مافێکی نەداوەتێ.. بەڵام ئیسلام هەموو مافێکی بەتەواوی داوەتێ بێ ئەوەی داوای بکات، ئەو بزوتنەوانە هەموو مەبەستێکیان دەرهێنانی دەسەڵاتە لەدەست پیاو و بەخشینیەتی به ئافرەت، بەڵام ئیسلام بەختەوەری هەردوولای دەوێ..

ئەو وێنەیەی بۆ یەکیەتی مرۆڤایەتی خەوم پێوە دەبینی، بە بێ جیاوازی ڕەنگ یا ڕەگەز، یازمان، سۆزو بەزەیی لە نێوانیاندا، لە ئیسلاما دەستم کەوت، لە دنیادا هیچ بانگەوازێك نییە توانیبێتی بەو شێوەیە مرۆڤایەتی کۆبکاتەوە کەئیسلام کۆی کردوونەوە، بەڵام بە داخەوە موسوڵمانان خراپەیەکی گەورەیان بەرامبەر ئاینەکەیان کردووە، چونکە شوێن هەواو هەوەسیان کەوتوون نەك ئاینەکەیان، ئەوەی بیانەوێ لە ئیسلامی وەردەگرن و لە ڕۆژئاواش..

ناموسڵمانانیش لەو وێنەوە سەیری ئیسلام دەکەن کە موسوڵمانان پیشانی دەدەن، ئەویش وێنەیەکی زۆر ناشیرین و دوور لە ئیسلامە، ڕۆژئاوا دەزانێ کە ژیانیان چەند نەخۆشە، بەڵام لە ئیسلام دەترسن وهێرش دەکەنەسەری و وێنەیەکی پرشنگدار بۆ ڕۆژئاوا دەکێشن..

## موسولمانبوونی خۆم ئاشكراكرد:

موسولّمانبوونی خۆم له ماڵبۆرن ئاشكراكرد، لەوێ هەندێ لەو خوشكانەم ناسی كه تازه خوا هیدایەتی دابوون، لەگەڵ ئەوانا دەستم بەچالاكی بانگەوازكردو، بۆم دەركەوت كەئیسلام گەورەترین ئاینێكە لەناو ئوستراليیەكانا بلاودەبێتەوە، بەڵام ئێمە بەرپرسیاریەتێكی گەورەمان لەئەستۆدایەو، دەبێ منداڵەكانمان لەسەر ئیسلام پەروەردە بكەین و، تێیان بگەیەنین كە ژیانی رۆژئاوا نەخۆشە، هەرچەندە هۆكارەكانی راگەیاندن بە جۆرێكی تر پیشانی دەدەن، دەبێ منداڵەكانمان رابێنین لەسەرئەوەی بیر لە هەموو شتێك بكەنەوە و بەرەلاّیان نەكەین تا هەرشتێكیان بینی بێ بیرلێكردنەوە وەری بگرن. هەروەها پێویستە لە دەروونیاندا شانازیكردن بە ئیسلامەوە بچێنین و فێریان بكەین كە ئیسلام چی پێشكەش بە شارستانیەتی رۆژئاوا كردووە، بگەڕێینەوە بۆ ڕەوشت وبەها بالاّكانی ئیسلام.[1]

## دواوته:

پاش ئەم گەشتە ئیمانیە با لەخۆمان بپرسین: بیانیەك كە موسڵمان دەبێت یەكسەر دەكەوێتە بانگەوازكردن، كە ئەوەش دەبێتە مایەی فێربوونیان و سەرفرازی دنیاو ئاخیرەت.. چەند نموونەیەكمان باسكردوئەمەش دووغوونەی تر:

١- لاوێك لە لەندەن كراسێكی لەبەركردووە كە لە پشتەكەی نووسراوە (ئەگەر دەتەوێت لە بارەی ئیسلامەوە بزانیت ئەم كەسە رابگرە).. بەم هۆكارە سەیرە ئەم لاوە توانی زیاتر لە سێسەد كەس موسڵمان بكات، رۆژێك بە پەلە دەچێت بۆ بنكەی ئیسلامی لەندەن و داوای نامیلكەو بابەتی ئیسلامی دەكات تا بیدات بەوانەی كە موسڵمان بوون، بەڕاستی هۆكاری بانگەوازكردن بێ ئەندازن نازانم تاكەی ناجوڵێین ؟؟؟!

٢- شێخ ئەحمەد دیدات نەك هەر مژدەدەرانی گاور بەڵكو تەنانەت پاپاشی بەزاندو بۆڕدا، ئەو لەم ساڵانەی دوایدا مردو دكتۆری جەراح زاكر نایكی قوتابی ئالاّكەی هەڵگرت و بەهەمان شێوەی ئەو گاورو جوولەكەی بەزاندووە، كە تەمەنی سی و نۆ ساڵەو شەش سەد وتاری داوە لە

[1] - سایتی: (ئیخوان ئۆن لاین)

سێ ساڵدا لە ئەمریکاو کەنەداوبەریتانیاو خوارووی ئەفریقیاو سعودیەو ئیمارات و مالیزیاو فلیپین و سەنغافورەو ئوستralیاو.. هتد..

مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت چەند کەس لەسەر دەستیا موسڵمانبوون. ڕۆژێك بڕیار بوو مونازەرەیەك لەگەڵ قەشەیەکدا بکات، کەچی مونازەرەکە نەکرا دەزانن بۆ؟؟ لەبەرئەوەی قەشەکە موسڵمان بوو!! مەوقیعەکەشی (www .irf.net) ە.

باشە با بیر بکەینەوە ئەگەر لە قیامەتدا لە پاڵ ئەم کەسانەدا حەشرکراین حاڵمان چی دەبێت؟؟ ئەوانە بە سەدان و بەهەزاران کەسیان هێناوە بەرەو ئیسلام و ئێمەومانانیش تا بینەقاقامان غەرقی هەڵەو کەموکورتیەو خۆشمان نازانین خەریکی چین!! تا ئێستا بۆ خواو بانگەوازەکەی یەکلایی نەبووینەتەوە !!

نەك هەرئەوەندە بەڵکوبانگ دەکرێین بۆ موحازەرەیەك بەلامانەوە زەحمەتە بچین، لەکاتێکدا ئەوە مەجلیسی زیکرەو مەلائیکەتان بەدوایا دەگەڕێن لەسەر زەویدا، ئەوانەی ئامادەی بن لای خوا ناویان دەبرێت و خوا لێیان خۆش دەبێت..

ئەو مەجلیسە دەرگایەکە بۆ بەهەشت و، ئەوەندە گەورەیە ئەگەر کەسێك بەبێ ئەوەی لەوان بێت و بە هەرکارێك لەوێ ئامادەبێت خوا لەویش خۆش دەبێت.. ئەمەش تەنها کارە لە ئیسلامدا کە ئەگەر نیەتیشت نەبێت بۆی هەر بۆت حساب دەکرێت !!!

دەبا لە کۆڕی خواناسان و بانگخوازاندا ئامادەبین بەڵکو بەر ڕەحمەتی خوا بکەوین..

## پێشەکی :

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهان و درورود و سەلامیش لەسەر پێشەواو مامۆستا و ڕابەرمان (محمد) ﷺ ، ڕەحمەت وبەرەکەتیش داباریێ بۆ سەر گیانی یارو یاوەران و شوێن کەوتوان.

هاتن بەرەو ئیسلام هاتنە بەرەو ئاشتی..

ئاشتی مرۆڤ لەگەڵ نەفسیخۆیدا، خەڵکێکی زۆر وان لە کێشەمەکێش دا لەگەڵ نەفسیاندا، ئیسلام دەیەوێ بڕوادار دڵئارام ودڵشاد و ئاسودە و لە ئاشتی بەردەوامدا بێت لەگەڵ نەفسیا و، ڕێ ی خۆی بدۆزێتەوە و بزانێت خەریکی چییە و بەرەوکوێ دەچێت.. نەفس گرنگە، قورئان سوێندی پێدە خوات ﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا ﴾ الشمس: ٧ - ١٠

بڕوادار لە ئاشتیدایە لەگەڵ نەفسیا، تەنها یەك خوا دەپەرستێ، تەنها لەیەك خواوە بەرنامەی ژیان وەردەگرێ ﴿ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ﴾ الزمر: ٢٩ واتە: خوا نموونەتان بۆ دێنێتەوە بەکەسێك کە چەند گەورەیەکی دژ بەیەکی هەبێ و،هەریەکەیان بەلایەکدا بینێرێ و هەریەکەیان شتێکی پێ بڵێ کە پێچەوانەی ئەوی تر بێت، ئایا ئەمە وەك ئە کەسەیە کە تەنها یەك گەورەی هەبێ وفەرمانی یەك کەس جێبەجێ بکات ؟! دیارە ئەم کەسەی دوایی ئاسودەترەو وەزعی باشترە !

ئیسلام دەیەوێت مرۆڤ لەئاشتیدا بێت لە ماڵ وخێزانیدا، لەگەڵ دایك و باوکیا، لەگەڵ کۆمەڵگەدا، ئەمەش بە کۆمەڵێ فەرمان و ڕێنمایی فەراهەم هێناوە بۆ نموونە کە دەفەرموێت(لا یؤمن أحدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه)کەستان بڕواداری تەواونین تا ئەوەی بۆ خۆتان پێتان خۆشە بۆ براکەشتان پێتان خۆش نەبێ.[1]

---

١- بخاري ومسلم.

یان کەدەفەموێ (كل المسلم على المسلم حرام:دمه وعرضه وماله)[1]، یان کە دەفەرموێ (والله لا يؤمن، والله لا يؤمن، والله لا يؤمن: قيل من يا رسول الله ؟قال الذي لا يأمن جاره بوائقه)[2].

هەروەها دەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴾ البقرة:٢٠٨، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەر هەمووتان بچنە ژێر سایەی ئیسلامەوە و بە تەواوی پەیڕەوی بکەن (کە مایەی ئاشتی و بەختەوەری دنیاو قیامەتە)و دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بە ڕاستی ئەو دوژمنی ئاشکراتانە..

ئیسلام تەنانەت ئاشتی دەوێت لەگەڵ دوژمناندا، بەڵام ئاشتیەك کە موسڵمانان بەهێز بن، نەك لە بێ هێزیەوە بێت و دوژمن شەرت و شروتی خۆی بسە پێنێ.

قورئان دەفەرموێت:﴿ فَلَا تَهِنُواْ وَتَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلۡمِ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمۡ وَلَن يَتِرَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴾ محمد:٣٥، واتە: ئێوە سستی مەکەن و لاوازمەبن ولە بێ هێزیەوە داوای ئاشتی مەکەن، چونکە هەر ئێوە سەرکەوتوون و خواش لەگەڵتانەو کاروکردەوەتان بەزایە نادات .

بەڵێ...ئەگەر ئەوان ئاشتیان ویست و دەست درێژیان نەکرد بڕواداریش دەیکات﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ ﴾ الانفال:٦١، واتە: ئەگەر دوژمنان حەزیان بە ئاشتی کرد تۆش ئامادەیی خۆت دەربڕە و پشت بە خوا ببەستە.

بەڕاستی تەنها ئیمان و ئیسلامە کە ئازادی، ئاسودەیی، ئارامی، ئاشتی بۆ مرۆڤ دەهێنێت، نەماڵ ومناڵ، نەتەخت و کورسی، نەپلەو پایە، ناتوانن ئەوانە فەراهەم بێنن ئەگەر ئیمان و بڕوای لەگەڵ نەبێت. باشترین نموونەش لەمڕۆدا، (بيل گيتس)ە کە نزیکەی (٦٥) ملیار دۆلاری هەیە و دەوڵەمەندترین کەسە لە جیهاندا، کە دەڵێت: ماڵ و سامان بەس نین بۆ بەختەوەرکردنی مرۆڤ، بگرە ڕەنگە بشبێت بەبەلا بۆ خاوەنەکەی،من هەست ناکەم کە

---

١- بخاري ومسلم.

٢- بخاري.

سامانەکەم هەموو شتێکی بۆ بەدیهێنابم، من بە تەنها دەژیم و لە میحنەتدام بەدەست سامانەکەمەوە، خۆزگە ناودار نەبوومایە و دەوڵەمەنترین کەس نەبوومایە، خۆزگە هەژاربوومایە.[1]

## شارەزابە با سەرگەردان نەبیت!

کەسێك کە لە شارێکەوە دەیەوێت بچێت بۆ شارێکی تر، نیشانەی هاتوچۆی لەسەر ڕێگا بۆ دانراوە و ڕێنمایی دەکات، ئەگەر بیەوێت بەسەلامەتی بگات و ڕێی لێ تێك نەچێ ئەبێ بەگوێی بکات، ڕێی دینیش هەروایە، هەموو واین لە گەشتێکدا بەرەولای خوا جابۆئەوەی بەسەلامەتی بگەین و لەڕێ و پێچ و پەنادا شەیتان زەفەرمان پێنەبات، ئەبێت شارەزای ڕێ بین و لە ڕێنماییەکانی قورئان و سونەت لانەدەین، ڕۆژانە بڕوادار زیاتر لە (١٧)جار لە خوا دەپاڕێتەوە کە ڕێنمایی بکات بۆ ڕێی ڕاست و یارمەتی بدات کە بەسەلامەتی ڕێگاکە ببڕێت، ڕێ ی سەرفرازان، ڕێ ی خوا پێداوان.

﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ آمین. لەم ڕێگایەدا با مەشخەڵدار بین و ڕێ ڕۆشنکەرەوە بین، تاخەڵکانی تریش ڕێیان لێ نەشێوێ و بەسەلامەتی گەشتی ژیانیان تەواو بکەن. خوای گەورە هەریەکەو توانایەکی داوینەتێ و، لەسەر ئەو توانایەش لێمان دەپرسێتەوە ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ البقـرة:٢٨٦ ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ﴾ الطـلاق :٧، ﴿ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ البقرة: ٢٣٣

حوزەیفە ئامۆژگاری مەشخەڵدارانی قورئان دەکات و دەفەرموێت: (ئەی مەشخەڵدارانی قورئان دامەزراوبن، ئێوە لە پێشەنگی کاروان دان و زۆرلە پێشەوەن، ئەگەر بەلای ڕاست وچەپ دا لابدەن زۆر دوور دەکەونەوە)[2].

١- www.alwatanvoice.com

٢- لە (جامع الصحیح)ی بوخاری دا هاتووە .

بڕواداران تووشی ناجۆری (التناقض)دەبن لە ژیانیاندا، تووشی دوانەیی (الازدواجية) دەبن لەکەسایەتیاندا، بۆیە قورئان لە چەندەها ئایەتدا چارەسەری ئەمە بەوریاکردنەوە و گلەیی دەکات‌ودەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔا ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ التوبة:٣٨-٣٩

یان دەفەرموێت:﴿ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴾ نوح: ١٣-١٤ یان دەفەرموێت:
﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ البقرة:٤٤ .

## دەیەوێت ئیمامی موتەقین بێت و کەچی؟!

بڕوادار زۆر جار دوعا دەکات و دەڵێت (واجعلنا للمتقين إماما) خوایە بمانکە بە پێشەواو سەرمەشقی پارێزکاران، کەچی خۆی نارەنجێنێ و هەوڵ نادات، ئەم کارە هەوڵ و کۆشش و ماندوبوونی دەوێت و شەونخوونی و لەخۆبوردنی دەوێت.

خۆدزینەوە لە مەسئولیەت و کاری بانگەواز (وەرع)ی پێنالێین، ڕاستە هەولی بۆ نادەین و سنگ نابەینە پێشێ، بەڵام کە پێویست بوو پێویستە ؟! کە پێویست بوو کارێك بە تۆ بکرێت، ئەبێ بیکەی، خواش ئەوسا هاوکاریت دەکات !

قاعیدەیەکی فیقهی زێڕین هەیە کە دەڵێت (لا إيثار في القربات). بۆ نموونە ئەگەر بۆشایی‌یەك هەبوو لەڕیزی نوێژ خوێنناندا لەبەردەمتا ئەبێ تۆ پڕی بکەیتەوە تا خێری زیاترت دەست بکەوێت، واتە هەرشوێنێکت لەپێشەوە پێ پڕدەکرێتەوە بیکەو چاوەڕێی کەس مەبە ومەیدە بەسەرشانی کەسدا و ئەو(قربات) و پلەوپایە و نزیکی یە لەخواوە لەکیس خۆت مەدە.

ئەمڕۆ ژیانەو سبەینێش مردن، چی فریایی مرۆڤ دەکەوێت جگە لەکاروکردەوەی چاك وبانگخوازی، (ولتنظر نفس ماقدمت لغد) هەرکەس باورد بێتەوەو بڕوانێت چی بۆ سبەینێ ئامادەکردووە کە قیامەتە ؟!دیارە بڕوادار هەردەم بەدوای هۆکارێکدا دەگەڕێت کە باشتر

وچاكتر لە خوای نزیك بكاتەوە، چونكە ئەوەش فەرمانی خوایەو لە قورئاندا ئامـاژەی پێكـراوە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾المائدة: ٣٥. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوەلەخوا بترسن ونـەو هۆكارانـە بگرنـە بەركە لەخواتان نزیك دەكاتەوەوهەوڵ بدەن لەڕێی خوادا بەڵكو سەرفرازبن.

## بڕوبیانوو هێنانەوە ..

مرۆڤ لە دنیا و لە قیامەتدا، دەیەوێ پاساوێنێتەوەو بڕوبیانوو بۆ خۆی بدۆزێتەوە:

﴿يَعۡتَذِرُونَ إِلَيۡكُمۡ إِذَا رَجَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡۚ قُل لَّا تَعۡتَذِرُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكُمۡ قَدۡ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنۡ أَخۡبَارِكُمۡۚ ﴾ التوبة: ٩٤.

كافران لە هەوڵدان بۆ پاساو هێنانەوە، بۆ نموونە دەڵێن:

﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ ﴾ الانعام: ١٤٨

لە قیامەتیشدا ﴿هَٰذَا يَوۡمُ لَا يَنطِقُونَ وَلَا يُؤۡذَنُ لَهُمۡ فَيَعۡتَذِرُونَ ﴾المرسلات:٣٥-٣٦، لەفەرمودەشدا جەخت كراوەتە سەر گەورەیی و پاداشتی زۆری بانگەواز كردن و دەفەرموێت: (من دعا الی هدی كان له من الأجر مثل أجور من تبعه)[1]. دەبا واز لە بڕوبیانوو بهێنین و بانگەواز بكەین تا ئەو خێرە گەورەیەمان لە كیس نەچێت .

## خۆشنووسێكی بەناوبانگی توركی ..

(محمد ئەسعەد یەساری) كـە لـەدایك بـوو لـە ئەسـتەمبوڵ لای ڕاسـتی ئیفلیـج بـوو، لای چەپیشی ئەلەرزی، لەلاوێتیدا چوو بۆ لای مامۆستای خەتخۆشی نـاودار (ولـي الـدین أفنـدي) تافێری خەت خۆشی بكات، ئەویش كەسەیری لەش و لاری كرد نەچوو بە عـەقڵی دا كـە ئەمـە بتوانێت فێری خەتخۆشی بێت، بۆیـە قایل نەبوو لەلای دەرس بخوێنێت، ئەویش ناچار چوو بـۆلای مامۆستایەكی ترو پاش یەك هەفتە مامۆستاكەی سەرسام كردو توانی ئیجازەی خـەت خۆشـی

---

١- مسلم

لێ وەرگرێ، بەم بۆنەیەشەوە ئاهەنگێکیان سازکرد کە مامۆستا (ولي الدين أفندي)یش ئامادەی بوو، وەلی الدین وتی (ئەم شەرەفی مامۆستایەتی یە بۆ مـن ئەبوو، بە داخەوە لە دەستم چوو)..

لە بۆنەیەکی تریشدا ناویراو وتی (خوا ئەم پیاوەی ناردووە تا لوتی ئێمەی پێ بشکێت).. . لەبەر ئەوەی ئەمان لەش ساغ و ئەویش بەو کەم ئەندامی یەوە ئەو بلیمەتەی لێ دەرچوو.. لە سالّی (١٢١٣) کۆچی واتە (٢١٤) سالّ لەمەو بەر لە ئەستەنبولّ کۆچی دوایی کردو لەگەڕەکی (الفاتح) بەخاك سپێردرا.

ناویراو تەنها دەستی چەپی ئیشی دەکرد، ئەویش زۆرباش نا، چونکە دەستی دەلەرزی، کەچی بە هیمەتی بەرز و کۆلّ نەدان، بوو بەناوبانگترین خەتخۆشی خەتی تەعلیقی فارسی لە هەموو دەولّەتی عوسمانی دا..

بەلّێ.. . ئەوەی هیمەتی بەرز بێ و بیەوێت بگاتە مانگ ئەگەر دەستی نەگەیشتە مانگ هەر هیچ نەبێت خۆ دەستی دەگاتە ئەستێرەیەك.. ئەوەی بەتەمای بڕینی دووری (٥)کم بێت، بەئاسایی دوو سێ کیلۆمەتر دەبڕێت؟! مەسەلەکە هیممەتە!

لەمەسەلەی زیرەکیش دا، ئەگەر تۆ توانای زیرەکیت ٢٠٪ بێت و بەکاری بهێنی بە چاکی زۆر چاکترە لە کەسێك کەتوانای زیرەکی ١٠٠٪ بێت و بەکاری نەهێنێ، گلۆپێکی ٢٠ واتی کەشوشەکەی پاك بێت و بەچاکی ئیش بکات، رووناکی زیاتر ئەدات لە گلۆپێکی سەد واتی کە خۆلّ و تۆزو پیسی پێوەبێت... بەکوردی و بەکورتی تەنانەت پیریش ڕێگر نیە لەڕێ ی ئیبداع و هەولّداندا، نموونە زۆرە ئەوە (ئیبن عەقیلی حەنبەلی) دەلّێت (مـن ئێستا کەتەمەنم لەهەشتا سالّیدایە زیاتر سوورم لەسەر زانست وەك لەوەی کەتەمەنم بیست سالّێك بوو)...

ئەحنەفی کوڕی قەیس شەل بوو، چاوێکی کوێر بوو، دانەکانی نارێکبوون و چوویونە سەریەك، سەری بچکۆلە بوو، چەناگەی خوار بوو، کورتە بالاّ بوو، چاوەکانی بە قولاّ چوویوون، لەگەلّ ئەو هەموو کەم ئەندامی و ناتەواوییەدا، کەچی جاحظ وەسفی دەکات کە زمان پاراوی عەرەب و عەجەم بووە، حەسەنی بصریش دەلّێت: هیچ گەورە پیاوێکم نەدیوە وەك ئەحنەف، ئەگەر توڕە بوایە سەد هە زار کەسی چەك بەدەست تووڕە دەبوو بەبێ ئەوەی لێی بپرسن لەسەر چی تووڕە بووی، ئەمە بێجگە لەوەی وتار بێژێکی قسەزان و حەکیمێکی ژیر بوو.

(عبدالله ی کوڕی أم مکتوم)یش کوێر بوو خوا ئایەتی نارده خوارەوه لەسەری ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴾ عبس: ١-٣، هەموو جارێ کە پێغەمبەر ﷺ دەیبینی دەیفەرموو: سەلام لەو کەسەی کە خوا سەرزەنشتی کردم لەسەری.. ناوبراو بەشداری کرد بەو کوێریەوه لە جەنگی قادسیەدا و ئالاکەی گرتبوو تاشەهید بوو، ئەمەش بۆ ئەوەی موسڵمانان هەڵبنێ لەسەر جیهاد و کۆڵنەدان..

لەسەردەمی خۆشماندا شێخی شەهید احمد یاسین کەلەسەر کورسی کەم ئەندامان هاتووچۆی پێ دەکراو تەنها سەری دەجولایەوه، بەو کەم ئەندامیەوە تەخت وبەختی جولەکەی هێنایە لەرزە.

شێخ کامیل بەڵتاجی کە کوێر بوو، یەکێکە لەزانایانی غەززە و نزیکەی سەد ساڵێك ژیا، دەڵێت: شێخ ئەحمەد یاسین پێش ئەوەی تەواو تووشی شەلەل ببێت، گۆچانی هەبوو خۆی ئەدا بەسەر منا و ئەو بەچاوەکانی ڕێنمای منی دەکردو منیش دەستم ئەدایە باڵی بەو جۆرە بەیەکەوە سەرتاسەری غەززە دەگەڕاین بۆ بانگەوازکردن وهەڵنانی خەڵکی لەسەر جیهاد .

ئەبان کوڕی عوسمان لەگەڵ ئەوەدا کەم ئەندام و ئیفلیج بوو، یەکێك بوو لە دە فەقیهەکەی مەدینە .

(محمد کوڕی سیرین)یش بەهەمان شێوە کەم ئەندام بوو(گوێی تەواو نەبوو) کەچی بووە کەسایەتیەکی زانای ناودار.

(معاذ کوڕی جەبەل) هەرچەند شەل بوو خۆشەویستی پێغەمبەر بووﷺ، لەبارەیەوە دەفەرموێت (زاناترینی ئومەتم بەحەڵاڵ و حەرام معاذ) ە..

نەك لەلای موسڵمانان بەڵکو لەلای گەلانی غەیری موسڵمانیش کەسانی کەم ئەندامی وا هەبوون، نەیان هێشتووە کەم ئەندامی ڕێگر بێت لە ڕێیان دا ئەوە(بارب جویرا) کەلەمناڵیدا کارەبا لێیدا وهەردوو دەستی سوتاو پاشان هەردوو دەستیان بۆ بڕیەوە تا شانی، کەچی بەو کەم ئەندامیەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە هاوەڵانی گاڵتەیان پێ دەکرد خوێندنی تەواوکردو شووشی کرد ومناڵیشی بوو، بەقاچ هەرچی ئیشی هەبوو جێبەجێی دەکرد، مناڵەکانی هەر بەقاچ بەخێو دەکرد تەنانەت ئوتومبێلیشی بە قاچ لێدەخوڕی..

بەڕاستی کەم ئەندامی و موعەوەقی لەلەش ولارو ڕووخساردا نیە، بەڵکو لە دڵدایە، لە هیممەتدایە، بۆیە پەروەردگاریش سەیری دڵ دەکات هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إن الله تعالى لاينظر الى صوركم واموالكم ولكن ينظر الى قلوبكم واعمالكم) (مسلم).[1]

# هاتن بەرەو ئیسلام

## یەکەم: موسڵمانبوونی دکتۆر جادالله‌ی قورئانی:

لە ساڵانی پەنجادا،مام برایمی تەمەن پەنجا ساڵی تورك کە لە فەرەنسا دەژیا، دوکانێکی بچکۆلەی خواردنی دانابوو لە تەلارێکی چەند نهۆمی دا و، دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ڕوویان تێدەکرد ڕۆژانە بۆ پێداویستییەکانیان، یەکێك لەو ماڵانەی لەو تەلارەدا نیشتەجێ بوون، ماڵێکی جولەکە بوو کە کوڕێکی حەوت ساڵیان هەبوو بەناوی جاد و، دایکی جادیش مامۆستای زانکۆ بوو..

ڕۆژانە کە جاد دەهات بۆ شت کڕین، فرسەتی دەهێناو نەستەلەیەکی ئەدزی !! ڕۆژێك هات شتی کڕی ویری چوو نەستەلەکە بەرێ، مام برایم بانگی‌کردەوە و پێی وت:نەستەلەکەت لەبیر چوو، جاد ڕەنگی تێك چوو زۆر شەرمەزار بوو، دیارە هەموو ڕۆژێك مام برایم تاگای لێ بووە کە ئەم نەستەلەیەکی دزیوە، ئەی بۆ قسەی نەکردووە ؟!

مام برایم پێی وت: هەموو ڕۆژێك نەستەلەیەك ببە، بەڵام پەیمانم بدەرێ لەژیانتا دزی نەکەی !

لەم ڕووداوەوە جاد بوو بە دۆستی مام برایم، حەڤدە ساڵ ئەم دۆستایەتیە درێژەی کێشا، جاد ڕۆژانە سەری لێ ئەداو ڕازو نیازی دڵیشی لاباس دەکرد و لە زۆرشتیش دا پرسی پێدەکرد .

لەم ماوە زۆرەدا ڕۆژێك مام برایم پێی نەوت، تۆ کافری، تۆ جولەکەی، یان وەرە موسڵمان ببە، مام برایمی نەخوێندەوار ژیرو بلیمەت بوو لە بانگەوازەکەیدا، تەنها مامەڵەو ڕەفتاری جوانی بەکاردەهێنا بۆ کارکردن لەسەر (جاد).

---

١- (المجتمع /دكتور علي حمادي /هندسة التاثير ٢٠٠٦/١/١٥)

مام برایم هەرچۆنێك بوو خۆی فێری قورئان خوێندن کردبوو، هەرجارێك کە جاد دەهات و کێشەیەکی خۆی باس دەکرد، داوای لێدەکرد کە لە چەکمەجەیەکی مێزی دوکانەکەدا قورئانەکەی بۆ دەربهێنێ و بیداتە دەستی، ئینجا بە جادی دەوت خۆت شوێنێکی هەڵبژێرە، ئیتر جادیش قورئانەکەی لەسەر لاپەڕەیەك دادەنا و مام برایمیش دەیخوێندەوە وهەندێ باسی بۆ دەکردو جاد دڵی دەهاتەوە و دڵخۆش دەبوو، کێشەکەی چارەسەر دەبوو .

پاش حەڤدە ساڵ هاوەڵی، مام برایم تەمەنی بوو بە (٦٧) ساڵ و جادیش تەمەنی بوو بە بیست و چوار ساڵ.

مام برایم نەخۆش کەوت وزانیهەڵناسێتەوە، بۆیە قورئانەکەی کە ڕۆژانە جاد دەیبینی خستیە کارتۆنێکیجوانەوەو بەکوڕەکانی وت دوای مردنم ئەو دیاریە بدەن بە جاد، پاش مردنی مام برایم لەسەر وەسیەتی باوکیان دیارییەکەیان برد بۆ جاد، جادیش بە سوپاسەوە وەری گرت وخۆشحاڵ بوو کە لەسەرەمەرگیشدا مام برایم ئەوی لە یاد بووە ! کەدیارییەکەی کردەوە بینی قورئانەکەیە کە هەموو ڕۆژێك لە دوکانەکەی مام برایم دەیبینی.

ڕۆژێك جاد تووشی کێشەیەك بوو، خۆ مام برایم نەماوە بچێ بۆلای، ناچار قورئانەکەی مام برایمی هەڵگرت و چوو بۆ لای هاوەڵێکی (تونسی) کە عەرەبی دەزانی، تا هەندێك قورئانی بۆ بخوێنێ، ئەویش هەندێ قورئانی بۆ خوێندو قسەی چاکی بۆکرد، (جاد) وەك جاران دڵخۆش و دڵئارام بوو.

تونسیەکە پێی وت:ئەمە قورئانی موسوڵمانانە، جادیش وتی:باشە بەچی دەبمە موسوڵمان ؟هاوەڵەکەی وتی: بڵێ أشهدوا ان لا اله الا الله و أشهدوا أن محمدا رسول لله، جاد وتی: أشهدوا ان لا اله الا الله و أشهدوا أن محمدا رسول لله. ئینجا ناوی خۆی کرد بە (جاد الله القرآني)، جاد کەوتە دیراسەکردنی قورئان وشارەزابوون لە ئیسلام و بانگەوازکردن، تا توانی شەش هەزار گاور و جولەکە لە ئەوروپادا موسوڵمان بکات.

ڕۆژێك قورئانەکەی مام برایمی هێناو پەڕە پەڕە سەیری کرد، بینی نەخشەیەکی جیهانی تیایە و کیشوەری ئەفەریقیای تیا ڕەنگکراوە و لە ژێریا نوسراوە: (ادع الى سبيل ربك بالحكمة و الموعظة الحسنة)، جاد لەمەوە تێگەیشت کە مام برایم داوای لێ دەکات بچێ لەئەفریقیا بانگەواز بکات. بۆیە جاد چوو بۆ کینیا و خواروی سۆدان و ئۆغەندا و وڵاتانی دراوسێی و کەوتە بانگەوازکردن، لەسەر دەستیا زیاتر لە شەش ملیۆن کەس لە هۆزی (زۆلۆ) موسوڵمان

بوون. (جاد الله) سی ساڵ بانگەوازی بۆ خوا کرد و بە ملیۆنەهای موسڵمان کرد، تا بە هۆی کەش وهەواو بارو زروفی ئەفریقیاوە نەخۆش کەوت و لە تەمەنی (٥٤) ساڵی دا لە ساڵی (٢٠٠٣) دا کۆچی دوایی کرد.

دایکی جوولەکەیەکی توندڕەو بوو، لە ساڵی (٢٠٠٥) دا موسڵمان بوو لە تەمەنی حەفتا ساڵی دا و وتی: من هەرچەند مامۆستای زانکۆم و بە هەموو تواناکانەوە سی ساڵ هەوڵم دا لەگەڵ کوڕەکەمدا کە بیگێڕمەوە بۆ جوولەکەیەتی نەمتوانی، لەکاتێکدا کە مام برایمێکی نەخوێندەواری بەتەمەن توانی دڵی جاد ڕاکێشێ بەرەو ئیسلام، کە ئاینێکی حەقە، بۆیە منیش بڕیارمدا موسڵمان ببم !

دکتۆر (صەفوت حجازی) بانگخوازی میسری لە بە یەککەیشتنێکدا لە سویسرا جاد الله دەبینێ و لێ ی دەپرسێ: هەستت چۆنە بەرامبەر بە موسڵمانبوونی ئەو ژمارە زۆرە لەسەر دەستا، ئەویش وتی: زۆر لام ئاسایی‌یە و ئەوە وەفایەکی زۆر کەمە بەرامبەر مام برایم و ئاینەکەی !!

دکتۆر صفوت حجازی لە کۆنگرەیەکی لەندەن دا کە لە بارەی دارفۆرەوە گیرابوو، کەچۆن هاوکاری بکرێن بۆ ڕزگاربوون لە چنگی برسێتی و تەبشیر و شەڕی ناوخۆ، کە یەکێ لە سەرۆك هۆزەکانی زۆلۆش ئامادەبوو بوو، (دکتۆر صفوت) لە فرسەتێك دا بە سەرۆك هۆزەکەی وت: بەڕێزت جاد الله دەناسیت ؟! ئەویش وتی: بۆ تۆ دەیناسیت ؟!

(د. صفوت) وتی: بەڵێ دەیناسم، لە سویسرا بینیم کە خەریکی چارەسەری نەخۆشی بوو! یەکسەر سەرۆك هۆزەکە دەستی (د. صفوت)ی ماچ کرد.

(د.صفوت) وتی: من هیچم نەکردووە شایانی ئەوەبم کە تۆ دەستم ماچ بکەی ! ئەویش وتی: من ئەو دەستە ماچ دەکەم کە دەستی خستۆتە ناو دەستی (جاد الله) وە.

(د.صفوت) وتی: بۆچی تۆ لەسەر دەستی (جاد الله)دا موسڵمانبووی ؟! وتی: نەخێر من لەسەر دەستی قوتابی (جاد الله)دا موسڵمانبووم![1]

---

١- موقع: قدوة.

## دووەم: موسڵمانبوونی ئەندازیارێکی فڕۆکەی ئەمریکی:

لە ساڵی ( ٢٠٠٠ ز) دا پیاوێکی (٤٠) ساڵی گەنم ڕەنگی بەوەقار و بە شان وشەوکەت کە ئەندازیاری فڕۆکەبوو لە بنکەی فڕۆکەوانی شا خالید لە سعودیە، ناوی (ئۆستن) بوو سەردانی بنکەی بانگەوازو هۆشیاری جالیاتی کرد لە شاری ئەبها، ناوبراو بە ڕەنگ و ڕوویەوە خۆشەویستی ئەم ئاینە دیار بوو، زۆر بە خۆشی و شیرینی کەوتە باسی گەشتە ئیمانی‌یەکەی و وتی: من مەسیحی بووم و هەموو یەکشەمەیەك سەردانی کەنیسەم دەکرد، چی سەیری دەموچاوی ئامادەبوان و قسەی وتارخوێنانم دەکرد هیچ نەبوو دڵم ئاوبدات. دوایی لە خۆمم دەپرسی، ئایا ناتەواوی و ناجۆری لە کوێدایە؟ لەنەفس و عەقڵ و دڵی من دایە، یا ئەو خەڵکە ناتەواون ؟! ئاخۆ کەس بتوانێ ڕەخنە لەو دینە بگرێت ؟! خۆشەویستی بۆ خواو دین وای لێدەکردم بچم بۆ کەنیسە، ئەوەش کەدەمبینی و دەمبیست ساردیان دەکردمەوە و دەگەڕامەوە دواوە !..

ئیسلامیش کە لەڕووی مەسیحیەتی دەستکاری کراودا دەوەستێت، هیچم نەدەزانی لە بارەیەوە ئەوە نەبێت کەئیسلام ناتەواوە و بۆ توندوتیژی و چەوسانەوە هاتووە !

قەدەری خوا وابوو کە ناوبراو بۆ کارکردن بێتە ولآتی سعودیە و لە نزیکەوە ئیسلام و موسڵمانان بناسێ و پاشان موسڵمانیش ببێ و ناوی خۆی بکات بە (محمد) لە خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ دا، لە بارەی موسڵمان بونیەوە دەڵێت :ئەو هەموو دژایەتی‌و پڕوپاگەندەیەی کە لە ڕۆژئاوادا دژی ئیسلام دەکرێت وای لێکردم کە بگەڕێم بە دوای ڕاستی دا، بەوەش گەیشتمە ڕێی ڕاست ودڵنیابووم کەموعجیزاتی ئەم ئیسلامە بەردەوام دەردەکەوێت بۆ بەشەریەت ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣

هەروەها بە چاوی خۆم کۆمەڵگەی ئیسلامیم بینی کە کۆمەڵگەیەکی پێکەوە بەستراوەو وەکو ڕۆژئاوا لەیەك هەڵنەوەشاوە، لە ڕۆژئاوادا ئێستا هەموو شتێك لە ڕوانگەی بەرژەوەندی‌یەوە سەیر دەکرێت، منداڵ ئاوڕ لە دایك وباوکی ناداتەوە.. لە کاتێکدا خێزان لە ئیسلامدا گرنگی زۆری پێدراوە و مناڵانیش هەقی دایك وباوکیان هەمیشە لە پێش چاویانە و هان دەدرێن لەسەر چاکە لە گەڵیاندا..

شایانی باسه هاوەڵێکم بە ناوی (صالح الحیاني) زۆر هانیدام لەسەر شارەزابوون و دۆزینەوەی ڕێی ڕاست، جا ئامۆژگاریشم بۆ هەر کەسێك کەبیەوێ بگاتە ڕاستینەوەیە کە هاوەڵی موسڵمانی ڕاستەقینە بکات، تا ئیسلامی ڕاستەقینە ببینێت، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لا تصاحب إلا مؤمنا ولایأکل طعامك إلا تقي)..[1]

## سێیەم: موسڵمان بوونی سەرۆکی قەشەکانی تەنزانیا :

(جوان موایبوبو) خەڵکی تەنزانیایە و کەسوکاری حەزیان دەکرد ببێتە قەشە بۆیە چوو بۆ ئەمریکا بۆ دیراسەی مەسیحیەت، لە هەمان کاتیشدا قورئانی وەرگێڕاو بۆ زمانی ئینگلیزی دەخوێندەوە لەگەڵ چەندەها پەڕاوی ئیسلامی تردا، لەدڵ و دەروونیا پرسیارو گومانی زۆر هەبوو، بۆیە بەراوردی نێوان قورئان و ئینجیلی دەکرد، تا سەرەنجام بە قەناعەتی تەواوە لە ساڵی (١٩٨٦) دا موسڵمان بوو.. .

(جوان موا یبوبو) پلەو پایەی بەرزی لە مەسیحیەتدا هەبوو، ببوە سەرۆکی قەشەکانی تەنزانیا، کە موسڵمان بوو ناوی خۆی کرد بە (ئەبوبەکر) و کەوتە بانگەوازکردن وتوانی زیاتر لە پێنج هەزار کەس موسڵمان بکات.. .

ناوبراو تووشی ناڕەحەتی وکێشەی زۆر بوو، هەندێ لە توندڕەوە مەسیحیەکان ماڵەکەیان سووتاند، کە زەرەرو زیانێکی گەورەی لێکەوت، تەنانەت دوومناڵیشی کە دووانە بوون ولەژنە موسڵمانەکەی بوو بووی لەخانووەکەیدا سوتان.

هەرچی پەڕاوو کاسێتێکیشی هەبوو کە ژیانی خۆی لەسەر تۆمار کردبوو، هەمووی بوونە خۆراکی ئاگر، بەڵام ناوبراو گوێی بەو ناڕەحەتیانە نەدا و سوور بوو لەسەر ئیسلامەتیەکەی و دەڵێت: من دڵ خۆش و دڵئارامم بە ئیمانەکەم...[2]

## چوارەم: هاری شووت موسڵمان بوو :

سەرچاوەیەکی ئاگادار بە ڕۆژنامەی میدیای ڕاگەیاند کە هاری شووت (لە دایك بووی ١٩٦٣) فەرماندەی پێشووی هێزەکانی ئەمریکا لە کوردستان و ڕاوێژکاری ئێستای حکومەتی

---

١- (WWW.THEMWL.ORG/ALDAAWA)

٢- WWW.K١٢٨.COM

کوردستان بۆ کاروباری ئەمنی ڕۆژی پێنج شەممە (٢٠٠٦/١١/٢٣) لە دادگای هەولێر شایەتمانی هێناو کچێکی کوردی لە دایك بووی (١٩٨٥)ی مارەکرد..[١]

## پێنجەم: ڕوبا ئەو بانگخوازە مەسیحیەی کە موسڵمان بوو:

من ناوم ڕوبایە و نازناوی خێزانم قەعوارە، لەبنەماڵەیەکی مەسیحی ئەردەنیم و لە وڵاتی دانیمارك لە دایك بووم، باوکم قەشەی چوار کەنیسە بوو، دایکم لە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستا یەکێك بوو لە گەورەترین پێشەوایانی ژنانی مەسیحی، من شارەزاییەکی تەواوم لەتەورات و ئینجیلدا هەیە..

کاتێ هەشت ساڵ بووم مەسیحم بەڕزگارکەری خۆم داناوە و، لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا خۆم لە ئاوی بە مەسیحی بوون هەڵژەندووە و، لەتەمەنی چواردە ساڵیدا (تەعمید)م بە ڕۆح کردووە. بەڵام ڕۆژێ لە ڕۆژان بۆ گەیشتن بە ڕاستەقینەو گەڕان بەشوێن زانستا عەقڵ و هۆشی خۆمم دانەخستووە، تا نەبوومە موسڵمان ئارامیم لە ناو دەروونی خۆما نەبینی، تا قەناعەتیشم بە ئیسلام کرد زۆری ویست..

سەرەتای بەسەرهاتم لەکاتی منالیمەوە دەست پێ دەکات، لەوکاتەدا زۆر ڕقم لە ئیسلام بوو، بەتایبەت کاتێ لە پۆلی دەهەمدا بووم دیتم کیژێکی موسڵمان نوێژ دەکات، لە کاتی سوژدە دا نوکە شەقێکم تێ هەڵدا، لەگەڵ کیژەکانی قوتابخانەی ئامادەییدا زۆر زۆر دەمەقالێم دەبوو، دەمویست پێیان پیشان بدەم کە چەند ڕۆشنبیرم !! هەموو ڕۆژێ لەگەڵ خۆما کتێبی پیرۆز (تەورات و ئینجیل)م هەڵدەگرت، بە دەنگی بەرزیش دەمخوێندەوە، یا دەقێکم وەك وتەی ڕۆژ لەسەر تەختەڕەشەکە دەنووسیەوە، لەیادمە کاتێ مانگی ڕەمەزان دەهات کردبوومە عادەت لەبەرچاوی کچە موسوڵمانە بەڕۆژووەکاندا شتم دەخوارد و خاوەنی گۆبەندێکی زۆر بووم..

لە قوتابخانەی ئامادەییدا: لە پۆلی یازدەدا پێش ئەوەی ئامادەیی تەواو بکەم لە بیرمە بڕیارم دا لەوانەی ڕۆشنبیری ئیسلامیدا ئامادەبم و ببیستم کە لە بارەی ئاینی مەسیحیەوە کچان چی دەڵێن؟ دەیان وت: ئینجیل دەستکاری کراوەو شێوێنراوە، منیش زۆر پێی توڕە

---

١- پێگەی یەکگرتوو.

دەبووم، بۆم شەرح دەکردن کە ئینجیل کتێبێکی موعجیزەیەو، لە چوار کتێبی جیاوازدا نوسراوە، لە هەمان کاتدا لەلایەن چوار کەسی جیاوازو، لەسەردەمی جیاواز دا نوسراوە (مەتیٚ، مەرقەس، لۆقا، یۆحەننا)، یەکی لە کچەکان هەڵی دایە و وتی: کەوابوو تۆ دەڵێیت: جنۆکە ئەو کتێبانەی نوسییوەتەوە، ئای چەند ناڕەحەت بووم !! ئیتر نەم ویست لەوەزیاتر لەگەڵ کچەکاندا چەلەحانیٚ بکەم و لەپۆلەکە چوومە دەرەوە.. .

کچەکان لەبارەی منەوە کەوتنە پرسیارکردن و بۆ ئەوەی زیاتر بمناسن، دەهاتن بۆلام ولەبارەی ژیانی خۆم و ئایینمەوە پرسیاریان لێدەکردم و منیش وەلامم دەدانەوە و کتێبی پیرۆزم پیشان دەدان و، بەڵگەو دەلیلەکانم بۆ ئەخوێندنەوە، هەوڵم دەدا قەناعەتیان بە ئاینی مەسیحی پیٚ بکەم، تا ڕۆژیٚ مامۆستای زمانی عەرەبی بانگی کردم و پێی وتم: دەبیٚ تۆ ئاگات لە خۆت بێت و، خۆت لە قسەکردن بۆ کچان لەبارەی ئاینی مەسیحیەوە بپارێزی، چونکە یاسای وڵات ڕیٚ بەتۆ نادات کاری وابکەیت.. پێم وت: ئەمە هیچ پەیوەندی بەو مەسەلەیەوە نییە، وتی: من کاسێتێکی تۆمارکراوم لایە بە دەنگی خۆت کە تۆ لە بارەی ئاینەکەتەوە بۆ کچان قسە دەکەیت.. بەڕاستی ئەمەش زۆر پەست و تووڕەی کردم.. بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان رق و قینم لە دڵا زیاتر دروست بوو، خزمەتی تەبشیر و بە گاورکردنم زیاتر کرد و دەمویست موسڵمانان یەکسەر بکەم بە مەسیحیو، هەندیٚ لە کچە موسڵمانەکانی هاوەڵم بۆ کەنیسە دەعوەت کرد تا قەناعەتیان پیٚ پەیاکەم بە ئاینی مەسیحی..

وەرگرتنم لە زانکۆ:

ئامادەییم تەواوکردو لەبەشی کیمیا لە زانکۆی موئتەی ئوردن وەرگیرام و، باش دەمزانی کە بە هێزترین بزوتنەوەی ئیسلامی ئۆردنی لەم زانکۆیەدایە، ساڵی یەکەمم تەواو کرد و، لەساڵی دووەمدا دەبوایە ناوم لە ڕۆشنبیری ئیسلامیدا تۆمار بکەم، چونکە لەلایەن زانکۆوە وەك ماددەیەکی بنەڕەتی و پێویست دانرابوو، پۆلەکەش بریتی بوو لە هۆڵێکی پلەدار وەك هۆڵی سینەما، کە سەد وپەنجا قوتابی دەگرت، من تەنیا مەسیحیەك بووم لەو پۆلەداو شانازیم پێوە دەکرد کە لە هەموان جیاوازم، هەر جارێك دکتۆر محمد ڕەواشیدە بابەتێکی باس بکردایە دەبوا من تەعلیقم لەسەر بدایە یا موناقەشەم بکردایە، لەیادمە لەسەر بەهەشت و دۆزەخ و لەسەر مافی ئافرەت لە نێوان ئیسلام و مەسیحیدا بووبە موناقەشەمان و تەنانەت موناقەشەکەمان سەری بۆ ئینجیل و تەوراتیش کێشا، منیش وەك عادەتی خۆم کتێبی پیرۆزم

پێ بوو، تا دروستی قسەکانی خۆم بسەلمێنم و، قسەکانی دکتۆر بەر پەرچ بدەمەوە، تا ڕۆژێك دکتۆر داوای لێ کردم سەری لێ بدەم بۆ نووسینگەکەی، وتی: من زانیاریەکی زۆرم لەبارەی هەردوو ئایینەکەوە پێیە و دەستی کرد بەدەعوەت کردنم بۆ ئیسلام، منیش بەسەرسەختیەوە پێم وت: گوێت لێبێ دکتۆر: من بە مەسیحی لە دایك بووم و، باوکم سەرپەرشتی چوار کەنیسە دەکات و، دایکم لە کۆمەڵگەی مەسیحیدا کەسایەتیەکی گرنگە، لەبەرئەوە هەرگیز بوارم نیە ئاینەکەم بگۆڕم و، لەبەر هیچ هۆیەکیش ئاینەکەم ناگۆڕم، دکتۆر هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاو وتی: خوا هیدایەتت بدات.

پاش ماوەیەك لە موناقەشەکردنەکەم لەگەڵ دکتۆردا هێرشم کردە سەر ئیسلام و، بەڕاشکاوی وتم: دکتۆر هەڵەیە، ئیسلامیش هەر هەمووی هەڵەیە، قوتابیەکان زۆر سەریان لە جورئەتی من سوڕما بوو، تەنانەت هەندێکیان بە پەنامەکی دەهاتن بۆلام و لەدوای دەرسەکەی مامۆستاوە لە شوێنێکی کەنارا پێکەوە دەوەستاین و لەبارەی ئاینەکەمەوە پرسیاریان لێ دەکردم، بەڵام من لە شوێنی گشتیدا دائەنیشتم و بەخەیاڵیشما نەدەهاتو موناقەشەم لەگەڵ دەکردن، تادکتۆر موحەممەد ڕەواشیدە ی مامۆستای ڕۆشنبیری ئیسلامی بانگی کردم بۆ نووسینگەکەی خۆی و وتی: وادیارە تۆ بوویتە فیتنەیەك بۆ کۆلێجەکە ولەبارەی ئاینی مەسیحیەوەقسە بۆ قوتابیەکان دەکەیت و، دەتەوێ لە ئیسلام وەریان بگێڕیت و مورتەدیان بکەیت، منیش وتم: مەبەستت لەو قسەیە چیە؟ وتی: مەبەستم ئەوەیە زۆر بەسادەیی پێت بڵێم: تۆ لەوەرزی داهاتوو لەم زانکۆیەدا قوتابی نابیت.. زۆر بایەخم بە قسەکانی نەدا و لەوەرزی داهاتوودا کاتێ ڕۆیشتم ناوم بۆ وانەکان تۆمار بکەم ناونوسەکە وتی: تۆ لەم کۆلێجەدا قوتابی نیت و لەم زانکۆیە دەرکراویت!! زۆر تووڕە بووم و، زانکۆکەم بەجێ هێشت، چونکە دەمزانی لەوماوەیەدا زۆر نزیکە بڕۆم بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەوێ هەلی باش بۆ وەرگرتنم هەیە.

## کۆچم بۆ ئەمریکا:

لە ساڵی (٢٠٠٢) دا ڕۆیشتم بۆ ئەمریکا بۆ ویلایەتی تەکساس تا هەوڵ بدەم ژیانم لە سفرەوە دەست پێ بکەم.. لەوێ دەڕۆیشتم بۆ کەنیسەی دالاسی مەعمەدانی، کە کەنیسەی عەرەبە مەسیحیەکان بوو، مامم قەشەی ئەو کەنیسەیە بوو، ئەوەی ڕاستی بێ پێم خۆش نەبوو

لەوێ بژیم، ماڵی خۆمان لە گەڵ خێزانێکی مەسیحی تردا لە ویلایەتی ئەریزۆنا وە پەیوەندییان پێوەکردم تا بڕۆم بۆ ئەوێ و لەتەك ئەوانا بژیم و جارێکی تر ژیانم دەست پێ بکەمەوە.. بەڵام کەسێك نەبوو پشتگیری ماددیم لێ بکات،ئیتر کەس وکارەکەم پێیان وتم: باشتر وایە بگەڕێمەوە بۆ تەکساس و لەگەڵ خوشك و براکەمدا بژیم، منیش لەوان گەورەتر بووم، باقی خێزانەکەمان گەڕانەوە بۆ ئوردن، تا باوکم خزمەتی تەبشیری خۆی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستا بە ئەنجام بگەیەنێت..

لەتەکساس کارم دەستکەوت و دەستیشم بە خوێندن کردو، بەردەوام هاتوچۆی کەنیسەم دەکردو، چالاکیەکانی ئاینی خۆم بە ئاسایی ئەنجام دەدا، تەنانەت هەندێ بەرنامەی تازەو ڕێبازی نوێم بۆ کەنیسەی ئوردن دەناردو، یارمەتی کەنیسەم دەدا بۆ دەرس وتنەوەی ئینجیل بە قوتابیە منداڵەکان..

## لەتەك قوتابیە موسڵمانەکاندا:

لەمانگی دوانزەی ساڵی (٢٠٠٣) دا باوکم بە شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد، وەفاتی ئەو لەکاری نەوەستاندم چونکە لە ڕاستیدا من بۆ مەبەستی خەڵك کردن بە مەسیحی هاتبووم بۆ ئەمریکاو، دەمویست ئەو خزمەتەی خۆم بەئەنجام بگەیەنم و، مەبەستیشم زیاتر موسڵمانی عەرەب بوو تاهەوڵیان لەگەڵ بدەم بۆ پاشگەز بونەوە لەئیسلام، چونکە من پێم وابوو: ئەمریکا ئازادی قسەو بیروڕا دەربڕینی تێدایە.

هەر لەوسۆنگەیەوە چاوم بە کۆمەڵێك هاوەڵی موسڵمان کەوت و، لەبارەی ئاینی مەسیحی و ئیسلامەوە دەستمان بە قسەکرد ومن لەتەوراتو ئینجیلا زۆر باش ئاگاداریم هەبوو، زۆر بەتوندی موناقەشەم لەگەڵ دەکردن، هەوڵی پاشگەز بونەوەیانم دەدا.. تا لە ئەخیرا هاوەڵەکانم لاوێکیان بانگ کرد بەناوی موستەفا – کە ئێستا بۆتە مێردم- تا موناقەشەم لەگەڵ بکات، لەواقیعدا ئاگاداریەکی فراوانیلە قورئان و سوننەدا هەبوو، لەبەر ئەوە چارەییم نەدەویست، بەشی زۆری کاتەکان دەمویست بەنزین بەسەر ئاگرا بکەم و، زۆر جار دەگەیشتینە ئەنجامێکی نەزۆك و داخراو، من زۆر توندورق ئەستوور بووم.

## گۆڕانێکی چاوەڕوان نەکراو:

لە ئەیلولی (٢٠٠٥)دا دایکم هات، منیش پێم وابوو، ئەمە بەلگەیەکی گونجاوە بۆ ئەوەی خۆم لەو مناقەشەیە دوور بخەمەوەو ڕێی خۆم بگرمە بەر، چونکە هەستم بە دڵتەنگی دەکرد.. لەم لایشەوە پێم سووکایەتی بوو لەو موناقەشەیەدا بدۆڕێم، بۆیە بە هاوەڵەکانم وت: من دەبێت بڕۆم و بەجێتان بێلم، موستەفا بەناوی خۆمەوە بانگی کردم و وتی: تەنیا بەلگەیەکم دەوێت، لێم پرسی لەبارەی چیەوە دەتەوێت؟ وتی: بڕۆ ئینجیل بەتەواوی بپشکنە، تەنیا ئایەتێك نابینیتەوە کە مەسیح باسی خۆی بکات و بڵێ کوڕی خوام و، هەرگیزیش نەی وتووە من خوام.

بەتوانجێکەوە وتم: ئەوە تۆ چی دەڵێیت؟ بێگومان چەندەها ئایەت هەیە کە دەڵێت مەسیح کوڕی خوایە. موستەفا وتی: تەنیا بەلگەیەکم پیشان بدە، بەلگەیەك و بەس، ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵ و زۆر بیرم لێکردەوە..

ئینجیلم کردەوەو دەستم بەگەڕان کرد، پاش ئەوە ڕۆیشتمە سەر ئینتەرنێت و لەوێوە بۆ ناو کتێبەکان و هیچم دەس نەکەوت.

پرسیارم کرد لەدایکم و موناقەشە دەستی پێکرد، پێی وتم: لەڕاستی دا تەنیا ئایەتێك نیە بەڕاشکاوی مەسیح لەبارەی خۆیەوە و تبێتی کوڕی خوایە، بەلام وتوویەتی: هەرکەس منی بینی خوای بینیوە، بەدایکم وت: بەلام باوك و کوڕ یەکێك نین، ئەویش وتی: بەلام خۆت دەزانی لە هێزو تواناوادا یەك ئاستیان هەیەو، لەسیانەی پیرۆزدا یەکێکن، (باوك و کوڕو گیانی پیرۆز).

دەستەواژەی یەکەم (کە مەسیح خۆی بڵێ من خودام)، نەبوو، بزانین دەستەواژەی دووەم کە (وتبێتی من کوڕی خودام) هەیە؟

دەستم بە پشکنین و گەڕان کرد، هاوکێشەیەکی نوسراووم لە ئینجیلی یۆحەننادا دییەوە کە دەڵێت: لەسەرەتادا وشە هەبوو، وشەش لەلای خودا بوو، باشە کەوابوو وشە ئەو مەسیحەیە کەلەسەرەتای بونەوەرەوە دروستکراوە، لەلای خوا هەبووە، بەلام موشکیلە لەوەدا بوو کەلەهەمان ئایەتا دەڵێت: وشەکە خوا بوو، ئالێرەدا سەرسام بووم کە خوا= بە مەسیح، لە هەمان کاتدا خوایش لەتەك مەسیحدا بێت، چۆن شتی وادەبێت ؟!

ئەمە هاوکێشەیەکی ناتەواوی بیرکاریە، چۆن دەبێت خوا مەسیح بێت وئەویش لەتەکیا بوویێت لە هەمان کاتا؟ ئایا کەسایەتیەکەی پچڕاوە؟ ئەمە شتێکی واقیعی نییە و ژیری ناتوانێ تەسەووری بکات بۆیە وازم لەو دەقە هێناو گەڕام بە شوێن دەقێکی تردا.. سەرم لە پەیامی یۆحەننادا لە ئیسحاحی پێنجەم و ئایەتی حەوت دا کە دەڵێت: ئەوانەی لە ئاسمان ئاگادارن سیانن، ئەوانیش باوك و وشەو ڕوحول قودسن، ئەم سیانەش یەکێکن، زۆر خۆشحاڵ بوم چونکە وام زانی حەللەکەم دۆزیوەتەوە، باوك =کوڕ=ڕۆح قودس، ئەمانەش یەکێکن..

بەڵام یەکسەر ئەو ئایەتەی دوای ئایەتی پێشوو کە ئایەتی هەشتە دەڵێت: ئەوانەی لەسەر زەویدا شایەتی دەدەن سیانن: گیان، ئاو، خوێن، گیان ڕۆحول قودسە، ئاویش باوکە، خوێنیش کوڕە، چۆن دەگونجێت ئەو سیانە یەکبن و هەرسێکیان لەیەکێکدابن؟ جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئەو دوو واتایەدا هەیە..

ئەگەر لەواقیعدا بڕوامان وابێ کەخوا سیانە، بۆ لەکاتی خەلیقەدا تەنیا یەکێکە و سیان نیە؟ ئالێرەدا هەستم بە نەسازی لە کتێبی پیرۆزدا کرد، لەکوێوە ئەم نەسازییە کەوتۆتە ناو کتێبی پیرۆزەوە ؟ ئەوەی کەمن بیزانم ئەوەیە کە مەسیح بە خۆی وتووە: کوڕی خوا... بەڵام هەروەك هەموو دەزانین هەموو جووەکان بە خۆیان دەڵێن: کوڕی خوا... لەگەڵ ئەوەدا کە مرۆڤێکی ئاسایی وەك ئێمەن، کەوابوو ئەم شێوە دەربڕینە لەوسەردەمەداو لەناو بەنی ئیسرائیلدا باو بووە..

مەسیحیش بەتەنیا بۆ خۆی دانیشتووە و دوعای کردووە، داوای لەکێ کردووە؟ لەخۆی پاڕاوەتەوە؟ ئەو لەخوا پاڕاوەتەوەو هاواری لەو کردووە، ئەمەش لەکتێبی پیرۆزدا سابتە.

باش لە یادمە کاتێ عەقیدەی مەسیحیم دەخوێند یەکێ لە دکتۆرە گەورەکانی بەریتانیا هات و مێژووی کتێبی پیرۆزی پێ وتینەوە، وتی: من لە بەریتانیا ڕۆیشتم بۆ پێشانگایەك تا ئەو دەقە ئەسڵیانەی ئینجیل ببینم کە دۆزراونەتەوە، بەڵام جگە لەکۆمەڵە کاغەزێکی سووتاوو دڕێنراو وبەزایە چوو چیترم نەبینی، ئینجا من سەیری کتێبەکەی بەردەستم کردو لە خۆمم پرسی: ئەم کتێبە چییە؟

ئەم هەموو وشانە لەکوێوە هاتنە ناو ئەم کتێبەوە؟

دەستم کردە تێڕامان و بیرکردنەوە و بە خۆمم دەوت: ئەگەر هەرچی کتێبی ئاسمانی لەسەر زەویدا هەیە هەموویان کۆکردەوە و فڕێمان دایە ناو دەریاوەو پاشان داوامان لە خەڵکی

کرد تا کتێبێکی تری وەك ئەو کتێبەی پێشووی خۆیان ئامادە بکەنەوە، یەك مەسیحیمان دەست ناکەوێ ئینجیلێکی وەك ئینجیلی پێشوومان بۆ ئامادەبکات، کە سەد لەسەد وەك ئەوەی پێشوو وابێ، بەڵام بەلای کەمەوە ملیۆنێ موسڵمانمان دەست دەکەوێت کە تەواوی قورئانی لەسینەیا تۆمار کردبێ و لەبەری بێ.. مەسیحییەکان نوسخەی ئینجیلیان زۆرە و لە یەکتر جیاوازن، تا ئێستاش دەقی ئینجیلی تازە دەدۆزرێتەوە. ئایا ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەر نییە؟

پاش ئەوە دەستم کردە لێکۆڵینەوە لە هەڵواسینی مەسیح ؟ئایا لە ڕاستیدا مەسیح مردووە؟

دەستم کردە بیرکردنەوە لەم ئینجیلەی بەردەستماندا، ئایا ئەمە ڕاستەقینەکەیە؟ ئەو کەسانەی ئینجیلەکانیان نووسیوەتەوە جوو بوون و شوێن مەسیح کەوتوون و چاودێریان کردووە و ژیانیان نوسیوەتەوە... ئەوان بینیویانە کە بەسەر تەختە هەڵواسراوەکەوە دەمرێت.. بەڵام ئایا زەرووریە ئەوان خودی مەسیحیان بینیبێ کە هەڵبواسرێ؟

لە قورئانی پیرۆزدا خوای باڵا دەست بەم شێوەیە باسی دەکات:

﴿ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ النساء :١٥٨

واتە: ئەوقسەیەشیان کە دەڵێن: ئێمە مەسیح پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەمان کوشتوە، لە ڕاستیدا نەکوشتوویانە و نەهەڵیان واسیوە، بەڵکو لێیان تێکچووەو کەسێکی تریان کوشتووە، بێگومان ئەوانەی رای جیاوازیان لەو مەسەلەیەدا هەیە خۆیان لە گوماندان و ئەوانە هیچ زانستێکی ڕاستیان لەو بارەیەوە نییە، بەڵکو هەر شوێن گومان کەوتوون، بە دڵنیاییەوە نەیان کوشتووە، بەڵکو خوا بۆلای خۆی بەرزیکردۆتەوە، خوا بەردەوام باڵا دەست ودانایە..

کەوابوو ئەوانەی وایان دیوە مەسیح کوژراوە، کەسێکی تریان بینیوە و لێیان تێك چووە.

کەوابوو ئەمەی لەبەردەستماندایە چییە؟ ژیانی مەسیحە و زیاد لە ٧٥٪ پاشکۆیە، ئێستا گەیشتمە ئەو ئەنجامە کە مەسیح خوا نییە، تەنانەت کوڕی خواش نیە، زۆر ترسام و شپرزەبووم..

ئـەم هـەموو سـاڵانە؟ (٢٤) سـاڵ لـە ژیانـدا نـەزەریاتی هەڵـەم لـە ئینجیـل و تەوراتاخوێندۆتـەوە، (٢٤) سـاڵ خوایـەکی هەڵـەم پەرسـتووە! (٢٤) سـاڵی ژیـانم بـە فـیڕۆ ڕۆیشتووە؟!

ویستم خۆم بکوژم، ترسام و هەستم کرد زەوی لە ژێـر پێمـا دەلـەرزێ، هەسـتم کـرد مـن ژیانی خۆم وێران دەکەم.. .

لەبیرکردنەوەدا ڕۆچوم، من ئێستا باوەڕم وایـە کەمەسـیح مرۆڤێکـە و لەلایـەن خـواوە پێغەمبـەرێکی پەیامـداره و باوەڕیشم بـە هـەموو پێغەمبـەرانی پـێش ئـەویش هەیـە، بـەڵام گۆیەندێکی ساکارم لەگەڵ موحەممەد پێغەمبەردا ﷺ بۆ سازبووە .

لە ڕاستیدا شتێ لە ژیانی نازانم، هەموو ئەوەی کە دەزانم ناسینێکی سادەیە لـەڕێی ئـەو مەسیحیانەوە کە لە دەروونی منا و لەبارەی ئەوەوە ﷺ چاندبوویان، بـەڵام چـۆن ئـەو خەڵکـە موسڵمانە بە درێژایی هـەزارو چوارسـەد سـاڵ ڕێزیـان گرتـووە؟ بـە خـۆمم دەوت: باشـە، چـۆن دەگونجێ ئەوە موشکیلە بێت، لەگەڵ ئەوەدا کە لەڕێی ئـەوەوە قورئـانی پـیرۆز لەلایـەن خـواوە هاتووە.. بێگومان پیاوێکە هەڵبژاردە، لەڕاستیدا هێژاترین مەخلوقی خوایە، کـەوابوو هـەرگیز ئەمە موشکیلە نیە، کە من ئیمان و باوەڕ بە پێغەمبەرێکی تر بێنم، کە دوایـین پێغەمبـەری خودا بێت ﷺ .

زیاد لەوە من پێ دەزانم کە ئینجیلێکی پێنجـەم هەیـە و کەنیسـە بەنایاسـایی و غـەیرە شەرعی داناوە و پێـی دەوترێ: ئینجیلی بـەرنابا، چـونکە ئـەو ئایەتـەی تێدایـە کـە مەسـیح سەلامی لێ بێت دەفەرموێت: پێغەمبەرێك دوای من دێـت کـەناوی ئەحمـەدە و، بۆمـان بـاس دەکات کەمەسیحیان لێ تێك چووە وکەسێکی تریان بە مەسیح زانیوە، ئەو سەلامی خـوای لێ بێ نەمردووە و هەڵنەواسراوە، بەڵکو خوا بۆلای خۆی بەرزی کردۆتەوە..

شایەتمان:

پـاش ماوەیـەك تێڕامـانی زۆر و بیرکردنەوەیـەکی قـووڵ پەیوەنـدیم بـە هـاوڕێ موسڵمانەکانمەوە کرد، ئەوانەی بەلای کەمەوە ماوەی دوومانگ دەبوو نەمبینیبون، ڕۆیشتم بـۆ بینینیان، لەوکاتەدا من دەگریام و لە خوا دەپاڕامەوە ئەگەر ئـەم ڕێیـە ڕێیـەکی ڕاسـتە، ژیـانم بگۆڕە و ئەگەر وایش نییە بەڕووداوێکی ئوتومبێل بمکوژە پـێش ئـەوەی بگەمـە هاوەڵـەکانم و بمخـەرە بەهەشـتەوە.. ئـەی پـەروەردگار! ئـەوەی کـە مەبەسـتمە گەیشـتن بەڕاسـتەقینەیە و

ڕەزامەندی تۆ.. ئەوەی کەمن دەمەوێ بەهەشتە.. بەڵێ بەو شێوەیە گەیشتم بە هاوەڵەکانم و فرمێسك لە چاووم دەهاتە خوار، وایان زانی شتێکی خراپم تووش بووە، مێردەکەی ئێستام موستەفا لەوێ بوو، هەموو چاوەڕوانی من بوون قسەبکەم بۆ ئەوەی حەقیقەتی حاڵم بزانن، منیش لە پڕ وتم: أشهد ألا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله!!.

چەند دەقیقەیەك بێدەنگی باڵی بەسەر هەمواندا کێشا وهەموو بەسەرسامیەوە چاویان بڕیبوە من، پاشان موستەفا وتی: بێدەنگ بە، درۆ مەکە!!.. بەدەم گریان و هەنسکدانەوە پێم وت: من درۆ ناکەم، سبەینێش یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانەو بەڕۆژوو دەبم، ئێستاش فێرم بکەن چۆن دەستنوێژ بگرم وچۆن نوێژ بکەم، کاتێ ئەمەی گوێ لێ بوو، لەچاوما سوربوونی منیشی لەسەر ئەو مەسەلەیە بینی، لە خۆشیا دەستی کردە گریان و خۆشحاڵی دەربڕی و بەخێرهاتنی بۆ ئیسلام لێ کردم .

لە واقیعدا هەر لەشەوێکدا فێری نوێژو هەموو هەڵس و کەوتەکان وسوننەتەکانی بوم، حیجابێکم کڕی و دەستم بە پیادەکردنی عەقیدەی نوێم کرد، بەڵام بۆ ماوەی دوو هەفتە ئیسلام بوونی خۆم لە خێزانەکەمان شاردەوە.. .

لەوکاتەدا ڕۆیشتم بۆلای ئیمام و ئیسلام بوونی خۆمم ڕاگەیاند و ئاشکرام کرد کە موسڵمانم.

موسڵمانبوونم و خێزانەکەم:

هەروەك پێشتر وتم: لەسەرەتاوە موسڵمان بوونی خۆمم لای خێزانەکەمان ئاشکرا نەکرد، شەوانە سەعات دوو یا سێی پاش نیوەشەو نوێژەکانم دەگێڕایەوە، تاکەس نەم بینێ و، گومانم پێ نەبات.

ڕۆژێکیان لەماڵەوە دەڕۆیشتم بۆ زانکۆ، لەناکاودا ئەو جانتایەم کە قورئانێك و حیجابەکەمی تیا بوو کەوتە خوارەوەو خوشکەکەم بینی، بەڵام نەیزانی مەسەلە چییە، تا شەوێ کەمن هەستام نوێژم کرد ئەو خەبەری بووەوەو منی لەوکاتەدا بینی، ئەندامانی خێزان پێیان زانیم و تاقیکردنەوەو ئیبتیلام دەستی پێکرد. هاواریان لێ بەرزبووەوە قیژاندیان بەسەرما وسەرزەنشتێکی زۆریان کردم و ئازاری دەروونی و عاتیفیان دام، هەرچی وشەی سوك ونەشیاوە پێیان وتم، دەستیان بە لێدانم کرد تا نزیکبوونەوە لەمەرگ، هەڕەشەیان بەکوشتن

لێکردم، لەگەڵ ئەوەدا من زۆر لەسەرخۆ و ئارام بوم ولەهیچ شتێکا موناقەشەم نەدەکردن و ماڵەکەم بەجێهێشت و لەخوا پاڕامەوە ڕێنماییان بکات..

پێش ئەوەی شوو بە موستەفا بکەم لەگەڵ کیژێکی موسڵمانی هاوەڵمدا دوو مانگ مامەوە، ڕاستە من خێزانێکم لەدەست چوو، بەڵام سوپاس بۆ خوا لەمزگەوتا خێزانێکی تری موسڵمانم بەدەست هێنا، کە چاودێریەکی باش و بێ وێنەیان لێ دەکردم، خوا پاداشتی خێریان باتەوە.. .

پاش ئەو لێدانە زۆرجار فشاری دەروونیم بۆ دروست دەبوو، تا ئێستاش ڕۆژانە بەلای کەمەوە لە هەموو گۆشەیەکی جیهانەوە (٢٥) ئیمێڵ وتەلەفونم بۆدێت، جنێوم پێ دەدەن و هەڕەشەم لێ دەکەن و لەوبابەتانە.. گەورەترین زاناو دکتۆری مەسیحی لە ئوردون و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بەتەلەفۆن پەیوەندییان پێوە کردم تا لەبارەی مەسیحییەتەوە موناقەشەم بکەن و لەئیسلام پاشگەزم بکەنەوە .

سبحان الله لەوەپێش بۆ هەرکوێ بڕۆیشتمایە و لەهەر دەمەقاڵێ و موناقەشەیەکی ئاینیدا ئینجیلم پێ بوو، بەڵام ئێستا بە پێچەوانەوە هەمیشە قورئانێکم پێیە..

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا لەو ماوە کەمەدا دەرس گەلێکی گرنگ فێر بووم، فێربووم چۆن خۆگر وخاکی بم، ئێستا بیر لە ژیانی پێغەمبەرﷺ ئەکەمەوە، چۆن لەناو ماڵ وکەس و کاریا سووکایەتی پێکراوە و لێی دراوە، خۆئەم بەسەرهاتەی من لە چاو ئەوەیئەودا هەر هیچ نیە، لە ڕاستیدا شتی زۆر فێر بووم.. .

لەوانەیە لەبەر چاو خەڵکیدا شەرەفی بنەماڵەو خانەوادەکەم لەکەدار کردبێت، بەڵام من شانازی بەوەوە دەکەم کە خوای میهرەبان گەورەترین شەرەفی پێ بەخشیوم کەئەویش ئیسلامە.. لەواقیعا ناتوانی بێنیت بە خەیاڵتا کە لەوکاتەوە موسڵمان بووم، خوا چ بەختەوەری وئاسایشێکی پێ بەخشیم، لەگەڵ ئەو هەموو سووکایەتی پێکردن و لەمپەرانەی خستیانە سەر ڕێم..

لەڕاستیدا لەچاو ئەوکاتانەی پێش موسڵمانبوونمدا من گۆڕانێکی زۆر سەیرم بەسەرا هاتووە، تەنانەت موستەفای مێردم سەرنجی ئەو گۆڕانە فراوانەی داوە، فێربووم چۆن بە ئارام بم لەگەڵ ئەوانەی بەناحەق هێرشم بۆ دێنن و زوڵمم لێ دەکەن، فێربووم چۆن خەندەلێوبم لەتەکیانا لە هەموو ئەو کات و حاڵەتە ناهەموارانەدا! لەگەڵ ئەوەدا بە هۆی موسڵمانبوون و

حیجابەکەمەوە وەزیفەکەم لەدەست دا، بەڵام هیوام بە خوایە دوو بەرابەر و بگرە بێ حیساب قەرەبووم بۆ بکاتە وە. سوپاس بۆ خوا.. . هەموو ئیسلام بریتیە لە ئاسایشی ڕاستەقینەی ناخۆ و دەروونی، بێگومان ناتوانی تۆ لەوانەی دەوروبەرتەوە ئەوە بەدەست بێنێت، دەبێت لەناو دەروونتەوە قەناعەتت هەبێت و، هەوڵ بدەیت خۆشەویستی خوا بەدەست بێنی و ڕەزامەندی بەدی بێنیودڵتی بە تەواوی تەسلیم بکەیت، ئەگەر عیبادەکەت لە ڕاستیدا بۆ خوابوو شوێن ڕێگەکەی ئەو کەوتیت، بێگومان لە ژیانتا بەختەوەر دەبیت، چونکە هەڵەو تاوان و گوناه لە ئاسایش مەحرومت دەکات وسەرچاوەی مەزاجت لێڵ دەکات، ئەویش ئازارێکی بەسوێیە..

ئەوەتە من سەیری دەموچاو و ڕواڵەتی خەڵکی دەکەم خەم و فرمێسکی زۆری تیا دەبینم، چونکە لە خوای بەدیهێنەرو زیندووی باڵادەست بەدوورن، دڵیان بە تاریکی دەبینم، نایانەوێ تەنیا مۆمێکی هیوای تیا داگیرسێ و بەگۆیەند و مەشغەڵەتەکانی خۆیانەوە خەرۆبوون ودەستیان بە دنیاوە گرتووە لەجیاتی قیامەت.

من ئامانج لەژیانا بەوە دەزانم عیبادەتیتیابکەم و خوا لە خۆم ڕازی بکەم، ناوچەوانی بۆبنێمەوە سەرزەوی و لە نوێژەکانا سوجدەی بۆ ببەم وشوێن سوننەتی پێغەمبەرﷺ بکەوم، تا بەهەشت بەدەست بێنم.[1]..

## شەشەم :موسڵمانبوونی یاریزانی بەرازیلی کاکا :

یەککگرتووی یاریزانانی تۆپی پێی ئیتاڵی، یاریزانی تیپی میلانۆ (کاکا) ی هەڵبژارد بەچاکترین یاریزانی (خولی پلە یەکی ئیتاڵی) بۆساڵی (٢٠٠٤)، (کاکا) بەرازیلییەو تەمەنی (٢٢) ساڵە و ئەندامی هەڵبژاردەی بەرازیلە و لەیانەی میلانی ئیتاڵیاش یاری دەکات و لە سی یاریدا توانی دە گۆڵ بۆ خۆی تۆمار بکات، (کاکا) زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کەڕێز لەتواناکانی دەگیرێت و ڕایگەیاند کە هەوڵ و کۆشش و یاری باشتر پێشکەش دەکات..

لەسایتی خۆی دا (کاکا) ڕایگەیاند کە موسڵمان بوەو وتی (ئیسلام پەیامی ئاشتی و خۆشەویستی پێیە، چاك وایە مرۆۋ موسڵمان ببێت، چونکە فیترەتە و مەسەلەی دینداریش ئازادی تاکە کەسە نابێت کەس دەستی تێوەربدات، من زۆر دڵخۆشم بە موسڵمان بوونەکەم و

---

[1] - پێگەی یەکگرتوو.

بەقەناعەتی تەواوە موسڵمان بووم، موسڵمان بوونەکەشم دیارە هیچ لە تواناکانم کەم ناکاتەوە، بە پێچەوانەوە دەبێتە هاندەرێکی باش بۆم، ئیسلام کاریگەری هەیە لەسەر دڵنارامی و ئاسوودەیی ماددیی و مەعنەوی، بۆیە حەزناکەم خەڵکی وجەماوەرەکەم وبەڕێوەبەرێتی‌نادی‌میلان و یاریزانەکانی بە چاوێکی تر سەیرم بکەن و رایان بگۆڕێت بەرامبەرم، چونکە من هەوڵ دەدەم لە جاران چاکتر تواناکانم پەرەپێبدەم و خزمەت بکەم)...

## حەوتەم: موسڵمانبوونی پرۆفیسۆرێکی ڕووسی:

ڕۆژنامەی(الوطن)ی سعودی لە ڕۆژی (١٢)ی ڕەمەزانی ئەمساڵ (٢٠٠٦) ڕایگەیاند کە مامۆستایەکی زانکۆی ڕووسی کە مامۆستای وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کوندالیزارایس بووەو لە زانکۆ فێری زمانی ڕووسی کردووە موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاندووە .سەرۆکی مەجلیسی ئیسلامی ڕووسی (محمد صلاح الدین) دەڵێت: پرۆفیسۆری ڕووسی (فولنتين بروساكوف) لە ڕووسیا لە دایك بووە و یەهودی بوو، لە سەردەمی یەکێتی سۆڤیەتدا کۆچی کرد بۆ ئەمریکا، لەبەر ئەوەی کە نیزامی کۆمۆنیستی پێ قەبوڵ نەدەکرا و پاش بیست ساڵ کە لە کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ڕایکردبوو لە دیموکراتیەتی ئەمریکیش ڕایکرد و پاش ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت گەڕایەوە ڕووسیا و موسڵمان بوو..

ئێستا ناوبراو لە ڕۆژنامەی (بیری هاوچەرخی ڕووسی)دا لەبارەی ئیسلامەوە دەنوسێت، کە لەلایەن (مەرکەزی ئیسلامی ڕووسی) یەوە دەردەکرێت و ژمارەیەکی زۆری لێ بڵاو دەبێتەوە.. .

هەروەها سەرۆکی مەجلیسی ئیسلامی ڕووسی (محمد صلاح الدين) دەڵێت سێ قەشەی ڕوسی لەم دواییەدا موسڵمان بوون کە کاریگەرێکی زۆریان هەیە لە بڵاوکردنەوەی ئیسلامدا لەناو ڕووسیادا..[1]

---

١- (گۆڤاری المجتمع/٣١/١٠/٢٠٠٦)

## هەشتەم: موسڵمانبوون لە ئەفریقیا:

وەکالەتی دەنگوباسی ئیسلامی ڕۆژی شەممە ٢٠٠٦/١١/٢٥ دەڵێت: (٢٥١) کەس لە دێی (داموکرو) و (ماگنگا) کە (٢٢٠کم) دوورن لە پایتەختی بورکینافاسو موسڵمان بوون بە هەوڵی لیژنەی موسڵمانانی ئەفریقیا وە.

سێ دێی تریش لە کۆماری (تۆگۆ) لە ناوڕاستی ئەفریقیا موسڵمان بوون بە هەوڵی(کۆمەڵەی بانگەوازی ئیسلامی جیهانی)[1]

## نۆیەم: باڵاپۆشی هونەرمەندی میسری مەدیحە حەمدی:

ناوبراو لە بارەی هەڵبژاردنی بەرنامەی خواو پابەند بوون بە فەرمانەکانیەوە دەڵێت :لەدایك بووی (١٩٤١م)و بەکالۆریۆسم هەیە لە هونەری شانۆدا و لەساڵانی شەستەوە کاری هونەریم لە ئیزاعەوە دەستی پێکرد.. .

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر توانای هونەریم دەردەکەوت و بەشداریم کرد لە کۆمەڵێ کاری هونەریدا وەك (الغول) (عائلة الدوغري) (شهداء الاسلام)...هتد..

هەمیشە لەلام زنجیرە ئاینیەکان لە پێش بوون، لەبەر ئەوەی کە کەسایەتیەکانی ڕاستەقینەن و بەخەیاڵ دروست نەکراون و، هەروەها زۆر لایەنی جوان دەخاتە ڕوو کە بینەر پێشتر نایزانێت و دەبێتە مایەی ڕۆشنبیر کردنی.

سوپاس بۆ خوا خۆم بە هاوسەرێکی سەرکەوتوو ودایکێکی نمونەیی دەزانم، مێردەکەم لیوای پۆلیسە و دوو کوڕیشم هەیەو هەردووکیان ماجستێریان هێناوە.. .. من لە خێزانێکی دینداربووم و هەر لە منالیەوە نوێژم کردووەو باڵاپۆشیش لەلام کارێکی ئاسایی بوو، هەرکەسێکیش لای ئاسایی نیە، با سەیری سەرتا سەری دنیا بکات، ئەوە ڕۆژ هەڵات و ڕۆژئاوا کە لەهەموو شوێنێك باڵاپۆشی هەیە، بەڕاستی باڵاپۆشی بەرگێکی ئاسایی یە بۆ ئافرەت و هەقە بیپۆشێت، حەزدەکەم لە هەموو شتێکدا میانەڕەوبم کە ئەوەش داوای خوایە لێمان..

من بەردەوام نوسینەکانی (قرضاوی)و (محمدغزالي)و (سید سابق) دەخوێنمەوە و ژیاننامەی پێغەمبەریش دەخوێنمەوە، من زۆر تینوی فێربوونم، بۆیە هەوڵم داو (بکالۆریۆس)م هێنا لە (تجارة وإدارة الاعمال)دا.. .

---

١- (المجتمع ٢٠٠٦/١٢/٢)

بەڕاستی باڵاپۆشی فەرزی شەشەمی خوایە لەسەر ئافرەتان، کە هیچ موناقەشەی ناوێت، لە ساڵی (١٩٧٦) دا بۆیەکەمجار چووم بۆعومرە و لەساڵی (١٩٧٧) یش دا چووم بۆ حەج، بەڕاستی تۆوی خێر لەو حەج و عومرەیەدا تیاما چەکەرەی کرد، تا لە ساڵی (١٩٩٩) دا بەیەکجاری خۆم دا پۆشی و تاجی وەقارو ڕەزامەندی خوام لەسەر سەرم دانا...

جارێك خەوێکم بینی کە ژووری نان خواردنەکەم تۆزو خۆڵی زۆری بەسەرەوەبوو، پێویستی بە پاککردنەوە هەبوو، هەر لە ماڵەوە کۆمەڵێ ئافرەتی ڕوونورانیم بینی، پرسیم ئەوانەکێن ؟؟ وترا :ئەوانە دایکی موسڵمانانن.. کە خەبەرم بۆوە لە خۆشیا خەریك بوو باڵ بگرم، هەر چەند دەشترسام بەڵام نامەکەم پێگەیشت و خەوەکە ئەوەندە ڕوون وئاشکرا بووپێویستی بەلێکدانەوە نەدەکرد.. .

ئیمرۆ ئێمە لە هەموو کات زیاتر پێویستمان بە هونەرێکی پاکی چاك هەیە، کە ڕەچاوی بەها باڵاکان بکات و لە سنووری رەوشتی بەرز دەرنەچێت، لەسایەی خواوە من لەبواری هونەری وکارەکانمدا خۆم بە بانگخواز دەزانم و حەزدەکەم دنیا هەموو ئەو ئیسلامە جوانە ببینێت کە تاقە ڕێگای سەرفرازی مرۆڤایەتیە.. .

من لەڕێی وتاردان و دەرسەکانمەوە، بانگەواز دەکەم و ئافرەتان فێری ئیسلام دەکەم، بەتایبەت ئەوانەی کە نەخوێندەوارن، بۆ ئەوەی بەرچاو ڕوون بن وئەندامێکی کارابن لەناو کۆمەڵگەدا، جا هەر کەسیش لەم بوارەدا سەریکەوێت بەئاسانی لە بوارەکانی تریش دا سەرکەوتن بەدەست دێنێت.. .

بەڕاستی ئیسلام ئاینی زانست و زانینە و داوای چاکسازی و چاکەکاریشمان لێدەکات، هەر وەك دەفەرموێت:﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾ ﴾ هود: ١١٧.[١]

**دەیەم: قیبتیەکانی میسر:** لەکۆنفرانسێکی داخراوی قیبتیەکانی میسردا،کە باباشنودەو جێگرەکانی وچەندەها کەسایەتی مەسیحی ئامادەبووبوون، باس لەموسڵمانبوونی زۆری قیبتیەکان کرا، کە لەسەرتاسەری میسردا ڕۆژانە کەسێك یان چەند کەسێك لە قیبتیەکان موسڵمان دەبن، ئەوانیش کەسانی هەژار نین دوای پارە کەوتبن، کەسانی

---

١- (المجتمع ژ: ١٧٢٦)

بێ پلەو پایەنین، هەوڵی پلەو پایەیان بێت، بەڵکو زۆربەیان خاوەن بڕوانامەی بەرزن بۆیە هەموو یەکڕابوون کە ئەگەر کار وابڕوات و بەو ڕێژەیەی کەلەحەفتا ساڵی ڕابردوودا کەمیان کردووە کەم بکەن لەماوەی دووسەد ساڵێکی تردا یەك قیبتی نامێنێ لەمیسردا (کە ژمارەیان چەند ملیۆنێکە)..

## یانزەیەم: موسڵمانانی هۆڵەندا:

موسڵمانان لە هۆڵەندا ژمارەیان ملیۆنێکە، لەکاتێکدا کە دانیشتوانی هۆڵەندا شانزە ملیۆن کەسەو، لەبەر ئەو هەمووناهەقیەی کە بەرامبەر بە موسڵمانان و ئیسلام و پێغەمبەرﷺ کرا لە ڕۆژئاوادا، موسڵمانان بڕیاریان دا کە حیزبی (ئیسلامی دیموکراتی) دروست بکەن و لە گۆڕەپانی سیاسیدا ڕۆڵی خۆیان ببینن و، بەرگری لەمافەکانی خۆیان بکەن و لە پەرلەماندا دەنگی خۆیان بە ئازادی لەڕێ ی کورسیەکانیانەوە بگەیەنن...

ئەمەبێجگە لەوەی بەم ڕێگایە لاوان کۆ دەکەنەوەو نایەڵن بەرەو لادان و توندڕەوی بچن[1]....

## دوانزەیەم: موسڵمانبوونی فریدیك کانوتیە:

ناوبراو گۆلکەری دەوری ئیسپانیەو لەتیپی ئیشبیلیەدا یاریدەکات ولەلایەن هەموو هاوەڵان و ئەندامانی تیپەکەیەوە بەڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و بەسەرسامیەوە دەڕوانە نوێژکردنی لەکاتی خۆیدا.

ڕەوشتی بەرزو مامەڵەی جوانی ناوبراو لەلایەن هەموو لایەکەوە نرخێندراوەوکاتێکیش کەقایل نەبوو ئەو فانیلەی یاریە لەبەربکات کە دیعایەیکۆمپانیایەکی پێوەبوو داواکەیان وەرگرت و ئاسایی بوو لایان[2]..

## سیانزەیەم: موسڵمانبوونی ماریا ی فلیپینی:

ناوبراو لەبەر ئەوەی پاش چاوەڕوانیەکی زۆر خوا بەخشی بە دایك و باوکی، نەزریان کرد بۆ کەنیسە، باوکی کاسۆلیکیەکی دیندار بوو، لەباوەشی کەنیسەدا گەورە بوو، لەتەمەنی

---

١- سایتی یەککرتوو.

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو

چوارده ساڵیدا بووه کیژێکی هۆشیارو چاوکراوەو شارەزاو دیندارو بەرگری زۆری لە کەنیسەو عەقیدەی دەکرد، بەمەش باوك و دایکی زۆر دڵ خۆش بوون.

کار بەم شێوەیە گوزەرا، ماریا لەگەڵ کاری کەنیسەدا (تمریض)یشی دەخوێند، چەند دەچووە بوارەکانی ژیانەوە زیاتر هەستی بەبۆشایی دەروونی ورِوحی دەکرد، کەنیسە نەیدەتوانی ئەو بۆشاییەی بۆ پرِبکاتەوە..

باوکی کەم دەست بوو بۆیە ماریا ناچار بوو کار بکات، بیریان کردەوە لەولاتێك کەدەسکەوتی باش بێت، قەدەری خوا وابوو کە ڕوویکاتە ولاتی سعودیە بۆ کاری (تمریض)..

خێزانەکەی لەبەردەم دوورِیانێکدا بوون، یەك لەیەك تاڵ تر، یان ئەبێت بە هەژاری ژیان بەرنەسەر یان دەبێت کچەکەیان بچێتە لانکی ئیسلامەتی، دەترسان ئیسلامەتی کار بکاتە سەری، ناچار بوون دووەم هەڵبژێرن، بەلام هەولێ زۆریان لەگەڵ داکە رقی لە ئیسلام بێت وهەمیشە ئامۆژگاریەکانی کەنیسەی لە یادبێت.

باوك ودایکی پەیمانیان لێ وەرگرت کەپەیوەندی نەبێت بەهیچ موسڵمانێکەوە، ماریا ئامۆژگاریەکانی وەك گوارە کردە گوێی و ڕووی کردە ولاتی سعودیە و لە خەستەخانەی (القابل) لەشاری ئەبها دەست بەکار بوو، هەرچەند دەیویست خۆی دوور بگرێ، بەلام بارو زروفیکارەکەیوایدەویست کە تۆزێ بکرێتەوە لەگەڵ دەوروبەریدا .

ماریا بووە هاوەڵی کیژێکی سعودی کەزۆر خەمی هیدایەتی بوو، بۆیە کاسێت و پەراوی ئیسلامی ئەدایە، پاشان پزیشکێکی ناسی کەزۆری لەبارەی ئیسلامەوە بۆ باس کرد.. بەم شێوەیە ڕێرەوی ژیانی گۆرِدرا، لەتاریکیەوە هەنگاوی نا بەرەو ڕووناکی، لە سێ خواییەوە بەرەو یەکتاپەرستی.

کەوتە هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنی ئیسلام ومەسیحیەت، کەوتە خوێندنی قورئان، هەروەك خۆی دەڵێت (هەستم کرد قورئان قسەم لەگەڵ دەکات).. ئینجا ڕەمەزان هات و بەرِۆژوو بوو، دڵ و دەروونی بە ئیسلام گەشایەوە و لە بنکەی بانگەواز و هۆشیاری جالیات لە ئەبها موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند و ناوی خۆی کرد بە (مەریەم) لە خۆشەویستی خاتوو (مەریەم)دا..

نەی توانی موسڵمانبوونەکەی بشارێتەوەو هەرزوو هەواڵی موسڵمانبوونی دا بە دایك وباوکی، هەواڵەکە وەك هەورە بروسکە دای بەسەریاندا، چیان هەوڵ دا ساردی بکەنەوە،

سوودی نەبوو، بۆیە پێیان وت: (ئێمە بێ بەرین لەتۆ تا نەگەڕێیتەوە سەر ئاینەکەت، دیارە تۆ دەتەوێت کێشەمان بۆ دروست بکەیت بەم موسڵمانبوونەت)..

ماریا سوور بوو لەسەر ئیمان و ئیسلامەتی و وەك شاخ لە ڕوویاندا وەستاو وتی: (مادەم خوا لێم ڕازی بێت باکم نیە، من لەزەتی عیبادەتم چەشتووە بەتایبەت ڕۆژوو).. سەرەنجام دایك و باوکی لەبەردەم کۆڵنەدانی ماریا دا کۆڵیان دا و نەرم بوون و، وتیان قەیناکە بە موسڵمانی بمێنەرەوە، بەڵام ناوی خۆت مەگۆڕە، کاربەدەستانی بانگەوازی هۆشیاری جالیات پێیان وت قەیناکە ناویشت نەگۆڕیت، چونکە(ماریا)ش ناوی هاوسەرێکی پێغەمبەرەﷺ کە قیبتی‌یەو دایکی موسڵمانانە. ئینجا ماریا وتی: (داواکارم لە خوا هاوکاریم بکاو توانام بداتێ بتوانم باوکم ڕزگار بکەم).

بەڵێ. ڕۆژی هەینی (١٤٢١/١٠/٢٤) کۆچی نزیکەی شەش ساڵێك لەمەوبەر ڕۆژێکی خۆش بوو، کەماریای تەمەن (٢٣ ساڵ) لە بنکەی بانگەواز و هۆشیاری جالیات لە ئەبها موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند بە (الله أكبر) و پیرۆزبایی کردن باوەشی گەرمیان بۆ کردەوە.

ماریا بووە هاوڵی خوشکێك کە لە (زامبیا)و هاتبوو پێش سێ مانگ لە ماریا موسڵمان بوو بوو. بەم شێوەیە گەشتی ئیمان و بانگەواز کردنیان بۆ ئیسلام دەستی پێکرد. دەك مژدەتان لێ بێت بەو مژدەیەی خوا کە دەفەرموێت: ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ‎ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ الزمر: ١٧ – ١٨، [١]

## چواردەیەم: موسڵمانبوونی ٣٠ قەشەی فاتیکان:

لێکۆڵەری سعودی (عصام مدير)کە قوتابی (شيخ ئەحمد ديدات)ەو پسپۆڕە لەبواری‌مژدەدان و بەراوردکردنی ئاینەکاندا دەڵێت: نزیکەی (٣٠) قەشەی گەورەی فاتیکان موسڵمان بوون و فاتیکانیش دادگاییان دەکات ودەریان دەکات لەکەنیسە، موسڵمانبوونی ئەو ژمارە زۆرەی قەشەکان لە فاتیکاندا یەکێکە لەو هۆکارانەی کە پاپا ئەو قسە ناڕەوایانە بکات بەرامبەر بە ئیسلام لەم دواییەدا..

---

١- (WWW.THEMWL.ORG/ALDAAWA)،

(عصام مدير) پاش بلاوکردنەوەی وێنە خراپەکانی دانیمارك، دەزگایەکی بلاوکردنەوەی دامەزراند لە دیسەمبەری (٢٠٠٥)دا بەناوی (دار البينة) کە پەڕاوەکانی شیخ ئەحمەد دیدات و پەڕاوی ناساندنی ئیسلام بەزمانە بیانیەکان بلاو دەکاتەوە..

دەزگای بلاوکردنەوەی (البينة) سەد هەزار نوسخەی پەڕاوی (محمد الأعظم) ی شیخ ئەحمەد دیدات ی بلاوکردەوە لە ڕۆما و فاتیکان بە زمانی ئیتالی و وەك دیاری یەك دایان بەخەلکی ئەو ولاتە، دیارە ئەمە ڕێگایەکی زۆر باشە بۆ ناساندنی ئیسلام..

هەر لەسالی (٢٠٠٥) دا هەمان دەزگا (٢٥) هەزار نوسخەی پەڕاوی موسلمانبوونی مژدەدەرێکی ئەمریکی ئافرەت چاپ دەکات کەناوی (میری مالفور)ە، کە ئەمیش لە ڕۆژنامەکاندا دیعایەی زۆری بۆ کراو بەدیاری دابەشکرا بەسەر خەلکی دا.. ناوبراودەلێت: ئەو قسە نارەوایانەی پاپا سەرەتایەکە بۆ پرکردنی خەلکی ئەوروپی‌دژی ئیسلام و، ئینجا چاوەڕێ ی بەرپەرچ دانەوەی موسلمانان دەکەن بەتایبەت لە ئەوروپا بۆ ئەوەی بیکەنە بیانوی دەرکردنی موسلمانان..

(عصام مدير) دەلێت: بەرپەرچ دانەوەی پاپا و ناحەزانی تر دەبێت زۆر بە ژیرانە بێت، چونکە ئەوان لە بیانوون لە ئیسلام و ئامارەکانیان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە پەنجا سالی داهاتوودا ئیسلام بەسەرتاسەری ئەوروپادا بلاودەبێتەوە... جا ئەو قسانەی پاپا لەوێوە سەرچاوە دەگرێ و سەرەتایەکە بۆ جەنگێکی نوێی خاچپەرستان، هەرچەندە ئەو ڕەفتارو گوفتارەی ئەوان بۆتە مایەی سەرنج ڕاکێشانی خەلکی بەرەو ئیسلام، موسلمانان ئەبێ بەدانایی ڕەفتار بکەن وهەموو ڕێگایەك بگرنە بەر بۆ بلاوکردنەوەی ئیسلام، تەنانەت ئێمە لەم ماوەیەدا چوار پەڕاومان بەزمانی ئەلمانی ناردبۆ پاپا کە دانراوی (شیخ ئەحمەد دیدات)ە و بریتیبوون لە (ماذا يقول الكتاب المقدس عن محمد)و (المسيح في الأسلام)و (القرآن معجزة محمد)و (محمد الخليفة الطبيعي للمسيح).. شایەنی باسیشە کە زۆر موسلمانی بەریتانی و ئەوروپی هاوکاریمان دەکەن وەك (يوسف إسلام)و (مراد هوفمان)و (أحمد فوندنفر)..[1]

---

١-WWW .ALWATAN.COM.SA/DAILY

## پانزەیەم: موسڵمانبوونی مەریتای سویسری:

فیترەتی مرۆڤ هەمیشە بە دوای شتێکدا دەگەڕێت کەلەگەڵیدا بگونجێت، ئەگەڕێت بە دوای یەکتاپەرستی و بەرنامەی ڕەوشت بەرزیدا کەئەوانەش تەنها لە ئیسلامدا دەست دەکەون..

یەکتاپەرستی و ڕەوشت بەرزی دوو هۆکارن بۆ هیدایەت و هاتنی ڕۆژئاواییەکان بەرەوئیسلام، مەریتای سویسری تەمەن (٢٣) ساڵ یەکێکە لەوانە، کە گەڕا بەدوای شتێکدا کە لەگەڵ فیترەتی دا بگونجێت و زۆر هەوڵیدا سەرەنجام بە قەناعەتی تەواوە موسڵمان بوو، لە کاتی عومرە کردندا، (الجزيرة) چاوپێکەوتنی لەگەڵ ساز دا.. .

*لەکەیەوە ئیسلامت ناسی؟

- سەرەتا لە کاتی دیراسەمەوە لە سویسرا ئیسلامم ناسی، ئەمەش بەوەی کە لەو خوێندنگایەدا هەمیشە دژایەتی ئیسلام دەکرا، ئەوە وای لێکردم کە بیر لە ئیسلام بکەمەوە و پرسیارێك لام دروست بوو، بۆچی ئەم ئاینە ئاوا هێرش دەکرێتە سەری ؟ چی کردوە ئاوا دژایەتی دەکرێت ؟ من دەگەڕام بە دوای نووسینێکدا کە بە هۆیەوە بتوانم وەڵامی ئەو هێرشانە بدەمەوە..

*بۆچی ئەو سۆزەت هەبوو بەرامبەر ئیسلام لەکاتێکدا تۆ مەسیحی بوویت ؟

- لە ڕاستی دا چەند هۆیەك هەبوو، گرنگترینیان شتێك بوو لە ناخمدا حەزم دەکرد بەرگری لەم ئاینە بکەم لە کاتێکدا کە کەسێك نەبوو بەرگری لێ بکات، لە ڕاستیشدا ئێمە هەر بەناو مەسیحی بووین و سەردانیشمان لە کەنیسە شتێکی ڕۆتینی و عادەت بوو..

*تۆ چیت هەیە لەسەر مەسیحیەت؟!

- من وەکو مرۆڤێکی ئەم سەدە پێشکەوتووە ناتوانم باوەڕ بێنم بەوەی گەورەمان عیسی سەلامی خوای لێ بێت خوایە، من لەسێ خوایی تێ ناگەم، ئەوە بیرو باوەڕێکە لەگەڵ عەقڵ و فیترەت دا ناگونجێ چۆن دەبێت عیسی بەشەر بێت و لە هەمان کاتیشدا خوا بێت ؟! چۆن دەبێت خواوەند یەکێك بێت و لەهەمان کاتیشدا سیان بێت ؟ ئەمانە شتانێکن قبوڵ نین، من دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم هەر مەسیحیەك بۆ ماوەیەکی کورتیش بیر لەوانە بکاتەوە واز لە مەسیحیەت دەهێنێ.. .

*ئەگەر ئەمە بیروبۆچوونت بێت لە بارەی مەسیحیەتەوە، ئەی لەبارەی ئیسلامەوە دەڵێیت چی؟!

- بەڕاستی بیروباوەڕو عەقیدەی یەکتاپەرستی، کەتەنها یەك خوا دەپەرسترێت و محمدیش ﷺ بەشەرەو پێغەمبەری خوایەو ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام وایان لێ کردم موسڵمان ببم، ڕەوشتی بەرز، سنگ فراوانی ولێبوردەیی و ڕاستگۆیی، ئەمانە هەمووی لە ئیسلامدا پاداشتی هەیەو نەبونیشیان سزای لەسەر دەدرێت، کەواتەڕەوشت بەرزی پێویست کراوە نەك هەر کەس بیکات بە ئارەزوی خۆی..

* هەندێك دەڵێن بالاپۆشی لەگەڵ سەردەم دا ناگونجێت ؟!

- چ سەردەمێك.. ئەمە درۆیە.. هەڵبەستنە.. گاڵتەکردنە بەعەقڵ.. ئەم سەردەمە تایبەت نیە بە شتێکەوە، بەڵکو هەموو شتێك لە خۆی دەگرێت، جا کە ئیسلامیش بۆ هەموو کات و شوێنێك بێت ئەوا ئەوەی فەرمانیشی پێ دەدات بۆ هەموو کات و شوێنێکە..

* چی دەکەیت دوای موسڵمان بوونەکەت ؟

- من دەمەوێت بانگخواز بم، بانگی کەس و کارو هاوەڵانم بکەم بۆ ئیسلام لە سویسرادا.[1]

## شانزەیەم: موسڵمانبوونی (٣١٣) کەس:

نووسینگەی هۆشیارکردنی جالیات لەڕێی مۆبایلەوە لە سعودیە توانیویەتی لەمانگی ڕەمەزانی (٢٠٠٦)ەوە بەکەمتر لەدوومانگ دەستی (٣١٣)کەس بگرێت بەرەو ئیسلام و پەیوەندیات پێوەبکات.[2]

## ناحەزانی پێغەمبەر دوابڕاون:

خوای گەورە بەردەوام دەستی خێری بە قورئانەوەیەو موعجیزاتەکانی بۆ مرۆڤایەتی دەردەخات، هەروەها پەیمانیشی بە پێغەمبەرﷺ داوەکە هەرخۆی بەرپەرچی گاڵتەکەران و دوژمنان ئەداتەوەو مژدەی داوەتێ کە دوژمنانی دوابڕاوو تیاچوون، هەروەك دەفەرموێت:

---

١- (ڕۆژنامەی الجزيرة/ ژمارە: (١٣٣٩٣)/ ٢٧ ربيع الثاني/١٤٢٧هـ)

٢- (المجتمع: ٢٠٠٦/١٢/١٦)

﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ ٱلَّذِينَ يَجۡعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴾الحجر:٩٤-٩٦، واته: هەرفەرمانێکت پێدراوە ئەی محمدﷺ بە ڕێکوپێکی ئەنجامی بدەو گوێ مەدە بە بوختان و ڕەفتاری موشریکان، ئێمەتۆدەپارێزین لەگاڵتەکەران و (تۆڵەیان لێ دەسێنین)، ئەوانەی لەگەڵ خوای گەورەدا خوایەکی تر بڕیاردەدەن، جا لە ئایندەدا هەموو ڕاستیەکانیان بۆڕوون دەبێتەوەو خۆیان دەبیننەوە چیان لێ دەکەین.. یان دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ ﴾الكوثر: ٣، واتە: بەڕاستی دوژمنان و ناحەزانی تۆ دواپڕاون..

ئاشکرایە خوای گەورە چی بەسەر دوژمنە سەرسەختەکانی پێغەمبەر دا هێنا، پەڕاوەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ زۆریان تۆمار کردووە، جا نەك هەر ئەوسا بەڵکو بەردەوام ئەم ڕاستی‌یە وایە و ئەم پەیانە دێتە دی!

## نموونەیەك لە كوردستانەوە:

مەریوان هەڵەبجەیی کتێبێکی نووسی دژی ئیسلام بۆ دەستکەوتێکی کەمی دنیایی و بۆ چوون بۆ خاریج، خاریجەکەی دەستکەوت، چەند نووسەرێك وەڵامیان دایەوە، وەك کتێبەکەی پڕۆژەی تیشك و کتێبەکەی دکتۆر عوسمان بەناوی سەرابەکان نابنە کانی.. بەڵام ئەوەی سەیرە خوا هەر بە عیلمانیەکان حەیای بردو ڕۆژنامەی پێگە ژمارە (٦٤) لە (٢٠٠٦/١٠/١٠)دا لاپەڕە (٥)، یەك لاپەڕەی تەواو لەژێر ناونیشانی (مەریوان هەڵەبجەیی یان مەریوانی تەزویر چی؟) بە وەسایقەوە باسی تەزویرکردنی بڕوانامەی پۆلی سێی ناوەندی دەکات کە کردوویەتی بە بڕوانامەی شەشی ئامادەیی و هەروەها بە تەزویر ویستویەتی‌خزمەتی نۆ ساڵ و یانزە مانگی پێشمەرگایەتی بۆ ئەژماربکرێت کە لە ڕاستیدا هیچ خزمەتێکی نیە..

## نموونەیەکی تری سەردەم:

(فرانسی‌فرانتار) یەکێکەلە دوژمنە سەرسەختەکانی ئیسلام و یەکێکە لە هاوبیرەکانی پاپا لەوقسە ناڕەوایانەی کەکردی دژی ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ، ناوبراو سەرۆکی ڕۆمی کاسۆلیکە لە سلۆفینیا، ئەم قەشەیە داوادەکات کەناسنامەی مەسیحیەتی ئەوروپا بپارێزرێت وبەرلە ئیسلام بگرێت کە بڵاوبێتەوە، خوای‌گەورە وەك سوننەتی بەردەوامی نەگۆڕی خۆی لە بوونەوەردا ناوبراوی ڕیسواکرد بەوەی کە لە ڕۆژی پێنج شەممە (٢٠٠٦/١٠/١٩) پۆلیسی سلۆفینی (فرانسی)یان دەستگیرکردوسەرەتا هەواڵەکەیان شاردەوە وپاشان لە (١١/١٢/

٢٠٠٦) دا بلاویان کردەوە، بەتۆمەتی ئەوەی ناوبراو، کە بەحیساب ڕەسولی مەحەبەت وسەلامە، پانزە ساڵە دەست درێژی دەکاتە سەر منالی کوڕو کچی سەر بە کەنیسەکەی؟! واش چاوەڕوان دەکرێت کە دە ساڵێك بەند بکرێت...

ئەمەش یەکەم جار نیە گەورە بەرپرسانیکەنیسە کارەساتی وایان لێ بقەومێ، دادگای (لوبلیانا)ش لەسلۆفانیا، ئابڕوچونێکی تری قەشە (کارل یوشتو)ی هاتە بەردەست، کەسزا درا بەوەی لە ماڵەکەیخۆیدا دەست بەسەربێت، ئەم جۆرە ڕووداوانە کە دادگاش سزای توند نادات لەسەری و قەشەکانیش هیچ نیە ڕێگریان بێت، وای کردووە کە کۆمەڵگەی سلۆفینی بە سوکی سەیری سەرانی کەنیسەی ولاتەکەیان بکەن و ئەمین نەبن لە منالەکانیان کە ڕووبکەنە کەنیسە !

ئەو قەشانەش کە لەگەڵ مژدەدەرەکاندا دەچن بۆ ولاتە هەژارەکانی وەك ئەفریقیاو فلیپین و شوێنەکانی تر، بەهەمان شێوە ڕەفتاری ناجۆر دەکەن بەرامبەر منالان، هەر چەند زۆر پەردە پۆش دەکرێ، تا هیچ نەبێت تۆزێ ئابڕویان بۆ بمێنێ، بەلام بەقەدەرەی خوا (پۆلیسی نێو دەوڵەتی، ئینتەر پۆڵ) بەردەوام فشار دەخاتە سەر دەوڵەتە ئەوروپی‌یەکان کە ئەو قەشە تاوانبارانە بگرێت و دادگایی بکرێن.. . هەر ئینتەرپۆل بوو داوای لە سلۆفینیا کرد کە قەشە (فرانسی) بداتە دەست، کە ئەوان قایل نەبوون و دادگایی‌یەکەیان لە (سلۆفینیا)کرد.

لە کرواتیاش سزای بەندکردنی ساڵێك بۆ (یالینا برایيشا) دەرکرا کە ئافرەتەو بەڕێوەبەری (ڕێکخراوی کاریتاس)ە، کە ئیدعای عامی کرواتی قایل نین بەو حوکمە و داوای سزادانی هەمو ئەندامی ڕێکخراوەکە دەکەن کە ڕێکخراوێکی کەنیسەیەو لەجیاتی خزمەت بە منالان، دەست درێژیان کردۆتە سەر ئەو مندالە بەسەزمانانە!؟! ئەمەش زیاتر متمانەی خەلکی لەق کردووە لەبەرامبەر کەنیسەو ڕێکخراوەکانی و، ئێستاش دادگای کرواتی لێپێچینەوە دەکات لەگەڵ چوار (ڕاهیبە) دا کە ئەوانیش کاری بەدڕەوشتیان ئەنجام داوە، ئەمانە هەمووی وای کردووە کە خەلکی نەچنە کەنیسەکان و لەزۆر لەولاتان دابخرێن یان بفرۆشرێن؟!

زیاتر له هەزار شکاتیش کراوە لەساڵی(٢٠٠٢)ەوە تا(٢٠٠٦) لەقەشەکانی کەنیسەکانی کالیفۆرنیا لە ئەمریکاو بۆ کۆتایی هێنان تەنها بە ٤٥ قەزیە (ئەبەرشیەی ئەسقوفی لۆس ئەنجلوس) بڕی (٦٠) ملیۆن دۆلاری تەرخان کردووە..[١]

## داخستنی کەنیسەکان لە بەریتانیا:

ساڵی زیاتر لە شەست کەنیسە لە بەریتانیا دادەخرێن، ئەمەش لەبەرئەوەی قەشەکان دەڵێن: زیاتر لەهەزار کەنیسە لە بەریتانیا دا لەرۆژانی یەك شەمماندا چۆڵن، ئامارەکان دەڵێن کە لە ساڵی (١٩٧٠)دا (١،٦ ملیۆن) کەس ڕووی کردووەتە کەنیسەو لە ساڵی (٢٠٠١) دا ئەو ژمارەیە بوو بە (٩٤٠) هەزار کەس، وە لەو ماوەی سی ساڵەدا (١٦٢٦) کەنیسە داخراوە، کەهەندێکیان ڕووخێنراون و هەندێکیان کراون بە هۆڵی یاری و سەماو ئاهەنگ گێڕان و شتی تر..

مەسیحیەت هەزار ساڵێکی ویست تا لەبەریتانیادا بڵاو بۆوە، کەچی لەتەنها چل ساڵێك دا خەڵکانێکی زۆر دەست بەرداری بوون...

لە ساڵی (١٩٩٨) دا ژمارەی ئامادەبووان کەم بۆوە لە (٥٧) کەنیسەدا لە ناوچە گوندنشینەکاندا بۆ (١٤) کەس، بەم شێوەیە مەسیحیەت بووە ڕابردووی بەریتانیا نەك ئێستاو داهاتووی.. .

هەروەها ئامارەکان دەڵێن کە ژمارەیەکی زۆر لە قەشەکان کەژنهێنانیان لێ قەدەغەیە، تووشی خلیسکان دەبن و بە تۆمەتی زیناو داوێن پیسی دەستگیر دەکرێن .

بیروباوەڕیکەنیسەش کە تەحریف کراوە، ناتوانێ ڕێنمایی خەڵکی بکات و قەناعەت بەخەڵکی سەدەی بیست و یەك بکات کە هەموو ژیانی بووە بە ڕاکەڕاك بە دوای ماددە دا .

ئێستا لە بەریتانیادا ئیسلام دووەم ئاینە و دوارۆژ بۆ ئەوە، بەتایبەت کە لە (٢٠٠٤) دا ژمارەی ئەوانەی کە هاتووچۆی مزگەوتیان کردووە (٩٣٠) هەزار کەس بوون، کە ئەم ژمارەیەش زیاتره لە ژمارەی ئەوانەی کە دەچوون بۆ کەنیسەی (ئەنگلیکانی) کە (٩١٦) هەزار کەس بوون .

---

١- المجتمع ژ: ( ١٧٢٩) (١٧٣١)..

هەڵەی قەشەکان و ناتەواوی بیروبۆچوون و باوەڕی کەنیسە وای کردووە خەڵکی خوو بدەنە ڕێکخراوەکانی ژینگە پارێزی و وەرزش و ئیلحاد و ماددیەت.. .

جا هەروەك (محمد ئەسەد) لەپەڕاوی (الإسلام علی مفترق الطرق)دا دەڵێت: بێگومان تائێستاش کەسانێك هەن کە پابەندی ئاینیمەسیحین لە ئەورووپادا بەڵام کەمن لەچاو ئەو هەموو خەڵکەی کەشوێن هەواوئارەزوویان کەوتوون و ماددە پەرستن، ئاشکرایە کە خەڵکی هەموو چاوەڕێی فریاد ڕەسێکن، تۆ بڵێی موسڵمانان ئەو فریادڕەسە بن کە ڕۆژئاوا ڕزگار دەکەن..[1]

# لەموعجیزەکانی ئیسلام

## یەکەم: کاریگەری ناوهێنانی خوا لەکاتی سەربڕینی مەڕو ماڵات و پەلەوەردا:

سی لێکۆڵەرو مامۆستای زانکۆی سوریا بۆ ماوەی سێ ساڵ لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گرنگیان کرد کە بەڕاستی موعجیزەی قورئان دەسەلمێنێ.. دکتۆر (سعد مخلص یعقوب) دەڵێت: بەرنامەیەکی کارمان دانا بۆ دیراسەکردن و لێکۆڵینەوە بە پێشکەوتوترین شێوازی زانستی لە تاقیگەدا، وە لیژنەی تایبەتیمان دانا لەکەسانی پسپۆڕ وشارەزا بۆ سەردانی قەسابخانەکان و هێنانی نموونەی تایبەت بۆ شیکردنەوەو فەحس کردن.

لیژنەکە نموونەی گۆشتی ئەو مەڕو ماڵات و پەلەوەرانەیان هێنا کەلەکاتی سەربڕینیاندا ناوی خوایان لەسەر برابوو، هەروەها نموونەی ئەوانەشیان هێنا کەلەکاتی سەربڕینیاندا ناوی خوایان لەسەر نەبرابوو..

دکتۆرنبیل الشریف کە عەمیدی پێشووی کۆلێژی دەرمانسازی زانکۆی دیمەشقە و دکتۆرفایز الحکیم لەبارەی هەنگاوەکانی دیراسەکەوە دەڵێن، ئەو نموونانەی دەگەیشتە دەستمان دەمانخستە ناو دیتۆڵەوە کە خەستیەکەی (١٠٪) بوو بۆ ماوەی کاتژمێرێك تا دەرەوەی گۆشتەکان بە تەواویپاکژ ببێت و لەدەرەوە هیچ میکرۆب و ڤایرۆسێك نەچێتە ناو

---

١- (المجتمع: ١٥/ ١٠/ ٢٠٠٦)

گۆشتەکانەوە.. ئینجا لە چینەکانی ناوەوە ی گۆشتەکان خانەمان وەرگرت و زەرعمان کردن بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر..سەرەنجامی لێکۆڵینەوەکان گەیشتنە ئەوەی کەڕەنگی ئەو گۆشتەی ناوی خوای لەسەر براوە (زهری فاتح)ەو ئەوی تر سورێکی تۆخە و ئەڵێی شین بۆتەوە.. هەروەها ئەوەی ناوی خوای لەسەر برابوو میکرۆب و (جراثیم) لەسەری گەشەی نەکردبوو کە ئەوی تریان بە پێچەوانەوە میکرۆب و جراثیم ی زۆر لەسەری گەشەی کردبوو.. .

هەروەها خڕۆکەی سووروسپی زۆر لەسەر ئەو گۆشتەی ناوی خوای لەسەر نەبراوە زۆر بە ئاشکرا دەبینراو ئەویتر ئەو خڕۆکە سوورو سپیانەی لەسەر نەبوو، کە ئەمەش بەڕاستی ئیعجازێکی گەورەیە و ڕاستیەکی زانستی گەورەشە، کە بەهۆی سەربڕینەوە کەناوی خوای لەسەر برابێت گۆشتەکە تارێژەیەکی زۆر پاکە و تەعقیمە.. دکتۆر خالد حلاوە بەرپرسی ڕاگەیاندنی لیژنەکە بە وەکالەتی دەنگوباسی کوەیتی ڕاگەیاند کە ئەم دۆزینەوە گەورەیە شۆڕشێکی زانستی گەورەیە لە بواری تەندروستی مرۆڤدا .

عبدالقادر الديراني لێکۆڵەر لە لیژنەکەدا دەڵێت: خەڵکی بەداخەوە حیکمەت و مەزنی ئەو فەرمانە قورئانیەیان نەدەزانی لە سەربڕین لەسەر شێوازی ئیسلامی، کە ئەم دیراسە زانستیە ئەو حیکمەتە گەورەیە دەردەخات کە قورئان دەفەرموێت:﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ﴾الانعام:١١٨.﴿وَلَا تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ﴾ الانعام: ١٢١، (انعام لم يذكر اسم الله عليها افتراء عليه)[1]

## دووەم: جووڵەی خۆر:

قورئانی پیرۆز لەبارەی خۆرەوە دەفەرموێت:﴿ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾یس: ٣٨، واتە: خۆر بە خێرایی بەرەو جێگای جێگیربوونی خۆی دەڕوات، ئەمەش لەکارو دروستکراوەکانی خوای خاوەن توانای بێ ئەندازەو خاوەن زانیاریی بێسنورە.. .

خۆر لە زەوییەوە نزیکەی (١٥٠) ملیۆن کیلۆمەتر دوورە، جا لەبەرئەوەی خێرایی ڕووناکی (٣٠٠)هەزار کیلۆمەترە لە چرکەیەکدا و ئەو ڕووناکییەش(٨,٣١) خولەکی دەوێت تا دەگاتە سەر زەوی.

---

١- www.tawabon.com

خۆر ئەستێرەیەکی ڕێی کاکێشانەو (٢٧) هەزار ساڵی ڕووناکی لە ناوەندییەوە دوورە، قەبارەی خۆریش ملیۆنێك و سێ سەد هەزار ئەوەندەی قەبارەی زەوی یە، واتە (١،٤ بلیۆن بلیۆن کم٣)یە، قورساییەکەشی (٣٣٣) هەزار ئەوەندەی قورسایی زەوی یە، گەرمیڕووی خۆر نزیکەی شەش هەزار پلەی سەدییەو گەرمایی ناوەکەشی (١٣) ملیۆن پلەیسەدییە، خۆر پێکهاتووە لە گازی هایدرۆجین وهلیۆم بەڕێژەی ٩٨٪، باقییەکەی تریشی ئۆکسجین و ئاسن وکاربۆن وعنصری ترە.

## جووڵەی خۆر:

لەکۆندا وایان دەزانی کە زەوی جێگیرە وخۆر بەدەوریا دەخولێتەوە، ئینجا پاش پێشکەوتنی زانستی لەسەدەی حەڤدەوە زانایان وایاندەزانی کەخۆر جێگیرە و ئەستێرەکان بە دەوریا دەخولێنەوە...

بەڵام پاش دۆزینەوەی مەجەرەکان و دیراساتی ورد لەسەر خۆر دەرکەوت کە خۆر دەجولێت و دەڕوات وجێگیر نیە، لەسەرەتاوە وایاندەزانی کە یەك جووڵەی ناوەندی هەیە بەدەوری ناوەندی مەجەڕەکەیدا، دواتر دەرکەوت کە خۆر بەرەو ناوەندی مەجەڕەکەش دەجولێت، دەرکەوت وەك چۆن کەسێك ڕادەکات و خۆی ئەدا بەلای ڕاست و چەپدا، خۆریش بە هەمان شێوەیە، بەمەش ڕێڕەوێکی (متعرج) دروستدەکات لە فەزادا نەك ڕێڕەوێکی ڕێك.

خۆرلەسەر خولگەیەکی تایبەت دەسوڕێتەوە کە بە (٢٢٦) ملیۆن ساڵ تەواوی دەکات، ئەمەش بەساڵی گەلەئەستێرە (مەجەڕە) ناو دەبرێت، کە بە خێرایی (٢١٧کم/چرکەیەك)دا..

زانایان جولەیەکیتریخۆریان دۆزیەوەکەلەگەڵ گەلەئەستێرەی ڕێی کاکێشاندا دەجولێ، کە خێرایی یەکەی نزیکەی (٦٠٠کم /چرکە) دا،کە هەموونەستێرەکانیتری ڕێی کاکێشانیش لەگەڵیان دەجولێن .

## جێگیربوونی خۆر:

زانایان گرنگیان دا بە دیراسەکردنی جوولەی خۆر بە مەبەستی ناردنی‌کەشتیە ئاسمانی‌یەکان بۆدەرەوەی کۆمەڵەی خۆر، بۆ ئەمەش (ڤۆیاگرای یەك و ڤۆیاگرای دوو) یان نارد..

لەکاتی دیراسەی ئەو ڕێڕەوەی کە پێویستە کەشتیە فەزایی یەکان بیگرنەبەر تا لەکۆمەڵەی خۆر دەرچن، دەرکەوت کارەکە هەروا ئاسان نیە، چونکە خۆر جوولەیەکی ئاڵۆزی هەیە کە تائێستا وردەکاری‌یەکانی نازانرێت، هەرچەند خۆر بە ئاڕاستەیەکی دیاری کراودەڕوا تا تیاجێگیر بێت، ئنجا جوولەکەی دەست پێدەکاتەوە، ئەمەش وای لە زانایان کرد کە باشترین ناو بۆ ڕێڕەو و ئاراستەی جوولەی خۆر دابنرێت (مستقر الشمس)ە ؟!

کەواتە گەلەئەستێرەی ڕێی کاکێشان بە خێرایی‌یەکی زۆر دەڕوا و هەموو ئەستێرەکانیش بە خێرایی جیاواز بەپێی دووریان لەناوەندی‌گەلەئەستێرەکەوە دەجولێن و دەخولێنەوە و زانایانیش ئێستا دەیانەوێت بەوردی (مستقر الشمس) بپێون ودیاری بکەن...

## قورئان و باسی مستقر الشمس:

١- هەزاروچوار سەد ساڵ لەمەوبەر قورئان باسی (مستقر الشمس) دەکات:﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ﴾یس: ٣٨ لەکاتێکدا کە هیچ کەس ئەو ڕاستیەی نەزانیوە و دەرکی پێنەکردووە، ئەوەتا پاش چواردە سەدە زانایان هەمان ڕاستی قورئان باسدەکەن و بە ئینگلیزی دەڵێن (solarapex).. . ئەگەر لە زانایانی وەکالەتی فەزای ئەمریکی (ناسا) بپرسین پێناسەی (مستقر الشمس) (solarapex)مان بۆبکەن دەڵێن: (مستقر الشمس) ئەو ئاراستەیەیە کەخۆر و کۆمەڵەکەی پیّ ی دەجولێن :

The solarapex is th the direct ion toward which the sun and the solar system are moving.

٢- قورئان وشەی (الشمس تسير، تتحرك، تمشى) بە کارناهێنێ بەڵکو(تجري) بەکاردێنێ، کە ئەوە دەگەیەنێ خۆر خێرایی‌یەکەی زۆرەوجوولەکەشی(لەرینەوەی)تیایە و ڕێك یان بازنەیی نیە، هەروەك جوولەی کەسێك کە ڕابکات و خۆی بدات بەلای ڕاست و چەپ دا.

٣- قورئان دەفەرموێت ﴿ لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴾ يس: ٤٠ واتە: خۆر لە خولگەی خۆیدا دەخولێتەوە و مانگیش لە خولگەی خۆیدا، بۆیە بەیەك ناگەن، شەویش بە دوای ڕۆژدا دێت و ڕۆژیش بەدوای شەودا، بەپێی ئەو یاسا و نیزامەی کە خوا بۆی داناون و هیچیان پێش ئەوی تریان ناکەون، هەر ئەستێرەیەو خولگەی خۆی هەیە و بەریەك ناکەون، ئاسمانێکی بەرفراوانە بەڕاسەرمانەوە و هەرچەند لێ ی وردبیتەوە زیاتر سەرسام دەبیت، لەم ڕوانگەیەوە بیریش لە دەسەڵاتیخوا بکەرەوە،ئایاعەقل ڕێ بەخۆیدەدات کە ئەم بوونەوەرە ڕێکوپێك و پڕ وردەکاری یە لەخۆیەوە دروست بوویێت ؟!

٤- زانایان دەڵێن ڕۆیشتن و جوولەی خۆر هەتا هەتایی نیە و کۆتایی دێت، ئەمەش قورئان وەك موعجیزەیەك پێش هەزارو چوار سەدساڵ ئاماژەی بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾لقمان:٢٩، بەڕاستی ئەگەر وەحیئەبێت و خوای خاوەن دەسەڵات و زانیاری بێ سنوور پێغەمبەر ﷺ فێر نەکات، ئەو زاتە چواردە سەدە لەمەوبەر چی داوە لە باسی جوولەی خۆر و ئەجەلی خۆر و مانگ و بوونەوەر، ئنجا زانستیش پاش ئەو هەموماوەیە بێت وسەری ڕێز لە ئاستی ڕاستیەکانی قورئاندا دانەوێنێت ؟!![1]

## سێیەم: کۆنگرەی جیهانی هەشتەمی ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەت:

وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی کوەیت بەسەر پەرشتی ئەمیری کوەیت لەگەڵ دەزگای ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەت، کۆنگرەی جیهانی هەشتەمی ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەتیان بەست لە ٢٦-٢٩/١١/٢٠٠٦، ژمارەیەکی زۆر لە زاناو بیریاری گەورە ئامادەی بوون..

کۆنگرەکە چوار تەوەرە بوو، تەوەرەکانیش(پزیشکی و زانستی ژیان وزانستی زەوی و دەریاکان، فەلەك وزانستی فەزا و، ئیعجازی زانستی لە زانستی مرۆڤایەتیدا).

لەکۆنگرەکەداچواردە دۆزینەوەیزانستیڕاگەیەنرا کە زانایانی موسڵمان دۆزیویانەتەوە پاش دەیان ساڵ لە لێکۆلینەوە، کەیەکێ لەودۆزینەوانە چارەسەری نەخۆشی ئایدزە، کە هەموو

---

١- (www.55a.net)

دنیا دەسەوسانن بەرامبەری، دکتۆر عبدالمجید زندانی ڕایگەیاند کە لیژنەی پسپۆڕی ئیعجازی عیلمیقورئان وسوننەت پاش زیاتر لە دەساڵ توانیان کە لە گژو گیا چارەسەری نەخۆشی نایدز بدۆزنەوە کە لە ماوەی چەند مانگێکداچارەسەردەکات و لەسەر چەندەها نەخۆش تاقیکراوەتەوەو هەر کۆمپانیایەکی دەرمان دەیەوێت ئەتوانێت سەردانی یەمەن بکات و لەنزیکەوە لەدەرمانەکە شارەزابێت وگرێبەست ئیمزا بکات بۆ بەرهەمهێنانی .

دۆزینەوەکانی تریش پەیوەندیان بەچارەسەری نەخۆشی (ڤیروساتی جگەر)و شێرپەنجەوە هەبوو کەنەخۆشی سەردەمن .

شایانی باسە کە دەزگای ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەت چەند لقێکی خۆی کردۆتەوە لەولاتە ئیسلامییەکاندا و توانیویەتی (مەوسوعەی ئیعجاز) وەربگێڕدرێت بۆهەژدەزمان و وا بڕیارە کەناڵێکی فەزایی تایبەت بە ئیعجاز دابمەزرینن.[1]

لەکۆتایی کۆنگرەکەدا زانای ئەوروپی (میلان) موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاندو وتی: من تا (٣٥) ساڵی بڕوادار نەبووم بەڵام دواتر لەڕێی دیراسات و لێکۆڵنەوەی ناو تاقیگەوە بڕوام هێنا بەخوا.. ئنجا کەوتمە دیراسەی تەورات و ئینجیل و بۆم دەرکەوت کە دەستکاری کراوە، پاشان دیراسەی قورئانم کرد زانیم کە موعجیزەیەو محمدیش لە خواوە هێناویەتی، لەبەرئەوە من شایەتی دەدەم (اشهد ان لااله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله)..

## چوارەم: زانایانن لە خوا دەترسن:

زانایان بە هۆی وردبونەوەی بەردەوام و لێکۆڵینەوەوە، زیاتر خوا دەناسن و زیاتر لێی دەترسن، قورئان دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ فاطر: ٢٨

١- روجربیکون کە لەساڵی (١٢٢٠) لە دایك بووە و لە ساڵی (١٢٩٢) کۆچی کردووەو زانا بووە لە بواری پزیشکیداو دامەزرێنەری (الطريقة التجريبية في الاستدلال) ە، ئیمان وبڕوای پتەوی هەبوو بە خوا و دەڵێت: هەرگیز ناگونجێت زانست دژی دین بێت و، دەکرێت زانست وەك هۆکارێك بەکاربهێنرێت بۆقەناعەت پێکردنی ئەوانەی بڕوایان دانەمەزراوە.

٢- فرانسیز بیکون کە لە (١٥٦١) دا لەدایك بووە و لەساڵی (١٦٢٦) کۆچی دوایی کردووە و یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ڕێبازی زانستی، زۆر بڕوای بە خوا هەبووەو دەڵێت

---

١- (گۆڤاری المجتمع) ٢٠٠٦/١٢/٢..

(بەڕاستی زانستی فەلسەفە دوای وتەی خوا چارەسەرێکی تەواوە بۆ شوێن نەکەوتنی خەرافەت و پاڵپشتێکی باشیشە بۆ بڕوا بوون بە خوا) .

٣- گالیلۆ گالیلی لە ساڵی (١٥٦٤) لەدایك بووە و لە ساڵی (١٦٤٢) دا کۆچی‌دوایی کردوە و یەکەم کەسە دووربینی بەکار هێناوە بۆ سەیرکردنی ئاسمان و سەلماندی‌کە زەوی خڕەو دۆزیەوە کە سەر ڕووی مانگ چاڵ و گردۆلکەی تیایە..

ناوبراو بڕوایەکی پتەوی هەبوو بە خواو دەڵێت (بەڕاستی ئەندامەکانی هەست کردن و توانای‌قسەکردن و زیرەکی کە دراوە بە مرۆڤ لەلایەن خواوە بۆ ئەوەیە کە بەباشترین شێوە بەکاریان بهێنیێ) و جەختیش دەکاتە سەر ئەوەی کە سروشت خوای گەورە نەخشاندویەتی و دەڵێت: (بەڕاستی سروشت پەڕاوێکە و پەروەردگار نوسیویەتی)... هەروەها دەڵێت: (ڕاستیەکانی زانست و دین هەرگیز دژی یەك نین)...

٤- کابلر کەلەساڵی (١٥٧١) لەدایك بووەو لە ساڵی(١٦٣٠) کۆچی دوایی کردووە، دامەزرێنەری زانستی فەلەکی نویێ یە، بڕوای پتەوی بە خوا هەبووە کە بەدیهێنەری ئەم بونەوەرەیە و دەڵێت: (من نیەتم بوو ببمە زانای ئاینی، هەر چەند ئێستا من خوا دەناسم لەڕێی هەوڵەکانمەوە، دەمەوێ سوپاس و ستایشی بکەم و باسی گەورەیی بکەم لە زانستی فەلەك دا، ئاسمانەکان ئاماژە بە گەورەیی ودەسەڵاتی‌خوا دەکەن. چەند گەورەیت ئەی پەروەردگار، چەند جوان و بەرزە حیکمەتت، هیچ سوپاس وستایشێك نیە هەقی تۆ بدات، ئاسمانەکان و خۆرەکان و مانگەکان و ئەستێرەکان هەمووی ستایشی تۆ دەکەن، منیش تا زیندووبم ڕۆحم ستایشت دەکات، عەقڵی تەواو ستایشت دەکات هەرچەند ئێمە تائێستا زۆر کەم دەزانین و زۆریش هەیە نایزانین، خوایە سوپاس و ستایش کردنمان بۆت شەرەف و ڕێز و گەورەییە بۆمان).

(ئێمە لەو ڕۆژەوەی بوینەتە زانای فەلەك، بوین بە خواناسێکی گەورە، پاش ئەوەی سەیری پەڕاوی سروشتمان کرد، وامان لێ هات کە بیر لە خۆمان نەکەینەوە بەڵکو لەسەر هەموو شتێکەوە و زیاتر لە هەموو شتێك بیر لە گەورەیی ودەسەڵاتی خوا بکەینەوە)..

بەڕاستی ئەو قسانە لەلای ئێمە فەرمووده ئاماژەی پیێ کردووە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (اللهم إنا لانحصي ثناءً عليك، أنت كما أثنيت على نفسك).

٥- باسكال كە لەساڵی (١٦٢٣) لە دایك بووەو لە ساڵی (١٦٦٢) دا کۆچی کردووە، یەکێکە لەزانا گەورەکانی ئەندازیاری لە زەمانی یۆنانیەکانەوە، لەسەرەتای لاویێتیەوە دۆزینەوەی هەبوو، سەلماندی کە پاڵەپەستۆی هەوا بەپێی بەرزونزمی جیاوازە، باسکاڵ بڕوای پتەوی بە خوا بووە و دەڵێت: (بەڕاستی خوا بەدیهێنەری هەموو یاساکانی بیرکاری یە).

٦- جون رای لە ساڵی (١٦٢٧) لە دایك بووە و لە ساڵی (١٧٠٥) دا کۆچی کردووە، زانایەکی ڕووەك ناسی بەریتانی بەناو بانگە و بڕوای وابوو کە هەموو شتێك لە بونەوەردا بەدیهێنراوە، پەڕاوێکی نووسی بەناوی (حكمة الله في الخلق).. لەم پەڕاوەدا باسیهەزاران ڕووەك ومێروو باڵندەو ماسی دەکات و دەڵێت: (بەڕاستی خوا بە دیهێنەری بوونەوەرە لەسەرەتاوە و، بە فەزلی خوایە کە ئەم بونەوەرە پارێزراوە تا ئەمڕۆ)..

ناویراو هەمیشە جەختی دەکردە سەر ئەوەی کە ئیمان و زانست لە زۆر خاڵدا بەیەك دەگەن .

٧- بۆیل کە لەساڵی (١٦٢٧) لە دایك بووە و لە ساڵی (١٦٩١) کۆچی کردووەو بە باوکی کیمیای نوێ دەناسرێت، یاسای بۆیلی بۆ گازەکان دۆزیەوە، چەندەها دۆزینەوەی تری گرنگیشی هەیە وە ك سەلاجەی سەرەتایی و...هتد..

ناویراو باوەڕی بەوە هەبوو کە نەخشەسازیەکی گەورە لە سروشتدا هەیەو ئەوەش کە بەدیهێناوە لەوپەڕی هێزدایە.. بۆیل لە وتارەکانیدا جەختی دەکردە سەر ئەوەی کە (زانست و ئیمان ئەبێت شان بەشانی یەك بوەستن، پێویستە لەسەرمان کەیادی خوای تاك و تەنها بکەین کە ژیانی هێناوەتە بوون، ئەم بڕوایەش سوود دەگەیەنێت بە مرۆڤایەتی)..

٨- ئەنتۆنی فۆن لیونهوك لە ساڵی (١٦٣٢) لە دایك بووە و ساڵی (١٧٢٣) کۆچیکردووە، ناویراو بەکتریای دۆزیەوە و توانی میکرۆسکۆب دروست بکات و بەکتریا ببینێت، ئامانجی ئەوە بوو بۆ خەڵکی بسەلمێنێت ژیان لە خۆیەوە هەروا بە گۆترە دروست نەبووە.

٩- ئیسحاق نیوتن کەلەساڵی (١٦٤٢) لە دایك بوو لە ساڵی (١٧٢٧) وەفاتی کردووە، ناویراو زانا بوو لە بواری ماتماتیك و فیزیادا و یەکێکە لە زانا هەرە گەورەکانی دونیا، توانی هێزی کێش کردنی زەوی بدۆزێتەوە کە بیردۆزەکانی زانستی زۆر بەرەو پێش برد، نیوتن ژیانی تەرخان کردبوو بۆ تێگەیشتن لە دەسەڵاتی بێ پایانیخوا و دەڵێت (ئەو خوایەی کە زانایە بە

هەمووشتێك وخاوەنی توانای بێسنورە نەمرو هەتاهەتاییەو هەربووە وهەر نەبێت، دەتوانیت بیناسیت لەڕێی جوانکاری و نەخشەسازی جوانیەوە لە بوونەوەرو دروستکراوەکانیدا، ئەو خاوەن دەسەلات و(عزیز)ە وبەندەکانی ئەو پەڕی خۆشەویستی خۆشیان دەوێت)..

١٠- سێر ولیام هیرشیل لەدایکبووی سالّی (١٧٣٨)ەو لە سالّی (١٨٢٢) دا کۆچی کردوە، ناوبراو یەکێکە لە زاناگەورەکانی فەلەك لەسەدەی هەژدەدا و توانی دووربینی تایبەت دروست بکات و دیراسەی گەلەئەستێرەکان بکات و ئیمانی پتەوی بە خوا هەبوو، دەلّێت: (ئەو فەلەکی یەی بڕوای بە خوا نەبێت هەق وایە شێت بێت) هەروەها دەلّێت: (لام سەیرە زانایەك دیراسەی بوونەوەر بکات و ئەو یاسا ڕێکوپێکە ببینێت لە بوونەوەردا وئینجا بڕوای بە خوا نەبێت)

١١- گول گێمس بریسکوت لە سالّی (١٨١٨) لەدایك بووە ولە (١٨٨٩) کۆچیکردووە و، دۆزەرەوەی یاسای یەکەمی دینامیکی حراری یە و توانی نرخی نەگۆڕی (مكافیء الحراري)یش بدۆزێتەوە کە ئەمەش بوە هۆی دۆزینەوەی یاسای پاراستنی وزە..

گول بڕوای وابوو کە مرۆڤ دەتوانێت باشتر لە خوا نزیك ببێتەوە کاتێك باش شارەزا دەبێت لە یاساکانی سروشت، ناوبراو یەکێك بوو لەو (٧١٧) زانایەی کە بەیاننامەیەکیان دەرکرد دژی بیردۆزیداروین لە سالّی (١٨٦٤) دا..

١٢- مەندڵ لە سالّی (١٨٢٢) لە دایك بووە و لە سالّی (١٨٨٤) دا کۆچی کردووە، ناوبراو یاسای بۆماوەزانی دۆزیەوە، کە بەرپەچ دانەوەی بیردۆزی پەرەسەندن بوو. ئەم زانا گەورەیە بڕوای بە خوای گەورەی بالّادەستی بەدیهێنەری بوونەوەر هەبوو، دەیوت کە ڕێکەوتی کوێرانە ناتوانێ ئەم بوونەوەرە پڕحیکمەتە بەدیبهێنێ.

١٣- باستۆر لە سالّی (١٨٢٢) لە دایك بووەو لە سالّی (١٨٩٥) کۆچیکردووەو ناوبراو یەکێکە لەو زانایانەی کەزانست وپزیشکی بەرەو پێش بردووە، بەوەی میکرۆبی دۆزیەوە کە دەبێتە مایەی نەخۆشی. ئەم زانایە زۆر دژی بیردۆزی پەرەسەندن بوو، باستۆر بڕوایەکی پتەوی بە خوا هەبوو، دەیوت کە زانست وئیمان بەیەکەوە دەگونجێن و دژایەتی نیە لە نێوانیاندا. لە وتەیەکی تریشدا دەلّێت (زانستی کەم لەخوات دووردەخاتەوە و زانستی زۆریش خوات پێدەناسێنێت و دەتبات بەرەو لای خوا).

١٤- كلفن لەساڵی (١٨٢٤) لەدایك بووە و لە ساڵی (١٩٠٧) کۆچی کردووە، ناوبراو زانایەکی گەورەی بواری فیزیایەو بڕوای پتەوی هەبووە بە خواو، ڕێگایەکی سەرکەوتووی دۆزیەوە بۆ توانەوەی هایدرۆجین و هیلیۆم و (پلەی گەرمی پەتی) دۆزیەوە کە پلەی گەرمی (کالفن)ە. ناوبراو دەڵێت (مەترسن لەبیرکردنەوەی ئازاد، ئەگەر بە بیرکردنەوەیەکی باش بیربکەیتەوە، تۆ بەو بیرکردنەوەیەت بڕوات زیاد دەکەی بە خوا، زانستی یەقینیش جەخت دەکاتە سەر بوونی هێزو توانای بەدیهێنەر).

١٥- پومسن لە ساڵی (١٨٥٦) لە دایك بووە و لەساڵی (١٩٤٠) کۆچی کردووە، ناوبراو لەساڵی (١٨٩٧)دا ئەلەکترۆنی دۆزیەوە ومامۆستای فیزیا بوو لە زانکۆی کامبردج و کە سێکی خواناس بووە و دەڵێت: لە ڕێی ووردبوونەوە لە ڕاستیەکان و ئەنجامە زانستیەکان دەگەیتە تێگەیشتن لە بوونی خوا).

١٦- ئەنیشتاین لەساڵی (١٨٧٩) لەدایك بووە و لەساڵی (١٩٥٥) کۆچی کردووە، ناوبراو یەکێکە لەزانا گەورەکانی سەدەی بیستەم و ئیمانی پتەوی بەخوا هەبووەو دەڵێت: (من ناتوانم تەسەوری ئەوە بکەم زانایەك زانابێت بەڕاستی بڕوای پتەوی نەبێت بە خوا، زانست بەبێ دین وەکو شەل وایە).

ئەنیشتاین قەناعەتی تەواوی هەبوو کە بوونەوەر بەم ئەخشەسازیە جوانەیەوە بە ڕێکەوت پەیدانەبووەو لەلایەن خوایەکی بەحیکمەتی بالادەستەوە بەدیهێنراوە، هەروەها دەڵێت: (ڕێگەی زانست ئەتگەینێتە هەستێکی ئاینی تایبەت).

١٧- گورگیس لیمانیز لەساڵی (١٨٩٤) لەدایك بووە و لە ساڵی (١٩٦٦) کۆچی کردووە، ناوبراو خاوەنی بیردۆزی تەقینەوە گەورەکەیە ولەبارەی دروستبوونی گەردوونەوە دەیوت: بوونەوەر سەرەتایەکی تایبەتی بووە و کۆتاییەکی تایبەتیشی دەبێت و، تێگەیشتن لەم ڕاستیەش ڕۆڵێکی گەورەی دەبێت بۆ یارمەتی دانی خەڵکی تا ئیمان بێنن بە خوا، زانست و دین دەتگەیەننە هەمان ڕاستی.

١٨- ورنهر فون براون لەساڵی (١٩١٢) لەدایك بووە و لەساڵی (١٩٧٧) کۆچی کردووە، یەکێکە لە زانا گەورەکانی جیهان و سەرۆکی ئەندازیارانی ڕۆکێت بوو لە ئەڵمانیا توانی پەرە بدات بە ڕۆکێتی (ڤی دوو) لە کاتی شەڕی دووەمی جیهانی دا، دکتۆر براون بەڕێوەبەری پێشووی وەکالەتی ناسا بووە و پیاوێکی دیندار بوو، دەیوت: (من بەلامەوە گرانەو

تێناگەم چۆن زانایەك دان نانێ بەوەدا كە هێزێكی باڵادەست هەیە لە دوای دروست بوونی بوونەوەرەوە).

لەساڵی (١٩٧٤) لە وتارێكدا دەڵێت: هیچ كەسێك ناتوانێت كە ئاگای لەیاساكان و نیزامی بوونەوەر بێت ئەوە نەسەلمێنێ كە نەخشەسازی و مەبەست هەیە لە پشت بەدیهێنانیئەم بوونەوەرەوە .

١٩- زانای گەورە (فرانسیس كولنز) سەرۆكی پەیمانگای (الوراثة) لەویلایەتی مریلاند دەڵێ: بوونی خوا هەقیقەتێكی زانستی‌یە و تەنها واقیعێكی ویجدانی نیە و پەڕاوێكی نووسی لەم بارەیەوە بەناوی (لغة الله)..

لەم پەڕاوەدا جەخت دەكاتە سەر ئەوەی كە خوایەكی باڵا دەست هەیە و، پزیشكەكان ڕووبەڕووی زۆر حاڵات دەبنەوە كە هیوایان نامێنێ بە ژیانی نەخۆشێك، بە زانستی پزیشكی دەبێت بمرێت، كەچی ئەو نەخۆشە دەژی وچاك دەبێتەوە. هەروەهادەڵێت (هەندێ كەس دڵنیایە كە خوا خۆشی دەوێت و هەر خواشە كە ڕزگاری كردوە لە بەڵاو موسیبەت و هەروەها شیفای بۆ ناردووە)..

بەڕاستی هەڵەیەكی گەورەیە كە وابزانرێت ئەو بڕوایە بە خوا پەیوەندی بە زانستەوە نیە، چونكە زانست و دین جیاوازی نیە لە نێوانیاندا و لێك جیاناكرێنەوە، بەڕاستی خوای گەورە دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێكدا و ئەو توانای هەیە بەسەر چاكردنەوەو ناردنی دەرماندا، بۆیە زانایان ناچار دەبن كەبڵێن ئەو حاڵەتی چاكبونەوەیە موعجیزەیە، كەئەمەش مانای وایە خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی شیفای بۆ ئەو كەسە ناردووەو، بەڕاستی خوا بیەوێ (ممكن)دەكات بە (مستحیل) و(مستحیل)یش دەكات بە (ممكن)...[1] ئەوانەی كە باسمان كرد بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە بەڕاستی قورئان پێشبینی‌یەكی گەورەی كردووەو ڕاستیەكی مەزنی ئاشكرا كرووە، كاتێك دەفەرموێت:﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ فاطر: ٢٨

---

١-(ڕۆژنامەی الشرق الأوسط)ی لەندەنی بلاوی كردۆتەوە.. (WWW.٢٠AT.COM)

## پێنجەم: فاحیشەو نەخۆشی تاعون:

تاعون گەلێك ناوی لێنراوە، کە هەموویان ترسێنەرن، وەك مردنی ڕەش، تاعونی ڕەش، ئەم مەسەلەیە چ ئیعجازێکی فەرموودەی تیایە؟

لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی لەزۆر شوێنی دونیادا، لە ساڵی (١٣٤٧) زاینی، واتا (٦٦٠) ساڵێك لەمەو بەر نەخۆشەی تاعون بڵاو بووە و، لە خوارووی ئاسیاو چین و نزیکەی (٥٧) ملیۆن کەسی‌کوشت وئنجاگەیشتەئەوروپاو دوو لەسەرسێ‌ی دانیشتوانی ئەوروپاشی قڕکرد،لەوەوە ناویان نا ڕەشە مردن، کە ئەمەش زۆرترین ڕێژەی مردنە لە مێژوودا.

زانایانی ڕۆژئاوا خۆیان دەڵێن (نەخۆشی تاعون کە زیاتر لە (٢٠) ملیۆن کەسی کوشت لە چەند هەفتەیەکدا لە ئەوروپا، سزای خوا بوو بۆیان لە ئەنجامی بڵاو بوونەوەی فەساد و بەدڕەوشتی).

زانایانی سەردەم جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە ئەم نەخۆشیە لە پڕ دەردەکەوێ و لەپڕیش دیار نامێنێ، ئەوەتا تا سەدەی نۆزدە تاعون بەردەوام لێرەو لەوێ دەردەکەوت و بە ملیۆنەهای لەناو دەبرد دواتر ئەو دیار نەماو نەخۆشی تر دەرکەوت کە نەبوون وەك ئایدز ئەمەش کت ومت ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێت: (لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها الا فشا فيهم الطاعون والاوجاع التي لم تكن مضت في اسلافهم الذين مضوا)[1]، واتە فەساد و فاحیشەو بەدڕەوشتی لەلای هەر گەلێك بە ئاشکرا سەر هەڵبدات و بڵاوببێتەوە نەخۆشی تاعون و نەخۆشی تر کە لەوەو پێش لە باوباپیرانیاندا نەبووە سەرهەڵدەدات.

پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خوای گەورە سروشی بۆ نەناردبێ چۆن دەتوانێت ئاوا بەوردی قسەی زاناکانی ئەم سەردەمە بکات، لەکاتێکدا زانایانی سەردەم لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو دیراسەی زۆرەوە و لە ئەنجامی ڕوودان و سەرهەڵدانی نەخۆشی یەکانەوە ئەو دیاردەیەیان باسکردووە. بەڕاستی ئەم فەرموودەیە بە تەنها بەسە کە بەڵگە بێت لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەر ﷺ، ئەو پێغەمبەرەی کە خوا خۆی شایەتی بۆ ئەدات و هەر ئەوەشی بەسەو ئەمانەی تر هەر بۆ دڵنیایی و بیانوو بڕینی خەڵکە، تا ببێ بە حوجە بەسەریانەوە ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ

---

١- ابن ماجه.

بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ﴾الفتح: ٢٨ - ٢٩ ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ الأحزاب: ٤٠ .[1]

## شەشەم: هاوسەرگیری :

قورئانی پیرۆز لەبارەی هاوسەرگیرییەوە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾الروم: ٢١ ، واتە: یەکێك لەنیشانەو بەڵگەکانی تری پەروەردگار ئەوەیە کە هەر لەخۆتان هاوسەری بۆ دروست کردون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایدا ولەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بە ڕاستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانەو بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوە. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت (من أحب فطرتي فليستن بسنتي، و ان من سنتي النكاح)[2] . واتە :کێ حەزی بە فیترەتی منە کە ئەویش ئیسلامەتی و فیترەتی پاکە، با لە سەر ڕەویەو سوننەتی من بڕوات، کە بەڕاستی هاوسەرگیری لە سوننەتی منە. هاوسەرگیری کە بەهۆی مارەکردنەوە ئەبێتە شەرعی، قورئان بە پەیمان و بەڵێنێکی گەورە و گرنگ ناوی دەبات ﴿وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴾ النساء: ٢١

زانایانی بواری کۆمەڵایەتی پاش دیراسە و لێکۆڵینەوە و ئاماری زۆری چەند ساڵە دان ئەنێن بەو ڕاستیەی کە قورئان پێش هەزارو چوار سەد ساڵ باسی کردووە، تەنانەت بیریاری کۆمەڵایەتی فەڕەنسی (دورکایم) دەڵێت: (ئەو مرۆڤانەی کە بەتەنها دەژین و پەیوەندی کۆمەڵایەتیان کەمە زیاتر دووچاری خۆکوشتن دەبن، ئەوانەی کە هاوسەریان نیە سێ ئەوەندەی ئەوانەی کە هاوسەرو منداڵیان هەیە زیاتر خۆیان دەکوژن، چونکە هاوسەرگیری زیاتر هەست بە بەرپرسیارێتی وبەرگەگرتن دروست دەکات لەلای مرۆڤ).[3]

---

١- موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة. (ڕۆژنامەی الشرق الأوسط)ی لەندەنی بڵاوی کردۆتەوە.. (WWW.٢٠AT.COM)

٢- صحيح جامع الصغير.

٣-(گۆڤاری المجتمع ١٤٢٧/١١/٢٩)..

هەروەها لە دیراسەیەکدا لە زانکۆی (هارفارد) و (میریلاند) لە ئەمەریکا کە لەسەر (٥٠٠) کەس کرا، دەرکەوت ئەوانەی کە دەچنە (قەفەسی ئاڵتونی و کەژاوەی هاوسەرگیری)یەوە ناچنە (قەفەسی ئیتهام) و مەحکەمەوە .

بەڕاستی هاوسەرگیری فیترەتە، مایەی هاوسەنگی و شیرازە نەپچڕانی کۆمەڵە، چەند بەرز و بەڕێز و پڕ حیکمەتە ئەم ئیسلامە کە ئاوا بە چاوی ڕێزەوە سەیری خێزان وهاوسەرگیری دەکات، تەنانەت یاری کردن لەگەڵ ماڵ ومناڵدا و پاروویەك کەدەیکەی بە دەمی هاوسەرەکەتەوە بە عیبادەت حیسابە .

ئەگەر ئەمە لەخواوە نەبێت چۆن ئاوا کۆمەڵگە ڕادەگرێت، لە کاتێکدا کە عەقڵی مرۆڤ و سەتاسەری ئەورووپاو زۆر جێی تر لە ئەنجامی گوێ نەدان بە خێزان و هاوسەرگیری بە جۆرێك گیریان خواردووە مەگەر تەنها بە گەڕانەوە بۆ فیترەت و ئیسلام ڕزگاریان ببێت..

## حەوتەم: خۆتان مەکوژن:

ئامارەکان دەڵێن کەلە ساڵێکدا نزیکەی (٨٧٣) هەزار کەس خۆی دەکوژێت، واتە هەر (٤٠) کەس و یەکێك بەخۆکوشتن ئەم دنیایە بەجێ دەهێڵێ..

لە ئەمریکادا ئەم دیاردەیە بەم جۆرە بوو لە ساڵی (٢٠٠٢) دا:

ژمارەی ئەوانەی کە خۆیان کوشتووە لەو ساڵەدا (٣١) هەزار کەس بوون کە (٢٥) هەزار یان پیاوو (٦) هەزاریان ئافرەت بووە. زیاتر لە (٥) هەزاریان کەسانی تەمەن (٦٥) ساڵ و بەرەو ژوور بوون .

نزیکەی (٤) هەزار کەسیان لاوی تەمەن (١٦-٢٤) ساڵ بوو .

بەپێی ئەو ئامارە هەر چارەکە سەعاتێك و کەسێك خۆی کوشتووە، جا ئەگەر بزانین کە (١٠٠) هەزار کەس بە ڕووداوو کارەساتیجیاجیا لەناو دەچن لە ئەمریکادا ئەوا ڕێژەی ئەوانەی خۆیان دەکوژن زۆرە لەچاو ئەوانەدا کەبەو جۆرەی تردەمرن.

ئینجا لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتن و داوو دەرمانەی هاتۆتە کایەوە بۆ چارەسەر کەچی لەم پەنجا ساڵەی ڕابردوودا ڕێژەی خۆکوشتن ٦٠٪ زیادی کردووە .

زانایانی ئەم بوراە دەڵێن:

ئەوانەی خۆیان دەکوژن خەمۆکی زاڵ دەبێت بەسەریانا و تەواو بێ هیوا دەبن لە هەموو شتێك، بە پێی ئامارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارەی خەمۆك ودەروون نەخۆشەکان دەگاتە (٤٥٠) ملیۆن کەس لە جیهاندا.

ئەوانەی کە خوویان گرتووە بە مەی و ماددە بێهۆشکەرەکانەوە زیاتر بەرەو خۆکوشتن دەچن، هەروەها نەزانین و بێئاگایی لە گوناهو تاوانی خۆکوشتن هۆکارێکی ترە کە کەسێك ڕوودەکاتە ئەو مەسەلەیە .

لە کیس چوون و زیانی گەورە کاردانەوەی خۆکوشتنی لای هەندێك لێدەکەوێتەوە.

هۆکاری نەفسی وەك کەنارگیری و شەڕەنگێزی لای هەندێك دەبنە هۆی چوون بەرەو خۆکوشتن .

جا زانایان پاش دیراسەکردنی باری هەزاران کەس کە خۆیان کوشتووە یان ویستویانە خۆیان بکوژن گەیشتوونەتە ئەوەی کە بیروباوەڕی ئاینی و هەستکردن بە حەرامی ئەو کردەوەیە و هیوا پێدان و جۆرێك لەترساندن وچاکردنی باری دەروونی و نەهێشتنی کەنارگیری هۆکاری باشن بۆ کەمکردنەوەی ئەو دیاردەیە کە ئەمەش چارەسەری ئیسلامە لەچواردە سەدە لەمەو بەرەوە ئەوەتا قورئان دەفەرموێت:

*﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ﴾ النساء: ٢٩: خۆتان مەکوژن بەمە کردەوەکە حەرام دەکات .

*﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ جۆرێك هیوای پێدەبەخشێ کە خوا میهرەبانە بەرامبەر مرۆڤ.. .

*﴿ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾ النساء: ٣٠. بەمەش ئەیترسێنێ، هەر کەس وا بکات دەیخەینە دۆزەخەوە ئەمەش بۆ خوا ئاسانە.

* قورئان ڕێ نادات بە کەنارگیری و هەمیشە هانی چوونە ناو کۆمەڵ و هاوکاری خەڵکی دەدات، ئەمە بێجگە لەوەی کە بڕوا بوون بە قەزاو قەدەر مەسەلەیەکی گرنگە لە ئیسلامدا و وا دەکات کە مرۆڤ هاوسەنگی خۆی لە دەست نەدات و بتوانێت خۆگر بێت، نە لە خۆشیدا لەتایم دەرچێت و نە لە ناخۆشیدا وره بەربدات، هەروەك قورئان بە ئاشکرا

دەفەرمویّت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ۝ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ الحديد: ٢٢ - ٢٣، (واتە: هیچ بەڵاو ڕووداویّك لە زەویدا بۆتان پیّش نەهاتووە كە لە لەوح المحفوظ دا تۆمارمان نەكردبیّت، پیّش ئەوەی ڕووداوەكە پیّش بیّت، ئەو كارەش بۆ خوا زۆر ئاسانە، ئەمەش بۆ ئەوەی خەفەت نەخۆن بۆئەوەی لەكیستان چووە و بەوەش دڵخۆش و غەڕڕا نەبن كە پیّمان بەخشیون، چونكە خوا كەسانی خۆبەگەورە زان و غەڕڕاو فەخركەری خۆشناویّت.. ئەمەش بەڕاستی بەڵگەیە كە ئەم قورئانە بەزانستی خوا دابەزیوە :

﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾الفرقان:٦. ئەم گەورەییەی ئیسلامە وای لە ئەمیر چارلزی بەریتانی كرد كە بڵیّت (زۆر لەو شتانەی كە ئیّستا ئەورووپای تازە شانازی پیّوەدەكات لە ڕیّی ئەندەنوسیاوە (لەشارستانیەتی ئیسلامەوە) پیّمان گەیشتووە، بۆیە ئیسلام بەشیّكە لە ڕابردوومان و بەشیّكە لە ئیّستامان)..

لەبەرئەمانەشە كەهاتن بەرەو ئیسلام بەردەوامە، ئیسلام مایەی دڵئارامی و ئاسوودەیی و بەختیاری یە، كەسانی خاوەن شەهادەو پلەوپایەی بەرزلە هەموو چین وتویّژەكانەوە دیّن بەرەو ئیسلام.. دەنگو باسەكان دەڵیّن:

وەزیری گەیاندی یابانی (جوشیروكومیاما) موسڵمان بوو ناوی خۆی كرد بە (محمد كومیاما) .

دكتۆرە (ئیفادی میرو فتش) مامۆستای زانكۆی سۆربۆن موسڵمان بوو، دەڵیّت: (بەڕاستی ئەورووپا پاش چواردە سەدە خەریكە ئیسلام ئەدۆزیّتەوە و تیّی دەگات)..

سەرۆكی ئەڵمانی (ڕومان هوت سوج) وتی: زۆر گرنگە كە بەچاكی لە ئیسلام تیّ بگەین[1]

---

١-(وتاری: وسيبقى الإسلام هو الدين الأوفى /أ.د/ كارم السيد غنيم) هەمان سەرچاوەی پیّشوو.

## میهرەجانێکی گەورە لە بەریتانیا :

بەئامادەبوونی نزیکەی ٥٠ هەزار کەس لە موسڵمانانی بەریتانیا لە ڕۆژانی (٢٥-٢٦/١١/ ٢٠٠٦) لە بەریتانیا (میهرەجانی ئاشتی و یەکێتی) لە بینای ئەکسڵ ی بەناوبانگ لە ڕۆژ هەڵاتی لەندەن دا گیرا..

(کەناڵی الإسلام) کەتاکە کەناڵی ئیسلامییەو بەبێ پارە لە لەندەنەوە پەخش ئەکرێت بۆ ئەوروپاو سەرووی ئەفریقیاو هەندێ شوێنی تر بە زمانی ئینگلیزی، هەندێك لە کارمەندەکانی هەستان بە بەڕێوەبردنی ئاهەنگەکەو بابەتی ئیمانی و تەرفیهی خۆشیان پێشکەش بە ئامادەبووان کرد، کە دیارە هەموو تینوون بۆ ئەو جۆرە ئاهەنگانە.. .

یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی میهرەجانەکە، هاوکاری حەوت دەزگای خێرخوازی بوو لە بەریتانیا بەتایبەت (مەجلیسی موسڵمانانی بەریتانیا)، لەو میهرەجانەدا دە کەسی بەریتانی موسڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند و بە(الله أکبر) ی ئامادەبووان پێشوازیان لێ کراو دەست خۆشیان لێ کرا .

بانگ بێژێکی حەرەمی مەککەش ئامادە بووبوو، بانگێکی خۆشی بۆ ئامادەبووان داو دواتر منداڵێکی دە ساڵ موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند کە منداڵێکی موسڵمانی لە خۆی بچوکتر لە شاری (مانشستر) قەناعەتی پێکردبوو موسڵمان ببێت ئەو منداڵە شایەتمانی هێنا بەزمانی عەرەبی و ئینگلیزی و لە دوای بانگ بێژەکەی حەرەمی مەکەوە شایەتمانی وتەوە .

لەمیهرەجانەکەدا یوسف ئەستێسیئەمریکی کەکاتی خۆی قەشە بوو، موسڵمان بووبوو، وتارێکی داو، حەماسەتی ئامادە بووانی زۆر بەرز کردەوە بەوەی کە باسی چیرۆکی موسڵمانبوونی خۆی کرد.. .

یوسف ئیسلامی بەریتانی لەسەر شانۆ گۆرانیەکی خۆشی پێشکەش بە ئامادە بوان کردو،ئەم چالاکیانەش ڕاستەوخۆ پەخش دەکرا.. .

ئنجا ژنەڕۆژنامەنوس (ئیفون ڕیدلی) کەبۆ کاری ڕۆژنامەنوسی چووبوە ئەفغانستان و لەلایەن تالیبانەوە دەستگیر کرابوو، دوایی کە ئازادیان کرد (ئیفۆن) دیراسەی ئیسلامی کردو موسڵمان بوو، لەوتارێکدا باسی(سید قطب)ی کرد و باسی کتێبی (معالم في الطريق)ی کردو ئەوەی دایە دواوە کە (سید قطب) هانی ئیرهابی دابێ.. (لەوتارەکەی ناوبراودا پەخشەکە وەستێنرا دیارە لەبەر زۆری کاریگەری لەسەر خەڵکی بەریتانیا و جیهان بەگشتی)..

هەروەها (صهيب ويب)ی ئەمریکی بە جل وبەرگی زانایانی ئەزهەرەوە کە ئەمیش ئەمریکیەو موسڵمان بووەو لە ئەزهەر دەخوێنێت، لەسەر شانۆکە وتی: (هەندێك موسڵمان لێرە دەڵێن دەگەڕێینەوە ولاتی خۆمان، موسڵمانینە ئێرەش ولاتی خۆتانە)..

هەندێك کاربەدەستی غەیرە موسڵمان لە ئەندامانی پەرلەمان و لۆردات و، لەوەزارەتی خەزانەی بەریتانی قسەیان کرد، کەهەوڵ و کۆششی موسڵمانانی بەریتانیایان نرخاند لە بواری کاری فریاگوزاری و ئابوریدا، هەروەها زۆر هانی بانقی ئیسلامی بەریتانیدرا لەسەر کارەکانی و وا پێشبینی کرا کە بەم زوانە لەندەن ببێتە پایتەختی جیهانی مامەڵەکردنی بانقی بە پێی شەریعەتی ئیسلامی.. .

شایەنی باسە لەمیهرەجانەکەدا، پێشانگای بەرگی بالاپۆشی و کتێب و شریت و سیدی پێشکەش کراو شوێنی تایبەت بۆ خواردن و نوێژکردن ئامادە کرابوو.. کە بەڕاستی ئەمەش مژدەیە بە دوارۆژێکی ڕوون و گەشی ئیسلام لە بەریتانیا و سەرتاسەری ئەوروپادا..[1]

## دواوتە:

ئامارەکان لەسەرتاسەری دنیا دا جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە ئاینی ئیسلام زۆر بە خێرایی و زیاتر لە هەموو ئاینەکانی تر بە چوار قورنەی دنیادا بلاودەبێتەوە، کە ئەمەش بەدی دەکرێت لە:

١- زیادبوونی ژمارەی مزگەوت لە ڕۆژئاوا: لەناو دڵی ئەوروپادا مزگەوتەکان پێشبڕکێ دەکەن لەگەڵ کەنیسەکاندا، لە پاریس و لەندەن و مەدرید و ڕۆماو نیویۆرك، ڕۆژی پێنج جار بانگی خوا لەبڵند گۆکانیانەوە ئەدرێت بە گوێی خەڵکدا. تەنها لە ئەمریکادا دوو هەزار مزگەوت و لە نیویۆرکیش سەد مزگەوت هەیە.. .

لە بەریتانیا هەزار مزگەوت و لە فەرەنساش (١٥٥٤) مزگەوت هەیە، ڕۆژنامەی (بیلد) ی ئەڵمانی دەڵێت: لە ساڵی (٢٠٠٤) ەوە ژمارەی مزگەوتەکان لە ئەڵمانیا لە (١٤١) مزگەوتەوە بوو بە (١٥٩) مزگەوت و هەروەها (١٢٨) مزگەوتیش لە قۆناغی دروستکردندان.. شایەنی باسە کە زۆر لەم مزگەوتانە پێشتر کەنیسە بوون و لەلایەن

---

١- (گۆڤاری المجتمع ژ: ١٧٣٠)..

موسڵمانانەوە کڕدراون و کراون بە مزگەوت، چونکە هەروەك دیراسەیەکی (بنك دربیسون) دەڵێت: ژمارەی کەنیسەکان ڕوو لەکەم بوونەوەن و لە (٣٥٠) کەنیسە لە (ئەبرشیە ئەیسن) (٦٩) دانەیان داخراون و کەس ڕوویان تێ ناکات و ئێستا بۆ شتی تر ئەو بینایانە بە کار دەهێنرێت.

٢- ڕۆژنامەو گۆڤارە گەورەکانی ڕۆژئاوا بەردەوام ئاگاداری دەدەن کە ئیسلام بە خێرایی بڵاودەبێتەوە فریایی خۆتان بکەون.. گۆڤاری تایم ی ئەمریکی دەڵێت (سەرلەنوێ خۆری ئیسلام هەڵدێتەوە، بەڵام ئەم جارە هەموو ڕاستیەکانی جوگرافیا هەڵدەگێڕێتەوە، ئیسلام وەکو عادەتی ئەمڕۆ لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵنایەت ئەمجارە لە ڕۆژ ئاواوە هەڵدێت).... هەروەها ڕۆژنامەی صندای تلگرافی بەریتانی لە کۆتای سەدەی بیست دا دەڵێت: (بڵاوبونەوەی ئیسلام لە کۆتایی سەدەی بیست و سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دانیشتوانی جیهان لە غەیری موسڵمانان، دەستیان کردوە بە دیراسەی ئیسلام و چاویان لەسەر ئیسلامەو، گەیشتونەتە ئەو بڕوایەی کە ئیسلام تەنها ئاینە کەشایەنی شوێنکەوتن بێت و، تەنها ئاینە کە بتوانێ کێشەکانی بەشەریەت چارەسەر بکات)...

٣- پاش کارەساتی سێپتەمبەری ئەمریکا، قورئان و پەڕاوە ئیسلامیەکان بە ژمارەی زۆر دەفرۆشرێن بەگشت زمانەکانی جیهان، لەیەك ساڵدا لە ئەڵمانیا بە هەزاران نوسخە قورئانی وەرگێڕدراو لە کتێبخانەکاندا فرۆشران..

٤- موسڵمانبونی زۆری خەڵکی و هاتنی بەردەوام بەرەو ئیسلام بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر بڵاوبونەوەی ئیسلام لەناو هەموو چین و توێژو لەناو هەموو گەلانی جیهاندا.. دوای (١١)ی سێپتەمبەر نزیکەی (٢٤) هەزار کەس لە ماوەیەکی کەمدا لە ئەمریکا موسڵمان بون.. . ڕۆژانەش بەدەیان فەڕەنسی موسڵمان دەبن لەگەڵ ئەوەشدا کە حکومەتی فەڕەنسی دژایەتی خۆداپۆشین و باڵاپۆشی دەکات.. .

بڵاوبونەوەی ئیسلام بە خێرایی لەسەرتاسەری ئەوروپادا، وای کرد کەقەشەیخانەنشین (رولاند فیسلبیرج) ڕۆژی چوارشەممە (٢٠٠٦/١١/١)، لە گۆڕەپانی کەنیسەیەکی شاری (ایرفورت) لەناوەڕاستی ئەڵمانیا نەوتی بکات بە خۆیدا و خۆی بسوتێنێت، هاوسەری ناوبراو دەڵێت (مێردەکەم لەنامەیەکدا کە لەپاش خۆی بەجێیهێشتووە دەڵێت: لەداخی بڵاوبونەوەی

ئیسلام خۆم سوتاندووه تا بەم ڕووداوه سەرنجی گاورەکان و ئەوروپا ڕابکێشم بەرەو مەترسی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەسەرتاسەری جیهاندا)..

شایانی باسە چوار ساڵە قەشەی ناوبراو داوا لە کەنیسەی لۆسەری دەکات کە هەڵوێستێکی جدی بنوێنێ بەرامبەر مەترسی بڵاوبوونەوەی ئیسلام.. .[1]

---

(١) المجتمع ژ ١٧٢٦/ سايتى: الدعوة

## پێشەکی:

لەکاتێکدا کە هەموو موسڵمانێك پێویستە هیممەت بەرزو چالاك بێ و، ئەگەر تاقە نایەتێکیش بزانیت بیگەیەنێ.

لەکاتێکدا کەدوژمنان هەرچی توانای ماددی و مەعنەویانە خستویانەتەکارو بانگخوازان و موسڵمانانیش پێویستە بە هەرچی دەتوانن ڕووبەڕوویان ببنەوە و خەو خەیاڵیان بدەن بە با......

کەچی وەك سرووشتی مرۆڤ کە زوو شتی لەیاد دەچێت وبریق وباقی دنیا سەرقاڵی دەکات، بانگخوازان سارد دەبنەوە و دەمیان دەچێتە کلیلەو دەست لە ئەژنۆ دادەنیشن و هیچیان پێنیە بیلێن و حاڵیان هەروەك ئەو شاعیرەیە کەباس لەخۆی دەکات و لەژێر ناو نیشانی ڕۆژێکی مردوودا دەڵێت:

من ئەمڕۆ هیچم لانیە بینووسم ....هیچ

هیچم پێنیە بیلێم و هیچیش نیە بیکەم ...هیچ

ئەمڕۆ من و بۆریە ئاوێکی شکاو لەیەك ئەچین

ئەو دوای ئەوەی چی تیا بوو لە بەری ڕۆیشت و

منیش دوای ئەوەی هەرچیم هەبوو وتم!

وەك درەختێکی گێژو وێژی تەمەڵ

بەرامبەر خامۆشی گۆڕستانێ ڕاوەستاوم!

یان وەك هەورێکی بێکار

کەبەچوار مشقی لەئاسماندا دانیشتبێ و

تاقەتی نەبێ بباریێ!

چون سەعاتێکی نوستوو بەکۆڵی دیوارێکەوە

کەهەرخەریکی باوێشکدان بێ

یان چون بەلەمێکی شکاو لەبەندەرێکی پشت گوێ خراودا

ئەمڕۆ من چۆڵ و هۆڵم ..چۆڵ و هۆڵ

وەکو کەلاوەی یادەوەریەکی کۆن

لەزەینی پیرەمێردێکدا

بەوێنەی گیتارێکی بێ ژێ

بەوێنەی شیعرێکی بێ خوێنەر

یان وەکو هێلانەیەکی بێ گمە

من ئە مرۆ حەز بەبینینی کەس ناکەم

نەبینینی.خۆم لە ئاوێنەدا و نەبینینی هاورێکانم و نە کتێب...[1]

دیارە ئەم ئەخۆشی‌یە کۆنە، ئەوەتا عیسا سەلامی خوای لێبێت پێش هەزاران ساڵ بەقوتابییەکانی دەفەرموێت: ئەی خوێی زەوی خراپ مەبن، ئەگەر ئێوە خراپ بن کێ شتەکانی تر بپارێزێ لەخراپ بوون..

خوای گەورەش بەم ئوممەتەی خاتەم دەفەرموێت: ﴿ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم ﴾ محمد: ٣٨ . ئێوە لامەدەن، سەرکەشی‌مەکەن، ئەگینا کەسانێکی تر دەهێنمە گۆرێ و وەك ئێوەش نابن.

یان دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ المائدة: ٥٤

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەرکەس لەئێوە لە ئاین و بەرنامەکەی وەرگەڕێت و پاشگەزبێتەوە، ئەوە هەر خۆی زەرەردەکات و خوا لەئایندەدا کەسانێك دەهێنێتە کایەوە کەخۆشی دەوێن و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێت، ملکەچ و فەرمانبەردارو بەسۆزن بۆ بڕواداران و سەربڵندو بە عیزەتن بەسەر بێ باوەڕاندا، جیهاد دەکەن لەڕێی خواداو لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسن، کە ئەمەش فەزڵی خوایە و دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کەبیەوێت و شایستەی بێت، خواش فراوانگیرو زانایە ....

---

١- دیوانی (لەگوڵەوە هەتاسووتوو) شێرکۆ بێکەس: لا٥٤

یان دەفەرمویّت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴾ التوبة: ٣٨ - ٣٩...

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەوە چیتانە کاتێك بانگدەکرێن بۆ جیهاد لە ڕێی خوادا زەمین گیردەبن و دەلکێن بەزەویدا و لەشتان قورسە، ئایا ئێوە دنیا بە گرنگتر دەزانن لە ئاخیرەت، بێگومان ژیانی دونیا بەراورد لە گەڵ ژیانی ئاخیرەتدا زۆرکەم تەمەن و کەم خۆشی‌یە.. ئەگەر بۆجیهاد نەچن ئەوە سزایەکی زۆر بەئێشتان دەدات و کەسانێکی تر دەهێنێتە کایەوە لە غەیری ئێوە، بەمەش هیچ زیانێك بە خوا ناگەیەنن، خواش هەمیشە بە سەر هەمووشتێکدا دەسەڵاتدارە.

بەڵێ ..ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەوڵ دەدات پەروەردەی بڕواداران بکات کە هەمیشە وورە بەرز و ئیرادەپۆڵاین بن ..

لاوێکی موسڵمان بۆخوێندن دەچێت بۆ لەندەن و لەماڵی پیرێژنێکی ئینگلیزدا دەبێت، هەموو بەیانیەك پیرێژنەکە سەرنج دەدات ئەم لاوە بەوساردو سەرمایە لە خەو هەڵدەستێت و جێگەی گەرم و نەرم بەجێ دێڵێ و دەچێت بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی، ڕۆژێك پێی دەڵێت: ئەوە ناکرێت خەو لە خۆت حەرام نەکەیت و دواتر هەستی، ئەویش وتی: ئاخر ئەوە خواوەند وای دەوێت و ناتوانم دوای بخەم، پیرێژنەکەش وتی: ئەوە ئیرادەیەکە ئاسن دەشکێنێ!

بەڕاستی هەروایە بڕواداران و بانگخوازان ئەبێت ئیرادەیەکی ئاسن شکێنیان هەبێ و پشت بە خوا لە هەوڵ وکاردا بن بۆ گەیاندنی پەیامی خوا.

بڕوادار بەردەوام پێویستی بەیادخستنەوە هەیە و زیاتر لە هەموو کەسێکیش سوودی لێوەردەگرێت: ﴿ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ الذاريات: ٥٥ ..

جایەکێ لەو وانەو دەرسانەی کە بەردەوام دەبێ بخرێتەوە یادی باوەڕداران و بانگخوازان، بەسەرهاتی پێغەمبەران و پیاوچاکانە، تاببێتە مایەی دڵدامەزراوی بەتایبەت لەم بارو زرووفەدا کە فشارەکان زۆرن لەسەر دڵ و دەروونی بڕواداران، هەروەك لەفەرموودەداهاتووە

(يُصبح الرجلُ مؤمنا ويُمسي كافرا) ئەوەندە فشارەکان زۆرن ئەوەندە جاهیلیەت کار لە سەر دارمانی بڕوادار دەکات، کەهی وایە بەیانی بڕوادارەو ئێوارە بڕواکەی لەدەست نەدات ..

بەڵێ لەبەر گرنگی ئەو دڵدامەزراوییەیە کە قورئان باسێکی زۆری خۆی بۆ چیرۆك و بەسەرهاتی پێغەمبەران و پیاوچاکان وبانگخوازان تەرخان کردووە، ئەوەتا قورئان لەم بارەیەوە بەئاشکرا دەفەرمویت: ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۚ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ هود: ١٢٠ واتە: ئەی محمد ﷺ هەموو ئەوانەشت بۆ دەگێڕینەوە لە چیرۆك و هەواڵی پێغەمبەران، ئەوەی کە دڵی تۆی پێ دامەزرێنین و دڵنیات بکەین، دڵنیاش بە کەلەم هەواڵانەدا حەق وڕاستیت بۆ هات، هەروەها ئامۆژگاری و بیرخستنەوەی باشی تێدا بوو بۆ ئیمانداران.

خوێنەرانی ئازیز، هۆگرانی زنجیرەی بەرەو ئیسلام.. ئێمەش لە سەر ڕەویەو ڕێبازو بەرنامەی قورئان، ژیاننامەو هەواڵی کەسانی بۆ خوا سوڵحاوی بانگخوازتان پێشکەش دەکەین لەم بەشی شەشەمەدا، بەهیوای دامەزراوی و گەرم وگوڕی لە دینداری دا و لەئێوەی بەڕێزیش دوعای خێر داوایە ...

## خـۆڕاگـری:

دیارە ڕێگای پێغەمبەران بەگوڵ فەرش نەکراوە، بەردەوام ڕووبەڕووی نەفامی و کەللەڕەقی و خودسەری گەلەکانیان دەبوونەوە، هەر لەبەرئەوەش بوو پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی لەسەرخۆگری وگیانفیدایی پەروەردە دەکرد.

هاوەڵان تادوا پلە سزادران، ئەشکەنجەو ئازارودەربەدەریان چەشت، خەباب پشتیان لەسەر چاڵێکی ئاگرو پشکۆ دانا تا هەموو پشتی سوتا، هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ کە لە سێبەری کەعبەدا دانیشتبوو، شکاتی حاڵی خۆیانی کردو،وتی: نزامان بۆ ناکەی، داوای سەرکەوتنمان بۆناکەیت؟!

ئەویش سوور بووەوە و فەرمووی: (پیاوێکی بڕوادار لەپێش ئێوەدا چاڵێکی بۆ هەڵدەکەنرا، ئنجا مشار لە سەرسەری دادەنرا ودەکرا بە دوولەتەوە، یان بەشانەی ئاسنین ئێسقان و گۆشتیان لێك جیادەکردەوە، بەبێ ئەوەی لە ئاینەکەی لابدات، بەخوا ئەم

ئیسلامەتیە بەپایان دەگات، تاسوارێك لەسەنعاوە دەچێت بۆحەزرەمۆت ولەخوانەبێت لەکەس ناترسێت با گورگ لەسەر ڕانەمەڕەکەی بێت، بەلاّم ئێوە پەلەدەکەن)(بوخاری).

بەلێ ..لای خوای گەورە هاتنی سەرکەوتن، ژیانی مرۆڤەکان، بەردەوامی ئاسمانەکان و زەمین هەرهەمووی ئەجەلی تایبەتی خۆی هەیە ..

بڕوادار لێرەدا پێویستە لەسەری هەولّی خۆی بدات، ئارام بگرێت، دوعا بکات کە خوا سەرکەوتن بنێرێت ﴿ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ ﴾ الأعراف: ٨٩.

قورئان باسی ئەزمونی پێغەمبەران وباوەڕدارانی بۆ دەکردن وپێغەمبەریش ﷺ چەندەها نموونەی خۆڕاگری بۆ دەگێڕانەوە، لەدوای شەوڕەوی و بەرزبوونەوە بۆ ئاسمانەکان بە هاوەلاّنی فەرموو: کەچووم بۆئاسمانەکان بۆنێکی خۆش هات بەسەرما، وتم: جوبرائیل ئەو بۆ نەخۆشە چی یە؟! وتی: ئەوە بۆنی قژداهێنەری کچی فیرعەونە، کاتێك کە قژی بۆ دادەهێنا شانەکەی لە دەست کەوتەخوارەوە و وتی: بەناوی خواوە (بسم الله)، کچی فیرعەون لێی پرسی: باوکم دەلێی؟! وتی: نا بەلکو پەروەردگاری من و پەروەردگاری باوکیشت.. وتی: کەواتە بەباوکم دەلّێم ..وتی: بیلێ!!

فیرعەون بانگی کردو لێی پرسی: تۆ پەروەردگارێکی ترت هەیە جگە لەمن؟! وتی: پەروەردگاری من وتۆش لە ئاسمانە!

فیرعەونیش تادەنگی هەق وڕاستی کپ بکات و بیکات بەپەندو عیبرەت بۆ کەسانی تر، فەرمانی دا کورەیەکی مسیان هێنا کە لەشێوەی مانگادابوو، گەرمیان کرد تاچاوترسێنی بکەن و پەشیمان بێتەوە لەبەرئەم تاقیکردنەوە قورسەدا، لەبەرئەم مەرگە ترسناك وتۆقێنەرەدا، ژنەکە وتی: داوایەکم هەیە لێت؟! وتی: داوا بکە. وتی: داوام ئەوەیە کە ئێسقانی خۆم و منالّەکانم بەیەکەوە کۆبکەنەوە و بینێژن! ئەویش وتی: ئەوەت بۆ دەکەین لەبەر ئەو هەقەی هەتە لە سەرمان، منالّەکانی یەك یەك فڕێ درانە ناو کورە گەرمەکەوە و بەبەرچاویەوە مەرگیان نۆشی! دواهەمینیان منالّێکی شیرە خۆرە بوو بەباوەشیەوە، منالّە هاتە قسەو وتی: دایکە ئارام بگرە تۆ لەسەر هەقیت، بەوجۆرە خۆی و ئەو منالّەی کە بەبەرسنگیەوە بوو ئازایانە بەرەو مەرگ چوون و گیانیان فیداکرد بۆ خوا...

جاوەك ئیبن عباس دەڵێت و پێغەمبەر پێی فەرموون: چوار منالّی بێشكە هاتونەتە قسە بە فەرمانی خوا كە ئەمە یەكێكیانە.[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ چیرۆكی ئەو لاوەیان بۆدەگێڕێتەوە، كەپاشایەك دەیەوێت بیكا بەساحیری بارەگای خۆی، ڕێی هەق وڕاستی دەدۆزێتەوە لەگەڵ ئەوەدا كەڕەنگە تەمەنی دە ساڵێك بووبێ، خوایی گەورە كۆمەڵێ كەراماتی دەداتێ و چاوی كوێری وەزیرێك چاك دەكاتەوە، كەپاشا پێی دەزانێت، سێ جار هەوڵی كوشتنی دەدات خوا ڕزگاری دەكات، غولامەكە بەپاشا دەڵێت: تۆناتوانی من بكوژیت مەگەر خۆم ڕێت بۆدانێم، خەڵكی هەموو كۆبكەرەوە و منیش ببەستەرەوە و بەم تیروكەوانەی خۆم تیرێكم تێبگرەو بڵێ: بەناوی پەروەردگاری ئەم غولامە، ئنجا دەتوانی من بكوژی ...

پاشا نازانێ كەئەم منالّە چالّی بۆ هەڵكەندووەو بەمەرگی خۆی گەلێك هۆشیار دەكاتەوە بۆ خواناسی، كاتێك پاشا تیرەكەی تێدەگرێ و ئەڵێ: بسم الله رب هذا الغلام..

تیرەكە دای لەسەردڵی منالّەكە وشەهید بوو، خەڵكەكە لەبەردەم ئەم فیداكاریەدا وتیان: (امنا برب هذا الغلام) بڕوامان هێنا بەخوای ئەم غولامە، بە مەرگی غولامەكە بانگەواز سەركەوت ..

ئنجا بەفەرمانی پاشا چالێكی گەورە هەڵكەندراو پڕیان كرد لە ئاگر، هەرچی پەشیمان نەبوایەتەوە فڕێ ئەدرایە ناوی، بەمەش كەسانێكی تر بەرەو لای خوا بەشەهیدی كەوتنە ڕێ ...ئەم ڕووداوە كەچەند ساڵێك پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ لەیەمەن ڕوویدا، قورئان تۆماری كرد لەسورەتی (البروج) دا تا هەردەم پەندوعیبرەت بێت بۆ بڕواداران ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ۝١ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ۝٢ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ۝٣ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ۝٤ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ۝٥ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ۝٦ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ۝٧ وَمَا نَقَمُواْ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾ البروج: ١ - ٨

---

١- (عبد الله ی كوڕی عباس) ڕیوایەتی كردووە: حدیث حسن.

## بەڕاستی ئەم ئاینە سەیرە؟!

ئەم ئاینە و شوێنکەوتوانی هەرچەند تووشی تەنگوچەڵەمەو ناڕەحەتی و میحنەت بن، زیاتر قاڵ دەبن وبەهێز دەبن، ئەمەش بەدرێژایی مێژووی ئیسلامەتی ڕاستە، لەکۆن و نوێدا، ئەوەتا لەم پێنج ساڵەی دواییدا کەئەو هەموو هێرشە ناڕەوایە کرایە سەرئیسلام لەئەمریکا، کەچی لە هەمووکات زیاتر خەڵکی ڕووی کردۆتە ئیسلام و لەئەورووپاش بەهەمان شێوەیە .

پێگەی ئیسلام ئۆن لاین لە (٢٠٠٦/٢/٢٦) لە ژێر ناونیشانی (بەلجیکا.. زۆرترین ڕێژەی موسڵمان بوون لە ئەورووپادا) دەڵێت: تەنها ئافرەتە بەلجیکیەکان موسڵمان نابن بەڵکو لاوانی بەلجیکیش بەردەوام موسڵمان دەبن، ئەمەش وای کرد ڕۆژنامەی (لوسوار)ی بەلجیکی زەنگی خەتەر لێ بدات و باس لەدیاردەی موسڵمانبوونی کوڕان وکیژانی بەلجیکا بکاو بەڕووداوێکی مەترسی دار ناوزەدی بکات...

ڕۆژنامەکە لەژمارەی ڕۆژی (٢٠٠٦/٢/١٨)دا دەڵێت: ئامارەکان دەڵێن کە ژمارەی ئەو بەلجیکیانەی کەموسڵمان بوون لەم چەند ساڵەی دواییدا گەیشتۆتە چل هەزار کەس، کە ئەمەش ڕێژەیەکی بەرزە لەئەورووپادا لەچاودانیشتوانی بەلجیکادا کە ژمارەیان(١٠) ملیۆن کەسەو ژمارەی موسڵمانانیش گەیشتۆتە (٤٥٠) هەزار کەس.

لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ (ئیسلام ئۆن لاین) لە (٢٠٠٦/٢/٢٠)دا (جیرۆم فرانسوا)ی تەمەن (٢٧) ساڵ دەڵێت: من پاش ئەوەی موسڵمان بووم ئافرەتێکی مەغریبی موسڵمانم هێنا، من دەگەڕام بەدوای تێرکردنی لایەنی ڕۆحیم داو دەمویست بگەمە حەقیقەتی ئاین، کەئەمەشم لەئیسلامدا دۆزیەوە، ئیسلام ئاینێکە پێویستت بەکەس نیە کەلەنێوان تۆو خوادا بێت و ڕاستەوخۆ دەتوانی چیت دەوێت داوا لەخوا بکەیت ...

(فرانسوا کلارنفال)ی تەمەن (٤٧) ساڵیش دەڵێت: هاتنم بەرەو ئیسلام هاتنمە بەرەو حەقیقەت، ئیسلام تەواوکاری گۆڕانکاریەکانی ژیانم بوو، لە هەرزەکارێکی کاسۆلیکیەوە بووم بەشیوعیەکی بێ باوەڕو هیچ نەبوولایەنی ڕۆحیم ئاسوودە بکات، تاوەکو موسڵمان بووم، کاتێ ئیسلامم دۆزیەوە هەستم کرد خۆم و ماڵ و منداڵم دۆزیوەتەوە...

# ئافرەتێك مەلائیكەت سێبەری بۆ دەكات!

ڕەنگە هەرگیز بەخەیاڵیا نەهاتبێ ئەو دەست و قاچ و مل و گەردنەی كە بە جوانترین و بەنرخترین بازنگ و خشڵ دەڕازایەوە، ڕۆژێك بێت بەزۆر لێی زەوت بكرێ و لەجێگایاندا كۆت وپێوەندی ئاسن دانرێت؟!

ئەوە ئافرەتێكە گەیشتە لوتكە و تەنها دوو كەسی تر هاوشانی ئەون، كە لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتیدا لە وێنەیان نەبووە و هیچ ئافرەتێك نەگەیشتووەتە پلەو پایەیان، كە ئەوانیش ( مەریەم و خەدیجە)ن ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لەسەر، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (كمُل من الرجال كثير و لم يكمُل من النساء الا آسية امراة فرعون، ومريم ابنة عمران، وخديجة بنت خويلد)[1]، ئەوشاژنە ئافرەتێكە كە ئەزموونەكەی لەقورئاندا بۆ هەتاهەتا تۆماركرا تا هەردەم سەرمەشق بێت نەك هەربۆ ژنان بەڵكو بۆ پیاوانیش!

ئەوشاژنە ناوی (ئاسیەی كچی موزاحیم)ە، كە هاوسەری فیرعەون بوو، ئاشكرایە لەجوانیدا كەم وێنە بووە، لەبنەماڵەو عەشرەت دا لە لوتكە دا بووە، چونكە دیارە فیرعەون بەهەموو ئافرەتێك ڕازی نابێ!

لەوە دەچێت ئادواپلە نازداربووبێت و نازی كێشرابێ لەلایەن فیرعەونەوە، بۆیە ڕازی بوو كە (موسا)ی شیرەخۆرە سەرنەبڕدرێت وهەڵی گرنەوەو بیكەنە كوڕی خۆیان ...

فیرعەون نێرینەی لەبەنی ئیسرائیل بڕی، ئەگەر لەبەر خاتری ژنە ئازیزەكەی نەبوایە چۆن ئەو فەرمانەی بەسەر موسای شیرە خۆرەدا پەیڕەو نەدەكرد ؟!

دیار بوو ئاسیە دڵی خەبەری دابوو، بۆیە هەرزوو وتی: ئەم مناڵە مەكوژە بەڵكو لێ ی بەهرەمەند بین و بیكەینەكوڕی خۆمان، ﴿ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ﴾القصص: ٩، بەڵێ بووە خێر بۆی، ئەم شاژنە ئیمانی هێنا؟! جاچ دەستكەوتێك وخێرێك لەئیمان و چوونە بەهەشت گەورەترە؟! چی لەوە مەزنترە ناوو بەسەرهاتت لەقورئاندا تۆمار بكرێت وتاقیامەت بخوێنرێ و بەهەر پیتێكی خوێنەرەكەی دە چاكەی دەستكەوێت.

---

١- مسلم.

قورئان لەبارەیەوە دەفەرموێ ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ التحريم: ١١ ، بەڕاستی نمونەیەکی بەرزە، هەمیشە سەرمەشقە، ئافرەتێك لەو هەموو نازو نیعمەتەدا بێت و، ڕێی ئیمان وباوەڕ هەڵبژێرێ و بەرامبەر مێردەکەی کە سەرسەختترین بێباوەڕبوو، وەخۆی کردبوو بەخوا لەخەڵك، بوەستێتەوە و نەك هەرئەوەندە بەڵکو بەرگەی ئەزیەت و ئازارو چەوسانەوەیەك بگرێ کەنەك ئافرەت بگرە پیاویش خۆی لەبەرداناگرێ! ئەم ئافرەتە کە هەموو گەلی میسرو تەنانەت فیرعەونیش لەخزمەتیابوو، کەوتە بەر ڕق وقینی فیرعەون و فەرمانی دا بە ئەشکەنجە و ئازاردانی، فیرعەون فەرمانی دا کەچوارمێخ بۆژنەکەی داکوتن و بەزەویەوە هەرچوارپەلی ببەستنەوە و سزای بدەن لەبەرهەتاوو قرچەی گەرما، جا کەهەرئەوان لادەچوون مەلائیکەتەکان بەفەرمانی خوا بە باڵەکانیان سێبەریان بۆدەکرد، ئەم شاژنەش تەنها داوای لەخوا ئەوەبوو کە لەلای خۆی لە بەهەشتا کۆشکێکی بۆ دروست بکات خوای گەورەش هەر لەدنیادا کۆشکەکەی بەهەشتیپیشان دا ..

هەروەك دەفەرموێ ﴿إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ﴾التحریم: ١١ ..

ئەبو یەعلا لە مەسنەدەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتی کردوە کە (ان فرعون اوتد لامراته اربعة اوتاد فى يديها، فكان اذا تفرقوا عنها ظللتها الملائكة) ..

(ابن جرير) يش لەسەلمانەوە ریوایەتی کردووە (كانت امراة فرعون تُعذب فىالشمس فاذا انصرف عنها اظلتها الملائكة باجنحتها، وكانت ترى بيتها فى الجنة).

بەڵێ ..دنیا کورتە، کەمە، هەرچی بێ و هەرچۆنێ بێ تەواو دەبێ، بەهەشتە کەنەبڕاوەو هەتاهەتاییە جاکەسێك کە هەرئەوەندە پێ بخاتە بەهەشتەوەهەرچی بەسەرهاتووە لەخۆشیا لەبیری دەچێتەوە وهەروەك نەشبووبێ! پێغەمبەرﷺدەفەرموێ:(يُؤتى بأشد الناس ضُرا فى الدنيا فيُقال: اغمسوه فى الجنة غمسة، ثم يُقال له هل رأيت ضُرا قط؟ فيقول: لا)[1]

---

١- (گۆڤاری المجتمع ٢/٢/٢٠٠٧).

## ئوم شورەیك غوزەیەی ئەنساری:

ئەم ئافرەتە هەر لەسەرەتای بانگەوازەوە موسڵمان بوو لەمەککەدا، بەچاوی خۆی زەبرو زەنگ و ستەمی کافرانی ئەدی دژ بە موسڵمانان، خەمی بانگەوازی خوا خولیای سەری بوو، بەدزیەوە سەردانی ژنانی قورەیشی دەکرد، زۆر لێی داخ لەدڵ بوون، بەتایبەت کەئەم قورەیشیش نەبوو، کەسیش نەبوو لەمەککەدا بەرگری لێبکات..

کافرەکان گرتیان و پێیان وت ئەگەر گەل و هۆزەکەت هاوپەیمانمان نەبوونایە خۆمان دەمانزانی چیت لێ دەکەین، بەڵام ئێمە ئەتنێرینەوە بۆ لای کەسوکارت..

دەستیان بەست و سواری پشتی حوشترێکی رووتیان کرد، بۆ ئەوەی لەسەر پشتی ڕەقی حوشترەکە ئازار بچێژێ، ئینجا سێ ڕۆژ ڕێگا ڕۆیشتن، نەنانیان ئەدایەو نەئاو، خەریك بوو لەبرسێتی و تینوێتی دا بمرێت، تەنانەت ئەوەندە ڕقیان لێی بوو، ئەگەر بوەستانایە بۆ پشوو، خۆیان دەچوونە بەر سێبەرو ئەویان لەبەر سووری هەتاو دائەنا، داوای ئاوی لێدەکردن نەیاندەدایە، جا لە کاتێکدا کافرەکان لە ژێر درەختێکدا سەرخەویان دەشکاند و ئەمیش لە قرچەی گەرمادا کە لەتینویەتی وبرسێتیدا گیانی دەدا، هەستی بەشتێکی ساردکرد لە سەرسنگی، تومەز دۆلکەیەك ئاوبوو، بۆی ڕاگیرابوو تۆزێکی لێ خواردەوە، بەرز بووەو ئنجا هاتەوە سەردەمی و هەندێکی تری خواردەوە تاتێر ئاوبوو ئنجا باقیئاوەکە کرا بە سەریاو تەواو فێنکی بوەوە.

کاتێك کافرەکان لەخەوهەستان و ویستیان بکەونە ڕێ، هاتنە لای بینیان ئاسەواری ئاو هەیە لەسەرجل و بەرگ و دەم و چاوی و بینیان ڕەنگ ورووی گەشاوەتەوە، لایان سەیر بوو، چۆن دەستی گەیشتۆتە ئاو لەکاتێکدا کە کۆت و پێوەند لەدەست و قاچیایە؟!

پێیان وت: کۆت و پێوەندەکەت کردۆتەوە و ئاوەکەی ئێمەت بەکارهێناوە؟

وتی: نەبەخوا..بەڵکو لەئاسمانەوە دۆلکەیەك ئاوم بۆ دابەزی، لێم خواردەوەو خۆم پێ فێنك کردەوە، کافرەکان سەیری یەکتریان کردو وتیان: ئەگەر ڕاست بکات مانای وایە ئاینەکەی ئەو لە ئاینەکەی ئێمە چاکترە! ئنجا چوون سەیری مەشکەو کوندەو ئاوەکانی خۆیان کرد بینیان هەروەك خۆیەتی و دەستی بۆنەبراوە، بەم هۆیەوە موسڵمان بوون وبەرەڵایان کرد.

بەڵێ..ئەم شورەیك بووە مایەی موسڵمانبوونیان، گەورەیی و دایینداری و دامەزراوی بووە سەرمەشق بۆخوشكان ویرایانی بانگخوازكەخۆیان گورج بكەنەوەو كۆڵ نەدەن ...بەڕاستی شاعیرێك چاكی وتووە، ئەگەر نەفسی مرۆڤ بەرز بێ و بە هیممەت وبەئیرادەبێت، لاشەی ماندوودەبێ لەگەیشتن بە ڕۆحی بڵندو بەرزیدا ..

واذا كانت النفوس كباراً تعبت فـي مرادهـا الاجسـام[1]

## خوا ڕەحم بە ئەبو هەیثم بكات:

شێخ علی المدنی مامۆستای بوخاری بوو، زانابوو لەبواری (علل)ی فەرمودەدا، بوخاری لەبارەیەوە دەڵێت (خۆم لەبەركەس دا بەكەم نەزانیوە مەگەر لەبەردەم شێخ عەلی المدنی دا..)...

هەروەها (یەحیا كوڕی معین)یش مامۆستای (جرح وتعدیل)و (علم الرجال)بوو، ئەم دووزانایە هاوەڵی ئیمام ئەحمەدی كوڕی حەنبەل بوون ...

ئیمام ئەحمەدیش كەبەسەدان هەزارفەرموودەی لەبەربوو، خاوەنیمسندێكی فەرموودەیە كە بەهەزاران فەرموودەی لەخۆی گرتووە و ناوی (مسندی ئەحمەد)ە..

قەدەری خوا وابوو كە فیتنەو تاقیكردنەوە هاتەكایەوە لەمەسەلەی (خلق القرآن) دا وزۆر لەزانایان لایەنی بێدەنگی و توقیەیان هەڵبژارد لەترسی زەبرو زەنگی خەلیفە وكاربەدەستان ..

دەڵێن لەوماوەیەدا شافیعی كە هاوەڵی ئیمام ئەحمەد بوو لە میسر خەوی بینی بە پێغەمبەرەوە ﷺ كە پێی فەرمووبوو هەواڵ بدە بە ئیمام ئەحمەد كە تووشی بەڵاو تاقیكردنەوەیەك دەبێت با خۆی ڕاگرێت .

ئیمام شافیعیش نامەیەكی بەیەكێكدا نارد بۆ ئیمام ئەحمەد لەبەغداو خەوەكەی پێڕاگەیاند، ئیمام ئەحمەدیش كەنامەكەی خوێندەوە گریا .

ئیمام ئەحمەد لەبەردەم فیتنەكەدا وەستاو ئارامی گرت، ئارامگرتنێك كە هەمیشە پەندو ئامۆژگاری بێت، هەروەك ئیمام ئەحمەد خۆی دەڵێت: (ئارامگری ئێمە ئارامگری یە بۆزۆر كەسی تر)....

---

١- (www.Islamicvoice.com) وتاری: (وداعاً أیهاالبطل) محمدالعریفي.

ئیمام ئەحمەد ڕوخسەتی وەرنەگرت و وتی: (ئەگەر زانا توقیە بەکار بێنێ و خۆی بپەڕێنێتەوە و نەفامیش ڕۆبچێ لە نەفامیەکەیدا، کەی هەق و ڕاستی دەردەکەوێت؟!) هەروەها دەیوت: چی ڕزگارم دەکات لەقیامەتدا لەو جەماوەرەی کە قەڵەم و کاغەزیان بەدەستەوەیەو چاوەڕێی قسەی منن ....

ئیمام ئەحمەد دووساڵ زیندانی کراو سەدو پەنجا جەلاد بەنۆرە قامچیان لێدا، بەڵام نەرم نەبوویۆیان، چونکە دەبێ پێشەواو بانگخوازان هەردەم سەرمەشق بن بۆ کەسانی تر ....

ڕۆژێك کە لە قامچی لێدان هێنایانەوە، لەناو زیندانەکەیدا زیندانیەکی تر لێی نزیك بۆوە کەناوی ئەبوهیپم بوو پێی وت: (من ئەبو هیپم ی جەردەم، هەژدە هەزارقامچیم لێ دراوە لەسەردزی، ئارامم گرتووە لەبەر دنیاو گوێڕایەڵی شەیتان، ئایا لە گوێڕایەڵی پەروەردگار و لەپێناوی ئاین دا ئارام ناگریت؟!) ئیمام ئەحمەد ئەم قسانە زۆر کاریگەری هەبوو لەسەری‌و هەمیشە دوعای خێری بۆ ناوبراو دەکرد ...

خەلیفە موعتەسەم بەجەلادەکانی دەوت: کێ دەتوانێ بەقامچی بیکوژێ؟! (ئەبوالدن)ی جەلاد وتی: بەبیست قامچی تەواوی دەکەم؟! ناوبراو بەهەموو هێزیەوە ئازاری داو، خوای گەورە هێشتیەوە و، سەرئەنجام ئیمام ئەحمەد سەرکەوت.

پاش گۆڕانی باروزروفەکەو نەمانی ستەمی میری، ئیمام ئەحمەد فەرمووی: (من لە خەلیفە موعتەسەم دەبوورم لەبەرئەوەی فەتحی عەموریەی کرد کەخزمەتە بۆئیسلام)....

کاتێکیش لەسەرە مەرگدابوو (ابن المدنی) هات بۆ سەردانی، ئیمام ئەحمەد ڕووی لێوەرگێڕا، (ابن المدنی) وتی: سبحان الله ئەی باوکیعبدالله، خۆش نابیت؟! (دیارەئیمام ئەحمەد زۆرلێی پڕ بوو کەچۆن ئیمامێکی وا گەورە ڕووبەڕووی ستەمکاران و فیتنەکە نەبۆوەو سەلامەتی هەڵبژارد!)..

لەوێدا قوتابیەکی (ابن المدنی) پێی وت! (مامۆستا تۆش وەکو ئیمام ئەحمەد بۆ ئارامت نەگرت)؟.

ابن المدنی سیخورمەیەکی لێداو وتی: (وس بە، ئەو پیاوێکە ئێمە بەپێغەمبەران ئەیشوبهێنین (لە هەوڵ و کۆشش و خۆگریدا).[1]

---

١- پێگەی: (صيدالفوائد) وتاری (رحم الله أبا الهيثم) د.عبدالمعطي الدالاتي ....

## هیممەت بەرزی:

مرۆڤەکان لە بەرنامەیاندا بۆژیان و لەئاوات وئامانج وهیممەتیاندا جیاوازن، کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی رێ بەپێغەمبەر ﷺ دەگرێ و دەڵێت: (ئەی محمد لەو ماڵەی خوام بدەرێ کە پێی داویت، ئەوە نەماڵی تۆیەو نەماڵی باوکتە!)....ئەمە ئەو عەقڵیەتانەن کە نە لە مەقامی پێغەمبەرایەتی تێگەیشتوون و نە لەدنیاش تێگەیشتوون ..

ئەمانە ئەوەندە ناحاڵین و ئەوەندە ئاین بە سەقەتی وەردەگرن، چاکتروایە هەر ئاین نەزانن، ئەمانە ئەوانەن کەقورئان لەبارەیانەوە دەفەرمویّت: ﴿ ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾التوبة: ٩٧، واتە: عەرەبە دەشتەکیەکان زۆر بێ دین و دوورِوون و چاکتر وایە کە لە سنورەکانی دینی خوا کە دایبەزاندۆتە سەر نێردراوەکەی هیچ نەزانن .

ئەوانە لەلایەك ولەلایەکی تریشەوە، رەبیعەی کوڕی کەعب کەخزمەتی پێغەمبەری دەکرد،رۆژێك پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: چیت داوایە بۆت بکەم؟ ئەویش پاش بیرکردنەوە هاتەوەلای و بەبێ ئەوەی داوای دنیا بکات وتی: ئەمەوێت هاوەڵت بم لەبەهەشت دا...بەڕاستی ئەوەیە هیممەتی بەرز کەتەنها چاوی لە بەهەشتە!

ئەبو هورەیرەش یەکێ بوولە ئەهلی صوففەو لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺدا دەمایەوە لەگەڵ هاوەڵانیدا، کاتێك هەندێ دەستکەوت هاتە بەردەستی پێغەمبەر، پێی فەرموو: وەکوئەو خەڵکە تۆش داوای ئەودەستکەوتانە ناکەیت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من تەنها یەك داوام هەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیە؟ وتی: من دەمەوێت ئەوەم فێرکەیت کەخوا فێری کردویت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی شتێکی تر داواناکەیت؟ وتی: هەرئەوەم دەوێت.. بەڕاستی ئەبوهورەیرە چاك تێگەیشتبوو چونکە بەرزی و پایەداری دنیاو قیامەت لە زانست وزانین دایە هەروەك قورئان دەفەرمویّت: ﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾ المجادلة: ١١، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّت:(من سلك طريقا يلتمس فيه علما سلك الله له به طريقا الى الجنة)...

پێغەمبەرﷺ دوعای فێربوون و توانای لەبەرکردنی بۆ ئەبو هورەیرەکرد، ئەوەتا زیاتر لە شەش هەزار فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کردووە، ئنجا لەکۆتایی تەمەنیشیا، لە دواساتەکانی ژیانیادەگریاودەیوت: (آه من قلة الزاد و طول السفر) ئای بۆ کەمی تێشوو ودووری سەفەر! ئیبن قەیم لەم بارەیەوە دەڵێ: چەند هیممەتێکی بەرزە و چەندە خەڵکی جیاوازن لەهیممەتدا !!

قورئان لەدوای غەزای ئوحودەوە باسی هاوەڵانی کرد کە چەند کەسێکیان دنیایان مەبەست بوو، غەنیمەتیان دەویست، هەندێکیشیان پیاوی ئاخیرەت بوون ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ حَتَّىٰ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّن بَعْدِ مَا أَرَاكُم مَّا تُحِبُّونَ مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الْآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴾ آل عمران: ١٥٢، ئەوانە هێشتا پەروەردەکەیان کاملی نەکردبوون وقورئانیش کاری لەسەر دەکردن.. جاخەڵکیش هەموو هەر ئەو دووجۆرەن، ئیبن الجوزی ئامۆژگاریان دەکات دەڵێت (تەمەن بەنرخە، ڕازی مەبە نرخ بۆ تەمەنت مەگەر بەهەشت).

ئەم هیممەت و خوا ویستیە مرۆڤ چاونەترس و نەبەرد دەکات، کاتێك فەڕەنسا جەزائیری داگیرکرد پیاوان و ژنان و منالآن ڕژانە سەر شەقامەکان وقورئانیان بەرز کردەوەو وتیان(ئێمەین بەیعەتمان داوە بەمحمد بۆجیهاد کردن هەتاماوین).. بەڕاستی بەهەشت خۆی ڕازاندۆتەوە بۆ بڕواداران کەچی بەداخەوە عاشقانی کەم بونەتەوە، ئەوەتا (ابن ام مکتوم) نابینا بوو، ئایەتی﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰ ۝١ أَن جَاءَهُ الْأَعْمَىٰ ۝٢ ﴾عبس: ١ - ٢، لەسەر ئەو هاتە خوارەوە، هەرکە پێغەمبەر ﷺ پێی دەگەیشت پێی دەفەرموو: سڵاو لەو کەسەی کەخوالۆمەی‌کردم لەسەری.

کاتێك پێشەوا عومەر ویستی سوپا بنێرێ بۆ شام، (ابن ام مکتوم) یش خۆی ئامادەکرد، عومەر پێی وت: تۆ خوای گەورە عوزری داویتێ کە نەچیت، وتی: کوڕی خەتاب دەتەوێت ڕێ ی شەهادەتم لێ بگری !؟

عومەر وتی: باشە دەچی چیدەکەیت لەگەڵیان؟! وتی: ئەچم ژمارەیان زیاد دەکەم! کاتێك چوو لەگەڵیان ڕازی نەبوولەدوای دواوە بوەستێ بەڵکو داوای کرد کە ئاڵاکە بدەنە دەستی ولەناوەڕاستی گۆڕەپانی جەنگدا بێت و وتی: من بۆ ئەمە چاکم چونکە چاوم نیە بترسم و ڕابکەم! بەڵێ..پاش جەنگەکە بینیان ئاڵاکەبە باوەشێوەیەتی و بۆ خوا شەهید بوەو زەردەخەنەش لەسەر لێویەتی!..

بەڵێ ..پێغەمبەر ﷺ مامۆستای (ابن ام مکتوم) بوو، لەسەرهیممەت بەرزی و خۆنەدزینەوە پەروەردەی کردبوو، کاتی خۆی کەهات داوای ڕوخسەتی کرد لەبەرئەوەی کوێرەو ڕێی مزگەوت دوورەو گوایە کەس نیە دەستی بگرێت؟! پێغەمبەرﷺ ڕوخسەتی نەداو فەرمووی: گوێت لەبانگ دەبێت؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: دەکەواتە عوزرت نیە کەنەیەیت بۆ مزگەوت.. بڕواداری ڕاستەقینە موستەحیلی لانیە و بە (حول)و (قوة)ی خوا، بیەوێ شاخ لەبن بێنێ لەبنی دێنێ، هەروەك ئیبن قیم دەڵێت: (ان العبد المؤمن اذا وقف امام الجبل وقال ازيحه يزيحه باذن الله) ئەگەر لە مانای (اياك نعبد واياك نستعين) تێگەیشتبێ [1] ........

## هیممەتی چوون بەرەو حەج:

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ﴿٢٧﴾ ﴾ الحج: ٢٧، دەنگی ئیسلام لەکاتی حەجی ساڵی (٢٠٠٦)دا ئەم هەواڵەی بڵاوکردەوە..

محمد علی بهاء الدین تەمەنی (٦٢) ساڵەو خەڵکی گوندی (ادروس مارتان)ە، کەدەکەوێتە خوارووی پایتەختی چیچان (گرۆزنی) یەوە ئەم پیاوە لەگوندەکەی خۆیەوە بەپاسکیل بەڕێ کەوت بەهیوای حەجی ماڵی خوای گەورەو گەیشتە عەممانی پایتەخت و (١١) هەزار کیلۆمەتری بەپاسکیل بڕیوەو بەوڵاتەکانی ئازەربایجان و جۆرجیا و ئێران و ئەرمینیا و تورکیادا تێپەڕیوە .

---

١- وتاری: (همم تناطح السحاب) خالد الراشد.

بەڵام بەگەیشتنی بەسنووری ئوردن - سعودیە گەشتەکەی وەستا چونکە پێویستی بە فیزە هەبوو بۆ چوونە ناو خاکی سعودیە، لەخاکی ئوردوندا چاوەڕێی کردبەهیوای ئەوەی لایەنە لێپرسراوەکان یارمەتی بدەن بۆ گەیشتن بە ئاواتی .

محمد دایکی کە وەفاتی کردووە لە خەودا بینیوە و تەمەنناى ئەوە بووە کوڕەکەی بچێتە حەج ئەگەر بەپاسکیلیش چووبێت، ئەویش بۆ ئەنجام گەیاندنی ئاواتی خۆی و دایکی لە بەردەست کورتی بە پاسکیل بەڕێ کەوتووە. محمد لەم گەشتە دوورو درێژوگرانەدا ناڕەحەتی زۆری هاتۆتە ڕێ، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەبێ خواردن ماوەتەوە جگە لەئاو هیچی تری پێ نەبووە، بەڵام ڕەحمی خوای گەورە فراوانەو دەنکێ گوێز لەدەمی باڵندەیەك کەوتۆتە خوارێ بۆی، محمد دەڵێ: کاتێك خواردم لە ژیانمدا شتی واخۆشم نەخواردبوو هەرگیزیش هیچ خواردنێك ئەوەندە تێری نەکردووم، هەرچەندە ئەو کەسانەی لەگەشتەکەیدا پێی گەیشتوون کۆمەکیان کردووە بەڵام محمد یارمەتی پارەی لەکەس وەرنەگرتووە تارەزامەندی خوا بەدەست بهێنێ .

هەروەها لەیەکێك لەشاخەکانی تورکیادا دوو گورگ هێرشیان بۆ هێناوە، بەڵام بەئیرادەی بەهێزی وبە ئارامی و پاڕانەوەی لە خوای گەورە کە لە حەج مەحرومی نەکات، بەسەر ئەم گرفتەدا زاڵ بووە کە لە هەموو ڕووداوەکانی گەشتەکەی ناڕەحەتتر بوو .

هەر کاتێکیش بکەوتایە ڕووەو قیبلە بەنیەتی حەج دەخەوت هەتا ئەگەر مرد لەسەر ئەونییەتە بمرێ، محمد خانەنشینەو مامۆستای شەریعەتی ئیسلامی گوندەکەی خۆیان بووەو قورئان بەعەرەبی دەزانێ بخوێنێتەوەو لەم گەشتەشیدا قورئانێکی پێ بووە بەردەوام عەزیمەتی پێداوە .

محمد دەڵێ: کاتێك لێپرسراوێکی چیچانی بەگەشتەکەمی زانی وێنەیەکی باوکی خۆی بۆ هێنام تا لەگەڵ خۆم بۆ حەجی بەرم و لەوێ بۆیجێبهێڵم چونکە باوکی بەتەمای حەج بووە بەڵام وەفاتی کردووە و نەی توانیوە بەو ئاواتەی بگات.

(ڕشاد بینو) ئەمین سڕی کۆمەڵەی هاوڕێیانی کۆماری چیچان ئەڵێ: بەرچاو کردنی تەمەنی محمد ئەمە ئەزمونێکی زۆرناوازەیە و حەج کردن بەم ڕێگایە ئیرادەو ئارام و تەحەددی نموونەیی دەوێ کەئەمەش دەگمەنە و بە هیوای ئەوەی لایەنە لێپرسراوەکان لەم کاتە کەمەی بەدەستەوە ماوە کاری بۆئاسان بکەن .

## ڕەجا کوڕی حەیوە:

لەساڵی (٩٩)ك ناویراو لەگەڵ سولەیمانی کوڕی عبدالملك بوو لە (دابق) لەسوریا، سولەیمان سوپای نارد بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ڕۆمەکان و لەوپەڕی گورو تین و دەسەلاتدابوو بۆیە بەشانازی یەوە دەیووت (انا الملك الشاب) کەتەمەنی چل ساڵ دەبوو، ڕۆژێك کەنوێژی جومعەی کرد نەخۆشکەوت و زانی کەمەرگ نزیکە .

ڕەجاء کە وەزیری بوودەڵێت: سەردانم کرد بینیم نامەیەك دەنووسێت، پێی وتم: بەتەمام کە دوای خۆم کوڕەکەم دانێم .

پێم وت: شتێك بکە کە بۆ قیامەتت باش بێت و ڕووسووری لای خوا بیت، ئەیوبی کوڕت منداڵەو ناشزانی کە گەورە بوو چی لێ دێت و چۆن دەبێت ...

وتی: باشە نوێژی ئیستخارە دەکەم ..

پاش ماوەیەك نامەکەی دڕاندو پەشیمان بووەو بانگی کردم وتی: دەمەوێت برازاکەم دابنێم، وتم: واناردوتە بۆ غەزای ڕۆم، کێ دەزانێت دێتەوە یان نا؟؟..

وتی: ئەی تۆ کێ بەباش دەزانی؟! منیش نەم ئەویست هیچ بڵێم بەڵکو دەمویست ئەوناو بڵێ و ئەگەر بەدڵم نەبوو شتێکی لێ بدۆزمەوە !

تاوەکو جارێك وتی: ڕات چی‌یە بەرامبەر عومەری کوڕی عبدالعزیز؟

منیش وتم: هەتابڵێی چاکە، وتی: ڕاست دەکەیت، بەڵام (یزید کوڕی عبدالملك) دەکەم بە(وەلی عەهد)ی تا ڕازیان بکەم و لەکۆڵ عومەر ببنەوە وکێشەی بۆ دروست نەکەن . (ئنجا نامەیەکی نووسی کە وەسیەتی بوو بەدانانی عومەر و وەلی عەهدیشی یەزیدی کوڕی عبدالملك بێت و مۆریشی کرد) ئنجا ئال و بەیتی خۆی کۆکردەوەو فەرمانی پێدان کەبەیعەت بدەن بەو کەسەی کەناوی لەو نامەیەدا هاتووە ...

ئەوانیش دواتر چوونە لای (ڕەجاء) و وتیان: کێی داناوە بەخەلیفە لەدوای خۆی؟! وتی ئەوە نهێنی‌یەو ناتوانم بیڵێم !

عومەر هات و قسەی لەگەڵ کرد وتی: ئەگەر دەزانی منی داناوە تاماوە بابچم داوای لێ بکەم لام ببات ؟وتی: نازانم.

ئنجا هشام کوڕی عبدالملك هات و هەمان داوای کرد کەبزانێ کێ ی داناوە، هەرپێی نەوت ...

ڕەجا دەڵێ: پاش چەند ڕۆژێك سەرم لێ دا بینیم گیان دەدات، ڕووم کردە قیبلە، وتی: جارێ کاتی نامەکە نەهاتووە..

پاش ماوەیەکی تر سەرم دایەوە هەر لەگیانەڵا دابوو، ڕووم کردەوە قیبلەو وتی: جارێ کاتی نامەکە نەهاتووە، منیش بەجێم هێشت .

پاش ماوەیەکی تر هاتمەوە دەیزانی ئیتر تەواو دەبێت، وتی: ئیتر کاتی خۆیەتی، ئیتر کەکۆچی کرد و گیانی سپارد، دەرگای ژوورەکەم داخست و پاسەوانم بۆ دانا و پێم وتن ڕێ بەکەس نەدەن بچێتە لای، سەربازم لەگەڵ خۆم بردو چوومە مزگەوتی (دابق) و خەڵکیم کۆکردەوەو وتم: خەلیفە فەرمانی داوە کە هەموو بەیعەت بدەن بەوەی لەم نامەیەدا ناوی هاتووە، ناچار هەموو بەیعەتیان دا، ئنجا کە وتم خەلیفە مردووە و عومەری داناوە، هشام کوڕی عبدالمليك هاواری لێ بەرز بۆوە، پێم وت: قسە بکەیت لەگەردنت ئەدەم؟ ناچار ئەویش بەیعەتی دا بەعومەر..

کەسەیری عومەری کرد وتی: لاحول ولا قوة الا بالله... عومەریش وتی: لاحول ولا قوة الا بالله ...

بەڵێ .. ڕەجاء کوڕی حەیوە پیاوێکی ژیر و خواناس بوو، هەمیشە لەخەمی ئیسلامدا بوو، بۆیە بەدوای فرسەتێکدا دەگەڕا کەرۆڵی چاکتر ببینێ، لەگەڵ ئەوەشدا کەوەزیری چەند خەلیفەیەك بوولەئەمەوییەکان ئەوفرسەتەی بۆ هەڵکەوت زۆر بەعاقڵانە توانی باری خەلافەت چاك بکاو عومەری کوڕی عبدالعزیز بێنێتە پێشەوە کە بە پێنجەم خەلیفەی ڕاشیدین دادەنرێت.[1]

## تاریق کوڕی زیاد:

ئەمیش یەکێکە لەوانەی کەخزمەتێکی گەورەی بەئیسلام کرد، ئەم لاوە تەمەنی (٢٨) ساڵ بوو کەکرا بەسەرکردەی حامیەی شاری (طنجة)، پاشان کرا بە سەرکردەی حەملەی فەتحی ئەندەلوس، لەبەرئەوەی لێهاتوو گیانفیدا بوو..

---

١- (وتارێکی طارق سویدان).

تاریق بەسوپاکەیەوە کە حەوت هەزار کەس بوون لەشاری(سبتە)ەوە بەکەشتی کەوتە ڕێ بەرەو (مضیق)ی (جبل طـارق) لـە ٥ ی ڕەجـەبی سـاڵی (٩٢) کۆچـی بەرامبـەر (٧١١) زاینی .. لەناو کەشتیەکەیدا سـەرخەوێکی شکاند، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێ لە هاوەڵانیـدا چووەخەوی و مژدەی سـەرکەوتنی دایەو ئامۆژگاری کرد کـە بەنـەرمی مامەڵـەی سـەربازەکانی بکـات و بـەوەفا بێـت بـۆ ئەوعەهـدو پەیمانـەی داویەتـی، کـە خەبـەری بـوەوە خەوەکـەی بـۆ سەربازەکانی گێڕایەوە زۆر دڵیان خۆش بوو...

کاتێ گەیشتنە لای شاخەکە ڕووبەڕووی سەربازەکانی(قـوط)بوونـەوە بۆیـە ناچار بـوو بگەڕێتەوە بەرەو (سبتە) تا تاریك داهات، ئنجا چوو بەرەو پشتی شاخەکە و هەرچەند زۆر لێـژ بوو، بەگوریس و شتی تر سەرکەوتن، کەوتنە شەڕەوە لەگەڵ (قوط)ەکان، سوپای دوژمـن خـۆی بۆنەگیرا لەبەرامبـەر موسـڵماناندا، بۆیـە سـەرکردە کـەیان نامـەی نـارد بۆپاشـاکەیان و وتـی: جەنابی پاشا، فریا کەوە کەسانێك هاتونەتە خاکمانەوە نازانین ئەوانە ئەهلی زەوین یان ئـەهلی ئاسمانن؟!

بەڵێ ..ئەوانە لەڕاستیدا ئەهلی ئەم سەر زەوی یە بوون بـەڵام لەسـەر مەنهـەجی ئاسـان بوون ...ئنجا موسڵمانان پێنج هەزار کەسی تر هات بۆ یارمەتیان و دوژمنانیش بوونە نزیکەی سەد هەزارێك ..

هەشت ڕۆژجەنگەکە درێژەی کێشا، (قوط)ە کان مەعنەویاتیان بـەرز بـوو تەنانـەت بـە عەرەبانـە گوریسـیان هێنـابوو گوایـە ئەسـیرە موسـڵمانەکانی پـێ ببەسـتنەوە... جەنگەکـە لەناوچـەی (شـدونە)بـوو لـەڕۆژی یـەك شـەممە ی (٢٨) ی ڕەمـەزانی سـاڵی (٩٢) کۆچـی (٧١١/٧/١٩)ی زاینـی، تـا یەکشـەمەکەی دوای تـری خایانـد، شـەڕێکی زۆر گـەرم بـوو، موسڵمانان قارەمانانـە جـەنگان و ئارامیـان گـرت تاسـەرەنجام خـوای گـەورە سـەرکەوتنی بـۆ ناردن...

موسـڵمانەکان دوانـزە هەزارکـەس بـوون، نزیکـەی سـێ‌هەزار کەسـیان لێ شـەهید بـوو لەدوژمنانیش ژمارەیەکی زۆر کوژرا.

بەم جۆرە لاپەڕەیەکی پڕشانازی و سـەروەریان بـۆ گەیانـدنی پـەیامی خـوا تۆمـار کـرد، کەبەڕاستی ئەمەش بەرپەرچی ئەو ڕیوایەتـە هەڵبەسـتراوە دەداتـەوە کـەدەڵێت گوایـە (تـاریق) کەشـتیەکانی سـوتاندووەو وتویـەتی دوژمـن لەپێشـتانەوەو دەریـاش لـە دواتانەوەیـە، تاباشـتر

بجەنگن ... هەرگیز ئەوە ڕەوشتی سەرکردەی موسڵمان نیە و ئەوەش ڕاست نیە .. ئنجا بەرەو شاری (استجه) ڕۆیشت و لەوێدا جێگیر بوو، سوپای دەنارد بۆ فەتح کردنی شارەکانی تر، بەوشێوەیە هاوکات لەگەڵ سەرکردە موسی کوڕی نوصەیر دا فەتحی زۆریان کردو لەساڵی (٩٦) ی کۆچی دا لەسەر فەرمانی خەلیفە وەلید گەڕایەوە خۆی و موسی کوڕی نصیر بۆ دیمەشق ...[١]

## بانگخوازی ئەندازیار ئەحمەد موفتی:

ئەحمەد محەمەد موفتی لە دایکبووی ساڵی (١٩٦١) و دەرچووی زانکۆی تەکنەلۆجیەو ماستەری لەزانکۆی یۆتۆبۆری هێناوە، خێزان دارەو خاوەنی (٥) منداڵەو بەرپرسی مەکتەبی ڕاگەیاندنی ئیسلامی سویدیە، بەهەردوو زاراوەی سۆرانی و بادینی و هەرسێ زمانی سویدی و ئینگلیزی و عەرەبی وانە و کۆڕو سیمناری هەیە، چالاکە لەبواری فریاگوزاری و کێشەی کورداو، بەرپرسی دەزگای بەزەیی کوردییە.

چەندین کۆبوونەوەو دانیشتنی تایبەتی بووە لەگەڵ پارتە سیاسیەکان وکەنیسەکانی سویدو دەزگاو بەرپرسە باڵاکانیان، دیداری تایبەتی هەبووە لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی پێشوی سویدی وران پێرشۆن ..

جا هەرکاتێ کەشوهەوای ئازادی لە بارو ڕەخساو بوو بۆتاکەکانی کۆمەلگەو، ئاستی هۆشیاری و ڕۆشنبیری خەڵکی بەرفراوان بوو، لەو دۆخەدا هزرو بیروباوەڕی ئیسلامی میانڕەو گەشەسەندوتر دەبێت و ڕۆڵ وکاریگەری بانگخوازانی ئیسلام لەبواری چاکسازی تاك وخێزان وکۆمەلگە زیاترڕەنگ دەداتەوەو بەرجەستە دەبێت، لەگەڵ بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی زیاتر ئەو ڕاستیە ڕوون دەبێتەوە کەئاین نەك فاکتەرێك نییە بۆ دواکەوتن، بەڵکو هۆکاری سەرەکی‌یە لە هاندانی مرۆڤ بەرەو چاکسازی و ڕەوشت وبەها جوانەکان، ئەوەتا پیاوانی حکومەت داوا لە بانگخوازان دەکەن کە ڕۆڵی پۆزەتیڤیان هەبێت لە پەروەردەکردنی تاکەکانی کۆمەڵدا، ئەمەش دەیسەلمێنێت کەبانگخوازی میانڕەو دەتوانێت سەفیرێکی دڵسۆزی کۆمەڵگابێت بۆ پڕکردنەوەی لایەنی ڕۆحی و ئەخلاقی مرۆڤەکان و بۆ بنیات نانی کۆشکی بەختەوەریان..

---

١- المجتمع ٢٠٠٧/٢/٢٤

## چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ئەحمەد موفتی دا:

*دەکرێت پێناسەیەکی کورتی ئەورێکخراوە بکەی کە جەنابتان سەرپەرشتی دەکەن؟

لەپاش سوپاس و ستایش بۆ خودای مەزن و درودوسەلام بۆ پێغەمبەری ئیسلام، ڕێکخراوی تای تای ئێف ڕێکخراوێکی بانگخوازی یاساییە لەسوید، هاوکاری ئەوخوشك و برایانە دەکات کەتازە دێنە ناو ئیسلامەوە و موسوڵمان دەبن و، کتێب و وتار بە زمانی سویدی دەستەبەردەکات بۆیان، ماوەی (١٠) ساڵ زیاترە لەسوید لەم بوارەدا خزمەت دەکەین، لەسەرەتادا تەنها مەکتەبێکی ڕاگەیاندن بوو کەزیاتر کاری وەڵامدانەوەی سویدیەکان بوو کە لەبارەی ئیسلامەوە دەیان پرسی و دەیانویست تێبگەن، زۆریان لەڕێگەی تۆڕی ئێنتەرنێت و سایتەکەمانەوە وەڵامیان وەردەگرت، ئێستاش هەموو هەفتەیەك ڕۆژانی یەکشەمە وتار و موحازەرەمان هەیە بەزمانی سویدی لەهۆڵی کۆمەڵەی قەڵاچۆکردنی کحول لەشاری یۆتۆبۆری، لەگەڵ ئەمانەشدا سەردانی زیندانیەکان دەکەین ئەمە جگەلەکاری ئەندازیاری خۆم کەهەفتانە (٤٠) کاتژمێر کاردەکەم.

* جەنابتان باسی ئەوەتان کرد کەسەردانی زیندانەکان دەکەن، ئایا لەسەرداوای بەرپرسانیحکومەتە یان کارێکیخۆتانە؟

بەڵێ لەسەرداوای لێپرسراوانی زیندانەکان و کاربەدەستانی حکومەت و زیندانیەکانیشە، بۆ ئەوەی وتار بدەین بۆ ئەو زیندانیانەی کەتوشی تاوان بوون و لە کۆمەڵگا دابڕاون و کاریگەری تاوانەکانیان لەسەر کۆمەڵگا و تاك ڕوون بکەینەوە، کە تا چەندە کاریگەری نێگەتیڤی هەیە، کاربەدەستانی حکومەت باش دەزانن کە ڕۆڵی بانگخوازێك چەندگەورەیە لەکۆمەڵگادا گەربەشێوەیەکی درووست ومیانڕەو پەروەردەی تاك بکات و، گرنگی دان بە لایەنی ڕۆحی و ئەخلاقی بۆزیندانیەکان کەناڵێکی کاریگەرە کە بتوانن بەختەوەری پێ بەدەست بێنن، وەك نیکسۆن دەڵێ: ئەگەر چی شارستانێتی لەلوتکەی بەرزدایە بەڵام ئەگەر بنەمایەکی ڕۆحی و ئەخلاقی نەبێت لەناو چوون چاوەڕوانێتی .

ئێمە ئەم خاڵە بەگرنگ دەزانین و لەسەری دەڕۆین، بۆ ئەوەی جارێکی تر بتوانن بگەڕێنەوە نێو کۆمەڵگاو ژیانی ئاسایی خۆیان دەست پێبکەنەوە، جگە لە قسەکردن و وتاردان بۆیان کتێب و کاسێت بە زمانی سویدی پێشکەشیان دەکەین، سوپاس بۆ خوا بەرهەمێکی باشی هەبووە خەڵکانێکی زۆر دەگەڕێنەوە باوەشی کۆمەڵگاو، زۆریشیان باوەڕ دێنن.

* ئەگەرێ بزانین زۆرینەی ئەوخەڵکانەی بەشداری وانەو بابەتەکانت دەبن لە چ چین و توێژێکی کۆمەڵگان؟؟

لەهەمووچین وتوێژێکی کۆمەڵگای سویدی و خەڵکانی خاوەن بڕوانامەی بەرزی هەموو بوارەکانی تێدایە و، زۆربەی ئەوانەی کەدێن شارەزایی‌یەکی ئەوتۆیان لەسەر ئیسلام نیە و بەشدار دەبن بۆئەوەی زیاتر ئەو تەم و گومانەی هەیە لەسەر ئیسلام بڕەوێنرێتەوە، تەنانەت هەندێ جار نوێنەری پارتە سیاسیەکانی سوید و پۆلیس گوێبیستی دەرسەکانمان دەبن و ئێمە دەرگامان بۆ هەمووکەس والایە، چونکە ئێمە کۆمەڵەیەکی بانگخوازی میانڕەوین، دژی توندوتیژین وفکری توندڕەوی هیچ مانایەکی نیە لامان، تاوەکو ئێستا (١١٠) کەسی سویدی بوونەتە موسڵمان لە رێگەی ڕێکخراوەکەی ئێمەوە، هەیانە هەر لە یەکەم دەرس دا باوەڕ دێنێت و هەشیانە لەپاش چەندجار یان پاش چەند ساڵ موسوڵمان دەبێت، زۆربەی ئەوانەی کە موسڵمانبوون خاوەنی بڕوانامەی بەرزن لەپرۆفیسۆرو مامۆستای زانکۆ وئەندازیار و یاساناس و قوتابی زانکۆکان و..هتد.

زۆربەشیان تەمەنیان لەنێوان (٢٠ تا ٤٠) ساڵ دایە، نموونەش وەك (بێنگت یوهانسۆن) خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لە هەندەسەی ئەلکترۆنی دا کەئێستا ئەویش بانگخوازێکی ئیسلامە لە سوید یان ماریە ئێلبرسۆن کەپزیشکی نەخۆشخانەیە لەشاری یۆتۆبۆری کەئێستا خەریکی وەرگێڕانی کتێبە بەنرخەکانی ئیسلامە بۆ زمانی سویدی، هەروەها بێنگت تۆریون کەبەڕێوەبەری بەشێکە لە کارخانەی ڤۆلڤۆ و چەندین کەسی تر کەئێستا ناوەکانیانم لەیادنیە.

هەروەها چەندین کەسی تری سویدی لەڕێگەی رابیتەی ئیسلامی سویدو تۆڕەکانی ئەنتەرنێتەوە موسڵمانبوون وەك سەفیری سویدی کەنیوت بێرنسترۆم کە ئێستا ناویخۆی ناوە محمدکەنویت کە پێش چەند ساڵێك گەورەترین و بە ناوبانگترین تەفسیری قورئانی پیرۆزی بەزمانی سویدی کرد، یان نووسەر و رۆژنامەنووسی بەناوبانگی سویدی هۆکان لارسۆن کەخاوەنی نزیکەی (٢٠)کتێبە لە بوارەکانی فەلسەفەو مێژوو کەلەم دواییەدا موسڵمانبوونی خۆی راگەیاند، هەروەها خاتوو ئانە سۆفی روالد کە مامۆستای بەشی ئاینەکانە لەزانکۆی لوند، یان پرۆفیسۆرو مامۆستای مێژوو (یان ساملسۆن) کەچەندین کتێبی بەنرخی لەسەر ئیسلام پێشکەش بەکتێبخانەی سویدی کردووە و لەزۆرێك لەزانکۆکانی سوید دەرس وموحازەراتی هەیە.

* هەندێ جار لێرەولەوێ دەڵێن ئیسلام بەزۆری شیرو هێز بڵاوبۆتەوە وەڵامت چی یە وەك بانگخوازێك بۆ ئەو جۆرە کەسانە؟

هیچ بیروباوەڕێك بەزۆرە ملێ لەناخی مرۆڤدا ناچەسپێ، چ جای ئەگەر ئەو باوەڕە باوەڕێکی ئاینی و رۆحی بێت، چەندین ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ئاماژە بەوە دەکەن کەمرۆڤەکان سەربەست و ئازادن لەوەرگرتنی ئاین و بیروباوەڕ، ئەو جۆرە کەسانە تەنها دەیانەوێت گومان دروست بکەن، وڵاتێکی وەك ئەندەنووسیا کەگەورەترین وڵاتی ئیسلامیە کە نزیکەی (٣٠٠) ملیۆن دانیشتوانێتی، خۆ یەك سەربازی ئیسلام نەگەیشتە ئەوێ، یان وڵاتێکی وەك مالیزیا کەئێستا لەتەکنەلۆجیا و بیناسازی ململانێ لەگەڵ ئەمەریکادا دەکات ئەم وڵاتەش هێزو شمشێر نەبووە هۆی موسڵمانبوونیان، یان ئەمەریکا خۆشی کەچەند ملیۆن موسڵمانی تێدایە بەهەمان شێوەیە .

سیاسەتمەدارێکی وەك رۆبرت کرین کە خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لەیاساو سیاسەتدا، راوێژکاری سەرۆکی پێشووی ئەمەریکابوو ئایاهۆی موسڵمانبوونی ئەم گەورە سیاسەتمەدارە هێز بوو؟ یان موسڵمانبوونی قەشەی گەورەی ئەمریکی جۆزیف ئەستێس کە خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لەفەلسەفەو لاهوتدا کەئێستا گەورەترین بانگخوازی ئەمەریکایە وناوی خۆی ناوە شێخ یوسف، تەنها لەیەك موحازەرەدا (١٣٥) ئەمەریکی شایەتمانی هێنا لەبەردەمیا، وەهەزارەها کەسانی خاوەن بڕوانامەی بەرز کەئێستا لە ئەمەریکا دەژین بەئیسلامەتی، خۆ هێز نەبووە هۆی هیدایەت دانیان .. یان گەورە کەسانێکی ئەورووپی وەك فەیلەسوفی فەڕەنسی روجیە گارۆدی و گۆرانی بێژی ناسراوی جیهانی کات ستیڤینس (یوسف ئیسلام)ی دایك سویدی و باوك ئینگلیز، موراد هۆفمانی دبلۆماتی ئەڵمان، ئەی خۆناکرێ بڵێین هۆکاری موسوڵمان بوونی ئەم سیاسەتمەدار و ناودارانە هێزو شمشێر بووە ..

* ئایا ئێوە لۆکاڵی تایبەتیتان هەیە بۆ وتنەوەی بابەت و وانەکان؟

بابەت و وانەکانی ئێمە هەفتانە لە لۆکاڵی(کۆمەڵەی قەڵاچۆکردنی کحول) لەشاری پۆتۆبۆریەکەئێمەش هاوکاری ئەوکۆمەڵەین بۆ ئەوەی گەنج ولاوانی کۆمەڵگا دووربخەینەوە لە زیانەکانی کحول لەڕێگەی ئەوپرنسیپ وبەهایانەی کە ئیسلام باسی دەکات، ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ زۆر جێگای تردا هەیە تەنانەت لەگەڵ کەنیسەکانیشداگفتوگۆمان هەیە، بڕیارە لەم

مانگەدا سەردانیکەنیسەیەکی گەورە بکەین بۆنەوەی باسی ئیسلام بکەین چونکە زۆریان بێئاگان لە ئیسلام .

* ڕێژەی موسوڵمانانی سویدی چەندە؟

بەپێی ئاماری چەند ساڵ لەمەوپێشی ڕۆژنامەی یۆتۆبۆری پۆست نزیکەی ١٠ هەزار سویدی موسوڵمان هەن و، ئێستا ڕێژەکە ڕوو لە زیادبوونە بەهۆی ئەوهەموو بابەتە زۆرانەی سەرتۆڕی ئەنتەرنێت لەسەرئیسلام و زۆربونی ڕێکخراوی بانگخوازی لە سوید، واتە ئیسلام بە ئاسانی دەگاتە هەموو خەڵك لەڕێگەی ئەنتەرنێتەوە.

* ئایا تەنها لێپسراوی ئەم ڕێکخراوەن یان پڕۆژەی ترتان هەیە؟

بەڵێ لێپسراوی کۆمەڵەی (ئار.ئێچ.سی)م کە دەزگایەکە بۆ یارمەتیدانی بێباوکانیکوردستان، لەکارەساتەکەی هەڵەبجەوە تاوەکو ئێستا ئێمە هەزاران و بێباوکانی کوردستانمان بیرنەچووە، کەمانگانە یارمەتیان بۆ ڕەوانە دەکەین، ئێستا نزیکەی (٣٠٠) منداڵی بێباوك یارمەتی مانگانەیان بۆ ڕەوانە دەکەین لەڕێگەی رابیتەی ئیسلامی کوردی لەکوردستان،ئەم کارەشمان بەئەرکێکی ئاینی ونیشتیمانی دەزانین.

* ئایا ئەم دوو ڕێکخراوەی ئێوە بە ڕەسمی ناسراوە لەلای حکومەت؟

بەڵێهەردووکیان رەسمیاتمان لەدەزگاکانی حکومەت بۆوەرگرتوە، بەپێی یاساو دەستوری سوید هەموو رێکخراو و کۆمەڵەیەك دەتوانن بانگەوازو چالاکی وبەرنامەی خۆیان پێشکەش بکەن.

## پەناگرتن بەخوا لە ساردبوونەوە و هاتنەدواوە!

ئەوەی سەیری گۆڕەپانی بانگەوازیکات لە رۆژهەلات و رۆژئاوا، لەکۆن و نوێدا، کەسانێك دەبینێت کە بۆماوەیەك لە تەمەنیان گورجوگۆڵ وخەم هەڵگری بانگەوازبوون، ڕۆح سوك، لەش سوك، قسەخۆش، دڵخۆش، سنگ فراوان، گەشبین، بەڵام لە بەر هەرهۆیەك بێت، هەقە یان ناهەقە، دێنە دواوەو ساحەکە چۆڵ دەکەن و بەزمانی حاڵ دەڵێن: ئەوە ساحەکەم بۆچۆڵ کردن، ئەوەندەم بەسە کە کردومە، رۆژێ بوو لەئێوە چالاکتربووم، لەئێوەمانان باشتربووم، خۆتان ماندوو مەکەن ئێوەش دوایی وەك من لەشتەکان تێدەگەن و ئێوەش هەردەبێ کۆڵ بدەن و ساحەکە بەجێ بهێڵن ....

ئەوانــە هــەمووگیانیان دەبێتەگلـەیی وگازنـدەو ڕەخنــە، چ ڕەخنەیـەك!؟ ڕەخنــە لــە سەرتاخوار، لەقیادە تاقاعیدە، خۆكاری دەعەویش ئیجتیهاداتی تێدەكەوێت، ئەمیش دوورە لە سـاحەكەو ئاگـای لەگشت لایەنـەكانی كێشـەكان نیـە، بۆیـە خـۆی لـە هـەمووان بـەزاناترو، ئیجتیهادی خۆشی لە هی هەموان بەباشتر دەزانێت!

هی واهەیەكۆڕو مەجلیس نیە زەمی ئەم وئەو نەكات، یا خەڵكی ساردنەكاتەوە لـەكاری بەكۆمەڵ و دەستەجەمعی، كەسانی تـریش هـەن ئەگـەروەرع و تەقواكەشـیان ڕێ نـەدات كـاری وابكەن، ئەوا بەدوركەوتنەوەیان دەبنە سـەرمەشقێكی خراپ بۆ لاوو تازەپێگەیشتوان و كەسانی دەوروبەریان!..

ئەم جۆرە كسانە كەم تازۆر بوون و هەردەشبن، كەسانی واهەبوون ڕەخنەی بێ جێیان لەپێغەمبەر دەگرت ﷺ، كاتێك كابرایەكی ئەعرابی وتی: تۆ دادپەروەرنیت لە بەخشینتا!! یان یەكێكی تر وتی: لەوماڵەی خوام بدەرێ خۆماڵی باوكت نیە؟! پێغەمبەریش ﷺ دڵی خۆی بەوە ئەدایەوە كەئەمە (سُنن)ەو یاساو باوی خوایە لە بانگەوازداو دەیفەرموو: خوا ڕەحم بە موسای برام بكات لەمەش زیاتر ئازاردراوە، تەنانەت كارگەیشتە ئەوەی هەندێ دووڕوو ئیتیهامی پێغەمبەریان كرد ﷺ كە لە دەسكەوتی غەزای بەدری لادابێ بۆ خۆی، قورئان لەسـەری دێتە وەلام و دەفەرموێت ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ آل عمران: ١٦١ واتە: بۆهیچ پێغەمبەرێك نەبووە كەنادادی و خیانەت بكات، هەركەس نادادی بكات، لەرۆژی قیامەت دا نادادیەكەی یەخەی پێدەگرێت و بەكۆڵیەوەیەتی، لەوەودوا پاداشتی هەركەسێك بەگوێرەی كردەوەكانی دەدرێتەوەو ئەوانە ستەمیان لێناكرێت... هەندێكی تر لەوانەی دڵیان نەخۆش بوو، هەر بەڵاو ناخۆشی و ناڕەحەتیەك یان شكستێك ببوایە دەیان كرد بەخەتای پێغەمبەرﷺ قورئان لەسەر ئەمەش هاتە وەلام و فەرمووی: ﴿ أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِ اللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ اللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰؤُلَاءِ الْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴾ النساء: ٧٨. واتە: ئەگەر خێرو خۆشیان بێتە ڕێ دەڵێن: ئەمە لەلایەن خواوەیەو ئەگەر توشی ناخۆشی و زیانێك بێن بەپێغەمبەر دەڵێن ئەمەیان بەهۆی

تۆوەیە، پێیان بڵێ: هەر هەموو ئەوانەی پێش دێت لەلایەن خواوەیەو بۆ تاقیکردنەوەیە، ئەوەبۆچی ئەو خەڵکە باوەڕ لاوازە هیچ شتێك تێناگەن و لە ڕاستیەکان حاڵی نابن..

ئەوەی ماوە بیڵێین ئەوەیە کەساردیو گەرمی لەکاردا ئاسایی یە بەمەرجێك کەلەو سنووره دەرنەچێت کەلەسوننەت دا دیاری کراوە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (لکل عمل شرّة ولكل شرّة فترة، فمن كان شرته (او فترته) الى سنتي فقد اهتدى)..

دیارە دڵیش بەردەوام لە (تقلب) و گۆڕاندایە، بۆیە بادوعا بکەین کە خوادڵمان دامەزراوبکات (اللهم يامقلب القلوب ثبت قلوبنا على دينك).. ئنجا ئەگەر ناڕوونییەك و لێڵیەکیش هەبوو لە مەسەلەیەکدا ئاساییە کە لەڕێی ڕاست و لەڕێی خۆیەوە بەحەکیمانە چارە سەربکرێت، ئەوەئەنصارەکان کە گلەییان هەبوو لەپێدانی دەستکەوتەکانی حونەین بەکۆچکەران و کەسانی ترو نەدانی بەوان، گەورەی ئەنصارەکان گلەییەکەی گەیاندو، هەروەك لەژیانامەی پێغەمبەر دا هاتووە، بەحەکیمانە پێغەمبەر ﷺ بۆی شیکردنەوەو دڵی هێنانەوە جێ و ڕازی کردن ...

بەخۆداچوونەوە و نەهاتنە دواوەکاری بەردەوامی دەوێ و لەپێش هەموو شتێکیشدا پاڕانەوەی بەکوڵ و دڵی دەوێت، هەروەك پێغەمبەر ﷺ کەدەپاڕایەوە لەکاتی سەفەردا و دەیفەرموو (اللهم انى اعوذ بك من الحور بعد الكون) واتە خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی کە پاش هەوڵ و کۆشش و تێکۆشان بێمە دواوە و سارد ببمەوە ...

## هیممەتی نورالدین زنکی:

زانایان یەك ڕان لەسەرئەوەی کەخولەفای ڕاشیدین چوارن، دواتر عومەری کوڕی عبدالعزیزیشی بۆزیادکرا کە لەسەر پەیڕەوو ڕێبازی ئەوان حکومەتداری کرد، ئنجا پاش چەند سەدەیەك قارەمانێکی تریش هاتە مەیدان کە سیماو سیفاتی لەوان دەچوو، وەك ئەوان ڕەفتاری دەکرد، ئەویش نورالدین زنکی بوو، کە زۆر لەزانایان بەخەلیفەی راشیدی شەشەمی دادەنێن. ئەم پیاوە شورایەکی پۆڵایین بوو لەبەردەم خاچپەرستانداو ڕێخۆشکەربوو بۆفەتح کردنەوەی قودس و گێڕانەوەی بۆژێر ڕکێفی ئیسلام ....

هەرکاتێك نورالدین لەجەنگێکدا سەرکەوتایە بەسەر خاچپەرستاندا نوێژی شوکری دەکرد بۆ خواو خێرو سەدەقەی زۆری دەبەخشیەوەو لەگەڵ زانایاندا دادەنیشت وگوێی لەئامۆژگاریان دەگرت، هەمیشەش دەیووت: سەرکەوتنی خوا نزیکە و هەردێت.

جارێك پاش جەنگی (حارم) بەدەوروبەرەکەی وت: سوپاس بۆ خوا لەقودس نزیك بووینەتەوە و پشت بەخوا دەچینە ناوی و نوێژی تیادەکەین، ئنجا پاش بێدەنگیەکی کەم، بەخەم و خەفەتی زۆرەوە بەئامادەبوانی وت: بەڵام دوانگەکە نەماوەو دوژمنان تێکیان شکاندووە، بۆیە بادوانگەیەك ئامادە بکەین کە لایەق بێت بەورۆژە گەورەیە، تا وتاربێژمان لەسەری وتاری سەرکەوتن بداو هەروەك چۆن دڵان دێنێتە جۆش و خرۆش ئاوەهاش دارو دیوار بێنێتە جۆش وخرۆش .. ئنجا باشترین ئەندازیاری ئەو زەمانەی بانگ کرد، وەك (حمید الدین کوڕی ظافری حەلەبی و سولەیمانی کوڕی معالی) و داوای لێکردن کەدوانگەیەکی ڕازاوە بەدوڕو مرواری دروست بکەن لە چاکترین داروتەختە کە لەوێنەی نەبێت وکەس نەدیدە بێت.

لەساڵی (٥٦٣) کۆچی بەرامبەر بە (١١٦٧) زاینی لەشاری حەلەب لەسوریا دەست کرا بە دروستکردنی ئەو دوانگەیە، لەساڵی (٥٦٤)کۆچیدا دا نورالدین کۆچی دوایی کرد و لەسەرەمەرگدا جەختی کردەوە سەردروستکردن وتەواوکردنی دوانگەی سەرکەوتن، پاش چەند ساڵێك تەواو بوو، (صلاح الدین)یش کە فەتحی قودسی کرد ناردی دوانگەکەیان هێناو لەقودسی پیرۆزدا دایان ناو وتاری سەرکەوتنی لەسەردرا ...

ئەم دوانگەیە مایەوە وەك ڕەمزی سەرکەوتن بۆ چەند سەدەیەك، تا لە بەیانی ڕۆژی٥ شەمە لە٧ ی جمادی دووەم (١٣٨٩) بەرامبەر بە (١٩٦٩/٨/٢١) لەسەر دەستی جوولەکەیەکدا سوتێنرا، هەندێ لەو پارچانەی کە ڕزگارکرا لەسوتان لە مەتحەفی ئیسلامی لە مزگەوتی ئەقسادا هەڵگیرا .....

ئەم دوانگەیە پێك هاتبوو لە شانزە هەزار و پێنج سەد پارچە و بەرزیەکەی شەش مەتر و پانیەکەی چوارمەتر بوو ...

مەلیك حوسەین لەساڵی (١٩٩٣) دا بڕیاری دا ئەو دوانگەیە بە هەمان شێوەی خۆی دروست بکرێتەوە لەسەرئەو وێنانەی کە لە مۆزەخانەی ئەمریکاو لەندەن دا هەبوون، ئەم کارە تا ساڵی (٢٠٠٢)ی خایاند و دووملیۆن و چوار سەدهەزار دیناری تێچوو، چل لێکۆڵەرو ئەندازیاری جیهانی ئیسلامی بەشداریان تیا کرد ..

ئەم دوانگەیە پاش سی وحەوت ساڵ لەسووتاندنی دروستکرایەوە و خرایەوە جێی خۆی، ماوەتەوەبڵێین ئاخۆکەی بێت وتاریێژێك لەسەری وتاری سەرکەوتن بداتەوەوگیانی نورالدین وصلاح الدینی پێ شادبێت وقودس لەبەندی ئازاد بکرێت؟

## کاتێك سوار دەگلێت !!

کەس گومانی لەوەدانیە کەبانگخوازیش بەشەرە وەك هەموو بەشەرەکانی تر، غەفلەت و بیرچوون ڕووی تێدەکات، کەئەمەش هەر لەئادەمەوە سەلامی خوای لێبێت هەیە ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴾ طه: ١١٥ هەروەها پێغەمبەرﷺ لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (کل بني ادم خطاء وخيرُ الخطائين التوابون)[١].

حەنزەڵە ڕۆژێك دەگریا، ئەبوبەکر پرسی لەهۆی گریانەکەی؟! ئەویش وتی: کاتێ لای پێغەمبەر ﷺ دەبین دەگەینە دواپلەی ئیمانی و کە دەگەڕێینەوە ناودنیاو ماڵ ومناڵ زۆر دائەبەزین، ئەبوبەکریش وتی: منیش هەروام بابچینە لای پێغەمبەرﷺ، کەچوونەلای و بۆیان باسکرد، فەرمووی: (بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەی لای من و لەسەر ئەو زیکرو هۆشیاری یە بەردەوام بن، مەلائیکەتەکان تەوقەتان لەگەڵ دەکەن لەجێ و ڕێتان دا، بەڵام دیارە ئەوە سیفەتی بەشەر نیە، بۆیە سەعاتێك لەوبەرزی یەو سەعاتێك لەو نزمیەدا دێن و دەچن (ولكن يا حنظلة ساعة وساعة ثلاث مرات)[٢].

دیارە بانگخوازانی ئەمڕۆ لە هاوەڵان چاکتر نین، کە تووشیگوناهو هەڵە بوون و تەوبەیان کردووە،تەنانەت ئەوئافرەتەی کە تووشی زینا بوو ڕەجمکراو هەندێ لە هاوەڵان قسەیان پێ وت، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموون: (لقد تابت توبة لو قسمت بين سبعين من أهل المدينة لوسعتهم، وهل وجدت توبة أفضل من أن جادت بنفسها لله تعالى؟)[٣]

گوناهکردنی بانگخواز هەرچۆنێ بێت ئاسایی‌یە، چونکە گوناهکردن سیفەتی مرۆڤە، بەڵام ئەوە ئاسایی نییە کەزوو پەشیمان نەبێتەوەو تەوبە نەکات.

---

١- رواه أحمد .

٢- مسلم.

٣- مسلم.

قورئان باسی سیفاتی پارێزکار دەکات، کەئەگەر تووشی گوناهو فاحیشە و زوڵمی نەفس بوو زوو یادەوەری وەردەگرێ ودێتەوە سەرخەت وتەوبەدەکات وسوورنیە لەسەرگوناه، کەئەمەش کارێکی مەزن و گرنگە و بەهەشتی پێ وەردەگرێ ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ آل عمران: ١٣، لە فەرموودەیەکی تریشدا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (والذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم، وجاء بقوم يذنبون، فيستغفرون الله تعالى، فيغفر لهم)[1].

## جا گوناهکارانیش دوو جۆرن:

یەکەم: ئەوکەسانەیەکە بەعەمدی گوناه دەکەن وسوورن لەسەریو لەبەرچاوی خەڵکیش خۆیان بەباش پیشان دەدەن، کەئەمانەش لەم فەرمودەیەداباسکراون (لأعلمن أقواما من أمـتي، يأتون يوم القيامة بحسنات أمثال جبال تهامة بيضاء، فيجعلها الله هباء منثورا، أما إنهم إخوانكم ومن جلدتكم، ويأخذون من الليل كما تأخذون، ولكنهم قوم اذا خلوا بمحارم الله انتهكوها)[2]. ئەمانەش ئەم ئایەتە دەیانگرێتەوە﴿ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾ البقرة: ٩ دووەم: ئەو کەسانەیە کە سوورنین لەسەر گوناهکردن و، هەرزوو تەوبە دەکەن، گوناهەکە وەك کێوێکە بەسەر دڵ و دەروونیانەوەو هەمیشە هەست بە پەشیمانی و شەرمەزاری دەکەن لە خزمەت خوای خۆیانداو بەردەوامیش لۆمەی خۆیان دەکەن.

پێویستە لە سەر بڕوادار کەلەدوای گوناهکردن:

١- هەوڵبدات زوو تەوبە بکات، کەبەمەش گوناهەکەدەسڕدرێتەوەو بۆی دەبێت بەچاکە

﴿ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴾ الفرقان: ٧١

٢- گوناه بەکەم نەزانێ، هەرچەندە بچوك وکەمیش بێت، هەروەك عبداللە کوڕی مسعود دەڵێت: بڕوادار گوناهی وادەبینێ هەروەك لەژێر چیایەك دا بێت وبترسێت بڕوخێ بەسەریا، فاجیریش گوناهیهەروەك مێشێك دەبینێ بەلای لوتیا بڕوا.

---

١- مسلم.

٢- (ابن ماجه) ئیسنادی صەحیحە.

٣- بەسیترو پەردە پۆشکردن و حیلمی خوا لە خۆی بایی نەبیّ .

٤- دەبیّت لەبەر چاوی خەلّك گوناه نەکات و ببیّت بەفیتنە بۆ خەلّك، هەروەك ابن عباس دەلّیّت: وەیل بۆزانایان گوناهیّك دەکەن و دەخلیسکیّن لە بەر چاوی خەلّکی، هەرچەند بگەڕیّنەوەو تەوبەش بکەن، کاتیّك بەخۆیان دەزانن بونەتە فیتنە بۆخەلّکانیّکی زۆرو، بەزۆر شویّندا بلاّوبۆتەوە، هەرلەبەر ئەوەشە کەخوای گەورە سزای چەند قاتی بۆ هاوسەرانی پیّغەمبەر ﷺ داناوە ئەگەر خراپەیەك بکەن و هەروەها پاداشتی چەند قاتی بۆ داناون ئەگەر پاریّزکارین، چونکە خەلّکانیّکی زۆر بەسەرمەشق و پیّشەوایان دادەنیّن و چاویان لیّ دەکەن هەروەك دەفەرموێ: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا﴾ الأحزاب: ٣٠

٥- جاری وا هەیە بانگخواز باسی کەم و کورتی گوناهی خۆی دەکات وادەزانیّت ئەمە خۆ بەکەم زانین و تەوازوعە، کە ئەمەش پیّغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە (كل امتي معافى الا المجاهرين وان من المجاهرة أن يعمل الرجل بالليل عملا ثم يُصبح وقد ستره الله عليه، فيقول يا فلان، عملت البارحة كذا وكذا، وقد بات يستره ربه، ويُصبح يكشف ستر الله عنه)[1].

جا ئەوانەی کە پەشیمانن لە گوناهیان و خۆیان ستر دەکەن، خوای گەورە لە دنیاو قیامەتدا ستریان دەکات هەروەك پیّغەمبەر ﷺ دەفەرمویّت (ان الله يُدني المؤمن فيضع كنفه ويستره، فيقول: أتعرف ذنب كذا وكذا؟ فيقول: نعم أي رب، حتى اذا قرره بذنوبه ورأى في نفسه أنه هلك، قال سترتها عليك في الدنيا، وأنا أغفرها لك اليوم، فيُعطى كتاب حسناته)[2]

٦- ئەبیّ بانگخواز هۆکارەکانی چوون بەرەو گوناه بزانیّ وهەولّ بدات لیّی دوور بکەویّتەوە و دەرگا بۆ شەیتان نەکاتەوە .

٧- ئەبیّ هەمیشە ورەی بەرز بیّ و هەرگیز نەهیّلیّ ورەی بڕوخیّ، ڕاستە بانگخوازە بەلاّم خۆمەعسووم نیە ،زۆر ڕاستە کەوتراوە: هەموو ئەسپیّك گلانیّکی هەیە و هەموو زانایەك زەللەیەکی هەیە، دیارە شەیتان لەفرسەت دەگەڕیّ بۆ خلیسکانی بانگخواز و زانایان، ئەگەر ئەوان لەخشتە نەبات ئەی کیّ لەخشتەبەریّ؟

---

١- بخاري.

٢- بخاري.

لە کۆتایدا باهەروەك پێغەمبەر ﷺ دوعا بکە یـن کەدەفـەرموێت (اللهم اجعلني في عيني صغيرا وفي أعين الناس كبيرا)

پەروەردگارا لەبەرچاوی خۆم بچوکم بکـە تازیـاتر هەوڵبـدەم و لەبـەر چـاوی خـەڵکیش گەورەم بکە تاببمە سەرمەشق بۆیان.

## هەڵوێستی مەردانە :

ڕۆژان دێن ودەڕۆن وئەم ئاینەش هەمیشە گەردن کەش وجێگیرە بە هۆی ئەو وەعدەی‌کـە خوا داوێتی بۆ پاراستنی ئەم دینە، کە بەشێکی لەوەدا دێتە دی کە هەردەم پیاوانێك دەنێرێت کـە بـەرگری لێ بکـەن و لەلۆمـەی لۆمـەکار نەترسـن. هـاوەڵان لەسـەرەتاوەو پاشـان شـاگردان وقوتابیانی قوتابخانە ناوەدانەکـەی محمدﷺ وەك (العز بن عبدالسلام) و (سـعیدی کـوڕی جـبیر) و( ئیمام ئەحمەد)و(ئیبن تەیمیە) هەمیشە سەرمەشق ومامۆستان بۆمەشخەڵدارانی ئـەم ڕێبـازە پیرۆزە، کاروانەکەش بەردەوامەو، ئەمەش چەند نمونەیەکی تر:

١- قەشە (فندر) خۆی بە لێهاتوترین کەس دەزانی لەبواری بەگاورکردن و دروسـتکردنی گومان لە ئیسلامدا، عەرەبی و فارسـی بەچـاکی دەزانـی، ژەهـری خـۆی لـە هـەموو شـوێنێك دەڕشت ..موسوڵمانان ترسان لە بـەرپابوونی فیتنەیەکی‌گـەورە، تـا زانـای پایەبـەرز (رحمة الله کوڕی خلیل الرحمان) داوای مونازەرەی ئاشکرای لێکرد لە بەرچاوی خەڵکدا، بـە ناچـاری قایـل بووکە ئامادەبێت لە شاری (ئەکبەر ئاباد) لەمانگی ڕەجەبی ساڵی (١٢٧٠)کۆچی‌دا واتە سەدو پە نجاو هەشت ساڵێك پێش ئێستا، شێخ رەحمـەتو اللە تـوانی لـە مونازەرەکـەدا سـەربکەوێ بەسـەر قەشەی ناوبراودا، مونازەرەکەش لە پـەڕاوی (إظهار الحق) داتۆمـاری کـردووەو بەمـەش هەیبەتی ئەو ناحەزە نەماو پروپاگەندە و گومانەکانی ڕەوانەوە ..

٢- لە ساڵی (١٨٩١) ی زاینیـدا شـێخ عبـدالوهاب النجـار هێشـتا قوتـابی بـوو لـە مزگەوتی‌ئەحمەدی، کە لە گنگا لەمیسر قەشەیەکی پرۆتستانتی فیتنەی نایەوە بەبڵاوکردنەوەی شوبوهات ودژایەتی ئیسلام، شێخ عبدالوهابی قوتابی‌کەوتە وەڵام دانەوەی ومونازەرە لەگەڵیدا، ئەمەش لەقاهیرە و لە بەریتانیا باس و قسەی مەجلیس و گۆڤار و ڕۆژنامەکان بوو، دەیـان وت گوایە (دەمارگیری ئاینی) هەیە لە میسردا، بەڕاستی سـەیرە ئەوانـە هەرچـی بکـەن قەیناکـە

(تەسامحی ئاینی) یە، بەلام ئەگەرموسلمانان بەرامبەریان بوەستنەوە ئەیخەنە قالبی (دەمارگیری ئاینی)یەوە، دیارەئەمەش بانێکەو دووهەوا..

لوردکرومر(بەعسەی ئینگلیزی) هێنایە میسر بۆ بەگاورکردنی خەڵکی لەژێر دەسەڵات وفەرمانڕەوایی ئینگلیزدا، شێخ عبدالوهاب دەچووەلایان وموناقەشەی لەگەڵ دەکردن، کەبەمەش بەڕاستی دەبێتە یەکەم مژدەدەر بە ئاینی ئیسلام لەناو قەشەکاندا، تاوای لێهات لای میری شکاتیان لێکردو، بە فەرمانی میری پۆلیس نەیاندەهێشت شێخ عبدالوهاب بچێتە ئەوکۆڕو کۆمەڵانەی کەئەوان کاری تەبشیریان تیادەکرد، بەلام ئەم هەرکۆڵی نەداو خەڵکی کۆدەکردەوەو بانگی‌دەکردن بۆ ئیسلام و،بەرپەرچی ئەوناحەزانەی ئەدایەوە .. دائیرەی‌مەعاریف کە زانی شێخ عبدالوهاب کە ئەوکاتە ببوە مودەڕیس بەرنامەی قەشەکان تێك ئەدات دووریان خستەوە بۆ شاری (اسوان)، ئەمەش وای لە شێخ عبدالوهاب کرد کە دەست بکێشێتەوە لە مامۆستایی، تا بەکاری ئازادەوە خەریك بێ و هیچ شتێك نەبێتە ڕێگر لەرێی‌دا بۆخزمەتی ئیسلام کە دوا بەرنامەی خوایە بۆبەشەریەت ..

٣- لەساڵی(١٩٣٣)دا (شێخ محمدجمیل العقاد)کە خەڵکی شاری حەڵەبی سوریایە ومامۆستا بوولەزانکۆی ئەزهەر، وەزیری ناوخۆی ئەوکاتەی میسر بانگی کردکە کۆمەڵێك قیبتی لابوو، قیبتیەکان داوایان لەوەزیرکردبوو کە لە میسر دەری بکات گوایە منالەکانیان لە مەسیحییەت هەڵدەگێڕێتەوە، مامۆستاش بەوەزیری وت: جەنابی‌وەزیر لێیان بپرسە، ئاخۆمن منالەکانیانم بەپارە، یابەئافرەت، یا بە هەڕەشەکردن هەڵگێڕاوەتەوە، ئایا من سیحرم لێکردون؟ کە لە وەڵامدا وتیان: نەخێر، ئەویش وتی: باشە خۆ ئەوان هەموو ئەوهۆکارانە بەکاردێنن بۆ بەگاورکردنی خەڵك؟! بەم جۆرە شێخ گوێی پێ نەدان وبەردەوام بوو لە خزمەتی بەرنامەی‌خوادا.

جاکاتێك شێخ محمد چوو بۆ مەککە و لە حەرەمی مەککی‌دا وانەی وتەوە، پیاوێك هەستاو کەوتە پارەکۆکردنەوە لەئامادەبوان، شێخ محمد پێی وت: دانیشە، وتی: قوربان پارە بۆ تۆ کۆدەکەینەوە، شێخ تووڕە بوو، مەحفەزەی پارەکانی دەرهێناو پارەکانی هەڵڕشت لەبەردەم ئامادەبواندا‌و وتی: ئێمە هاتوینەتە ئێرە پارە بدەین نەك پارە وەرگرین..

٤- شێخ مستەفا المراغي لە لوتکەی زانست و عیززەتدا بوو، وەك زانایەکی بەرزی ئەزهەر هەڵوێستی جوانی هەبوو، لەبارەی جەنگی جیهانی دووەم پرسیاری لێکرا، ئەویش وتی:

ئەوە جەنگێکە هیچ پەیوەندی بە موسڵمانانەوە نیە، بەمە بەریتانیا تۆقی، ترسا کە ڕێڕەوی جەنگەکە بەم فتوایانە بگۆڕدرێت، بۆیە داوایان لەسەرۆك وەزیران (حسين سرى پاشا) کرد، کە شێخ ئەگاداربکاتەوە.. سەرۆك وەزیرانیش پەیوەندی پێوەکردو داوای لێکرد هیچ تەصریحێك نەدات تا ئەمی لێ ئاگادارنەکات، شێخیش وەڵامی‌دایەوەو وتی: تۆ چیت تاموراجەعەی قسەی من بکەی بەیەك وتار لە سەر مینبەری مزگەوتی (الحسين) یان (الأزهر) لە دەسەڵاتت ئەخەم.[1]

## کوردێکی مەرد :

شێخ نوری پیاوێکی کوردی تەمەن چل ساڵی خەڵکی سوریابوو، چێشتخانەیەکی هەبوو لە ناوچەی (قساطل) لە دێ یەکی لازقیە، لەگەڵ چەند لاوێکی‌خزمیدا شەووڕۆژ خزمەتی گەشتیارانیان دەکرد. ئەم پیاوە پیاوێکی سادەی خۆش مەشرەب بوو، خوا و پێغەمبەری خۆش دەویست، لە لایەکی چێشخانەکەیدا شوێنێکی تایبەتی دانابوو بۆ نوێژو لە واجیهەی چێشخانەکەشیدا لافیتەیەکی هەڵواسیبوو کە لە سەری نووسرابوو ﴿إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ﴾ مائدة: ٩٠، وەك ئاماژەیەك کە کەس ڕێی نادرێت لە چێشتخانەکەدا توخنی حەرام بکەوێت.

ڕۆژێکی نیوەڕۆی گەرم جێگری سەرۆك کۆماری عەرەبی یەکگرتووی ئەوسا (سوریاو میسر) ئەسعەد کریم کە مەی خۆرێکی عەجایب بوو بەخۆیو پاسەوانەکانیەوەو، بەکۆمەڵێ سەیارەی ئاخرمۆدێلەوە لەچێشتخانەکەی شێخ نوری لائەدەن، پاش ئەوەی ئەسعەد کەریم پشوویەك دەدات، شێخ نوری بەئەدەبەوە دێتەخزمەتیان کەچی دەفەرمون بۆیان ئامادەبکات، پاش تاوتوێکردنێك لەسەر خواردنەکان لەنێوان خۆیاندا سکرتێری ئەسعە کەریم کەناوی (فەهمی ئەفەندی) بوو وتی: برژاومان بۆبێنە لەگەڵ ساردیو مەزەو ویسکی، شێخ نوری لێی نزیك بووەوە بەدەنگێك کە جێگری سەرۆکیش گوێی لێبێ وتی: فەرمانتان بەجێیە قوربان تەنها...

فەهمی ئەفەندی بەدەنگی بەرز: تەنها چی؟!

شێخ نوری: ببورە قوربان تەنها مەی، ئێمە نیمانە...

---

[1] Saaid.net .

فەهمی ئەفەندی بە دەنگی بەرز وتی: شێخ نوری تێم نەگەیت، دەبری حاڵی خۆت بکە!
شێخ نوری: چی دەبرکەم؟! ئەوەمان لانیە، ئەوادەچم بەلای کارمەوە.

شێخ نوری بەئەدەبەوە ڕۆی بۆ ئامادەکردنی برژاوەکە، پاش تۆزێك برازایەکی بەچرپە پێی وت: ئەوە میوانەکان لەسەیارەکانی‌خۆیان ویسکیان داگرت و لەسەر مێزەکان دایان ناوە چاوەڕێی برژاودەکەن!! شێخ نوری بەپەلە هاتەلای فەهمی‌یە فەنی و وتی: پێمان وتن مەیمان نیە و ڕێش نادەین لەچێشتخانەکەماندا مەی بخورێتەوە. فەهمیە فەنی پەلی گرت و بردیە لاوەو پێی وت: تۆ ئەزانی لەگەڵ کێ قسەدەکەیت؟ وتی: بەڵێ دەزانم (ئەسعەدکریم)ە... وتی: تۆ دەزانیت جێگری سەرۆك کۆمارەو قسەی یەکەو نابێ بەدوو، ئنجا خۆ (مەی)یش ڕێپێدراوە لەسەرتاسەری وڵاتدا، شێخ نوری وتی: من بەلامەوە گرنگ نیە، ڕێپێدراوە یان نا، من تەعلیماتی خۆم لە (رب العالمین)ە و وەردەگرم، ئنجا نیشارەتی کرد بۆ لافیتەکە کە بە واجیهەی چێشتخانەکەدا هەڵواسرابوو: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾المائدة: ٩٠

فەهمی وتی: بەقسەم بکە، من دڵسۆزتم، بێ ئەقڵی وامەکە.

شێخ نوری وتی: من سورم لەسەر قسەی خۆم!

فەهمی وتی: تۆ بەر پرسیار دەبی ئەگەر سوربی لەسەر مەوقیفەکەت!

شێخ نوری وتی: ئامادەم چی دەبێ بابێ.

فەهمیە فەنی گەڕایەوە لای جێگری سەرۆك و بەچرپە ئەسعەد کەریمی تێگەیاند، پاش تۆزێ ناوبراو بەتوڕەیی هەستاو نیشارەتی کرد بۆ دەست و پێوەندەکەی کە هەستن بڕۆن، لەچەند خولەکێکدا بە خۆیان و چەکەکانیانەوە چوونەوە ناو سەیارەکانیان و ڕۆیشتن ...

ڕەنگبە لای زۆر کەس ئەمە فرسەت بوایە بۆ ماستاوکردن و پێشکەشکردنی داواکاریەکانی ناوچەکەو خۆبردنە پێشەوە!

بەڵام ئیمان و ئیسلامەتی‌و، ئەبەردی و شەهامەت و دینداری وا ناڵێت!

ئیمانی شێخ نوری سەرکەوت، چونکە نایەوێت ماڵی خۆی حەرام بکات، ئێستاش چێشتخانەکە ماوەو خەڵکی لێی لا ئەدەن و نان دەخۆن و پشوو ئەدەن و نوێژی خۆیان دەکەن، لەم لاشەوە دەورو زەمانێك هات و جێگری سەرۆك لەسەر کارەکەی لابراو ئەفی کرا، لەوڵاتێکی

عـەرەبی دراوسـێ کۆچـی دوای کـرد و تەنانـەت ڕێ نـەدرا تەرمەکـەی بهێنرێتـەوە خـاکی نیشتمانەکەی وتەنها چەند کەسێکی کەمی خزم و کەسـی لەگـەڵ تەرمەکـەی بـوون لـەرۆژێکی بارانی ساردوسـەرمـادا.[1]

## شـەهیدێك لـەنـەیجیریا :

حاجی احمد بلولو لەمناڵی دا لە قوتابخانە ئیسلامیەکانەوە فێـری خوێنـدن بـوو، پاشـان چووە قوتابخانەی سەرەتایی بەریتانی و دواتر چووە کۆلێژی مامۆستایان لـە (کاتشـینا)، ئنجـا چوو بۆ بەریتانیا لە ساڵی (١٩٤٨) دا و پسپۆڕی پەیدا کرد لە خۆجێیەتی (حوکمی محـلی)دا، کە گەڕایەوە نەیجیریا بووە ئەندام لە مەجلیسی تەشریعی داو دواتر بووە وەزیری حـوکمی محـلی لەساڵی (١٩٥٣) داو، پاشان بووە سەرۆك وەزیری ئیقلیمی باکوری نـەیجیریا کاتێـك کـەحوکمی زاتی وەرگرت لەساڵی (١٩٥٤) دا ..

ناوبراو باوك وباپیریشی تێکۆشەرو خەمخۆری ئیسلام بوون، حاجی ئەحمەد دەسـەڵاتی خـۆی بەکارهێنا بۆ خزمەتی ئیسلام و توانی نیو ملیۆن کەس موسوڵمان بکات و هەندێ سەرچـاوەش دەڵێن کە چوار ملیۆن کەسی موسڵمان کردووە، ئەمەش خەوو خۆراکی لەدوژمنانی ئیسلام تاڵ کـرد، بۆیـە کۆمـەڵێك چـەکدار بەسـەرکردایەتی ژەنراڵـی مەسـیحی لـەهۆزی (ئیبـۆ) چـوونە سەرماڵەکەی و شەهیدیان کرد لە (١٥)ی ینایری ساڵی (١٩٦٦)دا.

شایانی باسە ناوبراو لەدامەزرێنەرانی رابیتەی عالەمی ئیسلامین و لەسەر ئاستی نـاوخۆ و جیهـان کەسـایەتیەکی ئیسـلامی گـەورەبوو کەدەسـەڵات و حـوکم نـەی تـوانی بانگەوازوئیسلامەتی بیر بەرێتەوە وشەهید بوو لەپێناویدا .

## نەبیلە لۆبیزی بانگخواز :

هەندێ کەس باری بانگەواز هەڵدەگرن و هەندێ کەسیش بارن بەسەر بانگەوازەوە، لەم دەستەی یەکەمە کەژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ بانگخوازی و خزمەت بەئیسلام دکتۆرە نەبیلە لۆبیزە کە سەرۆکی مەجلیسی جیهانی زانایانی ئافرەتانی مسوڵمانە.

لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ سایتی ئیسلام ئۆن لاین دا دەڵێت: ناوم نەبیلە لۆبیز محمدە و لە ساڵی (١٩٤٢) لە قاهیرە لە دایك بووم، کۆلێژی ئادابی زانکۆی قاهیرەم لەساڵی (١٩٦٣) دا

---

١- (گۆڤاری المجتمع ٢٠٠٦/١٢/١٦).

تەواوکرد، لەهەمان ساڵدا شوم کرد بەلاوێکی ئەندەنوسی ناسراوی خێزانەکەم کەناوی برهان الدین عمر لوبیێزە، من هەرگیز لە خەیاڵمدا نەبوو شوو بەکەسێکی دەرەوەی میصر بکەم بەلاّم دیارە قەدەری خوا بوو، ساڵ و نیوێك لەقاهیرە ماینەوە و دوایی کە وەزیری کاروباری ئاینی ئەندۆنیسی هاتە قاهیرەو ئیمەی ناسی داوای لێکردم لەسەر حیسابی حکومەت بچمە ئەندۆنیسیا و کتێبخانەی زانکۆی (شریف هیدایەتو اللەی ئیسلامی حکومی) دامەزرێنم، لەساڵی (١٩٦٤) دا چومە ئەو وڵاتە..

خوا چەند منداڵێکی پێبەخشیم کەیەکەمیان کچە گەورەکەمە (ئەمانی) کەئێستا مامۆستای زانکۆیەو (ئیلهام)ی کچیشم دەرچووی زانکۆیە لەوەزارەتی کاروباری ئاینی ئەندۆنیسیا کاردەکاو، (عمر)یش لەبەشی ئابووری دەرچووەو شەش ساڵە هاوکاریم دەکات لەدەرکردنی گۆڤاری (ئەلو ئەندۆنیسیا) داو، کورە بچوکەکەشم (احمد صبری) لەگەڵ ئەوەش دا کەلاوێکی تازە پێگەیشتووە سەرۆکی جەبهەی دیفاعی ئیسلامیە کەداوای پەیڕەویکردنی شەریعەت دەکات لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لە ئەندۆنیسیا .....

مەجلیسی زانایانی ئافرەتی مسوڵمان لەساڵی (١٩٩٧) دا لەسۆدان دامەزرا بۆ هاندانی ئافرەتانی مسوڵمان بۆ چوونە پێشەوە لەهەمووبوارەکانی زانست و زانین دا، لەساڵی (٢٠٠٣) دا کەسەرۆکایەتی درایە دەست ئەندۆنیسیا من بەکۆی دەنگ کرامە سەرۆکی ..

بەڕاستی خێزان ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەژیانمدا، باوکم زۆر حەزی دەکرد کە خوێندنی زانکۆ تەواو بکەم و هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئیسلام بدەم، بۆ ئەمەش زۆر هاوکاری کرام، لەسایەی خواوە ئاوات و حەزەکەیم هێنایەدی .[1]

## زاهیدێکی ڕووخۆشی شەهید:

هەرگیز زەردەخەنە لەسەر لێوی نەدەبڕا، هەرچەندە لەساڵی (١٩٥٥) دا حوکمی موئەبەد بەئەشغالی شاقەوە درا بەسەریدا لەگەڵ هەزارانی تردا .... شەیتانەکانی دەوڵەت زۆریان لەهاوسەرەکەی کرد کەداوای تەڵاق بکات و ناچار تەڵاقی دا، کچێکیشی لێی هەبوو مرد، کەچی هەردەم دڵخۆش و ئارامگربوو، ڕازی بوو بەقەدەری خوا.

---

١- (ئیسلام ئون لاین – آدم وحواء-)

هاوەڵان و دۆستانی، مامۆستایانی بەرزی دەعوە هەموو وەسفی پیاوەتی و دینداری و خواناسی و ئارامگری دەکەن و هەموو بەیەك دەنگ دەڵێن: ئەو بەراستی پیاو بوو لەزەمانێکدا کە پیاوکەم بوو! هاوسەری دووەمی (ئەمینە قوتب) خوشکی سەید قوتب بوو لەبارەیەوە دەڵێت:

قلبت فی صفحات عمرك علي القسی من الاخطاء ماينسيني
اشراقة الوجه الحبيب على المدى منذ التقينا من عديد سنين
فتشت على الذكريات تصدني عنها وتجرني دموع انيني
فبحثت في عهد الشباب فلم اجد عملا معيبا مخجلا لجبين
عف اللسان وعن حديث هابط تنأى وتبعد مؤثرا لسكون

ئەم پیاوە زاهیدە رووخۆشە شەهیدە ناوی (محمدکمال الدين محمد علی السنانيري) یەو لەقاهیرە لەساڵی (١٩١٨) دا لەدایك بووە، خێزانەکەیان گوزەرانیان باش بوو، پاش ئەوەی خوێندنی سەرەتایی ودواناوەندی تەواوکرد، لە ساڵی (١٩٣٤)دا لەوەزارەتی تەندروستی دامەزرا، پاش چوار ساڵ دەستی لەکارکێشایەوەو ویستی بچێت بۆ ئەمەریکا بۆخوێندنی دەرمانسازی تا کە تەواوی کرد لەدەرمانخانەکەی باوکیدا کاربکات، بەڵام زانایەکی مسوڵمان ئامۆژگاری کرد کە نەچێت و ئەویش بەگوێی کرد ...

لە ساڵی (١٩٤١) داکۆمەڵەی برایانی ناسی و خزمەتی باشی بەئیسلام کرد، لەسەر بانگەوازو کارکردن بۆ دینیخوا بیست ساڵ زیندانی کرا، لەگەڵ ئەوەدا کەبووەو بەخۆوە دیوبوو، بنەماڵەکەی دەوڵەمەند بوون، کەچی بەڕاستی زاهید بوو، نەفسی خۆی ڕادەهێنا لەسەر جل وبەرگی سادەوخواردنی سادەوکەم، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەگەر لەزیندانندا فشاریان بۆهێنا و خواردن و جل و بەرگیان لێ گرتەوە بتوانێ خۆی ڕاگرێ و کاری تێنەکات..

کەمال سنانيری بە بیست و پێنج ساڵ حوکم درا، پاش پێنج ساڵ لە خەستە خانەی بەندیخانە، مامۆستا سەید قوتبی بینی و هەر لەوێ خوازبێنی (ئەمینە)ی خوشکی لێکرد، کەهەواڵیان دا بەخوشکەکەی رازی بوو کە مارەی بکات وبیست ساڵ چاوەڕێی بکات تاماوەی بەندی یەکەی تەواو دەبێت..

بەراستی لوتکەی لەخۆبوردنە، بیست ساڵ، نەك بیست رۆژ یان بیست مانگ، بیست ساڵی رەبەق چاوەڕوانی، لەکاتێکدا کەس زۆری لێ نەکردبوو، دەیتوانی شووی باشتر بکات، بەڵام وەك وەفایەك بۆ بانگەوازو تێکۆشەرانی رێیخوا رازی بوو ئەو هەموو ماوە درێژە چاوەڕێی بکات و گەنجی و لاوێتی خۆیکرد بەقوربانی ئیسلام !

مێردەکەی پاش (١٧) ساڵ بەربوو، خێزانیان پێکەوەنا، لەسەرەتای شەشەم ساڵی هاوسەرێتیان جارێکی تر ستەمکارانی رووڕەشی بارەگای خوا گرتیانەوە بەتۆمەتی ئەوەیکە سەردانیئەفغانستانیکردبوو و یارمەتی موسڵمانانی دابوو دژی سۆڤیەت ..

لە بەندیخانەدا کە حوکم درا دایکی ئەمەن حەفتا ساڵی سەردانی کردو داوای لێ کرد کەنامەیەك بنوسێ بۆ حوکمەت و تیایا نەرمی پیشان بدات و بپاڕێتەوە بەڵکو بەری بدەن یان حوکمەکەی سووك بکەن، ئەویش قایل نەبوو بە دایکی وت: مەوقیفم لای خوا چۆن دەبێ ئەگەر نامەی وابنووسم و ئەم شەو بمرم؟! ئەتانەوێ بە موشریکی بمرم؟!

راستە کمال سنانیری وەك ئەرکێکی ئاینی سەردانی بیشاوەری کردبوو، هانی سەرانی جیهادی دابوو لەسەر یەك ڕیزی و یەك دڵی، بەڵام کەی ئەوە تاوانە تا سزای لەسەر وەرگرێ ...

لەساڵی (١٩٨١)دا کە گیرایەوە،ئەمەنی لە شەست ساڵ تێ پەڕیبوو، لەژێر ئەشکەنجە و ئازاردا ئارامی گرت و ئەوەی دوژمنانی خوا دڵیان پێی خۆش بوو نەیووت، بۆیە دەستیان نایەگەردنی و خنکاندیان، دوایش لاشەکەیان دایەوە بەکەسوکاری کە هەموگیانی ئاساری ئەشکەنجەو ئەعزیبی پێوەدیار بوو بەمەرجێ کە پرسەشی بۆ دانەنێن، ئنجا پڕوپاگەندەی ئەوەیان بۆکرد گوایە خۆی ئینتحار کردوەو خۆی خنکاندوە، کە ئەمەش هەموان دەیانزانی ڕاست نییە..

هەواڵی شەهیدبوونی بە دنیادا بڵاوبوەوە، لە ئەڵمانیا شانزە هەزار کەس خۆپیشاندانیان کردو داوای خوێنی ناوبراویان کرد.[١]

ئەمینە قوتب لە لاوێتیدا هۆنراوەی ئەنووسی و پیشانی براکانی ئەداو ئەوانیش هانیان ئەدا لەسەر زیاتر خوێندنەوە، تا ئەزموونی ژیان وئەشکەنجەو ئازاری ڕێی بانگەواز زیاتر لەبواری هۆنراوەدا قاڵی کرد..

---

١- (پێگەی الرواق).

شاژنی بانگخواز له شەهیدبوونی سەییدی برایدا دەڵێ:

فأهتف يالیتنا نلتقي كما كان بالأمس قبل الأفـــــــول
لأحكي اليك شجوني وهمي فكم من تباريح هم ثقيل
ولكنها أمنيات الحنين فما عاد من عاد بعد الرحيـــــــل

واته :

بانگ هەڵئەدەم و، ئەڵێم: خۆزگایە بەیەك ئەگەیشتینەوە وەكو دوێنێ پێش ئاوابوون
تا داخ و دووخ و خەمەكانی خۆمت بۆ بگێڕمەوە، كە چەندە باری خەمێكی گرانن
بەڵام ئەمانە هەر خەمی تاسەی دوورییەو، هەرگیز ئیتر نایەتەوە دوای ماڵ ئاوابوون

* * *

ولكنني رغم هذي الهموم ورغم التأرجح وسط العبـــــــاب
ورغم الطغاة ومايمكرون وماعندهم مـــن صـــنوف العـــذاب
فان المعالم تبدي الطريق وتكشف مـــــاحـــــوله من ضباب

واته :

بـــەڵام ســـەرەڕای ئـــەم خەمـــە، وەســـەرەڕای هەڵبەزودابـــەزی گێـــژاوی دەریـــا
وە ســـەرەڕای زۆرداران و، بەنـــدوباویان، چـــی ئەشـــكەنجەو ئازاردانیـــان لەلایـــە
ئـــەوەتا نیشـــانە بەدیكردنـــەكانی ڕێ ئەدۆزێتـــەوەو، تـــەم و مـــژی ڕێ ئەڕەوێنێتـــەوە

* * *

وألمح أضواء فـــجر جـــديد يزلزل أركـــان جمـــع الضـــلال
وتوقظ أضواءه النائمين وتنقذ أرواحـــهم من كـــــــلال
وتورق أغصان نبت جديد يـــعم البطاح نـــــدي الظـــلال

واته :

ئەوەتا، ڕۆشـنایی بەربـەیانێكی نـوێ بـەدی ئەكەم،كەپایـەكانی گرۆهـی گـومڕایی دێنێتـە لـەرزە
ئەوەتا ڕۆشنایی ئەوبەرییەیانە، خەوتووەكان خەبەردەكاتەوەو،ڕۆحەكانیان لەخەواڵوویی ڕزگار دەكا
درەختێكـی نـوێ گـەڵا دەردەكـا و شـیوو دۆڵـەكان سـایەی سـێبەریان ئەكەوێتـە سـەر

* * * *

فنم هانئا يا شقيقي الحبيب فلـــن يملـــك الـــظلم وقـــف المـــسير

فرغم العنـــاء سيمضـــي الجميـــع بـــدرب الكفـــاح الطويـــل العســـير

فـــعـــزم الابـــاة يـــزيح الطـــغاة بـــعون الالـــه العلي القدير

واته :

جـا بنـوو بێخـەم، ئـەی بـرای شـیرینم، زۆرداریـی نـاتوانێ کـاروان بوەستێنێ خۆ سەرەڕای هەموومەینەتیەك، هەرهەموو رێی دوورو درێژی سەختیتیکۆشان دەبڕین خۆغیرەتی پیاوانەی مەردانە، بە پشتیوانی خوای بالآدەستی بەتوانا زۆرداران ڕاتەماڵێ

* * *

ئەمینە لەبارەی ساتەکانی لاوازبوون و زاڵ بوون بەسەریا دەڵێت:

هل تراني صبرت أم أن قلبـــي قـــــد ثوى في التراب تحت رفاتك

هل تراني احتملت أم أن نفسي قـــــد طواها الردى بـــيوم وفاتك

هل تراني نسيت أيام عمـري حـين أنـهى الطـغاة نـبض حـياتك

لست أدري وانما كل شـــــيء قد توارى بعد اخـتـفاء سـماتـك

واته:

ئـــاخۆ ئـــەمبینی ســـەبرم کـــردووە یـــان دڵـــم

لـــە ژێـــر ئێـــسك و پروســـکی تۆدایـــە لـــە ژێـــر خۆڵـــدا

ئـــاخۆ ئـــەمبینی بەرگـــەم گرتـــووە یـــان دەروونم

مـــردن بـــەڕۆژی وەفاتـــت پێچـــایەوە لەگـــەڵ خۆیـــدا

ئـــاخۆ ئـــەمبینی کەڕۆژانـــە تەمـــەنم لـــەبیر چـــووەوە

کـــاتێ زۆرداران لێـــدانی دڵـــی ژیـــانتی دوایـــی پێهێنـــا

مـــن نـــازانم مەگـــەر ئـــاخۆ هـــەموو شـــتێ

ون ئـــەبێ لـــە چـــاو دوای نـــەمانی ســـەرو ســـیمای تـــۆ

هەروەها پاش شەهید بوونی مێردەکەی دەڵێت :

هـل تـرانا نلتـقي أم أنـها كانـت اللقيا على أرض السراب
ثـم ولـت وتلاشـت ظلـها واستحالت ذكـريات للعـذاب
هكذا يسـأل قلبي كلـما طالـت الأيام من بـعد الغيـاب
فاذا طيفـك يرنو باسـما وكأني في اسـتماع للجـواب
أو لم نمضي علـى الـدرب معا كـي يـعـود الخـير للأرض اليـباب
فمضـينا في طريـق شـائك نـستخلى فيـه عن كل الـرغـاب
ودفنـا الشـوق في أعـماقنا ومـضينا في رضـاء واحـتساب
قـد تعاهـدنا على السـير معا ثـم عـاجـلت مـجيـبا للذهـاب

واتە:

ئـاخۆ بەتـەمایت بـە یـەك شـادبینەوە، یـا وەكـو
ئـەو شـادبوونەوەیە لەسـەر زەوی تراویلكـەدا ئـەبێ
كەچـی نەمـاو، سایەیشـی چـووەوەو
یادەوەریـەكان بـووە بـە ئـێش و سـۆ
دڵـم هـەرناوا پرسـیار شـەكا هـەركاتێ
كـەدوای دیارنـەمان ڕۆژان درێـژ بوونـەوە
بـەڵام تامۆراییـت زەردەخەنـە ئەبەخشـێ
وەك بڵێیـت مـن چـاوەڕوانی وەڵامـێكم
ئـەی وانـەبوو كـە هـەردووكمان لەیـەك ڕێ بـووین
هـەتا خێـرو خۆشـی رووبكاتـەوە زەوی یـە بوورەكـان
ئـەوە بـوو دوو قـۆڵی بـە ڕێگـەی دڕكەڵانـدا رۆیشـتین
كـە وازمـان لەهـەموو حـەزێكی خۆمـان هێنـا
تاسـەو حـەزەكانمان ناشـت لـەناخمانا و
چـووین و، ڕەزامەنـد بـووین و، خۆشـنوود بـووین

پەیمانمانــــدا دوو قـــــۆڵی بەیەکـــــەوە ڕێ کـــەین
کەچـــی تـــۆ زووتـــر، پەلـــەت کـــرد، شـــۆغرت کـــرد



حين ناداك رب مـنعم ... لحيـاة في جنـان ورحـاب
ولقاء في نعيم دائـم ... بجنـود الله نرجـى بالصـحاب
قدموا الأرواح والعمر فدا... مستجيبين على غير ارتيـاب
فليعد قلبك من غفلاته ... فلـقاء الخلد في تلك الرحـاب

واتە:

کـــاتێ خـــوای میهرەبـــان بـــانگی لێکـــردی
بـــۆ ژیانێـــك لەبەهەشـــتا و بـــێ ئەنـــداز
بـــەخوا گەیشـــتن و لـــە خۆشـــی هەمیشـــەییدا مانـــەوە
لەگـــەڵ ئـــاواتی هـــاودەمی پیـــاوانی خـــوادا
کــــە بەخشـــــیان: چ ڕۆح و چ تەمـــــەنیان
چـــوون بـــەدەم خـــواوە بـــێ دوودڵـــی
دە بـــا دڵـــت لـــە غـــافڵی بـــەدەربێ
لـــەو دەریـــاری بەیـــەك گەیشـــتنەی هـــەتا هەتاییـــە



أيها الراحل عذرا في شكاتي ... فـالى طـيفك أنـات عـتاب
فقد تركت القلب يدمي مثقلا ... تائها في الليل في عمق الضباب
واذ أطوي وحيدا حـائرا ... أقطع الدرب طويلا في اكتئاب
فاذا الليل خـضم موحـش ... تتلاقى فـيه أمـواج العـذاب
لم يـعد يبـق في الليل سنا ... قد توارت كل أنوار الشهاب
غير أني سوف أمضي مثلما ... كنت تلقانـي في وجـه الصعاب
ثم يمضي الرأس مرفوعا فلا ... يـرتضي ضـعفا بـقول أوجـواب

سوف تحذوني دماء عابقات قد أنارت كل فج للذهاب

واته:

ئەی ئۆغرکردوو لە سکالاّم ببوورە
نالّەی گلەییم مەگەر هەر لە تامۆراییتمە
دلّمت بەباریّ خوێنی لیّچۆڕاوەوە جیّهیّشت
سەرگەردانە لەشەوا، لە قوولاّیی تەم و مژا
ئەوەتا تەنها و سەرسامم خۆم کۆکردوەتەوە
ڕیّ یەکی دوور ئەبڕم بەدلّ شکاوییەوە
شەوەتا شەوە، تا بلّییت تاریکە، ترسە
شەپۆلەکانی دلّ، ئازاری نەگەنەوە بەیەك
لەشەوگاری منا ترووسکاییەك نەما
ئەوەتا هەرچی ڕووناکی ئەستیرە گرداەکانیشە ئاوابوو
هەرچی منیشە، لە ڕیّکردن ناوەستم هەروەك
چۆن بەیەك گەیشتین لە ڕۆژە سەختەکاندا
سەر هەر بە بلّندی ئەبیّ و، هەرگیز
هەرگیز نانەویّ، نە بە قسیەك نەبە وەلاّمیّ
بیّگومانم کە چاوم لیّئەکەن، کە بۆنی خوێنم
هەموو ڕیّگاویانەکان پڕئەکا و، ئەلّیّ وەرن



هلا دعوت الله لي كي التقي
بركابكم في جنة الرضوان
هلا دعوتم في سماء خلودكم
عند المليك القادر الرحمن
ان يجعل الهم الثقيل براءة
لي في الحساب فقد بقيت أعاني

واته :

ئەرێ نەئەبوو داوام بۆ بکەی لەخوا تا منیش بگەم

بە کاروانی ئێوەدا لە بەهەشتی خۆشنوودان دا

ئەرێ نەئەبوو دوعام بۆ بکەن لە ئاسمانیئەمریی خۆتاندا

لەلای پاشای بە توانای میهرەبان دا

تا خەمی گرانی سەر دڵم بکا بە کەفارەت

بۆم لەدەفتەری کردەوەکانما، چونکو هێشتا هەر ئەناڵم



فاغفر الأمنيات يا رب عفوا

واعني دوما ببرد العزاء

لا تدعني للحزن يطمس قلبى

لا تدعني اعيش دنيا الفناء

واجعل الحبّ للبقاء المرجّى

فى نعيم بعالم الاتقياء

برضاء أنالـه منك يا ربّ

وأحيا في فيضه بالسماء

واته:

لە داوای ئاواتەکانم ببوورە پەروەردگار بە لێخۆشبوون

و، هەمیشە پشت و پەنام بەو، ئاویکە بە دڵە خەمین

نەکەی جێم بێڵی و، بمدەیتە دەست خەم دڵم رەشکاتەوە

نەکەی بهێڵیت بۆ دنیای بێ مایە، بهێڵیتەوە

خۆزگە و حەزم بۆمانی هەمیشەیی پێ ببەخشە

لەخۆشی یەکدا کە بە بالای پیاو چاکانت بڕیوە

بەخۆشنوودیەك کە پێم ببڕێ لە تۆوە ئەی خوایە

تا هەمیشە پێی زیندووبم لە ئاسمانی بەرین دا

## کۆچی دوایی:

لە ئێوارەی رۆژی یەکشەمە (١٨ی ذی الحجة ١٤٢٧)ی کۆچی بەرامبەر (٧ی ینایر ٢٠٠٧)ز شاژنی بانگخواز دواکۆچی کرد بۆ لای دۆستان و خۆشەویستانی و، رابەری گشتی برایان و ژمارەیەکی زۆر نوێژی جەنازەیان لەسەرکرد، بەم جۆرە ژیانی بانگخوازێکی بۆ خوا سوڵحاو کۆتایی هات لە دنیای مەینەتی و زەحمەتدا، تا لە ئاخیرەتدا بە ئیزنی خوا ژیانێکی تر دەست پێبکاتەوە لەگەڵ پێغەمبەران و راستگۆیان وشەهیدان وساڵحاندا .. ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلْفَضْلُ مِنَ ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا﴾ النساء: ٦٩ – ٧٠

## دڵدامەزراویی و نەتۆران!

پێغەمبەرﷺ پەیماننامەی مۆرکرد لەگەڵ نوێنەری قورەیش (سوهەیل کوری عەمر) داو یەکێکیش لەخاڵەکانی رێکەوتننامەکە ئەوەبوو، کە هەرپیاوێك بەبێ پرسیخاوەنەکەی بڕواتە لای(محمد)و هەڵبێت، دەبێت محمد بیداتەوە بە قورەیش، هەرکەسێکیش لای محمدەوە بچێتەوە بۆ لای قورەیش ئەوە نادرێتەوە بە محمد ..

کاتێك پەیماننامەکە تەواو بوو (ئەبو جەندەل)کوڕی سوهەیل کەڕایکردبوو لە دەست قورەیشیەکان گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ، (سوهەیل)ی باوکی داوای کرد کە کوڕەکەی بدەنەوە تا بیباتەوە، پێغەمبەریش ﷺ ڕازی بوو، ئەبو جەندەل بەدەنگی بەرز هاواری کرد، ئەرێ مسوڵمانینە ئێوە ڕازین من بگێڕدرێمەوە بۆناو موشریکان و لە ئاینەکەم وەرم گێڕن!؟

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەبو جەندەل ئارام بگرەو چاوەڕوانی پاداشتی خوابە، خوا یاربێت چارەسەرێك بۆتۆو هاوڕێکانت دەنێرێ، ئێمە تازە بەڵێنمان داوەو نابێت بیشکێنین .

پاش ماوەیەك (ابو بصیر) یش کەچەوساوەیەکی مسوڵمانی مەککە بوو هەڵهات و هاتە مەدینە و دوان لەقورەیشیەکان هاتن بیبەنەوە، ئەویش لەگەڵیاندا گەڕایەوەو لەڕێگا فرسەتی هێناو یەکێکیانی کوشت و هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئیدی خوا ئیمەی لەسەر ئەستۆی تۆ لابرد، ئەوەئێمەت گێڕایەوە بۆلایان و خوای گەورە لەدەستیان ڕزگاری کردم ..

ئنجائەبوبصیر چووە (سیف البحر) لەباکوری شاریجدە، پاشان ئەبوجەندەلیش ڕای کرد چوو بۆلای و چەند کەسی تریش پەیوەندیان پێوەکردن، بەمەش ڕێیان دەگرت لەکاروانی قورەیشیەکان و تالآنیان دەکردن، تا قورەیش ناچار داوای لە پێغەمبەرﷺ کرد  کە ئەوان بێنێتەوە ژێر ڕکێفی خۆی....

پێغەمبەر ﷺ نامەی نارد بۆ ئەبو بصیرکەرێیان ئەدرێ بێنەوە ناو مەدینە و غەریبیەکەیان تەواو ...کەنامەکەیش گەیشت ئەبو بصیر لەگیانەلآدا بوو، وتی نامەکەی پێغەمبەرم ﷺ پیشان بدەن، کە دایانێ ماچی کرد و خستیە سەر سنگی و دووجار وتی (اشهد ان لااله الا الله، واشهد ان محمدا رسول الله) و گیانی پاکی سپارد.

بەڕاستی لوتکەی بەوەفایی و دڵدامەزراویە، مسوڵمانێکی چەوساوە لەتاو ئەشکەنجەو ئازاری مەککە بە هەزار دەردەسەری رابکات بگاتە مەدینەو وەری نەگرن و بیدەنەوە دەست دوژمنان .. چۆن زویر نەبوون؟ چۆن وازیان نەهێنا؟! چۆن پاشگەز نەبوونەوە لەئیمان و ئیسلامەتی؟!

ئەوەتا لەدوا هەناسەکانی ژیانی دا هەر بەوەفایەو لەشەوق و خۆشەویستی دا تواوەتەوە بۆ دیداری پێغەمبەر و لەتاوا نامەکەی ماچ دەکات و شایەتمان دێنێت و کۆتایی بەداخ و حەسرەت و ماندو بوونەکان دێت و بارو بارگەی دەپێچێتەوە بەرەو ڕەزامەندی خواو بەهەشتی هەتا هەتایی.[1]

## بانگخوازی تا دوا هەناسە:

کاتێك باسی خوارووی ئەفەریقیا دەکرێت یەکسەر نیلسۆن ماندێلا دێتەوە یاد کە خەباتێکی سیاسی گەورەی کرد و زۆربەی خەڵکی ئەم جیهانە دەیناسێ!

هەروەها لەبواری دینداری و عەقیدە پارێزیش دا (احمد دیدات) دێتەوە یاد کە ناویانگی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بڵاوبۆتەوە و تەنانەت چەندەها دەزگای لێکۆڵینەوە دانراوە بۆ دیراسەکردنی  نوسینەکان و وتارەکانی، بەڵکو بتوانن کاریگەری نەهێڵن .

دیدات خوێندنی تا پۆلی دووی ناوەندی بوو، لەبەرئەوەی ناچار بوو بگەڕێ بەدوای کارو کاسبیەکەداوخێزانەکەی پێبژێنێ، لەحانوتێکیبچووکدا بەمانگانەیەکی کەم کەوتە کارکردن،

---

١- (Saaid. net)

کە نزیك بوو لە پەیانگایەکی مژدەدانەوە، بەردەوام قوتابییەکانی دەهاتنە حانوتەکەو موناقەشەیان لەگەڵ دیدات دەکرد، (دیدات) یش بەچاکی دیراسەی ئینجیلەکانی دەکردو بە بەڵگەوە وەڵامی دەدانەوە، بەم جۆرە ئەم حانوتە وەك زانکۆیەك وابوو بۆی.

## خەمخۆران یەکدەکەون:

احمد دیدات کەلاویکی خوێن گەرم بوو زانی کە باشترین هۆکار بۆ بەرگری لە ئیسلام هێرش کردنە، بۆیە بەردەوام هێرشی دەکردە سەر بیروباوەڕی شێواوی مەسیحیەکان و بۆی ڕاست دەکردنەوە.

ڕۆژێك دۆستێکی تازەی ناسی بەناوی (غولام حسن فنکا) کە لیسانسی هەبوو لە یاساداو بازرگانی پێڵاوی دەکرد، کەئەمیش یەکێك بوو لەخەمخۆران و دڵسۆزانی ئیسلام، ئەم هاوەڵە زۆرهاوکاری (دیدات) ی کرد بۆ تەواو شارەزابوون و هەرئەوەندە توانای موناظەرەو موناقەشەی بەهێز بوو، بڕیاریان دا کە دیدات خۆی یەك لایی بکاتەوە بۆ بانگەوازو، نووسینگەی بانگەوازیان دامەزراند  لە شوقەیەکدا لەشاری (دیربان) لە خوارووی ئەفەریقیا لە ساڵی (١٩٥٦) دا .

دیدات لەم نووسینگەیەوە دەچوو بە هەموولایەکداو سەردانی کەنیسەکان و زۆر شوێنی تری دەکرد، کۆمەڵگاو ناوەندی مەسیحیەتی شپرزکردو بەمەش خەڵکانێکی زۆر سەردانی نووسینگەیان دەکرد بۆ پرسیارو وەڵام و زۆر کەسیش لەسەر دەستیا موسڵمان دەبوون .

**(کیپ تاون) یان (دیدات تاون):** ئنجا دیدات (صالح محمد)ی ناسی کەیەکێك بوو لە گەورە دەوڵەمەندە مسوڵمانەکان لەشاری کیپ تاون، ئەم شارە مسوڵمانی زۆری تیابوو بەڵام وەکو پێویست نەبوون و، لەبەرامبەریشیان دا زۆرینەی گاوربوو کەزۆر بەهێز بوون، ئەم شارە لەلایەنی سیاسی و بازرگانیشەوە زۆر گرنگ بوو ...

لەبەر ئەم هۆکارانە (صالح محمد) داوای لێکرد کە سەردانی شارەکەیان بکات و زۆر چاوپێکەوتنی بۆڕێکخست لەگەڵ قەشەکاندا، قەشەکان ئەمەندە زۆربوون و حەزیشیان بەموناقەشەو موناظەرە دەکرد دیدات ناچار بوو لەم شارە بمێنێتەوە، تا وای لێهات شارەکە پێی دەوترا (دیدات تاون) شاری دیدات؟!

بەم جۆرە (غولام حسن) و (صالح محمد) وەك دووبالّ وابوون بۆدیدات لە ئاسمانی بانگەوازدا، بەڕاستی خەمخۆری ئاوایە بۆ ئیسلام، ئەوەتا بەسەرو ماڵ پشتی دیدات دەگرن تاپەیامەکەی بەچاکی بگەیەنیّ و ئالاّی شەکاوەی ئیسلام هەردەم بەرزو بڵندو بالاّبیّ..

دیدات کەسێکی خاکی بوو، بەئۆتۆمبێلێکی (فولکس واگن)ی کۆن هاتوو چۆی دەکرد و خەڵکی هەمووخۆشیان دەویست، لەهەموودنیادا ناسرا، کاتێك بۆ یەکەم جار مونازەرەیەکی جیهانی ئەنجام دا لەهۆڵی (البرت) لە لەندەن لەساڵی (١٩٧٧)دا، هەرچەندە پێش ئەم مونازەرەیە هەردوو هاوەڵەکەی دنیایان بەجێهێشت بەلاّم ئەوەندە قوتابیان بۆ پێگەیاند کە هەمیشە هاوکاری و هاودەمی (دیدات)بن لەکاروبارەکانیدا کە نزیکترینیان پیاوێك بوو بەناوی (ئیبراهیم جادات).

بانگەواز تا دواهەناسە: ڕۆژانە نزیکەی (٥٠٠) نامە دەگەیشتە نوسینگەکەیان لە (دیربان)کە داوای پەڕاوو مونازەراتەکانیان دەکرد، هەروەها ڕۆژی واهەبوو چوارسەد گەشتیاری بیانی سەردانیان دەکرد و قوتابیانی دیدات پێشوازیان لیّ دەکردن و مونازەرەو نوسینەکانی دیداتیان بەدیاری دەدانیّ .

دیدات بۆئەوەی کارەکانی بەردەوام بن شەش (وەقف)ی دامەزراند لەشاری (دیربان) کەیەکێکیان بنکەی جیهانی بانگەوازی ئیسلامیە لە سەرشێوازی بانگەوازی دیدات، ئەوەی تیایا دەخوێنێت، هەشت کۆرس لەسەر دەستی مامۆستاو زانای گەورە دا وەردەگرێت .

هەروەها (وەقف)ێکی تریش ئەوەیە کەئەوانەی تازە مسوڵمان دەبن فێری پیشەیەك بکرێن وەك دارتاشیو کارەباچێتی تابتوانن بژێوی خۆیان بەدەست بهێنن..

دیدات بەردەوام بەهاوکارانی دەوت: (ئەگەر پارەم هەبوایە دنیام پڕ دەکرد لە پەڕاوی ئیسلامی، بەتایبەت مانای قورئان بە ئینگلیزی) هەروەها بەئەندامانی مەجلیسی بنکەی جیهانی بانگەوازی ئیسلامی وت لەدوا سەردانیان دا (هەموتواناکانتان بخەنەکار بۆ گەیاندنی کەلامی خوا بەبەشەریت کە ئەوەش ئەو ئەرکەیە کە لە هەمووژیانمدا گرتوومەتە ئەستۆی خۆم).

لەساڵی (١٩٧٦) دا دیدات خەوێك دەبینێت کە لەخەوەکەیدا بە دەستی خۆی ملیۆنیّ قورئان ئەدات بەوانەی کە مونازەرەی لەگەڵ دەکەن لەبارەی ئیسلامەوە، لەم خەوەوە بڕیاری دا کە ئەو کارە بکات، تاساڵی (١٩٩٦) کەتیایدا توشی شەلەل بوو فریای(٤٠٠)هەزار نوسخە

کەوت لەمانای قورئان کەدابەشی بکات و داوای لەهاوکارانیشی کرد کەکارەکەی بۆ تەواو بکەن.[1]

**کورتەیەك لەژیانی:** شێخ احمد دیدات لەساڵی (١٩١٨) لەدێی تاد کشینار لە ویلایەتی سوارات لە هندستان لەدایك بووەو باوکی بەرگدروو بوو، لەبەرنەبوونی کۆچی کرد بۆ خوارووی ئەفەریقیا لەساڵانی بیستی سەدەی بیست دا.

لەساڵانی پەنجادا یەکەم نووسینی بڵاوکردەوە بەناوی (هل الکتاب المقدس کلام الله)؟ پاشان چەندەها نوسراوی تریشی بەسەرتاسەری دنیادا بڵاوکردەوە ئەمە بێجگە لە (٢٣٥) منازەرەو وتار کە لە چەندەها وڵاتی دنیادا داویتی.

لەساڵی (١٩٨٦)دا خەڵاتی مەلیك فەیسەڵی جیهانی بۆخزمەتی ئیسلامی وەرگرت لە بەر ئەو ڕۆڵە گرنگەی کە لەجیهاندا بینی بۆ خزمەتی ئیسلام و بەرپەرچ دانەوەی ناحەزان، دیدات پاش (٣٣) جار هەوڵ دان و داواکردن بۆ ژن هێنان ڕێی کەوت لەئافرەتێك بەناوی (حواء حسێن) کە دووکوڕ و کچێکی لێ بوو، یەکەمیان ئیبراهیمی کوڕیەتی کە لە ئەمەریکایەو دووەمیان (ڕوقیە)ی کچێتی کە چەند ساڵ پێش وەفاتی خۆی کۆچی دوایی کردو، سێ یەمیان (یوسف)ە کەبەردەوام لەگەڵ باوکی بوو..

دیدات دڵسۆز بوو بۆ ماڵ و منداڵی و ڕێزی زۆری لە هاوسەری هاوسەنگەری دەگرت و بەمنداڵەکانی دەوت: (هەموورۆژێك دایکتان لە ژیاندا بێت لەگەڵماندا ئەو ڕۆژە ڕۆژی لە دایك بوون و جەژنمانە !) ئەمە بێجگە لەوەی کە بە هاوسەرەکەی دەوت (دایکی دایکان).. لە ساڵی (٢٠٠١)دا کۆمەڵێ ڕۆژنامەنوسی ئەمەریکا سەردانیان کردو لە پرسیارێکدا وتیان: ئەگەر سەرۆکی ئەمەریکا بویتایە پاش (١١)ی سێپتەمبەر چیت دەکرد؟ لە وەڵامدا وتی: بەئیسرائیلی جگەرگۆشەم دەوت کە دادپەروەر بێت لەگەڵ فەلەستینیەکانداو ئەوە نەکات کە ئێستا بەرامبە فەلەستینەکان دەیکات.[2]

---

١- (ئیسلام ئۆن لاین/مجاهیل ومشاهیر).

٢- سایتی: (الرواق)

## هیممەت بەرزی وەرەقەی کوڕی نەوفەل!

خەدیجە خوالێی ڕازی بێت پێغەمبەری ﷺ برد بۆلای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی خزمی، کەپیاوێکی شارەزابوو لە ئاینی مەسیحی و یەهودی دا، کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتنی وەحی بۆ باسکرد، وەرەقە یەکسەر زانی کە پێغەمبەری ئاخر زەمانە، بۆیە بە داخ و حەسرەتێکی زۆرەوە هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاو وتی: خۆزگە گەنج و لاو و بەتوانا بومایە، خۆزگە بامایە کاتێك گەلەکەت لەوڵات دەریان دەکردی، ئەگەر بگەمە ئەوڕۆژە سەرخستنێکی چاك سەرت دەخەم و پشتیوانیت لێدەکەم. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بۆ دەریشم دەکەن؟ وتی: بەڵێ هەرکەس ئەوەی هێنابێت وەك تۆ دوژمنایەتی کراوە ... وەرەقە پیاوێکی زۆر بەتەمەن بوو، خوا هێشتیەوە کە ئەو مژدەی پێغەمبەرایەتی بدات بە پێغەمبەر و دوای چەند ڕۆژێك لەم یەکتر بینینە کۆچی دوایی کرد . بەڕاستی پیرەمێردێکی بەساڵاچووی بەهیممەت بوو، خوای گەورەش لەسەر ئەو هیممەتەی پاداشتی دایەوە بەبەهەشتی بەرین، هەروەك پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە (لاتسبّوا ورقة فاني رأيت له جنة أوجنتين)[1]

## پەیژۆکێك بۆ پەندوەرگرتن:

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کە لەدوای ئەوکەسانێك دێن کەئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکەن (لاتقوم الساعة حتى يخرج ثلاثون دجالون كلهم يزعم انه رسول الله) ئەبی داود، کە ئەمەش بەڕاستی موعجیزەیەکی ئاشکرای پێغەمبەرە)، هەر لەژیانی خۆی دا موسەیلەمەی درۆزن پەیدا بوو، کەدواتر بەهەوڵ و خەباتی هاوەڵان خوای گەورە لەسەردەستی ئەواندا لەناوی برد.

یەکێکی تر لەو درۆزنانە (میرزا غولام ئەحمەدی قادیانی) یەکە لەساڵی (١٢٦٥)ی کۆچیدا لەدایك بووە کەگوندێکی (بنجاب)ە لە وڵاتی هندستان..

خەڵکی هیندستان شۆڕشیان کرد دژی ئینگلیز وموسڵمانان لەپشت شۆڕشەکەوە بوون، ئینگلیز لە ساڵی (١٨٥٧)دا شۆڕشەکەی دامرکاندو پاشان لە ساڵی (١٨٦٩)دا حکومەتی بەریتانی کۆمەڵێ شارەزای ناردە هیندستان کە دیراسەی بارو زروفەکە بکەن. ئەوانیش دیراسەیەکی باشیان کردو پاشان راپۆرتیان نوسی کە چارەسەر ئەوەیە کەسێك دروست بکەن

---

١- صحيح الجامع الصغير: ١٧١٩٧

بەناوی ئیسلامەوە کاریان بۆ بکات، بۆ ئەمەش پاش گەڕانی زۆر میرزا غولام ئەحمەدیان دۆزیەوە کە بەو کارە هەستێت وهەموو هاوکاریەکیشیان کرد .

ناوبراو ڕایگەیاند کە نوێکەرەوەیەو لە خواوە ئیلهامی بۆ هاتووە و، پاشتر ڕایگەیاند مەسیح و مەهدی چاوەڕوان کراوە، پاش ئەوەی بۆی نەچووە سەرکە خۆی بکات بە پێغەمبەری عیسی یا بە مەهدی، ڕایگەیاند کە خواپێغەمبەر (محمد)ی جارێکی تر لەکەسایەتی میرزا غولام دا ناردۆتەوە.

ئەم کۆمەڵە سەرگەردانە، بیروڕای وایە (تناسخ الارواح) هەیەو بیروڕایان لە بارەی خواوە نادروستە و هاوەڵانی خۆی بە (صحابە) دا ئەناو دەبوت کەحەجی گەورە ئەوەیە کەسێك بچێت بۆ قادیان و، ئەمە بێجگە لەوەی عەرەق و تلیاك و گۆشتی بەرازیشی حەڵاڵ کردبوو ...

هەروەها هەموو موسڵمانێکی بەکافر دائەنا تا نەبن بە شوێنکەوتەی قادیانیەت و هەر کەسێکیش بە لای ئەوانەوە ژن و ژنخوازی لەگەڵ غەیری قادیانیدا بکا کافرە.

بانگەشەیان کرد بۆ نەهێشتنی جیهادو گوێڕایەڵی کوێرانە بۆحکومەتی ئینگلیز کە لەو کاتەدا هندستانیان داگیر کردبوو، گوایە ئینگلیز وەلی ئەمری موسڵمانانە. چەندەها تەرجومەی قورئانیان کردووە بەزمانی جیاجیاو هەمووی تەفسیراتی هەڵەو نابەجێ یە ...

زانایانی ئیسلام بەتایبەتی لەهندستان ڕوبەڕووی بونەوە وەك شێخ (ابوالوفاء) ثناء الله ئەمیری کۆمەڵەی ئەهلی حدیث لەهندستان، ناوبراو مونازەرەی کرد لەگەڵ (میرزا غولام) داو ئیقامەی حوجەی لەسەر کرد، دواتر میرزا غولام داوای موباهەلەی کرد کە خوا ئەوەی درۆزنە لەناوی بەرێت، خوای گەورەش میرزا غولامی دوای چل ڕۆژ بەنەخۆشی کولێرە لەناو ئاودەستا کوشت لەساڵی (١٩٠٨) زاینی دا، شایەنی باسە کە ئەم بێ دینە پەنجا پەڕاوو ژمارەیەکی زۆر وتاری لەدوای خۆی بەجێهێشت کە هەمووی بانگەواز دەکات بۆ گومڕا بوون و سەرگەردانی، مەجلیسی ئومەی پاکستانیش (پەرلەمانی مەرکەزی) موناقەشەی یەکێ لە زەعیمە گەورەکانی ئەم تایەفەیەی کردووە کەناوی (میرزا ناصر احمد) بوو، شێخ موفتی محمود وەڵامی دایەوەو موناقەشەکەش سی کاتژمێر درێژەی کێشا، کەسەرەنجام (میرزا ناصر احمد) قسەی نەماوکوفر و لەڕێ لادانی بۆ هەمووان دەرکەوت و، لە پاکستاندا دایان نان بە کەمایەتیەکەی ناموسڵمان و لەساڵی (١٩٧٤) دا رابیتەی عالەمی ئیسلامی بڕیاریان دا کە ئەو کۆمەڵە یە لە ئیسلام دەرچوون و ئەبێ ڕێیان لێبگیرێ ...

**مەسەلەی موباهەلە:** موباهەلە: واتە داواکردنی لەعنەت و سزای خوا بۆ سەر درۆزنان .. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کەوەفدی نەجرانی مەسیحیەکان کاتی خۆی هاتن بۆ مەدینەو پێیان دادەگرت لەسەر بیروباوەڕە هەڵەکانیان لەسەر عیسا سەلامی خوای لێ بێت، پێغەمبەر ﷺ بەفەرمانی خوا پێی فەرموون ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰذِبِينَ﴾ آل عمران: ٦١ مەسیحیەکانی وەفدی نجران لە ترسی سزای خوا نەیانوێرا بێنە پێشەوە و ئەو موباهەلەیە بکەن ..

میرزا غولام ئەحمەدی قادیانی لەگەڵ سەرۆکی زانکۆی دیوبەندی (شێخ موفتی محمود الحسن) ڕوبەڕوو بوونەوە و، بەئامادەبوونی لایەنگرانی هەردوولا، میرزا غولام جەختی کردە سەر ئەوەی کە (خاتم النبيين) واتا چاکترین پێغەمبەرو مانای وانیە کە کۆتایی هاتووە و خەتم بووە، هەرچەندە شێخ موفتی محمود حسن فەرمودەی هێنایەوە بۆ وەڵامدانەوەی، میرزا غولام بە فەرموودەکە قایل نەدەبوو بە بیانووی ئەوەی ئەو فەرموودەیە خاتوو عائیشە ریوایەتی کردووەو ئەویش لەبەرئەوەی ئافرەتە شایەتیەکەی بە یەکێك حسابە ... هەرچی لەگەڵ وت سوودی نەبوو، بۆ شەو زانایانی زانکۆی دیۆبەند کۆبونەوەو راوێژیان کرد کەکێ باشە بۆ دەمکوتکردنی ئەو تاوانبارە درۆزنە ؟! ڕایان هەتا سەر ئەوەی کە شێخ ثناء الله باشە، کە کاتی خۆی لای ئەمان قوتابی بووەو لەبەر زۆر موناقەشەکردن و جورئەتی زۆری لەزانکۆ دەریان کردبوو وە بڕوانامەیان نەدابوویە.

شیخ ثناء الله دەڵێ: سەرۆکی زانکۆ ناردی بەدوامدا بۆ ئەوەی ڕوو بەڕووی میرزا غولام ببمەوە و ئیقامەی حوججەی لەسەر بکەم، منیش وتم باشە، بەڵام بەو مەرجەی کە ئەگەر سەرکەوتم بەسەریا بڕوانامەی زانکۆکەتانم بدەنێ، ئەویش ڕازی بوو، بۆ سبەینێ فیلێکیان هێناو ویستیان جەنابی موفتی سەرکەوێ و هەموو ئەوانی تریش بەدەوریا بن و بەیەکەوە بڕۆین بۆ شوێنی موناقەشەکە، وەك ڕێزلێنانێك لەو زانایە، من قایل نەبووم، وتم: من سواری فیلەکە ئەبم، بەو جۆرە من لەسەر فیلەکە بووم و موفتی و هەموو زانایانیش لەدەورم

بوون و چوین بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەکەو هەموانیش هوتافیان دەکێشا بۆ هاندان و تەشجیع کردنم ...

کەوتینە موناقەشە لەسەر (خاتم النبیین) و ئەو هەمان قسەی کردو منیش هەمان فەرموودەکانم پێوت کە خاتوو عائیشە ریوایەتی کردووە، ناوبراو قەناعەتی نەکرد؟! بۆیە وتم: دەکەوایە پرسیارێکت لێدەکەم؟ وتی: فەرموو! وتم: تۆ کوڕی باوکت نیت؟! تووڕە بوو وتی: چۆن گومان لە نەسەبم دەکەیت و دایکم تاوانبار دەکەی؟ وتم: من گومان نابەم و تاوانبارت ناکەم، بەڵام بەڵگەیەکم بەرێ کە تۆکوڕی باوکتی !؟ وتی: دایکم دەڵێ من کوڕی باوکمم، وتم: دایکت تاقە ئافرەتێکەو بەو پێودانگەی تۆش بێت شەهادەتەکەی یەکێکەو وەرناگیرێ، ئنجا وتم: ڕەوایەدایکت ڕاست بکات و عائیشەی دایکی موسڵمانان ڕاست نەکات! بەمە میرزا غولام دەمکوت بوو نەی دەزانی چۆن ڕزگاری بێت، ئیتر بوو بە (الله اکبر) و بەو جۆرە خوا شکاندی و ریسوای کرد..

دوای ئەوەش لەو گۆڤارەی کەهەفتانە دەرمان دەکرد هەموو قسە و بیرو بۆچوونە سەقەتەکانی ناوبراوم هەڵئەوەشاند و کارێکم پێئەکردن با بە دەوای شەڕی نەکردبێ! بەمەش میرزا غولام بێتاقەت بوو، نەشی دەتوانی وەڵامم باتەوە،ناچار نامەیەکی بۆ ناردم لە ١٩٠٨\٤\١٥داو داوای موباهلەی کردو تیا نووسیبووی: بسم الله الرحمان الرحيم

. ويستنبؤنك أحق هو؟ قل: إي وربي إنه لحق.

حضرت المولوي ثناءالله السلام على من اتبع الهدى ان سلسلة تكذيبي جارية في جريدتكم اهل الحديث من مدة طويلة، انتم تشهدون اني كاذب دجال مفسد مفتر، ودعواي للمسيحية الموعودة كذب وافتراء على الله.

إني أوذيت فيكم إيذاءً، وصبرت عليكُم صبراً جميلا، لكن لمّا كنت مأمورا بتبليغ الحق من الله وأنتم تصدون الناس عني، فأناَ أدعو الله قائلاً: يامالكى البصير القدير العليم الخبير، تعلم مافي نفسي إن كان دعواي للمسيحية الموعودة افتراء منّي وأنا في نظرك مفسد كذاب، والافتراء في الليل والنهار شغلي، فيا مالكي أنا ادعوك بالتضرع والإلحاح أن تميتني قبل المولوي ثناء الله، واجعله واتباعه مسرورين لموتي، يامرسلي أدعوك آخذا بحظيرة القدس لك أن تفصل بيني وبين المولوي ثناء الله، إنه من كان مفسداً في نظرك كاذباً عندك فتميته قبل الصادق منا، ربنا افتح بيننا وبين قومنا بالحق وانت خير الفاتحين .

ربيع الاول ١٣٢٥ هجري
الراقم عبد الله الصمد/ميرزا غلام أحمد المسيح الموعود
عافاه الله وأيد عزه

شێخ (ثناء الله)ش بەمە ڕازی بوو کە خوا درۆزن لەناوبەرێ، خوا دوعاکەی گیرا کردو پاش چل ڕۆژ لە ٢٥|٥|١٩٠٨دا میرزا تووشی کولێرە بوو لە ناو ئاودەستدا گیانی دەرچوو.
دوای ئەویش شێخ ثناء الله چل سا لّی تر ژیا و خزمەتی ئیسلامی کردو لە سا لّی ١٩٤٨دا وەفاتی کرد..

## با هێمن ببنەوە!

دوژمنانی هەق و ڕاستی هەرلە دێر زەمانەوە خەڵکیان تۆقاندووە لە هەق و ڕاستی و، پڕوپاگەندەی زۆری ناهەقیان بۆ کردووە تاخەڵکی‌یە هێمنی گوێ نەگرن و ڕوونەکەنە هەق، هەمیشە بانگخوازان و پێغەمبەرانیان بە فاڵچی و جادووگەرو کۆنەپەرست و مەترسی لەسەرئاسایشی تاك و کۆمەڵ و ئاسایشی نەتەوەیی داناوە، کە لەڕاستیشدا هیچی وا نیە بۆیە بانگخوازان ئەبێ هەوڵبدەن ئەوخەڵکە هێمن بکەنەوەو لەکەشو هەوایەکی ئاسایی و هێمندا هەق و ڕاستی بگەیەنن پێیان.

کاتی خۆی فیرعەون دڵنیا بوو (موسا) ڕاست دەکات کەچی دەیوت ﴿ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾ طه: ٥٧ ئەی موسا تۆ هاتوی بە سیحرەکەت ماڵمان کاول بکەیت؟خاك و نیشتمانمان بشێوێنی؟! ئنجا هەرئەمەشی‌خستە سەردەمی خەڵك و پێی وتن: ﴿ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴾ الشعراء: ٣٥، لە ڕۆژی ڕووبەڕووبوونەوەشدا لەگەڵ جادووگەراندا، ڕاجیاییان هەبوو، دوایی سەریان کرد بەیەکداو بەوە یەکتریان هاندا کە موسا دەیەوێ‌لەگەڵ براکەیدا بە جادوەکەیان لە خاك و ئاومان دەرمان بکەن و نیشتمانمان بخەنە مەترسیەوە ڕێبازی ژیانمان تێك بەن ﴿ قَالُوٓاْ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾ ﴾ طه: ٦٣، کافرانی مەککەش بەهەمان شێوە ئەیانووت ئەگەر شوێنت بکەوین بەرژەوەندی‌یەکانمان دەکەونە مەترسی‌یەوە، ڕەنگە هەموو عەرەب پەلامارمان بدەن و دەسەڵاتی ئاینیمان نەمێنێ و بازرگانیمان تووشی

کەساد بێ﴿ وَقَالُوٓا۟ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ۚ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍۭ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ۖ فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴾ القصص: ٥٧ - ٥٩، هەروەها ئەیانوت: محمد ﷺ جادووگەرە، شاعیرە، بەندو باوی پێشینانی هێناوە، ئاژاوە چیە و ماڵان دەشێوێنێ، باوك و ئەولاد لەیەك دەكا، جا ئەوە چیە هێناویەتی ئێمەش ئەتوانین ئەوە بڵێین﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا قَالُوا۟ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ ۙ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ الأنفال: ٣١

ئنجا چەند ساڵێ جەنگ بەرپابوو لە ئەنجامدا سوڵحی حودەیبیە هاتە كایەوە و هەرچەند زۆربەی هاوەڵان بەلایانەوە قورس بوو، كەچی پێغەمبەر ﷺ ڕێكەوتن نامەكەی مۆر كرد، ئەمەش بۆئەوەی جەنگ نەمێنێ و خەڵكی هەموو هێور ببنەوە، هەرواش دەرچوو خەڵكی هێمن بوونەوەو هەرچی باسی ئیسلامی بۆبكرایە موسوڵمان دەبوو، پێشتر چەند موسوڵمان بووبوو لەو ماوە كەمەدا زیاتر موسوڵمان بوو .

بەڕاستی ئێستاش ڕاگەیاندنەكان زۆر جەخت دەكەنە سەر ئەم لایەنەو دەیانەوێ خەڵكی بتۆقێنن لە ئیسلام بەناوی تیرۆرەوە كە هیچ پێناسەیەكی بۆ نەكراوە، كە ئەمەش ئەركی بانگخوازان قورس تر دەكات بەوەی كە لە هەوڵی بەردەوام دا بن بۆئەوەی خەڵكی هێور ببنەوە تاوەكو باشتر هەق و ڕاستی وەرگرن .

# پێشەکی:

سوپاس و ستایش بۆخوای پەروەردگارو درودو سەلامیش لەسەرگیانی سەرداری پێغەمبەران و یارو یاوەران.

ئازیزان و دۆستانی زنجیرەی بەرەو ئیسلام، وا لەم بەرگی حەوتەمەدا بە ئێوەی بەڕێز دەگەینەوە بۆ کۆمەڵێك باس و خواسی ئیمانی و ئیعجازی نوێی قورئان و سوننەت و موسڵمانبوونی بەردەوامی خەڵکی لەهەموو لایەکی دنیاوە، کە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پاشەڕۆژ بۆ ئیسلامە .. خۆ ئەمەش لە ڕاستیدا هەقیقەتێکی بەڵگەنەویستە، چونکە بەرنامەیەك خوا شایەتی بۆ بدات، کە گەورەترین و مەزنترین شایەتیە، دیارە هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا شایەتی بۆ ئەدات و سەرەنجامیش هەر بۆ ئەوە ﴿ قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَىٰ قُل لَّا أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴾ الأنعام: ١٩ ..

ئیسلام تاکە ڕێگای ئازادی، ئاسوودەیی، دڵنیایی، ئاشتی، هیممەت بەرزی، سەرفرازییە، سەرفرازی نەك هەر لە دنیادا بەڵکو سەرفرازی لە دنیاوقیامەتدا،بۆیەنزیکەی (٢٧) جار لە قورئاندا (افلح، تفلحون، المفلحون) هاتووە، ئەمە بێجگە لەوەی ڕۆژی (٥)جار ئیسلام لەڕێی بڵندگۆکانەوە سروودی (حي على الفلاح) ئەدات بەگوێی دنیادا..

ئیسلام دەوڵەمەندترین بەرنامەیە بەدرێژایی مێژوو، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:(ولاتنقضي عجائبه)عەجایباتی قورئان تەواونابێت و (ولايُخلق على كثرة الرد) بەزۆر خوێندنەوەی کۆن نابێت و مرۆڤ بێزار نابێت (ولايشبع منه العلماء) زانایان لێی تێرنابن ..

زانایەکی ڕۆژئاوایی لە کۆنگرەیەکی ئیعجازی عیلمی قورئان و سوننەتدا بە ئامادەبووانی وت: ئەگەر ئەو هەموو ڕاستیەی لە ئاینەکەی ئێوەدایە لای ئێمە بوایە دنیامان هەڵدەستانە سەرپێو ئەمان دەهێشت دانیشن. زۆر جێی داخە، بانگخوازێك یان وتاربێژێك کەمینبەرەکەی ڕەسول الله ی لێگرتووین، نەزانێ ئەڵێ چی و وتاری ساڵی پەنجاکان دووبارەکاتەوەو تەنها ئیش ڕایی کات، لەکاتێکدا دوژمنانی ئەم دینە پڕچەك کراون بەهەموو هۆکارێکی سیحراوی سەردەم و پیاوم ئەویّ لە خشتە ئەبرێت .

## ئیمان و زانست:

لە ئەوروپا لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، کێشمەکێشێکی گەورە دروست بوو لە نێوان کەنیسەو زانایاندا، تێگەیشتن لەدەقەکان و بیرکردنەوەی ئازاد لە لایەن پاپاکان وقەشەکانەوە قۆرخ کرابوون،سەرانی کەنیسە دەیانویست قسە نەبێ لەسەرو قسەی خۆیانەوە و کەس قسە لەقسەیاندا نەکات، دیارە ئەمەش لەگەڵ فیترەتی مرۆڤدا ناگونجێ، بۆیە پێکدادان دروست بوو، زانایان لێکۆڵینەوەیان دەکردو بیروبۆچوونی خۆیان بەخەڵکی دەگەیاند، سەرانی کەنیسەش دەیانویست ڕێیان لێبگرن .

هەندێ زانا باسی خڕیتی زەویان کرد، سەرانی کەنیسە دژیان وەستانەوەو کافریان کردن و، تەنانەت کارگەیشتە ئەوەی کە زانایەك لەسەر بیروبۆچوونی بسوتێنرێ، ئەمە درێژەی کێشا هەتا کەنیسە و زانست لەیەك جیاکرانەوەو بیروبۆچوونی کەنیسە خرایەوە ناوچوار دیواری خۆی .

هەندێ کەس ویستیان ئەم ئەزموونە تاڵەش بگوێزنەوە لای ئێمەو، ئیسلام لە چوار دیواری مزگەوتدا بەندبکەن، دیارە ئەمەش نەچووە سەربۆیان، چونکە هەرگیز ئیسلام دژیزانین وزانست نەبووە، بگرە هەمیشە هانی بیرکردنەوەو سەرنجدانی داوە و، فێربوونێك کەلەبەر خوابێت بە عیبادەت داویەتیە قەڵەم . ئەوەتا قورئان دەفەرموێت :

﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾يونس: ١٠١

﴿ إِنَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ الجاثية: ٣ – ٤

﴿ قُلْ سِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأَخِرَةَ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ العنكبوت: ٢٠

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ

وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۗ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾ الأنعام: ٩٩ .

واته: پێیان بڵێ، سەیرکەن چی لەئاسمانەکان وزەویدایە، بەڕاستی لەئاسمانەکان و زەویدا بەڵگەونایاتی زۆر هەیە بۆ بڕواداران و لەدروستبوونی خۆتان و گیانلەبەرانی دەوروبەرتان بەڵگەی زۆر هەن بۆگەلێك کە یەقینیان هەبێ، پێیان بڵێ: بگەڕێن بەزەویدا سەیربکەن ژیان چۆن دەستی پێکردوە، هەروەها سەیرکەن درەختەکان چۆن بەروبووم دەگرن و چۆن ئەو بەروبوومە پێدەگات .

لەبارەی زانایانیشەوە دەفەرموێت:﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ آل عمران: ١٨، واتە: خوای گەورە خۆی شایەتی داوە ودەریخستووە و سەلماندویەتی کە بەڕاستی جگە لەو هیچ خوایەکی ترنیە کە شایانی پەرستن بێت، هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانستەکانیش (لەپێغەمبەران وزانایان)، کە بەڕێگەیەکی ڕاست و دروست ئەیسەلێنن خوا هەمیشە دادپەروەری ڕەهایە و جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە و ئەو بالآدەست و دانایە.

*﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴾ فاطر: ٢٨واتە: بەڕاستی زانایانن کە لەخوا دەترسن .

*﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾ سبا: ٦ ، واتە: ئەوانەی زانست و زانینیان لایە، ئەهلی کیتاب یان زانایانی تر، شایەتی ئەدەن کە ئەمەی لەخواوە بۆت هاتووە هەق و ڕاستی‌یە.

*﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ المجادلة: ١١. واتە: خوای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لەئێوەو ئەوانەشتان کە زانست وزانیاریان پێدراوە چەندە ها پلە بەرزیان دەکاتەوە ..

## سەرنجدانی گیانلەبەران:

یەکێ لەو بەدیهێنراوە سەیرانەی کە سەرنجی زانایانی ڕاکێشاوە، ورچی قوتبەکانە کە لە باروزروفێکی زۆر قورسدا ئەژی و، بەردەوام سەهۆڵ وبەستەڵەك ناوچەکانی داپۆشیوە، خوای گەورە بەجۆرێك ئەو ورچەی دروستکردووە کە بەرگەی ئەو بارووزروفە بگرێت، لەژێر پێستەکەیدا چینێك چەوری هەیە بە ئەستووری (١٠) سم، ئەمەش بۆئەوەی ببێت بە چینێکی نەگەیەنەری گەرمی، وەبەهۆی ئەمەشەوەیە کە ئەتوانێ بە دەسەعات دووهەزار کیلۆمەتر ببڕێت لەناو ئەو دەریا بەستەڵەکانەدا، بۆخواردنی ئەوجۆرە ورچەش خوای گەورە گوێرەکەی دەریای داناوە، کە لەناو ئەو دەریا بەستووانەدا ئەژی، ورچەکە توانای بۆنکردنی بەهێزەو نێچیرەکەی خۆی دەدۆزێتەوە تەنانەت ئەگەر لەژێر (١،٥) مەتر سەهۆڵیش دابێت.

هەروەها دۆلفینیش لەدەریادا زۆر بەخێرایی مەلە دەکات و گێژەڵوکەیەك لەناوەکەدا دروست دەبێت کەکارناکاتە سەرلاشەی بەهۆی پێکهاتەی پێستی دۆلفینەوە کە سێ چینە و دەتوانێ ئەو فشاری ئاوە بۆێ ..

هەروەها هەندێ تۆو هەن ژەهراوین، باڵندەی(ماکۆ) کە جۆرێکە لە تووتی و لە ئەمریکا دەژی، کە ئەو تۆوە ژەهراوییە دەخوات یەکسەر دەچێت بۆناوچەیەك کە جۆرێك قوڕی خەزەفی لێیەو پارچەیەکی دەشکێنێ و قوتی دەدات، ئەوقوڕە خەزەفییە ژەهرەکە دەمژێ و بەمەش باڵندەکە لە ژەهری تۆوەکە ڕزگاری دەبێت.

زانایان لەڕێی وردبوونەوە لەدروستکراوەکانی خواوە، زیاتر دەسەڵاتی پەروەردگاریان بۆ دەردەکەوێت وزۆریان دێنەوە بەرەوئیمان و ئیسلامەتی، وەك زانای ئەورووپی (میلان)کە لەکۆتایی کۆنگرەی هەشتەمی ئیعجازی عیلمی قورئان و سوننەتدا موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاندو وتی: من سی و پێنج ساڵ دووربووم لەخواو لەئیمان، بەڵام لەڕێی دیراسە ولەڕێی زانستەوە ڕێی ئیمانم دۆزیەوە ...

## أنطواني فلو:

یەکێکی ترلەو زانایانە ناوی (أنطواني فلو)یە، کە پرۆفیسۆرێکی بەریتانی‌یە لەبواری فەلسەفەداو تەمەنی هەشتاویەك ساڵەو، لەپانزە ساڵیەوە ڕێی ئیلحادی گرتۆتەبەر.

لەساڵی (١٩٥٠)دا لە بواری ئەکادیمی‌دا ناسرا بەهۆی وتارێکەوە کە بڵاوی کردەوە، دەیان ساڵ دیفاعی لەبیروڕای خۆی و لەئیلحاد کرد لە زانکۆی ئۆکسفۆردو ئەبیردین و زۆر لەزانکۆکانی ئەمەریکاو کەنەدا، کەمامۆستا بوو تیایاندا..

لەم ساڵانەی دواییدا ناوبراو ئیمانی هێنا بەوەی کەخوایەکی باڵادەستی حەکیم هەیە کەئەم بوونەوەرەی بەدیهێناوە.

ناوبراو پاش شەست ساڵ لە فیکری ئیلحاد بۆی دەرکەوت کە لەگومڕایی و سەرگەردانیدایە، بەهۆی وردبوونەوەی لەدیراساتی زانستی زانایانی زیندەوەرزانی لەبواری (DNA) دا، کەزۆر ئاڵۆزو سەرسوڕهێنەرە، زانایان بەئاشکرا پاش دیراسەی (DNA) وتیان کە حەتمەن خوایەکی باڵادەست هەیە کە ئەم (DNA)ە یەی بەم جۆرە بەدیهێناوە ..

بەڵێ، شێوەی لولپێچی ئەو (DNA)ە یە وەڵامە بۆ هەموو ئەوانەی کە دەیانوت مرۆڤ وبوونەوەر بەڕێکەوت دروست بوون، دیارە ڕێکەوت ئەستەمە بتوانێ (DNA) ڕێك بخات ..

زانای بەناوبانگ (فرانسیس کریك) کەیەکێ بوو لەوانەی شێوەی لول پێچی‌یەکەی دۆزیەوە ئیعترافی کرد کە موعجیزەیەك هەیە لەپشت هەقیقەتی ئەسڵی ژیانەوە، زانایەکی تریش بەناوی (لید ادلمان) لە زانکۆی (ساوپ کالیفۆرنیا) لەلۆس ئەنجلوس ڕایگەیاند کە یەك گرام لەو (DNA) یە توانای خەزنی ئەوەندە زانیاری هەیە کەلەیەك ترلیۆن سیدی (مضغوط)دا جێی دەبێتەوە.

لەکاسێتێکی ڤیدۆییدا بەناونیشانی (ئایا زانست بوونی خوای دۆزیوەتەوە؟) (أنطواني فلو) بە ئاشکرا باسی جوانی ومەزنی دروستکراوەکانی خوا دەکات و باسی هەرەسهێنانی فیکری ئیلحادی دەکات .. هەروەها لە هەوڵی زۆردایە بۆ گێڕانەوەی ئەوانەی کەشوێن پێیان هەڵگرتووە لەئیلحاداو دەڵێت: (لەبەرئەوەی بەدڵنیاییەوە بیروبۆچوون و نووسینەکانم کاریان

کردۆته سەرکۆمەڵێك کەس، من ئەمەوێ ئەو زەرەروزیانە فیکرییەی پێم گەیاندوون ڕاستی بکەمەوە)[1]

## دکتۆر برونۆ غیدرۆنی:

ناوبراو کە بەڕێوەبەری مرصدی فەلەکییە لە فەڕەنسا و بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوەکانی ئەستێرە و هەسارەکانە لەبنکەی نیشتمانی بۆ لێکۆڵینەوەی زانست و، پسپۆڕە لەپێکهاتن و پەرەسەندنی هەسارەکان و، نزیکەی (١٠٠) لێکۆڵینەوەی بڵاوکردۆتەوەو ژمارەیەکی زۆر کۆنگرەی زانستی فەلەکی نێو دەوڵەتی ڕێکخستووە ..

ئەم زانایە یەکێکە لەشارەزاکانی بواری ئیسلامەتی لەفەڕەنسا و پەنجا باسی بڵاوکردۆتەوە لەبارەی عیلمی کەلام و تەصەوف .لەنێوان ساڵانی (١٩٩٣ تا ١٩٩٩) بەرنامەیەکی هەبوو لە تەلەفزیۆنی فەڕەنسی بەناونیشانی (ناسینی ئیسلام)، ئێستاش سەرۆکی دەزگایئیسلامە بۆ دیراساتی عولیای پێشکەوتوو.

برۆنۆ غیدرۆنی کەناوی خۆی کردووە بە (عبدالحق) دەڵێ: ئێمە وەك موسڵمان دەزانین کەجیاوازی نیە لە نێوان هەقیقەتی زانستی و هەقیقەتی ئاینیدا، بەڵام گەیشتن بەهەقیقەتی زانستی لەڕێی تاقیکردنەوەو دیراساتەوەیەو گەیشتنیش بە هەقیقەتی ئاین لەڕێی وەحییەوەیە، ئەوەتا قورئان لەیەکەم ئایەتیەوە ئاماژە بۆ ئەم ڕاستی یە دەکات و دەفەرموێ:

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴾ العلق: ١ – ٣..

ئاشکرایە یەکێ لەناوە پیرۆزەکانی خوایگەورە (الحق)ە منیش کە (عبدالحق)م ئەرکی سەرشانمە کە هەوڵ بدەم وکاربکەم تاله هەقیقەتی زانستی و هەقیقەتی ئاینی تێبگەم .

## دکتۆر مصطفی محمود:

دکتۆر مصطفی محمود یەکێکە لەو کەسایەتیانەی کەڕۆڵێکی باشیان بینیوە لەبواری نوسین و ناساندنی ئیسلامدا، ناوبراو پزیشکی پسپۆڕ بوو لەنەشتەرگەری مێشك و ئەعصاب دا، ئەمەبێجگە لەوەی ئەدیبێکی شارەزاوڕۆشینبیر بوو.

---

١- (پێگەی هارون یەحیا)

لەزەمانی عبدالناصردا لە میسر، فەرمانێك دەرچووکە کەس نابێ دووکاریکات، ئەمیش وازی لەبواری پزیشکی هێناو خەریکی کاری ئەدەبی بوو.

سەرەتا بەئیلحاد دەستی پێکرد، وای دەزانیکەعیلم ئەتوانێ وەلامی هەمووشتێکی باتەوە، بەلام کەگەیشتە ئەو ئەنجامەی کە زانست بواری تایبەتی سنوورداری خۆی هەیە و زۆر شت ئەمێنێ کەوەلامی بۆی نیە، کەوتەگەڕان بەئاینی زرادەشتی وبوزی و دواتر ڕێی خۆی دۆزیەوە لەقورئاندا.

پرسیاری لێکرا پزیشك چۆن دەتوانێ ئەدیب بێت، وتی: پزیشك پەیوەندیەکی بەهێزی بەژیان و نهێنیەکانیەوە هەیە، تەنها پزیشکە کە زۆر ئامادەی ساتەوەختی لەدایك بوون و دواساتەکانی مردن و گیان کێشان دەبێت .

لەتەمەنی لاوێتیدا ڕۆشنبیران و قەڵەم بەدەستەکان چاویان بەماددیەت وغەرب بە شەوارەکەوتبوو، بۆیە ئەمیش کەوتبووە ژێر کاریگەری ماددیەت وئیلحادەوە، ئەم گەشتەشی سی ساڵی خایاند لەگەڕان بەکتێب وشەوخونی وبیرکردنەوە تاگەیشتە یەقین، پەڕاوێکیشی نووسی بەناوی (رحلتي من الشك إلى الإيمان) کە باسی گەشت و ئەزمونی خۆی دەکات لەکوفرەوە بەرەوئیمان .

دکتۆر مصطفی محمود ویستی بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنی پێشکەش بکات بەناوی (العلم والإيمان)، تەلەفیزیۆنی میسری بودجەیەکی زۆر زۆر کەمیان بۆدانا کە٣٠ جونەی بوو بۆ ئەڵقەیەك، ئامادەکردنی ئەوبەرنامەیەش ئەو بڕە پارەیە بەشی نەدەکرد چونکە سەفەرکردنی دەویست بۆ بنکە زانستیەکانی ولاتانی بیانی و ئاگاداربوون لەدوادۆزینەوەکان.

خوای گەورە کارەکەی بۆئاسان کردو پیاوێکی خواناسی دەوڵەمەند کە بەمەی زانی چەکی پڕنەکراوەی دایە کەچەندی دەوێت دەیداتێ بەمەرجێ ئەوبەرنامەیە بۆ خزمەتی ئیسلام بەرهەم بهێنێ، بەلا .. دکتۆر توانی بەهاوکاری ئەو خێرخوازە (٤٠٠) ئەڵقەی ﴿العلم و الإيمان﴾ بۆ تەلەفیزیۆن بەرهەم بهێنێ کەکارێکی زۆر مەزن بوو بۆ خزمەتی ئیسلام، دواتر تەلەفیزیۆن بەبێ هۆ بەرنامەکەی وەستان.

ئێستا دکتۆر پیربووە ولەجەناحێکی مزگەوتەکەی خۆی (مزگەوتی مصطفی محمود)دا ئەژی کە لەساڵی (١٩٧٩)دا دروستی کردووە، لە مزگەوتەکەدا سێ بنکەی تەندروستی هەیە کە چارەسەری هەزاران دەکات و لە مەرکەزەکەشی دا چوار تەلەسکۆب هەیە و چەند

مامۆستایەك وانەی فەلەك دەڵێنەوە، لەو ڕوانگەیەوە کە سەیرکردن و بیرکردنەوە لەئاسمانەکان و زەوی بەشێکە لەعیبادەت، هەروەها مزگەوتەکە مەقەفێکیشی تیایە..

پاش گەشتێکی دوورو درێژی ژیان دەڵێ: (ئەگەر پرسیارم لێبکرێ پاش ئەم گەشتەی ژیانم، کە ئایا من چیرۆك نووسم یان هونەرمەند، یان پزیشك دەڵێم: ئەوەی کە من مەبەستمە لەژیانمدا ئەوەیە کە خزمەتکاری وشەی (لاإله إلاالله)بم و بە ژیانم و بەزانینەکەم ڕێی خێر پیشانی خەلکی بدەم.[1]..

# موعجزاتی قورئان و سوننەت

## یەکەم: بوردیەی ئەبیور

یەکێك لە موعجیزەکانی قورئان ئەوەیە کە باسی ڕووداوو بەسەرهاتی مێژوویەکی دێرین دەکات،کە لەو ڕۆژگارەی پێغەمبەردا ﷺ نەخۆی و نەگەلەکەی نەیاندەزانی، هەروەك قورئان لەم بارەیەوە دەفەرموێت:﴿ تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَاصْبِرْ ۖ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ هود: ٤٩.

ئەم قورئانە وەحی‌یەو لە خوایەکەوە هاتووە کە زانایە بەهەموو نهێنیەکانی ئاسمانەکان و زەوی، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ الفرقان: ٦ .

فیرعەونەکان کە هەزاران ساڵ لەپێش پێغەمبەردا ﷺ ژیاون، قورئان باسی خۆی و گەلەکەی دەکات تاببێ بەپەندو عیبرەت بۆ موسڵمانان.

فیرعەون یەکێکە لەوفەرمانڕەوایانەی کە لەوێنەیان کەمە لەمێژوودا، لەزەبرو زەنگ و خودسەریدا، کە خۆی لەخەڵکی کردبوو بەخواو دەیوت:(أنا ربكم الاعلى)خوای گەورەش کردی بەپەندی زەمانە ﴿ فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَىٰ ﴾ النازعات: ٢٥. خوای گەورە (موسا)ی بۆ ناردن بەبەڵگەو بورهانی ئاشکراوە، وەك عەساکەی دەستی کە فڕێی ئەدا ئەبوو بە مارو کە

---

[1] - (إسلام اون لاين).

ئەیگرتەوە ئەبووەوە بەعەساکە، قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَـٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِىَ عَصَاىَ أَتَوَكَّؤُا۟ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى وَلِىَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا يَـٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴾ طه: ١٧ - ٢٠ هەروەها دووموعجیزەی تریشی هەبووکە قورئان لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿ ٱسْلُكْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ وَٱضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهْبِ ۖ فَذَٰنِكَ بُرْهَـٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴾ القصص: ٣٢ واتە: دەستت بخەرە باخەڵتەوە، کە دەرت هێنا سپی دەبێت بەبێ ئەوەی هیچی بێت، هەروەها لەترس و بیمدا بازووەکانت بهێنەرەوەیەك ئامێنێ، ئەم دوو موعجیزەیە دووبەڵگەن لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ سەر فیرعەون و دارو دەستەی، بەڕاستی ئەوانە گەلێکی یاخی و ئالەبارو تاوانبار بوون .

ئنجا پەروەردگار کە ئەوموعجیزانەی بۆ ناردن و بڕوایان نەکرد تووشی ئەبوونی و وشکە ساڵی و کەمی بەرووبومی کردن، بەڵکو بگەڕێنەوە وپەند وەرگرن: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾ الأعراف: ١٣٠، لەجیاتی ئەوەی بڕوا بهێنن بە موسا پێیان وت: هەرچی بکەیت ناتوانی جادوومان لێبکەیت، ئنجا پەروەردگار چەند بەڵایەکی بۆناردن کە لەوە ناچێت لەهەموومێژوودا هیچ گەلێك ئاوا تاقیکرابێتەوە، خوای گەورە بەڵای لافاووکوللەوئەسپێ وبۆق وخوێنی بۆناردن، لە کاتێکدا ئەوانە چەندەها بەڵگەی ڕوون بوون، کەچی ئەوان هەر لووت بەرزیان کردو خۆیان بە گەورەزانی، بەڕاستی گەلێکی تاوانبار بوون.

جاکاتێکیش هەر بەڵایەك لەو بەڵایانە بەسەریانا دەهات پەنایان دەبرد بۆ موسا و دەیانوت: ئەی موسا فریامان بکەوە، لە پەروەردگارت بپاڕێرەوە بۆمان، بەو پەیمانەی کە خوا لای داناویت، سوێند بە خوا ئەگەر ئەم بەڵایانەمان لە سەرهەڵگرێ ئەوسا بێگومان باوەڕت پێ دەکەین و ئەوەی ئیسرائیلیش ئازاد دەکەین و لەگەڵتا دەنێرین، جا کاتێك بەڵاکانمان لەسەر لادەبرن بۆکاتێکی دیاریکراوکە ئەوان پێی دەگەیشتن، ئەواخێرا پەیمانەکانیان دەشکاندو لەسنوور دەردەچوون، جائێمەش تۆڵەمان لێسەندن و نوقمی دەریامان کردن، چونکە ئەوان باوەڕیان بەبەڵگەو موعجیزەکانی ئێمە نەبوو بەدرۆیان دادەناو ئەوان لێی بێئاگابوون

﴿ وَقَالُوا۟ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُوا۟ يَٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَٰفِلِينَ ﴾ الأعراف: ١٣٢ - ١٣٦. جا ئەوانەی قورئان لەم مەسەلەیەدا باسی کرد هەندێکی لەتەورات و ئینجیلدا هاتووە و هەندێکیشی تیا نەهاتووە، بۆ نموونە باسی (تۆفان)ە کە تەنها لە قورئاندا هاتووە، هەروەها غەرق بوونی فیرعەون و تیاچونی و دەرهێنانەوەی بەوشێوەیەی لەقورئاندایە لای ئەوان باسی نەهاتووە، دیارە تەنها قورئانە کە پارێزراوە لەخواوەو، پەڕاوەکانی تر هەمووی دەستکاری کراون و بەردەوامیش دەستکاری دەکرێن، بۆ نموونە ئینجیلەکان چەند جۆرن وجیاوازی زۆر لەنێوانیاندایە .

هەروەها تاچەند سەدەش دوای پێغەمبەرﷺ تەورات و ئینجیل وەرنەگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی و تەنها زانایانی گاور و جوولەکە دەیانزانی.

زۆر لەو ڕاستیە مێژووییانەی قورئان باسی کردون، پاش هەندێ دۆزینەوەی ئاسەواری‌مێژوویی‌کە هەزاران سال لەمەوبەر بەزمانی هیروگلیفی تۆمارکراون دەبنە بەلگەی ڕاستی قورئان بۆ خەلکی، لەسەرەتای سەدەی هەژدەیەمی زاینیی بوردی‌یەکی کۆن دۆزرایەوە کە حەفدە لاپەڕەیە، لەناوچەی (منفیس) لە نزیک ئەهراماتی (سقارە)لە میسر، مۆزەخانەی نیشتمانی لیدن لە هۆلەندا ئەو بوردی‌یەی کڕیەوە لەسالی (١٨٢٨)ز دا کەباسی سەردەمی فیرعەون دەکاو بەزمانی هیرۆگلیفی نووسراوەتەوە، وە ژمارەکەشی لە مۆزەخانەکەدا (٣٤٤)ە و بە (بوردیەی ئەیبور) ناسراوە ..

لەسالی (١٩٠٨)دا زانایەك توانی زمانی هیرۆگلیفی بخوێنێتەوە و بە بجۆرەش زانایان توانیان لەو حەفدە لاپەڕەیە تێبگەن کەباسی سەردەمی فیرعەون وبەلاو موسیبەتەکان دەکەن بەم شێوەیە:

أ- وشکە سالی: لەلاپەرەی (٢،٣،٤،٥،٨،١١) باسی وشکەسالی و وێرانی ولات کراوە..

ب- خوێن: لەلاپەرەی (١٠،٢،٦،٧) داباسی ئەوە دەکات کە ئاوی نیل بووە بەخوێن، هەروەها دەڵێ:موسیبەت لە هەمعوولایەکەوەیەو خوێنیش لە هەمعوو ئەرزی میسردایە ..هەمعوو ئاوی ڕووبارەکە بووە بەخوێن، خەڵکی وازیان هێناوە لەئاو خواردنەوە و تینویەتی بڵاوبۆتەوە ..

هەروەها لە لاپەرە (١٣) دا دێری (١٠) دەڵێت (ئەوە ڕووبارەکەمانە ئەوە ئاوی خواردنەوەمانە، ئەوە سەرچاوەی بەختەوەریمانە، نازانین چی بکەین). ئەمەش بەڕاستی بەڵایەکە لەوەناچێ هیچ گەلێکی تری پێ تاقیکرابێتەوە، قورئان هەروا ئاماژەی بۆ دەکات(والدم)، بەخوێن تاقیمان کردنەوە، بەڵام ئەگەر سەیری ئەو نووسینانە بکەیت تێ دەگەیت چ کارەساتێك بووە، چ غەزەبێك بووە خوا لێی‌گرتوون؟! ئاوی ڕووباری نیل سووربێ بەخوێن، ئاوی بەرمیل و دۆلکە و پەرداخ و مەرکانە و گشت شتەکان لەپڕ بن بەخوێن ؟! بەڕاستی ئەمە هەر لەدەست خوا دێت .. کەچی وەرە بەو موعجیزە گەورەیە، بەوبەڵا لەوێنە نەبووەش نەگەڕێنەوە!

ج- کەمی بەرووبووم ... دیارە کەئاو نەما بەرووبومی چی ؟ کەبەرەکەتی خوایی نەما بەرووبووم لەکوێ‌دەمێنێ ؟! لاپەڕەی شەش دێڕی یەك دەڵێ: درەختەکان بەرووبوومیان نەماوە و زەویش سەوز نابێ و لەوەڕ نیە.

لاپەڕە (١٠) دێڕی دوو دەڵا: (سوتان و ئاگرکەوتنەوە زۆر بووە).

لاپەڕە شەش دێڕی (٣) دەڵێ (دانەوێڵە لەهەمعوو شوێنێك خراپ بوو، نەما)، لەلاپەڕە (٦) دێڕی یەکەم دەڵێ: هیچ نیە لێرە نەبەرووبووم و نەگژوگیا، هیچ نیە لێرە مەگەر برسێتی.

لەلاپەڕە (٣) دێڕی (١٠) ولە لاپەڕە (٦) دا دەڵێ: میسر گریا، سەرچاوەی ژیان نەما، کۆشکەکان گەنم و جۆویاڵندەو ماسی تیانەما ..

لەلاپەڕە (٥)دێڕی (٥)دەڵێ (تەنانەت مەڕومالاتمان دڵیان گریا)، هەروەها لەلاپەڕە (٢) دێڕی (٩) ولاپەڕە (٣) دا دەڵێ: ئەوە مەڕومالاتە وازی لێهێنراوەو کەس نیە بیلەوەڕێنێ ..

د- مردنی فیرعەون وغەرق بوونی:

لەلاپەرە حەوت دێڕی یەك و لاپەڕە (٢)دا دەڵێ (ئەوە فیرعەونە نەما لەبارو زرووفێکدا کە لەوەوپێش شتی وا ڕووی نەداوە) .

لەم لاپەڕانەدا باسی بۆق و باسی (ئەسپێ) نەهاتووە، ئنجا دیارە لەلاپەڕەی تردا هاتووە وڕەنگە لەناوچووبن یان نووسەرەکە ئاماژەی بۆ نەکردووە، بە هەرحاڵ لە پەڕاوی "(آثارمصر

القـــلم)ج:١ " دا کـە جێمس بیکـی نووسـیویەتی دەڵـێ: (لەدۆزینـەوە سـەیرەکانی زانـای شوێنەوارناس (بتری) لە کاتی گەڕانیدا لـە سـاڵی (١٩٠٥ — ١٩٠٦)دا لـەگردی (الرطابـــة)، سـوراحی‌یەکی خـەزەفی شـینی دۆزیـەوە کـە (١٩)بـۆق بەدەوریایـەو چـەند بـۆقێکیش پیـا سەردەکەون و ژمارەیەکی زۆریش لەسـەر دەمەکـەین، ئەمـەش لـە پـەڕاوی (فیرعـەونی موسـا کێیە)دا باسکراوە لاپـەڕە(٩١٢)کـە لەلایـەن دکتـۆر رشدی بەدراوییـەوە نووسـراوە، ئەمـەش ڕەنگە ئیشارەت بێت بۆزۆری بۆق لەوسەردەمەی فیرعەوندا .

## دووەم : سـێ ئیعـجاز لـە ئایەتێـکدا:

قورئـانی پـیرۆز دەفـەرموێت: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾ القصص: ٣٨ ئەم ئایەتە سێ لایەنی ئیعجازی تیایە:

١- فیرعـەون خـۆی لـە خـەڵکی دەکـات بـە خـوا، (مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى)، ئەمەش دیارە مەسـەلەیەکی مێژوویی گرنگە، چونکە گەلێکی خاوەن شارستانی پێش زیاتر لـە چـوار هـەزار سـاڵ لـە ناوچـەیەکی دوور لـە نیـوە دورگـەی عـەرەب کـێ دەزانـی کـە پاشـای سەردەمێك، کە سەردەمی موسایە سەلامی خوای لێبێت، چی پەرستووە؟

چی بەخەڵك وتووە؟ خەڵك هەڵوێستی چی بووە؟ بە دەیان پرسیاری تر کە لەم بوارەدا دێنە پێشەوە،قورئان وەڵامی ئەمانە ئەداتەوە بەپێی پێویست وبەرنامەیەکی پەروەردەیی تایبـەت و، دۆزینەوەکانیش لەم سەدانەی دواییدا جەختیان کردە سەرڕاسـتێتی قورئان..

زانایـانی شـوێنەوارناس و پسـپۆڕانی بـواری مێـژوو دەڵـێن: فیرعەونـەکان لـە (ئوسـرەی چوارەمەوە)دەیان وت کە کـوڕی خـوای (رع)ن کـە خـوای خۆرە (إلـه الشمس)ە کـە میسـریە کۆنەکان دەیان پەرست، ئەمـەش وای کرد کە نازناوی (رع) بچێتە سـەر ناوەکانیـان، وەك (رع نب) واتە خوای ئاڵتون، زانای شوێنەوارناس (بریسـتد) دەڵێت: بەڵگەیـەکی ڕوون لـەم بـوارەدا سروودی خۆرە، کە تیایدا ناسنامەی پاشای میسر بەوە دێت کە(إلـه الشمس)ە..

ئەگەر خوای‌گەورە پێغەمبەری فێرنەکردبێ‌چۆن دەتوانێ ئاوا باسی گەلێك بکات کە پـێش سـەردەمی ئـەو ژیـاون بـە هـەزاران سـاڵ و لـە وڵاتێکـی دوور لـە وڵاتەکـەی بـوون و، هـەموو فیرعەونەکانیش چوونیەك نەبوون .

٢- ئەگەر خوا نەبێ کێ دەزانێ کە ئەوان چیان بۆ بیناکردن بەکار هێناوە، قورئان لە باسی ئەو سەردەمەی فیرعەون دا دەفەرموێت: خشتی سورەوکراویان بەکارهێناوە، لە کاتێکدا کە زانایان لەو بڕوایەدا نەبوون کەخشتی سورەوکراو لەپێش سەردەمی ڕۆمانیدا بەکارهاتبێ لە میسری کۆندا، ئەمە مایەوە تا زانای شوێنەوارناس(بترى) بڕێك خشتی سوورەو کراوی دۆزیەوە لە بناغەی هەندێ بینا و هەندێ گۆڕدا، کە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە قورئان باسی دەکات﴿ فَأَوْقِدْ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّي صَرْحًا ﴾

٣- قورئان باسی کەسێك دەکات کە فیرعەون کاری بیناکردنی پێ سپاردووە و ناوی دەبات بە(هامان)ئەمیش موعجیزەیە، چونکە ناوی هامان کە لە زەمانی فیرعەوندا بێت لە تەورات و ئینجیلدا نەهاتووە، دکتۆر مۆریس بۆکای دەڵێت: چووم بۆلای زانایەکی فەرەنسی شارەزا لە بواری مێژووی میسردا، ناوی(هامان)م بۆ نووسی و وتم: ئەمە لە سەدەی حەوتی زاینیدا باسی هاتووە، تۆ ئەڵێی چی؟وتی:ئەستەمە شتی وا ببێت، چونکە ئەم ناوە ناوێکی هیرۆگلیفی‌یە و کەسیش تا ئەم دواییە لەم زمانە تێنەگەیشتووە.. لەم سەدانەی دواییدا کە ئەو زمانە دۆزرایەوەو ئاسەواری فیرعەونەکانیان خوێندەوە، بینیان کە کەسێك بە ناوی (هامان) بەرپرسی بیناکردن بووە لە زەمانی فیرعەونداو، وتی: بڕۆ سەیری (معجم اسماء الاشخاص فى الامبراطورية الجديدة) بکە کە ناوی پاشاکانی میسر و کەسایەتیەکانی کۆنی تیایە،کە گەڕام ئەوەی سەیر بوو ئەو ناوەم دۆزیەوە..

هەروەها بینیم (بە زمانی ئەڵمانی)باس لە کاری ئەو (هامان)ە دەکات کە پلەو پایەی هەبوەوسەرۆکی کرێکارە بەرد هەڵکەنەکان بووە..کە ئەمەش ڕاستێتی قورئان دەردەخات کە دەفەرموێت﴿ فَٱجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾

## سێیەم: فیرعەونی ذي الأوتاد:

قورئانی پیرۆز باسی فیرعەون دەکات بەسیفەتێکی‌کە ئەویش فیرعەونی(ذو الاوتاد) ە و دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ۝٦ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ۝٧ ٱلَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي ٱلْبِلَٰدِ ۝٨ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُوا۟ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ ۝٩ وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ۝١٠ ٱلَّذِينَ طَغَوْا۟ فِي ٱلْبِلَٰدِ ۝١١ فَأَكْثَرُوا۟ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ۝١٢ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ۝١٣ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ﴾ الفجر: ٦ - ١٤

ناخۆمەبەست چی بێت لە( ذوالاوتاد)؟؟، لەتەفسیرەکان دا هاتووە کە مەبەست لەفیرعەونی خاوەن بینای مەحکەم و دەسەڵاتی چەسپاوە، دیارە ئەم سیفەتە بەم جۆرە بێت گشتی‌یەو فیرعەونەکانی تریش هەمان سیفەتیان هەبووە، تۆ بڵێی فیرعەونی زەمانی (موسا) ناوی (ذو الاوتاد) بوویێ؟؟ بەڵێ، ئەمەش ئەو دۆزینەوەیە یە کە (دکتۆر علی فهمی خشم) لە پەڕاوەکەیدا (الهة مصر العربية) باسی دەکاو دەڵێ: دواپاشای خێزانی یەکەم کە لە لیستی (مانیتۆ)دا ناوی هاتووە، ناوی (بیینخێس) بووە.

ئەم وشەیە لەسێ بەش پێك هاتووە لەزمانی میسری کۆن دا :(بی، ان، خیو) کە ماناکەی(بی،ان)واتە (ذو ال) وە (خیو)ش واتە (اوتاد) وە (س)ەکەش زیادکردنی یۆنانیەکانە بۆناوەکان .

کەواتە(**ذوالاوتاد**)وەرگێڕانی‌ناوی فیرعەونەکەیە،کە سەردەمەکەی‌دەگێڕێتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ پێش زایین، کەبەڕاستی موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە وەك موعجیزەکانی تری قورئان.[1]

دیراسەکردن بەردەوامە بۆ زانینی مەبەستی قورئان لە (ذو الاوتاد)، هەندێ زانای تردەڵێن: فیرعەونەکان کەڕێزیان بۆ (اله شمس) دائەنا، لە بەردەم پەرستگاکانیاندا (مسلّة) یان دروست دەکرد، کە بریتی بوو لە پایەیەکی چوارلای بەردی بەرز هەروەکو منارەی مزگەوت، کە لەسەرەوەی باریك دەبێتەوە، ئنجا بە مس یان بە ئاڵتون دادەپۆشرا بۆ ئەوەی کە خۆر لێی دا لە دوورەوە ببریقێتەوە، جایەکێ لەم مەسەلانە لەژێریا بەزمانی هیرۆگلیفی‌کۆن دێڕێك نووسراوەکە بەئیلاهی‌خۆردەڵێت (تۆ ئەدرەوشێیتەوە لەم (أوتاد)ە بەردینەدا) ..

زۆر لەفیرعەونەکان (أوتاد)یان دروست کردووە، بەڵام ڕەمسیسی دووەم زۆرترین ( أوتاد)ی دروستکردووە کەدەگاتە نزیکەی (٣٠) دانە، جابۆیە ڕەنگە فیرعەونەکەی سەردەمی موسا(سەلامی‌خوای لێبێت) ڕەمسیسی دووەم بێت، ئەمەش بۆچوونێکەو دیراسات بەردەوامە .

## چوارەم: بەنی ئیسرائیل لەقورئان دا:

قورئانی پیرۆز لەزۆر ئایەتدا باسی بەنی ئیسرائیل دەکات، ئەمەش بۆ ئەوەی ببێت بە پەندوعیبرەت بۆ موسڵمانان، بۆنموونە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ

---

١- پەڕاوی (اليهود بين القرآن والتوراة ومعطيات العلم الحديث/عبدالرحمن غنيم).

ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱسۡمَعُواْۖ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَأُشۡرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡعِجۡلَ بِكُفۡرِهِمۡۚ قُلۡ بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ البقرة: ٩٣

واتە: یادیان بێنەرەوە ئەوسەردەمەی کە پەیمانمان لێوەرگرتن وکێوی گورمان بەسەردا بەرزکردنەوەو، فەرمانمان پێدان: ئەوەی پێمان بەخشیون لە تەورات بە توندی بیگرن و لێی لامە دەن و گوێڕایەڵ بن، وتیان: بیستمان، کەچی بەکردەوە پێچەوانەیان کردو یاخی بوون و گوێرەکە پەرستی لەدڵ و دەروونیاندا ڕوابوو بەهۆی بێباوەڕییانەوە، پێییان بڵێ: ئیمانەکەتان شتی ناڕەواتان پێدەکات ئەگەر ئێوە ئیماندارن؟!

٢- ﴿ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ وَرَٰعِنَا لَيَّۢا بِأَلۡسِنَتِهِمۡ وَطَعۡنٗا فِي ٱلدِّينِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَقۡوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ النساء: ٤٦ واتە: هەندێك لەوانەی بوونەتە جوولەکە، قسە لەجێی خۆیدا دەستکاری دەکەن وبە ئارەزووی خۆیان لێکی دەدەنەوەو پێت دەڵێن: بیستمان و پەیڕەویشمان نەکردیت، گوێ بگرە دەك گوێت لێ نەبێت !! هەروەها دەیان وت: (راعنا) و دەمیان بۆ خوار دەکردەوە تامانایەکی هەڵە ببەخشێت و ببێتە تەعنە و ڕەخنە لەدین، خۆ ئەگەر بەڕاستی ئەوان بیانوتایە: بیستمان و گوێڕایەڵین و تۆش گوێمان بۆبگرە و مۆڵەتمان بدە تاتێبگەین، چاکترو باشتر بوو بۆیان، بەڵام چونکە پاك نین ودەروونیان نەخۆشە، خوا نەفرەتی لێکردوون بەهۆی کوفریانەوە، بۆیە باوەڕناهێنن کەمێك نەبێت .

عیبارەتی (معناوعصینا) لە هەمووقورئاندا تەنها لەم دووشوێنەدا هاتووە و تەنها جوولەکەش وتوویانە، ئەمەش ڕاستە و ئەمڕۆ زیاتر هەستی پێدەکەین، لە ئایەتی یەکەمدا بەشێوەی ڕابردوو هاتووە (قالوا)، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕابردوویان کە فەرمانی خوایان بیستوەو بێ گوێییان کردووە، کەچی ئایەتی دووەم بەشێوازی بەردەوامی (استمرار) هاتووە (یقولون)، تابەڵگەبێ لەسەر ئەوکاتەو لەسەر داهاتووش کەهەروانەبن .

جانەك هەر گوێڕایەڵ نەبوون بەڵکو دڵیان داخراوەوپەردەی پیادراوەو تەغلیف کراوە بەبەرگی کوفرو سەرسەختی ئەوەتا قورئان لەدووئایەتی تردا هەقیقەتێکی تریان باس دەکات:

١- ﴿ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴾ البقرة: ٨٨ ، وتيـان: دڵەکانمان داخراوە، نەخێر وانیە، ئەوانە خوا نەفرینی لێکردوون بە هۆی کوفرو خوانەناسـیانەوە، کەوابوو کەم بڕوادەکەن .

هەروەها دەفەرموێ:

٢- ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ النسـاء: ١٥٥، واتـە: بـەهۆی پـەیمان شکاندنیان وبێباوەڕیان بەئایەتەکانی خواو کوشتنی بە ناهەقی پێغەمبـەران لەلایـەن ئەوانـەوەو ئەوقسەیەیان کە ئەڵێن: دڵی ئێمە داخراوەو داپۆشراوە، نەخێر وانیە کە ئـەوان دەیڵـێن: بـەڵکو خوا مۆری ناوە بەسەر دڵیانا بەهۆی بێباوەڕیانەوە، جاهەر بۆیە کەمێکیان نەبێت باوەڕناهێنن.

(قلوبناغلف) تەنها دووجارلەم دووئایەتەداهاتووەوبۆجولەکەش بەکارهێنراوە لەیەکەمـدا باسی ڕابردوویان دەکات و لەدووەمیشدا باسی ئەوکاتەو داهاتوویان دەکات، لەیەکەمـدا باسـی نەفرەتی خوائەکات بۆیان و لە دووەمیشدا باسی مۆرکردنی دڵیان دەکات کەئەمەش بۆتە هـۆی ئەوەی ئیمانیان کەمەو کەمیشیان ئیمان دێنن.

جا ئەگەر ئەم قورئانە لەخواوە نەبێت کێ دەتوانێـت باسـی ڕابـردوو داهـاتووی گـەلێکی دیاری کراو بکات و باسەکەش ئاوا لە سەداسەد بێتەدی بەدرێژایی چەندەها سەدە!

ئـەوە حـاڵی جوولەکـەی ئـەم سـەردەمەکە پـاش هـەزار و چـوار سـەد سـاڵ لـە کـاتی هاتنـەخوارەوەی ئەم ئایەتە، کامـەیە ئیمانی جوولەکە؟! دیارە ئیمانیان کەمە وکەمیشیان ئیمان دێنن بەئیسلام و، بۆ خۆشیان ژمارەیان زۆرکەمە، لەوەدەچێت خوا بەرەکەتی لێبڕیبن، ڕەنگە لە هەموو دنیادا ژمارەیان بیست ملیۆنێك بێت.(ئەمـەش بـە پێچـەوانەی گاورەکانـەوە کـەزۆرن و زۆریشیان موسوڵمان دەبن) ..

بەڕاستی ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەی قورئانە،کەهیچ پەڕاوێك نیە هاوشانی بێـت﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ ﴾ (الفرقان: ٦)[١]

---

١- (موسـوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسـنة)

## پێنجەم: مردنی ئەبو زەری غەففاری:

لە غەزوەی تەبوك دا ئەبو زەر حوشترەکەی نەدەڕۆیشت وتەواو دوای خستبوو لە سوپای موسڵمانان، بۆیە ناچار کەلوپەلەکەی دا بەکۆڵیداو شوێن سوپاکەکەوت، لەکاتێکداپێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان لایان دابوو لە دوورەوە ئەبوزەری بینی بەوحاڵە، کە بەتەنها کەلوپەل و شتومەکەکانی بەکۆڵەوەیە و دێ بەرەو لای ئەوان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەتەنهایی دەڕۆیت و بەتەنهایی دەمریت و بەتەنهایش زیندو دەکرێیتەوە.

لە زەمانی خەلیفە عوسماندا ئەبوزەر چووە ناوچەی(الربذة) و بەتەنها لەگەڵ هاوسەرەکەیو غولامەکەیدا ئەژیا، کاتێك لەسەرەمەرگدا بوو ژنەکەی گریا، وتی: بۆچی دەگریت؟ وتی: لەم چۆڵەوانیەدا بەتەنها چیت لێ بکەین وبەچی کفنت بکەین؟ وتی: مەگری من لەپێغەمبەرم بیستووە ﷺ کە فەرمووی: یەکێ لەئێوە لە چۆڵەوانیدا ئەمرێ وکۆمەڵێ بڕوادار ئامادەی جەنازەکەی دەبن، جانەوانەی لەومەجلیسەدا بوون هەموو لەناو خەڵکی و ئاوەدانیدا مردن، تەنها من ماوم،کەئەوەتا لەم چۆڵەوانیەدا ئەمرم، جا چاودێری ڕێگاکە بکە کۆمەڵێ بڕوادار بێرەدا تێدەپەڕن، ژنەکە وتی: کاتی حەج تەواو بووە کێ هەیە بێرەدا بێت، وتی: دەتۆ چاوەڕێ کە! کاتێك ئەبو زەر وەفاتی کرد لەسەر ڕێگاکە دایان نا، ئەوەندەی نەبرد عبداللەی کوڕی مەسعود وکۆمەڵێك کە لەعێراقەوە هاتبوون بۆ عومرە کردن بەویا تێپەڕین و وتیان: ئەمە کێ یە ؟!

هاوسەرەکەی ئەبو زەر وتی: ئەوە ئەبوزەری هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ، ئیتر کفن ودفنیان کرد و عبدالله یکوڕی مەسعود گریا وتی: بەڕاستی پێغەمبەرﷺ ڕاستی فەرمووە (تمشي وحدك وتموت وحدك وتُبعث وحدك).

## شەشەم: نیوەڕۆ خەو :

(CNN) لە۲۰۰۷/۲/۱۳دا لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردەوە بەناوی (بنوون لە نوسینگەکانتاندا تەندروستیتان باشدەبێت) و تیایا دەڵێت: نیوەڕوان سەرخەوێك بشکێنن لەنوسینگەکانتاندا، مەترسی تووشبوونتان بە نەخۆشیەکانی دڵ کەم دەبێتەوە، ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر (۲۳٦۸۱)کەس کرا لەیۆنان لە ماوەی شەش ساڵدا،کەتەمەنی ئەو کەسانەی بەشداریان کرد لە ۲۰ ساڵەوە تا ۸٦ ساڵبوو.

دکتۆر دیمیتریوس که لێکۆڵەره لەکۆلێژی پزیشکی زانکۆی هارفاردو زانکۆی ئەپینا ویەرپرسی ئەم لێکۆڵینەوەیەشە دەڵێت:ئامۆژگاریم بۆتان ئەوەیە ئەگەر دەتوانن ڕۆژانە سەرخەوێك بشکێنن و ئەو فرسەتە لەکیس مەدەن ..

دیراسەکە دەڵێ: ئەوانەی کەسێ ڕۆژی هەفتە ڕۆژی نیو سەعات نیوەڕوان بخەون، کێشەی دڵ ونەخۆشیەکانی‌کەمتر تووش دەبن لە چاو ئەوانەی کە ئەو سەرخەوشکاندنەیان نیە.

شایەنی باسە کە هەندێ کۆمپانیا ڕێ ئەدات بەو سەرخەوشکاندنە بۆکارمەندەکانی لەکاتی پشووی نیوەڕۆیاندا، کەئەمەش بۆتە مایەی زیادبوونی بەرهەمیان، وەك کۆمپانیای (یاردمیتالز)ی ئەمریکی بۆدابەشکردنی کانزاکان.

پاش ئەم دیراسەیە بابگەڕێینەوە لای فەرموودەکانی سەروەرمان کە پێش١٤سەدە زیاتر دەفەرموێت: (قيلوا فإن الشياطين لا تقيـــل)[1]، کە بەڕاستی ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەرئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لەخۆیەوە قسەناکات ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰٓ ۝٣ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾ النجم: ٣- ٤..[2]

**حەوتەم: زەردەخەنە**: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی‌داوە بەڕووگەشی و بوونی زەردەخەنە لەسەر لێو و فەرموویەتی (تبســـمك فى وجـــة اخيـــك صـــدقة)[3]، ئەمەشی لەسەرتاسەری ژیانی‌دا پەیرەوکردووە وهەمیشە ڕووخۆشو دەم بەزەردەخەنە بووە، (جریر) کە هاوەڵێکیتی دەڵێت: هەرکاتێك پێغەمبەرﷺ منی بینیبێت زەردەخەنەی لەسەر لێو بووە بۆم.

ڕۆژێك دەشتەکیەکی وشك وناحاڵی لەپشتەوە یەخەی جلەکانی پێغەمبەر ﷺ بەتووندی ڕادەکێشێت و دەڵێ: ئەی محمد لەوماڵەی خوا کەلاتە فەرمان بدە بەشم بەن، ئەویش ئاوڕی دایەوەو پێکەنی و فەرمانی دا پارەیان دایە.

لەکاتێکدا کە ئەوپەڕی تووڕەبوو لەوانەی کە لە تەبوك دواکەوتبوون، کەچی لەوتوڕەییەشدا زەردەخەنە لەسەر لێوی بوو، هەروەها هاوەڵان کە دادەنیشتن بەیەکەوە باسی سەردەمی نەفامییان دەکرد، پێغەمبەر ﷺ بەلایاندا دەڕۆیشت و زەردەخەنەی لەسەر لێو بوو.

---

١- صحيح الجامع الصغير ٤٤٣١

٢- موسوعة الإعجاز العلمي.

٣- ترمذي.

تەنانەت لەدواساتەکانی ژیانیشی دا کە پەردەی ماڵەکەی عائیشەی لاداوسەیری موسڵمانانی‌کرد کەنوێژیان دەکرد، بۆ دواجار بە زەردەخەنەوە مسوڵمانانی بەجێهێشت.

دیارە پێغەمبەر ﷺ هەر فەرمانێکی داوە بۆ بەختەوەری ئادەمیزادە، خۆشی لەهەمووکەس زیاتر پابەندبووە پێیەوە. ئەوەتا پاش هەزاروچوارسەد ساڵ زیاتر (دیل کارنیگی) لە پەڕاوەکەیدا (کیف تکسب الأصدقاء وتؤثر فی الناس)دا دەڵێت: ڕەنگ و ڕووی مرۆڤ باشترین هۆکارە بۆدەربڕینی (مشاعر)، بۆیە ڕووی‌گەشی و زەردەخەنە باشترین هۆکارە بۆهاوڕێیەتی و هاوکاری خەڵکی، داوام لەقوتابییەکانم کرد هەریەکەیان زەردەخەنەیان لەسەر لێو بێت بۆ کەسێکی دیاری کراو، یەکێ لەقوتابییەکانم کەبازرگان بوو هات وتی: من هاوسەرەکەم هەڵبژارد کە ڕووگەش و دەم بەزەردەخەنە بم لەگەڵیا، لەوەو پێش شتی وای لێ نەبینیبوم، بەم کارە بەختەوەرییەکی نوێم بینی کە پێشتر هەستم پێ نەکردبوو.

پاشان کارنیجی دەڵێت: بیرت بێت کە زەردەخەنە هیچی تێناچێت و هیچی پێناچێت وسوودی زۆریشت لێ‌ی دەکەوێت، کەس نیە نەتوانێ بیکات و کەسیش نیە پێویستی پێی نەبێت .[1]

## هەشتەم: کۆدی دڵ:

کەناڵی جەزیرەی وثائقی باسی پەڕاوێکی کرد کە دۆزینەوەیەکی گرنگ باسدەکات کە بەهێندەی دۆزینەوەی جازبیەتی ئەنیشتاین گرنگە، پەڕاوەکەش ناوی (کۆدی دڵ)ە، THE HEARTS COD.

ئەم پەڕاوە باس لەوە دەکات کە ئەوکەسانەی دڵیان بۆ دەگۆڕدرێت زۆر شتیان دەگۆڕدرێت، بۆ نموونە: یەکێك لەوانەی دڵیان بۆ گۆڕیوە پێشتر لە ئەتلێك ئاو دەترسا بخنکێ تیایدا، کەچی دوای گۆڕینەکە دەچوو بۆ مەلەکردن و لەئاو نەدەترسا، یەکێکی تر کەهەرگیز نەچووە بەلای هۆنراوەدا دوای دڵ گۆڕین ئەکەوێتە هۆنراوە نووسین، یەکێکی تر کەترساوە لەسەر تەپلەکێکەوە بکەوێتە خوارەوە، دوای ئەو نەشتەرگەرییە چووە بە شاخدا هەڵگەڕاوە، کەئەمەش وای لەزانایان کرد کە دان بنێن بەگرنگی دڵ دا، کە بەجۆرێك لە جۆرەکان فەرمان

---

١- (إسلام اون لاين).

دەكات بە مێشك و، دڵ لە پێش مێشكەوەیە بۆ بڕیاردان، هەروەك قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ الإسراء: ٣٦

﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَـٰرِغًا ﴾ القصص: ١٠.

﴿ وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾ الأنعام: ١١٣.

﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَـٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَـٰفِلُونَ ﴾ الأعراف: ١٧٩

هەرچەند دیراسات بەردەوامە بەڵام ئەو چەند ئایەتەی سەرەوە موعجیزەیە بیان نا؟؟ (ولتعلمن نبأه بعد حين).

## نۆیەم:حەسادەت و چاوپیسی:

قورئان دەفەرموێت(ومن شر حاسد اذا حسد) پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (العين حق، ولو كان شيء سابق القدر سبقته العين وإذا استُغسلتم فاغسلوا)[1] .

نووسەرولێکۆڵەری بەریتانی (لین ماکتاجارات) لە پەڕاوەکەیدا (گەڕان بەدوای نهێنی گەردوندا)دا ئەو لێکۆڵینەوانەی کۆکردۆتەوە کە لەسەر وزە کراوە .

نووسەر دەڵێت: لەساڵی (١٩٧٣)دا کە مەلیك فەیصەلی کوڕی عبدالعزیز ویستی نەوت نەدات بە ڕۆژئاوا، وڵاتانی ڕۆژئاواو ئەمریکا زاناکانیان کۆکردەوەو داوایان لێکردن کە دیراساتی زۆر بکەن لە بواری وزەدا، زانایانیش زۆر شتی سەر سوڕهێنەریان دۆزیەوە لەبواری و زەدا، کە مەلیك فەیصەڵ تیرۆرکراو نەوتیش کەوتەوە بەردەستیان دیراساتەکان سست بوون.

زانایان دیراسەی پێکهاتەکانی ناو ناوکی گەردیلەیان کردکەئەجولێن وبۆیان دەرکەوت کە ئەوجووڵەیە کاری تێدەکرێت بە سەیرکردنی ئەو کەسەی کەسەیری دەکات .

دیارە ئەمەش لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تردەگوێزرێت، گەنجێك بەناوی (ماثیو مانینغ) کە خەڵکی گوندی (لینتۆن)ی نزیك شاری (کامبردج)ە، هەر بەسەیرکردن دەتوانێت کەوچك و چەقۆ بنوشتێنێتەوە، هەروەها سەیری کاتژمێردەکات و لە جووڵەی دەخات، هەروەها بە سەیرکردن دەتوانێ کاربکاتە سەر ڕۆیشتنی خوێن لە بۆریەکانی خوێندا.

---

١- مسلم.

زانایبایۆلۆجی ئیدوارد فاموفما مۆستای زانکۆی مۆسکۆ لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر ئافرەتی ڕووسی(نیلیا میخایلوفا) کە لە دووری شەش پێ وە تەنها بە سەیرکردن سپێنەو زەردێنەی هێلکە لە یەك جیادەکاتەوە.

ئەمەو سەدان لێکۆڵینەوەی تر ئەوە دەسەلمێنن کە چاو کاریگەری خۆی هەیە، باشە ئەگەر خوای گەورە پێغەمبەری فێرنەکردبێت، چۆن ئەتوانێت (١٤)سەدە لەمەوبەر باسی ئەو ڕاستیە بکات،کەهێشتادیراسات بەردەوامیشە بۆدۆزینەوەی زیاتر.

**دەیەم: دوانزە خەلیفە**: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لایزال هذا الدين عزيزا منيعا لإثني عشرخليفة كلهم من قريش)[1]. هەروەها دەفەرموێت: (لايزال هذا الدين قائما حتى يكون عليكم اثني عشر خليفة كلهم تجتمع عليهم الأمة وكلهم من قريش)[2].

ئەمەش بۆ خۆی موعجیزەیە ئەگەر سەیری مێژوو بکەین دەبینین کە موسوڵمانان بەهێزو یەك ڕیزبوون لە سەردەمی:

چوار خەلیفەی ڕاشیدین، ئنجا جیاوازی دروست بوو تا حەسەنی کوڕی عەلی تەنازولی کرد بۆ معاویە، موسڵمانان یەککەوتنەوە لەزەمانی معاویەدا، پاشان ڕاجیایی دروست بووەوە لە زەمانی یەزیدا، پاشان بە شەهیدبوونی عەبدولای کوڕی زوبەیرومردنی مەڕوانی کوڕی حەکەم، موسڵمانان بوونەوە بە یەکڕیز لە سەردەمی (عبدالملك کوڕی مەڕوان)و (وەلیدی کوڕی عبدالملك)و (سولەیمانی کوڕی عبدالملك) و (عومەریکوڕی عبدالعزیز) و (یەزید کوڕی عبدالملك)و (هشام کوڕی عبدالملك)، بەمەش ژمارەیان دەبێت بە یانزە خەلیفە و، دوای هیشام دەوڵەتی عەبباسی هاتەکایەوەو پەرتەوازەیی دروستبووەوەو، یەکڕیزی نەماو ئەمەویەکان لە ئەندەلوس سەریان هەڵدایەوە .

تا ئەمڕۆش حاڵەکە بەردەوامە و ماوەتەوە بڵێین کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کە لە نزیك قیامەتدا لەسەر دەستی مەهدی دا موسڵمانەکان ئەبنەوە بەیەك ڕیز، کە ئەویش قوڕەیشیەو ژمارەکەش ئەبێ بە دوانزە، ئەمەش بەڕاستی موعجیزەیە.

---

١- مسلم.

٢- أبو داود.

## یانزەیەم: مردنی بەرنامە بۆ داڕێژراو

زانایان بۆیان دەرکەوت کە بەرنامەی مردن لەناو هەموو خانەیەکدا دانراوە، هەروەك چۆن بەرنامەی ژیانی تیادانراوە، کە هەردووکیان وەکو یەك گرنگن، جا ئەگەر بەرنامەی مردن نەبوایە، لاشە نەی ئەتوانی بەرگری بکات لە نەخۆشی، ئەمەش بەڕاستی لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە هەروەك دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَیَوٰةَ لِیَبْلُوَكُمْ أَیُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِیزُ ٱلْغَفُورُ ﴾ الملك: ٢.

زانایان دەڵێن لەدروستبوونی نوتفەدا و لە دروستبوونی یەکەم خانەوە بەرنامەی مردنی تیا دانراوە، کە ئەمەش قورئان ئاماژەی بۆ دەکات و دەفەرموێ﴿ نَحْنُ خَلَقْنَٰكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَیْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَیْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِینَ ﴾ الواقعة: ٥٧ - ٦٠.

زانایان هەوڵی زۆریاندا کە چارەسەری مردن و پیری بکەن نەیاتوانی لەبەرئەوەی بەرنامەی مردن و ئەجەلی دیاری کراو لە هەموو خانەیەکدا دانراوە، ئەمەش پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ دەکات و دەفەرموێت: (تداوو عبادالله، فإن الله لم یضع داء إلاّ وضع له دواء الا داء واحدا الهرم)[1].

زانایان جینێکیان دۆزیەوە کەبەرپرسە لە پیربوون ومردنی خانەو ناویان نا (التیلیمیر)، ئەم مردنی خانانەش نیعمەتن ئەگەر نەمرێت لە کاتی خۆیدا دابەشبوونی زۆر دابەش دەبێت و تووشی شێرپەنجە دەبێت.[2].

**دوانزەیەم: بینای گەردوون:** زانایانی بواری فەلەك جاران وشەی بۆشایی (فضاء) (space) یان بەکار دەهێنا بۆ بۆشایی ئاسمانەکان بەڵام ئێستا وشەی بینا (building) بەکاردێنن، چونکە پاش دیراسەو لێکۆڵینەوەی ئاسمانەکان لەڕێی مانگە دەستکردەکان وکەشتیە ئاسمانیەکانەوە بۆیان دەرکەوت کە ئاسمانەکان بینایەکی ئەندازەیی توند و تۆڵەو هەسارەکان یەکەی بیناو (خشتی) ئەو بینایەن، زانایان پاش ئەوبینینانە باسی

---

١- أحمد.

٢-(منتدیات شبکة التوابون)و (موسوعة الإعجاز العلمي في القران والسنة).

ئەندازەی بینای گەردوون (هندسة بنــاء الكــون) و باسـی (جســری گـەردوونی) و (دیـواری گەردوونی) دەکەن و، دەڵێن ماددەیەکی ڕەش کەنابینریّ (darkmatte) بۆشـــایی ئاسمـانی پڕ کردۆتەوە.

هەروەها لەرێی سوپەر کۆمپیوتەرەوە کەوێنەو نەخشــــەی ئاسمانـەکانیان دەسـتکەوت، بینیان کەئاسمانەکان چنراوە (والسماء ذات الحُبــك)، هەســارەکان وەك دەنکـی مـراوری کـە لەتەزبیحێکـدا بێـت، ئاســـــمانەکان جـوان دەکـەن، ئـەوەتا زانـای بـەناوبانگ بـول ملـیر و هاوەڵانیدەڵێن:

(بەڕاستی هەسارەکانی سەرەتا، یان باشـتر بڵـێین خشـتی سـەرەتایی بینـا لەهەسـارەکان (لبنات البناء الأولى من المجرات)، هەر لەدەنکـە دوڕومـرواری دەچـن لەتەزبیحـدا کـە ئاسمانیـان ڕازاندۆتەوە)..

بەڕاستی ئەمەش کت ومت ئەو ئایەتەی قورئانە کەداوا دەکــــات سـەیری ئاسمانـەکان بکـریّ کـە چـۆن بینــاکراوە و بەئەستێرەوهەسـارەکان ڕازێنراوەتـەوە ﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴾ ق: ٦، ئـەوە بـۆ سـەیری ئاسمانـەکان ناکـەن لەسەریانەوە، کە چۆن بیناکراوە و ڕازاوەتەوە و جوان کراوەو هیچ کە لەبەرو بۆشایی و نوقسانی یەکی تیانیە .

ئەوەی سەیرە زانایان وشەی (کیف) (how) (چۆن) بەکاردێنن هەروەك قورئان، ئـەوەتا ناونیشانی وتاری زانایەك بەم شێوەیەیە کە دەڵیّ :

How did structure form in the universe واتـە: چـۆن پێکهـاتووە بینایگەردوون، ئێستا لەسـەدەی بیسـت ویـەك دا جـائیزەی گـەورە ئـەدرێت بـۆ وەڵامدانـەوەی ئەوپرسیارە قورئانیە لەلایەن زانایانەوە، کە چۆن ئاسمانەکان بینـا کـراوە (کیـف بنیناهـا) بـەڵاّ قورئان لەچەندەها ئایەتداباسی بینای گەردوون دەکات:

﴿ ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴾ النازعات: ٢٧ – ٢٨

یان سوێند دەخوا بەبینای ئاسمانەکان کـە دیـارە شـتێکی گـەورە و مەزنـە ﴿ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴾ الشمس: ٥

هــەروەها قورئــان دەفــەرموێت: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًاۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾ فصــلت: ١٢، ئــەوەی سەیرە زانایان وێنــەی زۆر جــوانی ئــەو ئەســتێرانەیان گــرت کــەزۆر ئەدرەوشــێنەوە و ناویــان نــا (المصابیح الكشافة: flash lights )

باشە ئەگەر قورئان لەخواوەنەبێت، چۆن پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار ناوەها چواردە سەدە لەمەوبەر داوالەکافران دەکات کەسەیری چۆنێتی بینای ئاسمانەکان بکەن؟ هەروەها سەیری ئەستێرەکان بکەن کە وەك چرای درەوشاوە ئاسمانەکانیان جوان کردووە، ئەو ئاسمانانەی کەبۆشایی و ناتەواوی و نوقسانی تیانیە؟

بەڵێ هەمیشە لەقورئاندا وشەی (بناء) لەگەڵ ئاسمانەکانــدا هــاتووە هــەروەها لەگەڵیا باســی جــوانکردنی ئاسمانــەکان کــراوە، ئــەوەتا دەفــەرموێت: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾ الذاریات: ٤٧ ، ئنجا باجارێکی تر گوێ لە قورئــان بگــرین دەفــەرموێت: ﴿ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٢

## سیانزەیەم: شێواندنی ژینگە:

زیاتر لە (٥٠٠) زانای وڵاتان کۆبوونەوە لەکۆنفراسێکدا لــە فەرەنســا لــە (٢ ی فبرایــری ٢٠٠٧)، وەبەیەك دەنگ بڕیاریان دا:

یەکەم: ڕێژەی پیس بوونی ژینگە لەدەریا و وشکانیدا گەیشتۆتە ڕادەیەك کەلە مێــژوودا شتی وانەبووە، کەدەبێتە مایەی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای زەوی سێ پلە ..

دووەم: ئادەمیزادیــان دانــا کــە بەرپرسی یەکەمــە لەشــێواندنی هاوســەنگی ژینگــە، بەجەنگەکان و پاشماوەی کارگەکان و ئامێرەکــانی وەك ئوتومبیــل و ..هتــد، کەڕێــژەی کــاربۆن ئێستا لەهەوادا دەئەوەندەی ڕێژەی کاربۆنە لە سێ سەد ساڵ لەمەوبەردا.

سێیەم: کۆنفرانسەکە داوای لەهەمــوو دەوڵــەتانی دنیــا کــرد فریــای ئــەم حاڵەتــە بکــەون وزەوی لەتیاچوون ڕزگار بکەن.

بەڕاستی ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر گەورەیی قورئان کە ئاماژەیەکی لەم جۆرەی تیایە کە دەفەرموێت: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ الروم: ٤١.. ئایەتەکە باس لەدیاردەیەك دەکات کە نەبووە و دەرکەوتووە (ظهر) پاشان شێواندنیدەریاکان و وشکانی دەخاتە پاڵ مرۆڤ (بما کسبت ایدی الناس) دواییش ئینزاریان دەکات بەسزایەك تاوەکو بگەڕێنەوە ﴿ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾.[1]

# موسڵمانبوونی بەردەوام

## ١- موسڵمانبوونی قەشەی میسری فەوزی صبحی سمعان:

فەوزی هەر لە منداڵیەوە ئاواتی ئەوە بوو کە ببێ بە قەشەو خەڵکی ڕێزی لێبگرن و دەستی ماچ بکەن، بۆ ئەمەش هەر لە منداڵیەوە ئەچووە کەنیسەی (زقازیق) لە میسر و هەوڵیئەدا فێری مەسیحیەت بێت، دایك و باوکیشی کە گاور بوون زۆر دڵخۆش بوون بە کوڕەکەیان.

کەس لەو بڕوایەدا نەبوو کە ئەم منداڵە لە پاشەڕۆژدا لە جیاتی قەشەیەتی ئەبێتە بانگخوازێکی ئیسلامی، ناوبراو دەڵێت: حەوت نهێنیەکەی کەنیسە لایەکی مێشکی گرتبووم (التعمید، الاعتراف، شرب النبیذ، اکل لحم المسیح، الاب، الابن، الروح القدس)..

زۆر بیرم دەکردەوە لە مەسەلەی لە خاچدانی مەسیح (علیە السلام)، بەومنداڵیەش گومانم هەبوو لەو مەسەلەیە، چۆن دەبێت پێغەمبەری مەسیح لە خاچ بدرێت لەبەر پاکبونەوەی گوناهی خەڵکی، جا ئەگەر مەسیحیش خوایە، یان کوڕی خوایە، بۆ وا لە خۆی ئەکات، با لە گوناهی ئەو خەڵکە ببورێ و ئەوەش بەسەرخۆی نەهێنێ..

ساڵ لە دوای ساڵ فەوزی زیاتر قاڵ دەبوو لە دینداریداو شارەزایی زیاتری پەیدا دەکرد تا بووە قەشەو خەڵکی ڕێزی لێدەگرت و دەهاتنە خزمەتی، ئیعترافیان دەکرد لەسەر

---

[1]- (موسوعة الإعجاز العلمي في القران والسنة)

تاوانەکانیان بەو هیوایەی کە لە گوناه پاك ببنەوە، فەوزی لە دڵی خۆیدا دەیوت باشە ئەگەر ئەوخەڵکە سادەوساکارە بێن و ئیعتراف بکەن لەبەردەم قەشەداو قەشەش لەبەردەم (بطريك)داو (بطريك) لەبەردەم پاپاداو پاپاش لەبەردەم خوادا، ئەی باشە بۆ یەکسەر لە نێوان خۆت و خوادا تەوبە نەکەیت؟؟ بۆ کەسێك نهێنی و گوناهەکانی خۆی لە بەردەم کەسێکی تردا باس بکات کە ئەو حاڵەتەش زۆر شتی ناخۆشی لێدەکەوێتەوە لە ئیستغلال کردن بە هەموو جۆرەکانیەوە.

ئەم قەشە لاوە بۆ ماوەی نۆ ساڵ لەم کێشە دەروونییەدا بوو نەی ئەتوانی بەئاسانی لەدەوروبەری و لەسەرچاوەی رزق و رۆزییەکەی دەست هەڵگرێت.

کەوتە خوێندنەوەی پەڕاوی ئیسلامی و قورئانی پیرۆز، زۆر وەستاو زۆر گریا لە خزمەت ئەم ئایەتەدا:

﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ المائدة: ١١٦ - ١١٨فەوزی پاش خوێندنەوەی ئەم ئایەتە وەڵامی‌زۆر لەو پرسیارانەی دەستکەوت کە وێڵ بوو بە دوایاندا .. هەروەها لەبارەی بوون و هاتنە دنیای مەسیحەوە ئەم ئایەتە وەڵامێکی زۆر گرنگ بوو بۆ دڵ و دەروونی﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ آل عمران: ٥٩ .

فەوزی لەو ماوەیەدا بانگکرا بۆخزمەتی ئیلزامی سەربازی ئەمەش فرسەتێکی باش بووکەلە کەس و کاری دوورکەوێتەوە و بەخۆیدا بچێتەوە، رۆژێك چوو بۆ کەنیسەیەك لە ئیسماعیلیە، بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێ وەك موسڵمانان چووە سوژدەوە بۆ خوا، چاوی پڕ بوو لە ئاو، بەدڵ دوعای کرد خوا هیدایەتی بدات و دامەزراوی بکات، خوای گەورەش دوعاکەی

گیرا کردو لە سوژدەکەی سەری هەڵنەبڕی دڵی دامەزرا لەسەر ئیسلام و بڕیاری دا کە موسڵمان بێت.

ئینجا دوور لە کەس وکار موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند و ناوی خۆی کرد بە (فەوزی صبحی عبدالرحمن المهدی).. کاتێك کەس و کاری بەمەیان زانی زۆر پێیان ناخۆش بوو، بەڵام هیچیان بۆ نەکرا بەرامبەری، ئەمیش زۆر لە خوا پاڕایەوە کە خوای گەورە هیدایەتی کەسوکاری بدات، هەرچەند دایکی بەگاوری مرد، بەڵام باوکی و خوشکەکەی پاش ماوەیەك هاتن بۆلای و موسڵمان بوون.

ئەوەی سەیرە فەوزی ئێستا مامۆستای وانەی ئاینی ئیسلامە لە قوتابخانەکانی (منارات) لە شاری جدەی وڵاتی سعودیە. باوکی پاش ساڵ و نیوێك بە موسڵمانی وەفاتی کردو خوشکەکەشی شووی کرد بە کوڕێکی گاور کە ئەویش موسڵمان بوو، کەئێستا ئەمیش بانگخوازەو بووە بە ئیمامی مزگەوتێکی شاری دەوحە لە قەتەر[1]

## ٢- تەوبە کردنی گۆرانی بێژی تونسی فەوزی بن قمرە:

لە وتەیەکیدا بۆ پێگەی (اسلام اون لاین) فەوزی وتی (من لاوێکی تونسیم و تواناو بەهرەیەکی باشم هەبوو لە بواری هونەری میللی دا کە لە تونس پێی دەوترێت (مزود)، تیاقاڵ بووم لەماوەیەکی کەمداو سەرکەوتنی گەورەم بەدەست هێناوناوبانگم بەهەموولایەکدا بڵاوبوەوە، دەساڵ لە لوتکەی هونەری گۆرانی میللیدا بووم..

لەبارەی ژیانی ڕابردوشیەوە دەڵێت: (من وەك هەموو هونەرمەندە ناودارەکان ژیانم کارکردن و ناوبانگ و پارەو عیلاقات و سەفەرکردن بوو، جمهورێکی زۆرم بەلای خۆمدا ڕاکێشابوو .. من متواضع بووم و ڕەفتارم جوان بوو بەجدی کارم دەکرد وڕەخنە ساردی نەدەکردمەوە).

من لە خێزانێکی دیندار هاتوومەتە دنیاوە، چەند توانیبێتم کەمتەرخەمیم نەکردووە لە نوێژەکانمدا بە تایبەت ئەم چوار ساڵەی دوایی، کە دوو دڵی و ناڕازیبوون لەخۆم ڕووی تێکردبووم لەبارەی گۆرانی وتنەوە، بۆیە ئەگەڕام بەدوای چارەسەرو ڕزگاربوون لەوحاڵەتە.

---

١- سایتی: (مجلسنا).

وازهێنان لەجیهانی گۆرانی وناوبانگ ئاسان نەبوو، خوا پاداشتی هاوەڵانم بداتەوە، لە مانگی ڕەمەزانی (٢٠٠١) دا چووم بۆ عومرە کردن ..

لەبەرئەوەی جەنگی دەروونی ئاسان نیە و، وازهێنان لەناوو شۆرەت ودنیا هەوڵ و ئیرادەی دەوێ، لە دوا شەوی مانەوەم لە مەککە لە نوێژی بەیانیدا لە حەرەم لە سوژدەی ڕکاتی دووەمدا، هەستم بە هێزێکی سەیر کرد لە دڵ ودەروونمدا، زۆر پاڕامەوە لە خوا کە هاوکاریم بکات، خوای گەورەش هات بە هانامەوەو هەر لە مەککە بڕیاری گۆڕانم دا)..

من ئێستا کە لە ڕابردووم پەشیمانم و وازم هێناوە لە گۆرانی، زۆر خۆم بەبەختەوەر نەزانم، سوپاس بۆ خوا کە ئێستا خەریکی پەروەردەکردنی مناڵەکانم، چەند جاری تر چوم بۆ حەج و عومرەو زۆربەی کاتەکانم خەریکی بانگەوازکردنم لە تونس و مەغریب.

لە ساڵی (١٩٩٠ تا ٢٠٠١) بە دەیان ئاهەنگی گۆرانی سازکردو زۆر ناوچەی تونس گەڕاو، شەش ئاهەنگی لە میهرەجانی قرتاجی دەولیدا پێشکەش کردو، سەردانی فەڕەنساو ئیتاڵیاو هۆڵەنداو ئەڵمانیاشی کرد بۆ ئاهەنگ گێران، پاش ئەو هەموو ناوبانگەی بە دەستی هێنا، گەڕایەوە بۆ لای خواو هەموو مەبەستی ڕەزامەندی خوایە، ئێستاش بەهیوایە لەبواری سروودی ئیسلامی‌دا کاربکات و خزمەت بەدینی خوا بکات، هەرچەندە وازهێنان لە بواری گۆرانی هەندێ دەستکەوتی لە کیس ئەدات، بەڵام دیارە خوا دەرگای تری لێدەکاتەوە﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴾ الطلاق: ٢ - ٣.[١].

## ٣- موسوڵمانبوونی سەرۆکی یەکێتی جیهانی بۆ بەرمەجەی لغوي عصبي:

دکتۆر (وایت ود سمول) سەرۆکی یەکێتی جیهانی بۆ (بەرمەجەی لغوی عصبی) موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند لەسەر دەستی دکتۆر(عوض القرنی)دا لە بەحرەین، لەکاتی کۆنگرەی جیهانی (بەرمجەی لغوی عصبی) لە١٤-١٥\١٧\٢٠٠٧.

---

١- (منتديات جيل الصحوة).

له کۆنفرانسەکەدا(دکتۆر عوض القرني) وتارێکی پێشکەش کرد لەژێر ناوی (البرمجة اللغوية العصبية والدين)، شایانی باسە دکتۆر وایت ناوی خۆیگۆڕی پاش ئیسلامبوونی بۆ (عبدالحکیم) بەناوی کوڕە گەورەی شێخ قەرەنییەوە، شیخ قەرەنیش دەعوەتی عبدالحکیمی کرد بۆحەج کردن لەسەر مەسرەفی شێخ قەرەنی، ئەویش دەعوەتەکەی قبوڵکردو، بەنیازە بەماڵ و منالەوە بچێ بۆ سەردانی خێزانی دکتۆر قەرەنی.

دکتۆر وایت دکتۆرای هەیە لە فەلسەفەی علوم داو دکتۆر قەرەنیش لەوبوارەوە موناقەشەی لەگەڵ کردوهەرچی پرسیارێکی هەبوو وەڵامی دایەوە، سەرەنجام دکتۆر وایت گریاو وتی:ئەگەر ئەمە ئیسلام بێت من موسڵمانم، ئنجا شایەتمانی هێنا بەئامادەبوونی (٦٠) کەس کەمومارەسەیان هەیە لەو بوارەداو چوار کەسیش لەمامۆستایانی زانکۆی سعودیە.

دکتۆر قەرەنی پێی وت:ئاینی پیرۆزی ئیسلام هاتووە وەڵامی سێ پرسیار بداتەوە کەبە شەریەتی سەرقاڵ کردووە لەسەرتاسەری دنیادا کە ئەویش: من کێم؟ بۆچی دروست بووم؟ چارەنووسم چییە؟

دکتۆر وایت زۆر تامەزرۆی قسەکانی دکتۆر قەرەنی بوو، زۆر سەرسام بوو بەو قورئانەی کە گوێی لێ بوو.

لە وتەیەکدا دکتۆر وایت باسی گرنگی مۆسیقای کرد کە (ڕاهێنەری بەرمەجەی لغوی عصبی) لە دەوراتەکانیدا بەکاری بهێنێ، دوایی وتی: لەڕاستیدا ئێوە پێویستیتان بە مۆسیقا نیە، چونکە قورئانتان هەیە کە گەورەترین و گرنگترین مۆسیقایە کە گوێ و هەست و هۆش بهەژێنێ و، کاریگەرێکی زۆر گەورەی هەیە لەسەر ئەعصابی ئادەمیزاد و پشوودانی.

دکتۆر وایت یان (عبدالحکیم)داوای کرد کە دکتۆر قەرەنی ببێ بە جێگری لە ولاتی کەنداودا، دکتۆریش لەبەر سەرقاڵی زۆری قایل نەبوو، دکتۆر وایت تکای زۆری لێکرد کە هەردەبێببێ بە جێگری سەرۆکی یەکێتی جیهانی بەرمەجەی لغوی عصبی لە ولاتانی کەنداودا، دکتۆر قەرەنی وتی: ڕازی دەبم بەمەرجێ ئامادەبوان دەنگ بدەن،کە دەنگدانیان کرد هەموو بەیەك دەنگ ئەویان هەڵبژارد..[1]

---

١- (موسوعة الإعجاز العلمي في القران والسنة).

## ٤- موسـوڵمانبوونی هونەرمەنـدی ئیتـاڵی جیوفـانی فیروتـی:

وێنەکێشی ئیتـاڵی بـەناوبانگ جیوفـانی فیروتـی هیچـی لـەبارەی ئیسـلامەوە نـەدەزانی، تەنانەت بەخراپی سەیری ئیسلامی دەکرد، بەهۆی ئەوەی کە هۆکارەکـانی ڕاگەیانـدنی ڕۆژئـاوا ئیسلام بەشێوەیەکی ناشرین وێنادەکەن لەبەرچاوی خەڵکی..

لەدوای کارەسـاتی ١١ی سـێبتەمبەر بڕیـاریدا کـە لـە هەقیقـەتی ئیسـلام تێبگـات، کـە ئەمـەش سەرەتایەك بوو بۆی بەرەو ئیسلام و سەرەنجام موسڵمان بوو، ناوی خۆی کرد بە(محمد).

لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: لەپێش ئـەوەی موسـڵمان بم لـەخێزانێکی عیلمـانی دوور لەدینـدا ژیاوم، باوکم کرێکارێکی کۆمۆنسیت بوو، دایکیشم هەروا، هەموو ژیانیـان بریتـی بـوو لەچـێژ وەرگـرتن لـە ژیـان دوور لـەدین، منـیش سـەرقاڵی کـاری خـۆم و وێنەکێشـان بـووم، تـا١١ی سێبتەمبەر لە ئەمریکا ڕوویدا.

لـەدوای ئـەو ڕووداوەوە، کـە لـە ڕۆژئـاواو ئـەمریکا کەوتنـە چەوسـاندنەوە و ئـازاردانی موسڵمانان، من داوام لەهەندێ برادەرم لە (ڕۆما) کرد کـە موسـڵمان بـوون پـەڕاوی ئیسـلامیم بدەنێ، هەرئەوەندە بۆیان هێنام وخوێندمەوە بۆم دەرکەوت کە ئەم ئاینە ئـاینێکی زۆر گـەورەو مەزنە وهەرچیم زانیوە لەوەوپێش لەبارەیەوە هەمووی ناتەواوبووە...

ئنجـا لەموسـڵمانانی ئیتاڵیـاوە هەرچـیم نەزانیایـە وتێـی نەگەیشـتمایە فێـری دەبـووم و قەناعەتی تەواوم پەیدا کرد کە ئیسلام چارەسەری هەموو کێشـەکانی مـرۆڤ دەکـات و هـەرگیز ڕازی نابێت بەزوڵم و ئیرهاب..

محمدفیروتی داوا لـە موسـڵمانان دەکـات کەبەهـەموو زمانـەکانی دنیـا بابـەتی ئیسـلامی لەهەموو کەناڵەکانەوە بڵاوبکەنەوە تا ئیسلام بە پاکو پوختی و بەتـەواوی بگاتـە هـەموو ئـەو خەڵکە تینوەی کە تەنها بە ئیسلام تینوێتیان دەشکێ..[1].

## ٥- بـەڵکـو موسـوڵمـان بێت؟!

ئـافرەتێکی ئـەمریکی بـەناوی ئـان سـپولدنگ پـاش ئـەوەی موسـڵمان دەبێـت، پـەڕاوێك دەنوسێت بەناوی (ئافرەتێکی ئەمریکی ئیسـلام دەدۆزێتـەوە)، زۆر باسـی گرنگـی تیایـە، بـۆ

---

١- گۆڤاری(کن داعیاً) لە مەدینەی منورە/١٨-٢٨محرم، ١٤٢٥ کۆچی.

نموونە دەڵێت :(کاتێ موسڵمانبووم هەموو ڕۆژێك تووشی تەحەددایەکی تازە دەبووم، بەڵام دەمزانی کە خوام لەگەڵدایە، وەك موسڵمانێکی تازە دەزانم کە کامیل نیم، ڕەنگە لە کۆتایی تەمەنیشم دا هەرنەتوانم کامیل ببم، بەڵام دڵنیام لەوەی کە خوای گەورە شتێکم داوا لێناکات زیاد لە توانام، دڵنیام کە خوای گەورە دەستم لێ بەرنادات)....

هەروەها باسی ڕووداوێك دەکات کە بەڕاستی پڕە لە پەندو عیبرەت و دەڵێت:لە سێبتەمبەری ساڵی (٢٠٠١) دا کە هێشتا مانگێك تێپەڕ نەبووبوو بەسەر موسڵمانبوونمدا، لاوێك بەعەرەبانەیەکی (تسوق) وشت کرین خۆی بە توندی پیامالێم و زۆر ئازاری دام،کاتێ گرتیان و دادگاییان کرد وتی: (بەهۆی ئەوەی کە بالاپۆشە وامزانی عەرەبە)، نەیزانی کە ئەمریکیم...

ئەودووچاریبەندکردن ئەبوەوە و سزایەکی قورسی وەردەگرت لەسەر ئەو ڕەفتارە ناهەموارەی، منیش بیرم کردەوە لەپێغەمبەر ﷺ کە خۆی ئەو تۆزو خۆڵەی پاك دەکردەوە کە دەیانکرد بەسەریاو خراپەی نەدەکردەوە بەرامبەر ئەوەی کە ئازاری ئەدا، وەك موسڵمانێك بیرم کردەوە، کەچی بکەم خزمەت بە ئاینەکەم بکات، بە لاوەکەم وت: لێت خۆش نابم یا دەبێ بچیتە بەندیخانەوە، یان دەبێت بچیتە دەورەیەکەوە کە لە مانای ئیسلام تێبگەیت، ئەویش دەورەکەی هەڵبژارد، چونکە سەد قات لەبەندیخانەکە باشتر بوو... ئەوەی سەیرە لاوەکە زیاتر لەوماوەیەی بۆمان دیاری کردبوو لە دەورەکەدا مایەوە،پاش شەش مانگ لەمانگی فبرایری ٢٠٠٢ دا شایەتمانی هێناو موسڵمان بوو..[1].

## ٦- موسڵمانبوونی ڕاهێنەرێکی فلیپینی :

کاپتن (عبدالکریم ئەرسیناس) ڕاهێنەرێکی مەلەوانی فلیپینییە، لەگەڵ ئەوەدا کە پسپۆڕە لەو بوارەدا، پسپۆڕە لەبواری زانستی دەروونی دا، لەبارەی موسڵمانبوونییەوە دەڵێت:

سوپاس بۆ خوا من یەکەم موسڵمانم لە بنەماڵەی (ئەرسیناس) کە هەموویان مەسیحین، من لە ژینگەیەکی مەسیحیدا گەورە بووم لە (مانێلا) پایتەختی فلیپین، هەرلەمناڵیمەوە لەگەڵ دایك و باوکم ئەچووم بۆ کەنیسەو ئەگەر ئەوان بۆیان نەکرایە، پیاوێکی پیری ناسیاومان دەهات بەشوێنماو دەیبردم بۆ کەنیسە..

---

١- (منتدى طريق الإيمان للدعوة الى الله)

لەسەردەمی لاوێتیمدا کەمتر دەچووم بۆ کەنیسە، بە تایبەت کە لە زانکۆ بووم، هەرچەندزۆرم دەخوێندەوە لەبارەی مەسیحیەتەوە، لام سەیر بوو کەچەند مەزهەبی جیاواز هەبوو لە مەسیحیەتداو زۆر پرسیاری بێ وەڵامم لادرووست بوو..

کەهاتمە سعودیە،یەکەم بەیەك گەیشتنم بوو بە موسڵمانان، چونکە لە مانێلا موسڵمان زۆر کەمە و زیاتر لەخوارووی وڵاتدا دەژین و، هیچمان لەبارەیانەوە نەدەبیست مەگەر هەر ئەوەندەی کەشەڕ دەکەن لەگەڵ حکومەتداو دەیانەوێ جیاببنەوە.

لەوانەی کە ڕاهێنانم پێ دەکردن لاوێکی سیانزە ساڵ بوو کە زۆر ڕەوشتی بەرزو جوان بوو، وەعدێکی نەئەداو نەیباتە سەر، زۆر پابەند بوو بە ئیسلامەوە، لەکاتی خۆیدا نوێژەکانی دەکرد، هەندێ نامیلکەی ئیسلامی و قورئانی بەزمانی ئینگلیزی بۆ هێنام و وتی: کە ئەمانەت خوێندەوە دەزانی من بۆ وام؟

یەکەم جار بوو لەبارەی ئیسلامەوە بخوێنمەوە، زۆر ڕاستیم بۆ دەرکەوت کە منیش و زۆر کەسی تریش نایزانین...

ئیسلام ڕای کێشام بەرەو لای خۆی و ناوی خۆمم کرد بە (عبدالکریم)، پێش ئەوەی موسڵمانیش ببم زۆر سەرسام بووم بە نوێژی موسڵمانان و جەماعەت کردنیان لەدوای ئیمامەوە، دوای ئەو لاوەش کەلەشاری (جده)ناسیم، هاوەڵانم لەکاردا زۆر هاوکاریان کردم و زۆر نامیلکەیان دامێ، کەیەکێ لەوانە مونازەرەکەی شێخ (ئەحمەد دیدات) بوو لەگەڵ قەشەیەکی ئەمریکیدا، کەبەڕاستی شێخ ئەحمەد دیدات زۆر بەجوانی و موسەیتری بەڵگەکانی خۆی دەخستە ڕوو، نامەیەکم بۆ دیدات ناردو دەست خۆشیم لێکردو داوام لێکرد کە زیاتر لەو حیوارانە بکات بۆ ڕوون بوونەوەی هەق و ڕاستی..

چارم نەما ئەبوایە موسڵمان بم، هەرگیز ئەو ڕۆژەم بیرناچێ کە تیایدا موسڵمان بووم و ئیمانم هێنا بە خواو پێغەمبەرو ڕۆژی دوایی.. من زۆر هەست بە بەختیاری و ئاسوودەیی دەکەم و زۆر چێژ وەردەگرم لە نوێژو سوژدەبردن بۆخوا، بەڕاستی ئیسلام ئاینێکی مەزنە و من شانازی دەکەم کە موسڵمانم[1].

---

١- (ئیسلام أون لاین)

## ٨- موسڵمانبوونی جۆزێف مۆریس:

ناوبراو ئەمریکی‌یەو تەمەنی (٤٥)ساڵەو پسپۆڕە لە بواری ئابووریدا، باوك و باپیری کاتی خۆی لە ئەفریقیاوە چوون بۆ ئەمریکا، جۆزێف ماجستێری هەیە لە ئابووری دا و پابەند بوو بە کەنیسەوە.

لەئەمریکاوە هات بۆ ئوستورالیا بۆ کارکردن لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی‌دا کە یەکێکیان ئافرەتێك بوو بەنیاز بوو کە بیخوازێ، لەشاری سیدنی لە فڕۆکەخانەکەیدا لاوێکی خواناسی کۆمەڵەی تەبلیغ خۆی ناساند بە جۆزێف وبە دووسەعات ئاخاوتن تێی‌گەیاند کە ئیسلام بەرنامەی خوایە بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی، محمدو عیساش سەلامی خوایان لێ بێت بەندەو نێرراوی خوان ..

جۆزێف دەڵێت: لاوەکە قورئانێکی وەرگێڕدراوی ئینگلیزی پێدام، سێ‌سەعات لەسەریەك خوێندمەوە، تێگەیشتم کە خوای گەورە تاك و تەنهایە﴿ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾ ﴾ الإخلاص: ٣ - ٤ هەروەها تێگەیشتم کەئیسلام بەڕاستی ئەو ئاینەیە کە بۆ هەموو شوێن وکاتێکە و تاکە ڕێگەیە کە لە خوام نزیك بکاتەوە، بۆیە بڕیارمدا کە موسڵمان بم و،ئەمەم بەهاوەڵانم وت،جاکاتێ دەزگیرانەکەم هات و قورئانی دی بەدەستمەوە وتی ئەو کتێبە چیە؟

وتم: ئەوە قورئانە کە پەڕاوی موسڵمانانەو هەقەو لە خواوەیەو هەموو هەست و هۆشمی داگیر کردووە و دەمەوێ موسڵمان بم، کە ئەمەم پێ وت خەریك بوو شێت بێ، چوو هەواڵی دا بە هاوەڵەکانم و هەموو هاتن بۆ لام وکەوتنە زەمکردنی ئیسلام ..

دەزگیرانەکەم وازی لێ هێنام و باوك و دایك وکەس وکارم حاشایان لێکردم و، دواتر هاوەڵەکانم چوون بۆ یابان و بەتەنیا مامەوە لە ئوستورالیا.

منیش لەگەڵ برادەرە موسڵمانەکانمدا ٤٩ ڕۆژ چووم بۆ هیند و ٦٩ ڕۆژیش بۆ پاکستان بۆ دەعوە کردن، ئنجا بڕیارم دا بچم بۆ حەج و، لە پاکستان فیزەی سێ وڵاتم وەرگرت، یەکێ لەو وڵاتانە کەچووم بەداخەوە کەلە مزگەوت نوێژم دەکرد دیار بوو موراقەبەیان دەکردم، دوایی گرتیانم و سزاو ئازارێکی زۆریان دام و لەبەندیخانەیەکدا دایان نام کە عەرەبی زۆریشی تیا بوو، پاشان سەفارەی سویسری کە ئیشی سەفارەی ئەمریکیشی دەکرد لەو وڵاتە، ویستیان ببینن

نەیانتوانی، دوایی سویسریەکان ئەمریکایان ئاگادارکرد کە هاوڵاتیەکیان گیراوەو بەهەرحاڵێك بوو بەربووم، کەس و کارم وایان زانی نەماوم ..من بۆخۆم دڵ خۆشم وهیوام بە پاداشتی خوای گەورەیە کە دەفەرمووێت: ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ﴾ آل عمران: ١٩٥..

پاشان چوومەوە بۆ ئەمریکاو ساڵێك لە خەستەخانە مامەوە تا هاتمەوە سەرخۆم،ئینجا هاتم بۆ کوەیت بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی و شارەزابوونی زیاتر لە ئیسلام، لیژنەی ناساندنی ئیسلام باوەشیان بۆ کردمەوەو زۆر هاوکارییان کردم..

من ڕقم لە کەس نییە هەرچەند تووشی ئەو هەموو نارەحەتیە بووم، من حەز دەکەم لە وڵاتی ئیسلامدا بژیم و لە وڵاتی ئیسلامدا بمرم، تا موسڵمانان نوێژی جەنازەم لەسەر بکەن، من لەسەدا دووسەد پابەندم بە ئیسلامەوە، دوای موسڵمانبوونیشم ناوی خۆم کرد بە(محمد یوسف) لە خۆشەویستی محمد و یوسف دا سەلامی خوایان لێبێت.[1].

## ٩- با ئارام بگرین!

پیاوێکی پیریخەڵکی کەنداو دەڵێت: لە ماڵ و حاڵی خۆماندا بە ئاسوودەیی ژیانمان بەسەر دەبرد، دۆست و ئاسیاو سەریان کردە سەر خێزانم کە بۆچی خزمەتکارێك ناگرین خزمەتمان بکات، ئەوەتا زۆربەی خەڵکی خزمەتکاریان گرتووە ..ناچار منیش چووم بۆ نوسینگەیەك کە بیانی دەهێنن بۆ کارکردن، ئافرەتێکیان بۆ دیاری کردم، پرسیارم کرد موسڵمانە؟ وتیان: نەخێر (بوذی)یە، منیش نەم ئەزانی (بوذی) چیە؟ هەرگیز شتی وام نەبیستبوو..

حەوت مانگ ئەم ئافرەتە لەماڵماندا بوو، هەتا بڵێی چەوت و لاسار بوو، هیچی وای بۆ نەنەکردین و هەرخەریکی خواردن و خەو بوو، ئەوانەی تەگبیریان بۆ کردین خزمەتکار بێنین ئینجا پێیان ئەوتینەوە بۆچی ئەوەندە بەتەحەمولن لەگەڵیا، بۆ دەری ناکەن وبیرێتەوە؟ منیش بیرم کردەوە، دەرکردنی زۆر ئاسانە، بەڵام بۆچی هەوڵنەدەین کارێك بکەین بۆ ئیسلام،بۆچی

---

١- (منتدى طريق الإيمان للدعوة الى الله)..

ئارام نەگرین و، بەرەوشتی جوان و مامەڵەی جوان بەڵکو موسڵمان ببیٚ و بتوانین یەکێك لە دۆزەخ رزگار بکەین..

هەموو ئەندامانی ماڵەوە بڕیارمان دا ئانەویەری رێزگرتن رێزی بگرین،جا نە ئەو لە ئێمە حاڵی دەبوو،نە ئێمەش هیچ لەو حاڵی دەبووین، زمانەکەیان نەدەزانیو،نەماندەزانی چۆن باسی ئیسلامی بۆ بکەین، بەڵام هەمیشە دیقەتی ئەدایین کە دەستنوێژمان دەگرت و نوێژمان دەکرد، رەمەزانیش هات، ئەیبینی کە بە رۆژوو دەبین و ئێواران رۆژوو دەشکێنین،هەروەها لە تەلەفیزیۆن دا مزگەوتی مەککە و مەدینەی ئەبینی کەنوێژی تەراویحی تیا ئەکرا، جاری وا هەبوو خۆی دایدەگیرسان و بەدیاریەوە دادەنیشت و سەیری دەکرد..

حەوت مانگی تر ئارامان گرت لەگەڵیدا، هیچمان لەموچەکەی نەدەبڕی بەڵکو زیادەشمان ئەدایە، هەمیشە لە نوێژەکانیشم دا دوعای هیدایەتم بۆ دەکرد، تا هەوڵەکان بەفەزڵی خوا هاتە بەرو، رۆژێکی جومعە تێی گەیاندین کە ئەیەوێ موسڵمان ببێ، زۆر زۆر دڵخۆشبووم ..بەڵێ موسڵمان بوو، هەڵسوکەوتی زۆر گۆڕدرا لەگەڵمانا، لەسایەی خواوە کە گەڕاشەوە لای کەس وکاری لە وڵاتەکەی خۆی، مێردەکەی لەگەڵ کورەکەیدا کە تەمەنی (١٤)ساڵ بوو موسڵمان بوون، پاشان دوو خوشکیشی موسڵمان بوون، ئێمەش ناميلکەو شتمان دابویە بەزمانی خۆی،کە هەندێك لە ئیسلام شارەزا بوو ناوی خۆی لە (روهانی)ەوە کرد بە(رەیحانە) لەسەر ناوی دایەنی پێغەمبەر ﷺ.

## ١٠- تەوبەی هونەرمەندە مالیزیەکان:

هەروەك چۆن لە نەوەدەکانەوە هەندێ لە هونەرمەندە عەرەبەکان وازیان لەبواری هونەر هێنا کە نەئەگونجا لەگەڵ بیروباوەڕو عەقیدەدا و، ئەوانەش کە ئافرەت بوون خۆیان داپۆشی، بەهەمان شێوەش هەندێ لە هونەرمەندەکانی مالیزیا وازیان هێنا لەو شتانەی کەمایەی خەشم و قینی‌خوایە ..یەکێ‌لەوانە کەبڕیاری دا تەوبە بکات هونەرمەندی ئافرەت(ئوغی)تەمەن (٣٧) ساڵ بوو،کە بەرنامەی تەلەفیزیۆنیشی پێشکەش دەکرد، وازی لەو بوارە هێناو کۆمپانیایەکی گەشت و گوزاری دامەزراند بۆ بردنی خەڵك بۆ حەج و عومرە..

ئوغی دەڵێت: من ئەو بڕیارەم لە کاتێکدا دا کەلە عومرە بووم ساڵی پار، بەراستی من دنیاو ناوبانگ سەرقاڵیان کردبووم، ئەو دوو هەفتەیەی لە حەرەم بووم خاڵی وەرچەرخانم بوو،

که تیایدا زیاتر نزیك بوومەوە لە پەروەردگارو زیاتر ئیمانم دامەزرا، بڕیارم دا کە واز لە نازناوی هونەریم (ئوغی) بهێنم و بگەڕێمەوە سەر ناوەکەی خۆم کە (فەوزیە ئەحمەد داود)ە..

هەروەها گۆرانیبێژی بەناوبانگی مالیزی (موسا)ش بەهۆی کۆمەڵی (تبلیغ)ەوە ژیانی گۆڕاو بەتەمایە ئەو بوارە بەتەواوی بەجێ بهێڵێ.

هەروەها هەفتەی ڕابردوو هونەرمەند و گۆرانی بێژو نمایشکەری پۆشاکی بەناوبانگ (تورکو ملا ساری) کەناسراوە بە پرچە درێژەکانی، ئەمیش ڕێی هیدایەتی گرتۆتە بەر ..

هەروەها هەواڵەکان دەڵێن: کە هەردوو گۆرانیبێژ(سلیم و شکیل) چەند ئەکتەرێکیش تەوبەیان کردووە وەك (ازمیل مصطفی) و (سیدی اورزا) و(شاە ڕەزا)..

گەڕانەوەی خەڵکی بەرەو ئیسلام دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵی حکومەتی مالیزی و دەزگا ئیسلامی‌یەکان کەڕۆڵی باشیان هەیە لە ڕاگەیاندن دا وکاسێت و کتێبی زۆر بڵاودەکەنەوە... (ئیدریس ئەحمد) سکرتێری جەناحی لاوانی حیزبی ئیسلامی دەڵێت (ئەم سەردەمە سەردەمی بوژانەوەی ئیسلامە).

شایانی باسە ئێستا تیپی ڕەیحانەی ئیسلامی کاسێتەکانیان لە زۆر فرۆشتندا پێشبڕکێ‌دەکات لەگەڵ بەناوبانگترین گۆرانیبێژی مالیزی‌دا[1].

## ١١- نیوەی تەمەنی گەڕا بەدوای هەقدا:

ژنە نووسەرو شاعیری یابانی(سوی اورا) ئەندامی یانەی نووسینی نێودەوڵەتی و ئەندامی یانەی ڕۆشنبیری نێودەوڵەتی سەر بە وەزارەتی دەرەوەی یابانی، سەردانی میسری کرد پاش موسڵمان بوونی، پاش گەشتێکی دوور و درێژی گەڕان بەدوای هەقدا، لەچاوپێکەوتنێکدا ناوبراو کە ناوی خۆی کردووە بە خەدیجە ئاوا باسی ژیانی دەکات:

* لە کوێ لەدایك بوویت ومنداڵیت چۆن بوو:

لە تایوان لەدایك بووم، باوکم مامۆستای پزیشکی بوو، وەلەبەر ئەوەی خێزانەکەمان لە چینی سامورای بوو، واتە چینی جەنگاوەرە دێرینەکان، زۆر جدی بوون لەسەر پەروەردەکردنمان لەسەر گرنگی دان بەڕەوشتی بەرزو خۆشەویستی.

---

١- (إسلام اون لاين)

لەسیانزە سالّیدا لەیابان ولە کۆلیژی ئاداب زانکۆی (کی ا و) فەلسەفەم خوێند و بووم بە بەڕێوەبەری کۆمپانیای هاریکاری ڕێکخستنی ئاینی و هەرچی فەلسەفەم دەزانی لە کۆمەڵێ کتێبدا بلاّوم کردەوە .

*گەشتەکەت بەدوای ڕاستیدا چۆن بوو؟

گەشتەکەم بەدوای ڕاستیدا لە چواردە سالّیمەوە دەست پێ دەکات کە کۆمەڵێ پرسیارم لا دروست بوویوو، بەدوای وەلاّمیاندا دەگەڕام و، زۆر حەزم دەکرد کە خوا بناسم،لە ڕێی زانستەوە دەمویست خوا بناسم بۆیە زانستی قورسم خوێند وەك فیزیای کارەبایی و فیزیای کەونی و بۆم دەرکەوت کە زانست گەیشتۆتە پلەیەکی بەرز لەلایەنی ماددی دا،هەروەها دیراسەی زانستی دەروون ناسیم کرد..

لە ئاینەکانیشدا دیراسەی (شنتاوی) و (بوذی) و (مەسیحیم) کرد، ئنجا بڕیارم دا بچم بۆ میسر بۆ ناسینی خوا لەڕێی ئاسەواری کۆنی میسریەکانەوە، سێڕۆژ پێش ئەوەی بچم بۆ میسر بەقەدەری خوا سەیری یەکێ لەوتارەکانم دەکرد کە لە گۆڤارێکدا بلاّوکرابۆوە،بە دوای وتارەکەی مندا وتارێکی تر بلاّوکرابۆوە لە بارەی ئیسلام لە یاباندا، کە لەلایەن موسوڵمانی‌یابانی(سودا صفا) وە نوسرا بوو..لە دڵی خۆمدا وتم:من کە بەتەمام بچم بۆ میسر کە وڵاتێکی ئیسلامی‌یە چاك وایە شتێك لەبارەی ئەو کۆمەڵگایەوە بزانم، پەیوەندیم کرد بە بەڕێز (سودا صفا) وەو داوام لێکرد کە یەکتری ببینین،دوای یەکتر بینین و گفتوگۆکردنێکی زۆر بیرو بۆچوونی گۆڕیم و وتی: لە دوامەوە شایەتمان بلێ: (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله) منیش وتمەوە و دووهاوەڵی موسڵمانیشی لەگەڵ بوون ئەوانیش بوونە شایەت..

* هەستت چۆن بوو کە هاتیتە میسر؟

لە میسر مزگەوت و بانگ و نوێژی بە کۆمەڵی پیاوان زۆر سەرنجی ڕاکێشام، کە چۆن بەیەکسانی هەموو لەبەردەمی خوادا دەوەستن جا ئیتر دەوڵەمەند بێت یان هەژار،گەورە بێت یان منداڵ..دواتر چووم بۆ ئەزهەر وموسوڵمانبوونی خۆم ڕاگەیاند.

* یابانیەکان چی زاڵە بەسەر بیرو هۆشیاندا؟

ئەوەی بیروهۆشی یابانیەکانی داگیرکردوە زانستەو هەموو لە هەوڵدان بۆ بوژاندنەوەی ئابوری یابان، ئازادی بیروڕا هەیە و شوێن نیزامی سەرمایەداری کەوتون، یابانیەکان میراتێکی

ڕۆحیان هەیە کە لە دێر زەمانەوە بۆیان ماوەتەوە و گرنگی دەدەن بە ڕەوشت و سۆز و بەزەیی و دڵسۆزی، بۆیە دەتوانن ئیعتماد بکەنە سەر یەکتری و نیەت پیسی زۆر کەمە تیایاندا ..

* موسوڵمانان چەندن لە یابان؟

موسوڵمانان ژمارەیان کەمە لە یاباندا و لەسەدا یەکیش نیەو، شێوەی ئیسلام لەبەرچاوی یابانیەکان شێوێنراوەو هیچی وای لە بارەوە نازانن،چونکە تەنها زمانی یابانی دەزانن و، دیارە ڕاگەیاندنەکانی دنیاش بەباشی باسی ئیسلام ناکەن . ئەمریکاش دەیەوێ لەهەموو بوارێکدا غەزووی یابان بکات و (ثقافة)ی خۆی فەرز بکات . شارستانیەتی ڕۆژئاوا لایەنی چاك و لایەنی خراپیشی هەیە، لایەنە خراپەکەی کاری کردۆتە سەر یابانیەکان و ڕێژەی تەڵاق دان زیاد بوە و ڕووداوی خۆ کوشتن زیادی کردوەو ئارامی دەروون کەم بۆتەوە..

*پاش ئەوەی موسڵمان بوویت چۆن بانگەواز دەکەیت؟

ئێستا خەریکی نووسینی چەند پەڕاوێکم بەناوی (پێغەمبەر محمد)، (نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی) و (بەردە ڕەشەکە)و(قوبەی صخرە) و(مزگەوتی اقصی)، ئەمانە بەزمانی یابانی دەنووسم تا ئەوەی لە گەشتی ژیانمدا فێری بووم بیگەیەنم بە یابانیەکان و ئەوەشیان بۆ ڕاست بکەمەوە کەلەبەرچاویان شێوێندراوە. هەروەها لەچەند ڕۆژنامەیەکی یابانیشدا وتار لەبارەی ئیسلامەوە بڵاودەکەمەوە وەك، (اصاهی) و (مینتش) و(صدکای)..

* تۆ دەڵێی مرۆڤی یابانی ئێستا تەنها ئیمانی بە مادییات و بە عیلمە چۆن قەناعەتیان پێ دەکەیت و، بەرەو ئیمان و ئیسلام و غەیبیات ئەیانهێنی؟!

گەشتەکەم کە سی ساڵی خایاندوە ئەزمونی داومەتێ و شارەزایی تەواویشم هەیە لە نەفسیەتی یابانیەکان و شێوازی ئاخاوتن لەگەڵیاندا، بەوەش دەتوانم ڕێی ڕاستیان بۆ روون بکەمەوەو، دیارە بەردەوامیش موعجیزاتی ئەم ئاینە دەردەکەوێ و، مـن زۆر دڵخۆشم بە ئایەتی ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾[1]

---

١- منتدى طريق الايمان للدعوة الى الله..

## ١٢- موسڵمانبوونی پزیشکێکی مەسیحی:

(جی‌میشیل) تەمەن ٣٦ ساڵ، بەرپرسی دەزگای بەگاورکردن بوو، لە ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە هاتبوو بۆ ئیش کردن لە سۆماڵ لە ساڵی ١٩٧٨دا لەژێر ناوی (پرۆژەی نیشتمانی بۆ چارەسەری کوێری).. میشیل پزیشکێکی لێهاتو بوو لەبارەی موسڵمانبوونیەوە دەڵێ: زۆر دڵخۆش بووم لە کارکردن لە سۆماڵ، ڕەنگە لەبەرئەوە بێت کە زۆر باش هاتن بەدەنگمانەوە و جوان پێشوازیان لێ کردین، جا من لەسەر گەرمی و سەرقاڵیم بە کاری پزیشکیمەوە کارە سەرەکیەکەی خۆمم بیرچوەوە کە بەگاورکردن بوو.. هەرزوو هاوەڵی موسڵمانم بۆ دروست بوو، کە ئەحواڵم دەپرسین و ئەحواڵیان دەپرسیم، چاوی چەندەها کەسم چارەسەر کردوو زۆر سەرکەوتوو بووم لە کارەکانمدا و، بە کوێدا دەڕۆیشتم بە زمانی خۆیان سوپاسیان دەکردم ودەستیان بەسنگەوە دەگرت بۆم ..

بروسکەیەکم لە سەرۆکایەتی ڕێکخراوەکەوە بۆ هات لە ئەڵمانیەوە کە بچم بۆ دەورەیەك لە بەریتانیا، چووم بۆ بەریتانیا و مانگێك مامەوە، ئنجاگەڕامەوە ئەڵمانیای ڕۆژئاواو، حەزم دەکرد بچمەوە سۆماڵ، کەچی ناردیانم بۆ تەنزانیا، نەمدەزانی بۆچی، دوای مانگێکی تر ناردیانمەوە بۆ سۆماڵ، ئەوەندەم پێخۆش بوو، لەخۆشیدا گریام ..

بەڵێ ..پاش پێنج مانگ دابڕانم گەڕامەوە بۆ سۆماڵ و ئەوانیش زۆر خۆشحاڵ بوون، خۆشحاڵیەك کە باس ناکرێ، خۆشحاڵیەك کە زیاترە لە خۆشحاڵی کوێرێك کە چاوی چاك دەبێتەوە، بەتایبەت هاوەڵەکەم (محمد باهور)، بۆیە کە گەڕامەوە یەکسەر دەعوەتی کردم بۆ ماڵەوە، کەچوومە ماڵیان باوکیم بینی کە ئینگلیزی دەزانی، کەوتینە گفتوگۆ، زۆرم پێخۆش بوو کە ئینگلیزی دەزانی، چونکە ئیتر لە ڕێی ئەوەوە دەمتوانی کاری دووەمم بەجێ بگەیەنم کەئەویش بەگاورکردن بوو .کەوتمە باسی ئاینەکان بەگشتی و وتم: دوایی دەچمە سەر باسی مەسیحیەت، کە باوکی محمد زانی باسی ئاین دەکەم، نوسخەیەکی قورئانی گرت بەدەستیەوە و وتی: ئەزانی ئەم پەڕاوە چیە؟ ئنجا کەوتە باسی وتی:هەر پرسیارێکت هەیە لەبارەی قورئان و ئینجیل و مەسیحەوە، پرسیار بکە تا بۆت ڕوون بکەمەوە، وتم: باشە چۆن؟وتی: قورئان هەموو شتێکی تیایە ..

گەڕامەوە سەر کارەکەی خۆم و بیرم دەکردەوە چۆن کاریکەمە سەر ئەو پیاوەو بیهێنم بەلای مەسیحیەتدا، چونکە ئەگەر توانیم ئەو بکەمە گاور، کەسانی تریش بەئاسانی دێن،

چونکە کەسایەتیەکی ناوچەکە بوو.. لەسەردانێکی تردا بۆ ماڵی (محمد باهور)، باوکی پرسیاری کارەکەمی لێکردم، منیش وتم: کارم پزیشکی‌یە؟ئیتر کەوتە باسی ئەوەی کە قورئان بە درێژی باسی دروست بوون و قۆناغەکانی‌کۆرپەلەی کردووە، وتم چۆن شتی واهەیە؟ ئنجا زۆر بەجوانی کەوتە باسی ئەو لایەنەو، نایشارمەوە وای لێ کردم کە سەرسام بم بە پەراوێك (١٤٠٠)ساڵ لەمەوبەر هاتۆتە خواریێ! ئیتر وام لێهات کە رۆژانە سەردانی ماڵیانم دەکرد،نەمزانی کە چاودێریم لەسەرە؟!

ئەندامانی تیمە پزیشکیەکە داوایان لێکردم کە ئیتر نەچم بۆ ئەو ماڵە..فەرمانێکم بۆ هات لەسەرو خۆمانەوە کە ئەو ناوچەیە بەجێ بهێڵم، کاتێکم زانی (محمد)یش لەو ناوچەیە دوور خرایەوە، هەندێ لە بەرپرسانم قەناعەت پێکرد کە رێم لێ نەگرن کە بچم بۆ ماڵی (محمد باهور)، دواتر هەواڵم بۆ هات کە (محمد)دەستگیر کراوە چونکە پەیوەندی لەگەڵ من هەبوو..زۆر گریام لە داخا، کە نەمتوانی ئەوگەشتەی‌لەگەڵ باوکیا دەستم پێکردبوتەواوی بکەم.. زۆری نەبرد بروسکەیەك هات لە ئەڵمانیاوە داوای لێکردم کە سۆماڵ بەجێ بهێڵم و بچم بۆ کینیا..

پێش ئەوەی بڕۆم سەردانی ماڵی (محمد باهور)م کرد، باوکی زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم و وتی:لەگەڵ مانگی ڕەمەزاندا هاتی، مانگی پڕ خێر و بەرەکەتە، ئنجا لەگەڵیان پارشێوم کرد و بینیم پێش بەیانی هەموو خەڵکی چوون بەرەو مزگەوت و منیش ئەو رۆژە وەك ئەوان هیچم نەخوارد..

لە(نایرۆبی) لە فرۆکەخانە پێشوازیەکی گەرمیان لێکردم و پێیان وتم کە لەجیاتی ئوتێل دەچمە خانویەکی گەورەوە، پاش چەند هەفتەیەك بروسکەیەکم پێگەیشت کە لەبەر لایەنی ئەمنی نابێ بگەڕێمەوە بۆ سۆماڵ، هەرچی پرسیارم ئەکرد کەس پێی نەئەوتم لایەنی ئەمنی چی؟!

دوایی بۆم دەرکەوت کەسەرۆکایەتی ڕێکخراوەکە لە ئەڵمانیا ڕاپۆرتی تەواوی لایە لەسەر من، بۆیە پاش بیرکردنەوە لە قسەکانی (محمد باهور)و باوکی، نامەیەکم بۆ سەرۆکایەتی لە ئەڵمانیا نارد و تیایا نوسیم :دڵنیابن بەتەواوی کە هەموو شتێك باشە و، ئەبم بە موسڵمان، نامەکەم خستە سندوقی پۆستەوە و گەشتی دوو دڵیم کۆتایی پێهێناو بە هاوەڵانم وت: لە (نایرۆبی)نەگەڕێمەوە بۆ سۆماڵ چی ئەبێت با ببێت، ئەگەر بشم کوژن ئەگەڕێمەوە بۆ سۆماڵ،

جا هیچی وام پێ نەبوو پێی بگەڕێمەوە بۆیە هەندێ پێویستی و جلوبەرگی خۆم فرۆشت بۆ ئەوەی پارەی بلیتی گەڕانەوەم دابین بکەم بەرەو سۆماڵ، کەلەڕاستیدا بلیتی چوون بوو بەرەو ئیمان.

کە گەیشتمە (مەقدیشۆ)، یەکسەر چووم بۆ ماڵی (محمد باهور)، کە باوکی محمد باوەشی پیا کردم بە چرپە پێم وت: (اشهد ان لااله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله)، بەمەش موسڵمانبوونی خۆم ڕاگەیاندوناوی خۆمم گۆڕی بۆ (عبدالجبار)و کەوتمە دیراسەی قورئان و سوننەت ..

خوا پاداشتی (دکتۆر عبدالله نصیف)ئەمینداری ڕابیتەی عالەمی ئیسلامی لە مەککە بداتەوە کە بە مەسەلەکەی زانی، بڕیاری دا هاوکاریمان بکات و دەست بکەینەوە بە چارەسەری چاوی ئەوانەی ناساغ بوون، بەڵێ ..پرۆژەکە لە پرۆژەی بەگاورکردنەوە گۆڕا بۆ پرۆژەیەکی پڕخێر و و بەرەکەت کە خەڵکی سوود وەربگرن و مایەی ڕەزامەندی خواش بێت[1].

## ١٣- موسڵمانبوونی گۆرانی بێژی جیهانی بازارو:

گۆرانی بێژی ئەمریکی جیهانی بازاروکە بەدووەم گۆرانیبێژی جیهانی هیپ هۆپ دائەنرێت و گەورەترین جائیزەی ئەورووپی گۆرانیو مۆسیقای وەرگرت کەناوی (پلاتین)ە .

ناوبراو لەڕێی ئەنتەرنێتەوە شارەزای ئیسلام بووەوبانگخوازانی ناسیوە، بەتایبەت بانگخوازانی نووسینگەی هاوکاریبۆ بانگەوازو ئیرشادوهۆشیاری جالیات لە ناوچەی (البدیعه)ی سعودی، لە ریاز موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندو ناوی خۆی کردبە بیلال. لە پەیوەندییەکی تەلەفونیدا بەبرا بانگخوازەکانی وت: (وەرمگرن بەبرای خۆتان، دەبمە بچووك و خزمەتکارتان)، دیارە کەس ئەوەی لێ ناوێ، چونکە هەموو خزمەتکاری دینی خواین.[2]

---

١- ڕۆژنامەی المسلمون ژ/ ٢٦٠

٢- (منتديات شبكة توابون الإسلامية).

## کاتێ لەدەست نەفسم ڕزگاربووم!

بانگخوازێـك دەڵـێ: کاتێـك گەیشـتینە ئەفـەریقیا و بنکەیـەکی گونجاومـان ئامـادەکرد بۆکاری خێرخوازی و بانگەوازکردن، نازانم چۆن باسی هەست ونەستی خۆمتان بۆبکەم، ئەتوانم تەنها ئەوەندە بڵێم: دڵم خۆش بوو، شانازیم بەخۆمەوە لادروست بوو، چونکە من لەناو هاوەڵانم دا توانیم لەگەڵ ئەولیژنە خێرخوازیەدا بێم بۆئەم وڵاتـە دوورەدەسـتە، لـەدڵی خۆمـدا دەمـوت: کـەی بێـت بگەڕێمـەوە بـۆلای دۆسـت و هـاوەڵانم وبەشـانازیەوە بەسەرهاتیگەشـتەکەمیان بـۆ بگێڕمەوە، کەی بێت باسی ئەو خەڵکە هەژارە داماوەیان بۆبکەم کەبرسێتی زەفەری پێ بـردون و کەنەفتی کردون، ئێمەش کە هاوکاری و خێرمان بۆ بردبوون چەند بەڕێزو گەورەیی یەوە بۆیان دەڕوانین ..

ئنجا بیرم لەوە دەکردەوە کەگەڕامەوە لای هـاوەڵان و دۆسـتانم چـۆن بـە پەرۆشـەوە گـوێم بۆدەگرن و، خۆزگەم پێدەخوازن کەخەڵکی پەنجەم بۆ درێژدەکەن و دەبمە باس وخواسیان، خـۆمن هەرلەمناڵیەوە حەزم دەکرد جێی گرنگـی پێـدان بم، خـۆمن هەنـدێ تواناو لێهاتوویشـم هەیـە ڕەنگە خەڵکی تر نەیان بێت ! لەم خەیاڵاتانەدا بووم ئاەوکچە بیانیـەم بینـی، کـە وەك هـەورە بروسکە لیّ ی دام، کردەوەکانی پێش قسەکانی!

لەگەڵ یەکێ لەبرادەرە بانگخوازەکانـدا لـەژێر درەختێکـدا دانیشـتبووین بـەجل و بـەرگی سپی یەوە کە گەردی لێنەنیشـتبوو چـامان دەخـواردەوە، دیـمەنێکم بینـی زۆر کـاری تێکـردم ! ئافرەتێکی سوورسپی قژ زەردی ئـەوروپیم دی جـل و بـەرگی ئەفریقیـەکانی پۆشـیبوو !! زۆر خاکی بوو لەناویاندا، دەستی دەهێنا بە سـەری منداڵانـداو تەنانـەت لـووتی بۆدەسڕین، چـووم بۆلای و لێم پرسی: چی وای لێکردووی هەمووخۆشی و شارستانی وڵاتی خـۆت بـەجێ بهێڵـی و بێیتە ئێرە؟! سەیرێکی کردم و بەدەست عەلامەتی خاچی لەسەرسنگی دروست کردو، ئامـاژەی کرد بۆ ئاسمان و وتی: (من لێرەم تاپەیامی بەسود بگەیەنم بەمانە) و،ئاماژەی کردبۆمناڵـەکان! ئالێرەدا حەقیقەتی خـۆم تێگەیشـتم، وەڵامەکـەی شـەقازلەیەکی تونـد بووبـۆم، ئەوناسکۆڵەیە هاتووە پشتی کردۆتە دنیا بۆگەیاندنی پەیامێك کە لەلای ڕونە بۆئەوە هاتووە! ئیتر پەیامەکەی هەرچی بێت، لای ئێمە ڕاستە یان نا مەسەلەیەکی ترە ! کەوتە ئەوەی بەخۆما بچمەوە، جـارێ ئاسەد جار!

من بۆلێرەم ؟! بۆخوا، یان لەبەر نەفسی خۆم؟ بۆگەیاندنی پەیامی ئیسلام، یان بۆ شانازی کردن و بوون بەدەنگو باس؟ ئالێرەدا خۆم بۆ نەگیرا وگریام، فرمێسك مانای تـازە لـەدایکبووی

لەرۆحم دا ناودا، کەوتمە موراجەعەی حساباتم، کۆمەڵێ بڕیارم دا کە هەموو ڕێڕەوی ژیانی گۆڕی ...پاش چەند ڕۆژێك ناڕەحەتی هەستم کرد ئیهتیماماتم گۆڕدراوە، فێربووم، مەبەستم تەنها خوابێت، فێربووم لەنەفسم هەڵگەڕێمەوە، تامی ئازادیم چەشت لەدەست نەفس، بیری ئەوقسەیەی (عطاء الله)م کەوتەوە کەوتویەتی (سقتُ نفسي الى الله فأبت، فتركتها ومضيت).
نەفسم پەل کێش کرد بەرەو لای خوانەهات، وازم لێهێناو بۆخۆم ڕۆیشتم!

## خۆت بەکەم مەزانە!

زۆر لەئیسلامخوازان، تەنانەت هەندێ لەبانگخوازانیش تووشی نەخۆشیەك دەبن بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن، کەئەوەش لەشەیتانەوەیەو دەیەوێت بێ بەشیان بکات لەخێروچاکە و چوونەپێشەوە، شەیتان لەهەوڵدایە تاهەریەکە لەئێمە وا لێبکات لەدوای قافڵەکەوە بێت و هیچ دەورێکی نەبێت، ئەگەر کەسێك تووشی ئەم حاڵەتە بوو، پێ ی بڵێی: ئامۆژگاری خەڵك بکە، وتارێك بنووسە، دەڵێ: من لەکوێ و ئەوکارە لەکوێ، هێشتازۆرم ماوەبیگەمێ، ئەگەر پێی بڵای: ببە بەسەر مەشق ومامۆستابۆئەوانەی تازە گەڕاونەتەوە و ڕێی ڕاستیان گرتووە، ئەڵێ: منیش بەشی خۆم کەم و کورتیم هەیە و کەی خۆم چاکرد ئەوسا لەگەڵ خەڵکدا خەریك دەبم، ئەگەرپێی بڵێی: ئەگەر خۆشت نیتە هەوڵێ بدە لە خواپێداوان هاوکاری و یارمەتی کۆبکەرەوە بۆ کاری دەعەوەی وخێرخوازی، دەڵێ: بەخوا شەرم دەکەم و دەترسم تانەو تەشەرم لێ بدەن وگاڵتەم پێ بکەن!

ئابەم جۆرە ئەو بەرێزە ڕادەکات لەخێروچاکە، نە لەبەر ئەوەی حەزبەچاکە ناکات، بەڵکو لەبەرئەوەی خۆی بەکەم دەزانێت، دیارە ئەمەش نەخۆشیەکە لەدێرزەمانەوە هەیە و دەشبێت! ئەوەتا شێخ حەسەنی بەسری پێش سەدان ساڵ دەڵێت: (خەڵکینە: من نەمتوانیوە نەفسی خۆم گۆش کەم لەسەر ئەوەی کە پێویستە لە گوێڕایەڵی خوا، بەڵام ئەگەر بڕوادار تا خۆی تەواونەکات قسەو ئامۆژگاری نەکات ئەوا ئامۆژگاران تەواوکەم دەبن و کەس نابێت بانگەواز بکات بۆ لای خوا، دیارە کۆبوونەوەی بڕواداران بەیەکەوە و یادخستنەوەی یەکتری، مایەی ژیانەوەی دڵیانەو هوشیارکەرەوەیە لەغەفڵەت وپارێزەرە لە لەبیرچوونەوە.. خواسەلامەتتان کات بچنە کۆڕی زیکرویادخستنەوە، ڕەنگە وشەیەکی بیستراوچەند کەمیش بێت سوودی خۆی بگەیەنێت).

بەڕاستی خاوەن ئەزموون بووە،چاکی پێکاوە، هەر کەسەو بەپێ ی خۆی خوای گەورە تواناولێهاتنێکی داوەتێ، باشەیتان زەفەرمان پێ نەبات و توشی خۆبەکەم زانینمان نەکات

وەچی دەتوانین وچۆن دەتوانین خێر وچاکە بکەین وهیچ بەکەم نەزانین: (ولاتحقرن من المعــروف شيئا ولو أن تلق أخاك بوجه طلق) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: هیچ خێر وچاکەیەك بەکەم مەزانە،ئەگەر زەردەخەنەیەکیش بێت لەڕووی کەسێکدا..

## ئیسلام بۆ هەموو کات و شوێنێکە:

ئەگەر سەرنجی ئیسلام بدەین دەبینین شتانێکی حەرام کردووە کە لە هەموو کات و شوێنێکدا مرۆڤ ئالوودەی دەبن و گیرەدەخۆن پێوەی و، هەمیشەش ئەو شتانە خراپن، بۆ نموونە مەی و سووخواردن وزیناکردن وقومارکردن، هەر خراپ بوون و هەر خراپیش دەبن، هەزاران ساڵە خەڵکی گیرۆدە بوون پێوەی وبەردەوامیش گیرۆدەی دەبن، جا باشترین چارەسەریش ئیسلامە کە توانیویەتی بە چەند ڕێنماییەك چارەسەری بکات.

بۆنموونە ئیسلام قومارکردنی بەچەند ئایەتێك حەرام کردووە و لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا تەواوکەم بۆتەوە، بەپێچەوانەشەوە کۆمەڵگاکانی تر بەملیۆنەها کەسیان سەرقاڵی دەبن و زیانێکی زۆر لە تاك و لەکۆمەڵ دەکەوێت، لەم سەدەی بیست ویەکەدا کە دنیا ئەو هەموو پێشکەوتنەی بە خۆیەوە بینیوە، کەچی ٧٠٪ ی کۆمەڵگای بەریتانی یانسیبی نیشتمانی هەفتانە دەکڕن و، ساڵی (٢٠٠٦) بەریتانیەکان (٥٠) ملیار پاوەندیان لە قوماردا خەرج کردووە کە ئەمەش حەوت ئەوەندەی ئەو پارەیەیە کە لە (٢٠٠١) دا کراوە بە قومارو، ڕێژەی قومارکردن لە ڕێی ئەنتەرنێتەوە ٢٣٪ زیادی کردووە . لە ئەمریکاش (١٤٨) ملیۆن کەس قومارچین و، ڕۆژانە یەك ملیۆنیان لە ڕێی ئەنتەرنێتەوە قوماردەکەن . قومارکردن کێشەی کۆمەڵایەتی گەورە دروست دەکات وئەوانەی کە قوماردەکەن لە ٢٧٪ یان هەوڵی خۆکوشتن دەدەن و دوولەسەر سێی ئەوانەش هەوڵی تاوان دەدەن بۆ دەستکەوتنی پارە ..

ئەمەش نەك تەنها کەسانی ئاسایی بەڵکو زۆر کەسانی ناودار دەگرێتەوە، بۆ نموونە یاریزانی گۆلفی ئەمریکی جۆن دالی دەڵێ کە لە دوانزە ساڵدا ٣٣ ملیۆن پاوەندی زەرەرکردووە لە قوماردا .

چەند گەورەو مەزنە ئەم قورئانە کەپاش هەزارو چوارسەد ساڵ زۆر زیاتر لە جاران ئەتوانێ فریادڕەسی مرۆڤایەتی بێت بەرەو هەموو خێرو خۆشیەك و ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ

أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾المائدة: ٩٠ - ٩١.. زۆر زیاتر لە جاران مرۆڤایەتی ئاتاجی پێیەتی، چونکە بەڕاستی پەیامی ئیسلام خوایەك ناردویەتی کەباش مرۆڤ دەناسێ و دەزانێت پێویستیەکانی چین ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ الملك: ١٤

(جیمس) و (بیتر کیم) پەڕاوێکیان بلاوکردەوە بە ناوی (ئەو ڕۆژەی ئەمریکا دانی نا بەڕاستیدا)، کەتیایدا ئاماری زۆریان بلاوکردۆتەوەو لە بارەی ئەمریکاوە ودەلێن: هەر ١٢ چرکەو تاوانێك ڕوودەدات .

١٩ ملیۆن ئافرەتی ئەمریکی تووشی دەستدرێژی کردنە سەر بوون .

١٢ ملیۆن منداڵ سەرگەردان و بێ جێ ورێن .

هەر ٥ خولەك و دزیەك دەکرێت .

هەر ١ خولەك و ئوتۆمبیلێك ئەدزرێت .

١ ملیۆن ئەمریکی لە بەندیخانەدان و ٣ ملیۆنیش لە ژێر چاودێریدان .بازرگانی بە مادەی بێهۆشکەرەوە ساڵانە دەگاتە ١٩٠ ملیار دۆلار.

٣٠٠٠٠ کەس بەلای کەمەوە ساڵانە خۆیان دەکوژن .. دیارە ئەم ژمارانەش ساڵانە زیاتردەبن، باشە توخوا ئیسلام رزگاریان نەکات بەچی رزگاردەبن ؟؟!خۆ ئەم ڕاستیەش ئاشکرایە وزۆر زەحمەت نیە، ئەگەر کەسێك خۆی نەخەڵەتێنێ، بۆ نمونەگلەیی لە سەرۆك بۆش کرا کە بۆچی بەملیارەها دۆلار لە عێراق و ئەفغانستاندا خەرج دەکات و ملیارەهاش بۆ چارەسەری ئایدز و نەخۆشیەکانی تر تەرخان ناکات، ئەویش لەوەڵامدا وتی: چارەسەری ئایدز بە تەرخانکردنی ملیارەها دۆلار نابێت، ئەگەر بەڕاستی ئەتانەوێت چارەسەری بکەن با ئافرەتانی ئەمریکا وەك ئافرەتانی کەنداو حیجاب بکەن !! ..هەروەها کۆنداليزا رایس لە چاوپێکەتنێکدا لەگەڵ کەناڵی الحرە ڕۆژی هەینی ٢٠٠٧/٧/٢٧ وتی: (ئیسلام خێراترین ئاینە لە بلاوبونەوەدا لە ئەمریکاو بەشێکە لە پێکهاتەی ڕۆشنبیری ئەمریکی) .. سبحان الله

﴿ وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ ﴾النمل: ١٤.[١]

---

١- (گۆڤاری المجتمع) www.arab-eng.org

## قەڵەم و لاستیك !

قەڵەمێك ولاستیکێك لەسەرمێزێك بەیەك گەیشتن ..

لاستیك: هاوڕێم چۆنی؟

قەڵەم: من هاوڕێت نیم؟

لاستیك: بۆچی؟

قەڵەم: چونکە ڕقم لێتە!

لاستیك: بۆڕقت لێمە؟

قەڵەم: چونکە ئەوەی من دەینووسم دەیسڕیتەوە!

لاستیك: من تەنها ئەوەی هەڵەبێت دەیسڕمەوە!

قەڵەم: جا تۆ هەقت چی یە؟

لاستیك: چۆن، ئەوە کاری منە!

قەڵەم: جا توخوا ئەوە کارە ؟!

لاستیك: ئەریٚ وەڵڵا کارێکی زۆر چاکە!

قەڵەم: نا تۆ هەڵەیت و لەخۆباییت ..

لاستیك: بۆچی؟

قەڵەم: بۆ ئەوەی ئەنووسریٚ چاکترە لە وەی دەسڕێتەوە؟!

لاستیك: سڕینەوەی هەڵە بەهێندەی نووسینی ڕاست گرنگە!

قەڵەم بۆتۆزێك سەری داخست و پاشان سەری هەڵبڕی، لەوە دەچێت قسەکانی لاستیکی بەعەقڵدا چووبێت، وتی: ڕاست دەکەی!

لاستیك: ئێستاش ڕقت لێمە؟

قەڵەم: نارقم لەوەنیە هەڵەکانم بسڕیتەوە!

لاستیك: دەی منیش ڕاست ناسڕمەوە!

قەڵەم: ئەبینم بەردەوام بچوك دەبیتەوە!

لاستیك: چارنیە قوربانی ئەدەم بەبەشێك لەجەستەم بۆ سڕینەوەی هەڵەکان!

قەڵەمیش بەخەمبارییەوە وتی: منیش هەست دەکەم بەردەوام بچوك دەبمەوە.

لاستیك دڵی دایەوەو وتی: ناتوانین سوود بەخەڵکی بگەیەنین، تاقوربانی نەدەین لەپێناویانا.

## پێشەکی:

بەناوی خوای میهرەبان و دروودو سلاویش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یارویاوەران وشوێنکەوتوان، بانگخوازی بۆ خوا سولّحاوی کوردستان جەنابی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ، لە مەکتوبات دا دەڵێت:

ئەم نامەیەو نامەکانی تریش بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری نازدار چاکترین دیاریە لەلایەن دڵسۆزو خۆشەویستێکەوە بۆ خۆشەویستو دۆستێکی بنێرێت، سەرەڕای ئەوەش پەسەند نەکردنی ئەو دیارییە بە بەڵگەی فەرموودەیەکیتر دەبێتە مایەی خەشمی خوایی، دیارە لێرەدا مەبەست لەدیاری دونیایی نیەو فەرموودەکانیش ئەمانەن (ما أهدى مسلم لأخيه هدية أفضل من كلمة حكمة يزيده الله بها هدى او يرده عن ردى) .

فەرموودەکەی تریش (ايما عبد جاءته موعظة من الله في دين فانها نعمة من الله سيقت اليه فان قبلها بشكر زاده الله نعماً اخرى والا لكانت حجة من الله عليه ... تا ئەو شوێنەی دەفەرموێت: ويزداد بها تسخطاً)[1]

کەواتە ئەم فەرموودەیە مژدەی خێرو دابارینی نیعمەتی خوایییە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەم نامانە بۆ موسڵمانانو باوەڕداران بخوێننەوەو، هەروەها بۆ ئەوانەش کەگوێیان لێدەگرن، لەهەمان کاتدا هەڕەشەی سزاوخەشمیخوایی یە بۆ ئەو کەسانەی نایانخوێننەوە و گوێیان لێناگرن.

لەخوا دەپاڕێمەوە هەموو براکان پارێزراوبن لەگوناهو تاوانە گەورەکانو، یارمەتیشیان بدات تابتوانن کەفارەتی گوناهە بچووکەکانیشیان بدەن . براکان گوناه بەگشتی دەکرێت بەدوو بەشەوە، کە ئەویش بریتیە: لەگوناهی گەورەو بچووك، هەر کاتێك خاوەنی گوناهی بچووك، گوناهی گەورەی ئەنجام نەدابوو ئەوا گوناهە بچووکەکانی بەهۆی کارە چاکەکانیەوە خوای بەخشندە لێی خۆش دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ هود: ١١٤ .

---

١- كنز /٦٤٣٤.

خوێنەری ئازیز وا جارێکی تر پێتان دەگەینەوەودرێژەمان دا بەزنجیرەی بەرەو ئیسلام، بۆ پێشکەشکردنی باشترین دیاری، کە هیوادارم سوودبەخش بێت و هەمووشمان بانگخوازی بۆ خوا سوڵحاوبین .

## خەوێکی سەیر!!

لەبەرئەوەی بەباسی پڕ بەرەکەتی کاك ئەحمەد دەستمان پێکرد پێم باشە ئەم باسە تۆماربکەم وەك مێژوویەکی کوردوشاری سلێمانی .

کاك ئەحمەد لە (١٢٠٨) کۆچی لەدایك بووەولە (١٣٠٥)ی کۆچی ماڵئاوایی کردووە، (٩٧) ساڵ ژیاوە و، نزیکەی (١٢٠) ساڵێکە مەشخەڵی ئیمان و ئیسلامەتی بەجێهێشتووە بۆ نەوەکانی دوای خۆی ..

لەساڵیهەزارو نۆسەدو پەنجاوسیَ دا شەوێکیان کاك ئەحمەدی شێخ ئەچێتە خەوی حاجی مەلا شەریفی سەعاتچی کە دوکانەکەی لەسەر شەقامی مەولەوی بوو، پێی دەڵێت قەبرەکەم ئاو هاتۆتە سەری، ئەویش بۆ بەیانی دەچێت بۆ لای حاجی محمدی سەڵتە کەپیاوێکی خواناس و ناوداری سلێمانی بوو، خەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەویش دەڵیَ جاریَ بوەستە، شەوی داهاتوو هەمان خەو دەبینێتەوەو دەچێتەوە لای حاجی محمد و ئەویش دەڵێت: جاریَ بوەستە، شەوی سێیەم هەمان خەو دەبینێتەوەو دەچێتەوە بۆ لای حاجی محمدو ئەویش دەڵێت: دە ئنجا باهەواڵ بدەین بە شێخ مەحمود کە لە داریکەلی بوو.

حاجیمەلا شەریف کە باسی خەوەکەی کرد عەلی کوڕی و جەزای کوڕی کە ئەوکاتە هەرزەکار بوون وتیان: واز بێنە لەم خەو وشتانە دوایی قەبرەکە هەڵبدەنەوەو وانەبێت چی وەڵامی خەڵکی بدەینەوەو چی زمانی کۆمۆنیستەکان دەگرێت، حاجی مەلا شەریف گوێی نەدانیَو چوو بۆ داریکەلی و هەواڵەکەی دا بە شێخ مەحمود، ئەویش چەند کەسێکی راسپارد کە قەبرەکە هەڵبەنەوە، کاتێك قەبرەکەیان هەڵدایەوە بەئامادەبوونی خەڵکێکی زۆری شاری سلێمانی بینیان خەوەکە راستەو ئاوی کارێزی ماڵی قادری عیزەت بەگ کەدەکەوێتە پشت مزگەوتی گەورەوە چۆتە سەر قەبرەکە و، بە ئۆتۆمبیلی ئاگر کوژانەوە کەتازە هاتبووە سلێمانی ئاوەکەیان دەرداو دوایی دەوروبەرەکەیان چیمەنتۆ کرد .

دەڵێن کفنەکەی تەنها پەڵەیەکی پچوکی زەردی پێوە بووە لای قاچیەوە و ئەوی تری هیچی لێنەهاتبوو، یەکێ لەو کەسانەی کە ئەمەی پشت ڕاست کردەوە مامۆستا (نوری فارس حمە خان)ە کە ئەو کاتە لاو بووەو ئامادەی ئەو ڕووداوە بووەو بەچاوی خۆی بینیویەتیو ئێستا لەژیاندایە.

هەروەها کاك جەزای حاجی مەلا شەریف کە لە (٢٠٠٦) دا کۆچی دوایی کرد بۆ کاك شێخ سالاری حەفیدی گێڕایەوەو وتی: کە کەوتنە هەڵدانەوەی قەبرەکە سەرەتا هیچ دیارنەبوو، دەستمان لەسەر دڵمان بوو زۆر دەترساین کە خەوەکە ڕاست نەبێت، کەچی کە زیاتریان هەڵکەند ئاو دەرکەوت، کە بەڕاستی ئەمەش کەراماتێکی ئاشکرای ئەو پیاو باشەیە !

## صحابی‌یەك لە ئەوروپا!

بانگخوازێك دەڵێت: بووتم لە ئەوروپا و ترسی مردنم لێرە، هەست و هۆشی‌گرتبووم، ئاوەکوسەردانی شوێنێکم کرد، هاوسەنگیم بۆ گەڕایەوەو، دڵم خۆش بوو، فێربووم چۆن نیەتم تازە بکەمەوە و ئامانجی خۆم دیاری بکەم، تێگەیشتم هەر من لە ئەوروپا نیم،کەسی زۆر لەمن چاکتر لە پێش مندا گەیشتۆتە ئێرە، کەسانێك کەسوور بوون لەسەر مانەوەو نەگەڕانەوە.

چووم بۆ جێ نزرگەیەك تا سڵاوی لێبکەم و نزای بۆ بکەم، سواری کەشتی بووم لە دەریای(مەرمەڕە) بەرەو بەشی ئەورووپی ئەستەنبوڵ، شوێنەکە زۆر جوان بوو، باخ و باخاتێکی سەوزی جوانی ئاودار ناوچەکەی ڕازاندبوەوە، هەزاران خانووی ئاودامان سپی کە هەموویان حەزیان کردووە لەم جێ نزرگەیەوە نزیك بن لەدەوروبەری جێی خۆیان کردبۆوە، حەوشەی دەورەکەی مەرمەڕ کرابوو، لەناوەڕاستیشدا ئافورەیەکی‌جوان هەبوو، مزگەوتێکی جوان کە گومەزێك و دوو منارەی هەبوو لە بەردەمیا بوو، ئەوانەی دەهاتن دەستنوێژیان دەشت و لەمزگەوتەکەدا دووڕکات نوێژیان دەکردو ئینجاسەردانی جێ نزرگەکەیان دەکردو سڵاویان لێدەکرد و دوعای خێریان بۆ دەکرد..ئەو جێ نزرگەیە هی کەسێکی شێخ یان سۆفی نەبوو،بەڵکو جێ نزرگەی هاوەڵێکی پێغەمبەربووﷺ..

ئەوکاتی خۆی پێش چواردە سەدە لە (یثرب)ەوە چوو بۆ مەککە لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا پەیمانی بەست، کاتێکیش پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە مانگێك لەماڵی ئەودا مایەوە،تا مزگەوت و ماڵەکەی تەواو بوو..

ئەم پیاوە نەبەردە حەزرەت ﷺ لەگەڵ (مصعب ی کوڕی عومەیر)دا کردی بەبراوهەموو غەزاکانیبینی، لەگەڵ پێشەوا عەلی دا دژی(خوارج) جەنگا، ئینجا چوو بەرەو ئەوروپا، ئەو هاوەڵەش (ئەبو ئەیوب)ە..

پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك فەرمووی (اول جیش من امتي یغزون البحر قد اوجبوا): یەکەم سوپایەك کە لەدەریادا دەجەنگن بەهەشتیان مسۆگەرە ..

(ئوم حیرام) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەوانم؟

فەرمووی: بەڵێ تۆ لەوانیت..

ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (اول جیش یغزون مدینة قیصر مغفور لهم) یەکەم سوپایەك جەنگی شاری قەیسەر دەکەن، خوا لێیان خۆش بووە. ئوم حیرام وتی: منیان تیام ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: نەخێر!

معاویە یەکەم کەس بوو کەلە دەریادا جەنگا و کوڕەکەشی (یەزید) یەکەم کەسە کە هەوڵی فەتح کردنی قوستەنتینیەی دا لەساڵی (٥٢)ی کۆچیدا، کە ئەبو ئەیوبیش لە سوپاکەیدا بوو، لەم جەنگەدا ئەبو ئەیوب نەخۆش کەوت، کە یەزید سەردانی کرد لەسەرە مەرگیدا پێی وت:

سەلامم بگەیەنە بەخەڵکی و هەواڵیان بدەرێ کە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە(من مات لا یشرك بالله شیئا جعله الله فی الجنة).. کە مردم چەند توانیتان ببەنە پێشەوە بۆ ناو خاکی دوژمن ولەبەر پێتاندا بمنێژن لەو شوێنەدا کە بە دوژمن دەگەن (فادفنونی تحت اقدامکم حیث تلقون العدو).

بەڕاستی جوان لە جیهاد و هەوڵ و تێکۆشان تێگەیشووە؟!دەیەوێت زیاتر بڕوات بەرەو دوژمن نەك بەزیندویی بەڵکو بە مردویشلبەڵێ ..لە ساڵی (٥٢) ی کۆچیدا لە خاکی ڕۆمدا گیانی سپارد و لە لای شوراکانی (قوستەنتینیە)بە خاك سپێردرا، کە موسوڵمانان ئابڵوقەیان دابوو...ئەو شەوەی کە مرد و ناشتیان بۆ بەیانی، ڕۆمەکان یەکێکیان نارد و پرسیاری کرد، ئەرێ ئەمشەو زۆر سەرقاڵ بوون؟!

موسوڵمانانیش وتیان: گەورە هاوەڵێکی پێغەمبەرەکەمان کۆچی دوایی کرد، وتیان: باشە ناترسن دەستکاری گۆڕەکەی بکەین؟ وتیان: بەخوا دەست بەرن بۆ گۆڕەکەی نایەڵین زەنگێکی کەنیسەکانتان لە وڵاتی ئێمەدا لێبدرێت ..ڕۆمەکان ناچار بوون کە هەمیشە بیپارێزن

و ئاگاداری بن لەبەر هەڕەشەی موسوڵمانان..تەنانەت کە زانیان ئاوا کەسێکی پیرۆزە، لە کاتی بێبارانیدا گڵی سەر قەبرەکەیان لا ئەدا تا بارانیان بۆ بباریێت، بارانیشیان بۆ دەباری...

ئەبو ئەیوب سوپاکەی هان ئەدا بۆ جیهادو ئەم ئایەتەی بۆ دەخوێندن ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ البقرة: ١٩٥

ئەبو ئەیوب زۆر ئازاوچاو قایم بوو، هێرشی دەبرد بۆ دوژمن، هەندێك وتیان: سبحان الله خۆی تووشی تیاچوون و تەهلوکە دەکات! ئەویش پێی وتن: ئێوە بەهەڵە لەم ئایەتە تێگەیشتوون و لێکی دەدەنەوە، ئەو ئایەتە لەسەر ئێمە هاتۆتە خوارەوە،کاتی خۆی‌کەئیسلام سەرکەوت و دەسەڵاتی پەیدا کرد وتمان هەق وایە ئیتربچین بەلای ماڵ و مناڵ و باخ و باخاتمانەوە، کەچی ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە و هانی داین لەسەر جیهاد کردن و، سەرقاڵی دنیای دانا بە تەهلوکەو تیاچوون.

بوونی ئەبو ئەیوب لە ئەوروپا هۆکارێکی سەرکەوتنی محمد الفاتح بوو پاش (٨٠٠) ساڵ، چونکە لەکاتی جەنگەکەدا زانایان بەناو سوپاکەدا دەهاتن و دەچوون هەڵیان دەنان لەسەر هەوڵ و تێکۆشان و نموونەیان بە گۆڕی ئەبو ئەیوب بۆ ئەهێنانەوەو،دەیانوت: پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە و لە ماڵی ئەودا دانیشت، ئەمیش مەدینەی پیرۆزی بەجێهێشت، تا بێت و لێرەدا سەر بنێتەوە ..بەمەش ورەی سەربازەکانی محمد الفاتح بەرز دەبوەوە..

پاش هەشت سەد ساڵ لە مردنی، مامۆستای محمد الفاتح (اق شمس الدین) ئاسەواری‌گۆڕەکەی دۆزیەوە، (محمدالفاتح)یش مزگەوتێکی‌لەبەردەمیا دروستکرد و ناوی نا مزگەوتی‌سوڵتان ئەیوب..جا عادەتی عوسمانیەکانیش وا بوو کە هەریەکێ ببوایە بە سوڵتان، بە مەوکبێکی زۆر بە شکۆ دەچوو بۆ ئەو مزگەوتە و لەوێ لەسەر قەبری ئەبو ئەیوبی ئەنصاری وەك مەراسیمێکی بوون بە سوڵتان شمشێری سوڵتان عوسمانی یەکەمیان ئەدایە.[1].

---

١- (گۆڤاری المجتمع ژ١٧٧٢)

# موعجیزەی هاتن بەرەو ئیسلام

قورئانی پیرۆز تاکە پەڕاوە کە خوای گەورە پەیمانی پاراستن و بڵاوبوونەوەی داوە بە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا هەروەك دەفەرموێت: ﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ۝٨ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ﴾ الصف: ٨ - ٩، و پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت (سيبلغ هـذا الأمـر – أي الإسلام – ما بلغ الليل والنهار) ..

قورئان بە پێچەوانەی پەڕاوەکانی ترەوەیە کە دەستکاری کراون و بەردەوامیش دەستکاری دەکرێن و، هەرچی دەکەن نازانن چۆن لە هەڵەو ناتەواویەکانی پەڕاوەکەیان ڕزگاریان بێت..

(کیتابی موقەدەس- تەورات و ئینجیل) شتی وای تیایە کە شەرمەزارن لە ناستیا، ئەوەتا بوختان بۆ دەیان پێغەمبەر دەکەن سەلامی خوایان لێبێت، کە (مەی) یان خواردۆتەوە و زینایان لەگەڵ (محارم)دا کردووە..(هەروەك لوط و داود وابراهیم و زکریا..هتد) سەلامی خوایان لێ بێت..ئەو کەسانەش کە کیتابی موقەدەسیان نوسیوەتەوە وەك (مرقص)و (پولس)و (لوقا) ..هتد قوتابی حەزرەتی عیسا نەبوون، ئەوکیتابی بەناوموقەدەسە کەلەبەر دەستایەو وەرگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی، نوسخەی ئەسڵی دیار نیە، باشە لە چیەوە وەرگێڕدراوە کەس نازانێت؟!

نمونەیەك لە تەحریف کردن: لە نوسخەی ئینگلیزی مەلیك جیمس ی کیتابی موقەدەس دا هاتووە:( Blessed are they that dwell in thy house. they will be still praising you ، blessed is the man whose strength is in you ، whose heart is set on piligrimage as they pass through the valley of Baca make it awel) /PSLAMS (٤-٦)

(وەرگێڕانە عەرەبیەکەی)"طوبى لأناس عزهم بك طرق بيتك (الأصل كلمة الحج) في قلوبهم، (٨٤: ٦) عابرين في وادي البكاء يصيرونه ينبوعاً أيضا بركات يغطون مورة"

لەم دەقەدا دوو وشە دەستکاری کراوە، یەکەم وشەی (pilgrimage)کە مانای (حەج) دەگەیەنێ لە نوسخەی عەرەبیەکەدا هەر لایان بردووە، هەروەها وشەی (baca)کە ناوێکی مەککەیەو

لە قورئانیشدا هاتووە،

المزمور

**Holy Bible**

The New King James Version

CONTAINING
THE OLD AND NEW TESTAMENTS

This Special Edition of the
New King James Bible
is presented as a gift from

HILLWOOD MINISTRIES
Mt. Juliet, Tennessee, U.S.A.

387 PSALM 85:7

**PSALM 84**

**The Blessedness of Dwelling in the House of God**

To the Chief Musician. On an instrument of Gath. A *Psalm of the sons of Korah.*

HOW lovely is Your tabernacle,
O LORD of hosts!
2 My soul longs, yes, even faints
*For the courts of the* LORD;
My heart and my flesh cry out for the
living God.

3 Even the *sparrow has found a home,*
And the swallow a nest for herself,
Where she may lay her young—
*Even* Your altars, O LORD of hosts,
My King and my God.
4 Blessed *are* those who dwell in Your house;
They will still be praising You. Selah

5 Blessed is the man whose strength is in
You,
6 Whose heart is set on pilgrimage.
As they pass through the Valley of Baca, بكه
They make it a spring;

لە نوسخەی عەرەبیەکەدا کردویانە بە (وادي البكاء)..جا بۆ ئەوەش ئەمەیان کردووە تا مەسیحیە عەرەبەکان کە قورئان دەبیستن نەڵێن ئەو دەقەی ئینجیل باسی مەککەی تیایە و ببێتە مایەی موسڵمان بوونیان..

کەدەفەرموێت: ﴿ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلّٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۚ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ مَّقَامُ إِبۡرَٰهِيمَۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنٗاۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾آل عمران: ٩٣-٩٧، ئەوەی سەیرە ئەوەیە لەپێش باسی بەککەوە قورئان باسی

ئیفتیراو تەحریفاتی گاورو جوولەکەکان دەکات، ئەوەتا لای ئەوان ئەو بەڵگە گەورەیە هاتووەو ناوا تەحریفیان کردووە!!

ئەم بابەتە دکتۆر زەغلول النجار لە گۆشەیەکی خۆیدا لە ڕۆژنامەی (الأهرام)دا بڵاوی کردەوە، وتارەکانی ناوبراو لە ئەهرام دا بووەتە مایەی موسڵمانبونی ژمارەیەکی زۆر لەگاورەکانی میسر..

د.زەغلول دەڵێت: پاش بڵاوکردنەوەی ئەو وتارە، لەسەر سەفەربووم لە فرۆکەخانە لاوێکیمەسیحی بەناوی (جۆن)هات بۆ لام و پرسیاری لەو بارەیەوە کرد، منیش وتم: ئینگلیزی دەزانی وتی: بەڵێ دەرچووی کۆلێژم و ئێستا ژمێریارم، وتم: زۆر چاکە ئەوە هەردوو دەقە ئینگلیزیەکە و عەرەبیەکەیە لەبەردەستایە خۆت بەراوردی بکە،بزانە تەحریف کراوە یان نا.

پاش ئەوەی گەڕامەوە میسر بینیمەوە مژدەی دامێ کە موسوڵمان بووە و تەنانەت ڕەمەزان بەڕۆژوو بوەو تەراویحیشی کردووە، هەروەها وتی: دایك و باوکم مەسیحین و زۆر دەوڵەمەندن و تەنها منیان هەیە، دەترسم موسڵمان بوونم ئاشکرا بکەم جەڵتە لێیان بدات، منیش وتم: دەتوانی جارێ ئاشکرای نەکەی لەبەر ئەوان.

پاش دوو مانگی تر بینیمەوە لە دوبەی وتی: هاتووم لێرە فێری ئیسلام ببم، تا بتوانم بە چاکی بەرپەرچی ناحەزانی ئیسلام بدەمەوە!

بەڵێ ..دەستکاری کردنی تەورات و ئنجیل و پارێزراوی قورئان وادەکات کە خەڵکی دەستە دەستە لەهەر چوار قورنەی دنیاوە بێن بەرەو ئیسلام، دکتۆر زەغلول دەڵێت: بەراوردکردنی ئاینەکان وخستنەڕووی تەحریفاتی تەورات و ئنجیل مەسەلەیەکی زۆر گرنگە کە موسوڵمانان و بانگخوازان کاری لەسەر بکەن..

## دیبلۆماتیکی بەریتانی موسڵمانبوو:

دیبلۆماتێکی بەریتانی بەناوی (هند جیم)کەلە سەفارەتی بەریتانی کاری دەکرد لە پاکستان، لە مزگەوتی ناو پەرلەمانی پاکستانیدا موسوڵمانبونی خۆی ڕاگەیاند و ناوی خۆی کرد بە (محمد ایوب)، ناوبراو دەڵێت: لە ئیسلامدا هەموو خێرو خۆشیو وەڵامی هەموو پرسیارەکانم دەستکەوتووە.[1].

---

١- (المجتمع)١١\٩\٢٠٠٧.

## ڕۆژنامەنووسێکی سویدی موسڵمان بوو:

(مالین)ی مەسیحی ڕۆژنامە نوسی سویدی، موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاندو ناوی خۆی کرد بە (عائیشە)و بۆ ڕۆژنامەی ئێکس برنس دەدوێ و دەڵێت: لە بەراوردکردنی ئاینەکاندا تەنها لە ئیسلامدا گشت ڕاستیەکانم بۆ دەرکەوت، بڕواداریم وام لێدەکات میهرەبان و لەسەرخۆبم، من ئاسودە وبەختیارم کە سەرپۆشم پۆشیوە،لە ئیسلامدا ڕێگای بنیاتنانی ژیانم دۆزیەوە، قورئان سۆما و گلێنەی چاوانمە، بەبێ قورئان لەدەرەوی ژیان دەژیم، لێرە بە دواوە هەوڵدەدەم بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ئیسلام، بۆ ئەوەی بتوانم وەلامێکی ڕاست و دروستی ئەو کەسانە بدەمەوە کە پرسیار دەکەن و ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن، چونکە ئیتر وەك موسڵمانێك ڕەفتار دەکەم و دەژیم و دەبێت بە موسوڵمانێتیش بمرم.[1]

## موسڵمانبوونی لاوێکی فلیپینی:

لاوێکی فلیپینی بەناوی (نورمن)کە لەدایك بووی ساڵی ١٩٧٠ز یە، لەگەڵ کۆمپانیای (الجال) هاتە وڵاتی سعودیە بۆ ئیش کردن، ناوبراو مەسیحی بوو، دواتر حەوت ساڵێك لەمەوبەرلە ڕۆژی هەینی ١٥\١١\١٤٢١كۆچی دا موسوڵمانبونی خۆی لە نوسینگەی جالیات لە شاری (ئەبها)ی سعودیە ڕاگەیاند..کاتێك موسڵمان بوو وتی: (لە مانگی ڕابردوودا کاتژمێر ١١ی شەو لە کارکردن بوومەوە، خەوێکی زۆر خۆشم لێکەوت، لە خەوما بینیم لە مزگەوتێکدام و خەڵکی لە دەورمن، (بەمەرجێ من تەنها مزگەوتم لە دەرەوە بینیبوو)، خەڵکیم بینی نوێژ دەکەن و هەیانبوو لە کڕنوش دا بوو هەیانبوو لە سوژدەدا بوو، لە پڕ پیاوێکی جل و بەرگ سپیم بینی، کە ڕووی زۆر نورانی بوو، لە پشتیەوە فراوانیەکی زۆر گەورە هەبوو، کەوتە دڵمەوە کە ئەو حەزرەتی(ئیبراهیمە)..

پێی فەرمووم: (بگەڕێرەوە).

وتم: چۆن بگەڕێمەوە؟

فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ حەق و ڕاستی!!

خەبەرم بوەوە، چووم بۆ لای هەندێ موسوڵمان و پرسیاری خەوەکەم لێکردن، قەناعەتم کرد کە ئیسلام تەواوترین ئاینە لە دنیادا، بە تایبەت کەلەخەوەکەمدا لە مزگەوتدا بووم، لە

---

١- (ڕێگەی: ئیسلام پەیك)..

کەنیسە یان پەرستگایەکی تردا نەبووم، ئینجا ناوی خۆم بەبەرەکەتی خەوەکە کرد بە ئیبراهیم.[1]

## کلود کوفاسی موسڵمانبوو:

لە سویسرا(دەزگای موخابەرات) سیخوڕێکیان نارد بۆ بنکەی ئیسلامی کەناوی (کلود کوفاسی) بوو، تا چاودێری بەڕێوەبەری بنکەکە دکتۆر (هانی ڕەمەزان) بکات کە کچەزای ئیمام بەننایە و کەسێکی گورج و گۆڵ و چالاکە لە بواری بانگەوازدا..

(کلود کوفاسی)بە ڕووکەش وای پیشان دا کە موسوڵمان بووە و زۆر هات و چۆی بنکەی ئیسلامی (جنیف)ی دەکرد، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئیسلامی لا خۆشەویست دەبوو، ڕاستیەکانی بۆ دەرکەوت و سەرەنجام موسڵمان بوو، چەند جاری تریش ناردیان بۆ وڵاتی (نەیجەر)و (میسر)و (مۆریتانیا) و(تورکیا)تا مەعلوماتیان بۆ کۆبکاتەوە لەسەرئەو کەسانەی کە دەیانویست جیهاد بکەن.

ناوبراو داوای کرد وازی لێبێنن و داوای دەست لە کارکێشانەوەی کرد، ئەوانیش ڕازی نەبوون، زۆریان لێدەکرد کە بوختان بکات و تۆمەتی ناڕەوا بخاتە پاڵ بنکەی ئیسلامی جنێف و بەڕێوەبەرەکەی و شایەتی ناهەق بدات لە دژیان، ئەویش بە هیچ جۆرێك ڕازی نەبوو کاری وا بکات و لە دادگادا کە ئەوە دووجارە ئامادە دەبێت هیچی دژی ئەو بنکەی ئیسلامییە نەدا بەدەستەوە..[2]

## تەوبەی گۆرانیبێژێك:

گۆرانیبێژی عەرەب (محمد المازم) پاش ئەوەی سروودێکی ئیسلامی لەسەر پێغەمبەر ﷺ وت (یاحبیبی یامحمد)، لە چاوپێکەوتنێکی کەناڵی شارقەدا وتی: کە بڕیاری داوە ژیانی بگۆڕێت بەرەو خێرو، ئیتر واز لەگۆرانی بێنێت و تەنها سروودی ئیسلامی بڵێت و هونەرێك پێشکەش بکات کە سوود بەکۆمەڵگا بگەیەنێت ..

---

١- www.themwl.org\aldaawa

٢- www.arab-eng.org

## ئەبیدال موسوڵمان بوو:

بەرگری هەڵبژاردەی فەرەنسا، یاریزانی یانەی بەرشەلۆنەی ئیسپانی ئیریك ئەبیدال موسوڵمان بوو ناوی خۆی کرد بە (بیلال)و لە ڕۆژنامەی (ئیسنادی دەوحە)ژمارەی ٣٠ اغسطس ٢٠٠٧وتی: هەر لە منداڵیەوە قەناعەتم بە ئیسلام هەبووە، بۆیە موسوڵمان بووم و ئافرەتێکی موسڵمانم هێناوە.[١]

## بانگخوازێك (٤٠٠٠) کەس موسڵمان دەکات:

ئەندازیار (محمد توفیق ئەحمەد سعد)لەساڵی ١٩٠٣ لەشاری (الفیوم) لە میسر لەدایك بووە، باوکی بەڕێوەبەری بانکی ئەهلی میسری بوو لەو شارەدا، لەسەرەتای ژیانیەوە کاریگەری دایك و باوکی لەسەر بوو، لەلایەنی نوێژکردن و دینداریدا، ماڵی باوکی جێژوانی کەسایەتیە ئاینی و وێژەیی‌یەکان بوو، لەوێدا کۆ ئەبوونەوە و دوای نوێژی خەوتنان کۆڕ و مەجلیسی قورئان خوێندنیان دەبەست..

لەم کەش و هەوایەدا فێری قورئان بوو نەك لە حوجرەکانەوە، کە تاقەتی مامۆستای حوجرەکانی نەبوو لەبەر زبری و توندی مامەڵەیان لەگەڵ قوتابیاندا..

هەروەها کاریگەری مامۆستای مزگەوتی (الحواتم)ی لەسەر بوو، بەتایبەت کە دوای نوێژی نیوەڕۆ وعەسر وتاری ئەدا..ئەمانە هەمووی وای کرد کە ڕۆشنبیرێکی ئیسلامی لێ دەرچێت..

## ئەزمونێکی سەیر و سەمەرە:

لە منداڵیدا وریا بوو، پرسیاری زۆری دەکرد،تا ئاسۆی تێگەیشتنی فراوان بێت، لە ناوچەکەیاندا مزگەوت و کەنیسە هەبوو، ئەمەش پرسیارێکی لا دروستکردو ڕۆژێك لە دایکی پرسی: (دایە موسوڵمانان ئەچن بۆ مزگەوت بۆ نوێژ کردن و سوپاسکردنی خوا، ئەی ئەوانەی دەچن بۆ کەنیسە چی دەکەن؟ دایکی وتی: ئەوانیش سوپاس و ستایشی خوا دەکەن بەپێی ئایینەکەی خۆیان).

ئەمیش لە وەڵامەکەی دایکیەوە پرسیارێکی تری لا دروست بوو وتی: جاکە هەردوکیان سوپاس و ستایشی خوا دەکەن، بۆ لەیەك شوێندا کۆنابنەوە؟

---

١- (المجتمع).

دایکی وتی: کوڕم کە میوانێکی زۆرمان دێت و لە ژوری میوان جێ نابێتەوە، چی دەکەین؟؟

وتی: هەندێکیان دەچنە هۆڵەکە،ئەگەر زۆرتریش بن خێمەیان بۆهەڵئەدەین..(دایکی ویستی بەوەلامێکی سادەو مەنتیقی وەلامیبداتەوەکە لەگەڵ بیروپلەی تێگەیشتنیدا) بگونجێت ..

ڕۆژێك وتی: دایە ئەتوانم بچم بۆ کەنیسە ستایشی خوا بکەم؟؟

دایکیشی ڕێی لێ نەگرت و ئەو بیرکردنەوەیەی‌بە شتێکی سروشتی و فیتری دانا کە مەترسی لەسەر نیە..محمد کەوتە سەردانی کەنیسە و تێبینی ئەوەی کرد کە کەنیسە بە نەرم و نیانی مامەڵەی منداڵ دەکەن، بۆیەکەوتە وتنەوەی دوعاو نزاکانیان. کاتێك باوکی بەمەی زانی ویستی قەناعەتی پێبکات و تێی بگەیەنێت کە موسڵمان ئیشی بە کەنیسە نیە و تەنها ئەچێت بۆ مزگەوت، هەرچی کرد سوودی نەبوو، هەڕەشەی لێکرد کە ئەگەر بچێ بۆکەنیسە ڕۆژانەی ناداتێ، ئەمەش سوودی نەبوو،ئینجا باوکی چوو بۆ لای بەڕێوەبەری قوتابخانەکەیان سا بەڵکو کار بکاتە سەری ئەویش هیچی پێنەکرا ..پاشان کە فشاریان زۆر بۆ هێنا چوو بۆ لای مژدەدەری ئەمریکی کەنیسەی ئینجیلی میستەر گەلەوی .

لەدووری کیلۆمەترێکەوە لە شاری (الفیوم) قوتابخانەیەکی مژدەدانی مەسیحی هەبوو کە ئەم میستەر گەلەوی یە بەڕێوەی دەبرد، محمد حەزی کرد لەوێ بخوێنێ و نەچێتەوە قوتابخانەکەی خۆی.. گەلەوی پەیوەندی کرد بە باوکی منداڵەکەوە و حەزی کوڕەکەی بۆ باس کرد باوکیشی زۆر بە ڕەقی وەلامی دایەوە، دواتر گەلەوی محمدی وەرگرت و جێی خوێندن و مانەوەی بۆ ئامادەکرد..

گەلەوی وریابوو بۆ ئەوەی زۆر دژایەتی نەکرێ و کارەکە ئاسان بکەوێتەوە،لەگەڵ ئەوەدا کە محمد وانەکانی قوتابخانەی مژدەدەرەکانی دەخوێند، مامۆستایەکیشی بۆئامادەکرد کە قورئانیشی پێ بڵێت، بەم جۆرە ئەم منداڵە قورئانیش و ئینجیلیشی لەیەك کاتدا دەخوێند، بەڵام لەبەر ئەوەی کەزۆر وریاو بیر تیژ بوو وردە وردە تێبینی لەلا دروست بوو لەسەر ئینجیل، بۆ نموونە کە عیسا سەلامی خوای لێ بێ بە زبری بەدایکی دەڵێ (مالك ومالي یا امــراة) کە ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە لە قورئاندا هاتووە کە زۆر چاك بووە لەگەڵ دایکیاو

دەفەرموێت﴿ وَبَرًّا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ ﴾مريم: ٣٢ ، ئینجا کەوتە تۆمارکردنی تێبینیەکانی لەسەر ئەو کوڕاسانەی کە میستەر گەلەوی پێی دا بوو.

ڕۆژێك تێبینیەکانی پیشانی مستەر گەلەوی دا کە سێ کوڕاسە بوو تا وەڵام وەربگرێت، ئەویش کە خوێندیەوە وتی: ئەوەی ئەمەی نوسیوە شەیتانە تۆ نیت..محمدیش وتی: من نوسیومە،گەلەوی وتی: وەڵامم لا نیە، ئەمەش محمدی بێ هیوا کرد لە مەسیحیەت، ئینجا داوای لە ناوبراو کرد کە بیگەیەنێ و نزیکی بکاتەوە لەو مزگەوتەی کە مامی نوێژی تیا دەکرد، پاش ئەوەی گەیاندی و مامی بینی، مامی تکای بۆ کرد کە بگەڕێتەوە ماڵی خۆیان، باوکیشی پاش ئەوەی زانی کە منالەکەی بە قەناعەتی تەواوەوە هاتۆتەوە قایل بوو..

محمدی بەتەمەن منالێ و بە عەقڵ گەورە لە ئەزموونەکەیدا سەرکەوتوو بوو، حەزی بە بڵاوکردنەوەی خێر بوو، بانگخوازێکی بچکۆلانەی هیممەت بەرز بوو، لە قۆناغی سەرەتاییدا لەوانەی ئاین هەندێ شتی دەردەهێنا و لەپەڕەی گەورەدا دەینوسین و لە چەند شوێنێکدا هەڵی دەواسین بۆ ئەوەی خەڵکی سوودی لێ وەربگرن..

لە قۆناغێکی تریشدا لەگەڵ هەشت هاوەڵی قوتابخانەیدا بڕیاریاندا ئەوەی کە لەوانەی ئاینەوە فێر بوون بچن بیگەیەنن بەو مزگەوتە بچوکانەی کە جوتیاران لە نزیك کێڵگەکانیان دروستیان کردبوو، لەبەر ئەوەی شوێنی نوێژەکانیش هەشت بوون و خۆشیان نۆ قوتابی بوون یەکێکیان هەڵبژارد کە بگەڕێ بەسەر هەمواندا و کارەکانیان هەڵسەنگێنێ کەئەمەش بۆ تەمەنی ئەوان کارێکی زۆر مەزن بوو.

لە ساڵی ١٩١٨ چوو بۆ قاهیرە بۆ خوێندن،ئینجا بیری کردەوە کە ڕۆژنامەیەکی یەك لاپەڕەیی دەربکات، ڕۆژنامەکەی دەرکرد بەناوی (التقوى) کە ژمارەی یەکەمی هەزار دانە بوو، ئەم ڕۆژنامەیە تا ساڵی ١٩٢٩ بەردەوام بوو، ئینجا بۆ خوێندن ناردیان بۆ سویسرا لەوێش بۆ ئەوەی ئەوروپیەکان شارەزا بکات لە ئیسلام خانەی گەیاندنی ئیسلامی دامەزراند، کە دەزگایەکی مەعنەوی بوو بەتەنها خۆی کاری تیا دەکرد، هەروەها وتاری دەنارد بۆ ڕۆژنامە ئەوروپیەکان و بەرپەرچی ئەو گومانانەی دەدایەوە کە دەخرانە پاڵ ئیسلام ..

ڕۆژانەش نامەی خوێنەرانی ئەو ڕۆژنامانەی بۆ دەهات و وەڵامی پرسیارەکانی ئەدانەوە ..

بۆ ماوەی پەنجا ساڵ، لە ساڵی ١٩٤٣تا کۆتایی ژیانی لە ساڵی ١٩٩١ دا گۆڤاری (البريد الاسلامی)دەرکرد.

بەم جۆرە لە ڕێگەی نامە ناردنەوە بەزۆربەی زمانەکانی دنیا توانی بانگەوازی خوا بدات بە گوێی زیاتر لە سەد هەزار بیانی دا کە بەلای کەمەوە چوار هەزار کەسیان بە فەزڵی خوا موسوڵمان بوون..کە ئەمەش بە ڕاستی زەخیرەیەکی گەورەیە بۆ قیامەت، خۆزگەمان بەخۆی !!

## یەکەم زنجیرەی تەلەفزیۆنی ئیسلامی کەنەدی:

زنجیرەی تەلەفزیۆنی (little Mosque on the Prairie) واتا مزگەوتێکی بچوك لە نووسینی (زەرقا نەواز)ە کە ئافرەتێکی موسڵمانی کەنەدی بە ڕەگەز پاکستانیە، لە شاری لیڤەرپوولی بەریتانیا لە دایك بووە و لەگەڵ تەلەفزیۆنی (CBC)ی کەنەدی کاردەکات، نوسەرو ڕۆژنامەنوس و سیناریۆنووسی فیلمە، ناوبراو لە چاوپێکەوتنێکدا سەبارەت بە فیلمە نوێیەکەی وتی: فیلمی مزگەوتێکی بچوك شێوازێکی نوێی کارکردنە لە نێوان هەڕەشەکانی تیرۆرستان و فیلمی کۆمیدی.

ناوبراو وتی کەلە هەفتەی یەکەمی نمایشکردنی فیلمەکە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنی (CBC) ٢،١ ملیۆن بینەری هەبووە، وتیشی کە هیوادارم ئەم فیلمە دەرگایەکی نوێ بەسەر ڕەوەندی ئیسلامی بکاتەوە لە کەنەداو خەڵك بزانن کە ئەم ڕەوەندەش هەروەکو ڕەوەندەکانی تر خاوەنی خاڵی لاوازو تایبەتمەندی خۆیانن، وتیشی کە ڕەنگە ئەو فیلمە لە فیلمە کۆمیدییەکانی تر جیاواز بێت چونکە کۆمیدیا جیهانێکی فراوانە.

ماری دارلینك بەرهەمهێنەری فیلمەکە وتی کە بێگومان ئێمە بەو فیلمە ئەتوانین شتێك بکەین، بەوەی چۆن (٦٠٠٠٠٠) موسڵمانی کەنەدی خۆیان لە میدیاکانی کەنەدی دەبینن بە تایبەتی دوای ڕوداوی ١١ی سێپتێمبەر، شایانی باسە زنجیرە تەلەفزیۆنی کەنەدی (مزگەوتێکی بچوك) باس لە ژیانی موسڵمانانی گوندێك دەکات لەشاری خەیاڵی (Mercy) لە هەرێمی (Saskatchewan) بەشێوەیەکی کۆمیدی کە ناتوانن لەگەڵ داب و نەریتی کۆمەڵگەی کەنەدی تێکەڵ بن و تووشی کێشەو ڕووبەڕووبونەوە دەبن بە تایبەت دوای ڕوداوی ١١ی سێپتێمبەر.

هەروەها فیلمەکە باسی کێشەو ناکۆکیەکانی نێوان موسڵمانانی ئەو شارەش دەکا بەهەبوونی دوو ڕەوتی جیاواز، ڕەوتێك کە بە شێوازێکی مۆدێرن و هاوچەرخانە تەمسیلی ئیسلام دەکەن و ڕووی راستەقینەی ئیسلامی پیشانی کەنەدییەکان دەدەن، ڕەوتەکەی تریش بە پێچەوانەوە توندڕەون. فیلمەکە کەلە ٢٠ ئەلقە پێکهاتووە لە ٩ی کانونی دووەمی ٢٠٠٧ لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنی (CBC) دەست بە بڵاوکردنەوەی کراو لە ٧ی ئازاری ٢٠٠٧ کۆتایی پێهات و بڕیارە لەسەر شاشەی هەمان تەلەفزیۆن لە ٣یمانگی ئۆکتۆبەری داهاتوو دووبارە پەخش بکرێتەوە. جێی ئاماژەیە کە فیلمەکە سەرنجی زۆربەی میدیا جیهانیەکانی بۆ خۆی ڕاکێشاوەو بڕیارە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانی وڵاتانی ئەورووپاش نمایش بکرێت و لەسەر شاشەی (کەناڵ ٧)ی تورکیاش پەخش بکرێت.[١]

## ئامینە بانگخوازی ناوداری تورکیا:

ئامینە چەنك لیك ئۆغلو لە دایك بووی ١٩٥٣/٥/٢٧ و دانیشتووی شاری (ئەستەنبوڵ)ە و نووسەرو لێکۆڵەر و ڕۆژنامەنووسێکی موسڵمانەو لە جیهاندا ناسراوە...

دوایـن کتێبی کە ڕۆمانێکی سەرنجڕاکێش و فکرییە بەناوی (الوردة المسيحية) وەگێڕدراوەتە سەر زۆربەی زمانەکانی جیهان، ناوبراو داکۆکیکارێکی زۆر باشە لە ئیسلام و گرنگی پێدەدات چونکە﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾آل عمران: ١٩ لەم پێناوەشدا چەندین جار زیندانی کراوە .

هەر لە منداڵییەوە بەرەنگاری ژیان بووەتەوەو هەستی بە ستەم و نادادپەروەری کردووە، ئینجیلی خوێندۆتەوەو ئینجا ڕووی کردۆتە ئاینی ئیسلام، چەندین موحازەرەی لە تورکیاو دەرەوەی تورکیا وتۆتەوە. دووساڵ و نیو بەندکرا دوای دەرچوونی کتێبێکی بەناوی (سرقوا عقيدة الشباب بالأسئلة) لە ساڵی ١٩٨٥ گۆڤاری (المكتوب)ی دەرکردووە و ئێستاش (بەڕێوەبەری نووسینی) گۆڤاری ناوبراوە و لە ساڵی (١٩٨٤) وە دەنووسێت و خاوەنی ٧٠ کتێبە. لە دیدارێکی سایتی یەکگرتوودا ئەم پرسیارانەیان لێکرد:

ژیانی خێزانیت؟ سەرەتای هیدایەت و موسڵمان بوونت؟

---

١- بۆ ئاشنابوونی زیاتر دەتوانن سەردانی وێب سایتی ئەو فیلمە بکەن بەم ئەدرەسەی خوارەوە
www.cbc.ca/littlemosque

تێڕوانینی دەوروبەرو خێزانت؟ هاوڕێکانت و دراوسێ؟

ژیانی بەندیخانە؟ ژیانی ئێستاو کارەکانت؟

ئامینە چەنك لیك ئوغلو: سەرەتا زۆر بەخێربێن و بەختەوەرم کە خوشکانی وەك ئێوە دەبینم، من کچێکم هەیەو شەش نەوەم لە ژیاندایە. لەساڵی ١٩٩٣ سەردانی کوردستانم کردووە.

سەرەتای هیدایەتم چیرۆکێکی دوورودرێژە، من نەخشەکێش و نمایشکەری پۆشاك بووم و لەگەڵ ئەوەدا زۆر سەرکەوتوو بووم ئاسودە نەبووم، یەکەم جار ئینجیلەکانم خوێندەوەو قەناعەتم نەهات، دوایی دیراسەی قورئانم کرد هەستم بە ئارامی کردو دەروونم ئاسوودە بوو هەربۆیە بڕیاری بالآپۆشیم دا، ماڵەوەم ڕێگر بوون، هەوڵیاندا پەشیمان ببمەوە.

لە شوێنی کارکردنیشم بەجۆرەها شێوازی ناخۆش هەوڵیان دا پەشیمانم بکەنەوە، بەڵام من بڕیاری خۆمم دابوو، من ئەوانیشم فێری قورئان کرد چونکە سوور بووم لەسەر موسڵمان بوونم .

سەبارەت بە هاوڕێکانم زۆر لایان قورس و ناخۆش بوو، دژایەتیان کردم تەنانەت یەکێ لە هاوڕێکانم سەگێکی هەبوو ناوی نا ئامینە، منیش دەستم بە سەگەکەدا هێناو وتم: ئەوە ئاژەڵێکی بێ تاوانەو بەزەیم پێیدا دێتەوە، باش بوو خۆت ناونەنا ئامینە چونکە لام ناخۆش دەبوو.

لەساڵی ١٩٨٤ هەشت ساڵ حوکم درام لەسەر ئەم کتێبە (سرقوا عقيدة الشباب بالأسئلة) بەڵام تەنها دووساڵ و نیو لە زینداندا مامەوەو بەفەرمانی (تورکت ئۆزال) سەرۆکی ئەوکاتەی تورکیا ئازاد کرام . لە بەندیخانەدا شتی زۆر سەیرم بینی، ڕۆژێك چاوم لێبوو ئەفسەرێکی دکتۆر شتێکی بە سستەرەکەی وت ئەویش هاتە لام و سرنجێکی بە دەستەوە بوو منیش وتم نەخۆش نیم وتی دەبێ دەرزییەکت بۆ بکەم من هەر وتم ئامەوێ، لە دوایدا دڵی نەرم بوو سرنجەکەی بە دیوارەکەدا کرد.

بەیانیەك سەیرم کرد کچێکی یەهودی لە رکوعدایە منیش پێم وت: موسڵمان بووی؟ ئەویش وتی نا خوا بەدوورم کا بەڵام ئێمەی یەهودی بڕیارمان داوە تا دەگەینە دەسەڵات نابێ خۆر دەرکەوێ و ئێمە نووستووبین، زۆر لام سەیر بوو ئێمەی موسڵمانیش بیر لەچی دەکەینەوە .

جارێکی تر لە دەرەوە بووم ئافرەتێك هاتە لام کە دەرهێنەری فیلم بوو وتی: گەنجەکان دێن بۆ مزگەوت؟ منیش وتم بەڵێ (الحمدالله) زۆرن، ئەویش کێشای بەسەریاو وتی: کەواتە هیچمان نەکردووە، چەند ساڵە (فیلمی جنسی) دەردەکەین پێ دەچێ بێ سوودبێ.

سەبارەت بە ژیانی ئێستاشم وانەی خوشکانم هەیە و قوتابییەکان بە پەرۆشەوە دێن و موحازەرە دەڵێمەوە، دەمەوێ فێری زمانی ئینگلیزی ببم، تەندروستیم تەواو نیە نازانم لەم تەمەنە فێر دەبم یان نا، کەمێ زمانی عەرەبی دەزانم و هەوڵ دەدەم زیاتر فێربم، دڵم لای موسڵمانانە لە هەر شوێنێك بن و حەز دەکەم ئازادبن لە ژیاندا و سەربەست بن .

## موسڵمانبوونی یاریزانێکی سویدی:

هەفتەی ڕابردوو لە ناو ژمارەیەکی زۆری ئامادەبوانی وانەی گشتی هەفتانە کە لەلایەن بانگخوازی کورد ئەندازیار (ئەحمەد موفتی) کە ماوەی چەندین ساڵە ئەم وانەیە بەڕێوەدەچێت، یاریزانێکی بۆکسێنی سویدی (پێتەر هیتارا) موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند. ناوبراو تەمەنی بیست و حەوت ساڵە و لە وڵاتی سوید لە دایك بووە و بەڕەگەز فیلەندییە، شایەنی باسە تاوەکو ئێستا لەسەر دەستی ئەم بانگخوازە کوردەدا (١١٤) کەسی سویدی موسڵمان بوون.

## موسوڵمانبوونی گەنجێکی سویدی:

لە ئەنجامی سەردانەکانی بانگخوازی کورد ئەندازیارئەحمەد موفتی بۆ گرتوخانەکانی شاری یۆتۆبۆری، گەنجێکی تەمەن ٢٥ ساڵی سویدی موسڵمان بوو. کە ناوی ئەندریاس ئێریکسۆنە ئەمەش بەهۆی کاریگەری ئەو وتارەوە بوو کە مامۆستای بانگخواز لە ٢٠٠٧/٩/٢٥ پێشکەشی زیندانیەکانیکرد. پاش ئەوەی کە شایەتمانیهێنا بەڵێنی دا لە ڕۆژی داهاتوودا بەرۆژوو بێت.

## یاریزانی بەناوبانگی ئەڵمانی کانۆدی:

یاریزانی بەناوبانگ (کانۆدی) کەلە یانەی ئەندەلوس یاری دەکات، لەو کاتەوەی کە بووە بە موسڵمان پێش هەموو یارییەك نوێژ دەکات. کانۆدی لە دایکبووی: ١٩٧٧/٩/٢ و دانیشتووی: لیۆن ی فەرەنسایە.[1]

---

١- (پێگەی ئیسلام پەیك).

## موسڵمانبوونی ئافرەتێکی هۆڵەندی:

سەرەتای ڕەمەزانی ئەمساڵ ئافرەتێکی هۆڵەندی لەکاتی قسەکردندا لە بەرنامەی یەکێ لەو ڕادیۆیانەی بۆ موسڵمانانی هۆڵەندایە موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند .

لەبەرنامەی ڕاستەوخۆی رادیۆ (نیبۆ)داو لەیەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزاندا کە تەجرەبەی موسڵمانانی بەرچەڵەك هۆڵەندی باس دەکرد، لە ناکاو ئافرەتێك بەناوی(میرەندا هۆتن بۆس) خۆی بە پێشکەشکاری بەرنامەکە ناساندو وتی: من لێرەوە موسڵمانبوونی خۆم ڕادەگەیەنم. بەرنامەکەش میرەندای تەمەن ٢٦ ساڵی داوەت کرد تا هاوبەشی بەرنامەکە بکات و بیروڕای خۆی لە بارەی ئیسلامەوە دەربڕێت، چی بیستووە و چی بینیوە .

هەواڵنێری ئیسلام ئۆن لاین نێت دەڵێ: لەگەڵ ئەوەدا کە میدیاکانی ڕۆژئاوا وێنەی نەگەتیڤی ئیسلام بۆ خەڵکی دەگوێزنەوە، ئەوانەی کە لەبارەی ئیسلامەوە توێژینەوە دەکەن و لە ئیسلام دەگەن لەماوەی ئەم چەند ساڵەی ڕابردوودا ڕێژەیان بەرەو زۆر بوونە ...

## چۆن ئیسلامم ناسی؟

میرەندا لەناو بنەماڵەیەکی مەسیحی کاسۆلیکدا گەورە بووە و دەڵێ: من هەموو کات گوێم لەو بەرنامانە دەگرت کە میدیاکان لە دژی ئیسلام بڵاویان دەکردەوە، هەر کە چەند پرسیارێك لە لام گەڵاڵە دەبوو یەکسەر ڕووم دەکردە توێژینەوەو دەستم بەخوێندنەوە دەکرد لە کتێبە ئیسلامی و نا ئیسلامیەکاندا .

میرەندا وتی: هاوەڵێتی و پەیوەندی باشم لەگەڵ چەند موسڵمانێکدا ڕێی توێژینەوەی بۆ ئاسان کردم و یارمەتیان دام بۆ گەیشتن بە ڕاستەقینە. ماوەیەکە بۆ توێژینەوەو بەدەست هێنانی وەڵامی کۆمەڵێك پرسیار لە مزگەوتەکەی دراوسێی ماڵمان نزیك بوومەتەوە .

## هەڵبژاردن مافی خۆمە:

میرەندا وتی: ئەوەی زیاتر بەرەو ئیسلام ڕایکێشاوە ئەوە بووە کە زانیویەتی ئیسلام دواین ئایینە و هەڵبژاردنی ئایین مافی هەموو کەسێکە و ئێستاش کە من ئایینی ئیسلامم هەڵبژاردووە مومکین نیە کەسێك لە مافی هەڵبژاردن مەحرومم بکات.

لەبارەی هەڵس و کەوتی دایك و باوکیەوە لە گەڵیا وتی: دەرگایان لەبەردەما داخست و ڕەفزیان کرد کە من قبوڵ بکەن یا ڕەفیقێکی موسڵمانم قبوڵ بکەن، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ترسیان لە شتێکی نادیارو نایانەوێ بیناسن.

ئەمە یەکەم حاڵەت نەبوو: لەلایەن خۆیەوە ئەو ئیمام (رامی شوکورمان)ی میرەنـدا موسڵمانبوونی خۆی لا ڕاگەیاندبوو لە ڕۆژی یەکشەممە ٩/١٠/٢٠٠٥ بە ئیسلام ئۆن لاین نێتی وت: ئەمە یەکەم حاڵەت نەبووە و دوایین حاڵەتیش نابێ .

هەروەها وتی: زۆر حاڵەتی لەم جۆرە ڕووی داوە، کە خەڵکانێك دێن و دڵنیـایی خۆیـان لـە ئیسـلاما دەبیننـەوەو ئێمـەش ئـەوەمان لەسـەرە دەسـت بدەینـە دەسـتیان و بـەپێی توانـا یارمەتیان بدەین بۆ شارەزابوونی زیاتر، هەروەها وتی: مانگانە بەلای کەمـەوە یـەك هۆڵەنـدی لەم مزگەوتەدا لەسەر دەستی مندا موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا دەکات، ئەوانەی کە موسـڵمان دەبن، لەچین و توێژێکی دیاری کراونین، بەڵکو لـە هـەموو چین و توێـژێکیان تێدایـە، قوتـابی، مـامۆستا، پزیشك، پیاو ئافرەت ..هتد.

شوکورمان داوای لە موسڵمانە نوێیەکان ئەوە بوو: لە خێزان و بنەماڵـەکانیان دانـەبڕێن هەرچەند لەو ڕێیەشدا ئاستەنگی زۆریان بێتـەڕێ و وتـی: مـن دەزانم ئەوانـەی موسـڵمان دەبـن فشـارێکی زۆریـان دەکەوێتـە سـەر، ناخۆشـترینیان فشـاری مەعنەوییـە، بـەڵام پێویسـتە دان بەخۆیاندا بگرن .

**نارەحـەتیـەکـان:** لەبارەی ئەو نارەحەتیانەوە ڕەفیـق ئەحمـەد فـەریس بـە ئیسـلام ئۆن لاین ی وت: ئێمە لە شەستەکانا شەرەفی موسڵمان بوغـان بەدەسـت هێنـا، ئـەو کاتـە وەك ئێستا نارەحەتی نەبوو، باش لە یادمە کاتێ کە من موسـڵمان بـووم لـە بنەماڵەکەمـەوە هـیچ نارەحەتیەکم تووش نەبوو، بگرە دایك و باوکیشم کاتێ دیبیان لەو کاتەوە مـن موسـڵمان بـووم ئیسـلام چ کاریگەرییـەکی گـەورەی لەسـەر چـاکبوونی ڕەوشـت و موعامەلـەی منـدا هـەبووە ئامادەگی موسڵمانبوونیان هەبوو، ڕەفیق پـاش موسـڵمان بوونەکـەی کـە وەك مامۆسـتایەك و واعیزێکی ئاینی کار دەکات وتی: کات گۆڕاوە، وێنەی ئێسـتای ئیسـلام بـەهۆی میدیاکانـەوە گۆڕاوە.

هـەروەها وتـی: هەڵسـوکەوتی هۆڵەندییـەکان بەرامبـەر ئـەوەی موسـڵمان دەبـێ لـە یەکێکـەوە بـۆ یـەکێکی تـر جیـاوازە، ئەوانـەی موسـڵمان دەبـن هەنـدێکیان گۆڕانکارییـەکی گەورەیان تیا دروست دەبێ و سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشن، هەنـدێکی تـر بەشـێوەیەکی ئاسـایی دەگۆڕێن، لەبەر ئەوە هیچ ورووژان و کاردانەوەیەکیان لێ ناکەوێتەوە.

پەیامنێری ئیسلام ئۆن لاین نێت ئاماژە بۆ ئەوە دەکات دیاریکردنی ژمارەی ئەو موسڵمانانەی بە ڕەچەڵەك هۆڵەندین کارێکی ئاسان نیە، چونکە یاسای هۆڵەندی ڕێ بەوە نادات سەرژمێری لەسەر بنەمای ئایینیەوە بکرێت، ئەوەندە هەیە موسوڵمانە چالاکەکان ژمارەی هۆڵەندییەکان بە دوانزە هەزار دەخەمڵێنن و بەشی زۆریان ئافرەتن. ژمارەی خەڵکی هۆڵەندا بە ١٦ ملیۆن دەخەمڵێنرێ، ملیۆن و نیوێك موسڵمانیان تێدایە، کە لەسەدا هەشتای ئەو موسڵمانانە بە ڕەچەڵەك تورك و مەغریبین، لەسەدا بیستەکەی تریش لە نەتەوەو تایەفەکانی ترن .

## موسڵمانانی بەریتانیاو حەملەی ئیسلام ئایینی ئاشتییە:

موسڵمانەکانی بەریتانیا ڕاگەیاندنێکی فراوان بە ناونیشانی (ئیسلام ئاینی ئاشتی یە) لەسەر هۆکارەکانی گواستنەوە لە لەندەنی پایتەخت ڕێك دەخەن بە ئامانجی ڕاست کردنەوەی ئەو بیرو بۆچوون و تێگەیشتنە هەڵانەی بەرامبەر موسڵمانان و ئیسلام هەیە .

ڕۆژنامەی (مسلم ویکلی) ڕایگەیاند ئامانج لەم کارە دەرخستنی وێنەی ڕاستەقینەی موسڵمانانی بەریتانیە بۆ ڕای گشتی بەریتانی، دکتۆر (محمد عبدالباری) سەرۆکی ئەنجومەنی موسڵمانەکانی بەریتانیا سەبارەت بەو کارە وتی: زۆرینەی موسڵمانانی بێدەنگی بەریتانیکەوتوونەتە جموجوڵ و ئەوانە ئێستە یەکدەگرن و ئەمەش پرۆژەیەکی هاندەرە .

دکتۆر (هانی البنا) کە بەڕێوەبەری گشتی ئیغاسەی ئیسلامی بەریتانیە لە بڵاوکراوەیەکی هەفتانەدا ڕایگەیاند: ئەم کارەی لاوانی موسڵمانانی بەریتانی پێی هەستاون دڵخۆشمان دەکات، کە ڕاپەڕیون لە پێناوی ئاین و نیشتمانەکەیاندا، ئەمەش کارێکی نیشتمانیە و شایانی سوپاس و پێزانینە، هەروەها ڕۆژنامەکە باس لەوە دەکات کە قۆناغی یەکەم لەم حەملەیە بڵاوکردنەوەی دروشمی ئاگادارکردنەوە لە ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکاندا دەگرێتە خۆی. دروشمی (موسڵمانان یەکگرتوون) لە بەناوبانگترین بڵاوکراوەی بەریتانیدا ڕادەگەیەنن.

قۆناغی دووەم ئامانج تیایدا گەیاندنی ئەو نامەیەیە بۆ هەموو کۆمەڵگەی بەریتانی، لە ڕێگەی حەملەی ڕاگەیاندن لەسەر هۆکارەکانی گواستنەوە لە لەندەندا بە دروشمی (شانازی دەکەم بەوەی موسڵمانێکی بەریتانیم) کە لەسەر لاکانی پاسەکان ئەم دروشمە ڕادەگەیەنن .

لەبەر ئەوەی مانگی ڕەمەزانی٢٠٠٧ ئەم حەملەیە بەخۆیەوە دەبینێ بۆیە بڕیارە پاسێکی گەورە کە دروشمی (ئیسلام ئایینی ئاشتیە)ی هەڵگرتووە بە شەقامەکانی لەندەندا هەموو ڕۆژێك لەکاتی بەریانگدا بگەڕێت[1].

## موسڵمانبوونی قەشەیەك:

هەروەك خۆی باسی دەكات: نیعمەتی ئیسلام یەکێکە لە گەورەترین نیعمەتەکانی خواو ئەگەر تا مردن لە پاداشتی ئەو نیعمەتەدا سوجدە بۆ خوا بەرین هێشتا هەر کەمە ..

ئەو موسڵمانەی لە سایەی ئیسلامدا دەژی و بەو نیعمەتە گەورەیەوە ڕادەبوێرێ، هەست بە چێژی ئەو نیعمەتە ناكات وەك ئەوەی لێی مەحروم بووە و پێی دەگات .

خوێنەری بەڕێز !! پێویستە کەمێك باسی خۆمت بۆ بکەم پێش ئەوەی باسی نیعمەتی ئیسلام و هیدایەتی خواییت بۆ بکەم، لەوانەیە لێم بپرسی: پێش موسڵمان بوون و پاشتریش خێزانەکەتان چۆن بوو ؟

خێزانەکەمان لە چوار کەس پێکهاتبوو: من و خوشکم و دایکم و باوکم . وەك هەر خێزانێکی تری فەڵەی پابەند بە ئاین، ڕۆژانی یەکشەممە ڕوومان دەکردە کەنیسە و لە ڕۆژانی هەینی و یەکشەممەدا ئامادەی قودداس و مەراسیمەکانی دەبووین، وەك دانپیانان (الاعتراف) و خواردن و پاڕانەوە ...هتد .. دانپیانان ئەوەیە لەبەردەم قەشەدا باسی ئەو گوناهانە بکەیت کە لەماوەی هەفتەی ڕابردوودا کردووتە .. هەر یەکێك پێویستە لەسەری لەبەردەم قەشەدا ئەو دانپیانانەی هەبێت، جا هەر قەشەیەك بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت یا هەڵی بژێرێت و، ئەو قەشەیەش لە دوایدا پێی دەوترێت باوکی ڕۆحی .. دانپیانان بە یەکێك لە حەوت ڕازو نهێنییەکانی کەنیسە دادەنرێت .

خواردن و خواردنەوەش بریتییە لە خواردنەوەی ئەو شەرابە ترێیەی قەشە دوعای بەسەرا دەخوێنێ، ماوەی سەعات و نیوێك دەخایەنێ و بەپێی بیروباوەڕی خۆیان ئەو شەرابە دەبێتە خوێنی مەسیح و ئەوەی لەبەردەم قەشەدا دان بە تاوانەکانیا بنێ کەوچکێ لەو شەرابەی دەدرێتێ بیخواتەوە .

---

١- (ئیسلام پەیك)

باوکم بازرگانی دانەوێلە بوو، دایکیشم لەبەشی برین پێچیدا کاری دەکرد، من هەمیشە پێم خۆش بوو لەتەك باوکما لە دووکان بم، بازارێکی تری گەورەی دانەوێڵەمان هەبوو کە پەیوەندی بە هەموو بنەماڵەکەمانەوە هەبوو، وەك باپیرەو داپیرەو پوورەکانم .. من لای باپیرەم جێیەکی تایبەتم هەبوو، زۆر خۆشی دەویستم، لەگەڵ ئەوەدا کە ئامۆزاکانم هەموو لە دەورما بوون، مامێکی تریشم هەبوو ئەویش زۆر خۆشی دەویستم و دەیوت: من بە کوڕی خۆمت دادەنێم و من تەواو دڵنیام کە باوکت وەك من نرخت نازانێت، ـ سوپاس بۆ خوا ـ من لە بازرگانیدا زۆر وریاو لێهاتوو بووم، دەمزانی لەتەك خەڵکیدا چۆن مامەڵە بکەم، سوپاس بۆ خوا بەڕەوشت بەرزو خۆش ڕەفتار و ڕاستگۆ لەناو خەڵکی و خێزانەکەماندا ناسرابووم، ئەمە سرووشتی من بوو لە پێش ئیسلامەتیدا ..

## سەرەتای ڕووناکی:

لەسەرەتای هاتنی ئەو ڕووناکیەوە کە نووری ئیسلام ماڵمانی ڕووناك کردەوە هەستم بەوە دەکرد دایکی میهرەبانم ڕووی بەرەو ئیسلامە، هیچ پێت سەیر نەبێت دڵەکان لە نێوان دوو پەنجەی خوادان، چۆنی بوێت وای دەگێڕێت .. دەمبینی دایکم لە ئاینی فەڵە دووره پەرێز دەبێت، تا وای لێهات نەدەڕۆیشت بۆ کەنیسە و ئارەزووی ئیسلامی دەکرد، ئەوکاتەش لەگەڵ ڕەمەزاندا هاوکات بوو، لای فەڵەکان ڕۆژو لە کاتێکدا دەشکێنن کە ئەستێرەی ئاسمان ببینرێت، عادەتەن لەپێش ڕۆژئاوا بووندا ئەستێرەکان لێیان دەبینرێت، لەبەر ئەوە لەپێش موسڵماناندا ڕۆژوو دەشکێنن، بەڵام دایکم ڕۆژووەکەی نەدەشکاند تا بانگی مەغریب نەبوایە .. زۆرم پێ سەیر بوو، جارێکیان پێم وت: دایە! ئەوە تۆ چی دەکەیت ؟ تۆ ڕۆژووەکەت وەك ئێمە ناشکێنی و لەگەڵ بانگی موسڵماناندا دەیشکێنی ؟! بەڕاشکاوی پێم بڵێ .. ئەویش پێی دەوتم: عیمادگیان! خۆت بەوەوە مەشغوڵ مەکە .. بەو ڕەوشتانەیدا بۆم دەرکەوت کە حەزی لە ئیسلامە و ڕۆژووی ڕەمەزانی دەگرت نەك ڕۆژووی عەزرا، ڕۆژووی عەرزا پانزە ڕۆژ بوو، بەڵام ئەو تا ڕەمەزان کۆتایی دەهات بەڕۆژوو دەبوو، مانگەکەی دەگرت .. هەندێ هەڵوێستی جوانی تریلێ دەبینرا بۆ نموونە: کاتێ دەرسی شێخی شەعراوی لە دوانیوەڕوانی جومعەدا لەسەر تەلەفزیۆن دەستی پێدەکرد، زۆر بە بێدەنگی لەبەردەم تەلەفزیۆنەکە دادەنیشت و گوێی لێ دەگرت، وەك چۆن منداڵێك لەبەردەم باوکیدا یا قوتابیەك لەبەردەم مامۆستاکەیدا دادەنیشێت، ئاوەها و باشتر دادەنیشت و تەنانەت ئەگەر قسەشمان لە گەڵدا بکردایە وەڵامی

نەدەدایەوە، لەبیرمان نەچێ لای فەلەکان هەرکات دەرسی شەعراوی دەستی پێبکردایە بە کاتێکی نەحس و شووم دادەنرا، بەلاّم ئەمە لای دایکم زۆر جیاوازو پێچەوانە بوو، لەو ماوەیەشدا بەرنامەیەك هەبوو بەناوی (کۆڕێك بۆ ڕاوبۆچوون)، کۆمەڵێك لە زانایان پێشکەشیان دەکرد، بۆ ئەو بەرنامەیەش دادەنیشت و زۆر بایەخی پێ دەدا و گوێی بۆ وەلاّمەکان دەگرت ..

ئەم هەموو گۆڕانکارییانە لە دایکمدا و لەو ماوەیەدا شتێکی دیار بوو، کاتێ دایکم ویستی موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا بکات، ڕۆژێ لەگەڵما دانیشت و پێی وتم: عیماد گیان! تۆ تەنیا کوڕمی و جگە لە تۆ کەسێکی تر پێناناسم ڕازو نهێنیم بپارێزێ، شێوەزاری دایکم گۆڕابوو، وەك ئەوە لە شتێك بترسێ، منیش پێم گوت: دایە گیان! خێرە! تەنانەت بۆ منیش دوو دڵ بوو قسەبکات یان نا، ئینجا لە قسەیەکدا وتی: نەء .. نەء .. تۆ کوڕی گەورەمی و یەکەم شادییەکم بوویت لەم دونیایەدا، مومکین نیە ڕۆژێك لە ڕۆژان بیر لە ئازاردانی دایکت بکەیتەوە .. لەم قسانەی دایکمەوە ترسێکی سەیر سەری بۆ دڵ و دەروونم کێشا، یەعنی چی: مومکین نیە ڕۆژێك لە ڕۆژان بیر لە ئازاردانی دایکت بکەیتەوە!! ئەم قسانە واتای زۆریان هەبوو، زیاد لە چەند نیشانەیەکی پرسیاریان هەڵدەگرت .. لەنێو ئەم بیرکردنەوە خێرایەدا لە دایکمم پرسی: بۆچی وا دوو دڵیت؟ چی ڕووی داوەو چی ڕوو دەدات؟ دایە گیان ! دڵی خۆت و منیش ئاسودە بکە، دایك هەر دایکە، تا لەم کاتەدا دایکم وتی: ئەگەر ویستیان بمکوژن تۆ چی دەکەیت؟! وتم: کوشتن؟ کوشتنی چی؟! کێ دەتکوژێ؟! وتی: باوکت .. براکانم .. خزمان .. وتم: لەبەر چی؟! تۆ باشترین خوشك بوویت بۆیان و هەموویان خۆشیان دەوێیت؟ دایکم بە چاوێکی پڕ فرمێسکەوە سەرنجێکی دام و وتی: ئەگەر من موسڵمان ببم تۆ چی دەکەیت ؟! ئایا تۆش وەك ئەوان لە دژم دەجەنگی ؟! وتم: دایك هەر دایکە و تۆ لەهەموو حاڵەتێکدا هەر دایکمی، دڵم پڕ بوو بە گریانەوە دەستمان کردە ملی یەك و پێی وتم: کوڕم! من ئەم باسەی نێوانمان وەك ڕازێك لای تۆ دادەنێم .. ئەم هەڵوێستەی دایکم ڕای تەکاندم و زۆر هەژاندمی، لە دەروونمدا پرسیاری زۆری سەرسوڕهێنەر هەبوون و بیرۆکەگەلێکیش شپرزەیان کردبووم . دڵم وەختەبوو بتەقێت و چارەسەریانم نەدەزانی ..

## یەکەم ناخۆشی:

پاش ئەم ڕووداوە بە چەند ڕۆژێك کاتێك لە قوتابخانەوە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە دیتم دایکم لە ماڵ نیە، ڕۆیشتم سەری دۆلابەکانم دا دیتم بەرگ و پۆشاکی نەماوە .. هیچ کەس لەماڵ نەبوو ئاتەو کاتەدا هەستم بە ئازاری جیابونەوە کرد، ئازاری دوور بوون و دابڕان لە دایکێکی میهرەبانی خەم و پەژارە دایگرتم، ترسێکی ئاینەدم لێ نیشت، ئاواتە خوازبووم ئەمە خەو برایە نەك حەقیقەت .. گورج ڕۆیشتم بۆ دوکان بۆ لای باوکم و پێم وت: بابە گیان ! من ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵ دایکم لە ماڵ نەبوو .. وتی: لەوانەیە ڕۆیشتبێت بۆ لای یەکێ لە ژنەکانی هاوەڵی .. وتم: بابە! تەنانەت بەرگ و پۆشاکەکانیشی لەناو دۆلابەکاندا نەماون!! باوکم وتی: کوڕم! ئەوە چی دەڵێیت؟! بۆم دووبارە کردەوە، ئالێرەدا سەرسوڕمانی باوکم پتر بوو و بە شپرزەیی هەستاو پێکەوە ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵ، بەڕاستی ئەمە ناخۆشییە!! دایکت لە کوێیە؟ لەکوێ؟! سوێندی دەخوارد کە نەتوڕەی کردووە و نە ئازاری داوە و ناکۆکی لە نێوانیاندا نەبووە.

ئەم ناخۆشییە باڵی بەسەر هەموو بنەماڵەکەماندا کێشا ..

ڕێیان: لەبەردەم دادگا بەشێوەیەکی فەرمی موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاندووە و هەرگیز جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی ..

## شیرینی باوەڕ:

بنەماڵەکەمان لەتاوا شێت بوون و هاوسەنگیان لەدەست دابوو ..هەرچی نەشێت لە جنێو وقسەی سوك و ناشیرین بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان بەدەمیاندا دەهات ..باوکم و مام و خاڵەکانم لە حاڵەتێکی زۆر توڕە بوون و بێزار بووندا بوون، چونکە ئەمەیان بە کارەسات و لێقەومانێکی گەورە دادەنا وبە نەنگ و عارێکی گەورەیان دەزانی کە ڕووی لە بنەماڵەکە کردووە، لەو کاتەدا ئەوەی منی زۆر ئازار دەدا ئەوە بوو جنێو و قسەی سوك بە دایکم دەگوترا و نەشم دەتوانی داکۆکی لێ بکەم و بەرپەرچیان بدەمەوە، ئەو مامەشیانم کە منی زۆر خۆش دەویست دەڕۆیشت بۆ لای کاربەدەستان و پەیان نامەی پەیتا پەیتا بۆ مۆر دەکردن کە دەبێتە زامنی و کەس دەستی بۆ درێژ ناکات و کەس لە گوڵ کاڵتری پێ ناڵێت و سۆزی دایکێتی دەجولاند تا بگەڕێتەوە بۆ ناو منداڵەکانی چونکە زۆر پێویستیان پێی هەیە .. بەڵام

بێ سوود بوو .. دایکم تامی ئیمانی چەشتبوو بەرپەرچی هەموو ئەو هەوڵانەی دایەوەو ڕازی نەبوو جارێکی تر بگەڕێتەوە .. سوپاس بۆ خوا دایکم موسڵمان بوو، ئێمەشی واز لێ هێناو بەو خوایەی سپاردین کە سپاردە زایە ناکات، کە ئەویش باشترین پارێزەرو چاکترین کۆمەکە و لە هەموو سۆزدارێ بەسۆزترە..

## هەڵوێستی کەنیسە:

لەو کاتەدا من بە ڕێك وپێکی سەردانی کەنیسەم دەکرد و ئامادەی هەموو دەرسەکان دەبووم و بەتایبەت دەرسەکانی سێشەممان .. ئەم دەرسەش لای هەمووان دیار بوو، قەشە خۆی وتارێکی گشتی تیا دەدا کە پەیوەندی بە بابەتی جۆراوجۆرەوە هەبوو، بەتایبەت سیاسی، زۆر بە ئازادی قسەی خۆی تیا دەکرد، ڕای تیا دەردەبڕی بێ ئەوەی سانسۆرێك بەسەر قسەکانیەوە هەبێت، لە یەکێ لە دەرسەکانی سێ شەممەدا باسی موسڵمانبوونەکەی دایکمی دەکرد، قەشەکە وتی: فلانی کچی فلان دەناسن؟ (بەناو ناوی برد) ئەوەی خۆی تەسلیمی شەیتان کردو موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند و خیانەتی لە مەسیح و مەسیحیەت کرد و خۆی و منداڵەکانی بە موسڵمانان فرۆشت ..

ئەو ژنەی مەسیحی خوای دڵسۆزی ئەم بوونەوەرەی بەجێهێشت، ئاوەها مەسیح ئابڕووی دەبات، پاش ئەوەی کە خیانەتی لە کەنیسە کرد خراوەتە زیندانی بەشی ڕەوشتەوە ..!! بەڕاستی ئەم قسەیە کاسی کردم وەختەبوو سەرنجی سەیری ئامادەبووان بکوژێ، وەك ئەوە من گەورەترین تاوانی بەدڕەوشتیم کردبێ، وەك ئەوە خوا پەنامان بدات من زینام کردبێ، لەدڵی خومدا وتم: شتی وا مەعقول نییە، دایکم خۆی بخاتە مەترسییەوە و واز لە ئاینەکەی و پەرستنی مەسیح بێنێ و واز لە ئێمە بێنێ (من و خوشکم) تا بەرەو ڕووی ئەم هەموو بەڵاو موسیبەتە ببێتەوە بێ ئەوەی ئێمە هیچ تاوانێکمان کردبێ، ڕقم لەخۆم دەبووەوە و ئاواتەخواز بووم بمرم و گیانم دەرچێت .. لە کەنیسە ڕۆیشتمە دەرەوە و خوا خۆی دەزانێ چۆن لەو جادەیەدا دەڕۆیشتم، چاوم کەسی نەدەبینی، ئالەم کاتەدا کە من بەم هەموو خەم و خەفەتەوە دەڕۆیشتم گوێم لە دەنگێك بوو بانگی دەکردم: عیماد!! دایکمم بینی بە پارێزەوە لە نزیك ماڵی خۆماندا دەڕۆیشت تا من و خوشکەکەم ببینێ، یەکێ لە ژنە دراوسێکانی بۆ ئەوە ناردبوو تا من ببینێ و لەوکاتەدا کە لە کەنیسە دەگەڕێمەوە پێم بڵێت کە دایکم چاوەڕوانیم

دەكات، سەریەشەیەكی سەختم تووش ببوو، كۆمەڵێ هەست و سۆزی دژ بەیەك لەناو دڵ و دەروونمدا مل ملانێیان دەكرد، ئەوە دایكی بەسۆزو میهرەبانە .. ئەمە ئەو ئافرەتەیە كە خیانەتی لە مەسیح و مەسیحیەت كردووەو دینەكەی خۆی فرۆشتووە و دەبێ تۆڵەی لێ بكرێتەوە .. لە نێوان ئەم بیرو بیرۆكانەدا و لەتاو پەژارەی خۆم ئاگام لە قسەی تر نەبوو، ئاوڕم دایەوەو پێم گوت: كەی لە زیندان دەرچوویت؟ كۆمەڵێ ئافرەتی هاوەڵی خۆی لەگەڵ بوو، هەموو بە جارێك وتیان: زیندانی چی؟ دایكت فەزڵی قیامەتی داوە بەسەر دونیادا .

دایكم وتی: كوڕم! عومدە گیان! پێم وتی: ئەمانە هەرچی تۆمەت هەبێ بۆ منی دروست دەكەن، كوڕم ئەم وەرەقەیە بگرە، ئەمە ناونیشانی تەواوی منی تێدایە، بەڵام پەیمانم بدەیتێ كە ئەو ناونیشانە بەكەس نەدەیت .. ئیتر سڵاوم لێ كردو دەستم ماچ كرد و لەناو ئامادەبووەكاندا پیاوێكی ریشداری تیابوو، لەگەڵ خێزانە ڕوو داپۆشراوەكەیدا و پیاوەكە دەستی خستە سەرشانم و وتی: خوا هیدایەتت بدات! بەڵام تا هێزم تیابوو بە توندی دەستم لابرد و دایكم بەجێ هێشت و بۆ ماڵە تاریكەكەی خۆمان گەڕامەوە، هیبەی خوشكم بینی كە ئەویش ئەو سەردەمە منداڵ بوو، توانای ئەوەی نەبوو لەوەی لە دەوروبەرمان ڕوو دەدات حاڵی ببێ، سەرنجێكم داو وتم: ئەوەی دایك و باوك دەیكات تاوانی منداڵ چییە تیایدا؟ ئەم وشەیەشم لە مامۆستایەكی مەسیحییەوە بیستبوو، كە لەسەر مەسەلەكەی ئێمەوە باسی كرد ..

كارێكی گرنگ لەبەردەمما بوو ئەویش سەردانی دایكم بوولە خانووەكەی خۆیدا، كات پێش نوێژی ئێوارە بوو، ڕۆیشتم بۆ سەردانی دایكم، كە ڕۆیشتم زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ كردم و منیش دانیشتم و سەیری ئەم جێگەو مەنزڵەیم دەكرد چەند خاكی موتەوازیعانەیە، ئا لەو كاتەدا بانگی دا ( الله اكبر...الله أكبر ..) خوا لە هەموو گەورەیەك گەورەترە، لە هەموو دەسەڵاتێ بەدەسەڵات ترە .. سوێند بەو خوایەی جگە لەخۆی خوایەكی تری بەحەق نییە، وەك ئەوەی یەكەمجار بێت لە ژیانما بانگ ببیستم ئاوەها بوو، لەگەڵ ئەوەدا كە سەدان جاری تر گوێم لە بانگ بووە، بەڵام ئەم بانگەو بە تایبەت لەو كاتەدا شوێنەوارێكی زۆر گەورەی لە دڵ و دەرونمدا هەبوو كە هەرگیز ئەو هەستەم پێ نەكردبوو..

گورج دایكم لە تەنیشتمەوە هەستا، ڕۆیشت دەستنوێژی گرت و نوێژی ئێوارەی كرد، بەدەنگی بەرز قورئانەكەی دەخوێند، ئەوە یەكەم جاربوو گوێم لێ بێ دایكم قورئان بخوێنێ ..

سورەتی ئیخلاص (قل هو الله أحد)ی دەخوێند، باس ناکرێ ئەو دیمەنە چ شوێنەوارێکی باشی لەهەست و سۆزی مندا هەبوو!! ئاواتە خوازبووم بڕۆمە بەر زەوییەکەو لەو کاتەدا کە دایکم نوێژی دەکرد هەردوو پێی دایکم ماچ بکەم، هەستم دەکرد شتێ دڵ و دەروونم دەشواتەوە، ڕۆشنایی و خۆشەویستییەك هەموو گیانمی داگیر کردبوو، گیانێکی تازە سەریبۆ لاشەم دەکێشا، تیشکی ڕووناکییەکان کۆبوونەوە، پاش هەورو تەم و مژێکی زۆر و شەوەزەنگێکی درێژ هەستم بە هەڵهاتنی خۆرێکی نوێ کرد، گریان دایگرتم، کە ئەم دایکە بێتاوانەم لە لایەن ئەو قەشەیەوە لە دەرسی ڕۆژی سێ شەممەدا چ ستەمێکی گەورەی لێکراوە، ئاواتە خوازبووم ئەو قەشەیەم ببینیایەتەوە، لەسەر ئەو تاوانەی تۆڵەی دادگەرانەی خۆی وەربگرتایە .. کە بەناهەق ئاوەها ئەو تۆمەتەی بۆ دایکم دروست کرد و دەیویست ناشیرینی بکات و لەبەرچاو خەڵکیدا بیشکێنێ .. ئایا ئەوە دادگەرییە؟! ئایا مەسیح فەرمانی بەشتی واکردووە؟؟ ئەمە ئەو قەشەیە کە ڕۆژی یەکشەممان خەڵکی باسی گوناهی خۆیانی بۆ دەکەن ؟! ئایا ئەوە نموونەی چاولێکراوی کۆمەڵگەی مەسیحییە؟! ئەم پرسیارانە هەموویان وەڵامیان دەویست .. ماوەی سەعات و نیوێك لەخزمەت دایکما دانیشتم و پێکەوە نانمان خوارد، ئەو ڕۆژە و ئەو سەردانە وەك خەوێکی خۆش وابوو، خەریك بوو بڕوانەکەم شتی وا ڕووی دابێت و لە ڕاستیدا شوێنەوارێکی دیار و کاریگەری هەبوو..

## موناقەشەی قەشەیەك:

کاتێ لای دایکم ڕۆیشتمە دەرەوە زۆر دڵ ئاسوودە بووم و بەرەو ماڵ گەڕامەوە، لە ڕۆژی دواتردا ڕۆیشتم بۆ کەنیسە بۆ ئامادەبوون لە وتاری ڕۆژی سێشەممەدا، هەمان قەشە وتاری دەدا و دەیویست قسە ناشیرینەکەی لە بارەی ئەو گەوهەرە پارێزراوەوە تەواو بکات، کە لەبارەی دایکی پاکی پاك داوێنمەوە هەفتەی پێشوو دەستی پێکردبوو. قەشەکە وتی: ئەمما فلان ئافرەت دوێنێ لەلای بووم و پێم وت: کچم! منداڵەکانت زۆر پێویستیان بەتۆیە، بەڵام بەداخەوە ئەو ئێستاش هەر لە زیندانایە و زەحمەتێکی زۆرم بینی تا توانیم قسەی لەگەڵ بکەم، چونکە خۆتان دەزانن کە زیندان یاسا و پرۆگرامی چۆنە .. هەرکەس مەسیح بفرۆشێت ئەوە تۆڵەکەی دەبێت لە دونیاداو پاداشتی هەموو خائینێکیش ئاوا دەبێ !! ئا لەو چرکەیەدا دیتم هەموو خەڵکی کەنیسەکە سەرنجێکی سەیری من دەدەن، خۆمم بۆ نەگیرا، لەبەردەم ئەو ئاغوتەدا وەستام و

بەدەنگی بەرز هاوارم کرد و وتم: ئەی باوکمان! بابەس بیّ، ئینجا ڕووم کردە هەمووان و وتم: ئەی بەڕێزان! من دوێنێ لەلای دایکم بووم ئەو لە زیندانا نەبوو وەك ئەم پیاوە باسی کرد، بەڵکو ئەم پیاوە زۆر درۆزنە، بگرە بە پێچەوانەی ئەو قسانەی ئەم درۆزنە کردی ئەو لە دەرەوەیەو نەگیراوە .. هەموو بە جارێکا ڕویان کردە من و دەیانویست ئارامم بکەنەوەو پلەو پایەی قەشەم بخەنە پێش چاو، پاشان قەشەکە ڕووی تێکردم و وتی: عیماد ئەوە چیتە کوڕم! بێدەنگ بە، عەیبە بۆ تۆ، چیت لیّ قەوماوە ؟!

منیش پێم وت: تۆ درۆزنی، کاتێك کە بەرەو ڕوو قسەم لەگەڵ قەشەدا دەکرد هەموو خەڵکەکە بێدەنگ بوون، ئینجا ڕووم کردە جەماوەری ئامادەبووی ناو کەنیسەو پێم وتن: خەڵکینە! من دوێنیّ سەرم لە دایکم دا لەماڵەوە بوو، لە زیندانا نەبوو، کاتیّ گوێی لە بانگی مەغریب بوو هەستاو دەستنوێژی گرت و نوێژی مەغریبی کرد، لەوپەڕی پاکی و خاوێنیدا بوو، وەڵلاهی لە نێوچاویا ڕەونەق و ڕوونییەکی بیّ وێنەم بینیوە، خەڵکینە! دایکم لە زیندانا نییە هەروەك (باوکمان) بوختانی بۆ دەکات، ئەوە ناونیشانەکەیەتی و هەرکەس ئارەزووی لێیە بابڕوات سەردانی بکات و سوێندیشتان بۆ دەخۆم کاتیّ کە گوێم لەو ئایەتە قورئانییانەوە بوو کە دایکم دەیخوێند، ئەو ئایەتانە ناو دەروونی منیان شۆرد و پاکیان کردەوە، قەشەکە وتی: کوڕە ! بێدەنگ بە، دەنا لە کەنیسە دەتکەمە دەرەوە، باوکت نەیتوانیوە پەروەردەت بکات هەی کەم ئەدەب !!..

وتم: ڕێم بدە ئەی باوکە ! تا لێت بپرسم: ئایا لە پێش نوێژا وەك موسڵمانەکان خۆت پاك دەکەیتەوە؟! تا لەویا بە گەورەو بچوکەوە هەموو شێت بوون و ئاگری غەزەبیان لیّ دەباری و ددانە جیڕەیان دەکرد، هەندێك دەیوت: بێدەنگ بە، لە سنووری ئەدەب تێپەڕیت!! هەندێك دەیوت تۆ کەم ئەدەبیت!! هەندێکیش کەوتنە لێدانم.

قەشەکە ڕووی ڕەش داگیرساو دەلەرزی، لە ڕواڵەتیا تاڵی شکان و شپرزەیی لیّ دەبینرا، دوا قسەی کرد و وتی: واز لەمە بێنن ئەمە دایکی مێشکی شۆردۆتەوە، ئیتر بە دڵ ئاسوودەیی لە کەنیسە هاتمە دەرەوە، هەرچەند لەوەش دەترسام کە لەمەولا چی ڕوودەدات، دەستم بە گریان کرد، بەردەوام بووم لە گریانا تا ڕووم کردە ماڵی یەکیّ لە هاوەڵە دڵسۆزەکانم .. لەماڵ نەبوو، دایکی کە منی بەو حاڵەوە بینی دڵی پێم سووتا و بەزەیی پیاما هاتەوە و وتی: (ئەمە هەموو بەهۆی دایکتەوە بوو خوا تۆڵەی لیّ بسێنیّ)، هەر کە ئەو قسەیەم لەو ئافرەتە بیست وەختەبوو

هێرش بکەمە سەری و بیخنکێنم، بەڵام بەسەر خۆما زاڵ بووم، وتم: لەوانەیە ئەم توڕەبوون و ڕووبەڕووبونەوە و بەگژداچونەوەی قەشە وەسوەسەی شەیتان بێت، دەڕۆم سەرێك لە ئینجیل دەدەم، بەڵکو ئۆقرەیی و ڕینوێنییەکی تیا بەدەست بێنم .

ئینجیلم بەدەستەوە گرت، بەڵکولەو تەنگانەیە ڕزگارم بێت، بەڵام زۆر بەخێرایی گەڕامەوە بۆ ڕێی ڕاستی خۆم و بە خۆمم وت: باشە ئەمەی لەبەردەستیمدایە، ئایا فەرموودەی خوایە؟ تا من پەنای بۆ ببەم؟! جارێکی تر گەڕامەوە بۆ لای ئینجیلەکەو گرتم بەدەستمەوە هەستم دەکرد زیاتر ماندوو دەبووم، خەمم زۆرتر دەبوو، نیشانەکانی پرسیار لە دەورم زیاتر دەبوون و، دڵنیا بووم کە ئەمە وەك هەر کتێبێکی ترەو بەسەرهاتی کەسێك، دەگێڕێتەوە لە خەوتن و خواردن و خواردنەوەی و ئەم کارە عەجیب و غەریبانەی کردووە، ئینجا لە خۆمم پرسی کێ هەموو ئەم قسانەی کردووە؟ یا کێ ئەم هەواڵانەی پاش بەرزبوونەوەی مەسیح نووسیوەتەوە؟ بۆچی ڕیوایەتەکان جیاوازو جۆراو جۆرو بەڵکو هەندێ جار دژ بەیەکیشن؟ زۆر شتی خەرافیاتیشی تێدایە، لە خوێندنەوەی ئینجیلەکەدا هەستم بە ماندووبونێکی ئاناسایی دەکرد، سوور بوونم بۆ گەیشتن بە حەقیقەت هانی دەدام تا زیاتر بگەڕێمەوە بۆ لای ئینجیل و خوێندنەوەی. لەپاش چەند ڕۆژێك و لە ڕۆژی جومعەدا ڕۆیشتم بۆ کەنیسە، لە ڕێ و ڕەسمی بەیانیانا، نۆرەی من هات کە ئیعتیراف بکەم و دان بە تاوانەکانما بنێم، لەویا لەبەردەم قەشەدا وەستام و پێم وت: کۆمەڵێ پرسیارم هەیە پێویستیان بە وەڵام هەیە، لەناو خودی ئینجیلا ئەو پرسیارانەم بۆ دروست بووە، تا ئێستا بێ وەڵامن، قەشە پێی وتم: عیماد ئەفەندی بەڵێن بێ لەمنەوە کە پێکەوە دانیشتین وەڵامی هەموو پرسیارەکانت بدەمەوە و چەند وشەیەکیشی بەسەرما خوێند و هەموو دەزانن کە واتای چییە لە مەسیحییەتا، پاش چەند ڕۆژێك قەشە خاچێکی زێڕی پاڵفتەی بۆ ناردبووم لەگەڵ زنجیرێکی گەردنا و سەرنجم دەدا مامەڵەی بە تەواوی لەگەڵ مندا گۆڕاوە .. بە جوانترین شێوە مامەڵەم دەکات، جارێکیان پێی وتم: ئەی کوڕی مەسیح! داوای لێبوردن دەکەم کەمن بەو شێوەیە باسی دایکی تۆم کرد کە تۆی نارەحەت کرد، تۆ کوڕی مەسیحیت و هەموومان تۆمان خۆشدەوێت، هەروەها مەسیحیش تۆی خۆش دەوێت، ئیتر نەمدەزانی ئەم قەشە ناپاکە دەیەوێت فێڵم لێ بکات و تۆڵەم لێ بکاتەوە .. پێی وتم: ئەی عیماد! باوکت و مامتم بۆ بنێرە، چونکە کارێکی پێویستم پێیان هەیە، کارێك کە زۆر زۆر بەختەوەرت دەکات، ئەم زانی ئەم ناپاکە باوکم و مامی بۆ ئەو فێڵ و گزییە دەوێت!!

## فیێل و چاووڕاو:

لە هەمان ڕۆژا منیش بە باوکم وت کە قەشە فلان بۆ کارێکی زۆر پێویست دەیەوێت بتبینێت، وتی: بۆچی؟ وتم: نازانم .. مامیشمی دەوێت .. باوکم وتی: کەوابوو ڕۆژی جومعەی داهاتوو سەری لێ دەدەین، لە ڕۆژی هەینیدا هەرسێکمان ڕۆیشتین بۆ لای لە کەنیسەکەدا، پاش ڕێ و ڕەسمی هەینی، باوکم و مامم چاویان بەقەشە کەوت و منیش ویستم بڕۆم لەگەڵیاندا قەشەکە وتی: تۆ لەدەرەوەی ژوورەکە چاوەڕوان بە، کاتێ باوکم و مامم هاتنە دەرەوە زۆر خەمبار بوون، کاتێ لە باوکمم پرسی مەسەلە چییە؟ وتی: هیچ..

لەماڵەوە وتی: دەیەوێ تۆو خوشکەکەت بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە دێر لەگەڵیابن، زۆرم پێ خۆش بوو چونکە ئەو دێرەی ئەو باسی دەکرد لەناو دەروونی فەڵەکاندا پلەو پایەیەکی بەرزی هەبوو و کەراماتی زۆریان لێ دەگێڕایەوە، وتم بەباوکم: لەو شوێنەدا سێ ڕۆژ دەمێنینەوە؟ وتی: بەڵێ .. وتم: باشە .. وتی: کەوابوو پاش دوو ڕۆژی تر خۆت بۆ ئەو سەفەرە ئامادە بکە، بەڵام بە پێچەوانەی عادەتی خۆیەوە باوکم زۆر خەمبارو پەشێو بوو، پاش دوو ڕۆژ مەوعیدەکەمان هات، باوکم لە ئامادەکردنی جانتاکەدا یارمەتی دام و پێشم سەیر بوو کە هەموو پۆشاك و بەرگەکانی من و خوشکەکەمی دەخستە ناو جانتاکەوە .. لێم پرسی: ئەرێ بابە! بۆ هەموو جلەکانی تێ دەخەیت؟ ئەمە تەنیا سێ ڕۆژە، باوکم پێی وتم: عیماد کوڕم! لەمەولا خۆت هەموو شتێك دەزانی، ڕۆیشتینە مەترانییەی قاهیرەوە، پاشان ڕۆیشتین بۆ بەنی سوێف و لە ڕێگەدا پرسیارم کرد ئێمە بۆ کوێ دەڕۆین؟ خۆ ئێمە هیچ کەسێکمان لە بەنی سوێف نییە؟ وتی: لە خۆشترین حاڵ و باشترین وەزعا دەبن و پاش هەفتەیەکیش خۆم دێمەوە بۆ لاتان، سەیرم کرد کاتێ باوکم هیبەی خۆشکمی لە باوەش گرت دەستی بە گریان کرد و دەیوت: ئەمە هەمووی پەنی دایکت بوو، خوا هەقی لێ بسێنێ .

گەیشتینە مەترانیەی بەنی سوێف، باوکم لەگەڵ مەترانەکەدا قسەی کرد و پاشان ئێمەیان برد بۆ ماڵێك پێیان دەوت: ماڵی شەمماسە، سەرۆکی ئەم ماڵە قەشەیەك بوو سەرپەرشتی دەکرد، باوکم ماڵئاوایی لێ کردم و وتی: چاوت لە خوشکەکەت بێ و ئیتر ڕۆیشت و بەجێی هێشتین، خوشکەکەمیان برد بۆ شوێنی کچان و منیش لەوێ مامەوە، سەرپەرشتیارەکە بردمی بۆ ژوورێك زۆر بێ کەڵك بوو، تەنگ و تار بوو، دەتوت زیندانە،

هەموو قەرەوێڵەکان دوو نهۆمی بوون، جلەکان لە پشتەوە پینەکراو بوون، هەمووشیان یەك جۆرو یەك ڕەنگ بوون، خەڵکێکی زۆری هەرچی و پەرچی تیا بوو، قسەکردنیان جنێو و توانج و قسەی سووك بوو، لە هاوڕێیەتی ئەوانە هیچ دڵخۆش نەبووم، ڕۆژێك لە سەرپەرشتیارەکەم پرسی: ئەرێ من کەی دەگەڕێمەوە بۆ پارێزگاکەی خۆم؟ زۆر بەڕەقی وەڵامی دامەوە.. ئەو ڕۆژە بە نیسبەت منەوە ڕۆژێکی زۆر سەخت بوو، ببوومە جێی گاڵتەو پێکەنینی هەمووان، هەندێ شتم لەپشت قەشەکەوە لەبەرکردبوو، هەندێ ڕێنوێنی قەشە و سەرپەرشتیارەکانم ئامادەکردبوو، لەبەر ئەوە هەموو دەیان وت: ئەم کوڕە لە قسەکردن و موناقەشەدا داهاتوویەکی گەورەی دەبێت .. بەشێوەیەکی ڕەسمی لەبەنی سوێف دا بووم بە شەمماس و لە شێوەی خاچدا قژیان بۆ بڕیم، ڕۆژگار ڕۆیشت و لەگەڵ لاوەکانی ئەو خاووەدا خۆم گونجاند و بوومە کەسێکی خۆشەویست لایان، لەبەر ئەوەی قسەی جوان و خۆشم بۆ دەکردن و ڕێزیشم لێ دەگرتن، لەم لایشەوە هەرچی نامەم بۆ باوکم دەنووسی کە من زۆر بێتاقەتم و لە غەریبیدام بێ سوود بوو.

## بەرەو بەنی مەزار:

لە بەڕێوەبەرایەتی مەترانیەی بەنی سوێفەوە بڕیارێك دەرچوو بە گواستنەوەی من و خوشکەکەم بۆ بەنی مەزاری مینیا و نەشم زانی بۆچی!

قەشەیەك بەتایبەت لە مینیاوە هاتبوو و وتی: عیماد و خوشکەکەی لە کوێن؟ پاش شەش مانگ ئەوە یەکەمجار بوو چاوم بە خوشکەکەم بکەوێت .. دەستمان کردە ملی یەك و لەخۆشی ئەو دیدارە پێکەوە دەستمان کردە گریان، لە بارەی ژیانیەوە لێم پرسی، وتی: ئەو ماوەیە ناخۆشترین بڕگەیەك بووە لە ژیانیا، سەرپەرشتیارەکە بە کوتەك مامەڵەی لەگەڵداکردوون، ئەو قەشەیەی هاتبوو بە شوێنماندا پێی وتین: ئێمە لە بەنی مەزار لە لایەن مەترانی بەنی سوێفەوە ئاگادارکراوینەوە کە تۆو خوشکەکەت لە بەنی سوێف ئاسوودە نین، لەبەر ئەوە گوێزرانەوە بۆ بەیتول نیعمە، لەوێدا قەشەکە لەبارەی دایکمەوە هەواڵی پرسی، منیش باسێکی وام بۆ نەکرد سوودی لێ وەربگرێت، لەکۆتایی قسەکانمەوە وتم: پێم وایە شێوەی دایکمم لەبیر چووەتەوە و قەشەکە پێکەنی و وتی: باشتر، جاتۆ چیت لێ دەوێت، تۆ لە داهاتوودا دەبیتە قەشەیەکی ناودار و بەئیزنی مەسیح پێ دەنێیتە ژیانێکی خۆشترەوە ..

لێم پرسی: داخۆ کەی دەگەڕێینەوە بۆ لای باوکم؟! ئەویش وتی: پێم وابێ ئەوە بۆتۆ شورەییە بە چاوێکی ئاوەهاوە سەیری دنیا بکەیت!! تۆ لە ڕیزی ئەوانە دانراوی کە ئامادە دەکرێن بۆ ئەوەی ببنە قەشە، پێم وت: ئەی هیبەی خوشکم؟ وتی: هیبەی خوشکیشت پاش چەند ساڵێکی تر شوو بە قەشەیەکی وەك من دەکات .. ئیتر لەویا هەستم کرد کە لەلایەن کەنیسەوە حوکمی زیندانی هەمیشەیی بۆ خۆم و خوشکم براوەتەوە .. گەیشتینە مەنزڵە نوێیەکەمان، (بەیتول نیعمە) و لەناو خەڵکیدا پێیان دەوت: قوتابخانەی تێکەڵاوی سەرەتایی قیبتییەکان .

لە ناو ئەم قوتابخانەیەشدا باڵەخانەیەکی سێ نهۆمی هەبوو. ئەوە بەیتول نیعمە بوو، ژنێك سڵاوی لێ کردین و ئێمەی برد بۆ لای قەشەی سەر پەرشتیاری ماڵەکە .. ئەویش سڵاوی لێ کردین و بە ژنە سەرپەرشتیارەکەی وت: خواردن بۆ منداڵەکان ئامادە بکەو باشترین پۆشاکییان بۆ بێنە و، هیبەش بۆ ژوورەکەی خۆی ببە لە لای هاوەڵەکانی .. بەڵام جێی عیماد لە قاتی خوارەوەیە، لای ئەمیرو سامیح و ڕەئوف دا: لە ڕاستیدا جێگەکە زۆر خۆشتر و باشتربوو لەوەی بەنی سوێف: چونکە هەرکەس دۆڵاب و قەرەوێڵەی خۆی هەبوو، سەرپەرشتیارەکە هەندێ پۆشاکی نوێی بۆ هێنایین، لە ڕاستیدا کاتێ ئەو هاوەڵانەم ناسی لەوپەڕی ئەدەب ڕەوشت بەرزیدا بوون، ئەمیرو سامیح برا بوون ڕەئوف لە نێوانیاندا غەریبە بوو ئەوانەم زۆر خۆش دەویست، هەمویشیان زۆر لە پیرێژنە سەرپەرشتیارەکە دەترسان، ئەو پیرێژنەی خوا لە هەموو ڕەوشت و جوانییەك بێبەشی کردبوو، تا بڵێیت دڵڕەق و ناشیرین بوو، لە ڕاستیدا ترسناك بوو، لەسەر دەستی ئەو پیرێژنەدا هەموو جۆرە تاڵییەکم چەشت و هەموو جۆرە سەبرێکم تاقیکردەوە، تەنانەت ئەو ماڵەی کە ناونرابوو ماڵی نیعمەت، من ناوم نابوو: ماڵی نەگبەتی و زەحمەت .

## قژیان بۆ بڕی؟

هیبەی خوشکیشم قژی سەریان بۆ هەڵپاچی و بۆیان چاك کرد، پێشیان وت: هەربویتە پانزە ساڵ بە شووت دەدەین؟! ڕۆژێکیان قەشە گەورەکە هات و سەری لێ داین و هەواڵی پرسین، مامەڵەی لەگەڵ لاوان و کیژەکاندا لەوپەڕی ئەدەب و ڕەوشتدا بوو. ڕۆژێك قەشەکە لێی پرسیم: حاڵت چۆنە؟ ئێرە باشترە یان بەنی سوێف؟ پێم وت: بەنی سوێف زۆر لێرە دڵۆڤانتر

بوو.. بەسەرسامیەوە وتی: بۆچی؟ وتم: هۆکـار ئـەو ئافرەتەیـە .. چـۆن مامـەڵـە لەگـەڵ ئـاژەڵا دەکات .. ئاواش مامەڵە لەگەڵ ئێمەدا دەکات .. بە کوتەك لەگەڵمانا ڕەفتـار دەکـات، قەشـە سەرنجێکی دا کە پڕبوو لە سەرزەنشتی و پێی وت: ئەم قسەیە دروستە؟! وتـی: خـۆت دەزانـی منداڵ درۆ دەکەن .. وتی: نا ..!! ئەو ژنە سەرپەرشتیارە ماوەی هەفتەیـەك بـەجوانترین شـێوە لەتەك لاواندا توانی ڕەفتار بکات، بەڵام هەر لەگەڵ قەشە ڕۆیشـت بـۆ مینیـا، بایدایـەوە سـەر ڕەوشتە کۆنەکەی و بگرە لەگەڵ مندا بە تایبەت زۆر لە جاران خراپتر بوو ..

## هەوڵی هەڵهاتن:

ڕێـیـەکم پـێ نـەدەزانی تـا هـەڵبێم و ماڵەکـەش زۆر بەتونـدی پاسـەوانێتی دەکـرا هـیچ بوارێکی ترم لەبەردەما نەبوو جگە لە نامە نووسین بـۆ بـاوکم، وەزعەکـەی خۆمـانم بـۆ شـرۆڤە دەکرد و هەوڵم دەدا سۆزیشی ببزوێنم، بەڵکو بێت و لەم تەنگانە گەورەیە خۆم و خوشکم ڕزگار بکات، لەو ماوەیەشدا توشی نەخۆشی و لاوازی ببوم، چەند مانگێك تێپـەڕی بـەڵام وەك چـەند ساڵێك بوو. پاش پێنج مانگی تر مانەوەم لەبـەنی مـەزار ڕۆژێ ژنـە سەرپەرشـتیارەکە زۆر بـە سەختی لەگەڵما دووا، ئەوی ڕاستی بـێ منـیش خـۆمم بـۆ نـەگیرا و وتم: دەك خـوا تۆڵـەت لێ بکاتەوە، هەر لەگەڵ گوێی لەو نزایەی منەوە بوو ئاگری تێ بەربوو، گورج کوتەکەکەی هێنـا و بەربووە گیانم، ئەو ڕۆژە شەرابی مەرگی پێ نۆشیم ..

## خوا دەرووی لێ کردمەوە:

ئەو بەیانییەی کە ئەو پیرێژنە سەرسەختە لە من و ئەمیری هاوەڵمی دا بـۆ ئێوارەکـەی پاسەوانی ماڵەکە بەڕاکردن هات و بانگی کرد: عیماد کورە عیماد!! وتم: بەڵێ .. مام فەهمی! چـی ڕووی داوە؟ وتـی: باوکـت هـاتووە، ئـەوەتا لـە دەرەوە وەسـتاوە و دەیـەوێت تـۆو هیبـەی خوشـکت ببینێـت . تـا توانـام بـوو بـەدەنگی بـەرز وتم: ئـەلا.. ئـەلا ..ئـەو مـژدە خۆشـە!! بەڕاستیتە؟!.. کابراش زۆری پێ خۆش بوو وتی: کوڕم ! وەڵاهی باوکت هاتووە .. منیش گورج بەڕاکردن ڕۆیشتم و دیتم باوکم لەبەردەرگا وەستاوە .. خۆم خستە باوەشی باوکمەوەو گریانێکی بە کوڵ گریام، باوکیشم کە لێم ورد بووەوە خۆی پێ نەگیراو دەستی بە گریان کـرد و وتـی: ئـەی خوشکت کوا؟

وتم: نازانم!! وتی: ئەوە چیتە بۆ وا لاواز بوویت؟ نەخۆش بویت؟ منیش سەرنجێکم دا کە پڕبوو لە گلەیی و گازندە و هیچم نەوت تا ئەوکاتەش شوێنی کوتەکەکان بە لەشمەوە مابوون، پیشانم دا .. کە ئەوەی بینی بەسەرسامییەوە وتی: مومکین نییە ئینسان کاری وا بکات و ڕووی کردە سەرپەرشتیارەکەو وتی: ئەبو فلان لە کوێیە؟ پێویستە ئەو پیاوە ببینم .. وتی: کاری هەیە، دەتوانی کوڕەکەت ببینی و بڕۆیتەوە هەزار جار خوات لەگەڵ بێت، باوکم وتی: من نامەوێ گوێم لە دەنگی تۆ بێ چونکە تۆ ئافرەتێکی بێ دڵیت ..

ژنەکە قسەی بە باوکم بڕی و وتی: بۆچ بەوجۆرە دەدوێیت ؟ باوکم قسەی پێ بڕی و وتی: گورج فلان قەشەم بۆ بانگ بکە و نامەوێ لەوە زیاتر گوێم لە دەنگت بێت، ئەوە من لێرە دانیشتوم و تا فلانە کەسی باوکمان نەبینم ناڕۆم، ژنەکە گورج هەستاو بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ قەشەکەدا کرد و پێی وت: با ئەمشەو لە ژوورەکەی عیمادا بێت منیش سبەینێ زوو لە لاتان دەبم ..

سبەینێ قەشە هاتەوەو خواردنی بۆ خۆی و من و باوکم هێنابوو، پاش خواردنی نانی بەیانی باوکم پێی وت: من دەمەوێ منداڵەکانم لەگەڵ خۆما ببەمەوە، قەشەکە وتی: بەداخەوە ناتوانم لەوبارەوە قسەی زیاتر ببیستم، واتە ڕێ بە وەها کارێك نادەین، باوکیشم سوێندی خوارد و وتی: ئەگەر ئێستا عیماد و هیبە و جل و بەرگیان ئامادە نەکەیت هەموو شتێك لەم ماڵەدا بەسەر منالەکانا دەشکێنم!! ئینجا هەڕەشەی لە قەشەکەیش کرد و وتی: هەر ئێستا دەڕۆم بۆ لای پارێزگای مینیا بۆ ئەوەی لای موسڵمانەکان ئابڕوتان ببەم، کە چی بەمناڵی خەڵکی دەکەن!! نەك هەر ئەوە ئەگەر جەنابی قەشە! تۆش گیان بەسەلامەت ببەیت ئەوە سوپاسی خوا بکە دەرووی لێ کردوویتەوە ..

## دەرچوون لە زیندانی بەنی مەزار:

کاتێ قسەکان تەواو بوو، خێرا قەشەکە بە ژنەکەی وت: بڕۆ جل و بەرگی عیماد و هیبە ئامادە بکە، ئەویش بۆی هێناین و باوکم کە ژنە سەرپەرشتیارەکەی دی بەتەوسەوە بە قەشەکەی وت: ئەی فریشتەی ڕەحمەت ! تەنیا پرسیارێکت لێ دەکەم: ئایا بەم جۆرە قێزەونەی ئەم ژنە کردوویەتی مەسیح فەرمانی بە لێدانی مناڵ کردووە؟! قەشەکە سەرسامی خۆی دەربڕی و ڕووی کردە ژنەکەو وتی: پێم نەوتی: بەم جۆرە لە مناڵان مەدە؟!

ئیتر من و باوکم و هیبەی خوشکم لەو زیندانە هاتینە دەرەوە خواحافیزی کردنی ئەمیرو سامیح و ڕنووفی هاوەڵم کەلەو زیندانەدا بەجێم هێشتن هێنامیە گریان، هەرگیز لە بیرم ناچێ کە پێیان وتم: ئەوا تۆ دەڕۆیت و لەم سزایەدا و لەگەڵ ئەو دڵ بەردینەدا ئێمە جێ دێڵیت ..

## هەواڵێکی سەخت:

لە ڕێگە کەبەرەو شارەکەی خۆمان دەگەڕاینەوە، هەواڵی دایکمم لە باوکم پرسی: ئەویش وتی: عیماد ئەو مەسەلەیە لە بیر خۆت بەرەوە، چاوەکەم ! شەش مانگ لەمەوبەر دایکت مرد و فلان خاڵت بە ترۆمبێل لێی دا .. بۆ من هەواڵەکە زۆر سەخت و دڵتەزێن بوو، بەباوکمم وت: کەوابوو بۆچ بڕۆینەوە بۆ شارەکەی خۆمان؟! لە کوێوە هاتوین دەگەڕێینەوە بۆ ئەوێ، هەر دووپاتم دەکردەوە: دایکت مرد .. دایکت مرد و دەگریام .. باوکم پێی وتم: عیماد کوڕم! زۆر شورەییە تۆ بگریت .. تۆ دەگەڕێیتەوە بۆ ناو کەس و کارت، شوورەییە تۆ بگریت .. ژیان لەبەردەمتا دوور و درێژە ..

## هیوام بۆ هاتەوە:

پاش چل شەو لەو ڕووداوە ڕۆژێك بەتەنیا لە دوکان دانیشتبووم خوای باڵا دەست خۆشییەکی گەورەی خستە دڵمەوە، گوێم لە دەنگێك بوو لە دەنگی دایکم دەچوو بانگی کردم: عیماد !!

ئەڵڵا لەو خۆشییە!! منیش لە خۆشیدا خۆم خستە ئامێزی دایکمەوەو نزیکەی نیوسەعات هەر ئەمەم دووبارە دەکردەوە: دایکم ماوەو نەمردووە .. الله اکبر .. دڵنیا بووم کە باوکم ئەو حەقیقەتەی لەمن ون کردبوو، بۆ ئەوەی بیر لە دایکم نەکەمەوە .. داوام لێکرد ناونیشانەکەی خۆیم بداتێ .. ناونیشانەکەم وەرگرت و سەرلەنوێ دڵ و دەروونم هیوای تێ کەوتەوە .. پاش چەند ڕۆژێك سەردانم کرد و هیبەی خوشکیشم برد بۆ لای تا چەند ڕۆژێك لای بێت .. ئیتر لەوێدا حاڵی بووم کە ناردنمان بۆ بەنی سوێف پیلانێکی دۆزەخیانەبوو لەلایەن قەشەکەی گەڕەکی خۆمانەوە ..

## نامەی قەشەکە:

هەر ئەو قەشەیە نامەیەکی بۆ ناردبووم و داوای ئەوەی لێکردبووم کە وەك شەمماس لەناو کەنیسەدا دەوری خۆم ببینم، دیتم ئەوە داخوازی هەموانەو هەر کەسم لە بنەماڵەکەمان

دەبینی دەیوت: بۆ لە کەنیسە دەست بەکار نابیت؟ نۆ مانگ ڕێ و ڕەسمی کەنیسەم بەڕێوەبرد بەڵام زەوقم لێی نەبوو، قەشەیش داوای ئەوەی دەکرد لە قوتابخانەکانی یەکشەممەدا دەرس بە منداڵان بڵێمەوە، بەڵام نەمکرد .

## بەیەکگەیشتنێکی سەیر:

وتوێژ و قسەکردن و مناقەشەی زۆر لە نێوان من و لاوانی فەلەدا ڕووی دا لە بارەی سێ خوا بوون و لە بارەی هەڵواسینی مەسیح و خوایەتی مەسیح و شتانی تریشەوە بەڵام باسکردنی ئەمانە زۆریان دەوێت، تەنیا شتێکی کورت و سەیرتان بۆ باس دەکەم کە پاش موسڵمان بوونم ڕووی دا، ڕۆژێك لەگەڵ کۆمەڵێ لاوی موسڵمان بووم، ئەو قەشەیەم بینی کە بوختانەکی بۆ دایکم کرد و پیلانی ناردنەکەمی بۆ(بەنی سویف) ساز کردبوو، لەسەر شەقامەکە دەڕۆیشت و چەند لاوێکی فەلەشی لەتەکا بوو کە هەندێکیانم دەناسی، ڕۆیشتم لێی نزیك بوومەوەو سڵاوم لێ کرد و ئەویش بە شێوەزارێکی پڕ لە هەڵچونەوە وتی: ها کوڕی سەرلێشێواوی مەسیح چۆنی؟ منیش وتم: واز لەم خەرافیاتانە بێنە .. بیر لە دەوروبەری خۆت بکەرەوە، دەزانی تۆ لە سەرگەردانیدا دەژیت؟ قەشەکەش پێی وتم: (عیماد! خوێنی خۆت داوە بە موسڵمانان لەبەر ئەوەی بزانی چۆن بخۆیت!) منیش پێم وت: ئایا دەزانی پاپا ژنی هێناوە؟! خێرا گوتی: پاپا ژن ناهێنێ.. گوتم: سوبحانەڵلا پاپا ژن ناهێنێ، بەڵام خوا ژن دێنێ و کوڕیشی دەبێ!! ئێوە زۆر سەیرن ئەوە لە ئینسانێکی وەك پاپا حەرام دەکەن بەڵام بۆ خوای حەڵاڵ دەکەن !! هەموو - بەفەلە و موسڵمانەوە- دایانە پێکەنین و قەشەیش لە داخا ڕووی ڕەش داگیرسا!!..

جارێکیان مامۆستایەکم بینی کە لە کەنیسەدا دەرسی بە منالان دەوتەوەو کاری ئەوە بوو ڕق و قین لەدڵی منالاندا بچێنێ دژی ئیسلام و موسڵمانان، منیش پرسیارم لێکردو وتم: مامۆستا بۆچ ئادەم گوناهی کرد و خوا عیسای نارد تا ببێتە قوربانی ئەو تاوانەی ئەو؟ ئەی ئەوانەی پێش هاتنی مەسیح تاوانیان چییە؟ بەو تاوانەی ئادامەوە بتلێنەوە، بۆ دەبێ خوا لەتاوانی ئادەم خۆش نەبێ و دەبێ کوڕی خۆی بکاتە قوربانی تاوانێك کە ئەو نەیکردوە؟ ئایا عیسا کە هەڵواسراو کوژرا ئەگەر خوایە چۆن توانییان خوا بکوژن و هەڵی بواسن؟ ئایا خۆی خۆی زیندوو کردەوە یان خوایەکی تر زیندووی کردەوە؟ ئەگەر مەسیح بە ڕەزامەندی خۆی ئەو کارەی کرد بۆ لەکاتی هەڵواسیندا هاواری کرد و وتی: {ایلی ایلی لـِـمَ سبقتني؟} واتە: ئەی

خوایه! ئەی خوایە! بۆچ بەجێم دێڵیت؟ کە گوێی لەم پرسیارانەوە بوو هەڵهات و ئاوڕی نەدایەوە..

## موسڵمانبوونی خوشکم:

پاش چەند ڕۆژێك لەم قسانە، ڕۆژێ لەماڵەوە دانیشتبووم کە هیبەی خوشکم لە کەنیسە هاتەوە، دیتم وێنەیەکی بەدەستەوەیە کە لە کەنیسە وەریگرتبوو، ئالەو کاتەدا تەمەنی لە دوانزە ساڵان تێنەدەپەڕی، منیش لێم پرسی: هیبە گیان! ئەو وێنەیە چییە؟ وتی ئەوە وێنەی حەزرەتی مەسیحە لە گەوڕی مانگادا، کاتێ ساواو شیرە خۆرە بووە، منیش پێم گوت: ئەی ئەوانە چین بەدەوری حەزرەتی مەسیحەوە؟ وتی: ئەوانەش ئاژەڵن .. وتم: ئەگەر بۆ ئەوەیە کە مەسیح خاکی بووە کام لەمانە بۆ مەسیح شیاوترە .. لە نێوان و ئاژەڵ و لە گەوڕی مانگادا بوایە، یا لە ماڵێکی ڕوتەڵەی بێ زرق و برقا؟ زۆر شادمان بووم کە لەکۆتایی قسەکانمەوە گوێم لە هیبە بوو وتی: منیش قەناعەتم بەم قسانە نییە لە مەسیحییەتا و ئارەزووم لێیە لەگەڵ تۆدا منیش موسڵمان ببم، زۆری پێ نەچوو کە شایەتمانی هێنا و وتی: أشهد أن لا الـه الا الله و أن محمدا رسول الله . ئای چەند شادمان بووم!! ئەم هەڵوێستەی بە تەواوی دڵخۆشی کردم ..

## لە کۆتاییدا:

پاش ئەم گەشتە دوور و درێژ و سەختە ڕۆیشتین تا لەبەردەم دادگا و بەشێوەیەکی فەرمی موسڵمانبوونی خۆمان ئاشکرا بکەین .. لەلایەن بەرپرسانی دەوڵەتەوە کۆسپ و تەگەرەی زۆر خراپە بەردەمان و کاریان لێ ئاڵۆز دەکردین، لەلایەن فەڵەکانیشەوە فشارێکی زۆر کەوتە سەرمان، هەرچی کەنیسەی وڵاتمان هەبوو هەمووی هاتە سەرپێ، بەشێکی زۆریان نەیاندەتوانی بڕوا بکەن چۆن ئەو عیمادە شەماسەی قەشە نوقلانەی بۆ لێدابوو کە دەبێتە قەشەیەکی گەورە و بەناوبانگ، ئێستا وازی لە فەڵەیەتی هێناوە و بووە بە موسڵمان؟! بێ ئاگابوون لەوە کە هیدایەت بەدەست خوایە و کاتێ ویستی هیدایەتی یەکێ بدات ویستەکەی دێتە دی و بەختەوەری دەکات، ئەوەش کە ئەو سەرگەردانی بکات لەناو شیرك و بێباوەڕیدا دەتلێتەوەو کوێرەوەری و بەدبەختی ئامێزی بۆ دەگرێتەوە:

﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾
الأنعام: ١٢٥

لەناو پێشوازی ژمارەیەکی زۆر لە خوشك و برایانی موسڵمانماندا موسڵمانبوونی خۆمان ڕاگەیاند و پێشوازییەکی گەرمان لێکرا، باوکیشم لەگەڵ خێزانە تازەکەیا مایەوە و نابەناو سەردانم دەکرد و هەموو جارێك لۆمە و سەزەنشتی دەکردم، بەڵام من هەر وازم لە سەردانی نەهێنا، تا ئێستا وای لێهاتووە بومەتە خۆشەویسترین کەس لە دڵیا، ئێستا سەردانی کەنیسە ناکات، لە ڕۆژووەکانیانا بەڕۆژوو نابێت، لەگەڵ بەشی زۆری فەڵەکاندا سەردان و هاتووچۆی نەماوە، خۆشەویستی دنیای زۆر کەم بۆتەوە، تا ئێستاش من هەر هەوڵی لەگەڵدا ئەدەم تا قەناعەتی پێ بکەم بە ئیسلام و إنشاءالله بەم نزیکانە دڵی بەنووری ئیسلام ڕووناك و ئاوەدان دەبێتەوە و داوام لە خوشك و برایانی خوێنەریش ئەوەیە دوعام بۆ بکەن کە خوا هیدایەتی باوکم بدات و چاوی دڵی بکاتەوە .[١]

## موسڵمانبوونی ئەسیوبیەکان:

شێخ عمر ادریس موفتی موسڵمانەکانی ئەسیوبیا ڕایگەیاند زیاتر لە (١٢٠٠٠) ئەسیوبی هاتنە ئامێزی ئیسلامەوە تەنها لەساڵی ڕابردوودا، ئەم ژمارەیە بەردەوام لە زۆربوندایە. ئەوانەی دێنە ناو ئەم دینەوە بە شێوەیەکی زۆر باش پەیوەستن پێیەوە، هەروەها شێخ دەڵێت بەپێی وەکالەتی هەواڵی ئیسلامی موسڵمانەکانی ئەسیوبیا زیاتر لە ٥٥٪ ژمارەی دانیشتوان پێك دێنن کەلە بنەڕەتدا ژمارەی دانیشتوان دەگاتە (٦٨) ملیۆن کەس. لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆڵی سیاسی کە بگونجێ لەگەڵ خۆیان نابینن، هەرچەندە زۆرینە پێك دەهێنن تا ئێستاش بەربەرەکانێ دەکرێن، دەربارەی ڕۆڵی ڕێکخراو و دەزگا خێرییەکان شێخ وتی: ئەو ڕێکخراوانە هەڵدەستن بە پێشکەشکردنی یارمەتی و پێداویستی هەژاران لە ڕێی دابین کردنی خواردەمەنی و هەڵکەندنی بیر و کردنەوەی خوێندنگە و خولی ڕاهێنان بۆیانگخوازان بە یارمەتی ڕێکخراوە ئیسلامیە خێرخوازی یەکان .

---

١- سەرچاوە: (ئیسلام پەیك) لە وتارێکی خۆیەوە وەرگیراوە بەناوی: (قصة إسلام عماد المهدي الشماس السابق).

## نووسەری ئەمریکی مایکڵ ولفی سیکتر:

نووسەری ئەمریکی مایکڵ ولفی سیکترکە لە دایکێکی مەسیحی و باوکێکی جوولەکەیە موسڵمان بوو ....

شاراوەیی و ناڕوونی لە دینی مەسیحی و هەروەها ئەو ئاڵۆزی و شاراوەییەی جوولەکە وایان لە مایکڵ کرد کە دوور بکەوێتەوە لێیان و دینی ڕوون و پڕ نووری ئیسلام هەڵبژێرێ، بۆیە ئاینی ئیسلامی هەڵبژارد کە یەك دەستورو سەرچاوەی هەیە ئەویش قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، قورئانی پیرۆز دژایەتی ناكات لەگەڵ زانست و ئەو كار و ڕووداوو بابەتانەی پەیوەندی بە دروستکراو و فەلەك و گەردوونەوە هەیە .

دوای موسڵمان بوون بیری لەوە کردەوە کە دەبێت ڕوکنی پێنجەمیش بەجێ بهێنێ کە یەکێکە لە ئەرکەکانی ئیسلام ئەویش حەج کردنە بۆ ئەوانەی ئەتوانن پێی هەستن.

مایکڵ یەکەم جار لە کالیفۆرنیاوە بۆ سعودیە نەچوو، بەڵکو بۆ مەغریب چوو، باس لەوە دەکات کە چۆن هەستێکی هەبووە کاتێك گەشتووەتە مەغریب و لەناو کۆمەڵێك مەغریبی کە بۆ حەج خۆیان ئامادەکردووە دەڵێت: لە مەراکش دەستم بەو مامەڵانەی کە پێویستن بۆ حەج ئامادەکرد بە پێی یاسا و زانیاری دینە تازەکەم ....

لە مەراکش ماوەیەکم بەسەر برد هەتاوەکو لە ڕێیەوە فێری ئاداب و مەناسکەکانی حەج ببم، مامەڵەی موسڵمانان بۆم زۆر باش و دڵسۆزانە بوو، هەروەها زۆر بەخشندە بوون لەگەڵم .

بۆ یەکەم جار کە چوومە مەککەی پیرۆز لەگەڵ هەزاران موسڵمان کە بۆ حەج کردن هاتبوون بەیەکەوە لەیەك کاتدا تەوافمان دەکرد، سەرەڕای زۆری ئەو ژمارەیەی موسڵمانان بێدەنگییەك ئەو شوێنەی داگرتبوو هەستت بە قەرەباڵغی و پاڵ نان نەدەکرد. مایکڵ کتێبێکی بەناوی (الحج الى المكة) لە بارەی گەشتە ئیمانییەکەیەوە بە زمانی ئینگلیزی نووسیوەو تیایدا وەسفی گەشتەکەی کردووە بە وردی و هەموو لایەنەکانی حەجی خستۆتە ڕوو.[1]

---

١- (ئیسلام پەیك ـ سایە فارس) .

## چیرۆکی قورئان نموونەیەکە بۆ ژیان:

باسکردنی چیرۆکە قورئانییەکان نەك تەنها پێویستی بە زانیاری زمانەوانیی و مێژوویی هەیە، بەڵکو لەوە زیاتر پێویستی بە کەسێکە چەندین جار قورئانی خوێندبێتەوە، لەگەڵیدا ژیابێت و لەگەڵ باسەکانیدا ئینفعالی کردبێت ..

**چیرۆکی قورئان دوو وەزیفەی هەیە:**

مەبەستەکانی قورئان بە نموونەی بەرجەستە ڕوونتر بکاتەوە، لەگەڵ بەکارهێنانی کاریگەریی‌گێڕانەوە لەسەر عەقڵ و دەروونی مرۆڤ، لەو چیرۆکانەدا کەسانێکی وەکو خۆت دەبینی، کەسانێك ڕۆژێك وەکو تۆ لەسەر ئەم زەوییەدا ژیاون، کەسانێك دەهاتن و دەچوون، پێدەکەنین و دەگریان، حەزیان هەبوو، چیرۆکیش تەواو دەبێت و لە کۆتاییدا چەند وێنەیەك لە مێشکتدا دەمێنێتەوە .

جیاوازی چییە لە نێوان چیرۆکەکانی قورئان و ئەو چیرۆکانەی زۆر لە واعیزەکان دەیانگێڕنەوە؟

چیرۆکی قورئان نموونەیەکە بۆ ژیان، بەڵام زۆر لە چیرۆکەکانی واعیزەکان دەتبەنە دەرەوەی ژیان، نموونەیەکت پێ دەڵێت ناتوانیت دووبارەی بکەیتەوە، چیرۆکی قورئان دەیەوێت سوود لە ئەزمونی ئەوانی پێش خۆت وەربگری، بەڵام حیکایەتخوان تەنها سەرسوڕمانی لە تۆ دەوێت.

واعیزە نەزانەکان بە زۆری دوو جۆر چیرۆکیان لایە: چیرۆکی شت و ڕووداوە سەیرەکان و چیرۆکی نموونەی مرۆڤە سەیرەکان. هیچیش لەمانە توانای بەرجەستەبوونی لە جیهانی ڕۆژانەی بیسەراندا نییە، بۆ نموونە کەسێك چیرۆکێکمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەمەیە بە کورتی و پاش لابردنی ترش و خوێکەی: (پیاوێکی خواناس هەبوو تەماشای ئافرەتێکی کرد، کاتێکیش هەستی بەو تاوانە گەورەیە کرد بە پەنجەی خۆی چاوێکی خۆی دەرهێنا). بیسەر نارەزایی دەرنابڕێت بەڵکو سەرسوڕمان، بەڵام بیسەری سەرسام ناتوانێت چاوێکی خۆی دەربهێنێت، کەواتە بیسەر پێویستە لە ئاست ئەو (خواناسییە) ئیفلیج بێت، ئەوی موسڵمانی سادە کەسێکی خراپەو تاوانبارە، ناگاتە قولەپێی نموونە بەرزەکان، بیسەر دەبێتە مرۆڤێکی ئیفلیج، تەنانەت عەقڵیشی ئیفلیج دەبێت، چونکە ناپرسێت چۆن بۆ گوناهێکی وا بچووك مرۆڤ

سزایەکی وا گەورەی خۆی بدات، ئەگەر بشپرسێت نازانێت کە مرۆڤ بۆی نییە زیان بە لاشەی خۆی بگەیەنێت ئەگەر بۆ سڕینەوەی گوناهەکانیشی بێت. جگە لە ئیفلیجی و بێدەسەڵاتی ئەو چیرۆکانە ڕەشبینیشیان بەدواوەیە، بەڵام چیرۆکەکانی قورئان تەرکیز لەسەر ئەوە دەکەن کە کەس لە ڕەحمەتی خودا بێهیوا نەبێت، بەڵکو وەك یەعقوبی پێغەمبەر پاش ساڵانێکی زۆری ونبوونی یوسفی خۆشەویستی و پاش گیرانی بینیامینی برای یوسف بە کوڕەکانی دەڵێت بگەڕێن بە دوایاندا و ﴿ وَلَا تَاْيْـَٔسُوا مِن رَّوْحِ اللَّهِ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَٰفِرُونَ ﴾ یوسف: ٨٧ (لە ڕەحمەتی خوا بێهیوا مەبن چونکە تەنها بێباوەڕان بێهیوان لە ڕەحمەتی خوا).

پرسیاریش دوای ئەوە زیادەیە چونکە ئەنجام دیارە، چیرۆکە هەڵبەستراوەکان کە زۆر لە واعیز و نەزانەکان مێشکی میللەتیان پێ تێکداوە چیرۆکن بۆ سەرسوڕمان و دابڕانی مرۆڤ لە نموونە (بەرزەکان)، کە پاش لێکۆڵینەوە دەردەکەوێت بەرز نین چونکە هەڵبەستراون، ئەگەر هەشبووبن و بەڕاستی وا بووبن قورئان و سوننەت ئیمزای خۆیان ناخەنە سەر ئەو کردار و ژیانە سەیرانە، چیرۆکەکانی قورئان (فەرموودە صەحیحەکانیش هەروا) شتێکی ترن، ئەوانە هانی مرۆڤ دەدەن بۆ نزیکبوونەوە لە نموونە بەرزەکان کە نموونەی بەرزن و واقیعین و بەڕاستیش هەروابوون.

چیرۆك بۆ کارکردن، گرنگی کارکردن یەکێکە لە وانەکانی چیرۆکی ئادەم و حەووا. زانراوە کە ئادەم بەری ئەو درەختەی خوارد کە خودا لەسەری قەدەغە کردبوو لێی بخوات، قورئان وا باسی دەکات، تەوراتیش گوناهەکە دەداتە پاڵ حەووا، حەوواش دەیداتە پاڵ مارەکە، تەورات عەزاب و نارەحەتی دەکاتە بەشی ئادەم و حەووا، لەعنەتیش لە مارەکە دەکات، لەو چیرۆکەشەوە ئافرەت لە فیکری کەنیسەدا تاوانبارێکی هەمیشەییە.

قورئان تاوانی خواردنی بەری درەختەکە دەخاتە پاڵ هەردوو مرۆڤەکە، ئادەم و حەووا (فأكلا منها) زۆر جاریش ئادەم تاکە تاوانبارە﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴾ طه: ١٢١ هەرچەندە دەکرێت ئەم تاك کردنە بە پێی ئەو بنەما زمانەوانییە بێت کە باسەکە بۆ یەك کەس بێت و مەبەست لێی کەسانی تریشە، وەك چۆن زۆر لە فەرمانەکانی قورئان شێوازی نێرینەی بەکارهێناوە بەڵام مەبەست لێی هەردوو نێر و مێیە.

درەختەکە چی بووە؟ قورئان باسی نەکردووە چونکە هیچ لە وەزع ناگۆڕێت، دەڵێن سێو بووە و دەڵێن گەنم بووە، هەرچییەکیش دەڵێن قسەی خۆیانە، گرنگ ئەوەیە درەختێك بووە و گرنگ وانەکەیە، شەیتان تەماعێکی خستە بەر ئادەم: ﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴾ طه: ١٢٠. (ئەی ئادەم درەختێکت پێ بڵێم ئەگەر لێی بخۆیت نەمر دەبیت و مولکێکت دەستگیر دەبێت تیاچوون نەزانێت؟) بەڵێ کێ نایەوێت؟ شەیتان پەنجەی خستە سەر حەزێکی گەورە، بەڵکو گەورەترین حەزی مرۆڤ: نەمری، نەمرییەکی نادیاریش نا، نەمری لەناو خۆشییەکی نەبڕاوە، ئادەم حەزی کرد و لە درەختەکەی خوارد، ئەنجامیش پێچەوانەی پێشبینی بوون ئەنجام ئابڕوو چوون بوو لای خاوەنی نیعمەتەکە، ئابڕووچون بوو بێ دەستکەوتنی نەمری و مولکی نەبڕاوە .

وانەکە زۆر لە ناسینی جۆری درەختەکە گەورەترە: نەمری و خۆشیی هەتاییت دەوێ، کاری بۆ بکە، دەنا بەتەنیا خواردنی بەری درەختێك ئەوە ناهێنێتە دەست، با بزانین چۆن تێنەگەیشتن لەو چیرۆکە، کارنەکردنیش بە پێی ئەو چیرۆکە ئیفلیجی بە دواوە بوو، کاتێك نەوەی یەکەمی ئیسلام ئاینەکەیان وەرگرت زانییان پێویستیان بە دوو شتە تا لەبەهەشتێکی هەتا هەتاییدا نەمری بەدەست بهێنن، باوەڕی پوخت لەگەڵ کاری چاکە، کەس لەوانە بەتەما نەبوو تەنیا شتێکی وەك ناسینی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بداتێ، سەردەم سەردەمی هیممەت و کارکردن و خۆماندوکردن بوو، بەڵام خەڵك دوایی لە ئیسلام دوور کەوتنەوە بۆیە لە جیاتی کۆشش فیکرەیەکی سەیر دروست بوو: ئەگەر بڕوات بە فلانە شێخ هەبێت ڕزگارت بووە، باوەڕی پێ بێنەو لە قیامەتدا خۆت لەژێر ئاڵاکەیدا دەبینیتەوە. لەتبونێکیش لەناو دەروون و عەقڵی موسڵماناندا دروست بوو: پیاوچاکەکان ئەو نموونە بەرزانەن کە مرۆڤی سادە مەگەر تەنها خەون بەوە ببینێت سەگی بەردەرگایان بێت، جگە لەو پیاوچاکانەش خودی پێغەمبەر وا تەماشا کرا: ئەوسا ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەردا بوون هاوڕێی بوون، ئەی ئەوانەی دوای ئەو هاوڕێیانە دێنە دونیا؟

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ئەوانەی دوای ئەو و ئەوان دێن و بێئەوەی بینیبێتیان باوەڕی پێ دەهێنن هاوڕێی نین بەڵکو براین. باسەکە واهات و وا ڕۆیشت تا زەمانێکی درەنگ،

زمانی نەزانی کە تێیدا شاعیران و مەولودنامە خوێنان کەوتنە هاوار لە پێغەمبەر بەسەگی بەردەرگای خۆی قبوڵیان بکات .

لە نێوان هاوڕێیەتی و برایەتی لەگەڵ پێغەمبەر و بوون بە سەگی بەردەرگای ئەو پێغەمبەرە دەریایەك هەیە، ڕەنگە ئێستاش هۆیەکی شکستی کەسێتی موسڵمان بزانین: لەجیاتی هیممەت و کۆشش (هەوڵدان بۆ دەستکەوتنی ئەمری لە ڕێگەی باوەڕ و کرداری چاکە) تەمبەڵی و پشت بەستن بە چارەسەری سیحری، بەکورتی: ڕێگەی ئاسان .. ژەمێك لەبەری درەختێك..

بیرکردنەوە لە چارەسەری سیحری تەنانەت لە کاروباری دنیایشدا پەیدا بوو: زۆر کەس بەم جۆرە بیر لە دەوڵەمەندی یان ڕزگار بوون لە هەژاری دەکەنەوە: دەستکەوتنی کوپەڵەیەکی ئالتون، لەویش (واقعیتر) سەفقەیەکی سەیری بازاڕ بێتە ڕێگەیان وەکو ڕێوییەکی بەر ڕێگە ... ئەی کارکردن و ئارەق ڕشتن و بەکارهێنانی عەقڵ؟ ئەوە ڕێگە هەرە دوورەکەیە.

چیرۆکی (ذوالقرنین) لە قورئاندا وانەیەکی دیکەیە بۆ کارکردن. ئەو کەسە کێ بووە؟ ئایا پێغەمبەر بووە یا تەنها پادشا؟ کەی ژیاوە؟ چەند پرسیارێکن لە مەبەستی چیرۆکەکە دوورمان دەخەنەوە. ڕەنگە بەهۆی بەڵگەنامە مێژوویی و شوێنەوارییەکانەوە لە دواڕۆژێکی نزیك یان دووردا ئەوانە ئاشکرا بن، بەڵام تا ئەوانە دەزانرێت چی لەو چیرۆکە بکەین؟ (ذوالقرنین) پادشایەکی زۆر بەهێز دەبێت، دەگاتە یەکێك لە شوێنەکان و خەڵکی ئەو شوێنە کە قورئان لە بارەیانەوە دەڵێت بەحاڵ لە قسە تێدەگەیشتن، سکاڵای لا دەکەن: یەئجووج و مەئجووج خراپەکارن، باجت دەدەینێ بەو مەرجەی دیوارێکمان لە نێوان ئەم دوو کێوەدا بۆ دروست بکەیت، بەربەستێك بێت ئێمە لەو دوو تیرە بەدکارە جیا بکاتەوە، (ذوالقرنین) باجەکە قبوڵ ناکات و دەڵێت: لەجیاتی ئەوە بەهێزی بازووتان کۆمەکیم بکەن،﴿ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ ﴾الكهف: ٩٥ ، ئەنجامیش بە بیرکردنەوەی خۆی و بە بازووی ئەو خەڵکە دیوارێکی بەرز هەڵسایە سەرپێ، دیوارەکە خراپەکارانی دوورخستەوەو خەڵکی ئەو شوێنە فێری کارکردن بوون. ئەو پیاوە ئەو میللەتەی فێرکرد، ئەو میللەتەی بەحاڵ لە قسە تێدەگەیشتن، فێری کارکردنی کردن.

بەشی (زانست) لەو چیرۆکانەدا هەیە؟

کەواتە چیرۆکەکان وانەی ژیانن، ژیانی دەروون و دڵ، بەڵام پاش ئەوانە (زانست) دوورەپەرێز ناوەستێت. وەك وتم زەمەن بەڵگەی مێژووی و شوێنەواری بۆ ئەو چیرۆکانە ئاشکرا دەکات، بەڵام تا ئەو کاتە مرۆڤ چی بکات؟ کەواتە سەرەتا سوود وەرگرتنە لە چیرۆکەکان بۆ ژیان، دوایش هەر دەستکەوتێکی زانستی دەستکەوتە بۆ چیرۆکەکە، قورئان باسی چەند میللەتێکی کردووە کە باوەڕیان بە پێغەمبەری خۆیان نەهێنابوو و ئەنجام تیاچوونیان بوو، وەسفی تیاچوونەکەش بە چەند شێوەیەکە: لەرزە، هاوار، بروسکە، قورئان بناغەیەك بۆ زانستی شوێنەوار ناسی دادەنێت، کاتێك فەرمان دەدات بە خەڵکی بەزەویدا بگەڕێن بۆ زانینی ئاکامی بێباوەڕان ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ ﴾ النمل: ٦٩ خەڵکی تر گەڕان و چەند شوێنێکیان دۆزییەوە، کارەساتێکی کتوپڕی چەند شارێکیان بینی، نموونەیەکی دیار شارستانییەتەکەی (موهنجو دارو) لە دۆڵی (سند)ی هەزاری سێیەمی پێش زاینە. شارەکە سووتا، سووتانەکەش کتوپڕ بوو چونکە خەڵکەکە ژیانی ڕۆژانەی خۆیان دەبردە سەر، وەسفێکە بۆ هەندێ سزای ناو چیرۆکەکانی قورئان..

لە دورگەی (کریت)یشدا لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زاین شارەکان توشی کارەساتی گەورە بوون، یەکێك لە شارە گرنگەکان (کنۆسۆس) بوو کە وەکو ئەو شارانەی قورئان باسیان دەکات زۆر بەهێزو دەوڵەمەند بوو، بەڵام هەروەکو ئەو شارانە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا تیاچوو، ئەوەی سەیریشە ئەوەیە کانزاکانی ناو کۆشکی شارەکە دیارنەمابوون تەنانەت لەو شوێنانەش کە بەهۆی تەپینی دیوارەکانەوە نەسووتابوون (بڕوانە چیرۆکی شارستانیەتی وڵ دیورانت بەشی یەکەمی بەرگی دووەم) جارێکی تریش کتوپڕیەکی ئەو کارەساتە زۆر لەو سزایانەوە نزیکە کەلە قورئاندا باسکراون.

کەواتە بوارێکی تر بۆ عەقڵ کرایەوە، با ئێمەی مرۆڤیش بە زەویدا بگەڕێین، قورئان تەنانەت پێمان دەڵێت بە زەویدا بگەڕێن تا بزانین دروستکراوەکان چۆن پەیدا بوون، ئاسمان، زەوی، تەنانەت زیندەوەرانیش ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ۚ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ العنکبوت: ٢٠

نـوح و کەشـتییەکەی: تـەورات باسـی کەشـتییەکە دەکـات کـە لەسـەر کێوەکـانی (ئارارات)دا نیشت، بەڵام قورئان دەڵێت ناوی کێوەکـە (جـوودی) بـوو، مێژوو و شـوێنەواریش دووەمیان پەسەند دەکات، کوردستانیش لەگەڵ ئەو پەسەنکردنەدا بەرز دەبێتەوە.

کتێبێك بۆ میللـەتان: چیرۆك لایـەنی مێژوویی لـە مێشـکی مرۆڤدا بـەهێز دەکـات، یەکێکیش لە هۆکارەکـانی تێکشـکاندنی کەسـێتی میللـەتانی لاواز ئەوەیـە تەماشـای ئێسـتا دەکەن و وادەزانن ئەم ئێستایە کە لاوازیی خۆیانە و بـەهێزی ئـەوانی تـرە واقیعێکـە تـا هـەتا دەسەپێت، میللەتیش وا بیر دەکاتەوە ناتوانێت گەشبینانە بیر لە دوارۆژیش بکاتـەوە، چیرۆکی موسا و گەلەکەی وانەی تێدایە کە بـۆ کـورد گرنگـە: چـی میللـەت کۆیلـە دەکـات و چـی لـە کۆیلەیـەتی ڕزگـاری دەکـات، خـودا موسـای بـۆ گەلەکـەی نـارد تـا لـە کۆیلەیـەتی فیرعـەون ڕزگارییان بکات، خوا مەبەستی خۆی بەیان دەکات: (دەمـەوێت چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکەم کـە بە بێهێز تەماشا کراون و بیانکەمـە پێشـەواو بیانکەمـە میراتگر، دەسەڵاتیشیان لـە زەویـدا بدەمێ و ئەو شـتە لـەو میللەتـە پیشـانی فیرعـەون و هامـان و سـەربازەکانیان بـدەم کـە لێـی دەترسـان﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴾القصـص: ٥ - ٦

وانەیەکە بۆ ئێمە کە کۆیلەیەتی قەدەرێکی ئەزەلی نییە، کەس قـەدەر نازانێـت بۆیـە میللـەت تـەنها کۆششـی لەسـەرە، ئایـا کـوردی ئـەم ساتەمان پـاش ژێردەستەیی فیرعـەونی عـیراق و هامانەکەی دەسەڵاتی دەست نەکەوتووە؟ ئایا نەبووە بە یەکێك لەوانـەی میراتـی عێراقیـان بـۆ ماوەتـەوە؟ ئایـا کـورد بـەو لاوازی خۆیـەوە لـە سـاتێکا نـەبووبوو بـە مەترسـی بـۆ صـەدام و سەربازەکانی؟ خواش ئەوەی پیشان نەدان کە لێی دەترسان؟

چیرۆکی موساو ئیسرائیل پێمان دەڵێت کەوا ئیسرائیلییەکان پاش ڕزگاری زوڵمیان کـرد بۆیـە پێویستە کورد ئاگای لە زوڵم بێت.

ئەگەر بەشێکی چیرۆکی ئیسرائیلییەکانیش تەواو بکەین دەڵێین کە مێژووەکەیان پـڕ لـە سەرپێچی لە فەرمانەکانی موساو خواکەی بووە، دوای ئەویش سـەرپێچی لە فەرمانەکانی باقی پێغەمبەرانیان، زنجیرەیەك بوو لە ئاڵۆزکردنی ژیانی خۆیان، زنجیرەیەك لـە بوهتـان بـۆ خـەڵك و بەتایبەت بۆ پێغەمبەرانیان تا گەیشتە ئەوەی بەو ڕەفتارە ژیانی خۆیان ژەهراوی بکـەن، کـورد

زۆر جیاوازە لە جوولەکە، بەڵکو هێندە جیاوازە بۆتە پێچەوانەی جوولەکە بەڵام کورد دەتوانێت سوود لە وانەکانی ئەوان وەربگرێت تا هەمان هەڵەکانی ئەوان دووبارە نەکاتەوە، ئەوەشە گرنگترین سوودی چیرۆك بەڵام بەداخەوە نەك تەنها سوود لە چیرۆکەکانی قورئان وەرنەگیراوە بەڵکو لەوەش خراپتر کورد سوودی لە مێژووی خۆشی وەرنەگرتووە.

چەند چیرۆکێکی تریش بە کورتی، چەند بەهێز بی ئەوەندەش ئاگات لە خۆت بێت لە خۆت بایی نەبی: باسی وانەیەکی چیرۆکی (ذوالقرنین)م کرد، وانەیەکی تر هەیە، ئەمجارە بۆ دەسەڵاتداران، ئەو کەسەی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاواو بە پێچەوانەوە گەشتی کردبوو و دەسەڵاتێکی مەزنی هەبوو نموونەیەك بوو بۆ فەرمانڕەوایەك خۆی بە گەورە نازانێت..

سولەیمانیش نموونەیەکی تر بوو، ئەو دەسەڵاتەی هەیبوو تووشی لەخۆبایی بوونی نەکردبوو بەڵکو داوای لە خوای خۆی دەکرد یارمەتی بدات سوپاسی نیعمەتەکانی بکات، ئەوانە هەبوون و ئەو گەلانەش هەبوون کە بە پێغەمبەرانیان دەوت: کێ لە ئێمە بەهێزترە.

چەندیش زانا بی بزانە کە لەتۆ زاناتر هەیە: چیرۆکی موسا و ئەو پیاوەش هەیە کە نازانین ئایا پێغەمبەر بووە یا تەنها خواناسێك بووە و فەرموودە پێی دەڵێت (الخضر) فەرموودەیەك باسی ئەو پرسیارە دەکات کەلە موسا کرابوو: کێ زاناترین کەسە؟ لەجیاتی ئەوەی بڵێت (خوا) وتی (خۆم)، خواش فەرمانی پێدا بچێتە لای ئەو پیاوە کە لە خۆی واتە لە موسا زاناترە، لێرەوە قورئان باسی دەکات چۆن پیاوەکە بە موسای وت کە ناتوانێت خۆی ڕابگرێت و ئەو شتانەی دەیانبینێت لای سەیر دەبن، چیرۆکەکە درێژەو کورتەکەی ئەوەیە پیاوەکە سێ شتی زۆر سەیری کرد: زیانی بە پاپۆڕی ئەو کەسانە گەیاند کە بەبێ پارە سواریان کردبوون، ئینجا بەبێ هۆ مێردمنداڵێکی کوشت، دوایش لە شارێکدا داوای خواردنیان کرد بەڵام کەس میوانداری نەکردن، هەر لەو شارەشدا دیوارێك دەبینن خەریکە دەڕووخێت پیاوەکەش بێ بەرامبەر چاکی دەکاتەوە، موسا پاش هەر یەکێك لەو ئیشە سەیرانە ناڕەزایی دەردەبڕێت، لە دوای ئەو سێ ڕووداوەش پیاوەکە لێی جیا دەبێتەوە بەڵام پاش ئەوەی نهێنی ئەو ئیشانەی بۆ ڕوونکردەوە.

خاوەن باوەڕی؟ کەواتە دەبێ بەهێز بی: ئیبراهیم بتەکانی شکاند ئەی بتە نوێکان کێ دەیانشکێنێت؟ زۆربەی خەڵك مەراییان بۆ دەکەن، چیرۆکەکەش بێ ئاوڕدانەوەی پێویست تێدەپەڕێت.

کوشتنی یەك مرۆڤ وەکو کوشتنی هەموو مرۆڤایەتییە: چیرۆکی دوو کوڕەکەی ئادەم (قورئان ناڵێت ناوییان قابیل و هابیل بوو) دووبارە بوونەوەی بەسەرهاتی ئادەم و شەیتان بوو: ئادەم شکۆمەند کرا شەیتانیش حەسوودی پێ برد، ئەو حەسوودییەش فرێی دایە خوارەوە، کوڕەکەی ئادەمیش کە بینی قوربانییەکەی قبوڵ کراو ئەوەی خۆی قبوڵ نەکرا حەسوودی پێ بردو کوشتی، ئەویش وەکو شەیتان کەوت، ئەوە دووبارە بوونەوەی کەوتن، ئەی کوا دووبارە بونەوەی شکۆمەندی مرۆڤ، قورئان پاش چیرۆکەکە ئەو بنەمایە ڕادەگەیەنێت:

﴿مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۚ﴾ المائدة: ٣٢ (هەر کەسێك کەسێك بکوژێت وەکو ئەوەیە هەموو مرۆڤەکانی کوشتبێت، هەر کەسێکیش مرۆڤێك زیندوو بکاتەوە (لە مردن ڕزگاری بکات) وەکو ئەوەیە هەموو مرۆڤەکانی زیندوو کردبێتەوە)

کەواتە لاوازەکان دەتوانن بەهێزبن و سەربکەون، زۆربەی شوێنکەوتوانی پێغەمبەران، ئەوانەش کە شوێنی پێغەمبەری ئیسلام کەوتبوون، کەسانێکی هەژاربوون، کەسانێك بوون پایەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزیان نەبووە، ڕەخنەیەکی بێباوەڕانیش ئەوە بوو: ئەی ئەو کەسەی دەڵێی پێغەمبەری خوای خاوەن هەموو جیهانەکانم: ئەوەتا دەبینین لاواز و هەژارو بێدەسەڵاتەکان شوێنت کەوتوون، ئەوە ڕەخنەکەیان بوو بەڵام ئەوهەژارانە لای خوا بەرزبوون، بەرزتر لەبێباوەڕە پایەدارەکان و دەوڵەمەندەکان، پێغەمبەران لەگەڵ شوێنکەوتەکانیان خۆڕاگربوون، گوێیان نەدایە تانەو تەشەر، لە کۆتاییشدا ئەوان بردیانەوە ..

هەموو باسەکانی سەرەوە بریتی نەبوون لە هەموو باسە پێویستییەکانی سەبارەت بە چیرۆکەکانی قورئان، ئەوانە دڵۆپێکی ناو دەریان، بەڵام دەرفەتەکە هەر ئەمەندەیە، لەناو چیرۆکەکانیشدا هەموو شتێك دەدۆزینەوە: عەقڵ، زانست، زانیاری گشتی، قورئان بەشێوەیەکی گشتی کتێبێکە بۆ ژیان، چیرۆکەکانیش بە نموونەی بەرجەستە فەلسەفەی ژیانمان بۆ ڕوون دەکەنەوە.[1]

---

١- ئیسلام پەیك/ فازڵ قەرەداغی.

## لێکچوون و جیاوازی دووبارەبوونەوەی چیرۆکەکانی قورئان:

قورئانی پیرۆز کە بۆ پەروەردەکردنی ئادەمیزاد هاتووە، بە زۆر شێواز هەوڵی لەگەڵ ئەدات، هەندێ جار باسی بەهەشتی بۆ دەکات تا هیوای بداتێ، ئینجا باسی دۆزەخی بە دوادا دینێ تا بترسێ لە سزای خوا، بەمەش ترس و هیوای بۆ دروست دەکات..

هەروەهایەك لەسەرسێی قورئان چیرۆکەو باسی پێغەمبەران و بەسەرهاتی گەلەکانیان دەکات کە بەڕاستی پەند و عیبرەتی زۆریان تێدایەو، لە چەند سورەتێکدا باسی پێغەمبەرێك دووبارە دەبێتەوە، بەڵام لەهەر شوێنێکدا بۆ مەبەستێکەو ئامانجێکی تایبەت ئەپێکێ، کە بەڕاستی ئەمەش موعجیزەی قورئانە.

ڕاستە باسەکان باسی پێغەمبەرێك و گەلەکەیەتی بەڵام شێوازی باسەکەو ڕەنگی باسەکان جیاوازن، واتە لەیەکچوون هەیە بەڵام جیاوازیشن، جیاوازیەکەشیان هەندێك لەسەر وەستان و وردبوونەوەی دەوێت، کە لێرەدا چەند نموونەیەك باس دەکەین:

**یەکەم: لەباسی چیرۆکی موسادا (سەلامی خوای لێبێت)**: لەسورەتی (البقرة)دا قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾ البقرة: ٦٠

واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە، کاتێك موسا بۆ گەلەکەی داوای بارینی باران و ئاوی کرد، ئێمەش پێمان وت:بە گۆچانەکەت بدە بە(تاشە) بەردەکەدا، جا ئەو کارەی ئەنجامدا، بەردەکە دوانزەکانی لێ هەڵقولا، بێگومان هەر هۆزێك چاوگەی خۆی ناسی،ئینجا پێمان وتن: دە بخۆن و بخۆنەوە لە ڕزق و ڕۆزی و بەخششی خوا و تاوان و خراپەمەکەن لەسەر زەویدا لەکاتێکدا کە بەچاندنی تۆوی خراپەوە خەریکن.

هەمان باس لە سورەتی (الاعراف) دا دووبارە ﴿ وَقَطَّعْنَٰهُمُ ٱثْنَتَىْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنۢبَجَسَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۚ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْغَمَٰمَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ

﴿ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾

الأعراف: ١٦٠. واته: ئێمه نەوەی ئیسرائیلمان کرد بە دوانزە تیرەو تایەفە، (دوای ئەوەی بە بیابانی سینادا کۆچیان دەکرد تووشی تینویەتیەکی زۆر بوون)، وەحیمان بۆ موسا نارد کاتێك گەلەکەی داوای ئاویان لێکرد کە: دارعەساکەت بدە بەبەردەکەدا، هەرکە ئەو کارەی کرد بەردەکە دوانزەکانی لێ هەڵقولا، بێگومان هەرتیرەو تایەفەیەك کانیاوی خۆی زانیو هەوریشمان کردبە سێبەر بە سەریانەوە (تا گەرما زۆریان بۆ نەهێنێت)و گەزۆ و باڵندەی شەلاقمان بۆ ناردن، دەبخۆن لەو هەموو ڕزق و ڕۆزیە پاکانەی کە پێمان بەخشیون، جا وە نەبێت ئەوانە ستەمیان لە ئێمە کردبێت.

ئەگەر سەرنجی هەردوو باسەکە بدەین و وردبینەوە، لەیەك دەچن و باسی یەك ڕوودا وە، بەلاّم لە ڕاستیدا لەیەکتری جیاوازن، لەیەکەمیاندا وشەی (فَٱنفَجَرَتْ) هاتووە کە تەقینی سەرچاوەکەو زۆری ئاوەکەیەتی ..

لە دووەمیاندا (فَٱنۢبَجَسَتْ)هاتووە کە هەڵقولانی ئاوێکی کەمە..جا ئەم دوو وشە جیاوازە بۆ بەکارهاتووە؟

لە وەلاّمدا دەڵێین:هەردوو وشەکە بە مەبەست بەکارهاتوون،ئاوەکە لەسەرەتاوە کە سەرچاوەکە تەقیوە زۆر بووە،دوایی بەهۆی گوناهباری و سەرسەختیانەوە کەم بۆتەوە..

لەیەکەم ئایەتدا باسی نیعمەتەکانی خوا دەکات بۆیان، باسی ئاوە زۆرەکە دەکات، بەلاّم کەباسی گوناهو تاوانیان دەکات باسی کەم بوونەوەی ئاوەکە دەکات، کەواتە قورئان هەرشتەو لە شوێنی خۆیدا دای دەنێت..

دووەم: لە چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم دا (سەلامی خوای لێ بێت): لە سورەتی (الذاريات)دا قورئان دەفەرموێت﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ ﴾ الذاريات: ٢٤ - ٢٨ واته: ئەی پێغەمبەرﷺ ئایا هەواڵی میوانە بەڕێزەکانی ئیبراهیمت پێنەگەیشتووە؟

کاتێك چوون بۆ سەردانی وتیان: سلاو، ئەویش وتی: سلاو لە ئێوەش بێت، هەرچەندە ناتانناسم، ئەوسا ئیتر خۆی دزیەوەو چوو بەهاوکاری خێزانی، گوێرەکەیەکی قەڵەوی سەربڕی و سوریانکردەوەو هێنای و لێی نزیك کردنەوە، فەرمووی لێکردن، کەبینی ناخۆن، وتی: ئەوە نافەرموون، ئەوە ناخۆن؟؟

ئیبراهیم ترسێکی لێنیشت (ترسا شتێکیان لەژێر سەردا بێت) بۆیە خێرا وتیان: مەترسە ئێمە فریشتەین، مژدەشیان پێدا کە خوا بەم نزیکانە منداڵێکی زانایان پێدەبەخشێت..

لە سورەتی (الحجر)یشدا دەفەرموێت: ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ ﴿٥١﴾ إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰ أَن مَّسَّنِيَ الْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ الْقَانِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ ﴾ الحجر: ٥١ - ٥٦ واتە: هەواڵیان بدەرێ دەربارەی میوانەکانی ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت، کاتێك کت و پڕ خۆیان کرد بە ماڵداو وتیان: سلاو، وتی: بەڕاستی ئێمە لێتان دەترسین(فریشتەکان وتیان: مەترسە (ئێمە لەلایەن خواوە ڕەوانە کراوین)و بێگومان ئێمە مژدەی کوڕێکی زۆر زانات پێ دەدەین..

ئیبراهیم وتی: ئایا مژدەم دەدەنێ لە کاتێکدا کە ئاوا پیری یەخەی گرتووم، جا بەچی مژدە دەدەن؟!

فریشتەکان وتیان: بەڕاستی مژدەت دەدەینێ،کەواتە لەو کەسانە مەبە کە نائومێدن لە بەخششەکانیخوا. ئیبراهیم وتی: ئایا کێ نائومێد دەبێت لە ڕەحمەت و بەخششەکانی پەروەردگاری مەگەر کەسانێك کە گومڕاو سەرگەردانن..

لەیەکەمدا: باسی سەندنەوەی سەلامەکە و باسی گوێرەکە سورەو کراوەکەی کرد، چونکە تیشك خرایە سەر بەڕێزی میوانەکان﴿ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ ﴾ الذاريات: ٢٤ – ٢٨، لێرەدا میوانەکان زۆر بەڕێزن و ئەمیش زۆر ڕێزی لێگرتوون..

بەڵام لە دووەمدا: باسی ڕێزداری میوانەکان ناکات، بۆیە باسی ڕێزگرتنی ئیبراهیمیش ناکات و کورتی دەکاتەوە، ئەمەش لەلای خۆشمان هەروایە کاتێك شتێك دەگێڕینەوە بەپێی شوێن و کات چەندی پێویست کات ئەوەندەی باس دەکەین.[1].

## سێیەم: قورئان لەبارەی سزاو ئەشکەنجەی فیرعەونەوە بۆ بەنی ئیسرائیل:

دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ نَجَّيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ البقرة: ٤٩ واتە: بیری نیعمەتی ڕزگاربونیشتان بکەنەوەکاتێك ڕزگارمان کردن لە دەست داردەستەی فیرعەون کە خراپترین سزاو ئازاریان دەدان، کوڕەکانیان سەردەبڕین و ئافرەتەکانیان دەهێشتنەوە بۆ کارەکەری و خزمەت، ئەوەش بۆ ئێوە تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو لەلایەن پەروەردگارتانەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ إبراهيم: ٦٦

واتە: یادیان بهێنەرەوە کاتێك موسا بەگەلەکەی وت، یادی نازو نیعمەتەکانی خوا بکەنەوە لەسەرتان، کاتێك لە داروەدستەی فیرعەون ڕزگاری کردن کە بە ناخۆشترین شێوە سزای دەدان، کە یەکێ لەو سزایانەی سەربڕینی کوڕەکانتان و هێشتنەوەی ئافرەتانتان بوو، بێگومان ئەوە تاقی کردنەوەیەکی گەورەبوو لەلایەن پەروەردگارتانەوە.

جیاوازی نێوان ئەم دوو ئایەتە ئەوەیە لەیەکەمدا(يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ) لە دووەمدا (وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ)تەنها (و)ێك زیادە، کەلەیەکەمدا باسی سزاکە دەکات هەروەك سەربڕینی کوڕان و هێشتنەوەی ئافرەتان بێت، بەڵام لە دووەمدا ئەو (واو)ە ئەوە دەگەیەنێت کە سزاکان زۆرن و یەکێ لە سزاو ئازارو تاقیکردنەوەکان سەربڕینی کوڕان و هێشتنەوەی ئافرەتان بووە..

---

١- (على طريق التفسير البياني للقران الكريم)د.فاضل صالح السامرائي.

سەرنج بدە لەپێش باسی دووەمدا ئایەتی ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ إبراهيم: ٥. هاتووە، واتەسوێند بەخوا ئێمە موسامان ڕەوانە کرد، هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەی زۆردا فەرمانمان پێدا کە قەوم و عەشرەتت لە تاریکیەکان ڕزگار بکە بەرەو نوور و ڕووناکی، ڕۆژەکانی خوایان بهێنەرەوە یاد، ئەوڕۆژانەی کە تۆڵەی لە بێباوەڕان سەندو ئیماندارانی سەرخست، بێگومان لەو بەسەرهاتانەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیەبۆ هەموو ئەو کەسانەی کە زۆر خۆگرن لەکاتی تەنگانەداو، زۆر سوپاسگوزاریشن لەکاتیخۆشیدا (صبار، شكور)ن، بۆیەکەباسی ئارامگرتنی زۆرو سوپاسگوزاری زۆری کرد، بەدوایدا باسی زۆری سزاکانی کرد کە یەکێکیان سەربڕینی کوڕان و هێشتنەوەی ئافرەتان بووە، بەڕاستی قورئان زۆر بەوردی و حەکیمانە وشەکان بەکاردەهێنێ.

## چوارەم: چیرۆکی نوح و گەلەکەی سەلامی خوای لێبێت:

**لێبێت:** لە سێ سوورەتدا باسکراوە و هەر جارەی گرنگی داوە بەچەند لایەنێك بەپێی پێویست و ئامانجی سورەتەکە...

١. لە سوورەتی (هود)دا ئامانجەکە سێ شتە کە لە سوورەتەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە:

ا. ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْقُرَىٰ نَقُصُّهُ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَائِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مِن شَيْءٍ لَّمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَىٰ وَهِيَ ظَالِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ الْآخِرَةِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ النَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴾هود: ١٠٠ - ١٠٣ واتە: ئەم چیرۆك و دەنگوباسانەت بۆ باس دەکەین کە ئاگادار کردنەوە بێت بۆ خەڵکی تا خۆیان لە سزای ئاخیرەت بپارێزن .

ب.﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ ﴾هود: ١٢٠واتە: مەبەست لەم چیرۆکانە دامەزراندنی دڵی تۆیە ئەی پێغەمبەرﷺ کە ئەمەش ئامانجی دووەمە..

ج. ﴿ وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾هود: ١٢٠ ئامانجی سێیەمیش بۆ ئەوەیە کە ببێ بە ئامۆژگاری و یادەوەری بۆ بڕواداران..

لەبەر ئەم سێ ئامانجە بە درێژی باسی چەند لایەنێکی چیرۆکەکە کراوە کە ئەو سێ ئامانجە بپێکێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ . أَن لَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ . فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأْيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍۭ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَٰذِبِينَ . قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَٰرِهُونَ . وَيَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًاۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ . وَيَٰقَوْمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ . وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٌ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِيٓ أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًاۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمْۖ إِنِّيٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ . قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ . قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ . وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِيٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ، أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجْرَامِي وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ . وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ . وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَٰطِبْنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ . وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُواْ مِنْهُۚ قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ . فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ، حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ . وَقَالَ ٱرْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْرٜىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ . وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَٰبُنَيَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَٰفِرِينَ ، قَالَ سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِي

مِنَ ٱلْمَآءِۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ، وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ. وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ. قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ، قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ، قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَۚ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾هود: ٢٥ – ٤٨

٢. لەسورەتی الاعراف یشدا جەخت کراوەتە سەر لەناوبردنی لەپڕ، بۆیە چەند لایەنێکی کەم باس دەکات کە ئامۆژگاری نوح و وەڵام نەدانەوەی گەلەکەی و تیاچوونی کافرەکانە..

ئەوەتا باسی ئامانجەکە دەکات ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّبِىٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ، ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَوا۟ وَّقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ الأعراف: ٩٤ – ٩٥

لەبارەی چیرۆکەکەشەوە دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ. قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ. قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى ضَلَٰلَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ. أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ، أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ، فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴾الأعراف: ٥٩ - ٦٤

٣. لە سورەتی (الشعراء)یشدا کافران داوای ئایەت و بەڵگەو موعجیزە دەکەن، بۆیە قورئان بەکورتی و بە خێرایی بانگەوازی نوح و وەڵام نەدانەوەی ئەوان باس دەکات و، جەخت دەکاتە سەر لەناوبردنی کافران وەك بەڵگەو ئایەت وموعجیزەیەك بۆ قەناعەت پێکردنیان،

هەروەك دەفەرموێت: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ ، إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ، إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ، فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ، وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ، قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ ، قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ، إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ ، وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ ، إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُبِينٌ ، قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمَرْجُومِينَ ، قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ ، فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَنْ مَعِيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ، فَأَنْجَيْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ ، ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ الْبَاقِينَ ، إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ ، وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ الشعراء: ١٠٥ - ١٢٢.[١]

**پێنجەم: چیرۆكی ئادەم و ئیبلیس لە حەوت سوورەتدا هاتووەو،** هەرجارەو بەشێكی رووداوەكانی خستۆتەڕوو كە بگونجێت لەگەڵ ئامانجی سوورەتەكەو بابەتەكانی پێش خۆی و دوای خۆیدا :

ا – لەسوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ، وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَٰؤُلَاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ، قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا ۖ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ، قَالَ يَا آدَمُ أَنْبِئْهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ ۖ فَلَمَّا أَنْبَأَهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ ، وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ. وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ .فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ ، فَتَلَقَّىٰ آدَمُ مِنْ رَبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ، قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ

---

١- (لاياتون بمثله: محمد قطب)

﴿ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ، وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾ ٣٠-٣٩

هەندێ بڕگەی ئەم چیرۆکە تەنها لێرەدا باس کراوە، بۆنموونە کە باسی فەزڵی ئادەم کراوە لە لایەنی زانست و فێربوونەوە کە ئەمەشی پێویستە بۆ بوون بە خەلیفە لە زەویدا، کە ئەمەش تەوەرەیەکی سوورەتەکەیە.

جائەگەر سەرنجی سوورەتەکە بدەین دەبینین کە هەڵبژاردنی پێغەمبەریش ﷺ بۆئەوەیە ئایەتەکانی خوا بۆ خەلکی بخوێنێتەوەو دڵ و دەروونیان پاك بکاتەوەو فێریان بکات، ﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ ﴾ ١٥١

هەروەها داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە پاش ئەوەی خوا زانست وزانین و هەق و راستی دایە وریابێت شوێن هەواو ئارەزووی ئەهلی کیتاب نەکەوێت، ئەگینا سەرگەردان دەبێ و خوا هاوکاری ناکات ودەبێتە یەکێ لە ستەمکاران: ﴿ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾ ١٢٠

﴿ وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُوا قِبْلَتَكَ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ البقرة: ١٤٥

ئوممەتی ئیسلام بەو زانستە لەخواوە بوونە جێنشینی زەوی، جائەگەر پەیڕەوی بەرنامەی خوایان کرد ئەوجێنشینی و پێشەوایەتیە بەردەوام دەبێت، گەرنا خوا لێیان دەسێنێتەوە هەروەك چۆن لە ئەهلی کیتابی سەندەوە.

لە سوورەتەکەدا لە چیرۆکی طالوت وجالوت دا جەخت دەکاتەوە سەر گرنگی ئەو زانینەو بە هۆکارێکی گرنگی دادەنێت بۆ پێشەوایەتی: ﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَالُوٓا أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً

مِنَ ٱلْمَالِۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِۖ وَٱللَّهُ يُؤْتِى مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ ٢٤٧

کاتێکیش کۆمەڵی طالوت سەرکەوتن و داود جالوتی کوشت خوای گەورە دەسەڵات و حیکمەت و زانینی دا بەداود تا بتوانێت پێشەوایەتی بکات. جا سەرنج بدە ( وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ) چەند جوان ئەگونجێت لەگەڵ کەش و هەوای سوورەتەکەدا، ئەم مەسەلەیەی ئادەمی تەنها لێرەدا باس کردووە .

ب- لە سوورەتی (الاعراف) دا بەم جۆرە باسی ئادەم کراوە:

﴿ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ، فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِىَ لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ، وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ،فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ، قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ، قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ، قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ، يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِى سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ، يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾١٩ - ٢٧

ئەم ئەڵقەیەی چیرۆك و ژیاننامەی ئادەم کە لێرەدا باس کراوە بەتەواوی دەگونجێت لەگەڵ سوورەتەکەدا، شەیتان کە دوژمنی سەرسەختی ئادەمە لێرەدا لەبەرگی دڵسۆزیو ئامۆژگاریدا دێتە پێشەوە، ( وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ)، بەوەش دەیان خەڵەتێنێت، ئەم

سوێندخواردن و دەربڕینی دڵسۆزییەی شەیتان تەنها لێرەدا هاتووە. ئەگەر سەیری سوورەتەکە بکەین چەندجار باسی دڵسۆزی تیاهاتووە، دڵسۆزی و ئامۆژگاری ڕاستەقینە :ئەوەتا حەزرەتیnوح بەگەلەکەی دەفەرموێت:﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾٦٢

ئەوەتا حەزرەتی هودیش بەگەلەکەی دەفەرموێت:﴿ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ ٦٨

حەزرەتی صالحیش بەگەلەکەی دەفەرموێت: ﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾٧٩

حەزرەتی (شوعەیب)یش بەگەلەکەی دەفەرموێت:﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ ۖ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴾٩٣

وەك بینیتان دڵسۆزی تەوەرەیەکی سوورەتەکەیەو هەموو چیرۆکەکانیش خزمەت بەو تەوەرەیە دەکەن، جا بەڕاستی ئەم داڕشتن و چنینە جوانە موعجیزەیەکی قورئانە کە هەقە لە خزمەتیا بوەستین ..

هەر لەم سوورەتەدا قورئان دەیەوێت ئەو بیروباوەڕەی کافران پووچەڵ بکاتەوە کە شەیتان چووبووە بن کلێشەیان گوایە کە حەجیان کرد ئەگەرجلی ئەهلی مەککەیان دەست نەکەوت، ئەبێ بەڕووتی تەواف بکەن گوایە جلەکانی خۆیان بەکەلکی حەج نایەت لەبەر ئەوەی گوناهیان پێوەکردووە یان حەڵاڵ نیە، قورئان فەرمان دەدات بەڕووتی تەواف نەکەن و دەفەرموێت: ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ، قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾الأعراف: ٣١ - ٣٢. ڕەنگە لەبەر ئەمەش بێت کە باسی ڕووت بوونەوەو هەست بەڕووتی کردنی ئادەم و حەوا دەکات کەشەیتان خەڵەتاندنی .کەواتە ڕووت بوونەوە سیاسەتی دێرینی شەیتانەو دوژمنی هەتاهەتاییتانە و خۆتانی لێبپارێزن ..کەواتە ئەو بەشەی چیرۆکی ئادەم ﴿ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا

وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ﴾٢٢ خزمەت بەو تەوەرەیە دەکات و بۆ ئێرە دەگونجێت، ئنجا دەفەرمووێت: ﴿ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾٢٧

ج- چیرۆکی ئادەم لە سوورەتی (الحجر)یشدا دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ، وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ، وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى خَـٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ، فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَـٰجِدِينَ ، فَسَجَدَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ، إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ، قَالَ يَـٰٓإِبْلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ، قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ، قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ، وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ، قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ، قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ، إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ، قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ، إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ، قَالَ هَـٰذَا صِرَٰطٌ عَلَىَّ مُسْتَقِيمٌ ، إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَـٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ، وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ، لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ، إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ، ٱدْخُلُوهَا بِسَلَـٰمٍ ءَامِنِينَ ﴾ ٢٦ - ٤٦

سەرنج بدە پێنج سوژدەبردن دووبارە بۆتەوە، هەر لەم سوورەتەدا باسی تری سوژدەهاتووەو بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ . فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ . وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴾ ٩٧ - ٩٩ لەم ئەلقەیەدا فێڵێك و پیلانێکی تری شەیتان باسدەکات کە جوانکردنی خراپەو دنیایە لەرچاوی ئادەمیزاد ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ ٣٩ کە ئەمەش ئەگونجێت لەگەڵ سەرەتای سوورەتەکەدا کە دەفەرمووێت: ﴿ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾(٣) دیارە کافران سەرقاڵی دنیان و هەر خەریکی خەو وخواردن و رابواردنن و هیوای

زۆریان بەخۆیانە دەتۆش وازیان لێبێنە تا لووتیان بە قەبرو قیامەتدا دەتەقێت .ئنجا بە پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانانیش دەفەرموێت ئێوە خاوەنی بەرنامەی خوان کە گەورەترین نیعمەتە، کەواتە چاو لەدووی دنیامەبن و ئاوات بەماڵ وسامانی کافران مەخوازن کەجوانیەکەی وەك جوانی گوڵێکە کەزووسیس دەبێت و هەڵدەوەرێت ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ، لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ٨٨

د- لەسوورەتی (الاسراء)یشدا بەم جۆرە باسی ئادەم هاتووە:

﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ، قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ، قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ، وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا، إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴾٦١-٦٥ لەم ئەڵقەیەدا شەیتان ئەیەوێت لغاو بکاتە دەمی نەوەی ئادەم و بەدوای خۆیدا رایان کێشێت (لَأَحْتَنِكَنَّ)، یەکێ لەو هۆکارانەش کە بەدەستیەوەیە بریتیەلە ئیستیفزازکردن وپەیمانی درۆ ﴿ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴾٦٤ ئنجا سەیری گونجانی ئەم ئەڵقەیە بکە لەگەڵ سوورەتەکەدا، وشەی (استفزاز) سێ جار لە قورئاندا هاتووە هەمووشی لەم سوورەتەدایە، جارێکیان لەباسی نەوەی ئادەم و ئیبلیسدا، جارێك لەباسی قورەیشدا کە دەیانویست پێغەمبەرﷺ ئیستفزاز بکەن ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾٧٦ جاری سێیەمیش لە باسی فیرعەوندا کە ویستی حەزرەتی موساو شوێنکەوتوانی ئیستفزاز بکاو جێ و رێیان لێ تێکبدات ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ

يَـٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ، قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَـٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَـٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ، فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَـٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴾١٠١ - ١٠٣

م- له سووره‌تی (كهف)یشدا ده‌فه‌رمویّت:

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ بِئْسَ لِلظَّـٰلِمِينَ بَدَلًا ، مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا ﴾٥٠ - ٥١ ته‌نها له‌م سووره‌ته‌دا باسی ئه‌وه ده‌كات كه ئیبلیس له (جن) ه، جا كه ئه‌وان سه‌رگه‌ردانن و گومڕاكه‌رن و دوژمنتانن چۆن ده‌یانكه‌ن به دۆست و هاوه‌ڵی خۆتان، چۆن ده‌یاكه‌ن به هاوه‌ڵ و هاوبه‌شی خوا؟؟ كه ئه‌مه‌ش له چه‌ند ئایه‌تی تری سووره‌ته‌كه‌دا هاتووه‌و هه‌مووی ته‌واوكاری یه‌كترین بۆ نموونه:

١- ﴿ هَـٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَـٰنٍۭ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾ الكهف: ١٥، هاوه‌ڵانی ئه‌شكه‌وته‌كه وتیان: گه‌له‌كه‌مان هاوه‌ڵ و هاوبه‌شیان بۆ خوا بڕیارداوه به‌بیّ هیچ به‌ڵگه‌یه‌ك، كیّ له‌وه تاوانبارتره كه درۆ هه‌ڵبه‌ستیّ به‌ده‌م خواوه .

٢-﴿ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴾٢٦ ، لیّره‌شدا جه‌خت ده‌كاته‌وه سه‌رنه‌وه‌ی كه هاوه‌ڵانی ئه‌شكه‌وته‌كه ته‌نها خوا دۆست و پشتگیریانه .

٣- ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ، وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ، هُنَالِكَ ٱلْوَلَـٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴾ ٤٢ - ٤٤ خاوه‌نی باخه‌كان كه باخه‌كه‌ی تیاچوو په‌شیمان بووه‌وه و وتی: خۆزگه هاوبه‌شم بۆ خوا بڕیارنه‌دایه، جا كه‌س نه‌بوو فریادڕه‌سی بیّت بیّجگه له خوا، كه به‌ڕاستی ته‌نها ئه‌و دۆست وفریادڕه‌سه .

٤- ﴿ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِى مِن دُونِىٓ أَوْلِيَآءَ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ نُزُلًا ﴾ ١٠٢ ئایا كافران دەیانەوێت كە بەندەكانی من لە ئینس و جن بكەنە هاوەڵ و فریادڕەسی خۆیان؟؟

٥- ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾ ١١٠، ئەوەتا دوا ئایەتی سوورەتەكەش جڵەوگیرییە لە هاوەڵ و هاوبەش دانان بۆ خوا .

ئێستا سەیری ئایەتەكانی چیرۆكی ئادەم بكەرەوە لەسوورەتی كهف دا، وردبەرەوە چەند بەجوانی لە خزمەتی تەوەرەیەكی سوورەتەكەدایە (كە تەنها خوا دۆست و پشتگیری ڕاستەقینەیەو تەنها ئەو دەبێت بپەرسترێت)، سەیركە چۆن ماناو مەبەستەكان دەوڵەمەند دەكات.

ن- لە سوورەتی (طه) شدا دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا، وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ، فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ، إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ، وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ، فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ، فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ، ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ، قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ، وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ، قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴾ ١١٥ - ١٢٥ لەم ئەڵقەیەدا باسی بیرچوونەوەی ئادەم كراوە، سەیربكە ئایەتی پێش ئەم چیرۆكە باسی ترسی پێغەمبەر ﷺ دەكات كە كاتێك وەحی بۆ دەهات بە پەلە پەل دەیوتەوە لەگەڵیا نەوەك بیری بچێتەوە ﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۗ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴾ ١١٤ واتە ڕاستە ئادەم و

ئەوەکانی بیرچوونەوەیان هەیە بەڵام ئەوە مەسەلەیەکی ترەو ئێمە خۆمان قورئان لە دڵتا دەچەسپێنین ..ئەمەش پەیوەندی ئەم ئایەتە دەردەخات بە چیرۆکەکەوە.

ئینجا لەسەرەتاوە باسی ئەوە دەکات کە ئێمە قورئانمان بۆ نەناردویت ئەی محمد ﷺ کە ببێتە مایەی خەم و خەفەت و (شقاء) بۆت ﴿ طه. مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ﴾ ١- ٢ سەیرکە لە چیرۆکەکەشدا باسی (شقاء)ی ئادەم هاتووە کە ئەگەر شەیتان تەفرەیان بدات و لە بەهەشت دەریان بکات تووشی دەبن ﴿ فَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَـٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴾١١٧ ئنجا ئەگەر هەرکەس هاتەدنیاو شوێن بەرنامەی خواکەوت تووشی تیاچوون و (شقاء)ی دنیاو قیامەت نابێت ﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴾١٢٣.. بەم شێوەیە چیرۆکەکە تەوەرەکانی سوورەتەکە دەوڵەمەند دەکات و هیچ شتێکی نیە لە خۆوەو بەزیادەو بەبێ مەبەست هاتبێت .

و- لەسوورەتی (ص)یشدا دەفەرموێت :﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى خَـٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ، فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَـٰجِدِينَ ، فَسَجَدَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ، إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ، قَالَ يَـٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ، قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ، قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ، وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ، قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ، قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ، إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ، قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ ٧١ - ٨٣ لەم ئەڵقەیەدا باسی خۆ بەزل زانی تەکەبور دەکات، ئەمەش پەیوەندی هەیە بەتەوەرەیەکی سوورەتەکەوە کە هەر لەسەرەتاوە باسی دەکات کە کافران خۆیان بەزل دەزانن و لووت بەرزی دەکەن لە عاستی هەقدا:

﴿ صٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ، بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴾ ١- ٢ لەکاتێکدا کە عیززەت و کیبریا بۆ خوایە ئەوەتا تەنانەت شەیتان دان ئەنێت بەوەداو سوێند بە عیزەتی خوا دەخوات ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ، إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ ٨٢ - ٨٣.

دەی کافرانی مەککە ئێوە خاوەنی چین لەم بوونەوەرە گەورەیەدا، فەرموون چیتان دەسەڵاتە؟؟ دیارە خاوەنی هیچ نین و بەندەیەکی زەبوونن ﴿ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ ، أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَلْيَرْتَقُواْ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴾ ص: ٩ - ١٠ .[١]

(بۆ زیاتر شارەزابوون لە تەوەرەونامانجی سوورەتەکان داواکارم لە خوێنەری ئازیز کە پەڕاوی رازی قورئانی بخوێنێتەوە، کە (خواطر قرآنیة)ی مامۆستا عەمر خالیدەو وەرمان گێڕاوە).

## تۆفانەکەی نوح ..

قورئان باسی بەسەرهاتی گەلانی دێرینی کردووە، یەکێك لەو گەلانەش گەلی نوحە و دەفەرموێت: ﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ، إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ، إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ، فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ، وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ، فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ، قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ ، قَالَ وَمَا عِلْمِى بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ، إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّى لَوْ تَشْعُرُونَ ، وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ، إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ، قَالُواْ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ، قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِى كَذَّبُونِ ، فَٱفْتَحْ بَيْنِى وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِى وَمَن مَّعِىَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ، فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ، ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ٱلْبَاقِينَ ، إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ، وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ الشعراء: ١٠٥ - ١٢٢ ...ئەم باسەش ئیعجازی غەیبی قورئانی تیایە کە دۆزینەوەی پاشماوە کۆنەکان ڕاستێتی دەسەلمێنێ..

سۆمەریەکان باسی تۆفانێکیان تۆمار کردووە لەسەر لەوحی قوڕی سورەوکراو کە ساڵانی ١٨٨٩ بۆ ١٩٠٠ی زاینی دا دۆزرایەوە لە لایەن کۆمەڵێك شوێنەوارناسی ئەمریکیەوە لە عێراق، کەباس لەوە دەکات کەپاشا (زیو سودا) خواناس و پارێزگار بوو، ئاگادار کرا تۆفان دەبێت، کەشتی دروست کردوو خەڵکانێکی ڕزگار کرد لەو تۆفانەو کە حەوت شەو و حەوت ڕۆژی خایاند .

---

١- سەرچاوە: (إمعان النظر فی نظام الآي والسور/ محمد عناية أسدالله سبحاني)

هەروەها بابلی‌یەکانیش تۆماریان کردووە، لەساڵی (١٨٧٢)دا (سیدنی سمیث) ڕایگەیاند کە پێویستە پارچەکانی (مەلحەمەی گلگامێش) کۆبکرێتەوە کە دوانزە لەوحەیە، کەلەوحەی یانزەی باسی تۆفانەکە دەکات کە دەڵێت: پیاوێك بەناوی گلگامێش، (خواکان) فەرمانیان دایە کە کەشتیەك دروست بکات و واز لە موڵك و ماڵ بێنێو، لەسەر کەشتیەکەشی تۆوی هەموو شتێکی زیندووی هەڵگرت، ئەو کەشتیەی دروستی کرد درێژی و پانی وەکو یەك بوو ..بارانێکی زۆر باری و تادەگاتە ئەوەی کە دەڵێت: کەشتیەکە لەسەر شاخی (نیصیر)یان (نیزیر) نیشتەوە کە دەکەوێتە نێوان دیجلەو زابی خوارووەوە.

لەنیوەی یەکەمی سەدەی سێ‌ی پێش زاینیشدا، لە زەمانی پاشا (أنتیوخوسی یەکەم) (٢٨٠-٢٦٠)ی پێش زاین یەکێ بەناوی (بیروسوس)ی بابلی کە کاهینی خوای (ردوك)ی بابلی بووە، بە زمانی بابلی مێژووی وڵاتەکەی بە زمانی یۆنانی بە سێ بەرگ نوسیوەتەوە، کە تیایا باس لە تۆفانێك دەکات، کە گوایا پاشایەك بەناوی (ئەکسیسوپووس) لە خەویا خوا ئاگاداری دەکات لە تۆفانێك کە هەموو زەوی دەگرێتەوە و هیچ ناهێڵێو، فەرمانی ئەداتێ کە کەشتیەك دروست بکات، ئەویش کەشتیەك دروست دەکات کە درێژییەکەی١١٠٠(یارد)ەو پانیەکەشی٤٤٠ (یارد)ەو هەموو خزم و هاوەڵان و زیندەوەرانیش لە باڵندەو چوارپێ لەگەڵ خواردن و خواردنەوە لەگەڵ خۆیدا بار دەکات.

تۆفانەکە زەوی داپۆشی، کەشتیەکە لەسەر شاخێك لەنگەری گرت، خۆی و ژن و منداڵەکانی و کەشتیەوانەکە دابەزین و پاشا سوجدەی بۆ خوا برد و قوربانی کرد ...

تەوراتیش لە (ئیصحاح)ی شەش تا (نۆ) لە سیفری تەکویندا باسی ئەو تۆفانە دەکاو دەڵێ: خوا بینی کە خراپەی مرۆڤ زۆر بووە لەسەر زەوی، خەمبار بوو لەم ڕفتارەی مرۆڤ لە زەوی‌داو پەشیمان بوو لە دڵیا، بڕیاریدا کە مرۆڤ و چوار پێ و باڵندەو گیانەوەران لەسەر زەوی نەهێڵێ، تەنها نوح بهێڵێتەوە کە پیاوێکی بەوەفا و چاك بوو ..نوح ئاگادار کراو فەرمانی درایە کەشتیەکی گەورە دروست بکات و بە قیرو (قەتران)لە ناوەوەو دەرەوە داپۆشێ تائاو نەچێتە ناوی، لەهەموو گیانلەبەرێك دووان، نێرو مێیەکی تیا دابنێ، ئەمە بێجگە لە ژنەکەی و منداڵەکانی و ئافرەتانی ناوماڵی...

چل شەو و چل ڕۆژ باران باری و کانیەکانی زەوی تەقین و ئاسمانیش کرایەوە و تۆفانەکە چل ڕۆژی خایاند لەسەر زەوی ..هەرچی هەبوو لە مرۆڤ و گیانەوەران لەسەر زەوی لەناو چون و

نوح و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون مانەوە، تا کەشتیەکە لەسەر شاخی ئارارات گیرسایەوە، هەندێ لەمێژوونوسان و موفەسیرەکان لەو بڕوایەدان کە تۆفانەکە هەموو زەوی نەگرتەوە و دەڵێن: کە لە چوار شاری بیلادی ڕافیدەین دابووە (نور،ئریش، شورپاك، کیش) شوێنەوارەکانیش جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە ئەو شارانە تۆفانێك لێی داوە لە سالآنی ٣٠٠٠پێش زاینیدا ..

لەناوەڕاستی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٤٨ز دا شوانێکی کوردی تورکیا بەناوی ڕەشید سەرحان پاشماوەی تەختەکانی کەشتیەکەی نوحی دۆزیەوە کەلەسەر شاخی جودی بوو، کە دانیشتوی دێی (ئەسار)ە، ئەوەی سەیرە ئەم ناوە ناوی هەمان ئەو دێیەیە کە بەزمانی بابلی بەدێیەکەی نوح وتراوە کە تیایا ژیاوە.

لەسالآنی دوای ١٩٥٣دا چەند کۆمەڵێکی شوێنەوار ناسی سەردانی شاخی جودیان کردو فەحسی تەختەی بەبەرد بووی کەشتیەکەیان کرد وە بە (هاوتای کاربۆنی تیشکدەر) فەحسیان کردو بۆ زانینی مێژووی تەختەکان بۆیان دەرکەوت دەگەڕێتەوە بۆ ٤٥٠٠ساڵ پێش ئێستا، فەزڵی گەورە دەگەڕێتەوە بۆ لێکۆڵەران (دیفید فاسولد) و (رون وایت)و هەوڵی زۆری پرۆفیسۆری تورکی(احمد رسلان) لەماوەی چل ساڵدا پەنجا جار سەرکەوتە سەر شاخی جودی بۆ دیراسەی شوێنی کەشتیەکە، کەتەواو دەگونجێ لەگەڵ ئەوەی کە لە قورئاندا هاتووە:

﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ ﴾ هود: ٤٤

ئەو وێنانەی جیهازی ڕادار لەقوڵی ٢٥ مەتردا کێشاویەتی بۆ ژێر بەشی دواوەی کەشتیەکە، زۆر وردە کاری کەشتیەکەی دیاری کردووە.کە درێژیەکەی نزیکەی ١٧١ مەتر دەبێ گەورەترین پانی نزیکەی٤٦ مەترێك دەبێ و معەدەلی پانی نزیکەی ٢٨ مەترێك دەبێت، قوڵیەکەی نزیکەی ١٧ مەترێك دەبێت.

زانایان بە ڕێگایەکی زانستی تەواو دیراسەی زۆربەی پارچەکانی کەشتیەکەیان پشکنیوە. بەڵام لێرەدا باسی (انجر) یان (مرساە)یان لەنگەری کەشتیەکە دەکەین، کە بۆ لەنگەرکردن و هاوسەنگی کەشتیەکە هەڵواسراوە بە گوریس و شتی زۆر بەهێز بەبنی کەشتیەکەوە ...

یەکەم پارچەی کەشتیەکە کە دۆزرایەوە سیانزە دانە بوو لەو بەردانەی لەنگەر گرتن کەلە بەرزایی هەزاران پێ لەئاستی دەریاوە دۆزرایەوە لەو ڕێیەی کەوا دادەنرێت کەشتییەکەی پیا ڕۆیشتبێت.

کە ڕەنگە کاتی تەواو بوونی تۆفانەکەو کەم بونەوەی ئاوەکە حەزرەتی نوح و هاوکارانی ئەو گوریسانەیان پچڕانبێ و بەردەکان بلاوبونەوە. زانایان دەڵێن ڕەنگە (٢٤مرساە)ی هەبووبێ هەرچەند ئێستا (١٣)ی دۆزراوەتەوە، ئەو لەنگەرە بەرداتە معدلی بەرزی ٢،٥ مەترە قورسیشی (٤-١٠)تەنە، لێکۆڵەر (دیفید فاسولد) کە ناودارترین دۆزەرەوەو پسپۆرە لەم مەسەلەیەدا، جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە ئەو بەردی لەنگەرانە ئەوەیە کە لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کراوە کە بۆ خۆی موعجیزەیەو دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾هود: ٤١ ئەوەی کە لێکۆڵەرانی سەرسام کردووە، باشە چۆن ئەو بەردە قورسانە بەرز کراونەتەوەو چۆن کون کراون، چۆن هەڵواسراون بەکەشتیەکەدا بۆ هاوسەنگی و هەڵگرتنی کەشتیەکە لەبەردەم شەپۆلی زۆر بەرزدا کە وەك شاخ بووە هەروەك قورئان دەفەرموێ:﴿ وَهِيَ تَجۡرِي بِهِمۡ فِي مَوۡجٖ كَٱلۡجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبۡنَهُۥ وَكَانَ فِي مَعۡزِلٖ يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ هود: ٤٢ بەڵام دیارە وەڵامی هەموو ئەوانە لەوەدایە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا ﴾هود: ٣٧ وە بۆ ڕۆیشتنیشی دەفەرموێ ﴿ تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا ﴾ القمر: ١٤...

## لەخزمەت چەند ئایەتێکدا :

پرۆفیسۆر زغلول النجار لە پێگەکەیدا دەڵێ:

١- کە قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ ﴾هود: ٤٤ واتە ئەی زەوی ئاوەکەت قوت بەرەوە، وشەی(مَآءَكِ) هەروەها کە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ٣٠ أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ﴾ النازعات: ٣٠ - ٣١ واتە: ئاوی زەوی لەخۆیەوە دەرهێنا، زانایان پاش هەوڵ و کۆشش و لێکۆڵینەوەی زۆر بۆیان دەرکەوت، هەرچی ئاوی سەر زەوی هەیە

لەناوجەرگەی زەوی خۆیەوە هاتۆتە دەرێبەهۆی گڕکانەکانەوە، بۆیان دەرکەوت کە ٧٠٪ی گڕکانەکان هەڵمی ئاوە..دیارە زەویش لەسەرەتایەوە کە گڕکانی زۆر زۆری بووە، بوەتە هۆی پەیدا بوونی ئەو ئاوە کە نزیکەی ١،٤٠٠کیلۆمەتر سێجایە)..

٢-﴿ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِي ﴾هود:٤٤ واتە ئەی ئاسمان ئاوەکەت بگرەوە.

دوو زانای فیزیایی زەوی ئەمریکی لەساڵی١٩٩٨دا کە ناویان (ولیام ریان) و (التربتمان)ە، لە پەڕاوێکیاندا بەناوی (گوفان نوح) وتیان کە پێش (٧٦٠٠)ساڵ ئاوی دەریا و ئۆقیانوسەکان بەرز بۆتەوە و بە(وادی بۆسفۆر)دا لافاوێکی گەورە هاتوەو بوەتە مایەی کۆچ کردنی زۆری خەڵکی ناوچەکە.

بەڵام ئایەتەکانی قورئان جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە بەئاوی دەریا نەبووەبەڵکو بەئاوی ناو زەوی بووە واتە بەئاوی شیرین بووە، کەدۆزینەوەکانی کەشتی نوحیش ئەوە دەسەلمێنێ لەسەر شاخی جودیکە ئەو پارچانەی کەشتیەکە لە گلێکی نیشتەنی ئاوی شیرین دا نوقم بووەو ئەو گلە نیشتەنیەش سنورێکی فراوانی لەنێوان دیجلەو فورات دا داگیر کردووە.

٣-﴿ وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ﴾هود: ٤٤ واتە ئاوەکە کەم بۆوەو زەوی هەڵی مژیەوە، لە تەوراتدا دەڵێ: خوا بایەکی ناردو ئاوەکە نیشتەوە، نازانم با پەیوەندی چییە بە نیشتنەوەی ئاوەکە، هەروەها دەڵێت:

کە تۆفانەکە جیهانی بووە، (سفر التکوین)(١٨:٧:٢٤)دا، بەڵام منطق وا نالێ و دۆزینەوەکانیش جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە لە شاخەکانی تورکیاوە بۆ ناوچەیەکی فراوانی نێوان دیجلەو فورات بووە...هەروەها تەورات دەڵێت: پانزە گەز ئاوەکە بەرز بۆوە و هەموو شاخەکانی داپۆشی، دیارە ئەمەش تەواو نیە ئەو شاخە بەرزانە بەو پانزە گەزە چۆن دادەپۆشرێ..قورئان باسی ئەوشتانەی نەکردووە ..

٤- ﴿ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ ﴾هود: ٤٤

ئەم ئایەتە جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە کەشتیەکە لەسەر شاخی جودی گیرساوەتەوە، لێکۆڵینەوەکانی (مارتن روی) لەساڵی١٩٨٠ دا،(جون مونتو جری) لەحەفتاکاندا جەختیان کردە سەر ئەوی کە پاشماوەی کەشتیەکە لەسەر شاخی جودییە، کە لە لایەن شوانێکی کوردەوە لە ساڵی١٩٤٨ دا دۆزرایەوە لەسەر ئەو شاخە، کە (٢٣٠٠) مەتر لەئاستی دەریاوە بەرزە..

ئەو تۆفانە بۆتـە مایـەی نیشـتنی لیتەیـەك بەئەسـتوری زیـاتر لـە (٣)مـەتر، تەمـەنی دەگەڕێتەوە بۆ سێ تا حەوت هەزار سـاڵ پـێش زایین.. دکتـۆر (رالـف سولسـکی) لەپـەیاگای سمسپونیان دا لە ئەمریکا، لەپاش دیراسەی پارچەکانی کەشتیەکە بۆی دەرکـەوت کـە تەمـەنی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٤٥٠٠)ساڵ پێش زایین، هەروەها ئەمـەش (مـارتین روی) لەرۆژنامـەی (ئوبزرفر)ی لەندەن دا ڕایگەیاند لـە١٦ ینـایری ١٩٩٤دا زانایـانی رۆژئـاوا زۆر هەوڵیانـدا کـە ئەودۆزینەوانە لەسەر شاخی ئارارات بێت، کە شاخی جودی (٢٥٠)میل دووره لێـی دەکەوێتـە لای خواروی رۆژئاوای شاخی ئاراراتـەوە، ئەمـە مایـەوە تـا کۆمـەڵێ زانـای ڕووسـی لـەرۆژی جومعەی ٢٥\٣\٢٠٠٥ لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنوسیدا کە وەکالەتی (ئینتەر فاکس بۆ هەواڵ) بلاوی کردەوە، ڕایانگەیاند هیچ پاشماوەو شوێنەوارێکی کەشتی نوح نیە لەسەر شـاخی‌ئارارات، بەڵکو ئەو شوێنەوارە لەسەر شاخی جودییە.

تێبینـی/ لەبـەر ئـەوەی گۆڤـاری هـەیڤ بابـەتی (مانگـە دەسـتکردەکان شـایەتی بـۆ پێغەمبەردەدەن)ی بلاوکردەوە لە ژمارەی (١٢) دا بۆیە لە جیاتی ئەوە ئەم بـەرگی هەشـتەمان دەرکرد و ئەوەم دووبارە نەکردەوە.

## دواوتە:

کاروانی بەرەوئیسـلام بەردەوامـەو هـەردەم هـەواڵی نـوێ بلاودەکرێتـەوە لەوبارەیـەوە، لـە ئەنتەرنێت و گۆڤارو ڕۆژنامەکان و کەناڵە ئاسمانیەکان دا، لەم زنجیرەیەدا ئەوەندە بەسەو، ئەوەی گرنگەو جێی دڵخۆشیە و زۆر زۆر سوپاسی خوای لەسەردەکەم ئەوەیە کە بەهـەزاران نوسـخەی بـەرەو ئیسـلام بـە کوردسـتان و دەرەوەیـدا بلاوبۆتـەوەو لەسـایەی خـواوە لـە هـەموو چین و توێژێکیش سوودیان لێوەرگرتووە ..

زۆر لەوتاربێژە بەڕێزەکان لەوتاری هەینیدا بۆ هەزاران نوێژ خوێنیان باسـکردووە، لاوانـیش بەتایبەتی زۆر تامـەزرۆین، ڕۆژێـك لـە کتێبخانـەی رۆشـنبیر لاوێکم بینـی کـە قوتـابی پـۆلی چوارەمی ناوەندی بوو، هەموو نووسراوەکانی بەندەی خوێندبۆوە کـە پسـیارم لێکـرد دەربـارەی زنجیرەی بەرەو ئیسلام کە تاکوێ سوودی لێبینیوە؟؟ وتی: خۆزگـە هـەموو ڕۆژێـك و بـەرگێکی بەرەو ئیسلام دەرچووایە!

## پێشەکی:

سوپاس وستایش بۆخوای پەروەردگارو درودو سەلامیش لەسەرگیانی سەرداری پێغەمبەران و یارو یاوەران.

ئازیزان و دۆستانی زنجیرەی بەرەو ئیسلام، وا لەم بەرگی نۆیەمەدا بە ئێوەی بەڕێز دەگەینەوە بۆ کۆمەڵێك باس و خواسی ئیمانی و ئیعجازی نوێی قورئان و سوننەت و موسڵمانبوونی بەردەوامی خەڵکی لەهەموو لایەکی دنیاوە کە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پاشەڕۆژ بۆ ئیسلامە ..

لە ڕاپۆرتێکی پێگەی(سی ان ان)دا هاتووە کە لە دوانزە ساڵدا ۱۲۰۰ مزگەوت لە ئەمریکادا دروست کراوە، واتە ساڵی سەد مزگەوت، دیارە ئەمەش بەهۆی ئەو ژمارە زۆرەی ئەمریکیەکانەوەیە کە موسڵمان دەبن کە ساڵانە زیاترە لە بیست هەزارکەس.

لێکۆڵەران دەڵێن: ئەوانەی موسڵمان دەبن دەبنە بانگخوازو باوك و دایك و ژن و منداڵ و خوشك و براو هاوەڵیان بانگ دەکەن بۆ ئیسلام، ئەمە بێجگە لەوەی کە وازدەهێنن لە مەی و هەموو ئەو شتانەی کە خوویان پێوەگرتووەو هەموو هەم و غەمیان دەبێت بەوەی کە خوا لە خۆیان ڕازی بکەن.

ئیسلام ئاینی فیترەتە بۆیە ئاوا لە هەموو لایەکەوە خەڵکی دەستە دەستە دێن بەرەو لای، قورئان دەفەرموێت: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الروم: ۳۰

یەکێ لەوانەی موسڵمان بووە دەڵێت: من کەموسڵمانبووم وا هەست ناکەم لە ئاینێکەوە چووبم بەرەو ئاینێکی تر، بەڵکو هەست دەکەم هاتووم بەرەو ئاینێکی ئاسایی کە بۆ مرۆڤایەتی هاتووەو گرنگی تەواو ئەدات بە جەستەوگیان.

لێکۆڵەری ئافرەتی بیانی (کارین ڤین نیوکیرك) لە پەڕاوە تازەکەیدا (ئافرەتان موسڵمان دەبن) دەڵێت: (ئافرەتان زیاتر دێن بەرەو ئیسلام لەبەرئەوەی دادپەروەریو ڕێزو کەرامەتی تیادەبینن).

قوتابیەکی زانکۆ لە بەریتانیا دیراسەی ئیسلامی کردو ویستی موسڵمان ببێت، هاوەڵێکی زۆر هەوڵی دا پەشیمانی بکاتەوە و داوای لێکرد کە مانگێك مۆڵەتی بدات تا

دیراسەی ئیسلام بکاو هەموو ناتەواوی و کەم وکوڕی‌یەکانی بخاتە بەردەم کە گوایە ئاینێکی تیرهاب و تۆقێنەرە ..ئنجا بەگەرمی کەوتە خوێندنەوەو دیراسەکردن سا بەڵکو ناتەواوی بدۆزێتەوە، جا نەك هەر هیچی نەدۆزی‌یەوە، بەڵکو موسڵمانیش بوو و، هاتەوە لای هاوەڵەکەی و وتی: من ویستم لە ئیسلامت دوور بخەمەوە کەچی بۆم دەرکەوت کە ئیسلام ئەوە نیە کە لەڕاگەیاندنەکانی ڕۆژئاوادا باسدەکرێت و بۆم دەرکەوت کە ئیسلام ئاینێکی هەقەو لە خواوە هاتووە بۆ مرۆڤایەتی و، وا پێش تۆ موسڵمان بووم.

## سکرتێری تایبەتی پاپا وریایی دەدات لە موسڵمانبوونی ڕۆژئاوا:

(جۆرج جاینزفاین)ی سکرتێری تایبەتی پاپا بەندێکتی شازدە، وریایی دا بە ڕۆژئاوا بەوەی کە وەسفی کرد بە (موسڵمانبوونی ڕۆژئاوا)و وتی نابێت ڕۆژئاوا هیچ کەمتەرخەمی و چاو نوقاندنێك بنوێنێت سەبارەت بە هێنانە ناوەوەی قیەم و بەهای ئیسلامی بۆ ڕۆژئاوا کە دەگونجێت هەڕەشە لە ناسنامەی ئەم کیشوەرە بکات.

جۆرج جاینزفاین سکرتێری تایبەتی پاپا لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ گۆڤاری (دۆیچە سایتۆنگ)ی ئەڵمانی دا وتی:

(نابێت لە هەوڵی بە ئیسلام کردنی ڕۆژئاوا بێ ئاگا بین و، ڕۆژئاوای وریا کردەوە پشتگوێ خستن و گوێ نەدان بە هێنانە ناوەوەی تەعالیم و بەها ئیسلامی‌یەکان بۆ ڕۆژئاوا کە بە پێی گومانی ئەو دەکرێت هەڕەشەیەك لەسەر ناسنامەی ڕۆژئاوا دروست بکات).

هەروەها جاینزفاین بەرگری لە قسەکەی ساڵی ڕابردووی پاپا کرد کە باسی لەوە کردبوو گوایە ئیسلام بە توندوتیژی بڵاوبۆتەوە، ئەو قسانەی کە شەپۆلێکی توندی نارەزایی لە جیهانی ئیسلامدا خولقاند.

ساڵی ڕابردوو پاپای ڤاتیکان بەندێکتی شازدەیەم لە وتارێکدا لە یەکێك لە زانکۆکانی ئەڵمانیا وتی: ئیسلام ئایینی توندوتیژی‌یە و بە زەبری شمشێر بڵاوبۆتەوە و، ئەمە بێجگە لەوەی قسەی نەشیاو و بێجێی بەرامبەر بە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ کرد.

لــه ڕوویــەکی تریشــەوە ئەســقەفی شــاری کــوێلنی ئــەڵمانیا یــواکیم مینمــەر لــە چاوپێکەوتنێکدا کە لەم دواییانەدا بڵاوکرایەوە وتبووی: (کۆچکردنی موسڵمانان کەلێنێکی لـە ڕۆشنبیری ئەڵمانی و ئەوروپیماندا دروستکردووە).

ئەم قسە و ڕووداوانە میسداقیەتی ئازادی بڵاو بوونەوەی بیروڕا لە ئەوروپا لە داهاتوودا دەخەنە ژێر پرسیار.

## ئیسلام خێراترین ئایینە لە بڵاوبوونەوەدا:

(کۆندالیزا ڕایس)ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ کەناڵی (الحرة) وتی: ((ئیسلام لە خێراترینی ئەو ئایینانە دەژمێردرێت کە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بڵاودەبێتەوە)) و وەسفی ئیسلامی کرد بەوەی: (بەشێکە لە نەسیجی ڕۆشنبیری ئەمریکی).

لە وڵاتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکادا ژمارەیـەکی زۆر لـە موسـڵمانان دەژیـن و چـەندین ڕێکخـراوو دامــەزراوەیان هەیــە، کــە بــە پێــی ســەرژمێری حکومــەت لــە (٣%) ی ڕێــژەی دانیشتووانی ئـەو وڵاتـە پێـك دێـنن واتـە (٦) بـۆ (٧) ملیـۆن کـەس دەبـن. بـەڵام ڕێکخـراوە ئیسلامییەکان دەڵێن ژمارەی موسڵمانان دەگاتە ١٠ملیۆن کەس. دوای ڕووداوی سـێپتەمبەری (٢٠٠١) موسـڵمانانی ئـەو وڵاتـە تووشـی زۆرێـك تەنگوچەڵەمەو جیاکـاری هـاتوون لەلایـەن دەزگاکانی پۆلیس و حکومەتی ئەو وڵاتە.

## موسـڵمانبوونی دوو سـەرباز:

هاوکات لەگەڵ لێدوانەکەی ڕایسدا ڕۆژنامەیەکی ئەفغانی لە (٢٠٠٧/٧/٢٦) ڕایگەیاند کە دوو سەربازی ئەمریکی بوونەتە موسڵمان و ژنیان لە ئەفغانستان هێناوە.

کەسانێکی زۆر لە ڕۆژئاواییەکان کاتێك سەردانی ئەفغانسـتان دەکـەن، موسـڵمان دەبـن. بەڵام ئەمە یەکەم جارە کە سەربازی ئەمریکی ئیسلامەتی خۆیان ئاشکرا بکەن.

شایەنی باسە کە ساڵی پاریش لـە کوردسـتان (٣٧) سـەربازی کۆریـای باشـوور لـە شـاری هەولێر ئیسلامەتی خۆیان ئاشکرا کرد و بوونە موسڵمان.[1]

---

١- لە (ئیسلام ئۆن لاین)ەوە.

# ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام:

دوژمنان بۆ ئەوەی ڕێ لەم بڵاوبوونەوەیە بگرن، هەموو هەوڵێکیان خستۆتە گەڕ، بۆ نموونە لە چاوپێکەوتنێکی سەرۆکی ئەمریکی لەگەڵ کەسایەتی مافناسی میسری (هیشام قاسم) کە جائیزەی ئەمریکای درایە لە بواری مافی مرۆڤدا لە کۆشکی سپی، سەرۆك بۆش پێی وت: (ئیخوان موسلیمین) بەتواناترین هێزی سیاسین لە میسردا لەگەڵ ئەو هەموو دژایەتییەی کە دەکرێن، باری ئابووری و گەندەڵی حکومەت وادەکات کە خەڵکی لە هەڵبژاردندا دەنگیان پێبدەن، بۆیە ئەمریکا ساڵی دوو ملیار دۆلار ئەدات وەك یارمەتی بە وڵاتی میسر بۆ ئەوەی ڕێ بگرێت لە هاتنە پێشەوەی ئیسلامیەکان و نەیەڵێت دەوڵەتێکی ئیسلامی دابمەزرێت.[1]

جێگری ڕابەری گشتی برایانی موسڵمان دەڵێت: حکومەتی میسری ڕێی بە بیست کاندیدی ئێمە داوە لە بەرامبەر پەنجاو دوو هەزار کاندیدکراوی خۆی بۆ هەڵبژاردن.[2]

لەناو میسریشدا هەوڵەکان بەردەوامن بۆ هەمان مەبەست، بۆ نموونە ملیاردێری قیبتی میسری (نجیب ساویرس)کەخاوەنی (١٠)ملیار دۆلارەو دەوڵەمەندترین کەسی میسرەو خاوەنیکەناڵی (ئۆ تی ڤی)یە، نارەحەتی خۆی دەردەبڕێت لە دیاردەی بڵابوونەوەی باڵاپۆشی لە میسرداو دەیەوێت لە ساڵی ٢٠٠٨ دا دوو کەناڵی فەزایی تر دابمەزرێنێت یەکێکیان بۆ هەواڵ و ئەوی تریشیان بۆ فیلم، سا بەڵکو بتوانێ ڕێ لە باڵاپۆشی بگرێت .[3]

لەزۆر لاشەوە دەیانەوێت کە ئەمریکا زیاتر هان بدەن لەسەر ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام، بۆ نموونە نووسەری ئەمریکی (مارك ستاین) لە پەڕاوەکەیدا (نهاية العالم كما نعرفها) دەڵێت: (داهاتوو بۆ ئەوانەیە کە وەچەی زۆریان دەبێت و متمانەیان بە خۆیانە، ئەم دوو سیفەتەش لە موسڵماناندا هەیە، لەبەرئەوەی کە ڕۆژئاوا ئەو دووسیفەتەی تیانییە سەرەنجامیان نەمانە .

---

١-(المجتمع ژ١٧٧٤ لە ٢٧/١٠/٢٠٠٧).

٢- (ڕۆژنامەی "حياة"ی لەندەنی٢١/٣/٢٠٠٨).

٣- (المجتمع)

هەروەها داوا لە ئەمریکا دەکات فریای خۆی بکەوێت ئەگینا لەدەنگی بانگی بلندگۆی مزگەوتەکانی ئەمریکا خەبەریان دەبێتەوە و، ئەگەر ئەوروپاش یەکنەگریّ بۆ دژایەتی ئیسلام ئەوە بەتەنها ئەمریکا دەمێنێتەوە بۆ ئەو ڕێگرتنە). شایانی باسە (محافظ)ەکانی ئەمریکا داوا لە ئەندامەکانیان دەکەن کە هەموو ئەو پەڕاوە بکڕن و بیخوێننەوە.[1]

هەواڵەکان هەموو جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە ئیسلام بە خێرایی بڵاودەبێتەوە بۆنموونە:

١- وەزارەتی دادی بولغاری بەنیازە مزگەوت لە چەند بەندیخانەیەکیدا دروست بکات بۆ ئەو بەندکراوانەی کەلە بەندیخانەدا موسڵمان دەبن و، هەڵسوکەوتیان دەگۆڕدرێت ولێیان ڕازین.[2]

٢- وەزارەتی بەرگری نەمساوی بڕیاری دا کە دوو ئیمام دابمەزرێنیّ لە سوپاکەیدا بۆ ئەو سەربازە موسڵمانانەی کە لە سوپاکەیدان، کەژمارەیان زیاترە لەهەزارکەس .

شایانی باسە موسڵمانان لە نەمسادا نزیکەی ٤٠٠ هەزار کەس دەبن و ٥٪ی کۆی دانیشتوانی نەمسان و هەموو کۆبونەتەوە لەژێر ئاڵای ڕێکخراوێکی ئیسلامیدا کە پرۆفیسۆر ئەنەس شەقفە ڕابەرایەتیان دەکات .[3]

٣- مۆرۆ بیرگر دەڵێت: بڵاوبونەوەی ئیسلام بە ئاسانی و بە خێرایی لە ئەفریقادا تۆقانوینی!! (ملتقى المهندسين العرب-اعداء الاسلام في لحظات الصدق).(یاڕەبی بتۆقن)!

٤- ڕۆژهەڵاتناسی ئەمریکی وك سمیث دەڵێت: ئەگەر موسڵمانان ئازادیان بدرێتیّ و نیزامی دیموکراتی حوکمیان بکات ئەوا ئیسلام سەردەکەوێت لە وڵاتەکانیاندا، تەنها بە دیکتاتۆریەت دەتوانرێت گەلانی موسڵمان لە ئاینەکەیان دووربخرێنەوە .[4]

ئەمەشە وایکردووە گەندەڵترین و بوو دەڵەترین حکومسات هەبیّ لە وڵاتە ئیسلامیەکانداوغەربیش پشتگیریان بکات، دیارە ئەمەش قۆناغێکەو تا سەر ئاوا بۆیان

---

١- (المجتمع ژ١٧٨٤ /٢٠٠٨/١/١٢).

٢- (المجتمع ژ١٧٨٦ ژ٢٠٠٨/١/٢٦) .

٣- (المجتمع ژ ١٧٨٥ لە ٢٠٠٨/١/١٩).

٤- هەمان سەرچاوە .

نالوێت، وا ئێستا کۆمەڵێك کەسیژیر داوا لە غەرب دەکەن کە ئیتر پاڵپشتی ئەو گەندەڵچیانە نەکەن و مامەڵە لەگەڵ ئیسلامیەکاندا بکەن کە جەماوەر ئەوانیان دەوێت.

٥- سەرۆکی مەجمەعی (قدیس اثناسیوس) ماکس میشیل داوای لە هەموو مەسیحیەکانی جیهان کرد کە هاوکاریان بکەن بۆ ڕاگرتنی چوونی قیبتیەکان بەرەو ئیسلام لەمیسرداو وتی: ئەگەر بەو ڕێژەیە قیبتیەکان بچن بەرەو ئیسلام مەسیحیەك لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا نامێنێت.[١]

٦- لە ساڵی ١٩٦٨ دا یەکەم مزگەوت لە بەلجیکا دروستکراو ئێستا ژمارەی مزگەوتەکان گەیشتۆتە ٣٨٠ مزگەوت و ژمارەی موسڵمانان ٤٥٠هەزار کەس دەبێ لەکاتێکدا ژمارەی دانیشتوان هەمووی دە ملیۆن کەسە.

خەبیری بەلجیکی نولیفی سرفی لە ڕۆژنامەی (لیبر بلجیك) لە١٣-٣-٢٠٠٨دا دەڵێت: (ئەگەر کۆچکردن ئاوا بەردەوام بێت بۆ بەلجیکا ئەوا لە ٢٠٢٨ دا موسڵمانان دەبنە زۆرینەی برۆکسلی پایتەختی بەلجیکا).

ڕێکخراوی ڕاگرتنی بلاوبوونەوەی ئیسلام ویستی خۆپیشاندانێك بکات دژی موسڵمانان، عومدەی برۆکسل ڕێی پێنەدان.[٢]

٧- وڵاتی سعودیە هاوکاری موسڵمانانی کۆریای باشووری کرد کە یەکێتی موسڵمانانی کۆریای باشوور دابمەزرێنن و بەردی بناغەی یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی ئیسلامی دابنێن.[٣]

٨- بان کیمۆن سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای ڕێگری کرد لە دژایەتی کردنی ئیسلام و وتی: زۆر لە موسڵمانانیش قوربانی دەستی تیرۆرن.[٤]

٩- بەیارمەتی کۆمەڵەی بانگەوازی جیهانی لە شاری کیجالی پایتەختی ڕوەندا لە مانگی ئازاری٢٠٠٨ دا یەکەم ڕادیۆی ئیسلامی دامەزرا.[٥]

---

١-(سایتی: طریق الایان).

٢- ئیسلام ئۆن لاین.

٣-(سایتی یەکگرتوو)

٤- هەمان سەرچاوە .

٥- هەمان سەرچاوە .

## موعجیزەی قورئان :

١ - ﴿ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ ۚ قُلْ إِنَّ اللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰ أَن يُنَزِّلَ آيَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴾ الأنعام: ٣٧ - ٣٨ كافرەكان داوای موعجیزەو بەڵگەو نیشانەیان دەكرد، خوای گەورەش (هەرچەند دەتوانێت هەر موعجیزەیەكی بوێت بینێرێت) سەرنجیان ڕادەكێشێت بۆ ئەوهەموو ئایەت و بەڵگەو نیشانە زۆرانەی دەوروبەریان، بەتایبەت گیانلەبەران، كە هەرچەند زانست پێش بكەوێت و دیراسات بكرێت زیاتر ڕاستێتی ئەم ئاماژە قورئانیەمان بۆ دەردەكەوێت، كە گیانەوەران و باڵندەكانیش وەك مرۆڤ ئومەتن و نیزام و بەرنامەی تایبەتی خۆیان هەیە، بۆ نموونە:

أ- (گراهام كوری) دووساڵ دیراسەی هاتوچۆوی مێروولەی كردو بۆی دەركەوت كەڕێگایەكی خێرا هەیە ئەو مێروولانەی پیادەڕۆن كە كاریان ڕێكخستنی هاتوچۆیەو، ڕێگایەكی تریش هەیە كە ئەو مێروولانەی پیادەڕۆن كە باریان پێیە، لەم لاو ئەو لاشەوە ڕێگای تر دیاری دەكەن بۆ هاتوچۆی ئەو مێروولانەی كەباریان پێ نییە.

زانایەكیش دیراسەی مێروولەی كرد بۆی دەركەوت كە ئیش دابەش دەكەن و هەندێكیان خەریكی پاسەوانی و هەندێكیان خەریكی بەخێوكردنی بێچووەكان و هەندێكیشیان خەریكی پەیداكردنی خۆراكن و...هتد، ئەو زانایەش هەر كۆمەڵەو ڕەنگێكی تایبەتی‌كردن، پاش دوو هەفتەیەك بینی كارەكان لە نێوان خۆیاندا دەگۆڕنەوە تاهەمووان لە هەموو بوارێكدا شارەزابن .

هەروەها قورئان لەبارەی خانوو مەسكەنی مێروولەوە كە زۆر وردەكاری ئەندازیاری تیایەو حسابی هەوا گۆڕكێ و حسابی زستان و هاوینی تیا دەكات دەفەرموێت: ﴿ حَتَّىٰ إِذَا أَتَوْا عَلَىٰ وَادِ النَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾النمل: ١٨ (مَسَاكِنَكُمْ) نافەرموێت (كهوفكم)و (أوكاركم)، چونكە وشەی (مَسَاكِنَكُمْ) پڕ بە پێستێتی و بەڕاستی مەسكەنە، زانایانیش جەخت دەكەنە سەر

بلیمەتی و وەستایی مێروولە لە بواری بیناکردندا کە سەد قات زیاترە لە تواناکانی مرۆڤ بەبەراوردکردنی قەبارەی مێروولەو مرۆڤ و دەڵێن: (إن المهارات التي يتمتع بها النمل من حيث بناء وهندسة البيوت تجعله يتفوق على الإنسان، قياساً لحجم النملة، فإن النملة أقوى من الإنسان بمئة مرة على الأقل).

دکتۆرBill Hughes لێکۆڵینەوەیەکی پێشکەش بە ئەکادیمیای نیشتمانی بۆ زانست کردکە تیایدا پاش لێکۆڵینەوەی زۆر بۆی دەرکەوت کە هەندێ مێروولەش وەك مرۆڤ فڕوفێڵ و حەسەدیان هەیەو شەڕدەکەن لەسەر رزق و ڕۆزی. جا ئایا ئەمە تەسدیقی قورئانە یان نا؟؟ کەسێك چواردە سەدە لەمەوبەر لە کوێ ئەم ڕاستیەی زانی کە ئەوەتا پاش هەوڵ و کۆششی زۆری دەیەها زانا و پاش خەرج کردنی پارەیەکی زۆر ئنجا ئاشکرا دەبێت کە ئەوانیش ئومەتن وەك مرۆڤ.[1]

ب- خوای پەروەردگار بەرنامەیەکی تایبەتی بۆ هەنگ داناوە تا هەردەم ئەو هەنگوینە بەرهەم بێنێ کە شیفایە، هەروەك دەفەرموێت:﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾النحل: ٦٨ – ٦٩، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (عليكم بالشفاءين: القرآن والعسل)[2]. زانایان تا ئێستا چی دیراسەیان لەسەر هەنگوین کردووە هەمووی ڕاستێتی ئەم ئایەتە دەسەلمێنن کە هەنگوین شیفایە .

دکتۆر گلینس راوند پسپۆڕ لەبواری شێرپەنجەدا پاش تاقیکردنەوەو دیراساتی زۆر بۆی دەرکەوت کە هەنگوین چارەسەرە بۆ شێرپەنجەی پێست. هەروەها چارەسەرە بۆ قورحەی گەدەو قوڕقوڕاگە.

---

١-(پێگەی عبد الدائم كحيل – عجائب الحشرات).

٢- رواه ابن ماجه.

لەدیراساتی تریشدا ماددەیەکی تریان تیادۆزیوەتەوەکە دژی (التأكسد)ەو سوودی هەیە بۆ کۆلیسترۆڵ و لەنامەیەکی دکتۆرای زانکۆی قناە لەم ساڵدا ٢٠٠٨لە میسر هاتووە کە هەنگوینی چیا سوودی هەیە بۆ دڵ و بۆرییە خوێنەکان.[١]

دکتۆر مۆلان دەڵێت: هەنگ بە هۆی ئەنزیماتی‌تایبەتەوە ماددەی هایدرۆجین پیرۆکساید دروست ئەکات کە (معقم) و (مطهر)ەو هیچ ماددەیەك نیەوەك هەنگوین (معقم) بێت.

هەروەها زانایان بۆیان دەرکەوت کە جاری واهەیە هەنگ ڕێی دەکەوێت لە هەندێك خواردنی خراپ کە دەبێتە مایەی سەرخۆشکردنی هەنگەکە بۆ ٤٨ سەعات، جا کاتێك ئەو هەنگە سەرخۆشە دەگەڕێتەوە بۆ کوورەکەی، هەنگەکانی تر یەکسەر دەزانن کە سەرخۆشەو نایەڵن داخڵ ببێ و بچێ بەلای شانەی هەنگوینەکانداو پیسیان بکات، جا ئەگەر هەنگێك ئەمەی دووبارە کردەوەو ویستی بێتە ژوورەوە قاچی دەشکێنن.

٢- پێش زیاتر لە چواردە سەدە قورئان دەفەرموێت ڕۆح سرێکە لە خواوەو مرۆڤ زانستێکی زۆر کەمی پێدراوە لەو بوارەدا ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾الإسراء: ٨٥

ئەمەش ئەگەر خوا فێری حەزرەتی نەکردبێت چۆن ئەتوانێ باس لە شتی وابکات، ئەوەتا پاش هەزارو چوارسەد ساڵ زیاتر هەمان پرسیار دەکرێ، ئاخۆ لەنهێنی ڕۆح تێبگەین؟؟ ئاخۆ دەتوانرێت بە کارلێکی کیمیایی یان هەر شتێکی تر خانەیەکی زیندوو دروست بکرێت؟؟

لە ٢٦ فیبرایری ٢٠٠٨ دا گۆڤاری دەیلی مەیڵ وتارێکی بڵاوکردەوە بەناونیشانی (Life's Still One Big Secret) کە باس لەوە دەکات زانایانی زانکۆی ئەدنبەرە لە بەریتانیا بەهۆی سوپەر کۆمپیوتەرەوە کە بایی ٢٠ ملیۆن دۆلارە هەشت ساڵ دیراسەیان کرد، سەرەنجام دەستەوسانی خۆیان ڕاگەیاند بەرامبەر بە سیری ڕۆح ودروستکردنی خانەی زیندوو.[٢]

٣- دکتۆر تەها ئیبراهیم خەلیفە مامۆستای ڕووەکی پزیشکی‌ودەرمان لە زانکۆی ئەزهەر دەڵێت: ماددەی (میثالویثونیدز) ماددەیەکی پرۆتینیەوکبریتی تیایە وبە ئاسانی یەکدەگرێت لەگەڵ زینك و ئاسن وفسفۆرداو زۆرگرنگە بۆ لەش، تیمێکی زانا یابانیەکان

---

١- (ڕێگەی مەوسوعەی ئیعجازی عیلمی قورئان و سوننەت).

٢-(ڕێگەی عبدالدائم الكحيل).

کەوتنە گەڕان بەدوای ئەم ماددەیەداو لە هەنجیرو زەیتون دا دۆزیانەوە و باشترین ڕێژەش ئەوەیە کە زەیتونەکە حەوت ئەوەندەی هەنجیرەکە بێت .

دکتۆر تەها سەیری کرد قورئان شەش جار ناوی زەیتوونی بردووە و جارێکیش ئاماژەی بـــۆکردووە کەدەفــەرموێت: ﴿ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ ﴾ المؤمنون: ٢٠. یەك جاریش باسی هەنجیری‌کردووە.

کاتێك دکتۆر تەها ئەم باسەی نارد بۆ تیمە یابانیەکە، سەرۆکی تیمەکە موسڵمان بوو،(براءة الاختراع)یشیان دا بە دکتۆر تەها.[1]

٤- خوای پەروەدگار سوێند دەخوات بە (التين) و(الزيتون) و (طور السنين) و (البلد الامين) لەسەر ئەوەی کە مرۆڤی لە باشترین شێوەدا دروستکردووە:﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴾التين: ٤.

نموونەش لەسەر ئەم ڕاستیە: زانایانی زانکۆی (دیوك)ی ئەمەریکی پاش دیراساتێکی زۆر ڕایانگەیاند کە ڕیخۆڵە کوێرە کە چەندەها ساڵە وادەزانرێت زیادەیەو هیچ کارێکی نیە، وانیەو کاری مەزنی هەیەو خوای پەروەردگار بەزیاد دروستی نەکردووە، کارەکەشی ئەوەیە کە بەرپرسە لە بەرهەمهێنان و هەڵگرتنی کۆمەڵێکی زۆر لە بەکتریاو جراپیم کە بەسوودن.

جالەکاتی هەندێ نەخۆشی و سکچووندا کە بەکتریاو جراپیم ی ناو ڕیخۆڵە نامێنن، ئەوا ڕیخۆڵە کوێرە فریای لەش دەکەوێو بەکتریاو جراپیم ی بەسوودی ئەداتێ.[2]

٥- قورئانی پیرۆز زۆر و کەمی مەی حەرام کردووەو دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ، إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ

---

١- (منتديات اذكر الله).

٢-(موسوعەی ئیعجازی عیلمی قورئان و سوننەت).

ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾المائدة: ٩٠- ٩١. هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ما أسكر كثيره فقليله حرام﴾[١].

جاران هەندێ کەس دەیانووت مەی کەمێکی هیچ زیانێکی نیە، تا دکتۆرە سارا لویس لەزانکۆی بریستۆل وکۆمەڵێك لێکۆڵەری تر سەلماندیان خواردنەوەی کەمێکی مەی زیانبەخشەو کاریگەری بۆ دەیەها ڕۆژ دەمێنێت لەسەر لەش، ڕەنگە ئەمەش هۆیەکی ئەوە بێت کە حەزرەت ﷺ دەفەرموێت: ئەوەی مەی بخواتەوە تا چل ڕۆژ نوێژی لێوەرناگیرێ .

هەروەها با ئەوەشمان لە یاد بێت کە دەفەرموێت: خوا چارەسەری ئێوەی نەخستۆتە ئەو شتانەوە کە لەسەری حرم کردوون ﴿ إن الله لم يجعل شفاءكم فيما حُرم عليكم ﴾[٢].

هەروەها دەفەرموێت: (إن الله أنزل الداء والدواء وجعل لكل داءٍ دواءً فتداووا ولا تداووا بمحرم) [٣]. وقد سئل الرسول الكريم ﷺ عن التداوي بالخمر فقال: (إنه ليس بدواء ولكنه داء)[٤]

دکتۆرەکانی جەمعیەی بەریتانی دڵ جەخت دەکەنە سەرئەوەی کە هەرگیز مەی دەرمان نیە وئەمەش هەمان فەرموودەکەی حەزرەتەو لە سەدەی بیست و یەکدا ئەوان دەیگەنێ، ئەمەش دەقی قسەکەیان: * However alcohol should not be used as a medicine and those who are teetotal do not need to start consuming alcohol to benefit their heart health.

کە ئەمەش دیارە هەر خوا فێری کردووە ئەگینا لە کوێ دەزانێت مەی دەرمان نیەو دەردە وشیفا لەو شتە حەرام کراوانەدا نیە و پاش دیراسات ولە دوای زیاتر لە چواردە سەدە زانایان هەمان قسەدەکەن؟؟ [٥]

٦- قورئان وردەکاریەکی زۆری دەکات لە هێنانی هەر وشەیەیکدا، بۆ نموونە:

---

١- رواه الترمذي.

٢- صحيح - ابن حبان

٣- رواه أبو داوود.

٤- رواه مسلم.

٥- سايتى عبدالدائم الكحيل .

أ- كاتێ زەید فەزڵی پێغەمبەری ﷺ دا بەسەر باوك و كەس و كاریداو لای مایەوە،ئەویش وەك وەفایەك كردی بەكوڕی خۆی، دەوترا زەیدی كوڕی محمد، كە خوای گەورە عادەتی(تبني) هەڵوەشاندەوە، فەرمووی ئەمە باشترەو عەدالەت ترە لای خوا(ذلك أقسط عندالله) واتە: ئەوەی تۆش باش بوو بەڵام ئەمە باشترە بۆتان ئەمەش وەك ڕێزێكە بۆ كارەكەی پێغەمبەرﷺ.

ب-كاتێك قورئان باسی حەزرەتی‌موسا دەكات سەلامی خوای لێبێت دەفەرموێت لەلای ڕاستی كێوی گور خوای گەورە وەحی بۆنارد ﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا﴾ مريم: ٥٢

﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ﴾ طه: ٨٠

لەبەر ئەوەی (يمين)ماناى (بەرەكەت) هەڵدەگرێ، كەدێتە سەر باسی ئەوەی كە ئەمانەی بۆ پێغەمبەرﷺ هاتووە لە خواوەیەو خۆ پێغەمبەر ﷺ لەوێ نەبووەوئەو ڕووداوەی نەبینیوە، نافەرموێ لەلای ڕاستی كێوی طور نەبویت نەك بەرەكەتدارنەبوونی لێبخوێندرێتەوە، بەڵكو دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلۡغَرۡبِيِّ إِذۡ قَضَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلۡأَمۡرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ القصص: ٤٤

﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذۡ نَادَيۡنَا وَلَٰكِن رَّحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ﴾ القصص: ٤٦.

نموونەم زۆر باسكردووە لەنووسراوەكانمدا، تكایە لە شوێنی خۆیدا سەیری بكەن، داواكارم كە وردبنەوە لە قورئان وگرنگی بدەن بەو نووسراوانەی كە لەو بوارەدا نووسراون یەتایبەت (لەخزمەت قورئان دا)و(ڕامان لە قورئان)و (ژیانەوە) و(بەهاری دڵان) و(ڕازی قورئانی).

ج- خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَيَأۡبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ، هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾التوبة: ٣٢ - ٣٣، هەروەها دەفەرموێت:

﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ، هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ﴾ الصف: ٨ - ٩

يُرِيدُونَ أَنْ يُطْفِئُوا : ئەیانەوێ نووری خوا بکوژێننەوە ئێستاو لە داهاتووشدا.

يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا: بەدوای هۆکاردا دەگەڕێن کە نووری خوای پێ بکوژێننەوە.ئنجا (يُطْفِئُوا ) کە مانای کوژانەوەی ئاگرە کەم بێت یان زۆر بەکاردەهێنێت لەجیاتی (يُخمدوا) کە مانای کوژانەوەی ئاگری زۆرە.

واتە: کافران بەردەوام لە هەوڵدان بۆ کوژانەوەی نووری ئیسلامەتی کەم بێت یان زۆر کە ئەمەش موعجیزەیەو خوانەبێت کێ دەزانێت دوژمنایەتیەکە بەردەوام دەبێت و هەموو هۆکارێکیش بەکار دێنن .

## موعجیزەی فەرمووده:

١- هەموودەزانین کە ئاو پاکەرەوەیەو، قورئانیش ئاماژەی بۆ کردووەو دەفەرموێت:

﴿ وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴾ الفرقان: ٤٨..

هەروەها داواکراوە موسڵمان بۆ نوێژکردن بە ئاو دەستنوێژ بشواو ئەگەر ئاویش نەبوو بە تۆزی گڵێکی پاك تەیەموم بکات .

هەروەها حەزرەت ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر سەگ دەمی خستە قاپێکەوە جارێك بە گڵ و شەش جاریش بە ئاو بیشۆن.ئەمەش لەبەرئەوەی کە ڤایرۆس و میکرۆب هەیە لە لیکی سەگەکەدا کە بە گڵەکە پاك دەبێتەوە .

لە فەرموودەیەکی تردا حەزرەت ﷺ دەفەرموێت: ﴿ جُعلت لی الارضَ مسجدا وطهورا ﴾ واتە زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت لە کوێدا بێت نوێژ دەکەم و هەروەها خاك و زەویشم بۆ کراوە بە پاکەرەوە . باشەحەزرەت ﷺ ئەگەر خوا ئاگاداری نەکردبێت چوزانێت گڵ پاکەو پاککەرەوەشە ؟؟

گۆڤاری (العالم الجديد) لە ساڵی ٢٠٠٦ دا لێکۆڵینەوەی زانا (جۆن وانگ)ی بڵاوکردەوە کە لە تاقیگەکانی شاری نیوجرسی کردبووی لە ئەمریکا لە سەرگڵ کە دەتوانرێت (ئەنتی بایوتیکی) لێدەربهێنرێت.

هەروەها دکتۆرە لیندا ولیامز جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە لە گڵدا زیاتر لە ماددەیەکی پاکەرەوە هەیە، تاقیکردنەوەکانیش سەلماندیان کە قوڕ دەتوانێت موستەعمەرەیەکی‌کامیلی جراثیم لە ٢٤ کاژێردا لە ناوبەرێت، کە ئەگەر ئەو قوڕە نەبێت لەو ماوەیەدا ٤٥ قات زیاد دەکات .

دکتۆر هایدڵ کەزانایەکی بواری (الاحیاء الدقیقة)یە دەڵێ: (ئێستا دەتوانین پەیوەندی نێوان زانستی زەوی و خانەی زیندوو بدۆزینەوە، تا ساڵێك لەمەوبەر من گڵم بە پیس دەزانی، بەڵام ئێستا بە مادەیەکی پاکەرەوەی دەزانم)..

پێش چەند ساڵێکیش ژنە دکتۆری فەڕەنسی (لین برینیت)لە قوڕی سەوزی فەڕەنسی چارەسەری نەخۆشی دۆزیەوەو وەك ئەنتیبایوتیك بەکاری هێنا لە کینیاو ساحل العاج و، ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیش سەرسامی خۆیان بەرامبەر دۆزینەوەکەی دەربڕی .

ئەمەش بەڕاستی میهرەبانی خوایەو حیکمەتی تیایە، لە هەموو دنیادا منالاَن یاری بەگڵ و خۆڵ دەکەن کە ئەگەر پیس بوایە نەخۆشی‌یەکی زۆر بلاَو دەبۆوە ..

٢- وتمان حەزرەت ﷺ ئاگاداری‌کردوینەتەوە لەلیکی سەگ و فێری کردوین کە ئەگەر دەمی خستە قاپێکەوە جارێك بە گڵ و شەش جاریش بە ئاو بیشۆین، کە ئەمەش بۆخۆی موعجیزەیە و کەس لەو سەردەمەدا هیچی لە بارەی میکرۆب و ڤایرۆسەوە نەزانیوە، ئەمەش بووە هۆی موسڵمانبوونی چەندەها کەس .

کەچی پشیلە کە هەروەك سەگە حەزرەت ﷺ بە پاکی دادەنێت، جارێکیان ئەیەوێت لە ئاوێك دەستنوێژ بشوات، پیێ دەڵێن: پشیلە دەمی تێخستووەو لیێ خواردۆتەوە، ئەویش دەفەرموێت: قەیناکە چونکە پیس نیەو پاکە﴿ انها لیست بنجس انها من الطوافین علیکم والطوافات ﴾[1].

پشیلە بەردەوام خۆی پاك دەکاتەوە بە زمانی کە زبری تیایە،دکتۆر گورگیس مقصود سەرۆکی بەشی تاقیگەکان لە خەستەخانەی بەیتەرەی دیمەشق دەڵێت: بەدەگمەن لەسەر فەرووی پسیلە جراپیم هەیە، ئەگەر ببێت ئەوە ئەو پشیلەیە نەخۆشە .

---

١- أحمد.

دکتۆره جین جۆستافسن دەڵێت: پاش بەراوردکردنی لیکی مرۆڤ و سەگ وپشیلە لە تاقیگەدا بۆمان دەرکەوت کە لیکی مرۆڤ یەك لەسەر چواری لیکی سەگ جراپیم ی تیایەو لیکیپشیلەش یەك لەسەرهەشتی لیکیسەگ (جراثیم)ی تیایە .

دکتۆر سعید ڕەفاه لە بەیتەرەی دیمەشق دەڵێت: ماددەیەکی پاکەرەوە هەیە لەلیکی پشیلەدا پێی دەوترێت (لیزۆزیم). ئەمانەش هەمووی بەڵگەی ئەوەن کە حەزرەت ﷺ لەخۆیەوە قسە ناکات ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ، إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٌ يُوحَىٰ ﴾ النجم: ٣ - ٤ ، حەزرەت ﷺ دەفەرموێت: ((نِعمَ الادام الخَلُ))[١] واتە: سرکە پێخۆرو خواردنێکی چاکە.پاش چوارده سەده و تاقیکردنەوەی زۆر زانایان جەخت دەکەنە سەر سوودەکانی سرکەو دەڵێن: سوودی هەیە بۆ سك چوون و گەدەو ڕیخۆڵەش پاك دەکاتەوە،کرداری هەرس کردنیش چالاك دەکات و (طفيليات)ی ڕیخۆڵەش لەناودەبات و، سوودی زۆرە بۆ چارەسەری هەوکردنی پووك و کلۆر بوونی ددان، بۆ نازاری جومگەش سوودی زۆری هەیە .[٢]

٤ - حەزرەت ﷺ دەفەرموێت: ((الفطرة خمس: الختان، والاستحداد، وقص الشارب، وتقليم الأظفار، ونتف الآباط))[٣]. خەتەنەکردن لە فیترەتەوەیە، ڕاستت فەرمووە ئەی مامۆستای مرۆڤایەتی، ئەوەتە پاش چوارده سەده ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی و بەرنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ چارەسەری ئایدز لە مارس ی٢٠٠٧ دا جەخت دەکەنە سەر گرنگی خەتەنە بۆ خۆپاراستن لە ئایدزو شێرپەنجە، کە تائێستا ئایدز زیاتر لە ٢٥ ملیۆن کەسی لە جیهاندا کوشتووە .

لە کۆنفرانسێکی جیهانی لەشاری سیدنی ئوسترالیا بۆ چارەسەری ئایدز کە ٥هەزار کەس بە نوێنەرایەتی ١٣٠ دەوڵەت بەشداریان تیاکرد جەخت کرایەوە سەرگرنگی خەتەنە بۆ خۆپاراستن وسنووردانان بۆ بڵاو بوونەوەی ئایدز.

---

١- مسلم.

٢- (پێگەی مەوسوعەی ئیعجازی عیلمی قورئان و سوننەت).

٣- بخاري.

له هیندستانیش مەجلیسی وەتەنی پزیشکی داوادەکات کە ئەو منالانەش کە موسلمان نین خەتەنە بکرێن، کە ئەمەش نارەزاییەکی زۆری لای هیندۆسەکان دروست کردووە.[1]

ئاشکرایە ئایدز لەولاتە ئیسلامیەکاندا زۆر کەمترە لەچاو ولاتانی تردا، کە ئەمەش گرنگی ئایین دەردەخات لەسەدەی بیست و یەکدا، بیرمان نەچێ کە ئیسلام هەمووی گونجاوە لەگەڵ فیترەتی مرۆڤداو هەمووشتێکی بۆ بەرژەوەندی مرۆڤە﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾الروم: ٣٠

٥- قورئانی پیرۆز جەخت دەکاتە سەر گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ ﴾محمد: ٣٣

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ النساء: ٦٥ ، هەروەها هەرچی پێغەمبەرﷺ حەرامی کات یان حەلاڵی کات هەر لەخواوەیەو ئەبێ بەگوێی بکرێت ﴿ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾الأعراف: ١٥٧

هەروەها پێغەمبەر ﷺ قورئان ڕاڤەدەکات و ڕوونی دەکاتەوە بۆ بڕواداران:﴿ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ النحل: ٦٤﴿ لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ

---

١- (ئیسلام ئۆن لاین).

ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾آل عمران: ١٦٤، دیاره قورئان پەڕاوەکەیەو حیکمەتیش سوونەت و فەرموودەکانێتی .

گوێڕایەڵی بۆ فەرمایشتەکانی حەزرەت ﷺ بەڵگەنەویست بوو، ئیمان و بڕوا بەبێ ئەوە دانەئەمەزرا، بەڵام لەسەدەی دووەمی کۆچییەوە بیرو بۆچوونێك سەری هەڵدا لەلایەن هەندێ ناحاڵیو ناحەزەوە کە هەرچی لە قورئاندا هاتبێ تەنها بەگوێی ئەوە دەکەن و، ئەگەر لەفەرموودەدا شتێك هاتبێ و لە قورئاندا نەهاتبێ وەری ناگرن، ئەمەش بۆ ئەوەی ڕوونکردنەوەی زۆر لە عیبادەتەکان وزۆر فەرموودەی تری حەزرەت ﷺ لە حەڵاڵ و حەرامدا پشت گوێ بخرێت .

ئێستاش هەندێ کەس وەك (محمد شحرور)و (ئەحمەد صبحی)ئەو بیرو بۆچوونە بڵاودەکەنەوە و پێگەی ئەلەکترۆنیان هەیەو بڵاوکراوەیان هەیە، زانایان ڕووبەڕوویان بوونەتەوەو هەق و ڕاستی هەردەم دەخەنە ڕوو تا موسڵمانان سەرگەردان نەبن .

سەرهەڵدانی ئەو دەستەو تاقمە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە، دیارە غەیبەو خوای گەورە ئاگاداری کردووە، هەروەك دەفەرموێت ﴿یوشك أن یقعد الرجل متكئا على أريكته، يحدث بحديث من حديثي، فيقول: بيننا وبينكم كتاب الله، فما وجدنا فيه من حلال استحللناه، وما وجدنا فيه من حرام حرمناه، ألا وإن ما حرم رسول الله مثل ما حرم الله﴾ [1]

(لا ألفين أحدكم متكئا على أريكته يأتيه الأمر من أمري مما أمرت به أو نهيت عنه فيقول: بيننا وبينكم هذا القرآن فما وجدنا فيه من حلال استحللناه وما وجدنا فيه من حرام حرمناه. ألا وإني أوتيت الكتاب ومثله معه، وإن ما حرم رسول الله ﷺ كما حرم الله تعالى) [2]

ڕاستت فەرمووە ئەی خۆشەویستی خوا، ئەوا ئێمە دوای زیاتر لە چواردەسەدە ئەو دەستەو تاقمە دەبینین،ئەگەر تەنها ئەم موعجیزەیەت هەبێ بەسە بۆ کەسێك بە عەقڵی خۆی بیرکاتەوەو تۆزقاڵێك ویژدانی هەبێت .

---

١- صحيح الألباني: صحيح الجامع.

٢- المحدث: ابن تيمية/المصدر: القواعد النورانية - الصفحة أو الرقم: ٢٤

هەیە بۆ کەسانی خواپەرست وبەندە ملکەچەکان، ئەی(محمد) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنهابۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت بۆهەموو جیهانەکان.

لە ڕێی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێتەوە گەڕام بەدوای﴿أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّـٰلِحُونَ﴾الأنبياء: ١٠٥ لە عەهدی قەدیمدا کەچل وشەش سیفرە، هەروەها گەڕام لە(عەهدی جدید)دا کە پێکهاتووە لە بیست و حەوت سیفر، هیچم نەدۆزییەوە تەنها ئەم تەعبیرە نەبێت لەئینجیلی(متى)دا کە دەڵێ:(طوبى للودعاء، لانهم يرثون الارض)..

ئینجا گەڕام بە زەبوری حەزرەتی داوودا سەلامی خوای لێبێت کە پێی دەوترێت (مزامیر داوود)،کە پێکهاتووە لە سەدو پەنجا(مزمار)،تەنها لە (مزمار)ی سی وحەوتەمدا ئەو باسە هاتووە، کە ئەگەر بتەوێت سەرباسێك بۆ ئەو بەشە دابنێی باشترین سەرباس ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێت﴿أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّـٰلِحُونَ ١٠٥﴾، خۆدیارە زەبوریش دەستکاری کراوە، بەڵام ڕەحمی خوا لەوەدایە کەئەم باسە بمێنێتەوە و دەستکاری نەکرێت و بەڵگە بێت لەسەر ڕاستێتی قورئان ...

تەورات و ئینجیل و زەبوریش نەك لەزەمانی حەزرەتدا ﷺ بەڵکو تادوای چەند سەدەیەکیش وەرنەگێڕدرابوونە سەر زمانی عەرەبی، کەواتە حەزرەت ﷺ چۆن ئەتوانێ ئاوا ئاماژە بکات بە باسێکی ناو زەبور و تائێستاش مابێت،دیارە خوای گەورە کە ئاگاداری هەموو شتێکی ئەم بوونەوەرەیە هەر ئەو ئاگاداری کردووە. ئەوەتا زەبوور دەڵێت:

(( ١- لا تَغَر من الأشرار، و لا تَحْسدْ عُمَّالَ الإثم.

٢- فإنَّهُم مثلَ الحَشيش سَريعاً يُقْطَعُون، و مثلَ العُشْبِ الأخْضَر يَذبُلُون.

٣- اتَّكلْ عَلى الرَّبِّ و افعَلِ الخَيْرَ.اسْكُنِ الأرْضَ و ارْعَ الأمانَة.

٤- و تَلَدد بالرَّبِّ فَيُعْطِيَكَ سُؤْلَ قَلْبِكَ.

٥- سَلِّمْ للرَّبِّ طَرِيقَكَ و اتَّكلْ عَلَيْه و هُو يُجْري.

٦- و يُخْرِجُ مثلَ النورِ برَّكَ، و حَقَكَ مثلَ الظَّهيرَة.

٧- انْتَظِر الرَّبَّ و اصْبِر لَهُ، و لا تَغَرْ منَ الَّذي يَنْجَحُ فِي طَرِيقِهِ، مِنَ الرَّجُلِ الْمُجْري مَكَايِدَ.

٨- كُفَّ عَنِ الغَضَبِ، و اتْرُكِ السَّخَطَ، و لا تَغَرْ لفِعْلِ الشَّرِّ.

٩- لأنَّ عامِلِي الشَّرِّ يُقْطَعونَ، والَّذينَ يَنْتَظِرُونَ الرَّبَّ هُمْ يَرِثونَ الأرْضَ.

١٠- بَعْدَ قَليلٍ لا يَكونُ الشِّرِّيرُ. تَطَلَّعُ فِي مَكانِهِ فَلا يَكُونُ.
١١- أمَّا الوُدَعاءُ فَيَرِثُونَ الأرْضَ، و يَتَلذذونَ فِي كَثْرَةِ السَّلاَمَةِ.
١٢- الشِّرِّيرُ يَتَفكَّرُ ضِدَّ الصِّديقِ و يُحَرِّقُ عَلَيهِ أسْنانَهُ.
١٣- الرَّبُّ يَضْحَكُ بِهِ لأنَّه رَأى أنَّ يومَهُ آت!
١٤- الأشْرارُ قَدْ سَلُّوا السَّيفَ و مَدُّوا قَوْسَهُمْ لِرَمْيِ المِسْكينِ و الفَقِيرِ، لِقَتْلِ الْمُسْتَقيمِ طَرِيقُهُمْ.
١٥- سَيْفُهُمْ يَدْخُلُ فِي قَلْبِهِم، و قِسِيُّهُمْ تَنكَسِرُ.
١٦- القَليلُ الّذي للصِّدِّيق خَيْرٌ مِنْ ثَرْوَةِ أشْرارٍ كَثِيرين.
١٧- لأنَّ سَواعِدَ الأشْرارِ تَنْكَسِرُ، و عاضِدُ الصِّدِّيقِينَ الرَّبُّ.
١٨- الرَّبُّ عارِفٌ أيَّام الكَمَلة، و مِيراثُهُمْ إلى الأبَدِ يَكُونُ.
١٩- لا يُخزَونَ فِي زَمَنِ السُّوءِ، و فِي أيَّامِ الجُوعِ يَشْبَعُونَ.
٢٠- لأنَّ الأشْرار يَهْلكُونَ، و أعْداءُ الرَّبِّ كَبَهاءِ المَراعِي. فَنُوا. كَالدُّخانِ فَنُوا.
٢١- الشِّرِّيرُ يَسْتَقرِضُ و لا يَفِي، أمَّا الصِّدِّيقُ فيَتَرَأفُ و يُعْطِي.
٢٢- لأنَّ المُبارَكِينَ مِنْهُ يَرِثُونَ الأرْضَ، و المَلْعُونِينَ مِنْهُ يُقْطَعُونَ.
٢٣- مِنْ قِبَلِ الرَّبِّ تَتَثَبَّتُ خَطَواتُ الإنْسانِ و فِي طَرِيقِهِ يُسَرُّ.
٢٤- إذا سَقَطَ لا يَنْطَرِحُ، لأنَّ الرَّبَّ مُسْنِدٌ يَدَهُ.
٢٥- أيْضاً كُنْتُ فَتىً و قَدْ شِخْتُ و لَمْ أرَ صِدِّيقاً تُخُلِّيَ عَنْهُ، و لا ذرِيَّةً لَهُ تَلْتَمِسُ خُبْزاً.
٢٦- اليَومَ كُلَّهُ يَتَرَأفُ و يُقْرِضُ، و نَسْلُهُ لِلْبَرَكَةِ.
٢٧- حِدْ عَنِ الشَّرِّ و افْعَلِ الخَيْرَ، و اسْكُنْ إلى الأبَدِ.
٢٨- لأنَّ الرَّبَّ يُحِبُّ الحَقَّ، و لا يَتَخَلَّى عَنْ أتْقِيائِهِ. إلى الأبَدِ يُحْفَظُونَ. أمَّا نَسْلُ الأشْرارِ فَيَنْقَطِعُ.
٢٩- الصِّدِّيقون يَرِثُونَ الأرْضَ و يَسْكُنُونَها إلى الأبَدِ.
٣٠- فَمُ الصِّدِّيقِ يَلْهَجُ بِالْحِكْمَةِ، و لِسانُهُ يَنْطِقُ بِالْحَقِّ.
٣١- شَرِيعَةُ إلهِهِ فِي قَلْبِهِ. لا تَتَقَلْقَلُ خَطَواتُهُ.
٣٢- الشِّرِّير يُراقِبُ الصِّدِّيقَ مُحاوِلاً أنْ يُمِيتَهُ.
٣٣- الرَّبُّ لا يَتْرُكُهُ فِي يَدِهِ، و لا يَحْكُمُ عَلَيْهِ عِنْدَ مُحاكَمَتِهِ.

٣٤- انتظر الرَّبَّ و احفَظْ طَريقَهُ، فَيرْفَعَكَ لِترثَ الأرْضَ. إلى انقراضِ الأشْرارِ تَنْظُرُ.
٣٥- قَدْ رَأيتُ الشِّرِّيرَ عاتياً، وارِفاً مِثْلَ شَجَرَةِ شارِقَةٍ ناضِرَةٍ.
٣٦- عَبَرَ فَإذا هُوَ لَيسَ بِمَوجود، و التَمَسْتُهُ فَلَمْ يُوجَدْ.
٣٧- لاحظِ الكامِلَ و انْظُرِ المُسْتَقيمَ، فَإنَّ العَقَبَ لِإنْسانِ السَّلامَةِ.
٣٨- أمَّا الأشْرارُ فَيُبادُونَ جَميعاً . عَقَبُ الأشْرارِ يَنْقَطِعُ.
٣٩- أمَّا خَلاصُ الصِّدِّيقين فَمِنْ قِبَلِ الرَّبِّ، حِصْنِهِمْ في زَمانِ الضِّيقِ.
٤٠- و يُعِينُهُمْ الرَّبُّ و يُنَجِّيهِمْ. يُنْقِذُهُمْ مِنَ الأشْرارِ و يُخَلِّصُهُمْ، لأنَّهُمْ احْتَموا بِهِ)).

بەڕاستی دووبارە بوونەوەی(عباد الله الصالحين) کە دەبنە جێگرو میراتگری زەوی لەم بەشەدا،بەڵگەیەکی گەورەیە کە حەزرەت ﷺ ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ (٤) عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ ﴾ النجم: ٣ - ٥

**٢- گیانلەبەران ئومەتن وەك مرۆڤ:** قورئان دەفەرموێت:﴿ وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴾ االانعام:٣٨. ئەمڕۆ زانایان لە هەموو کاتێك زیاتر هەست بەڕاستێتی ئەم ئایەتە و موعجیزەکەی دەکەن، چونکە ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دیراسەی عالەمی مێروو وباڵندە وگیانلەبەرانی تر دەکەن، ڕۆژبەڕۆژیش زیاتر بۆیان دەردەکەوێ کە هەموو گیانلەبەران وەکو مرۆڤ ئومەتن و نیزام و یاساو سیفاتی تایبەتی خۆیان هەیە، بۆ نموونە لە جیهانی گیانلەبەراندا هەروەك جیهانی مرۆڤ لەلایەکەوە یارمەتی و هاوکاری هەیە و، لە لایەکی تریشەوە فێڵ و تەڵەکەو هەق خواردن و درۆوخەڵەتاندن هەیە ...(لە بەرگەکانی پێشوودا چەند نموونەیەکمان باسکرد) .

زانایان دیراسەی مێروولەیەکیان کرد کە پێی دەوترێت (مێروولەی ئاگر) لە ئەمریکا، ئەم مێروولەیە پێوەدانێکی هەیە کە دەتوانێ دیفاعی لە خۆی پێبکات ودوژمنەکەی لەناوبەرێت .

کۆمەڵێ زەردەواڵە هەیە دەچنە شارە مێروولەوەو کرمۆکەکانیان دەخۆن جا بۆ ئەوەی هەستیشیان پێنەکرێت بۆنێك دەرئەدەن کەلەبۆنی مێروولەکان دەچێت و بەو بۆنە ذەیانخەڵەتێنن وسەریان لێ تێك دەدەن .

زانایەك لەزانکۆی ڕۆشستەری ئەمریکی پاش دیراسەولێکۆڵینەوەی زۆر لەسەر گیانلەبەران بۆی دەرکەوت کە ئەوانیش درۆ دەکەن وەك مرۆڤ، کەئەمەش لە وتارێکدا لەپێگەی ئەو زانکۆیەدا بڵاوکراوەتەوە .

باڵندە ومێروو وگیانلەبەرانی تریش لەرینەوەی دەنگ کاریان تێدەکات و توانایان هەیە ئەو لەرەلەرانە شیتەڵ بکەن، توتی دەتوانێ لاسایی ئەو دەنگانە بکاتەوە کە دەیبیستێت،ئەمەش وای لە دکتۆر ئیرج جارڤیس کرد کە مامۆستای یاریدەدەرە لە زانستی ئەعصابدا پاش لێکۆڵینەوە لەسەر باڵندەکان بڵێ (ئەم شێوازی فێربوونی دەنگەی لای باڵندە هەیە هەر هەمان ئەو شێوازەیە کە مرۆڤ بەهۆیەوە فێری قسە دەبێت).

لێکۆڵەر دکتۆر ڕۆبەرت هیکلینگ کە چەند ساڵێك دیراسەی دەنگی مێروولەی کرد بۆی دەرکەوت کە مێروولە زمانی تایبەتی خۆی هەیەویە ئامێری تایبەتیش تۆماری کرد، پاشان ئەمەشی لە ساڵی ٢٠٠٦ دا بڵاوکردەوە لە گۆڤاری (جۆرناڵ ئۆف ساوەند ئاند ڤایبرەیشن) دا .

هەروەها زانایان بۆیان دەرکەوت کە مێروولە شاخە هەستیارەکانی بەکاردێنێت بۆ وەرگرتن و ناردنی لەرەلەری دەنگەکان .

زانایان بۆیان دەرکەوت پاش دیراسەی زۆر کە مەیمون هەست بە عەدالەت و زوڵم دەکات و، ژیانی کۆمەڵایەتی غۆریلاش لە ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ دەچێت، هەروەها کە نێرەی غۆریلا لە خێزانەکەی جیادەبێتەوەو خێزان بۆ خۆی پێکەوە دەنێ و سەرکردایەتی کۆمەڵێك دەکات زۆر نەرمی دەنوێنێ بەرامبەرئەو کۆمەڵانەی کە خزمەکانی سەرکردایەتی دەکەن، ئەم دۆزینەوانەش هەمووی بەڵگەن کە گیانلەبەران ئومەتن وەك مرۆڤ، ڕەنگە هەندێك لایان سەیربێت کەچۆن گیانلەبەران درۆدەکەن،مەگەرقورئان نافەرموێت: حەزرەتی سولەیمان

سەلامی‌خوای لێبێت بەهود هودەکەی فەرموو: بزانین ڕاست دەکەیت یان درۆ دەکەیت ﴿ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴾ النمل :٢٧.[١]

**٣- پەیوەندی منالبوون بە بوومەلەرزەوە:** ئیعجازێکی تری قورئانی یە کە پێش چواردە سەدە لەمەوبەر قورئان ئاماژەی بۆدەکات و زانستی سەردەمیش جەخت دەکاتە سەری پاش دیراسەو لێکۆڵینەوە .

قورئان دەفەرموێت ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَـٰرَىٰ وَلَـٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ﴾ الحج:١

واتە: ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لە خەشمی بپارێزن چونکە بەڕاستی زەوی لەرزەی قیامەت کارەساتێکی زۆر گەورەیەو ڕووداوێکی سامناکە. لەو ڕۆژەدا کەکارەساتەکە دەبینن، هەموو شیردەرێك لە شیرەخۆرەکەی بێئاگا دەبێت و فەرامۆشی دەکات، هەموو سکپڕ و دووگیانێکیش کۆرپەلەی لەباردەچێت، خەڵکی دەبینی وەکو سەرخۆشن، لەڕاستیدا سەرخۆش نین، بەڵکو سزای‌خوایی زۆرسەخت و سامناکەو سەری لێشێواندوون.

کۆمەڵێك زاناو لێکۆڵەری ئەمریکی لەئەنجامی دیراسەی زەمین لەرزەی لۆس ئەنجلۆس لەساڵی ١٩٩٤کە پلەکەی (٦،٧) پلەی ڕێختەر بوو،کە بووە مایەی زەرەر و زیانی (٤٠)ملیار دۆلار، بۆیان دەرکەوت کە ئەو زەمین لەرزەیە بوەتە هۆی خێراکردنی منالبوون، چونکە ویلاش هەر بەتەنها ڕێڕەوێك نییە بۆ گواستنەوەی مەواد لەدایکەوە بۆ کۆرپە، بەڵکو ویلاش هۆکاری دەرەکی کاری تێدەکات و هەندێ هۆرمۆنات دەرئەدات و کاردەکاتە سەر کاتی منالبوون .

باشە زەمین لەرزەیەکی ئاسایی دنیا ئەم کارە بکات دەی شەبێ زەمین لەرزەی قیامەت چۆن بێت بەو هەموو سامناکی و بەهێزیەوە، دیارە بێگومان دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەرچی ئافرەتێك منالی لەسکدا بێت لەباری بچێ و پێش وەخت بیبێت.

---

١- پێگەی عبدالدائم کحیل.

## ٤- حەرامكردنی سووخواردن موعجیزەیەكی تری

**ئیسلامە:** قورئان دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ، فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾ البقرة :٢٧٨ . واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پارێزكار و خواناسبن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئیماندارن .

خۆ ئەگەر وا نەكەن ئەوە جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەكەیدا ڕابگەیەنن، (كە سەرەنجامەكەی زۆر سامناكە)،خۆ ئەگەر تەوبە بكەن و لە سوو خۆری وازبهێنن ئەوە تەنها سەرمایەكانتان بۆ هەیە وەری بگرنەوە، نە ستەم دەكەن لە (قەرزارەكان)، نە ستەمتان لێ دەكرێت.

هەروەها دەفەرموێت:﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ، يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِي ٱلصَّدَقَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴾ البقرة :٢٧٦. واتە: ئەوانەی سوو دەخۆن هەڵسوكەوت ناكەن و ڕاست نابنەوە لە گۆڕدا مەگەر وەك ئەو كەسەی كە شەیتان دەستی لێوەشاندبێت، (لە دنیادا سروشتی نین و، لە قیامەتیشدا وەك شێت دەبن)، چونكە ئەوانە دەڵێن: كڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە، (لە حاڵێكدا) خوا كڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ كردووەو سووی حەرام كردووە، جا ئەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری پێگەیشت و وازی هێنا، ئەوەی دەستیكەوتووە بۆ خۆی، كاری لێپرسینەوەش دەكەوێتە لای خوا، بەڵام ئەوەی دەست بكاتەوە بە سووخۆری، ئا ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیا دەبەنە سەر.

خوا سوو لەناو دەبات و بەرەكەتی لێهەڵدەگرێت، بەڵام سامان بەخشین برەو پێ دەدات و بەرەكەتی تێدەخات، بێگومان خوا هیچ كافرێكی تاوانباری خۆش ناوێت.

ئەم چەند ئایەتە كە سوو قەدەغە دەكات و جەنگ بەرپا ئەكات لە دژی یەكێكە لە موعجیزە گەورەكانی قورئان، ئەمە یەكێكە لەو شتانەی كە حەرام كراوە بۆ ئەو ڕۆژەی كە

قورئان تیایدا هاتۆته خوارەوەو بۆ ئەمڕۆ و بۆ هەتا هەتا... خوا بە خوایەتی خۆی دەزانێت کە مرۆڤ لەو زەمانەداو تا قیامەتیش گیرۆدەیسووخواردن دەبێت و،سووش زیانی گەورە لە ئابووری تاك و کۆمەڵ دەدات بۆیە ئاوا باسی دەکات...

نیزامی کۆمۆنیستی چونکە لەگەڵ فیترەت دا نە دەگونجا هەرەسی هێناو بوو بە پەندی زەمانە، لە بەرامبەریشیەوە نیزامی سەرمایەداری وا سەرەتای تیاچوونی لە ئەمریکاوە سەری هەڵداوەو دنیای سەرقاڵ کردووە، پشت بە خوا ئەمیش دەبێتە پەندی زەمانە چونکە لەسەر سوو خواردن بنیات نراوە.

ئەم هەرەسهێنانەش لە خۆیەوەو لە گۆترە نەبووە، ئەمە وەعدی خوایە بەرامبەر نیزامی سووخواردن کە بە بەرچاوی هەموو دنیاوە ئەمڕۆ دێتە دی، ئەمڕۆ باری ئابووری ئەمریکا لەو پەڕی خراپیدایە، قەرزاری دەرەوەو ناوەوەی حکومەتی ئەمریکی دەگاتە (٤٥٠)ملیار دۆلارو عەجزی تیجاریشی زیاترە لە (٦٥)ملیار دۆلار، لەملاشەوە مۆشری بێ ئیشی و هەڵئاوسان و بێکاری ڕوو لە زیادبوونە...

ئەم ئەزمەی مالییە بووەتە هۆی زیانی (٢,٤)تریلیۆن دۆلارو، نزیکەی حەفتا کۆمپانیای ڕەهنی عەقاریش کارەکانی هەڵپەساردووەو لە سەرەتای (٢٠٠٦) ە وە عەرچ کراون بۆ فرۆشتن و، زیاتر لە یانزە بانقی گەورەش ئیفلاسیان کرد.

هەروەها (کریستوفر والین) کە ئەندامە لە کۆمپانیای لێکۆڵینەوەی (تحليلات المخاطر المؤسسية) دەڵێت: نزیکەی سەدو دە بانقی تر کە سەرمایەکەیان (٨٥٠) ملیار دۆلارە تا ناوەڕاستی ساڵی(٢٠٠٩) دادەخرێن.

سەرۆك بۆش و کاربەدەستانی ئەمریکا بە (٧٠٠)ملیار دۆلار ویستیان فریای وەزعەکە بکەون، بەلام ئەمە چارەسەری ناکات، چونکە وەك ئەوە وایە بوتڵێ خوێن بکەیتە نەخۆشێکەوە کە خوێنی زۆری لەبەر دەڕوات.

هەموو ولاتانی دنیا لەم ئەزمەیەدا بەشیان هەیەو هەر دەوڵەتەو بە پێی خۆی زیانی لێکەوتوە...

لەملاشەوە بانقە ئیسلامیەکان تا ڕادەیەکی زۆر سەلامەتن لە زەرەرو زیان، کە بڕی ئەو پارەیەی کاری پێوە دەکەن نزیکەی (٤٠٠)ملیار دۆلارە...

ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر دنیا چاوی لەسەر نیزامی ئیقتصادی ئیسلامیە کە وەك بەدیلێك سوودی لێوەربگیرێ و مرۆڤایەتی لەم قەیرانە جەرگ بڕە ڕزگار بکات.

پاش ئەو داڕمانە گەورەیەی ئابووریوڵاتان، ڕۆژنامە ئابورییە گەورەکانی دنیا داوای پەیڕەویکردنی شەریعەتی ئیسلامی دەکەن لە بواری ئابووری دا، تا ڕزگاریان ببێ لە خراپی نیزامی سەرمایەداری کە بۆتە هۆی ئەو زەرەرو زیانە گەورەیە.

لە ئیفتتاحیەی گۆڤاری (چالینجز)ی پاریسی، رەئیس تەحریر (بوفیس فانسون) بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە بە ناونیشانی (البابا أو القرآن)، کە ئەمەش مشتومڕێکی زۆری دروست کرد لە ناوەندە ئابووریەکاندا، نووسەر باسی ئەخلاقیاتی سەرمایەداری دەکات و، باسی ڕۆڵی خراپی کەنیسە دەکات کە نەیتوانیوە ئەو ئەخلاقیاتە بگۆڕێ و بێدەنگیش بووە لەو سووە زۆرەی‌کاری پێکراوە.

ئنجادەڵێت: (وا ئەزانم ئێستا لەم ئەزمەیەدا زیاتر پێویستمان بە خوێندنەوەی قورئانە لە جیاتی ئینجیل، تا تێبگەین خۆمان و بانقەکانمان تووشی چی بووین، چونکە ئەگەر کاربەدەستانی بانقەکان ڕێزیان لە قورئان و تەعلیمات و ئەحکامەکانی بگرتایەو پەیڕەویان بکردایە، تووشی ئەم ڕۆژە نەدەبوون).

هەروەها (رولان لاسکین) رەئیس تەحریری ڕۆژنامەی (لوگۆرناڵ دفیناس) لە ئیفتیتاحیەی ئەم هەفتەیەدا داوای پەیڕەوی کردنی شەریعەتی ئیسلام دەکات لە بواری ئابووری دا کە سوو حەرام بکرێت، تا سنورێك دابنرێت بۆ ئەو ئەزمەیەی کە بازاڕی جیهانی شڵەقاندووە.

وتارەکەی لاسکین لە ژێر ناوی (ئایا وول ستریت گەیشتۆتە ئەوەی کە پەیڕەوی شەریعەتی ئیسلامی بکات؟)دا بوو..

لە پەڕاوێکیشدا کە لەم دواییەدا لێکۆڵەری ئیتاڵی (لوریتا نابلیونی) دەری کرد بە ناوی (إقتصاد ابن آوى)، نووسەر ئاماژە بۆ ڕۆڵی گرنگی تەمویلی ئیسلامی دەکات لە ڕزگار کردنی ئابووری ڕۆژئاوادا.

هەروەها دەڵێت: (دەکرێت بانقە ئیسلامیەکان ببنە جێگرێکی باشی بانقە ڕۆژئاواییەکان)... نوسەرێکی ڕۆژئاوایش دەڵێت: (ئایا وولّ ستریت گەیشتۆتە ئەوەی کە موسڵمان ببێت)، هەروەها شارەزای بواری دارایی ئەوروپی (سواتی تانیجا) دەڵێت: (ئەزمەی

دارایی لە ئەمریکا بوارێکی ئاڵتونی باشی ڕەخساندووە بۆ ئابووری ئیسلامی کە کار بە سوو نەکات).

وەکالەتی دەنگوباسی (برناما) بڵاوی کردەوە کە جێگری سەرۆکی (هیئه النقد)ی هۆنگ کۆنگ دەڵێت:(گومان لەوەدانیە کە سورین لە سەر دانانی بەرنامەیەك بۆ تەمویلی ئیسلامی و کردنەوەی بازاڕێك بۆ سەنەداتی ئیسلامی)

هەروەها وەزیرەی ئابووری و مالی فەڕەنسی لە (ملتقی)ی فەڕەنسی دووەم بۆ تەمویلی ئیسلامی دا وتی: وڵاتەکەی نیازێتی پاریس بکاتە پایتەختی تەمویلی ئیسلامی وکارئاسانیەکی زۆر بکات بۆ بانکە ئیسلامی‌یەکان. ڕۆژنامەی لو باریزیان ی فەڕەنسی‌وتی: پاش ئەزمونی بەریتانیا کەیەکەم بانکی ئیسلامی کردەوە لە ئەوروپادا لەساڵی ٢٠٠٤ دا، فەڕەنساش ڕێی دا بە سێ بانکی ئیسلامی وڵاتی کەنداو کە لقی خۆیان بکەنەوە.[١]

ترسێکی بێ دەنگ لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە دەبینین، مامۆستای زانستی سیاسەت و ئیقتصادی بەریتانی(جون گری) لە وتارێکی ڕۆژنامەی (ذی ئوبزیرفر) لە ژێر ناونیشانی (ساتە وەختی تێکشکان و داڕمانی هێزی ئەمریکا)دا دەڵێت: (بە ڕاستی سەردەمی دەسەڵاتی ئەمریکا کۆتایی هات).

ئەم ئەزمەی ئابوورییەی ئەمریکا زۆر لە (تسۆنامی) خراپترە کە تووشی زۆر لە وڵاتانی جیهان بووە.ئەمریکا وەك قارون و عاد و سەرسەختەکانی تر دەیووت (من أشدُّ مِنّا قوة)، کێ لەگەڵمانایە باشە، کێ لە گەڵمان نیە مانای دوژمنە، دەیانوت: کێ لە ئێمە بەهێز ترو دەسەڵاتدارترە؟! تا سەرەنجام خوای گەورە بە تاوانی سوو خواردن و زوڵم و ستەم پەندێکی دادان کە نازانن چۆن لێی دەرچن.

وەزیری دارایی ئەڵمانی دەڵێت: (بە ڕاستی جیهان هەرگیز جارێکی تر ناگەڕێتەوە حاڵی جارانی پێش ئەم ئەزمەیە)...

بە ڕاستی ئەمەش ئەو جەنگەیە کە خوای گەورە ڕایگەیاندووە بەرامبەر ئەوانەی کە سوو خۆری دەکەن ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ فَأۡذَنُواْ بِحَرۡبٖ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ البقرة :٢٧٨

---

١- (المجتمع: ١٨٣٠).

ئەم جەنگە دوژمنانی خوای خستۆتە دڵەڕاوکێیەکەوە کە زانای ئافرەتی دەروناسی ئەمریکی(نانسی مولیتور) دەڵێت: (لە ئەزموونی بیست ساڵی کارکردنمدا، هەرگیز شتی وام نەدیوە کە دڵەڕاوکێ هەموو ڕەقەمێکی قیاسی شکاندووە).

ئەوەی بەتەمایە بەسوو خۆری ماڵەکەی زیاد بکات،زیاد ناکات چونکە ﴿ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَٰتِ ﴾البقرة:٢٧٦

هەروەها (وما آتيتم من ربا ليربو فى اموال الناس فلايربو عند الله)، حەزرەتیشﷺ دەفەرموێت: (ما أحد أكثر من الرِّبا إلا كان عاقبة أمره إلى قِلّة)[1]

ئەمەش بە ئاشکرا لە دنیای خەڵکیدا هاتە دی، دە دەوڵەمەندی بەریتانی لە ماوەیەکی کەمدا چل ملیار دۆلار زیانیان لێکەوت، لە ڕوسیاش گەورە دەوڵەمەندەکانیان بلیۆنەها دۆلار زیانیان لێکەوت .

گەورەترین بانقی ئەمریکی وەك (لیمان برازەرز)و (ئەنتجرتی) و (واشنتن میوتشواڵ) ئیفلاس بوونی خۆیان ڕاگەیاند، کۆمپانیای دڵنیایی (AIG) بەهۆی پێدانی تعویچاتی (١١)بلیۆن دۆلارەوە هەرەسی هێنا کە لە تەمەنی (٩٠) ساڵی کارکردنیدا زەرەرو زیانی ئاوەهای بە خۆیەوە نەدیوە.

نزیکەی سێ ملیۆن ئەمریکی خانووەکانیان لەدەست ئەدەن، چونکە ناتوانن قیستی مانگانەیان بدەن.

جیاکردنەوەی دین و دنیا، دین و سیاسەت، گوێ نەدان بە حەڵاڵ و حەرام و چاوپۆشین لە سوو خواردن، بە بیانووی ئەوەی کە دین و ئەخلاق پەیوەندیان نیە بە ئابوورییەوە،ئەم سەرەنجامە خراپەی لێکەوتەوە، ئەمانیش هەروەك گەلی شوعەیبیان لێ قەوما کە دەیان وت:

﴿ قَالُوا۟ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُا۟ۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴾ هود :٨٧

شارەزایان دەڵێن بڕی ئەو زەرەرو زیانەی کە تووشی بانکەکان و خەڵکی بووە لە جیهاندا دەگاتە نزیکەی (٦٠٠)تریلیۆن دۆلار.

---

[1] - صحيح الالباني (رواه ابن ماجه).

ئەوان ئابووریەکەیان لەسەر سوو دامەزراند وەدەیانوت(ئیقتصاد بەبێ بانق نابێ‌وبانقیش بە بێ سوو نابێ)، ئەمەش وای کرد کە بەرەو جەهەننەم هەرەسیان پێ بهێنێ:﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾التوبة :١٠٩.

ئەم ئەزمەیە دەبێتە مایەی ئەوەی کە لە کۆتایی ئەمساڵدا (٢٠٠٨) بیست ملیۆن کەس کارەکانیان لە دەست بدەن و بێکار بن، لە لایەکی تریشەوە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی دەڵێت: (ئەم ئەزمەی ئابوورییە دەبێتە هۆی شێوانی عەقڵی و دەروونیەکی زۆر لە جیهاندا).

تەنها لە بۆرصەی وڵاتانی کەنداودا لە یەك هەفتەدا (١٥٥)ملیار دۆلار نەماوبوویە هەڵم، ئیتر چۆن دەوڵەمەندەکانیان لە داخا تووشیﻫەزار دەرد نابن ﴿ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾الروم:٤١. ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾السجدة: ٢١

**٥- قوماركردنیش بەهەمان شێوە حەرام کراوە** و یەکێکە لەوشتانەی کە مرۆڤ پێوەی‌ئالودە دەبێت ومایەی ماڵ وێرانییە بۆ تاك و بۆ کۆمەڵ، قورئان دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾المائدة:٩٠ واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە دڵنیابن عەرەق و قومار وگۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا، حەرام وحەڵاڵ زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە، ئەمانە هەر پیسن و لەکاروکردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ بپارێزن بۆ ئەوەی سەرفراز و بەختەوەر بن.

بەڕاستی ئەمەش موعجیزەیەکی تری قورئانە،کە خوای گەورە زانیویەتی قومار چەند زیان بەخشە و چۆن مرۆڤ لەو زەمانەدا ولە ئەمڕۆدا و تا قیامەتیش ئالودەی دەبن، ئینجا ئەمڕۆش لە هەمووکات زیاتر دیارە کە قومار چی زەرەر وزیان لەخەڵکی دەدات لەسەرتاسەری دنیادا، قومار زۆر بواری گرتۆتەوە وخەڵکێکی زۆریش گیرۆدەی بوون، لەڕێی یانەکانی قومارەوەو، لە ڕێی ئەنتەرنێتەوەو، لە ڕێی (یانصیب) ەوە.

(دکتور محمد عوضی) بانگخوازی کوەیتی‌لە بەرنامەیەکدا وتی:

دوو لاوی دەوڵەمەندی خەڵکی کەنداو، بڕیاریاندا کە بچن بۆ ئەمریکا و لەوێش سەردانی قومارخانە گەورەکەی لاس فیگاس بکەن کە یەکێکە لە سێ قومارخانە گەورەکەی جیهان، ئەمەش بۆ ئەوەی لەنزیکەوەحاڵی قومارو قومارچیەکان ببینن.

کە دەگەنە ئەوێ و دەچنە ژوورەوە، بەڕێوەبەری قومارخانەکە ئافرەتێکی شۆخ وشەنگ وبەتوانابوو، هەستی کرد کە ئەم دەم وچاوانە تازەن و دەوڵەمەندیش دیارن، لێیان نزیك بۆوە وکەوتە باسی یارییەکان وئەو خیبرەو شارەزاییەی کە بەبیست ساڵ لەو شوێنەدا کۆی کردبۆوە کەوتە بەکارهێنانی بۆ ئەوەی ئەو دوو لاوە لاس بات و بەرەو قومارکردن بیان بات، پاش هەوڵ وموجامەلەیەکی زۆر، لاوەکان پێیان وت: ئێمە تەنها هاتووین لەنزیکەوە لەم شوێنە تێبگەین و، بەهیچ جۆرێکیش بەلای قوماردا ناچین چونکە لەئایینەکەی ئێمەدا حەرام کراوە ..

ئافرەتەکە ئەم هەڵوێستەی لا سەیر بوو پرسی: بۆ ئاینەکەی ئێوە چییە وچۆنە؟؟پاش هەندێ گفتوگۆ وتی:دەکرێ کەسێکی شارەزام پێبناسێنن تا زیاتر وەڵامی پرسیارەکانم بداتەوە ...

ئەوانیش تەلەفونی دکتۆر(مصباح الــدُريني)یان دایە، ئافرەتەکەش بەتەلەفون قسەی لەگەڵکردو پاش باسوخواسێکی زۆر لەبارەی ئیسلامەوە، ئافرەتەکە گەیشتە قەناعەت کە ئیسلام ئاینێکی هەقە و لەخواوەیە بۆیە ئاوا دژی قومارکردن وەستاوەتەوە، جا بۆ خۆشی لەو ماوە دوورودرێژەدا و لەو شوێنەدا، زەرەرو زیانی قومارکردنی بە چاوی خۆی دیبوو،کە چۆن چەندەها کەس لەپاش زەرەرکردن جەڵتە لێی دابوون و،چۆن ئەو هەموو پارە جوانە لەو شوێنەدا بە فیڕۆدەدرێت و چەندەها ماڵی پێ کاول دەبێت ...

ئافرەتەکە بە دکتۆر مصباحی وت: دەکرێ بە تەلەفون موسوڵمان ببم؟؟ وتی: بەڵێ، لەگەڵما بڵێ: أشهد أن لاإله إلاالله وأشهد أن محمدا رسول الله، ئەویش وتی: أشهد أن لاإله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله...

**٦- گرنگی دڵ:** قورئانی پیرۆز لەبارەی دڵەوە دەفەرموێت:

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ ﴾ الحج: ٤٦

﴿ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ ﴾البقرة: ٧٤

﴿ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا ﴾الأعراف: ١٧٩

﴿ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾التغابن: ١١

﴿ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ﴾ المائدة: ٤١

زانستی سەردەم پاش زیاتر لە چواردە سەدەو پاش هەزاران دیراسات و لێکۆڵینەوە ئەم ڕاستیەی قورئان دەسەلمێنن و دەڵێن: ڕاستە دڵ گرنگیەکی زۆری هەیە ...

پرۆفیسۆر(گاری سچوارتز) پسپۆری دەروونی لە زانکۆی ئەریزۆنا و دکتۆرە (لیندا ڕوسیل) دەڵێن: بە ڕاستی دڵ تواناو وزەیەکی تایبەتی هەیە کە بە هۆیەوە زانیاری (خزن) دەکرێت و چارەسەر دەکرێت.

هەر بۆیە مێشك بە تەنها شت خەزن ناکات بەڵکو دڵ بزوێنەرەو چاودێرە بەسەریەوە ...

پرۆفیسۆر (گاری) دیراسەی سێسەد حاڵەتی چاندنی دڵی کردو بۆی دەرکەوت کە هەموویان گۆڕانکاری لە دەروونیاندا دروست بووە دوای ئەو نەشتەرگەرییەی بۆیان کراوە.

هەروەها دکتۆر(پاڵ پیرساڵ) دەڵێت: بە ڕاستی دڵ هەستی هەیەو بەرگری لەش ڕێك دەخات و زانیاری تایبەت دەنێرێت بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش، ئەمەشی لە پەڕاوێکدا بڵاوکردەووە بە ناوی (کۆدی دڵ).

پیاوێك کە دڵی ناساغ دەبێت نەشتەرگەری بۆ دەکەن و دڵی پیاوێکی تری بۆ دائەنێن کە خۆی کوشتووە، ئەم پیاوە پاش چاکبوونەوەی ژنی پیاوەکە دەهێنێ و هەروەکو ئەو خۆشی دەوێ‌و وەکو ئەو هەڵس و کەوت دەکات و پاش چەند ساڵێکیش هەروەکو ئەو خۆی دەکوژێت...

زانایان سەرنجیان داوە کە ئەوەی دڵی (صناعی) بۆ دانراوە هەست بە دڵ ڕەقییەکی زۆر دەکات کە ئەمەش بەڕاستی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دڵ نەرم دەبێت و ڕەق دەبێ‌و ئەو کەسانەش بە چاکی هەستی پێ دەکەن.

قورئان بە ئاشکرا ئاماژە بۆ ناوچەوان دەکات کە بەشی پێشەوەی مێشك ڕۆڵی هەیە لە درۆ کردندا﴿ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴾ العلق: ١٦، ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە شتی ڕاست لە

دڵدا هەڵدەگیرێ، کە چل هەزار دەمارە خانەی بەتایبەت کاری (خزن)ی معلومات و ڕێنمایی کردنی ئەندامەکانی لەش و مێشك دەکەن، ئەوەتاقورئان ئاماژەبۆئەمەش دەکات و دەفەرموێت ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾الفتح:١١، واتە: ئەوەی دەیڵێن درۆیەو لەسەر زمانیانەو ڕاستیەکە نالێن کە لە دڵیاندایە.

ئەوەندەش بەسە کە حەزرەتﷺ پێش چواردە سەدە زیاتر ئاماژە بۆ ڕۆڵی گرنگی دڵ دەکات و دەفەرموێت:(ألا إن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله و إذا فسدت فسد الجسد كله ألا وهي القلب)[1].

**٧- چیرۆکەکانی قورئان:** قورئانی پیرۆز موعجیزەیە لەو چیرۆك و بەسەرهاتانەدا کە دەیگێڕێتەوە کە هەمووی لە عیلمی غەیبی خوادایەو تەنها ئەوە کە حەزرەتی ﷺ ئاگادارکردووە، ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوا أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ﴾يوسف:١٠٢ ، واتە: ئەی محمد ﷺ ئەم بەسەرهات و چیرۆکەی یوسف کە بۆت دەنێرین بە وەحی لە هەواڵ و بەسەرهاتە شاراوەکانە، خۆ تۆ لەلای براکانی یوسف نەبوویت کاتێك کە هەموویان خەریکی بڕیاردان و پیلان گێڕان بوون.

﴿تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ هود :٤٩

واتە: ئەی محمدﷺ ئەو باسانەی بۆمان کردیت لە هەواڵە نادیارەکانە کە بۆت دەنێرین، نە تۆ دەتزانی و نە هۆزو نەتەوەکەشت پێش ئەم باسەی ئێمە، جا خۆگرو بە ئارام بە، چونکە بە ڕاستی پاشە ڕۆژ بۆ خواناس و پارێزکارانە.

جوان سەرنجی ئەم چەند وشەیە بدە (مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ)، نە تۆ و نە گەلەکەت نەتانزانیوە.. ئەم ئایەتە کە بەردەوام خوێندراوە کەس نەهات بڵێ: نەخێر ئێمە بیستوومانە ..

زۆر لە چیرۆکەکانی قورئان وەك گەلی عاد و ڕزگاربوونی لاشەی فیرعەون، وەك زۆر لایەنی چیرۆکی حەزرەتی یوسف لە تەورات و ئینجیلدا نەهاتووە، هەروەها قورئان زۆر

---

[1] - مسلم.

وردەکاری تیایە کە پاش دۆزینەوەی دەستخەتەکان و پاشماوە مێژووییە دێرینەکان دەردەکەوێت کە قورئان ڕاستی فەرمووە وەك وشەی (سید) کە بۆ مێرد بەکارهاتووەو تەنها لەو شوێنەدا باسکراوەو لە باقیشوێنەکانی تری قورئان دا بە (بعل) یان (زوج) هاتووە هەروەك دەفەرموێت ﴿ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِ ﴾ یوسف: ٢٥، دۆزینەوەکان لەم سەدەیەی دوایدا ئەوەیان سەلماند کە قیبتییەکان کاتی خۆی بە مێردیان وتووە (سید) قورئانیش وشەکەی ئەوانی بەکار هێناوە.

هەروەها تەورات و ئینجیل (فیرعەون) بەکار دەهێنن بۆ پادشای زەمانی حەزرەتی یوسف و حەزرەتی موسا، کەچی قورئان بۆ پادشای زەمانی حەزرەتی یوسف (ملك) بەکاردێنێ وبۆ پادشای زەمانی حەزرەتی (موسا)ش (فیرعەون) بەکار دێنێ... کە ئەمەش لەم سەدانەی دواییدا دەرکەوت کە پادشای زەمانی حەزرەتی یوسف چونکە لە خۆیان نەبووە پێیان وتووە (ملك) بەڵام پادشای زەمانی حەزرەتی موسا چونکە لە میسرییەکان خۆیان بووە پێیان وتووە (فیرعەون) کە ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە ئەگینا ئەم وردەکارییە مێژووییە خوا نەبێ کێ دەیزانێ کە ئاوا لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کردووە.

تەورات و ئینجیل کە باسی مێردی ئەو ژنە دەکات کە حەزرەتی یوسف لەماڵیان بووە، بە بەڕێوەبەری پۆلیس (یان بە ناوەکەی خۆیەوە) ناوی دەبات کەچی قورئان ناوەکەی وەردەگێڕێت بۆ زمانی عەرەبی کە دەکاتە (عزیز إلە الشمس) دیارە لە ئیسلامیشدا یەکتاپەرستی هەیەو (اله الشمس) نیە بۆیە لای دەبات لە ناوەکەو تەنها (عزیز) بەکاردەهێنێو دەفەرموێت ﴿ قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ قُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ۚ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٔـٰنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾یوسف:٥١

**٨- موعجیزەی ژمارەیی:** لە سەرەتای ئیعجازی ژمارەییدا (عبدالرزاق نوفل) پەڕاوێکی دانا لە بارەی دنیاو ئاخیرەتەوە تا بیسەلمێنێ کە ئیسلام هاوسەنگی کردووە لە نێوان دنیاو قیامەتداو گرنگی بە هەردوولا داوە... لە کاتێکدا کە وشەی دنیاو ئاخیرەتی لە قورئان دەرهێنا، بۆی دەرکەوت(١١٥) جار وشەی دنیا و (١١٥) جار وشەی ئاخیرەت هاتووە .

دواتر پەڕاوێکی دانا لە بارەی مەلائیکەت و شەیتانەکانەوە، بە هەمان شێوە کەوشەی (مەلائیکەت) و وشەی (شەیطان)ی دەرهێنا بینی کە هەریەکەیان (٦٨) جار دووبارە

بوونەتەوە، ئەمەش وای لێکرد یەکەم پەڕاوی نووسی بە ناوی (الإعجاز العددي للقرآن الكريم).

دیارە قورئان هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت (لا تنقضي عجائبه)، عەجائیباتەکانی تەواو نابێت، ئەندازیار عبد الدائم کحیل دەڵێت (منیش کەوتمە دەرهێنانی ئەو ئایەتانەی کە باسی ئەو شتانە دەکەن کە خوا خۆشی دەوێت و پێی خۆشە، هەروەها ئەو شتانەش کە خوا پێی ناخۆشەو خۆشی ناوێت، بۆم دەرکەوت کە (١٦) جار هەریەکەیان دووبارە بۆتەوە هەروەك لەم ئایەتانەدا دیارە:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾البقرة: ١٩٥ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾الصف:٤ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾ البقرة: ١٩٠.﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ الحديد :٢٣

**٩- شاری عەدەن و موعجیزەیەکی گەورە:** یەکێك لە ئیعجازەکانی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ئەوەیە کە دەفەرموێت: (عن حذيفة بن أسيد الغفاري قال: اطلع النبي ﷺ علينا و نحن نتذاكر فقال: ماذا تذاكرون؟ قالوا: نذكر الساعة. قال: انها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات، فذكر الدخان و الدجال والدابة وطلوع الشمس من مغربها و نزول عيسى ابن مريم عليه صلاة و سلام و يأجوج و مأجوج، وثلاثة خسوف: خسوف بالمشرق، و خسوف بالمغرب، و خسوف بجزيرة العرب، و آخر ذلك نار تخرج من اليمن تطرد الناس إلى محشرهم). (و في رواية عند مسلم: نار تخرج من قعر عدن تُرحل الناس)[1] ، ئەوەی مەبەستمانە لەم فەرموودەیەدا ئەوەیە،کە بورکانێك لە (قعر)ی عەدەن، (بنی عەدەن)دەردەچێت و خەڵکی دەبات بەرەو مەحشەر،شاری عەدەن زۆربەی بەئاوی دەریا دەورە دراوە ولە بنەڕەتدا زەویەکەیبەهۆی بورکانێکی گەورەوە درووست بووە کە لەو دەریایەدا بووە،ئەم بورکانە پاش هێوربوونەوە و سارد بوونەوەی دەمێکی چاڵی بۆ دروست بووە زۆر زۆر گەورەو فراوانە .

---

١- مسلم.

کەس لە ڕابردوودا نەیزانیوە کەشاری عەدەن لەسەردەمی بورکان درووست بووە، تا ئەو کاتەی ئینگلیز داگیری کرد و فڕۆکە پەیدا بوو،کاتێك بە فڕۆکە لـە بەرزاییـەکی زۆرەوە سەیری عـەدەنیان کـرد بینیـان شـارێکە ڕووەکـەی چـاڵە و دەمێکـی بورکـانی گەورەشـی هەیـە.بۆیـە ئینگلیزەکان ناویان نا شاریدەمی بورکان (Kraytar)، ئیتر بـەم نـاوەوە ناویـان دەبـرد نـەك ناوی(عدن).

بیعپهیەکی مەلەکی بەریتانی بۆ زانیاری بورکـان لـە سـاڵی ١٩٦٤دا کەوتنـە دیراسـەی بورکانی عەدەن بەسەرۆکایەتی پرۆفیسۆر(I.G.Gass)کە سەرەتای ڕاپۆرتەکەی بەمە دەست پێدەکات کە دەڵێت:(بەڕاستی بورکانـەکانی ئێستا وەکـو دەمەقاچـان ویـاری منالآنـە لەچـاو بورکانی عەدەن دا).

ئەمـە لەکاتێکـدا کـە بورکـانی زۆر گـەورە تەقیوەتـەوە،وەك بورکـانی (کراکـاتو)لـە ئیندۆنیسیا کەلەساڵی ١٨٨٣دا تەقیوە، کەزانایان بەگەورەترین بورکانی دەزانن تائێستـا، کـە بوەهۆی کوشتنی سی وشەش هەزار کەس و خەڵکی لەدووری پێنج هەزار کیلۆمەترەوە گوێیـان لە دەنگی بوو، تۆز وخۆڵ و دوکەڵیشی بۆ ماوەی یەك هەفتە روناکی خـۆری شـاردەوە،وە بـووە هۆی هەڵوەشـان و نەمانی زۆربەی ئەو دوورگەیەی کە تیایدا تەقیوە، زانایان هێزی تەقینـەوەی بورکانەکە مەزەندە دەکـەن بەتوانا و هێـزی تەقینـەوەی سـەد بـۆمبی هایـدرۆجینی ...ئینجـا بیرکەرەوە لەقسەی زانایان کە دەڵێن: ئـەم بورکانـە گەورەیـە وەك دەمەقاچـان و یـاری منالآنـە لەچاو تەقینەوەکەی بورکانی عەدەن دا.

ئەم فەرموودەیە لە چەند ڕوویەکەوە موعجیزەیە:

أ- حەزرەت ﷺ دەفەرموێت(قعر عدن)کە هیچ کەس تا زەمانی داگیرکردنی ئینگلیز کە دیراسەیان کرد نـەیزانیوە کـە شـاری عـەدەن لەچـاڵاییـەکی بـەرفراوانی دەمـی بورکـانێکی زۆر گەورەدایە .

ب- دیارە زۆربەی بورکانەکانی دنیا،کە جارێك تەقیونەتەوە،زۆر ئاساییە کە جاری تریش چالاك ببنەوە،بەتایبەت بورکانێکی ئاوا گەورەی وەك بورکانی عەدەن کە ئاگر و شلەی تـەواوەی خەڵکی دەبەن بەرەو ساحەی مەحشەر،قورئانیش ئامـاژە بـۆ بوومەلـەرزە وتەقینـەوەی بورکـان دەکـات کەئەمـەش بـۆ خـۆی هـەر مـوعجیز ەیـە ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا وَأَخْرَجَتِ

ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا ﴾.. باشه كێ له زه‌مانی حه‌زره‌تدا ﷺ زانیویه‌تی په‌یوه‌ندی هه‌یه له نێوان بورکان وبوومه‌له‌رزه‌دا؟ ئه‌مڕۆ پاش دیراساتی زۆر زانایان ده‌ڵێن: (بوومه‌له‌رزه وه‌کو ئاگادارکردنه‌وه‌یه‌کی پێش وه‌خته بۆ هاتنی بورکان).

ج- له‌گه‌ڵ باسی بورکانی (عه‌ده‌ن)دا حه‌زره‌ت ﷺ باسی ڕۆچوون ده‌کات که ئه‌مه‌ش دیسان به‌هۆی زه‌مین له‌رزه‌ی به‌هێزه‌وه ده‌بێت که ڕۆچوونێکی زه‌وی له ڕۆژهه‌ڵات ویه‌کێکیش له‌ڕۆژئاوا و یه‌کێکیش له نیوه‌دورگه‌ی عه‌ره‌ب ده‌بێت،که ئه‌مه‌ش شتێکی ئاسایی یه له‌ڕووی زانستیه‌وه که‌له‌گه‌ڵ ئه‌و بوومه‌له‌رزه گه‌ورانه‌دا ڕوو‌بدات.

**١٠- موعجیزه‌یه‌ك له ئه‌هرامه‌کانه‌وه**: زانایانی ڕۆژئاوا ده‌ڵێن: یه‌که‌م که‌سێك که ئاماژه‌ی به‌وه کردبێت که به‌ردی ئه‌هرامه‌کان به‌شی خواره‌وه‌ی به‌ردی ڕاسته‌قینه‌یه‌و ئه‌وانی سه‌ره‌وه‌ش له قوڕی سوره‌وکراو دروستکراوه پرۆفیسۆر (هنری لی چاتیلیر)ه که له ساڵی (١٨٥٠) له فه‌ره‌نسا له دایك بووه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ورد بینه‌وه ده‌بینین قورئان یه‌که‌م په‌ڕاوه‌و ده‌ستپێشخه‌ر بووه له ڕاگه‌یاندنی ئه‌و ڕاستیه‌دا که له زه‌مانی فیرعه‌ون دا له قوڕی (کلسی) بینای به‌رزیان دروست کردووه...

(هه‌رچه‌ند ڕۆمانیه‌کانیش له کۆندا قوڕی کلسیان به‌کارهێناوه بۆ بینا پاش گه‌رمکردنێکی زۆر که ئه‌م ڕاستیه‌ش ئه‌ندازیار (دافید مور) پاش دیراسه کردن دۆزیه‌وه).

فیرعه‌ونه‌کان گڵێکیان هێناوه که‌کلسی تیابێت و له‌گه‌ڵ گڵی ئاسایی وئاو تێکه‌ڵیان کردووه‌وله قاڵبی تایبه‌تدا به‌گه‌رمی زۆر تا نۆ سه‌د پله‌ی گه‌رمی کوتله‌ی گه‌وره‌ی وه‌ك به‌ردیان دروستکردووه‌و بینای به‌رزیان پێدروستکردووه.

پرۆفیسۆری ئیتاڵی (ماریۆ کۆلیپاردی) له‌ساڵی ١٩٨١ داو، پرۆفیسۆری فه‌ڕه‌نسی (جۆزێف داڤیدۆڤیتس) به‌ڕێوه‌به‌ری په‌یمانگای جیۆپۆلیمه‌ر و چه‌نده‌ها زانای ئه‌مریکی تریش له‌دوای ساڵی ٢٠٠٦ ه‌وه، پاش لێکۆڵینه‌وه‌ی زۆر جه‌خت ده‌که‌نه سه‌ر ئه‌وه‌ی که به‌رده‌کانی ژێره‌وه‌ی ئه‌هرامه‌کان به‌ردی ڕاسته‌قینه‌ن و به‌رده‌کانی ترش هه‌مووی له‌قوڕدروستکراون له قاڵبی تایبه‌تداو زۆر گه‌رم کراون و زۆر به‌هێزوقایم بوون.

تەنانەت پرۆفیسۆر (جۆزێف داڤیدۆڤیتس) لە تاقیگەدا بە دە ڕۆژ بەردێکی هەمان شێوەی بەردی ئەهرامەکانی دروست کرد لە گڵی ئاسایی و گڵێ کە کلسی تیابوو لەگەڵ ئاودا و گەرمی زۆر.

پرۆفیسۆر (لین هۆیس) مامۆستای زانستی مەوادو ئەندەسەی ئەوەویش هەمان ڕای هەیە.[1]

ئەگەر خوانەبێت حەزرەت کاری چییە بەوەی کە فیرعەونەکان بینای بەرزیان بەچی دروست کردووە، لە کاتێکدا لە ١٨٥٠ دا زانایەك ئاماژە بۆ ئەمە دەکات و دیراسات و تاقیکردنەوەی تازەش بە پێشکەوتووترین ئامێر ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن.

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾
القصص: ٣٨

قورئان لەم ئایەتەدا بەئاشکرا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە فیرعەونەکان چۆن لە قوڕی سوورەوکراو بینای بەرزیان دروست کردووە.

**١١- چارەسەری تووڕەبوون:** تووڕەبوون یەکێکە لەو سیفاتانەی کە حەزرەت ﷺ نەهی لێ کردووە، جارێك پیاوێکی دەشتەکی عەرەب هاتە خزمەتی و داوای ئامۆژگاری لێکرد، ئەویش فەرمووی: تووڕە مەبە! وتی: زیاتر ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: تووڕە مەبە! وتیەوە: زیاتر ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: تووڕە مەبە!

لە پێگەی(BBC)دا هاتووە کە بانکی زانیاری (کاهوت) لەسەر ئینتەرنێت دیراسەیەکی کردووە کە بەریتانیا لە ساڵێکدا لە ئەنجامی تووڕەبوون و شت شکاندندا (١٦) ملیار جونەیە زیانمەند دەبێت... ئەوەش کە تووڕە دەبێ پەرداخ و شوشەوات دەشکێنێ...دیراسەکە کەلەسەر (٧٠٠) کەس کرابوو دەڵێت: پیاوان زیاتر تووڕە دەبن لە چاو ئافرەتاندا... هەروەها دەڵێت: لە سەدا بیستی ئەوانە، قەرەباڵغی شەقامەکان هۆکاری

---

١-(پێگەی ئەندازیار عبدالدائم کحیل).

سەرەکی تووڕەبوونیان بووە، نیوەشیان لە چاوەڕێ کردنی سەر تەلەفون تووڕەدەبوون. تەنها چارەکێکی ئەوانەش دەیانزانی کە چۆن تەعبیر بکەن لە تووڕەبوونەکانیان بە شێوەیەکی ئیجابی.

(دونا دوسون) پسپۆڕ لە بواری دەروونی دا دەڵێت: تووڕەبوون شتێکی زۆر ئاڵۆزە، زۆربەی جاریش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ترسان لە زەرەرو زیان، یان ترسان لە تووشبوونی شتێك، یان ترسان لەوەی کە بێ هیوا ببێ لە شتێك.

حەزرەت ﷺ پەروەردەی موسڵمانانی کرد لەسەر ئەوەی تووڕەبوونیان بۆ خوا بێ و لەبەر خوا بێ کاتێك کە فەرمانێك یان سنورێك لە سنوورەکانی خوا دەشکێنرێ، وە بۆ خۆشی سەر مەشق بووە لەم بوارەشدا، کابرایەکی دەشتەکی هات و بە دەنگی بەرزو تووڕەییەوە وتی: ئەی محمد لەو ماڵەم بدەرێ کە خوا داوێتی پێت... هاوەڵان ئەوەندە لە شێوازی داواکەی تووڕە بوون خەریك بوو بیکوژن، حەزرەت ﷺ فریای مەوقیفەکە کەوت و فەرمووی: وازی لێبێنن بۆ من... حەزرەتﷺ پێی فەرموو: ئەوە (بیت المال) چەندت دەوێت بببە! کابرا گەورەیی و بەخششی حەزرەتی ﷺ بۆ دەرکەوت، موسڵمان بوو، دوایش هۆزەکەی هەموو هێنا موسڵمان بوون...

حەزرەت ﷺ زۆر بە دانایی چارەسەریی هۆکاری تووڕەبوونی کابرای کرد، ئەگەر وا نەبووایە دەیانکوشت و بە کافری سەری ئەنایەوە!

تووڕەبوون بەرگری لەشی مرۆڤ کەم دەکاتەوە، دکتۆرە(آنا مارشلاند) لە زانکۆی (بیتسبەرەی ئەمریکی) دەڵێت: ئەوانەی کە زیاد تووڕە دەبن بەرگرییەکی تەواو لە لەشیاندا نیە. پاش دیراسەیەکردن لە هەمان زانکۆ بۆیان دەرکەوت کە ئەوانەی تووڕەبوون وتەلقیح کران دژی (التهاب کبدی ڤایرۆشی) کەمتر سوودیان لە تەلقیحەکە وەرگرت لە چاو ئەوانەی کە تووڕەنەبوون.

زانا ئەمریکییەکان دەڵێن: هەڵچوون و تورەبوونی لاو و تازە پێگەیشتوان دەبێتە مایەی زیاد بوونی کێش و قەڵەوی و تووش بوونی نەخۆشی دڵ.

بە کورتی زیانی تووڕەبوون لەسەر دەروون و لاشەی مرۆڤ زۆرەو دیراساتەکانیش بەردەوام لەسەرتاسەری دنیادا ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن، تا لێرەوە گەورەیی ئیسلام تێدەگەین کە چۆن

کاری لەسەر ئەم لایەنە کردووەو هەوڵ دەدات موسڵمانان وا لێ بکات کۆنترۆڵی تووڕەبوونی خۆیان بکەن کە بەوەش پاداشتی چاکیان لە خواوە دەست دەکەوێت :

﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴾ الشورى: ٤٣

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴾ البقرة:١٥٣

﴿ وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴾ الشورى: ٤٠

## ١٢- ئەم ئوممەتە هەردەمێنێت:

(إن الله زوى لي الأرض. فرأيت مشارقها ومغاربها. وإن أمتي سيبلغ ملكها ما زوى لي منها. وأعطيت الكنزين الأحمر والأبيض. وإني سألت ربي لأمتي أن لا يهلكها بسنة عامة. وأن لا يسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم. فيستبيح بيضتهم. وإن ربي قال: يا محمد! إني إذا قضيت قضاء فإنه لا يرد. وإني أعطيتك لأمتك أن لا أهلكهم بسنة عامة. وأن لا أسلط عليهم عدوا من سوى أنفسهم. يستبيح بيضتهم. ولو اجتمع عليهم من بأقطارها -أو قال من بين أقطارها- حتى يكون بعضهم يهلك بعضا، ويسبي بعضهم بعضا)[١].

واتە: بێگومان خوا تەنگی زەوی بۆ هێنامەوە یەك، خۆرهەلاَت و خۆرئاوایم بینی، دەسەلاَتی ئوممەتەکەیشم دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە بۆم هێنراوەتەوە یەك، هەردوو گەنجینە سوروسپییەکەشم پێ‌خەلاَت کراوە(گەنجی قەیسەروکیسرا).هەروەها من داوام لە پەروەردگارم کرد کە ئوممەتەکەم بەگشتی بەوشکە ساڵی وقات وقڕی لەناو نەبات و، دوژمنی بەدەر لە خۆیان بەسەریاندا زاڵ نەکات بەڕادەیەك ڕەگ و ڕیشەیان لەبن دەربێنێت، هەروەها پەروەردگارم فەرموویەتی: ئەی محمد کاتێ من بڕیارێکم دەرکرد تازە گەڕانەوەی نابێت، من ئەوەم خەلاَت کردووە بە ئوممەتەکەت کە بەوشکە ساڵی وقات وقڕی بەگشتی لەناویان نەبەم ودوژمنی بەدەر لە خۆیان بەسەردا زاڵ نەکەم ڕەگ و ڕیشەیان لەبن دەربهێنێت، باوەکو هەرچی خەڵکی سەرزەوی هەیە لە هەموو لایەکەوەگەلە کۆمەکیان لێبکەن، تاوەکو خۆیان لە ناو خۆیاندا هەندێکیان هەندێکیان لە ناو دەبەن و یەکتری بەدیل دەگرن ویەکتری تالاَن دەکەن ..

---

١- مسلم

ئەم فەرموودەیە موعجیزەیە لەوەدا کە دەفەرمویٚخوا گەنجی قەیسەرو کیسرای داومەتیٚ، ئەمەش پاش چەند ساڵێك لە وەفاتی حەزرەت هاتە دی..هەروەها موعجیزەیە کەدەفەرمویٚ ئومەتەکەم نەبە وشکەساڵی و نە بەدوژمنانی دەرەکی لەناوناچن و هەردەمێنن مەگەر خۆیان بکەونە گیانی خۆیان .

ئەوە مێژووی ١٤٠٠ ساڵە سەیری بکە بزانە ئەم پێشبینیە لە سەدا سەد تەواوە یان نا، جا ئەوسا بڵیٚ (أشهد أن محمدا رسول الله)..

## ڕۆژهەڵاتناسێکی ئیتالی دیفاع لە قورئان دەکات:

دکتۆرە (ریتا) کەمامۆستای ژیاری ئیسلامی و مێژووە لە زانکۆی ڕۆما، تەمەنی لە شەست ساڵ تێپەڕیوەو، زۆر بە جوانی دیفاع لە ئیسلام دەکات و دەڵێت: من هەر کێشەیەکی ڕۆحی و عەقیدیم هەبێت دەچمەوە لای قورئان بۆ دۆزینەوەی چارەسەر، چونکە لایەنی ڕۆحی قورئان زۆر بەرزەو هیچ پەڕاوێکی تر ناگاتە قورئان، قورئان دەتوانیٚ دڵەکان زیندوو بکاتەوە، ئەم بەهێزی لایەنی ڕۆحی‌یەیە کە وای کردووە بە دەیان هەزار ئەوروپی بەرەو ئیسلام بێن لە کاتێکدا بە ملیۆنەها خەڵکی ئەوروپی بیر لە خۆکوشتن دەکەنەوە چونکە پاساوێکیان نیە کە بۆچی دەژین و بۆچی بژین...

موسڵمانان پێویستە کەناڵی فەزایی و هۆکاری ڕاگەیاندنیان هەبیٚ بە زمانی ئەوروپی تا بتوانن دوژمنانی ئیسلام دەمکوت بکەن.

هەروەها دکتۆرە ریتا ڕەخنە لە کاری بەگاورکردن دەگرێت کە ڕۆژئاوا ئەو هەموو پارەیەی بۆ خەرج دەکات و ئەنجامیشی نیە، ئەوەتا ساڵی (٢٠٠٠ز)یان دانابوو هەموو ئەفریقیا بکەنە گاور، هیچیان بۆ نەکرا.

باوکی دکتۆرە بۆ چەند ساڵێك لە خەستەخانەیەکی سعودیە پزیشك بوو، ئەمەش وای‌کرد کە دکتۆرە لەموسڵمانان تێبگات و دوایش بە قەناعەتی تەواوەوە موسڵمان ببێت، هەر ئەمەش وای لێکرد کە نەچێتە کۆلێژی پزیشکی، بەڵکو بچێتە بەشی مێژو و شارستانێتی ئیسلامی و لەوبوارەدا پسپۆری بەدەستبهێنیٚ.

## ئیسلام دەبێتە یەکەم ئایین لە برۆکسل:

پایتەختی یەکێتی ئەورووپی دەبێتە موسڵمان لە بیست ساڵی تردا، ئەمەش لە ڕۆژنامەیەکدا هاتووە کە باس لەوە دەکات ئێستا یەك لەسەر سێی دانیشتوانی شاری برۆکسل موسڵمانن، پاش پانزە تا بیست ساڵی تر دەبنە زۆرینە بەهۆی زاووزێو منداڵبوونەوە، شایانی باسیشە لە ساڵی (٢٠٠١)ەوە ناوی (محمد) زۆرترین ناوە کە لە منداڵ دەنرێت لە برۆکسل.

هەروەها ڕۆژنامەکە دەڵێت: لە کاتێکدا باوکان و دایکان ڕەنگە زۆر پابەند نەبن بە دینەوەو بیانەوێت خۆیان بگونجێنن لەگەڵ کۆمەڵگەدا، کەچی لاوان وتازە پێگەیشتوان بە گەرمی پابەندن بە دینەوەو پەرستشەکان بەجێ دێنن.

تەنانەت لە هەندێ گەڕەکدا وەك (مۆنلێن بیك) وا دەزانی هەر لە بەلجیکا نیت و لەسەر شەقامەکان ژمارەیەکی زۆر ئافرەتی بالآپۆش دەبینی.

(جان فرانسوا باستین) تەمەنی شەست و پێنج ساڵەو پاش موسڵمان بوونی پێی دەڵێن (عبداللە)، موسڵمانێکی چالاکەو لە ساڵی (٢٠٠٤)دا حیزبی لاوانی ئیسلامی دامەزراند، ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنی شارەوانی ئەم دواییەدا توانی لەو دوو دائیرەیەی خۆی تیا هەڵبژاردبوو زیاتر لە (٥٠٠٠) دەنگ بهێنێ لە شاری برۆکسل دا.

## هەوڵ بدە لە ڕیزی پێشەوە بیت:

حەز دەکەیت لەناو دەرگاکەدا دانیشی یان بچیت بەرەو ژووررو لای سەروو بگریت؟؟ دیارە ئەمەش بە دەست خۆتە، لای سەروو یان بە مانایەکی تر ڕیزی پێشەوە خێری زیاترە لە ڕیزی دواوە.

ئەگەر وتمان زوو وەرەو جێ بگرەو نەهاتی و جێ نەما لە پێشەوە لۆمەی خۆت نەبێ هی کەس مەکە.

حەزرەت ﷺ هەندێ لە هاوەڵانی دوا دەکەوتن بۆیە پێی فەرموون: وەرنە پێشەوەو نوێژ لە دوامەوە بکەن، ئەوەی دواتر دێت با بێتە دواتانەوە، بەردەوام کەسانێك دوا دەکەون تا خواش دوایان دەخات.(تقدموا فائتموا بي، وليأتم بكم من بعدكم، لايزال قوم يتأخرون حتى يؤخرهم الله)[1]

---

١- مسلم.

ئیبن جەوزی دەڵێت: (إن همت فبادر، و إن عزمت فثابر، واعلم أنه لا يدرك المفاخر من رضي بالصف الآخر)...

ئێمە ڕازی نابین بە ڕیزی دواوە لە وەستانی بەردەم ئیشاراتی مرور !

ئێمە ڕازی نابین بە ڕیزی دواوە لە سەرکەوتنی ناو فڕۆکەدا !

ئێمە ڕازی نابین بە ڕیزی دواوە لە پۆلدا !

ئێمە ڕازی نابین بە ڕیزی دواوە لەبەر دەم نانەواخانەدا !

ئیتر چۆن دەبێت ڕازی بین بە ڕیزی دواوە لە مەسەلەی ئاخیرەتدا، هەر لەبەر ئەمەشە قورئان دەفەرموێت (سارعوا، سابقوا، فليتنافس المتنافسون).

## شێوازی کارت بگۆڕە ئەگەر بەرهەمی نەبوو:

لە وڵاتێکی ڕۆژئاوا پیاوێکی کوێر شەبقەکەی دانا بوو بەڵکو هەرچی بەویادا دەڕوات خێرێکی پێبکات و شتێك پارەی بۆ دانێت، کارتۆنێکیشی لاوە دانا بوو لەسەری نووسرا بوو (من کوێرم تکایە هاوکاریم بکەن)... کوێرەکە هەستی دەکرد کەم کەس خێری پێ دەکات، پاش ماوەیەك هەستی کرد خەڵکی زیاتر لای لێدەکەنەوەو پارەی بۆ دادەنێن، تومەس کەسێکی ژیر بەوێدا تێپەڕیبوو بێدەنگ کارتۆنەکەی هەڵگێڕابووەو لەسەری نووسیبووی (لە وەرزی بەهاردایین و ناتوانم جوانیەکەی ببینم) بەمەش ئەوانەی بەوێدا دەڕۆیشتن زیاتر سۆزو بەزەییان دەجوڵا بۆی و پارەیان بۆ دانەنا...

## هەندێ خێر زۆر گرنگە لە دەستت نەچێت:

هەندێك خێر فرسەتەو مەیەڵە لە دەستت دەرچێت، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ( رَغِمَ أنفه، ثم رَغِمَ أنفه، ثم رَغِمَ أنفه، قيل مَن يا رسول الله؟ قال: مَن أدرك والديه عند الكِبَر أو أحدهما أو كليهما ثم لم يدخل الجنة).

پیاوێکی بە تەمەن بە ناوی (حەیزان) لە دێیەك کە (٩٠) کیلۆمەتر دوورە لە (بُرَيدة) وە لە وڵاتی سعودیە، لە دادگاو لە بەردەمی ئامادەبوان و قازیدا گریا، دەزانن بۆ؟! ئەم (حەیزان)ە بە تەنها دەژیا و دایکێکی پیری هەبوو لای خۆی خزمەتی دەکرد، براکەی کە حاڵی باشتر بوو دەیویست دایکیان بباتە لای خۆی تا باشتر ئاگای لێ بێو خزمەتی بکات، (حەیزان)یش ڕازی نەدەبوو، کار گەیشتە دادگا، دادوەر لە پیرێژنەکەی پرسی لای کامیان دەبیت؟، وتی: ئەمیان

ئەم چاومە و ئەوی تریان چاوەکەی ترمە، ئیتر کە دادوەر پێی باشتر بوو لای براکەی تری (حەیزان) بێت، (حەیزان) کە ئەو خێر و بەرەکەتی خزمەت کردنەی لە کیس چوو لە داخا گریا ؟!

## پاککردنەوەی دڵ و دەروون:

لاوێك هەموو بەیانیەك باپیرەی ئەبینی بەوپەڕی شەوقەوە قورئان دەخوێنێت، هەرچی سەیری خۆشی دەکرد نەیدەزانی قورئان خوێندنەکەی بۆچیە و چۆن سوودی لێوەرگرێت، بۆیە بەیانیەکیان بە باپیرەی وت: باپیرە، من هەوڵ دەدەم وەك تۆ قورئان بخوێنم، کەچی هیچی وای لێ حاڵی نابم، ئەگەر لێشی حاڵی بم بیرم دەچێتەوە، ئیتر نازانم قورئان خوێندنەکەم بۆ چیە؟!

باپیرەشی وانەیەکی کرداری دادا، پێی وت: کوڕی خۆم ئەم سەتڵەی کە خەڵوزی تێدەکەین بۆ ئاگردانەکەمان بیبە بۆ سەر ئەو ڕووبارەو ئاوی تێبکەو بۆم بهێنەرەوە... کوڕەش نەیدەزانی مەسەلە چیە! سەتڵەکەی کە خەڵوز تەواو ڕەشی کردبوو هەڵی گرت و چوو لەسەر ڕووبارەکە پڕی کرد لە ئاو و تا هاتەوە هیچی وای تیا نەما لەبەرئەوەی کون بوو! ناچار جارێك و چەند جارێکی تریش چوو پڕی کردەوە بەڵام ئاوی تیا نەدەوەستاو هیچی وای تیا نەدەما کە بیباتە لای باپیرەی، بۆیە حاڵەکەی بۆ باپیرەی باس کرد، ئەویش وتی: کوڕی خۆم ئەوە حەقیقەتی مەسەلەکەیە کە تۆ دەتەوێت، خۆ ئەگەر ئەو سەتڵە ئاویش نەگرێتە خۆی و تیاشیا نەمێنێ، سەیرکە پاك بۆتەوە بەهۆی ئەو چەند جارەوە کە ئاوت تیا هێنا؟!... کەواتە قورئان بۆ خۆی خێرو بەرەکەت و پاداشت و پاکبوونەوەیە، چەند لە خزمەتیا بیت سوودمەند و بەهرەمەند دەبیت لێی ئەگەر بەخۆشت نەزانیت، مەگەر خوا نافەرموێت:﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الإسراء: ٨٢.

## بیرت بخەرە کار شتێ زیاد بکە لە دنیادا:

ئەگەر لە دنیادا شتێك زیاد نەکەیت و جێ دەستێکت نەبێ، ئەوە تۆ زیادەیت لەم دنیایەدا، هەروەك (مصطفی صادق الرافعي) دەڵێت..

کابرایەکی ئەمریکی تەمەن (٤٤)ساڵ بە ناوی (تیری فینبرگ) هەموو بەیانیەك خۆڵ و خاشاکی بەردەرگاکەی دەبینی کە پشیلە و سەگ و حەشەرات بۆیان هەڵوەشاندووەو هەموو بەیانیەك ئەبوایە بکەوتایەتە کۆکردنەوەی و بیخستایەتەوە ناو کیسەیەکی تر، تا بیری خستە

کار و سێ ساڵ دیراسەی کرد لەسەر دروستکردنی کیسێك کە بۆنێکی لێ بێت، هیچ زیانێکی نەبێت و سەگ و پشیلەو حەشەراتیش نەچن بەلایاو حەزی پێ نەکەن.

لە ساڵی (٢٠٠٤)دا کۆمپانیایەکی دامەزراندو(٥٠)هەزار دۆلاری لە بانق وەرگرت و کەوتە کارکردن، ئێستا لە سەد بازاری گەورەی ئەمریکا کیسەکانی دەفرۆشرێن و قازانجێکی باشی دەستکەوت.

## بازرگانێکی سەرکەوتووی نەخوێندەوار:

(بول أورفيلا) کە باوك و دایکی بە ئەسڵ لوبنانی بوون و لە ئەمریکا دەژیان، هەر لە منداڵیەوە تووشی نەخۆشیەك بوو کە پێی دەوترێت (دیسلکسیا)، ئەم نەخۆشیە بە جۆرێکە کە مێشکی نەخۆشەکە ناتوانێ لە پیتەکان تێبگات و بیکات بە وشە.

هەر لە پۆلی یەك و دووی سەرەتاییەوە بول تووشی ناڕەحەتی بوو، لەم قوتابخانەوە بۆ ئەو قوتابخانە دەگوێزرایەوەو سەرەنجامیش هیچ فێر نەبوو، کەس نەیدەزانی نەخۆشیەکەی چییە، بەڵام دایك و باوکی زۆر ژیرانە مامەڵەیان لە تەکدا ئەکردو هانیان ئەدا کە بەرەو پێش بچێت و لە ژیاندا جێی خۆی بکاتەوەو دوا نەکەوێت.

(بول) لە بواری بازرگانیدا سەرکەوتنی بە دەست هێنا، سەرەتا بەوەی شوێنێکی زۆر بچکۆلەی بە کرێ گرت و جیهازێکی ئیستینساخی لێ دانا لەگەڵ پێداویستی قوتابخانەدا لە نزیك یەکێك لە زانکۆکانی نیویۆرك لە ساڵی (١٩٧٠)دا.

پاش زیاتر لەسی ساڵ ئێستا (١٧٠٠) مەرکەزی بازرگانی هەیە لە جیهانداو (٢٣) هەزار کارمەند ئیشی بۆ دەکەن و چالاکی بازرگانیەکەی زیاترە لە (٢)ملیار دۆلار.

ئێستاش ناتوانێ پاش ئەو هەموو سەروەت و سامانە بخوێنێتەوەو بنوسێت، گوێ بۆ ژنەکەی دەگرێت کە ناوی (ناتالی)یە شتی بۆ دەخوێنێتەوە.

## بەریدی (هۆت مەیڵ):

(صابر باتيا) پیاوێکی هیندی موسڵمانە و لە ساڵی (١٩٨٨)دا چوو بۆ خوێندن لە زانکۆی (ستانفۆرد) لە ئەمریکاو بە پلەی ئیمتیاز دەرچوو، ئنجا کەوتە کارکردن لە کۆمپانیایەکی ئینتەرنیت دا .

(صابر) توانی بەرنامەی (هۆت مەیل) دروست بکات لە ساڵی (١٩٩٦) دا کە زۆر بە خێرایی بڵاوبوەوەو چوار سیفاتی هەیە کە ناتوانرێ پێشبڕکێی لەگەڵدا بکرێ:

١- ئەم بەریدە بە خۆڕاییە.

٢- تاکە کەسییە.

٣- نهێنییە.

٤- دەتوانرێ لە هەموو شوێنێکی جیهانەوە بەکار بهێنرێ.

هەر ساڵی یەکەمی بەشدار بووانی لە دە ملیۆن کەس تێپەڕی، ئەمەش وای لە (بیل گێتس)کرد کە خاوەنی (مایکرۆسۆفت)ەو دەوڵەمەند ترین کەسی جیهانە، بیر لە کڕینی (هۆت مەیل) بکاتەوە تا بیخاتە (ویندۆز)ەوە.

لە ساڵی(١٩٩٧)دا (٥٠)ملیۆن دۆلاری دایە ڕازی نەبوو، داوای (٥٠٠)ملیۆن دۆلاری لێ دەکرد، سەرەنجام لە (١٩٩٨)دا بە (٤٠٠) ملیۆن دۆلار لێی کڕی و، (صابر)یش وەك ڕاوێژکار لە (مایکرۆسۆفت) دامەزرا.

ئێستا بەشداربووانی (هۆت مەیل) گەیشتۆتە (٩٠)ملیۆن کەس و ڕۆژانەش سێ هەزار کەسی بۆ زیاد دەبێت.

(صابر) لە داهێنان نەوەستا، توانی بەرنامەیەکی تر دابنێ بە ناوی (آرزو) کە لە ڕێی ئینتەرنێتەوە دەتوانی کڕین و فرۆشتنی پێ بکەی.

(صابر) ئەوەندە ناوبانگی دەرکرد، هەریەکە لە (کلینتۆن) و (شیراك) و سەرۆك وەزیرانی هیندی (بیهاری فاجبانی) دەعوەتیان بۆ کردو چاوپێکەوتنیان لەگەڵ سازدا .

شایەنی باسە کە (صابر) ئەو پارە زۆرەی دەستکەوت کەوتە کردنەوەی پەیمانگای ئاینی و هاوکاری قوتابیانی کەم دەستی وڵاتەکەی تەنانەت دەڵێن نزیکەی (٣٠٠)ملیۆن دۆلاری لەو پێناوەدا بەخت کردووە، کە بەمەش (إنشاء الله) قیامەتی بۆ خۆی دەستەبەر کردووە.

## بڵاوبوونەوەی ئاشتیانەی ئیسلام:

زۆرێك لە زانایان و دانایانی ڕۆژئاوا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئیسلام بە ئاشتی لە سەرتاسەری دنیادا بڵاوبۆتەوە، لەبەرئەوەی کە بۆخۆی توانایەکی لە ڕادەبەدەری هەیە لە ڕێنمایی و ڕێ پیشاندانددا، ئەوەتە مژدەدەری پرۆتستانتی (أرکلورسدی مونت کروسیس) کە لە سەدەی سیانزەی کۆچیدا هاتۆتە وڵاتە ئیسلامییەکان دەڵێت: (ئەو هەموو مەسیحیە عەرەبەی کە دەیبینین، بەڵگەن لەسەر ئەوەی زۆر بە ئاشتی ژیاون و تێکەڵ بە موسڵمانان بوون، ئەگەر موسڵمانان توندوتیژیان هەبوایە بەرامبەریان و بە زۆر بیانکردنایە بە موسڵمان، ئەوە تا سەردەمی عەباسیەکان مەسیحیەکان دەیانتوانی بمێننەوە، بە ڕاستی تەنها مانەوەی کەنیسەکانی مەسیحیەکان لە ئەفریقیا ئەو هەموو ماوە دوورو درێژە ئەوە ئەداتە دواوە کە بە زۆر کرابن بە موسڵمان).

هەروەها ئەمیرو ڕۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی (لیون کایتانی)(١٨٦٩-١٩٢٦) کە دیراساتی زۆری هەیە لەسەر مێژووی ئیسلام و ڕۆژهەڵات دەڵێت (عەرەبەکان کەسیان نەچەوساندۆتەوە لە پێناوی ئایندا و، هەوڵیان نەداوە بە زۆر کەس بکەن بە موسڵمان، بەهۆی ئەوەشەوە مەسیحیەکان لە ژێر سایەی ئیسلام دا دوای سەردەمی فتوحاتی یەکەم ئازادی یەکیان هەبووە کە هەرگیز لەوەو پێش بە خۆیانەوە نەدیبوو). ئینجا دێتە سەر باسی ئەو خێر و سەدەقاتەی ئەدرا بە پیرو پەککەوتە و نەخۆشە مەسیحیەکان و ئەو ئامۆژگارییەی کە خولەفای ڕاشیدین دەیان کرد بۆ چاك بوون لەگەڵ ئەهلی زیمەتدا کە دەیان وت (أوصيه بذمة الله وذمة رسوله أن يوفي لهم بعهدهم و ألا يكلفوا إلا طاقتهم).

هەروەها فەیلەسوفی ئەمریکی (جون تایلۆر)(١٧٥٣-١٨٢٤) دەڵێت: (بە ڕاستی ئاسانە بزانیت بۆچی ئیسلام وا بە خێرایی لە ئەفریقیاو ئاسیادا بڵاوبۆتەوە، ئەوەی هۆکار و یارمەتیدەر بوو بۆ بڵاوبوونەوەی ئیسلام سەرقاڵبوونی زانایانی مەسیحی بوو بە بیروڕای سەیرو سەمەرەوە وەك فەزڵی ژن نەهێنان لە ئاسماندا و بەرزبوونەوەی پلەی ئەوەی شوو ناکات بەرەو پلەی مەلائیکەت، بەلایانەوە وازهێنان لە دنیا ڕێگەی پیرۆزی بوو، خۆنەشتن و گوێ بە

خۆنەدان سیفاتی ڕاهیبی بوو، لەملاشەوە ئیسلام بیروباوەڕێکی پاك و پوختی یەکخواناسی هێنا کە لەگەڵ فیترەتدا گونجا).[1]

## لە هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئیسلام:

ئیسلام بەهۆی ئاسانی عەقیدەو گونجانی لەگەڵ فیترەتدا زۆر بە خێرایی بڵاوبۆوەو لە زۆر جێگاشدا بەبێ جەنگ دڵەکانی فەتح کرد، ئەم ڕاستیەش ژمارەیەك لە زانایان و بیریارانی ڕۆژئاوا دانیان پیا ناوە، وەك ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی پرۆفیسۆر (مونتیە)(١٨٥٦-١٩٢٧) کە قورئانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی و خاوەنی پەڕاوی (حاضر الإسلام و مستقبله)یە دەڵێ: بە ڕاستی ئیسلام لە جەوهەردا ئاینێکی عەقلانییە بە هەموو مانایەکی عەقلانییەوە، بە ڕاستی عەقیدەی ئیسلام یەکخواناسی و پێغەمبەرایەتی لە دڵ و دەروونی بڕواداردا ئەچەسپێنێ لەسەر بنەمایەکی جێگیری عەقڵ و مەنتیق. بە ڕاستی سادەیی و ئاسانی تەعالیمی ئیسلام و ڕوونییەکەی دیارترین هۆکارێتی لە بڵاوبوونەوەو چالاکی بانگەوازدا بۆی، کە ئەمەش لە غەیری ئیسلامدا بەدی ناکرێت.

ئەوەش کە پێشبینی دەکرێت بۆ عەقیدەیەك لەم جۆرە کە هیچ گرێ و گۆڵی فەلسەفی تیا نیەو هەموو کەس تێی دەگات، ئەوەیە کە توانایەکی بەهێزی سەرسوڕهێنەری هەیە بۆ کێشکردنی خەڵك بۆ لای خۆی.

هەروەها ڕۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی (مرانشی)(١٦١٢-١٧٠٠) قورئانی وەرگێڕاوە بۆ ئیتاڵی و پەڕاوی (دراسة عن الإسلام)ی نووسیوە و بەشداری کردووە لە وەرگێڕانی عەهدی (قدیم و جدید)دا، شارەزایی یەکی زۆری هەیەو ئەو شەهادەتەی ئەیدات گرنگە کە دەڵێ: (ئەگەر کەسێك بەراورد بکات لە نێوان عەقیدەی پڕ لە ئەسراری مەسیحی و عەقیدەی قورئاندا ئەوا یەکسەر واز لە عەقیدەی مەسیحی دێنێ و دەچێت بە لای عەقیدەی قورئان دا.زۆر گرنگە کە قورئان دەفەرموێت﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٌ ﴾الحجرات: ١٠ بڕواداران بە ڕاستی برای یەکترین، ئەمە لە ژیانی موسڵماناندا زۆر بە چاکی دەردەکەوێ و جێ بەجێ دەبێت.

لە لای مەسیحیەکان، قەشەکان دەستەیەکی تایبەتن و ئامادە دەکرێن بۆ کاری مژدەدان، لە کاتێکدا لە ئیسلامدا بەو جۆرە نیە).[1]

---

١- (د. محمد عمارة).

## دوعا كردن:

قورئانی پیرۆز گرنگییەکی زۆری داوە بە دوعاکردن هەروەك دەفەرمویت:

﴿ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ * فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ * وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ * وَأَدْخَلْنَٰهُمْ فِى رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ * وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ * فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ * وَزَكَرِيَّآ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِى فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ * فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴾الأنبياء: ٨٣ - ٩٠

واتە: یادی ئەیوب بکە کاتێك هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری برد (دوای ئەوەی ماوەیەکی دوورودرێژ نەخۆش کەوتبوو، (جگە لەوە پێشتریش ماڵ و سامان و منداڵەکانی تیا چووبوون) وتی: پەروەردگارا، بە ڕاستی من ئازار و ناخۆشیم تووش بووە، تۆش لە هەموو میهرەبانێك میهرەبانتریت.

جا ئێمەش نزامان گیرا کردو چووین بە هانایەوەو هەموو ناخۆشی و نەخۆشیەکمان لە کۆڵ کردەوە، هەموو ماڵ و منداڵیمان پێبەخشیەوەو ئەوەندەی تریش لەگەڵیاندا، ئەوە ڕەحمەتێکی تایبەتی بوو لەلایەن ئێمەوە، یادەوەریشە بۆ بەندە خواپەرستەکان، کە ئەگەر ئەوانیش تووشی بەڵاو ناخۆشی بوون ودوعاو نزایان کرد، خوای میهرەبان بە هانای ئەوانیشەوە دەچێت.

یادی (إسماعیل و إدریس و ذوالکفل) بکەرەوە، هەریەکە لەوان لە تاقیکردنەوە جۆراوجۆرەکاندا سەرکەوتووبوون، لە خۆگرو ئارامگران بوون. ئێمە هەموویانمان خستە ژێر سایەی ڕەحمەت و میهرەبانی خۆمانەوە، چونکە بە ڕاستی ئەوانە لە چاك و پاکانن.

---

١- (د. محمد عمارة)

یادی (ذو النون) بکەرەوە کە (یونس پێغەمبەرە) کاتێك بە تووڕەیی یەوە ڕۆیشت، گومانی وا بوو کە هەرگیز دنیای لێ تەنگ ناکەینەوە، (بەڵام بە پێچەوانەی گومانەکەیەوە خوا خستیە ناو سکی نەهەنگەوە)، جا لە ناو تاریکایەکاندا، (تاریکایی شەو و ناو دەریا و ناو سکی نەهەنگ) نزای کردو وتی: پەروەردگارا هیچ خوایەك نیە جگە لە تۆ، پاکی و بێ گەردی هەر بۆ تۆیە، بە ڕاستی من لە ستەمکاران بووم (کاتێك بەبێ ئیزنی تۆ گەلەکەمم بەجێ هێشت)، ئێمەش بە هانایەوە چووین و ڕزگارمان کرد لەو غەم و پەژارە و تەنگانەیەی کە تێی کەوتبوو، بەو شێوەیەش ئیمانداران ڕزگار دەکەین.

یادی زەکەریاش بکەرەوە کاتێك هانای بۆ پەروەردگاری بردو وتی:پەروەردگارا، من بە تەنهایی مەهێڵەوە (نەوەیەکی چاك و پاکم پێببەخشە) تۆش چاکترین زاتێکی کە دوای من و هەموو مردویەك دەمێنیتەوەو (وارسی).

ئنجا ئێمە نزاکەیان گیرا کردو یەحیامان پێبەخشی، هاوسەرەکەشیمان بۆ چاککرد کە منالی ببێ، چونکە بە ڕاستی ئەوانە چالاك و گورج و گۆڵ بوون لە ئەنجامدانی هەموو خێرو چاکەیەکدا و نزای بەکوڵیان دەکرد، بە ئومێدی ڕەحمەت و بەهەشتی ئێمە و لە دۆزەخ و خەشمی ئێمە دەترسان و ئەوان هەمیشە گەردن کەچ بوون بۆ ئێمە.

نا لێرەدا با هەڵوێستەیەك بکەین لە بەردەم ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە پایە بەرزانەدا ئەوەتا دەکەونە ئەخۆشی و ناخۆشی یەوەو دوعا دەکەن، ئەمە بێجگە لەوەی کە لە خۆشیش دا دوعایان کردووە.

دوعا بۆ خۆی عیبادەتە، ئەگەر کەسێك دوعا نەکات خوای گەورە لێی زویر دەبێت، خوای گەورە حەز دەکات بە کوڵ بپاڕێینەوە لێی (ان الله يحب الملحين في الدعاء)، هەست بە بەندایەتی خۆمان بکەین بەرامبەر خوایەکی بالا دەستی دەوڵەمەند ﴿وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا﴾ الأنبياء: ٩٠

پێغەمبەریش ﷺ کە لەم بوارەشدا مامۆستا و سەرمەشق بووە دەستی موبارەکی لە بارەگای خوادا بەرزدەکردەوە، لە سێیەکی ئاخری شەو و سبایی ساڵحاندا و لە کاتی خۆشی و

ناخۆشی دا و ئەیفەرموو (اللهم إني أعوذ بك من زوال نعمتك، وتحول عافيتك، و فجاءة نعمتك، و جميع سَخَطِك)[1].

واتە: پەروەردگارا پەنا دەگرم بە تۆ لە نەمانی نیعمەتت و دەردوبەلاّ کتو پڕەکانت...

بە ڕاستی چاکی پێکاوە، دەردو بەلاّ دەبارێت و نازانی لە کەیدا یەخەت پێ دەگرێ، سەیری دەوروبەرت بکە لەو بابەتە دەبینی، کابرایەك تووشی نەخۆشییەکی چاو بوو کە موو لەناو چاوی دەهات و چاوێکی کوێر بوو بۆ ئەوەی چاوەکەی تریشی لە دەست نەدات بەردەوام سەردانی ئەڵمانیای دەکرد بۆ عیلاج، ئەم نەخۆشییەی ئەم لە پێنج ملیۆن کەس دا یەك کەس تووشی دەبێت!

دکتۆر محمد العريفي بانگخوازی ناوداری ئیسلامی سعودی دەڵێت: چووین بۆلای دکتۆرێکی زانکۆ کە هەموو منداڵەکانی و هاوسەرەکەی و بووکەکەی کە یانزە کەس بوون لە ڕووداوێکی هات و چۆدا لەناوچوون، ئیمان و خۆڕاگرییەکەی زۆر کاری تێکردین.. ئەوەیە دەردو بەلاّی کت و پڕ، دوعا بکە پێش دابەزینی بەلاّو موسیبەت خوات لە یاد بێت، تا خواش ئەو کاتە و دوای ئەو کاتەش ئەگەر خوانەخواستە تووشی بەلاّو موسیبەت بوویت فریات بکەوێت...

هەرگیز لە دوعاکردن بێ هیوا مەبە، هیچ شتێك نیە لە بوونەوەردا لە ژێر دەسەلاّت و فەرمانی خوادا نەبێت، ئەزموونەکانیش لە بواری دوعا قبووڵ بوون دا زۆرن، دکتۆر محمد العريفي باسی دەوڵەمەندێکی سعودی دەکات کە ناوی (ناصر مكيرش)ە، ئەم پیاوە تووشی نەخۆشی جگەر بوو، دایکیشی هەمیشە دوعای بۆ دەکردو دەیووت: خوا هەروەك چۆن جگەری پێداوی ناوەهاش جگەرێکت پێ بداتەوە... ناصر ئەم دوعایە سەیر بوو بە لایەوە، چۆن خوا جگەرێکی پێ بداتەوە... ئەم دوعایە هاتەدی بەوەی کە لە ئەڵمانیاوە زەرعی جگەر پەیدا بوو، چوون بۆ ئەڵمانیاو لەوێ پارچەیەك لە جگەری (عبدالله)ی کوڕیان دایە، پاش ماوەیەك جگەرەکەی بۆ دروست بووەوە.

---

١- مسلم.

## باشترین قسه:

خوایپەروەردگار داوایلە موسڵمانان کردووەکە باشترین قسە هەڵبژێرن لە کاتیقسەکردن دا،تا وەکو شەیتان نێوانیان تێك نەدات، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ﴾ الإسراء: ٥٣

زۆر جار حەزرەتﷺ لە کاتی قسەو ئامۆژگاریدا بە ناڕاستەوخۆ بەبێ ناوبردنی کەس ئامۆژگاری کردووە، کە بەمەش قسەو ئامۆژگارییەکانی کەسی زویر نەکردووەو زۆر چاك جێی گرتووە، یان نموونەیەکی هێناوەتەوەو لە ڕێی ئەو نموونەیەوە ئامۆژگارییەکەی گەیاندووە...

پزیشکێکی زیرەك کە قسەی بۆ کۆمەڵێك کەس دەکرد بۆ خوێن بەخشین، وتی: دەریای (مردوو) لەگەڵ دەریاچەی (تەبەریە) لە یەك شوێنەوە سەرچاوە دەگرن، بەڵام دەریای مردوو نارژێتە دەریایەکی ترەوەو هیچی لێ دەرناچێت، هەمیشە مردووەو تازە نابێتەوە، بەردەوام خوێی تیا دەنیشێ، بە پێچەوانەشەوە دەریاچەی تەبەریە چونکە دەجولاَ و لێی دەرئەچێ و ئەبەخشێ زیندووەو بەردەوام ئاوەکەی تازە دەبێتەوە، کەواتە (هەرچی ببەخشێت تازە دەبێتەوەو دێتەوە جێی، ئەوەشی نەبەخشێت و چروك بێت تازە نابێتەوەو دەمرێت)، ئەم قسانە تەواو هانی خەڵکەکەی داو بەو پەڕی دڵخۆشی و قەناعەتەوە چوونە ڕیزەوە بۆ خوێن بەخشین.

## کاریگەری قسەی خێرو هاندان:

زۆرجار قسەی خێرو هاندان و، ژینگەی پاك و چاك، هۆکاری سەرەکین لە دروستکردنی کەسانی لێهاتوو و هەڵکەوتوو، لە مێژووشدا نموونە زۆرە لەسەر ئەم ڕاستیە:

١- حەزرەتﷺ کە مامۆستا و سەرمەشق بوو بۆ دروستکردنی سەرکردە و مامۆستا، گرنگی دا بە پەروەردەی کچەزاکانی (حەسەن) و (حسین)، بە زۆر شێواز هانی ئەدان لەسەر پێشەوایەتی، جارێکیان لەسەر مینبەر بوو حەسەنیش لە تەنیشتیەوە بوو فەرمووی (إن ابني هذا سيد، و لعل الله أن يصلح به بين فئتين من المسلمين). جارێکی تریش فەرمووی (هذان إبناي و إبنا بنتي، اللهم إني احبهما فأحبهما، و أحب من يحبهما).

هەروەها فەرمووی: (الحسن و الحسين، سيدا شباب أهل الجنة). دیارە ئەم فەرمایشتانەی حەزرەتﷺ هەمیشە لە گوێیاندا زرنگاوەتەوە، وە لەسەر ئەرزی واقعیشدا

هاته دی، کاتێك (حسن) تەنازولی کرد لە خەلافەت بۆ (معاویە) بەمەش یەکڕیزی کەوتەوە ناو موسڵمانان و خوا یەکی خستنەوە.

٢- عبداللە ی کوڕی مەسعود بە لای کۆمەڵێکدا تێپەڕی کە سەرمەستی دنیاو گۆرانی وتن بوون و (زازانی کندی) بە دەنگە خۆشەکەی هەمووانی هێنا بووە جۆش و خرۆش. عبدللە ی کوڕی مسعود پێی وت: (ئەگەر ئەو دەنگە خۆشەت قورئانت پێبخوێندایە تۆ ئەگەیشتیتە چ پلەیەك)...

زازان بە هاوەڵەکانی وت: ئەو پیاوە کێ بوو؟ وتیان: ئەوە ئیبن مسعود بوو! ئەمە وای لێکرد کە یەکسەر بڕیاری تەوبەکردن بدات...

ڕای کرد بە دوای عبداللە ی کوڕی مەسعوداو بە گریانەوە جلەکانی گرت و ئەویش باوەشی پیا کردو گریا و پێی وت: (سڵاو لە کەسێك کە ئێستا خوا خۆشی دەوێت)...

بەو قسانەی ئیبن مەسعود زازان لە دنیایەکەوە چووە دنیایەکی تر و ئەوپەردەی جەهالەتەی بەرچاوی گرتبوو لاچوو!

٣- یەکێ لە هۆکارەکانی گۆڕانی ژیانی عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەوە بوو کاتێك ئەمیر بوو یەکێکی بەند کردبوو، (مُزاحم) کە پیاوێکی باش و هاوکاری بوو پێی وت: ئەو کابرایەت زیاد لە پێویست بەند کردووە، ئەویش وتی: بەری نادەم تا تەواو دڵنیا نەبم لێی، مزاحم پێی وت: ئەی عومەری کوڕی عبدالعزیز، بترسە لەو شەوەی کە بەیانیەکەی قیامەتە... بە ڕاستی من خەریکە ناوەکەتم بیر دەچێتەوە، ئەوەندە بانگت دەکەن بە ناوی ئەمیرەوە... عومەر دەڵێت (هەر ئەوەندەی لە قسەکانی بوەوە، پەردەی سەرچاوم لاچوو، ئێوەش خوا ڕەحمتان پێبکات تەزکیەی نەفسی خۆتان بکەن چونکە﴿فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الذاریات: ٥٥

٤- (ئیبن قدامە)ی مەقدسی لە پەڕاوی (التوابین)دا باسی تەوبەی (بیشر الحافي) دەکات و دەڵێت: (بیشر سەرگەرمی دنیا و مەی خواردنەوەو گۆرانی وتن بوو لەگەڵ هاوەڵانیدا لە ماڵەوە، پیاو باشێك بەلای ماڵیاندا تێپەڕی و لە دەرگای دا، کارەکەرێك هاتە دەرەوە، لێی پرسی: ئەمە ماڵی حورە یان ماڵی عەبدە؟ کارەکەرەکە وتی: ماڵی حورە (ئازادە)! ئەویش وتی: ڕاست ئەکەیت ئەگەر ماڵی عەبد بوایە ئەدەبی عەبدایەتی دەپاراست!

بیشر لە ژوورەوە گوێی لە قسەکانی بوو بە پەلە هاتە دەرەوەو لە کارەکەرەکەی پرسی ئەوە کێ بوو قسەی لەگەڵ کردی؟! ئەویش وتی: لە پیاو باش دەچوو! بە پەلە بە پێی پەتی ڕۆی بە دوای کابراداو وتی: تۆ بووی لەبەر دەرگای ئێمە؟ وتی: بەڵێ، پێی وت: چیت وت بیڵێرەوە! هەمان قسەی پێ وتەوە... بیشر لە مەبەستی کابرا تێگەیشت، کە ئەدەبی عبودیەتی لەگەڵ خوادا نە پاراستووە، بە چۆکا هات و ڕوومەتی خستە سەر زەوی بۆ خواو وتی: من عەبدم، من عەبدم... ئیتر ژیانی بە یەکجاری گۆڕدرا، بووە ئەو پیاو باشەی کە ئێستا ناوی دێت زانایانی وەك ئیمامی زەهەبی لە کاتی ناو بردنیدا دەڵێت (الإمام المحدث الزاهد الرباني القدوة، شيخ الإسلام بشر بن حارث الحافي)...

ئیمام ئیبراهیمی حەربی لە بارەیەوە دەڵێت (ئەگەر عەقڵ و ژیری بیشر بەسەر خەڵکی بەغدادا دابەش بکرایە بەشی هەموویانی دەکرد و عاقڵ دەبوون)!

٥- منداڵێك بەناوی یعقوب لە سەدەی دووەمی کۆچیدا کوڕی پیاوێکی هەژاری دوکانداربوو، حەزی لە زانست بوو دەیویست لای ئەبو حەنیفە بخوێنێت و باوکیشی حەزی دەکرد لە دوکانەکەیدا یارمەتی بدات، ئەبو حەنیفە کە لێهاتویی بینی سەد درهەمی دایە و وتی: کەی تەواو بوو هەواڵم بدەرێ پارەی ترت بدەمێ .

ئەبو حەنیفە بە هاندان و یارمەتی دان توانی ئەو منداڵە بکات بە و ئەبو یوسفەی کە قاضي قضاة بوو لە زەمانی هارونە ڕەشیدا.[1]

٦- محمد کوڕی ئەحمەد کوڕی عەفانیش لاوێك بوو لە سەدەی حەوتی کۆچیدا لە ئەڵقەی قورئانیدا لە هەژدەساڵیدا هەموو قورئانی لەبەرکرد .کاتێك شێخەکەی دەست و خەتی بینی پێی وت: دەست وخەتت لە دەست وخەتی ئەهلی حەدیس دەچێت، ئەمە وای لێکرد بڕوا بەرەو فەرموودەو ببێ بەو زانایەی کە بە (الذهبي) ناویانگی دەرکردووە و خاوەنی زیاتر لە دووسەد بەرهەم وەك (سير أعلام النبلاء)و (تأريخ الاسلام) و..هتد.[2]

لەملاشەوە ئەبێ بزانین کە نەزانی و بێئاگایی لە قسەدا کاریگەری خراپی دەبێت لەسەر بەرامبەر، بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی کۆمپیوتەر بەرنامەی دائەنا بۆ دانیشتن لەگەڵ

---

١- (المجتمع١٨٣٠).

٢-(المجتمع ١٨٣٠).

بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی گەورەدا بۆ مۆرکردنی گرێبەستێکی گرنگ، بۆ ئەمە باشترین ئەندازیاری خۆی بانگ کرد و پێی وت: هەفتەی داهاتوو کۆبوونەوەیەکی گرنگمان هەیە لەگەڵ بەهێزترین ڕکابەرماندا، بۆیە دەمەوێ لەجیاتی ئەم جلە وەرزشی و تراکسودەی بەرت خۆت سپۆرت بکەیت و قات لەبەر بکەیت و بۆینباخ ببەستیت، تا جل و بەرگت لایەق بەو کۆبوونەوەیە بێت...

ئەندازیارەکە هەر کە لای بەڕێوەبەرەکەی دەرچوو، بڕیاری دا واز لە کۆمپانیاکەی بهێنێ و بۆ خۆی کۆمپانیایەك دروست بکات، کە بە ئارەزووی خۆی چ جلێکی بوێ لەبەری بکات و لە جیاتی گوێ دان بە ڕواڵەت گوێ بدات بە کارکردن و ئیبداع کردن.

پاش وازهێنانی ئەم بەڕێوەبەرەکەی نەیتوانی ئەو گرێبەستە مۆر بکات و ئەو (صفقە)یەی کە زۆر گرنگ بوو بە دەستی بهێنێ...

ئەمیش پاش یەك ساڵ هەوڵ و ماندوو بوون توانی لەگەڵ کۆمپانیا گرنگەکەدا ئەو گرێبەستە گرنگە مۆر بکات و لە بازاڕدا پێش کۆمپانیا کۆنەکەی خۆی بکەوێ کە کاری تیا ئەکرد بەبێ ئەوەی قات و بۆینباخیشی لە بەردا بێت... چیرۆکێکی لەم شێوەیەش بەسەر (بیل گیت)دا هات و سەرەنجام بۆ خۆی کاری کردو بووە دەوڵەمەندترین کەسی دنیا.

دیارە ڕواڵەتیش بەشێکە لە کارەکەو لە شوێن و کاتی دیاریکراودا پێویستە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە ئەم مەسەلەیە بەڕێوەبەرەکەی نەیتوانی بە جوانی بیگەیەنێ، نەیتوانی بە جوانی قەناعەتی پێبکات...

بێینە سەر باسی وتاربێژ و مامۆستا بەڕێزەکان تا پێم بڵێ: چەند وتاربێژمان هەیە لە ماوەیەکی کورت دا بتوانێت بە جوانی و بە چاکی ئەوەی پێویستە بیگەیەنێ بە خەڵکی، دیارە زۆر کەم مەگەر (إلا ما رحم ربي)...

## بەرەکەتی تەمەن :

ئیمامی عومەر دوعای دەکرد کە (اللهم إنا نسألك صلاح الساعات، والبركة في الأوقات) واتە: پەروەردگارا ئێمە داوای سەلاح و چاکی ساتەکانی ژیانمان و بەرەکەتی تەمەنمان دەکەین لێت.

دیارە بەشێکی تەمەن بە منداڵی و بە فێربوونەوە دەڕوات، ئینجا ئەو بەشەی دەمێنێتەوە گرنگ ئەوەیە چۆن سوودی لێ ببینرێ و چۆن بەرهەمداربێ. زۆر کەس دێت و دەڕوات و هیچی نەکردووە، کەسانێکیش هەن زۆر چاك سوود لە تەمەنیان وەردەگرن و بە ئاشکرا ئەو بەرەکەتە دیارە کە باسمان کرد، بۆ نموونە: ئیمامی نەوەوی (٤٥) ساڵ ژیا، بەرهەمێکی زۆری هەبوو، کە نیشانەی تەمەنی پڕ بەرەکەتیێتی.

لە زەمانی تازەشدا کەسێك بەناوی(حامد رەبیع) (٦٤) ساڵ ژیا، توانی لە ماوەی ژیانیدا حەوت دکتۆرا بە دەست بهێنێت لە چەند بوارێکدا، نموونەی تریش لەم بوارەدا زۆرن...

هەموو شتێك لە ژیانتا بەناوی خواوە دەست پێ بکەو کۆڵ مەدە، تۆ هەوڵت لەسەرە و سەرەنجامیش خوا کەریمە...

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ * خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ * اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ * الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴾ العلق: ١- ٤

خواوەند دەستی ڕێزی لە مرۆڤ ناوە کە زانست و زانیاری پێ بەخشیوەو، هەوڵدان لەو پێناوەشدا جۆرێکە لە عیبادەت، هەرچەند بە داخەوە ئەمڕۆ ئوممەتی (اقْرَأْ) ناخوێنێتەوە...

دکتۆر (عبدالكريم بكار) دەڵێت: کەسی بە توانا و سەرکەوتوو ساڵی بەلای کەمەوە (٥٠) پەڕاو دەخوێنێتەوە، واتە مانگی نزیکەی نزیکە چوار کتێب، ئەگەر (٥٠) نەبێ، هیچ نەبێ نیوەی کە دەکاتە (٢٥) و مانگی نزیکەی (٢) کتێب، ئەی چی دەڵێی بەوەی ساڵی کتێبێکیش ناخوێنێتەوە و هەر ئەڵێی ئاو لایداوە!!

حەزرەت ﷺ دەفەرموێت: (اعذر الله إلى امريء أخَّرَ أجلَه حتى بلغه ستين سنة)[1] ، واتە: خوا بیانووی کەسێکی نەهێشتووە کە شەست ساڵ تەمەنی داوەتێ... لە شەست ساڵدا ئەگەر

---

١- بخاري.

بیستساڵیشی لێ لابەی بە ڕاستی (چل) ساڵ کەم نیە، یەکێکی وەکو سەعدی کوڕی مُعاذ تەنها بە حەوت ساڵ ئیسلامەتی گەیشتە پلەیەك کە کاتێك وەفاتی کرد حەزرەت ﷺ فەرمووی: عەرشی خوای بۆ لەریوەتەوە (اهتز لە عرش الرحمان)... سبحان الله چ پلە و پایەیەکە... تەنانەت هاوەڵان کە جەنازەکەیان هەڵگرتبوو سووك بوو بە دەستیانەوە، حەزرەت ﷺ فەرمووی: مەلائیکەتان لەگەڵیان هەڵگرتوون... (خۆزگەمان بە خۆی).

## دڵی خەڵك خۆش بکە :

یەکێك لەو ڕێگایانەی کە بە هۆیەوە خوا لە خۆت ڕازی ئەکەیت ئەوەیە کە دڵی خەڵکی خۆش بکەیت، حەزرەتﷺ دەفەرموێت (ان أحب الأعمال الى الله تعالى بعد الفرائض إدخال السرور على المسلم) واتە: باشترین کردەوە لای خوای پەروەردگار لە دوای فەرزەکان خۆشی‌یەکە بیدەی بە موسڵمانێك...

بزانە چی دڵی دەوروبەرەکەت خۆش دەکات، حەزرەت ﷺ زیاتر ئەمە ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێت (تكشف عنه كرباً، أو تقضي عنه ديناً، أو تطرد عنه جوعاً) واتە:(بەڵاو موسیبەتێکی لە کۆڵ کەیتەوە، یان قەرزێکی بۆ بەیتەوە یان برسێتی لێ دوورخەیتەوە)...

ئنجا حەزرەت ﷺ دەفەرموێت (و لأن أمشي مع أخي المسلم في حاجةٍ أَحَبٌّ اليَّ من أعتكف شهراً في المسجد)... واتە: ئەگەر لەگەڵ برایەکی موسڵماندا بڕۆم بۆ جێبەجێ کردنی کارێکی، بەلامەوە باشترە لەوەی مانگێك لە مزگەوتدا ئیعتیکاف بکەم...

پاشان حەزرەت ﷺ دێتە سەر مەسەلەیەکی گرنگی تر کە هەرچی ئارام بگرێ و ڕقی خۆی نەڕێژێ بە خەڵکی و دەسەڵاتیشی هەبێت، ئەوە خوای گەورە پاداشتی گەورەو هیوای چاك دەخاتە دڵیەوە لە قیامەتدا(ومن كف غضَبَهُ ستر الله عورته، ومن كظم غيظه ولو شاء أن يمضيه أمضاه ملأ الله فى قلبه رجاءً يوم القيامة، ومن مشى مع أخيه المسلم في حاجةٍ حتى يُثبتها له ثبتَ الله قَدَمَهُ يومَ تَزَلُ الأقدام)[1].

برایەکی بانگخوازی عێراقی دەیەوێت خزمەت بە ماڵێك بکات کە باوکیان مرد بوو، چەند مناڵێکی لە پاش بەجێ مابوو کە هاتوچۆی مزگەوتیان دەکرد، ئەم برایە داوای لە برایەکی خاوەن پیشە کرد کە یەکێ لەو مناڵانە لە پشووی هاویندا لای خۆی بخاتە کار، لەبەر

---

١- رواه الطبراني.

ئەوەی خاوەن کارەکە هیچ پێویستی بەو منالە نەبوو، ئەو برایە خۆی ئەو دوو سێ مانگە پارەی ئەدایە تا بیدات بە منالەکە، تا بەمەش لە هاوەڵی خراپ دووری بخاتەوەو فێری کارێك ببێ و خۆشی بچێتە دڵیانەوە کە یەکێکیان ئیش دەکا و فێری هەڵگرتنی باری مەسئولیەت بێ.

## هەوڵدان بۆ ئیسلام:

هەوڵ و تێکۆشان بۆ ئیسلام لە هەموو بوارێکدا، جیهاد بە هەموو شێوازێکیەوە هۆکارێکی گەورەیە، دەرگایەکی والایە بۆ چوون بەرەو ڕەزامەندی پەروەردگار... مێژووی پڕ سەروەری موسڵمانانیش پڕن لە وانەی زۆر بۆ هەرکەسێك بیەوێت... ئیبراهیمی کوڕی أدهم لەگەڵ ئەوەی کە چەند زاهید و خواناس بوو، تێکۆشەرێکی نموونەیش بوو، تا ئەو کاتەی وەفاتی کرد لە ساڵی(١٦٢)ی کۆچیدا، بەردەوام بوو لەسەر جیهاد کردن، لە ڕۆژەکانی کۆتایی ژیانیدا لە دورگەیەك لە دورگەکانی بەحری ڕۆم دا بوو لەگەڵ سوپای ئیسلامدا، کە زانی مەرگی نزیکەو دوا ساتەکانی ژیانێتی داوای کرد کە تیرو کەوانەکەی بۆ بهێنن، تیرو کەوانەکەیان بۆ هێنا، گرتی بە دەستیەوە تا گیانی سپارد...

دیارە هەرچۆن بمریت ئاوا زیندوو دەکرێیتەوە، لە حاڵەتی جیهادا مرد بەو حاڵەتەش کە باشترین کارو کردەوەیە لای خوا زیندوو دەکرێتەوە! بە ڕاستی دواساتەکانی ژیان و عاقیبەت خێری مەسەلەیەکی گرنگە، شێخ عبدالحمید کشك وتاربێژی بەناو بانگی میسری کە هەرچەند نابینا بوو، خوای گەورە بەسیرەتی ئیمانی دابوویە، ڕۆڵێکی زۆر گەورەی بینی لە میسر و جیهانی ئیسلامیدا، لە سوجدەدا گیانی سپارد...

ناوبراو دەڵێت: زۆر حەزم دەکرد خەو بە حەزرەتەوە ببینم ﷺ، شەوێك لە خەوما بە خزمەتی گەیشتم نوێژی دەکرد و منیش لە پشتیەوە بووم، کە سەلامی دایەوە بە دەستی موبارەکی عەمامەکەی بۆ بەستم، بۆیە ئەو عەمامەیە سەر بۆ کەس دانانەوێنێ (بەهەزاران ڕەحمەتی خوات لێ بێ)...

## گەشتیارێکی بانگخوازی ڕۆمانی:

لە (١٥)ی مایو (٢٠٠٨)دا گەشتیاری ڕۆمانی (ستیفان لیسا) خۆی و هاوسەرەکەی کە گەشتێکیان دەستپێکردووە بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆیانەوە کە لەسەری نوسراوە (ئیسلام ئاینی ئاشتی یە)، گەیشتنە سعودیە و پاشانیش سەردانی (ناوچەی مەدام)یان کرد لە ئیمارات و سەرۆکی شارەوانی ناوچەکە یان بینی، کە پێشوازییەکی گەرمی لێکردن بۆ ئەو هەوڵانەی کە ئەیدا بۆ ناساندنی ئیسلام لە هەموو ئەو شوێنانەی کە بۆی دەچێت، کە بووە هۆی موسڵمانبوونی (٨٢)کەس بە تایبەت لە ئەمریکا.

(ستیفان لیسا) دەڵێت (لە وڵاتی ئیمارات میوانداریییەکی زۆر چاکیان کردین) ئینجا دێتە سەر گەورەیی ئیسلام و باسی چیرۆکی موسڵمانبوونی خۆی دەکات و دەڵێت: (لە یەکێ لە گەشتەکانمدا لە تورکیا هاوڕێ لەگەڵ هاوسەرەکەمدا، پیاسەمان دەکرد، بە هەرکەس دەگەیشتم سەلامم لێ دەکردو هەستم بە ئارامییەکی زۆر دەکرد لە دەروونمدا، جا کاتێ لە یەکێ لە لادێکانی تورکیا بووین پرسیاری ئوتێلمان کرد، ئوتێل نەبوو پیاوێکی موسڵمان دەعوەتی کردین و شەو لەماڵیان ماینەوەو زۆر خزمەتیان کردین، ئەمە وای لێکردم کە لە بارەی ئاینەکەیەوە پرسیار بکەم و بگەڕێم بە دوای ئیسلامداو سەرەنجامیش بەوپەڕی قەناعەتەوە خۆم و هاوسەرەکەم موسڵمان بووین).

ئاویراو بە نیازە سەردانی هیندو بەنگلادیش و بۆرما و تایلاند و چین و هۆنگ کۆنگ و تایوان و یابان و سەنغافورە و ئەندۆنیسیا و ئوسترالیا و نیوزیلاند و ئەمریکا و ئەوروپا بکا و پاشان بچێتەوە وڵاتەکەی خۆی.[١]

## زیاد بوونی موسڵمانبوون لە ئیمارات:

(بنکەی موسڵمانی تازە) لە ئەبوڤبی ڕایگەیاند کە ژمارەی ئەو بیانیانەی موسڵمان دەبن بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووەو جەختی کردۆتە سەر ئەوەی کە (٦٣٠) کەسی بیانی لە سەرەتای دامەزراندنی بنکەکەوە لە پێش چوار ساڵەوە موسڵمان بوون کە لە(٧٠٪)یان ئافرەتن.

---

١-(almotamar.net)

(محمد ناصر) بەڕێوەبەری بنکەکە دەڵێت (هەفتانە نزیکەی (١٠) کەس موسڵمان دەبن، کە نیوەیان زیاتر فلیپینین).

هەروەها دەڵێ هیچ جۆرە پڕوپاگەندەیەکم نەکردووە بۆ بنکەکەمان و سەرەتا کاری بانگەوازمان بە نوسینگەیەکی بچوك دەست پێکرد بۆ بڵاوکردنەوەی کتێبی ئیسلامی و بەوەش خەڵکانێکی زۆری بیانی سەردانیان کردین کە حەزیان بە ناسینی ئیسلام بوو.

## پیاوێکی یەهودی موسڵمان بوو:

(ئارون کوهین) پیاوێکی ئاینی یەهودی یەو هاوسەرەکەی ناوی (ڤلوری) و کچەکەشی (میری) ناوە، هەموویان پێکەوە موسڵمان بوون لە شاری ئەستەنبوڵ لە تورکیا.

ئارون تەمەنی (٤٥) ساڵەو لە کەنیسەی جوولەکەکاندا لە ئەستەنبوڵ ماوەی سی و پێنج ساڵە کار دەکات و، کارەکەشی خوێندنەوەی هۆنراوە ئاینیەکانە لە کاتی مەراسیمە ئاینیەکاندا، بە هۆی ئەوەی دەنگی خۆش بوو. ژنەکەی مامۆستایە لە یەکێ لە قوتابخانە فەرەنسیەکاندا...

ئارون پاش موسڵمانبوونی دەڵێت (من ڕێزم هەیە بۆ هەموو ئاینە ئاسمانیەکان، ئیسلامیش ئاینێکی تێرو تەواوەو دوا پەیامی خوایەو، بە ڕاستی قورئانی پیرۆز هەموو پەیامە ئاسمانیەکانی لە خۆگرتووە) .

## سیمینارێك لە سوید:

لە بەرواری (٢٠٠٨/١٠/٩) لە شاری یۆتۆبۆری سوید سیمینارێك سازدرا لە هوتێل لیسوبێری هێدن، لە ژێر ناوی (ئاینی ئیسلام و ڕۆڵ و کاریگەری ئەم ئاینە لەسەر کۆمەڵگای سویدی) بۆ پرۆفیسۆر (نۆکێ ساندێر) سەرۆکی بەشی ئەدیان لە زانکۆی یۆتۆبۆری و پسپۆر لە ئیسلامناسی و بانگخواز مامۆستا (ئەحمەد موفتی) بەرپرسی مەکتەبی ڕاگەیاندنی ئیسلامی سویدی. کە زیاتر لە سێ کاتژمێری خایاند بە ئامادەبوونی نوێنەری هەر شەش پارتە سیاسیەکەی سوید و ژمارەیەکی زۆری کەسانی ئەکادیمی و سیاسی ئەم شارە.

پرۆفیسۆر نۆکی لە وتەیەکدا وتی: (ئیسلام بەشێکە لەم کۆمەڵگایە و ئەبێت ڕێز لە بیرو باوەڕیان بگیرێت، ڕاستە ئێمە لەگەڵ ئازادی بیروڕاین بەڵام بڵاوکردنەوەی کاریکاتێرەکەی (لاش ڤیلکس) لە سوید لەسەر پێغەمبەری ئیسلام ئیهانەیەکە بە شوێنکەوتوانی ئیسلام، من لە

گەلێتانم کە هەستان بریندار کراوەو ئازارتان چەشتووە، بەڵام ئەوەش جێگەی ڕێزو پێزانینە کە موسڵمانانی سوید هیچ پەرچە کردارێکی توندیان نەبوو لەم کۆمەڵگایە بەهۆی بڵاوکردنەوەی کاریکاتێرەکە، چونکە خۆیان بە بەشێك لەم کۆمەڵگایە دەزانن و نایانەوێت پەشێوی ڕوو لەم وڵاتە بکات).

هەروەها ئەندازیار ئەحمەد موفتی، بانگخوازی بەناوبانگی کورد لە سوید لە بەشێکی وتەکەیدا وتی: (زۆرێك لە موسڵمانان بۆیە نیشتەجێی ئەم وڵاتەن چونکە ڕێزی ئاینەکان گیراوەو بەها ئینسانی و دیموکراسیەکان کاری پێدەکرێت و ئیسلام بۆتە بەشێکی دەنەبڕاو لەم کۆمەڵگایەو، بۆ هەر ڕووداو و پێشهاتێك ئەبێت بە زمانی حیوارو گفتوگۆ چارەسەری بکەین.

دوا بە دوای ئەوە (فاتیمە فالك) ئەندامی شارەوانی و نووسەرو ڕۆشنبیر (کەتەرینا هیگلێد) بە وتەیەکی کورت بەشداریان کردو هەروەها هەریەك لە نوێنەری پارتە سیاسیەکانی سویدیش بە پرسیارو وەڵام سیمینارەکەیان دەوڵەمەند کردو خوازیار بوون ئەم جۆرە سیمینارە بەردەوام بێت بۆ ئەوەی زیاتر موسڵمانان و خەڵکی ئەم وڵاتە لەیەك بگەن. هەروەها بەڵێنی ئەوەشیان دا لە بەرامبەر هەر گرفت و کێشەیەك کە ڕوو لە موسڵمانن دەکات بە زووترین کات لە ڕێگەی زمانی حیوارو دیالۆگ چارەسەری بکەن.

نوێنەری پارتەکان داوایان لە بانگخواز ئەحمەد موفتی کرد کە سەردانیان بکات بۆ ئەوەی کۆڕی تایبەتی بۆ بگێڕن لەسەر ئیسلام، ئەوەی جێی ئاماژەیە ئەحمەد موفتی لە ڕێی وتارو کۆڕەکانیەوە کە هەموو ڕۆژی یەکشەممەیەك لە هۆڵی قەڵاچۆکردنی ئەلکهول لە شاری یۆتۆبۆری سویدی ئەنجامی دەدات تا ئێستا زیاتر لە (١٢٧) کەسایەتی سویدی لە مامۆستای زانکۆو یاساناس و پزیشك و قوتابی زانکۆ لەسەر دەستیا موسڵمان بوون، لە ١٢/١٠/٢٠٠٨ یشدا لە هەمان هۆڵ فەرمانبەری دەزگای ئیداری (ڕۆبەرت ستراندت)ی تەمەن ٢٣ساڵ موسڵمان بوو بەهۆی وتاری (ئەحمەد موفتی)یەوە کە لە ژێر ناوی (ئەرکی مرۆڤ و بەرپرسیاریتی لەسەر زەوی)دا بوو..[1]

---

١- پێگەی یەککرتوو.

## یانزە قەشە موسڵمان دەبن:

یانزە قەشە لەچەند شوێنێکی کۆماری (تۆگۆ) لە ئەفریقیا موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند لە ئاهەنگێکدا کە بانگخوازانی(ڕێکخراوی بانگەوازی ئیسلامی جیهانی) سازیان کرد.

## موسڵمانبوونی هاوڵاتیانی دورگەی (بابوغینیا) :

یەکێ لە ئیمامەکانی دوورگەی(بابوغینیا) کە نزیکە لە ئیندۆنیسیاوە لە خوارووی ڕۆژئاوای ئۆقیانووسی هادی، لە چاو پێکەوتنێکدا لەگەڵ شەبەکەی (ABC)ی ئەمریکی دا دەڵێت: (ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان لە دوورگەکەمان لە ساڵانی (١٩٨٠)ەوە دێن بەرەو ئیسلام، زۆردێمان هەیە بەتەواوی موسڵمان بوون، واش پێشبینی دەکرێت لە بیست ساڵی تردا هەموو هاوڵاتیانی دوورگەکە موسڵمان بن...

ئەمەش لەبەرئەوەی کە پەیڕەوی کردنی ئیسلام ئاسانە و مرۆڤ بۆ خۆی دەبێتە ئامۆژگاریکاری خۆی و خوای پەروەردگار لە هەموو شوێنێك و لە هەموو کاتێکدا لەگەڵتایەو، مرۆڤ لە ئیسلامدا خۆشی و بەختەوەرییەکی زۆری دەست دەکەوێت).

## بنکەیەکی ئیسلامی لە بولغاریا:

موفتی گەورەی بولغاریا (ئەلیشا حاجی) لە خۆ ئامادەکردندایە لەگەڵ عومدەی شاری (صۆفیا)ی پایتەخت بۆ کردنەوەی بنکەیەکی رۆشنبیری بۆ ئامادە کردنی بانگخوازان.

عومدەی شار (بویکو بارسیف) دەڵێت: (پێویستە ڕێ بدرێ بە موسڵمانان لە بولغاریا کە فێری ئاینەکەیان بن).

## موسڵمان بوونی پەرستارێکی هندوسی:

(منی بانکیر)ی تەمەن (٢٥)ساڵ پەرستارێکی هیندی و، مێردەکەی مافناسێکی گەورەی هیندی بوو، کچێکی شەش ساڵانیان هەبوو، بۆ کارکردن هات بۆ وڵاتی سعودیەو ڕۆژانە موسڵمانانی دەبینی کە پێنج فەرزە نوێژیان دەکرد لە ناو مزگەوت و تەنانەت لەسەر جادەو شۆستەکانیش، وردە وردە کەوتە بەراوردکردنی ئیسلام و ئاینی هیندۆسی و سەرەنجام بە قەناعەتەوە موسڵمان بوو، پەیوەندی کرد بە مێردەکەیەوەو بانگی کرد بۆ ئیسلام، مێردەکەی زۆر خراپ وەڵامی دایەوەو وایزانی ژنەکەی تووشی نەخۆشی دەروونی بووە، کە سەرەنجام بۆی

دەرکەوت لەوپەڕی قەناعەتەوە موسڵمان بووە، لە یەك جیابوونەوە، بەمەش دەستی لە مێرد و لە کچە شەش ساڵانەکەی هەڵگرت کە دیارە ئەمەش لەسەر دڵ و دەروونی دایك زۆر قورسە، بەڵام بۆ خوا دەستی لە هەموو شتێك هەڵگرت.

(منی) کەوتە بانگەواز کردن و وتاردان و حەوت کەس لەسەر دەستیا موسڵمان بوون، دوایش شووی کردەوە بە موسڵمانێکی هیندی ناوی (عبدالقادر) بوو بەیەکەوە خێزانێکی موسڵمانیان پێکهێنا.

## محمد سیتی خێرخواز:

ئەم کەسایەتیە هەشتا ساڵ لەمەوبەر لە خێزانێکی دەوڵەمەندی (سیخ) لە پاکستان لە دایك بووە، لەسەر عادەتی ماڵە دەوڵەمەندەکان کە منداڵەکانیان دەنارده لای مامۆستای چاك، ئەمانیش منداڵەکەیان ناردە لای مامۆستایەکی چاکی موسڵمان، ئەویش بە خوو ڕەوشتی بەرزی کاری تێکردو سەرەنجام موسڵمان بوو...

خێزانی (محمد سیتی) بە موسڵمانبوونی زۆر بێتاقەت بوون و حاشایان لێکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی (محمد) چاوکراوەو بلیمەت بوو لە بازرگانیدا پێشکەوت و ماڵ و سامانێکی زۆری پێکەوەنا، ژنی هێنا و منداڵەکانی خستە قوتابخانەی لەبەرکردنی قورئانەوە، بەڵام منداڵەکانی لەو قوتابخانانەدا بەردەوام نەبوون، ناوبراو زۆر خەمی دەخوارد بەوەی کە منداڵەکانی نەبوونە حافزی قورئان، بەڕێوەبەری قوتابخانەکە کە زانی ئاوەها بە خەمی لەبەر کردنی قورئانەوەیە پێی وت: مادام تۆ ئەوەندە گرنگی ئەدەیت بە لەبەرکردنی قورئان، وەرە گرنگی بدە بەم قوتابخانەیەو یارمەتی بدەو پێشی بخە، ئەو قوتابیانەش هەموو وەك کوڕی تۆن).

(محمد) ئەم بۆچوونەی بەلاوە پەسەند بوو، بیری کردەوە مامۆستای باشیان بۆ دابین بکات، بۆ ئەمەش سەردانی مەککەی پیرۆزی کرد و گەڕا بە دوای مامۆستای باشدا کە لەسەر مەسرەفی خۆی بیانبات بۆ پاکستان بۆ وتنەوەی وانەی قورئان، لە مەککە چی گەڕا بۆی دەرکەوت کە لایەنێك نیە گرنگی بدات بە لەبەرکردن و فێرکردنی قورئان، هەرچەندە لەناو مزگەوتەکاندا لێرەو لەوێ ئەڵقەکانی لەبەرکردنی قورئان و فێربوونی هەبوو.

لە دڵی خۆیدا وتی: جا باشە قوتابخانەی لەبەرکردنی قورئان لە مەککەدا هەبێ لە پێشترە و باشترە یان لە پاکستان... دیارە لە مەککە هەبێ باشترە، بۆیە بیرو بۆچوونی خۆی لەو

بارەیەوە لای زانایانی مزگەوتی حەرام باسکرد ئەوانیش کارەکەیان بەلاوە باش بوو... بەمەش یەکەم جەمعیەی لەبەرکردنی قورئانیان لە سعودیە دامەزراند لە ساڵی١٣٨٢ی کۆچیدا، ئینجا لە پاکستانەوە سەد مامۆستای هێنا بۆیان تا لەو جەمعیەدا کاربکەن بۆ فێرکردنی قورئان.

دوای دوو ساڵ، چوو بۆ مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە مەدینە هەمان جەمعیەی دامەزراند و لە دوای دوو ساڵی تر لە (ریاض)یش هەمان کاری کرد.لە ریاچ جەمعیەکە بە پێنج مزگەوت دەستی پێکرد، ئێستا لە سایەی خواوە سەدو بیست هەزار کەس لە کورو کچ لەو قوتابخانە قورئانیانەدا خەریکی فێربوون و لەبەرکردنی قورئانن.

ژمارەی جەمعیاتەکانیش ئێستا لە سعودیەدا گەیشتۆتە (١٢٠) جەمعیە، ئەم کارە خێرە ولاتانی تریشی گرتەوەو ئێستا لە زۆر ولات دا (جەمعیاتی تحفیظ) قورئان فێری خەلکی دەکەن وهانیان ئەدەن لەسەر لەبەرکردنی... ئاشکرایە خێری هەموو ئەوانەش بۆ (محمد سیتی) دەنووسرێ کە خاوەنی فکرەکەیەو لەو پێناوەدا ماندوو بووە...[١]

## نامەیەك لە شێخ (عائض القرني) یەوە بۆ (نیلسۆن ماندیلا):

شێوازی بانگەوازکردن بۆ دینی خوا لە کات و شوێن و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕدرێت، بانگخوازی بۆ خوا سوڵحاو هەردەم لە خەیاڵی ئەوەدایە چ شێوازێك باشترە بەکاری بهێنێ بۆ بانگهێشت کردنی خەلکی بەرەو ئیسلام...

شێخ(عائض القرني) کە یەکێکە لە بانگخوازە هەلکەوتووە بلیمەتەکان، خاوەنی ژمارەیەکی زۆری وتار و پەڕاوەو بەردەوام لە کەناڵە فەزاییەکانەوە بەرنامەکانی دادەبەزن لە بارەی ئیمان و ئیسلامەتی و ژیاننامەی حەزرەتەوە ﷺ شێخ (عائض) خوێنەرێکی چاکەو لە سەردەمی لاوێتیەوە شەیدای پەڕاوەو لەم بارەیەشەوە پەڕاوێکی نووسیووە بە ناوی (العاشق) کە باسی عەشقی خۆی دەکات بۆ پەڕاو، ئەمە بێجگە لەوەی کە ئەدیب و نوسەرێکی چاکەو بە هەزاران دێڕ شیعریشی لە بەرە.

---

١- گۆڤاری البیان ژمارە /٢٥٣.

شێخ (عائض) ژیاننامەی (نیلسون ماندێلا) کەسایەتی ناوداری خوارووی ئەفریقیا و جیهان دەخوێنێتەوە، پاشان وەك ئەرکێکی سەرشانی ئەم کەسایەتیە بانگ دەکات بۆ ئیسلام و دەڵێت:

لە: (عائض القرني)یەوە

بۆ: سەرۆك نیلسۆن ماندێلا

سڵاوێکی گەرمت لێ بێت سەرکردەی مەزن:

من یەکێکم لەو ملیۆنەها کەسەی کە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ژیاننامەکەتیان خوێندۆتەوەو هەوڵو خەباتتیان زانیوەو،سەرسام بوون بەخۆگریت، سەرسام بوون بە قوربانیدان و تێکۆشانت لە پێناوی بیروباوەڕەکەتدا، لە پێناوی ئازادی خۆت و ئازادی گەلەکەتدا، تا بوویتە ئەستێرەیەك لە ئاسۆی ئازادیداو، بوویتە سەرکردەیەکی جیهانی لە قوتابخانەی خەباتداو، مامۆستایەکی عەبقەری لە دەستووری مافی مرۆڤدا.

بە ڕاستی خەڵکی لە تۆوە چیرۆکی خەباتیان وەرگرتووەو، لە تۆوە سوودمەند بوون بە سەرگوزشتەی پایەبەرزی و سروودی کۆڵنەدان و تەحەددی، بەمەش جەنابتان بوونە باوکی زۆرێك لەو چەوساوانەی کە ماف خوراون و، لە زێدی باوو باپیرانیاندا چەوسێنراونەتەوەو، زۆرداری مەحرومی کردوون لە ژیانێکی خۆش... ئەوان لە تۆدا نموونەیەکی زیندوو دەبینن، سەرمەشقێکی چاك دەبینن لە ئارامگرتن و سووربوون و بەردەوامی دا، لە ڕەفزکردنی ستەمدا و بەردەوام بوون لە بەخشین و بەخت کردندا، تا مافەکان بەدەست دێن.

ئەی سەرکردەی مەزن:

بە ڕاستی ئیسلام -ئاینی ڕاستی خوا- ئاینێکی مەزنە، گەورە پیاوانی خۆش دەوێو ڕێز لە داهێنەران دەگرێت، دەست خۆشی لە شەریفەکان دەکات، کە تۆ یەکێکی لەوانە. بە ڕاستی ئیسلام ئاینی یەکسانی یە، بە یەك چاو سەیری عومەری عەرەبی و بیلالی حەبەشی و سەلمانی فارسی و صوهەیبی ڕۆمی کردووە.

بە ڕاستی ئیسلام ئاینێکە ڕەفزی ستەم و چەوسانەوە دەکات و، هەموو جیاوازی کردنێك لەسەر ئەساسی ڕەنگ و زمان و (جنس) ئەداتە دواوەو نایهێڵا، خوای پەروەردگار دەفەرموێت

﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ﴾ الحجرات: ١٣.

ئەی سەرکردەی مەزن:

ئیسلام بە ڕاستی گرنگی ئەدات بەوانەی کە گەورەو مەزنن وەك جەنابتان، چونکە ئاینێکە تەقدیری فەزیلەت دەکاو بە گەورە سەیری ئارامگرتن دەکا و، هانی دادپەروەری دەدات و، ئاشتی دەوێت و، ڕەحمەت بڵاودەکاتەوەو، بانگ دەکات بۆبرایەتی.

ئەی سەرکردەی مەزن:

بە ڕاستی گەورەیی دنیاو شەرەفێکی جیهانی و ویسامی قوربانی دانت دەستکەوتووەو، تاجی سەربەستیت لەسەرکردووە، بۆ هەموو ئەوانەش بڕوابوون بەخواو گوێڕایەڵی و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی ﷺ زیاد بکە، کە ئەوەش بە دەست نایەت مەگەر بە ئیسلام، موسڵمانبە سەلامەت دەبی، موسڵمانبە گەورەیی و سەرفرازی دنیا و قیامەتت دەست دەکەوێت. ڕزگارت دەبێت لە سزای خوا... موسڵمانبە -ئەی سەرکردەی مەزن- تا زەوی و ئاسمان سڵاوت لێ بکات و ملیارێك و دووسەد ملیۆن موسڵمانیش بەخێرهاتنت بکەن و دەرگاکانی بەهەشتت بۆ بکرێتەوە.

ئەی سەرکردەی مەزن:

بە ڕاستی تۆ دەستکەوتیت بۆ ئیسلام و ڕەصیدێکیت بۆ موسڵمانان، چەند جوانە کە وشەی هەق و دادو ئاشتی و ئازادی (لا إله إلا الله محمد رسول الله) لە دەمت بێتە دەرێ، کە جوانترین ڕستەیە خوا ناردبێتیە سەر ئادەمیزاد، کە سرِی بەختەوەری و ڕزگاری و خۆشی و سەرکەوتنی مرۆڤە.

ئەی سەرکردەی مەزن:

هەرچەند چاوم کەوتبێ بە زانایان و سەرکردەکان و حوکمەماکانی عالەمی ئیسلامی وتویانە: خۆزگە نیلسون ماندیلا موسڵمان دەبوو، بۆیە تکات لێ دەکەم و ئاواتە خوازیشم کە بە دەنگی بەرزی زوڵاڵ بڵێی (لا إله إلا الله محمد رسول الله)... کە ئەو کاتەش بەندەکانی خوا لە هەر شەش کیشوەرەکەوە چەپڵەت بۆ لێ ئەدەن و مەککەش سڵاوت لێ دەکاو کەعبەش دەرگات بۆ دەکاتەوەو، دوانگەی موسڵمانانیش ناوە جوانەکەت دێنێ.

تۆ بیست و حەوت ساڵ ئارامت گرت لە بەندیخانەدا، تا کۆت و پێوەندت شکاندو، سەرکەوتیت بەسەر ستەم و، تاغوتت تێك شکاند، جا بە موسڵمان بوونت مەلحەمەیەك لە ئیمان بنووسە و چیرۆکێك لە ئازایی تۆمار بکەو تابلۆیەك لە تابلۆکانی مەردایەتی بنەخشێنە.

ئەی سەرکردەی مەزن:

بە خوا ئێمەی موسڵمان لە ئیسلام دا نرخی ئینسان و کەرامەتی ئینسانمان دۆزیوەتەوەو، تامی شیرینی ئیمان و لەززەتی گوێڕایەڵیمان چەشتووە، ئێمە خۆشی عیبادەت بۆ خوا، شەرەفی سوجدە بردن بۆی و گەورەیی شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیان دەستکەتووە... جا چونکە تۆش گەورەی لەلامان بەهۆی مێژووی پرشنگدارتەوە، حەز دەکەین بەشداریمان بکەیت لەم ژیانە بەختیارەماندا لە سێبەری ئیسلامدا.

ئەی سەرکردەی مەزن:

ئەو نموونە باڵایەی تۆ بانگی بۆ دەکەیت لە ئیسلامدا دەیبینی، ئەو ڕەحمەتەی لە دڵتایە لە ئیسلامدا هەستی پێ دەکەیت و، ئەو عەدالەتەی کە بانگی بۆ دەکەی لە ئیسلامدا پێی شاد دەبیت.

بە ڕاستی ئیسلام ئارامگرتنی خۆش دەوێت، تۆش ئارامگری، ڕێز لە زیرەکەکان دەگرێت و تۆش زیرەکیت، بە گەورە سەیری ژیرەکان دەکات کە تۆش لە ژیرەکانی و، گرنگی دەدات بە ئازاکان کە تۆش ئازایت.

ئەی سەرکردەی مەزن:

بە ڕاستی ڕۆژانێکی خۆش ژیام لەگەڵ بیرەوەرییەکانتدا (گەشتە درێژەکەم لە پێناوی ئازادیدا)، ئەوەم تیا بینییەوە کە سەرسامی کردم لە گەورەیی و ئارام و گیانفیدایی، بە خۆمم وت: خۆزگە ئەم ئادەمی یە بلیمەتە هەڵکەوتووە موسڵمان بوایە، سا بەخوا هیچ ئاینێك شك نابەم کە بۆ تۆ ببێ و تۆش بۆ ئەو ببی جگە لە ئیسلام، هیچ بیروباوەڕێك نابینم ڕێزت لێبگرێت وەك ئیسلام، چونکە ئاینی فیترەتە، سنگ فراوان دەکاو، عەقڵ و ژیری ئەدوێنێ و، نەفس پاك دەکاتەوەو، ئەخلاق چاك دەکات و ڕێز لە مرۆڤ دەگرێ و بوونەوەر ئاوەدان دەکاتەوە.

ئەی سەرکردەی مەزن:

من لە مەککەوە لەگەڵ تۆ ئەدوێم، لە پەنا کەعبەدا، کە قورئان تیایدا نازڵ بوە و محمد ﷺ تیایدا هەڵبژێردراوەو، خۆری پەیامی تیا هەڵهاتووەو بتەکان و تاغوتەکانی تیا شکاوەو، جاڕی مافی مرۆڤی تیادراوەو، زوڵم و ستەم و چەوساندنەوەی تیا یاساغ کراوەو دادو ئاشتی تیا نەشرکراوە.

پـەروەردگارمان و پـەروەردگارت - جـل في عـلاهُ - دەفـەرموێت: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ﴾الأنعام: ١٢٥

ئەی سەرکردەی مەزن:

بە ڕاستی ژیان کـورت و ماندووکـەرە جـا وەرە ژیـانی کەسـێکی وەك تـۆ کـە لـە پیـاوە گەورەکانی، ئەگەر نزیکەی نیوەی تەمەنت بە ستەمدیدەیی و بەندکراوی بەسەر بردبێت و، لـەم لاشەوە ژیانێکی هەتاهـەتایی هـەبێت لـە بەهەشـتدا، کـە بـڕواداران بـە خـواو شـوێنکەوتوانی پێغەمبەران دەستیان دەکەوێت، هیوادارم ئەو بەختەوەری و سەرکەوتنەت لە دەست دەرنەچێت، هەروەك فەیلەسوفی بەناوبانگ دیکـارت دەڵێـت (بـە ڕاسـتی ژیـان شـانۆگەرییەکە مەشـهەدی یەکەمان بینی، مەشهەدی ستەم و ستەملێکراو، سەرکەوتوو ژێرکەوتوو، بەهێزو بێ هێـز، کـوا مەشهەدی دووەم کە عەدالەتی تیا نەبێت؟!) زانایانی موسڵمانیش وەڵامیان دایەوە (مەشهەدی دووەم ڕۆژی پرسینەوەیە لە قیامەتدا، ئەو ڕۆژەی کە دادگای عەدالەت دائەنرێ و تەنها خـواش حاکمە، تا هەر کەسێ جەزای خۆی وەرگرێ، وە حوکم دەکات لە نێوان بەندەکانیا لـەو شـتانەدا کە جیاوازیان هەبووە تیایاو ناکۆك بوون).

لە کۆتاییشدا پێم خۆشە کە پەڕاوەکەم (لا تحزن) بە دیاری بنێـرم بـۆت کـە یـەك دەنگـی زانایان و دانایانی هەڵکەوتووی تیایە کە بەختەوەری ڕاستەقینە لە ئیسلام دایە.

داوا لە خوای گەورەی پەروەردگاری عەرشی کەریم دەکەم کە سنگت فروان بکـات -ئـەی سەرکردە- بۆ ئیسلام ... وە قبوڵی بفەرموو سەلامی موسـڵمانانی پیـاو ژن و پـیرو گـەنج لـە هەموو دنیاوە، سەلامت لێ بێ.

د. عائض القرني

## دکتۆر عبدالرحمان السميط:

له ساڵی ١٩٤٧ دا له دایك بووه له کوەیت، هەر له مناڵیەوه حەزی به کاری خێر بووه، له قۆناغی دواناوەندیدا لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێیدا، له پارەی ڕۆژانەی خۆیان ئوتومبێلێکی هەرزان دەکڕن و دوای دەوامی قوتابخانەیان یەکێکیان ئوتومبیلەکە بەکار دەهێنێ بۆ گواستنەوەی کرێکاری هەژار لەسەر کارەوه بۆ ماڵەوه یان به پێچەوانەوه.

کاتێك له زانکۆی بەغداد له کۆلێژی پزیشکی بوو، بەشێکی پارەی خەرجی ڕۆژانەی دائەنا بۆ کڕینی پەڕاوی ئیسلامی و دابەشی دەکرد بەسەر مزگەوتەکاندا، کاتێك مینحەی دیراسی بۆ دەرچوو که (٤٢) دینار بوو، وه بۆ ئەو ڕۆژه پارەیەکی زۆر بوو، زیادە مەسرەفی نەدەکردو ڕۆژی یەك ژەم نانی دەخواردو دەمی خۆی له زۆر شت دەگرتەوه تا بتوانێ کاری خێری پێ بکات.

ناوبراو دبلۆمی هێنا له زانکۆی لیڤەربول له ساڵی ١٩٧٤دا و خوێندنی باڵای له کەنەدا تەواوکرد، لەو کاتەشدا که له ڕۆژئاوا دەیخوێند، له هەر قوتابییەکی موسڵمانی زانکۆ مانگی دۆلارێکی وەردەگرت بۆ چاپکردنی نامیلکەی ئیسلامی و دەینارد بۆ ئەفریقیاو خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا وەك کارێکی خێرخوازی.

دکتۆر عبدالرحمان ئەندامی دامەزرێنەری زۆر کۆمەڵەی خەیرییه وەك (هەیئەی خەیری ئیسلامی جیهانی و، مەجلیسی ئیسلامی بۆ بانگەوازو ئیغاسەو،... هتد).

هەروەها زۆر ویسام و شەهاداتی تەقدیری و جائیزەی وەرگرتووە، به نرخترینیان جائیزەی مەلیك فەیسەڵی جیهانی بوو بۆ خزمەتی ئیسلام که بڕەکەی (٧٥٠) هەزار ڕیاڵی سعودی بوو، ناوبراو کردی به وەقف و، دەستکەوتی ئەو وەقفەی دانا بۆ خوێندنی قوتابیانی ئەفریقی له زانکۆکانی دەرەوەی وڵات.

دکتۆر عبدالرحمان ڕەئیسی مەجلیسی ئیدارەی جەمعیەی عەونی مباشرە که پێشتر ناوی (جەمعیەی موسڵمانانی ئەفریقیا) بوو، له ڕێی ئەم جەمعیەتەوه خزمەتێکی زۆری به ئیسلام کرد له ئەفریقیاداو بووه بەربەستێکی گەوره له ڕێی به گاورکردندا لەو کیشوەرەدا.

کاتێك گەڕایەوە لە ڕۆژئاوا لە خوێندن چووە لای دائیرەی ئەوقافی کوەیت وداوای لێکردن کەهاوکاری بکەن بۆ کاری خێرخوازی لـە ئـەفریقیادا، بـەڵام بەداخـەوە نـەهاتن بـە دەنگیـەوەو خەریك بوو ساردیشی بکەنەوە.

خوای گەورە کە ئاگای لە دڵ و نیەتە، کارەکەی بۆ ئاسان کرد بەوەی کە ژنێك پارەیـەکی دایە بیکا بە مزگەوت، ئەویش چوو بۆ ئەفریقیاو لە وڵاتی مـەلاوی مزگەوتەکەی دروست کـرد، ئەمـەش بوو بە سەرەتایەکی خێر و کلیلی چوونە ناو ئەفریقیا .

لـە ئـەفریقیا بـە چـاوی خـۆی ملیۆنـەها کەسـی بینـی کەچـۆن برسـی و ڕەش و ڕوتـن و ڕێکخراوە بیانیەکانیش چۆن لەڕێی خێرخوازیەوە دەیانەوێت بیانبەن بەرەو مەسیحیەت .

ئەوەی کە زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر دڵ و دەروونی دکتۆر عبـدالرحمان و وای لێـدەکرد کە زۆر جار بشگری ئەوەبوو، کاتێ دەچووە ناوچەیەکەوە و خەڵکەکەی موسوڵمان دەبوون، ئـەو خەڵکە دەگریان و زۆر بێتاقەت دەبوون بەوەی‌کەدایك وباوکیان بەبێ ئیمـانیو دوور لـە ئیسـلام سەریان ناوەتەوە، ئەوانە گلەییان لە موسڵمانان دەکرد، کوان و لەکوێن بۆ زووتـر نـەهاتوون بـە هانایانەوە .

کاروچالاکی مەسیحیەکان لە ئـەفریقیادا زۆرەو پـارە وپـولێکی زۆر لەبـەر دەسـتیاندایە، دکتۆر (دافید بارت) شارەزا لەبواری ئاماری کاری مژدەداندا لە ئەمریکا دەڵێت: ئەو کەسانەی کە لە ڕێکخراوەکانی مژدەداندا کـار دەکـەن نزیکـەی پـەنجاو یـەك ملیـۆن کەسـن و، سێسـەدو شەست تەیارە لە خزمەتیاندایە بۆ گواستنەوەی هاوکاری و ئازوقەو پێویستی بۆ هـەر کوێیـەك بیانەوێت .

نزیکەی (٤٠٥٠)چوار هەزار و پەنجا ڕادیۆو تەلەفزیۆنیان هەیە،ئەو پارەیەی لە سـاڵێکدا بۆیان دابین کراوە (٣٠٠) ملیار دولار بووە .

لە هەموو لایەکەوە (تەبەروعات)یان بۆ دەچێت، تەنانەت کۆمپانیـای مایکرۆسـۆفت لـە ساڵێکدا ملیارێك دۆلاری پێ بەخشیون، پیاوێکی دەوڵەمەندی هۆڵەندی خـاوەنی(١١٤)ملیـۆن دۆلار بـوو هـەمووی پـێ بەخشـین. لەئاهـەنگێکی کـاری مژدەدانـدا لـە نیویـۆرك، یـەکێ لـە هاوکارانی کاری مژدەدان بڕیاری دا کە هەر ماڵێك لە دنیـادا نوسـخەیەك ئینجیلـی بـدرێتێ و هەر کەسەو بـە زمـانی خـۆی، بـۆ ئەمـەش ڕایگەیانـد کـە ئـەم کـارەی (٣٠٠)ملیـۆن دۆلاری تێدەچێت، هەر ئەو شەوە (٤١)ملیۆن دۆلاری بۆ کۆکرایەوە .

## کارەکانی جەمعیەی (العون المباشر):

تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٢، ئەم جەمعیەتە هەستا بەدروستکردنی (١٢٠٠) مزگەوت و چاودێری (٩٥٠٠) منالّی بێ باوك و هەلّکەندنی (٢٧٥٠) بیری ئیرتیوازی و، دروستکردنی (١٢٤) خەستەخانەو دابەشکردنی (١٦٠)هەزار تەن خواردن وجل و بەرگ و دەرمان و، دابەشکردنی (٥١) ملیۆن قورئان و،دابەشکردنی (٦٠٥)ملیۆن پەڕاوی ئیسلامی بە زمانە جیاجیاکانی ئەفریقیاو، دابین کردنی (٢٠٠) مینحەی دیراسی بۆ دیراساتی بالاّ لە ولاّتانی ڕۆژئاواو، کردنەوەی (١٠٢) مەرکەزی ئیسلامی و، جێبەجێ کردنی پڕۆژەی کشتوکالّی لەسەر(١٠) ملیۆن مەتر دووجای زەوی.

## زەکاتی موسڵمانان:

دکتۆر عبدالرحمان دەڵێت: تەنها زەکاتی دەوڵەمەندە عەرەبەکان پێویستی (٢٥٠)ملیۆن موسڵمان دابین دەکات، لەبەر ئەوەی بڕی ئەو پارەیەی کە لە دەرەوەو لە ناوەوە وەبەردەهێنرێت دەکاتە (٢٢٧٥)ملیار دۆلاری ئەمریکی، کە زەکاتەکەی دەکاتە نزیکەی (٥٧)ملیار دۆلار، جا ئەگەر هەژاران (٢٥٠)ملیۆن کەس بن یەکی (٢٢٧) دۆلاریان بەردەکەوێت، کە ئەم بڕە پارەیەش باشە بۆ کەسێکی هەژار کە کارێکی پێ دەست پێ بکات و بە هۆیەوە بژێوی دابین بکات.

## مەترسی و تیاچوون:

دکتۆر عبدالرحمان دەڵێت :ساڵانە ٨ کەس تا ١٠ کەسمان تیا دەچێت بە هۆی شەڕی ناوخۆو کێشەی ناو ئەفریقیاوە، تا ئێستا من دووجار جەڵتە لێی داوم و زۆر نەخۆشیشم هەیە بەلاّم هەمووی لە پێناوی ئامانجی گەورەدا هەرچی بێ هەر کەمە، ئەوە (تۆماس ئەدیسۆن) جاری وا هەبووە (٣٦) سەعات لەسەر یەك کاری کردووە بۆ ئیختراعاتێکی، هەروەها (کولونیل ساندرز) دوو ساڵ لەسەر یەك هەوڵی دا بۆ ناساندنی مریشکی کنتاکی سورەوکراو بە بازاڕ، تەنانەت لە ناو سەیارەکەشیدا دەنووست، تا سەرکەوتنی بە دەست هینا، ئێستا کۆمپانیاکەی دە هەزار چێشتخانەی هەیە لە جیهاندا...

لە مێژووی ئیسلامیشدا ئەوە (ئەحمەدی کوڕی حنبل) لە بەغداوە بۆ مەککە حەماڵی کرد تا بتوانێ بگاتە مەککەو فەرمایشتێکی پێغەمبەری ﷺ دەست بکەوێ، شایانی باسە

دکتۆر لە عێراقیش خزمەتی زۆری پێشکەشکرد پاش ڕووخانی ڕژێمی پێشوو، تەنانەت جارێـك لای (کوت)ەوە تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بوو، دەست و قاچی شکا.

دکتۆر عبدالرحمان دەڵێت: مردن لە کات و سات و ڕۆژی دیارییکراوی خۆیدا دێت، مـرۆڤ بە ئەجەلی خۆی نەبێت نامرێت، دووجار بەندکراوم جارێکیان لە بەغداد لـە سـاڵی (١٩٧٠)دا، خەریك بوو لە سێدارەم بدەن، جارێکی تـریش لـە بەغـداد لـە سـاڵی (١٩٩٠)دا کـە مخابراتی عێراقی لە کوەیت دەستگیریان کردم و، هێنامیان بۆ بەغداو ئەشکەنجەو ئازارێکیان دام گۆشت و پێستی دەست و دەم و چاوو قاچیان ڕنیم، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە یەقینم هەبوو کـە ئـەوەی خوا نەیکات نابێت.

* پرسیاریان لێکرد پاش زیـاتر لـە (٢٦) سـاڵ لـە بانگـەوازو کـاری خێـر لـە ئـەفریقیا دەڵێیت چی؟

دکتۆر وتی: زۆر ئاسوودەو دڵ خۆشم کە ژیانم بەخت کرد بۆ بانگەوازی خواو یارمەتیدانی خەڵکی ئەفریقیا.

منداڵەکانیشم هەرلەسەرەتاوە سـەردانی ئـەفریقیایان کـردووەو بەشـداربوون لـەو خێـرەدا، ئێستاش گەورە بوون و دەرچووی زانکۆن، بە تایبەت کوڕە بچوکەکەم (عبـدالله) کـە پزیشـکی بەیتەری تەواو کرد، هەوڵ ئەدەم ژیانی بۆ دابین بکەم تا بتوانێ دەست بەتاڵ بێت بـۆ بانگـەوازو کاری خێر لە ئەفریقیادا.

منیش بەتەمام بـاقی ژیـانم لەئـەفریقیا لـە دێی (منـاکـارا) لای هۆزەکـانی (ئـەنتیمۆر) بەسەر بەرم کە ڕۆژانە بە دەیان کەسیان لەڕێی بەرنامەکانی ئێمەوە موسڵمان دەبن .

بەڵێ:دکتۆر دەیتوانی وەکو هەزارەها دکتۆر و خاوەن شەهادەتی تـر بیوتایـە (ذرنـا نکـن مع القاعدين): وازمان لێ بێنن با ئێمـەش دانیشـین وەك دانیشـتووەکان، دیـارە نـەفس ئـەوەی پێخۆشە کە لە سایەی سێبەر و ژیانی ڕەفاهیەت دا بێت، بەڵام خوای گەورە (إن الله يغرس لهذا الدين غرسا يستعمله في طاعته) واتـە :خواکەسانێك دەنێرێو دەیان هێنێتە ناو سـاحەوە بـۆ ئـەم دینە و بەکاریان دێنێ تا ببنە حوججەت بەسەر خەڵکی ترەوە .

## ئافرەتێکی بانگخواز :

دایکی وەلید (هیلە کچی أبو حمید) ئافرەتێکی بانگخوازی سعودیەو لە شاری (ریاض) خزمەتێکی گەورەی بە پەیامی‌خوا کرد بۆماوەی زیاتر لە سی‌ساڵ.

لە کاتی شەڕی (بۆسنە و هرسك)دا مێردەکەی منداڵێکی ئەو وڵاتەی کەفالەت کرد و ئەمیش منداڵێکی تری کەفالەت کرد، پاشان هانی مامۆستاکانی هاوەڵی دا لە قوتابخانە کە ئەوانیش ئەو کارە خێرە بکەن، بە هۆی ئەوەوە توانیان پانزە منداڵی بێ باوکی بۆسنەیی کەفالەت بکەن و مانگانە پارەیان بۆ بنێرن. دایکی وەلید لە ڕێی پیرێژنێکی خزمیانەوە بە ناوی دایکی عبدالرحمان هانی دەر و دراوسێی ئەدا کە زەکات و پارە و ماڵ کۆ بکەنەوەو یارمەتی هەژارو لێقەوماوانی پێبدەن، ئەمەش سەرەنجام دەزگایەکی خێرخوازی لێ دروست بوو بە ناوی (دەزگای نوور) کە ئێستاش لە ڕۆژئاوای ریاض کار دەکات.

دایکی وەلید پاش ئەوەی ئەو منداڵەی کەفالەت کرد کەوتە خۆتەواو کردن و خۆ پێگەیاندن لە ڕێی کاسێت و پەڕاوەوەو بەردەوام شەو نوێژی دەکردو بە ڕۆژیش زۆر جار بە ڕۆژوو دەبوو تەنانەت لەم دواییەدا ڕۆژ نا ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو هەروەك ڕۆژووەکەی حەزرەتی داوود سەلامی خوای لێبێت.

دایکی وەلید لە ماڵی خۆیاندا هەموو عەسرێکی هەینی وانەی بە دەرو دراوسێکانی دەووت، جاری وا هەبوو ژمارەیان دەگەیشتە سەدو پەنجا ئافرەت. ئەمە بێجگە لەوەی کە کێشەکانیانی بۆ چارەسەر دەکردن و جێی ڕاز و نیازی هەمووان بوو. لە لایەکی تریشەوە مێردەکەی (حمد الناجم) دەرسی بە کوڕانی گەڕەك دەوت و هانی ئەدان لەسەر نوێژی بەیانی لە مزگەوتدا و پێشبڕکێی بۆ دائەنان بۆ لەبەرکردنی قورئان و پەڕاوخوێندنەوەو گوێگرتن لە کاسێت و جائیزەی ئەدانێ.

دایکی وەلید هەمیشە دوعای دەکرد کە عاقیبەت خێر بێت و لەکاتی وانەوتنەوەو بانگەوازکردندا یان لەحەرەمی مەککەدا گیان بسپێرێت، کوڕێکی لە پۆستێکدا دائەمەزرێت و دەچن بە دەم مامەڵەی دامەزراندنەکەوە لە مەککە، پێش نوێژی بەیانی لە حەرەم دەکەونە مەراسیمی عومرە کردن لە مانگی شەعبانی ساڵی (٢٠٠٨)، لەگەڵ کوڕەکەی و کچەکەیدا و، داوایان لێ دەکات کە نیەتی ڕۆژووش بهێنن لەبەرئەوەی ئەو ڕۆژە پێنج شەممە بوو. لە کاتی

تەواف دا دوعای زۆری کرد بۆ ئەوانەی کە دەیناسین و دوعای بۆ خۆشی دەکرد کە عاقیبەت خێر بێت و خوای گەورە گیانکێشانی لەسەر سووك بکات، ئینجا ئاوڕی دایەوەو باسی مردنی لە پڕی بۆ کچەکەی کرد و وتی دەبێت بڕوادار ئارامگر بێت، ئینجا چوو لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە و سەریشی پێ تەڕ کرد... پاشان چوون بۆ صفا و مەروە و پاش پێنج جار هاتن و چوون لە نێوان کوڕەکەی و کچەکەیدا گیانی سپارد و کەوت، دەستیان دایە باڵی هەڵی گرنەوە سەیریان کرد قورس بووەو گیانی سپاردۆتەوە بەو خوایەی کە چەندەها ساڵ بوو بانگەوازی بۆ دەکردو هەوڵی ئەدا لە پێناویدا...

پێنج ڕۆژ پێش ئەوەی بمرێت وتارێکی دا لەبارەی مردن و ئادابی سەرخۆشیکردن،کچەکەی دەڵێت: دایکم بەرماڵێکی داخستبوو لە سووچێکی ماڵەکەدا و هەمیشە لەوێدا نوێژی دەکرد و هەمیشە ڕاخرا بوو ئەگەر سەفەریشی بکردایە،کەچی کاتێك ویستمان بچین بۆ عەمرە بەرماڵەکەی پێچایەوە، من پێم ناخۆش بوو حەزم نەکرد بەرماڵەکەی هەڵگرێتەوە ئەو هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کەلای بات، هەروەك دڵی خەبەری دابێت کە دوا سەفەرەو جارێکی تر لەسەر ئەو بەرماڵە ناوەستێ لە بارەگای خوادا بۆ خواپەرستی..

ناوبراو خەوێکی دیبوو کە کۆچی یەکجاری نزیکەو لە حەرەمدا دەبێت وبەمناڵەکانی وت: خەوێکم بینیوە ئەگەر ڕاست بێت چەند ڕۆژێکی تر دەیبینن دێتە دی، بۆیە سووربوو لەسەر ئەوەی بچێ بۆ حەرەم و لە فڕۆکەخانە زۆر دوعای بۆ مێردەکەی کردکە بواری بۆ ڕەخساندبوو بۆ بانگەوازکردن.

پاش ئەوەی لە مەککە بەخاکیان سپارد و هاتنەوە بۆ ریاض مامۆستای مزگەوتەکەیان هات بۆ سەرخۆشی کردن و وتی: بەڕاستی دوای ئەو ئیتر مزگەوتەکەمان بێناز دەبێت بەهۆی ئەو یارمەتیانەی کە ڕەحمەتی دەینارد بۆ دەرس و دەوری مزگەوت و قوتابیانی مزگەوت، مناڵەکانی بەمەیان نەزانیبوو، دیاربوو ئەمە یەکێ بوو لەو کارانەی کە بۆ خوا دەیکردو حەزی نەدەکرد کەس بیزانێت، هەروەك زوبەیری کوڕی عەوام دەڵێت:(من استطاع منكم أن يكون له خبيئة من عمل صالح فليفعل)[1]

---

١- گۆڤاری الأسرة، ژمارە ١٨٦

## ئەبو ئەعلای مەودودی:

(حومەیرا کچی گەورەی مەودودی) کە ئێستا مامۆستای زانکۆیە لە پاکستان لەبەشێکی یادەوەریەکانی دا دەڵێت:

دایکمان ئومەتێك بوو لە ئافرەتێکدا کۆبووبۆوە، نۆ منالی بەخێو کرد دایکیش و باوکیش بوو بۆمان، تۆزقالێك کەمتەرخەمی نەکرد لە پەروەردەکردنماندا، لەگەڵ ئەو هەموو سەرقالییەی کە هەیبوو بە دەست میوانەوە، بە حوکمی ئەوەی کە باوکمان کەسایەتیەکی دیارو ناودار بوو، هەمیشە ماڵمان جمەی ئەهات لە میوان، ژنان لە لایەك و پیاوان لە لایەك.

هەر لە منالیەوە دەمانبینی کە نوێژی جومعە لە ماڵماندا دەکراو ژنان لە هەموو لایەکەوە دەهاتن و لە سەعات یانزەوە فەرش دائەخراو دایکم نوێژی بۆ دەکردن و وتاری بۆ ئەدان، ئنجا دوای نوێژ وانەیەکی قورئانی پێ دەوتن، ئنجا هەر کەسەو دەچووەوە ماڵی خۆی.

نوێژی جەژنیش لە ماڵی ئێمەدا بە هەمان شێوە دەکراو دوایی جەژنە پیرۆزە لەگەڵ هەمواندا دەکراو پاشان شیرینی دابەش دەکرا.

## قوتابخانەکەی یوسف:

حومەیرا دەڵێت: هەرچەند یادی ڕابردو دەکەمەوە، ئەو وێنەیەم دێتەوە بەرچاو کە لە شەوێکی زۆرتاریکدا، کە تاریکی هەموو شوێنێکی داگرتووە، دایکم وەستاوەو دەستی منالەکانی گرتووە و هەندێ لە پۆلیسەکان ڕووبەڕوومان وەستاون و هەندێکیشیان ماڵمان ئەدەن بە یەکداو ماڵمان دەپشکنن. باوکیشم دەستێ جلی کردۆتە جانتایەکەوەو خۆی ئامادە کردووە بۆ گەشتێك بەرەو نادیار... لە پڕ باوکم وەستا، بەبێ ئەوەی ئاوڕباتەوە بە دەنگی بەرز وتی: سەلامتان لێبێ،خواتان لەگەڵ، خوا بتانپارێزێ... نیتر لەگەڵ پۆلیسەکاندا ڕۆیشت...

ئەوە یەکەم جار بوو باوکم دەستگیر بکرێت لە ساڵی (١٩٤٨)دا، جا کە دوایی لە دایکمان پرسی بۆ باوکمان ئاوڕی نەدایەوە پێش ڕۆیشتنی؟ بەوپەڕی دڵنیاییەوە پێی وتین: (بە ڕاستی ئەوە سوننەتی ئیبراهیمە سەلامی خوای لێ بێت، کاتێك هاجەرەی هاوسەری و کوڕە شیرەخۆرەکەی بەجێهێشت لە مەککە ئاوڕی لێ نەدانەوەو قسەی لەگەڵ نەکردن، چونکە ئاوڕدانەوە بۆ دواوە هیممەت و عەزیمەتی پیاو لاواز دەکات)...

دایکم هەمیشە چیرۆکی پێغەمبەرانی بۆ باس دەکردین بۆیە تەنها بەو ئاماژە کردنـە لـە مەسەلەکە تێگەیشتین.

کاتێ باوکم گیرا، هیچی وامان لەماڵەوە نەبوو، بۆیە دایکم ژیـانی ڕۆژانـەمانی گـۆڕی، پێشتر کە جلیان بۆ دەشتین، وازی لەوە هێناو خۆی کەوتە جل شتن، لە کاتێکدا کە ماڵی باوکی زۆر دەوڵەمەند بوون و ئەو کارە بۆ ئەو زەحمەت بوو، ئنجا خزمـەتکارەکانی ئیزنـدا بـۆ ئـەوەی خۆی چێشت لێنێ بۆمان و پارە سەرف نەکەین...

ئەم حاڵە وا مایەوە تا بێوەژنێکی پیر کە نوێژی هەینی لـە مـاڵی ئێمـە دەکـرد زۆری لـە دایکم کرد کە لە گەڵماندا دانیشێ و ئەو هـەموو یارمەتیـەکی دایکـم بـدات و پێـی وت: (تـۆ پشت بە خوا ببەستەو بانگەوازی خۆت بکەو، ئیشی ماڵیش واز لێ بێنە بۆ من).

## چەند وانەیەك لە پەروەردەدا :

حومەیرا دەڵێت: هەمیشە دایکم ویردی (يا حي يا قيوم برحمتك استغيث) لەسەر زمـانی بوو، هەمیشە تەنگەنەفەسیەکی لەگەڵدا بوو، جارێك تەنگەنەفەسیەکەی زیاد بوو زۆر ماندووی کرد وتی: (مێردەکەم لە بەندیخانەیە، ئەگەر شتێکم لێ بێت، منداڵـەکانم شـپرزە دەبـن و کـەس نابێت بێ بەلایانەوە)...

نەنکم (دایکی باوکم) لە ئارامگرتن و دینداریدا لەوپەڕی دا بـوو، هەمیشـە ئامۆژگـاری دایکمی دەکردو پاڵپشتێکی باش بوو بۆی، هانی دایکمی ئەدا کە زۆر نازمان نەداتێ و هەموو داوایەکمان جێ بەجێ نەکات تا لەبەر زەحمەت و نا ڕەحەتی ژیانـدا بتـوانین خۆمـان ڕابگـرین و دەیووت: (من منداڵەکانی خۆم ئاوا پـەروەردە کردووە،جاری وا هـەبووە، باشـترین خـواردنم پـێ داون و جاری واش هەبووە نسکێنە زیاترم لەبەردەم دانەناون، جـاری واش هـەبووە تـەنها نـان و ماستم داونەتێ)...

ڕەنگە ئەوەش بووبێ کە باوکم ئاوا بێ باکانە دەڕۆی بەرەو بەندیخانەو وەکو شاخ خـۆڕاگر بوو لە بەردەم ناحەزانی ئیسـلامدا، هەمیشـە جانتـای بەندیخانـەی حـازر بـوو دەرزی و دەزووی هەمەڕەنگی تیا بوو بۆ پینەکردنی جلەکانی لە بەندیخانەدا...

هەرچەند چووبین بۆ بەندیخانە بۆ لای باوکمان، نەنکم زۆر دڵخۆش بوو، سـوعبەتی لەگـەڵ دەکردین و نوکتەی خۆشی بۆ دەگێڕاینەوە، لامان سەیر بـوو ئـەم پیرێژنـە بـە ڕاسـت دەچـێ بـۆ بەندیخانە بۆ لای کوڕەکەی، یان دەچێ بوکی بۆ دەگوێزێتەوە؟!

ئەوەی سەیر بوو باوکیشمان ئەدی بە هەمان شێوە بوو، ئەو کاتە لەو مەسەلەیە تێنەئەگەیشتین، دوایی زانیمان کە ئەیانویست پەروەردەمان بکەن لەسەر بەها بالآکان وفێری خۆراگریمان بکەن بەرامبەر تاڵ و سوێرییەکانی ژیان.

ئەمە لە کاتێکدا خەڵکی ترمان ئەدی لە دەوروبەرمان شیوەنیان بوو لەو کاتەی دەهاتن تا ئەوکاتەی دەڕۆشتنەوە.

تەنانەت بەڕێوەبەری بەندیخانە لای سەیر بوو جارێك بە باوکمی وت: (هەرگیز لە ژیانمدا خێزانم نەدیوە ئاوا بە دڵخۆشییەوە سەر لە بەندیخانە بدەن، بە تایبەت دایکت کە ئافرەتێکی پیرو لاوازو کەم توانایە)...

باوکم پێی وت: (ئێمە منالەکانمان لەسەر ئارامگری و ڕازی بوون بە قەزاو قەدەری خوا پەروەردە کردووەو، ئێستاش دەیەوێت کوڕەزاکانی هەروا پەروەردە بکات).

لە ساڵی (١٩٤٩)دا باوکم نامەیەکی بۆ برا گەورەکەی (أبوالخیر) ناردو داوای لێکرد کە دوو براکەم لەگەڵ خۆیا بەرێت بۆ بەندیخانە تا ڕابێن لەسەر بینینی ئەو حاڵەو لە داهاتوودا چاویان لە هیچ نەترسێ و بتوانن ڕووبەڕووی دوژمنانی خوا ببنەوە.

نەنکم

حومەیرا دەڵێت: ئەنکم ئافرەتێکی خواناس بوو، هەرکاتێك تووشی تەمەڵی یان نەخۆشیەك ببوایە سەری بەرز دەکردەوەو سەیری ئاسمانی دەکردو بەوپەڕی خشوعەوە بە زمانی فارسی لە خوا دەپاڕایەوەو دەیوت: (من نەخۆشم و تۆش دکتۆرمی) دوای ئەو دوعایە چاك دەبوو... لە هەموو ژیانیدا نەچووە لای دکتۆرو هەرگیز دەرمانی نەخواردووە، ئەگەر شوێنێکی ئاوسایە یان ئازارێکی ببوایە دەستی دەخستە سەری و بە فارسی دەیوت (ئەی ئاوساوی، ئەی ئازار،گەورە مەبە،)الله أکبر) ئیتر ئەو ئاوساوییە نەدەما.

نەنکم شارەزاییەکی باشی هەبوو لە زمان و ئەدەبی فارسیدا، زۆر جار هۆنراوەی فارسی بە نموونە دەهێنایەوە لە قسەکانیاو، کاتێ قسەی بکردایە ئامادەبووان هەموو ڕوویان تێدەکردو بە زانینیفراوانی، هەمووانی سەرسام دەکرد.

دایکم دەیوت: (هەرگیز کەسم نەدیوە وەك نەنکتان، هەر ئەڵێی خۆخۆیی تیا دروست نەکراوە، هەرگیز نەمدیوە شتێ بۆ خۆی داوا بکات)...

ئەنکیشم دەیوت: (لە سیمای ساڵحان و خواناسان ئەوەیە، کە دەستناگرنەوە لە هەر شتێ داوایان لێبکرێ و تەماعیان لە هیچدا نیەو هیچ کۆناکەنەوە)...

دایکم دەیوت: (بە ڕاستی من ژیان لە ئەنکتانەوە فێر بووم)... ئەوەی سەیرە ئەم بووك و خەسووە هەمیشە یەك ڕا بوون و هەرگیز بەینیان تێك نەچووە !

## نەفس بەرزی:

حومەیرا دەڵێت: هەژاری تەواو ڕووی تێکردین، دایکم ناچار لە بەرەوە ئاڵتونەکانی دەفرۆشت بۆ ئەوەی بژین و لە خوێندن دوا نەکەوین، لە جەژنی ڕەمەزاندا پێی دەوتین: ئێمە وا (زەکاتی فطر)مان داوە ئاساییە داوای جلی تازە مەکەن، لە قوربانیشدا دەیوت: ئێمە قوربانی دەکەین گوێ مەدەن بە جلی تازە، گرنگ ئەوەیە بە جل و بەرگی پاکەوە بچن بۆ نوێژی جەژن... ئاوا پەروەردەی دەکردین...

شەوێکیان ئاردمان نەمابوو، ئیشکەرەکەمان لە ماڵی دراوسێ ئاردی قەرز کرد، دایکم زۆری پێناخۆش بوو، وتی: بۆچی پرست پێنەکردووم و قەرزت کردووە لە ماڵە دراوسێ، ئەمشەو هەرچۆنێ بوایە بە شۆرباو شتی تر بە سەرمان دەبرد، ئیشکەرەکەمان وتی: ئاخر زۆر ئاساییە چونکە ئەوان جارێك لە ئێمە ئاردیان قەرز کردووەو بۆیان گێڕاوینەتەوە، قەی چی دەکات ئێمەش بۆیان دەگێڕینەوە...

دایکم وتی: ئەوان جیان و ئێمە جیاین، با ئەوان قەرز بکەن لێمان قەیناکە، بەڵام ئێمە قەرز ناکەین تا خەڵکی نەڵێن: شێخ لە بەندیخانەدایەو ماڵ و منداڵەکەی موحتاجن و لەسەر خێری خەڵك دەژین.

بە ڕاستی ئەتوت خوا دایکمی لەبەر باوکم دروست کردووە، ئەگەر دایکم نەبوایە بڕوا ناکەم حاڵەکە ئاوا بڕۆیشتایەو باوکم بیتوانیایە بەرگەی ئەو بارو زرووفە ناخۆشە بگرێت.

ئەم بەندییەی باوکم نزیکەی بیست مانگێکی خایاندو لە (١٩٥٠)دا ئازاد کراو لە هەموو لایەکەوە هاتن بۆ پیرۆزبایی...

**تەفسیری (تفهیم القرآن):**

حومەیرا دەڵێت: باوکم بەردەوام خەریکی نووسین بوو، ئەگەر ئەوەی نووسیویەتی بەراوردی بکەی لەگەڵ تەمەنیداو لەگەڵ ڕۆژەکانی ژیانیدا، سەرت دەسوڕمێت، کە چۆن توانیویەتی ئەو هەموو کارە بکات، لە کاتێکدا کە بارو زرووفی ژیانیشی لەبار نەبووەو سەرقاڵی ڕێکخستنی موسڵمانان و ململانێی سیاسی و بەند کردن بووە...

باوکم خەمی بوو تەفسیری (تفهیم القرآن) تەواو بکات، ئێمەش وەك عادەتی منداڵ کە سەرقاڵمان دەکردو کاتمان لێدەگرت، بە سوعبەتەوە پێی دەوتین: (منداڵینە، ئەگەر وازم لێ نەیەنن تەفسیرەکەم تەواو بکەم، ئەڕۆمەوە بۆ بەندیخانە لەوێ تەواوی دەکەم، ئەگەر کاتم بگرن و نەیەڵن تەفسیری کەلامی خوا بکەم، خوای گەورە خۆی دەمباتەوە بۆ بەندیخانە تا تەواوی بکەم).

دایکیشم هەمیشە ئامۆژگاری دەکردین و دەیوت: (باوکتان ئیزعاج مەکەن، ئەو زانایەکی نووسەرو موحەقیقە، پێویستی بە جەوێکی بێ دەنگ و هێمنەو داوای هیچی لێ مەکەن و دەرس و دەورو کێشەی قوتابخانەتان مەبەن بۆ لای و، بە قسەکاتی مەگرن).

مامی گەورەم حەزی دەکرد باوکم خۆی دەست بە تاڵ بکات بۆ نووسین و خۆی سەرقاڵی خۆ پیشاندان و وتاردان و سیاسەت نەکات، بەڵام بارو زرووفەکە وای دەخواست و باوکم ناچار بوو لە هەموو بوارەکاندا کار بکات.

## پیاوێك لە دنیایەکی تردا ئەژیا:

حومەیرا مەودودی دەڵێت: عەمیدی کۆلێژی زمانی عەرەبی لە شاری جدە (کە مامۆستایەکی ئافرەتی سوری) بوو پرسیاری لە بارەی باوکمەوە کرد منیش ئەم دێڕە بە دەمما هات و وتم: (باوکم لە عالەمێکی تردا ئەژیا) ئەویش زۆر وەڵامەکەی لا جوان بوو وتی: ئێمە تەمیمەش هەروا بوو.

باوکم حەزی بە نیفاق نەدەکرد، ڕۆژێ لەسەر نان خواردن دایکم بە (محمد فاروق)ی برامی وت: (کوڕم نوێژەکانتان لە کاتی خۆیدا بکەن، حەز دەکەی خەڵکی بڵێن: کوڕەکانی شێخ مەودودی نوێژ ناکەن؟!) پاش نان خواردن کە باوکم دەستی شت پێی وتین: (منداڵینە، کە

نوێژتان کرد خواتان لە یاد بێ و بۆ ئەوی بکەن و نیەتتان ساف بکەن و، لەبەر باوکتان نوێژ مەکەن).

باوکم پێی دەوتین: (هەموو کەس چاکە و خراپەی هەیە، عاقڵ ئەوەیە لە چاکی خەڵکی سوود وەرگرێ و خۆی بپارێزێ لە خراپیان).

باوکم هەروەك سوننەتی رسول الله ﷺ عەیبی لە خواردن نەدەدۆزیەوەو هەرچی هەبوایە دەیخواردو گوێی نەئەدایە، ئەگەر جارێك نیشکەرەکەمان چێشتێکی سەقەت بکردایە، خوێی زۆر بوایە، یان بێ خوێ بوایە، پاساوی بۆ دەهێنایەوەو دەیوت: (ئەو ڕۆژانە چێشتی خۆشمان بۆ لێ دەنێ، قەیدی چی دەکات با جارێکیش خۆش نەبێ).

## من کرێ گرتەم چاوەڕێی ئەجر دەکەم:

حومەیرا مەودودی دەڵێت: چەند مانگێك پێش ئەوەی باوکم کۆچ بکات، یەکێ نەقدێکی زۆری لە کاری باوکم گرت و وتی: (خومەینی توانی لە ئێراندا شۆڕشێك بەرپا بکات، تۆ نەت توانی شۆڕشێ لە پاکستاندا بەرپا بکەیت) باوکیشم زۆر لەسەر خۆ پێی وت: (من کرێگرتەو کرێکارم بۆ خواو ڕۆژانە کرێی خۆم وەردەگرم، من لەسەرمە ئەرکی سەرشانم ڕۆژانە بە چاکی جێبەجێ بکەم و ڕۆژانەی خۆم وەرگرم، ئیتر من هەقم نیە بەسەر باڵەخانەکەوە کەی تەواو دەبێو شێوەی چۆن دەبێت، من کرێکارم لەهەر کوێدا دامبنێن و هەرچیم پێ بسپێرن ئەوە دەکەم، من لەسەرمە بە دڵسۆزی کارەکانم بکەم، لەسەر من نیە کارەکان بەرەو کوێ دەچن، ئەوە کاری خاوەن بانگەوازە نەك کاری بانگخواز).

بە ڕاستی باوکم خۆی نەزر کردبوو بۆ بەرنامەی خوا، شەوو ڕۆژ بۆ خوا دەژیا، هەرچی سیفاتی جوانی موسڵمانانە هەبوو، هەوڵی ئەدا لە خۆیدا جێبەجێی بکات، تا سەر مەشقێکی جوان بێت بۆ خەڵکی.

* هەرگیز تۆڵەی بۆ نەفسی خۆی نەکردۆتەوە.
* ڕق و کینەی لە دڵدا بەرامبەر کەس هەڵنەگرتووە.
* قسەی بە کەس نەوتووەو وەڵامی کەسیشی بە خراپە نەداوەتەوە.
* هەرگیز درۆی نەکردووەو غەیبەتی کەسی نەکردووە.
* لە بەر خوا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترساوەو لەبەرامبەر بەڵاو موسیبەتدا خۆگر بووە.

* هەرگیز تەنازولی بۆ کەس نەکردووەو چاوەڕێی دەستی کەس نەبووە.

جارێکیان ئەو قازیەی کە فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرکرد، خانەنشین کرابوو، دەیویست بچێ بۆ وڵاتانی کەنداو کار بکات و هات بۆ لای باوکم نوسراوێکی باتێ و تەزکیەی بکات تا کاری پێ بدەن، ئەویش هەموو خراپی کابرای لەبیر کردو تەزکیەیەکی دایە لە وڵاتانی کەنداو کارێکی باشی دەستکەوت... کە بە ڕاستی ئەمەش لوتکەی لەخۆ بردن و بۆ خوا سوڵحانە...

باوکم باسی کەسی بە خراپە نە دەکرد، تەنانەت (ذو الفقار علي بوتــو) کە هەمیشە هێرشی دەکردە سەر باوکم، باوکم دوعای خێری بۆ دەکرد و بە ئەدەبەوە باسی دەکردو دەیووت: (داوا دەکەم لە خوا هیدایەتی بدات و حاڵی ئوممەت چاك بکات، تا عیبادو بیلاد لەوە زیاتر زیانیان لێ نەکەوێت).

مناڵ بووین لەگەڵ باوکم چووین بۆ نوێژی هەینی، خەتیبەکە دژایەتی باوکمی دەکرد لە وتارەکەیدا وتی (ئەگەر یەکێ لە شوێنکەوتوانی مەودودی مرد (لە ئەندامانی جەماعەی ئیسلامی)و نێژراو لەسەر قەبرەکەی درەختێکی سیدر ڕواو مەڕو ماڵاتێك لە گەڵای ئەو درەختەی خوارد، حەرامە کەس لە شیری ئەو مەڕو ماڵاتە بخوات)!

کە گەڕاینەوە برادەرانی باوکم زۆر زۆر پێدەکەنین بە بێ عەقڵی ئەو خەتیبەو قسەکانی، کەچی باوکم هیچ پێ نەکەنی و زۆر لای ئاسایی بوو...

جارێکیان زانایەکی گەورەی زانکۆی ئەشرەفیە لە لاهور بە باوکمی وت: (شێخ ئەحمەد عەلی لاهوری زۆر خراپ باست دەکات و ڕەخنەت لێ دەگرێ، خۆزگە وەڵامت بدایەتەوە، چونکە بێدەنگیت شوبهەو گومان لە دڵی خەڵکدا دروست دەکات) باوکیشم وتی: (دیارە پێم ناخۆشە کەسێك بە بێ بەڵگە ڕەخنەم لێ بگرێ، بەڵام شێخ ئەحمەد عەلی وەکو خەڵکی تر نیەو چاکەی زۆرەو خوا بە چاکەکانی لێی خۆش دەبێت، بەڵام من گوناهم زۆرە بەڵکو بە ئارامگرتن و وەڵام نەدانەوە خوا لە گوناهم خۆش ببێت).

## دڵنیا بوون لە خوا:

حومەیرا مەودودی دەڵێت: وەفدێك لە فەلەستینەوە هاتن بۆ لای باوکم، پێش گەیشتنیان بە ماوەیەکی کەم زانیمان ئافرەتیشیان لەگەڵدایە، لای ئێمەش پیاوو ئافرەت تێکەڵ نابن، بۆیە

بە پەلە ناو باخەکەمان چاککرد بۆ ئافرەتان و باوکم داوای لێکردین کە زۆر خزمەتی ئافرەتەکان بکەین و ڕێزیان لێبگرین.

وەرزەکە وەرزی باران بوو، کە کورسیمان داناو پەردەمان گێڕا هەورێکی ڕەش ئاسمانی گرتبوو لەوەدا بوو ببارێت، زۆر خەمان بوو بە باوکمان وت: (ئەگەر باران باری بەسەر میوانەکاندا تووشی ئیحراجیەکی زۆر دەبین و بۆ کوێ ڕاکەین!) باوکم زۆر لەسەر خۆ وتی: (ان شاء الله باران نابارێت) وتمان: (باوکە، وەرە سەیرکە، خەریکە دەبارێت)، باوکم دەنگی بەرز کردەوە وتی: (پێم وتن ان شاء الله باران نابارێت).

پاش ئەوە بە چاوی خۆمان بینیمان هەورەکە بە ئاسماندا بڵاوەی کردو جەوێکی زۆر خۆش دروست بوو، دوای ئەوەی میوانەکان ڕۆیشتن و شتەکانمان کۆکردەوە، هەور جارێکی تر کۆبووەوەو ئەو شەوە تا بەیانی باران باری.

ئنجا دایکم پێی وتین: (هەرگیز موناقەشە لەگەڵ باوکتان و ئەنکتاندا مەکەن، گوێ بگرن و پەیڕەوی قسەیان بکەن، هەرچی بڵێن خوا بۆیان دەکات، مەگەر حەزرەت ﷺ نافەرموێت (مِن عباد الله مَنْ إذا أقسم على الله أبرّه) (رُبَّ أشعث أغبر لا تُفتح له الأبواب، إذا أقسم على الله صدقه الله)...

## جارێکی تر بەندیخانە:

جارێکی تر لە ساڵی(١٩٥٣)دا باوکم ڕاپێچی بەندیخانە کرایەوە، فلیمەکە لە ئەوەڵەوە دەستی پێکردەوە، پارەیەکی کەم، هەشت مناڵ لە دەوری دایکێکی نەخۆش و لاواز، جارێکی تر فرۆشتنی ئاڵتون و پێداویستیەکانی خۆی، جارێکی تر نان کردن و جل شتن...

ئەم جارە تاوانەکە قورس تر بوو بەلای حکومەتەوە، چونکە باوکم پەڕاوێکی نووسی لەسەر مەترسی قادیانیەکان و ئامانجەکانیان...

لە مەحکەمەی عەسکەریدا حوکمی لە سێدارەدانیان بۆ باوکم دەرکرد، بڕیارێکی زۆر ستەمکارانەو نابەجێ بوو، خەڵکی هەریەکەو بە جۆرێك، هەبوو ناحەز بوو ئەوەی بەوپەڕی عەدالەت دەزانی، ئەوەی دۆستیش بوو دنیای لێ تاریك بوو بوو...

دۆستانمان کە دەهاتن بە گریانەوەو ئێمەیان بەوپەڕی خۆڕاگری دەبینی ئەوانیش بە خۆیاندا دەهاتنەوەو ناچار دەبوون داخ و خەمەکانیان بشارنەوە...

ئەو ڕۆژەی بڕیارەکە دەرچوو، شەوەکەی تا بەیانی دایکم نوێژی کردو لە خوا پاڕایەوە، لە دوای نوێژی بەیانی دایکم کەوتە قورئان خوێندن و گەیشتە ئایەتی﴿ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَأۡتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۖ مَّسَّتۡهُمُ ٱلۡبَأۡسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلۡزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِۗ أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ ﴾ البقرة: ٢١٤.

دایکم ئایەتەکانی دووبارە دەکردەوەو دەگریا، ئنجا بانگی کردم و وتی: سەیرکە کچم ئەم پەڕاوە چەند زیندووە، ئەها چۆن خەم و خەفەتمان دەڕەوێنێتەوەو چۆن قسەمان لەگەڵ دەکات...

من لەو کاتەدا سیانزە ساڵێك دەبووم، بە ڕاستی کچی گەورە وەکو خوشك وایە بۆ دایك، کە هەموو شتێکی خۆی لا باس بکاو دڵی خۆی لا بکاتەوەو، هەمیشە دایکم دەیوت: ئەو ئافرەتە چەند گوناهو بەدبەختە کە کچی نەبێت.

هەموو جیهانی ئیسلام بۆ باوکم خرۆشا بوون، بۆیە دوای چواردە ڕۆژ ئەندامێکی کۆمەڵەی ئیسلامی هات و لە پشت دەرگاکەوە وتی: دایکتان بانگ بکەن بۆم، هەموو ترساین کە خەبەری ناخۆشی پێ بێت،کەچی خۆشبەختانە وتی: (پیرۆزباییتان لێ دەکەم، میری قەرارەکەی گۆڕی بە بیست و یەك ساڵ بەند کردن لەگەڵ ئەشغال شاقە).

هەر ئەوەندە کابرا قسەکەی تەواو کرد دایکم لە پشت دەرگاکەوە سوجدەی بردو وتی: خوای گەورە ڕاستی فەرمووە ﴿ أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ ﴾البقرة: ٢١٤

هەر ئەو ڕۆژە دایکم خەوێکی بۆ گێڕاینەوە، وتی (لە خەوما فڕۆکەیەك لە لامانەوە دابەزی و باوکیشتان دەستی هەموومانی گرت بۆ ناو فڕۆکەکەو، فڕۆکەکە بە خێرایی فڕی بەرەو ئاسمان و، منیش سەرم گێژی خواردو زۆر ترسام، لە پڕ فڕۆکەکە وەستاو باوکتان دەستی گرتم و دایبەزاندم، من زۆر دەترسام، کەچی باوکتان پێی وتم: سەیری خوارەوە بکە چەند سەرکەوتین، منیش سەیری خوارەوەم کرد، دیار بوو زۆر سەرکەوتبووین، خەڵکیم دەبینی لە خوارەوە وەك مێروولە و بینا بەرزەکانیش ئەتووت یاری مناڵانن... ئیتر لەوێدا خەبەرم بووەوە.

بە ڕاستی خەوەکەی دەقاو دەق هاتە دی، هەرچەندە دایکم زۆر ترسا بەڵام خوای گەورە بەو مەسەلەیە (إن شاء الله) پایە بەرزی دنیاو قیامەتی کردین.

پاش چەند سالێکیش لە (٢٥ی دیسەمبەری ١٩٧٥)دا ڕۆژنامەی (ئیفریشیا)ی هەفتانە کە لە لاهور دەرنەچێ، لە دەمی پیاوێکەوە لە شاری (سرجودها) کە ناوی (میان رحیم بخش) بوو بڵاوی کردەوە کە وتبووی: (کاتێك مەحکەمە حوکمی لە سێدارەدانی بۆ شێخ مەودودی دەرکرد، لە خەوما حەزرەتم بینی ﷺ، دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (پەروەردگارا ڕەحمان پێ بکە، پەروەردگارا، بە ڕاستی مەودودی بۆ دینەکەی تۆ بانگ دەکاو هەوڵی بەرزکردنەوەی وشەی هەق دەدات،پەروەردگارا داوات لێ دەکەم کە بە زیندوویی بیهێڵی، پەروەردگارا ڕەحمان پێبکە ئەی کەریم).

ئنجا لە پڕ گوێم لە دەنگێك بوو وتی؟: (ئەی محمد، دوعاکەتمان قبوڵ کرد)...ئیتر لە بانگی بەیانی خەبەرم بۆوە... دڵم لێدانی زیادی کرد، لەشم دەلەرزی، فرمێسك بە چاوانمدا دەهاتە خوارێ، خۆم بۆ نەدەگیرا، ماوەیەکی زۆر لە جێگاکەمدا مامەوەو نەمدەتوانی بجوڵێم)...

دیارە تەفسیری خەوەکەش ئەوە بوو کە باوکم ڕزگاری بوو...

## سیاسەتمەداری ساڵح:

حومەیرا مەودودی دەڵێت: لە ساڵی (١٩٦٤)دا جارێکی تر باوکم ڕاپێچی بەندیخانە کرایەوەو ئەمجارەش کتێبەکانی برد تا لە بەندیخانە نووسینەکانی تەواو بکات، دایکم پەکی کەوتبوو، نەنکیشم لە(١٩٥٧)دا وەفاتیکرد بوو کەس نەبوو دڵنەواییمان بکات.

پێش ئەم دەستگیر کردنە، ڕەئیس ئەرکانی سوپاو سەرۆکی دەوڵەت (محمد أیوب خان) بە ئامادە بوونی والی پاکستانی ڕۆژئاوا (ئەمیر محمد خان) چاویان بە باوکم کەوت، سەرۆکی دەوڵەت بە باوکمی وت: (گەورەم جەنابی شێخ، گەل و دەوڵەت پێویستیان بە زانستی جەنابتە، هیوام وایە واز لە سیاسەت بێنی و خەریکی زانست بیت).

باوکیشم پێی وت: (بەڕێز ئەیوب، تۆ تەمەنت هەموو لە سوپادا سەرف کرد، بۆچی ڕێ لە من دەگریت چالاکییە کۆمەڵایەتیەکانم ئەنجام بدەم ولە ژیان دوور بکەومەوە؟ جا نازانم بە چ مەبدەئێك و یاسایەك بە من دەڵێی کە واز لە سیاسەت بهێنم؟)

سەرۆکیش وتی: (جەنابی شێخ، سیاسەت گەمەیەکی پیسە، ناگونجێ بۆ پیاوێکی ساڵحی وەك بەڕێزتان خۆی لەو بوارە بدات).

باوکیشم وتی: (نازانم رات چۆنە، واز بێنین لەو پیسییە بەردەوام بێ باشە یان ڕێ خۆشکەین بۆ کەسانی ساڵح کە خاوەن ئەمانەت و ڕاستگۆیی و ئیخلاسن کە ئەو پیسییە کۆتایی پێ بهێنن و پاکی بکەنەوە؟ هەروەك فەرمووتان جەنابی سەرۆك، سیاسەت قوڕو لیتاوە، منیش هاتومە ناوی پاکی بکەمەوە، تا نەوەکانی داهاتووش پیس نەکات و، ببێتە ڕەحمەت بۆ گەل و وڵات).

ئنجا سەرۆك ویستی ئیغرای بکات بە پارەو سامان و وتی: (جەنابی شێخ بۆچی بە ناوی منداڵەکانتەوە کارگە دانامەزرێنی و بانکەکانیش چی قەرزت بوێ ئەتدەنێ‌و هەموو ئاسانکارییەکت بۆ دەکەین، چ وڵاتێکی عەرەبیشت دەوێت دەتکەین بە سەفیر).

جەنابی سەرۆك نەیزانی چ کەسایەتیەك لەگەڵیا دانیشووە، کەسایەتیەك کە دنیای بە لاوە هیچ نیەو هەموو شتێکی کردووە بە قوربانی ئاینەکەی، ئنجا باوکم پێی‌وت: (ئەیوب تۆ هێشتا تێنەگەیشتووی، بەڕاستی‌بەم قسانە ئیهانەت کردم)...

بە ڕاستی باوکم ئیمانی بە قەبرو قیامەت و ئاخیرەت بەهێز بوو، بە چاوی بەسیرەت ئەوەی ئەدی کە خەڵکی تر بێئاگابوون لێی، چاوەڕێی بەهەشت و پاداشتی ئاخیرەت بوو...

## شەهادەی دنیایی:

حومەیرا مەودودی دەڵێت: کە سێیەم جار باوکم بەند کرا لە (١٩٦٤)دا، (ئەحمەد فاروق)ی برام لە کۆلێژی پزیشکی بە پلەی (باڵا) دەرچوو، منیش ماجستێرم هێنا لە ئەدەبی ئینگلیزیدا بە پلەی (باڵا)، خەریك بوو هەردووکمان لە خۆشیدا باڵ بگرین، داوامان لە دایکمان کرد کە جائیزەمان بداتێ بۆ ئەو سەرکەوتنەی بە دەستمان هێناوە، کەچی پێکەنی و هیچی نەوت.

دوای دوو سێ ڕۆژ، کە هیچ گرنگیان پێ نەداین، زۆر بێتاقەت بووین و وتمان: (ئێوە تەقدیری ئێمەتان نەکرد، ئێمە هیچ نین بە لاتانەوە).

دایکم هیچی نەوت، بۆ ئێوارە باوەشی پیا کردین و ناوچەوانی ماچ کردین و لای خۆی دایناین و وتی: (خۆشەویستانم، ئەمە ماڵی زانای ئاینییە، لەم ماڵەدا عیلم و عەمەل گرنگە، پلەو پایەی دنیایی و شەهادەی سەر وەرەقە گرنگ نیە، ئەوانەی کە بە دوای شەهادەدا ڕادەکەن و کۆی دەکەنەوە وەك ئەوەیە کە سفر زەڕبی سفر بکەن، هەر سفر ناکات؟) بەم ئامۆژگاریانە

دڵمان ئاوی خواردەوەو ئەو خەوو خەیاڵە دنیاییەی هەمان بوو وەك سەراب لەبەر چاومان ڕەوایەوە...

## نەخۆشکەوتنی باوکم:

بە هۆی بەند کردن و ماندوویەتی زۆرەوە ڕۆژ بە ڕۆژ تەندروستی باوکم خراپتر دەبوو، ناچار دایکم پاش بیست و پێنج ساڵ وانە وتنەوەی قورئانی لە (یانەی ژنان)دا، وانەکانی کەم کردەوەو سپاردی بەو ئافرەتە بانگخوازانەی کە پەروەردەی کردبوون...

دایکم زانست و زانیارییەکی بەرفراوانی هەبوو، ڕۆژێك ئافرەتێك لێی پرسی: چ پسپۆڕیەکت تەواو کردووە لە شەهادەی ماجستێرەکەتدا؟ ئەویش وتی: کچی خۆم، ئێوەن خاوەن بڕوانامەی بەرزو ماجستێر، من بڕوانامەی ناوەندیم هەیە لە قوتابخانەی (مەلیکە دیری)لە دیلهی...

ژنەکە وەڵامەکەی دایکمی بەلاوە سەیر بوو لێی پرسی ئەی کەواتە ئەم هەموو زانیارییەت لە کوێ بوو؟!

دایکم وتی: من ژیانم لەگەڵ زانایەکی‌خواناسدا بەسەر بردووە،کە بە سەعاتێکی فێری زانست و زانیارییەك دەبیت کە لە چەندەها کتێبدا دەستت ناکەوێ.

## کۆچی دوایی باوکم:

حومەیرا دەڵێت: کاتێ نەخۆشیەکەی باوکم زیادی کرد ڕۆژێك پێی وتین: (من زۆر زوڵمم لە خۆم کردووە، هەرگیز ڕەحمم بە لاشەم نەکردووە، هەقی چاوم نەداوە لە خەو، چاوەکانم خەویان دەویست من زۆرم لێدەکردن بۆ شەونخونی و نووسین، زۆر جار دوای نوێژی عیشا دەکەوتمە نووسین کاتێك بە خۆم دەزانی بانگی بەیانی ئەدا، ئەگەر ئەمەشم نەکردایە نەم ئەتوانی تەفسیری (تفهیم القرآن) تەواو بکەم، جا وا ئێستا چاوەکانم هەقم لێ دەکەنەوە، ئەمەوێ پشوو بدەم و چاو لێك بنێم، کەچی خەو بە چاوما نایەت، ڕامهێناون لەسەر شەونخونی و ئێستا مانای نووستن و پشودانیان لەبیر چۆتەوە... ئەمەوێ بیرم مەشغوڵ نەبێ و پشوو بدەم بەڵام چونکە خۆم وا فێر نەکردووە ناتوانم فکرم ساف بکەم و بیر نەکەمەوە، خۆم زۆر ماندوو کرد، بۆیە ئێسقانەکانم هەقم لێ دەکەنەوەو ئەمڕۆ نایەڵن تۆزێ ئیسراحەت بکەم...

باوكم داوودەرمانی كەمكردنەوەی ئازاری دەخوارد ئەوەش ئەوەندەی تر تەندروستیان ڕوخاند، دایكم تكای لێكرد كە لەگەڵ (ئەحمەد فاروق)ی برامدا بچێ بۆ ئەمریكا، سەرەنجام باوكم قایل بوو، براكەم كە لە ئەمریكا بوو گەڕایەوەو لە (٢٦ی مایو ١٩٧٩) لەگەڵ باوكمدا چوون بۆ ئەمریكا بۆ عیلاج.

پاش سەردانی چەند دكتۆرێك مانگی یەكەم باوكم باشتر بوو، كەوتە نووسینی پەڕاوێك لەسەر ژیانی حەزرەت، لە هەموو لایەكیشەوە خەڵكی دەستە دەستە دەهاتن بۆ لای‌و زۆربەیان لەوانە بوون كە بە هۆی نووسینەكانی باوكمەوە ڕێی ڕاستیان دۆزیبووەوە، یان باشتر پابەند بوو بوون بە ئیسلامەوە، پێیان دەوت: (ئێمە هەر بە ناو موسڵمان بووین، بە ڕاستی خوا بەهۆی پەڕاوەكانی تۆوە هیدایەتی داین و زیاتر پابەند بووین بە ئیسلامەوە، خوا پاداشتی خێرت بداتەوە لەسەر ئێمەو موسڵمانان).

تەنانەت یەكێ لەوانەی سەردانی باوكمیان كرد (ئەلیكس هیلی) بوو خاوەنی پەڕاوی بەناوبانگی (الجذور)، كە نوسخەیەكی كتێبەكەشی پێشكەش بە باوكم كرد.

لە (٨ی سێبتەمبەری ١٩٧٩)دا بەباوكم جەڵتەیەك لێیداو دوای دوو هەفتەش گورچیلەكانی و جگەری وەستان و ئەو ساتە وەختە هاتە پێشەوە كە ڕاكردن نیە لێی، لە (٢٢ی سێبتەمبەری ١٩٧٩) باوكم لە خەستەخانەی (بفیلو) لە ئەمریكا گیانی سپاردەوە بەوخوایەی كە هەموو ئەچینەوە بارەگای ئەو.

## دایكێكی خۆگر:

حومەیرا دەڵێت: كاتێك براكەم لە خەستەخانە گەڕایەوە، هەروەك پەڕۆ كۆنی لێهاتبوو لە خەم و خەفەتدا، كە هەواڵی وەفاتی داینێ، دایكم دڵنەوایی كردو وتی (كوڕم ئارام بگرە، سوپاسی خوا بكە، كە لە سایە و سێبەری باوكتدا گەورە بوویت، خەریك بوو لە ١٩٥٣دا لە سێدارەی بدەن، ئەگەر ئەو كاتە بڕۆشتایە ئەوا هەر شێوەشت نەدەكردو وێنەكەشی نەدەهاتەوە یادت)...

دایكم دڵنەوایی هەموانی دەكردو دەیوت: (بڵێن: إنا لله و إنا إليه راجعون)...

خەڵكی ئارامگریی دایكمیان زۆر بەلاوە سەیر بوو...

خالم (دکتۆر جەلال شەمسی) بە سەیارەکەی لە (تۆرنتۆ)ی کەنەداوە هات بۆ لای دایکم، خەریك بوو لە داخا لە هۆش خۆی بچێ، کە دایکمی بەو شێوەیە بینی لای سەیر بوو وتی: خوشکم من بە درێژایی ڕێگا ئەگریم و لە بیری ئەوەدا بووم چۆن بتوانم دڵنەوایت بکەم..

ئەویش وتی: برام ئیمان بە خواو پشت بەستن پێی و ئارامگرتن سیفاتی بەرزن کە مرۆڤ بە هۆیانەوە دەتوانێ ڕووبەڕووی گەورەترین تەنگوچەڵەمەو ناخۆشی ببێتەوە.

کاتێك لە فڕۆکەخانەی نیویۆرك چاوەڕێمان دەکرد و جەنازەکەی باوکم گەیشتە فڕۆکەخانە، ژنانی پاکستانی و هیندی و ئەفریقی زۆر هاتن بۆ فڕۆکەخانەو، چەند کەسێکیان پرسیاریان دەکرد ئاخۆ جەنازەکە گەیشتبێ، دایکم وتی: بەڵێ گەیشتووە! وتیان: چوزانیت؟! وتی: من هاوسەری ئەوم، خوا ڕەحمی پێبکات! ئیتر هەموو کەوتنە سەرخۆشی لە دایکم و گوێم لێ بوو بە یەکتریان دەوت: (بە ڕاستی ئەوەیە ئارامگرتن).

## لە سێ کیشوەر نوێژیان لەسەر کرد:

ئەو موسڵمانانەی هاتبوون بۆ فڕۆکەخانەی نیویۆرك ئەوەندە زۆر بوون بە شەش جار نوێژی مردوویان لەسەر باوکم کرد، لە فڕۆکەخانەی لەندەنیش کە دەکەوێتە کیشوەری ئەورووپاوە موسڵمانانی ئەوێ نوێژیان کرد لەسەر باوکم، لە (لاهور)یش لە کیشوەری ئاسیا ژمارەیەکی بێ ئەندازەی موسڵمانان نوێژیان کرد لەسەر باوکم...

ڕاستە باوکم سەری نایەوە، بەڵام کاتێ سەری نایەوەو کۆچی کرد کە لەسەر تاسەری دنیادا نووسینەکانی وریا بوونەوەیەکی ئیسلامیان بەرپا کرد کە تا قیامەت پاداشتی بۆ دەنووسرێت...

## بەسەر جلە کۆنێکدا مەگرین:

کە گەیشتینەوە لاهور دایکم ئامۆژگاری کردین و وتی: (بەسەر ئەم جەستەیەدا مەگرین، ئەم جەستەیە جلە کۆنێکە، چونکە جەستە وەك بەرگێك وایە بۆ ڕۆح، هەروەکو هەموو جل و بەرگێکیش کۆن دەبێ و ڕەنگی تێك دەچێ و پینە و پەڕۆ دەکرێت و بە کەڵکی بەکارهێنان نامێنێ، ئەو کاتە ڕۆح ئەو بەرگە لە خۆی دا ئەکەنێ و فڕێی ئەدات و بەرگێکی نوورین لەلایەن خواوە دەپۆشێ ... بە ڕاستی ئێستا باوکتان زۆر ئیسراحەتی کردووە، گەڕاوەتەوە بۆ لای ئەو کەسەی کە ڕێزی لێ دەگرێ و قەدری ئەزانێ، ئەوەی کە لە ئەمریکا لە تابوتدا بۆتان

هاتۆتەوە بەرگ و پۆشاكێكی كۆنە، هەیە بگری بەسەر جل و بەرگ و پۆشـاكی كـۆن دا؟! بـە ڕاستی دایكم بەو شێوازە ناسانە پڕ مانایە توانی سەبووریمان بدات و هەمیشە سەرمەشق بێت.

## بۆ پۆستی دنیایمان نەكردووە:

سەرۆك (ضیاء الحق) داوای لـە دایكـم كـرد كـە ببێتـە ئەنـدام لـە مەجلیسـی شـیوخ دا، دایكیشم ڕازی نەبووهیچ پۆستێك وەرگرێـت و وتـی: نـەخۆم و نـە منالـەكانم بازرگـانی بـەناوی مێردەكەمـەوە ناكـەین، ئێمـە نـاوی ئـەومان بـۆ ئـەو ڕۆژە دەوێـت كـە قورئـان دەفـەرموێت ﴿ وَالَّذِينَ ءَامَنُواْ وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ كُلُّ ٱمْرِيٍٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ ﴾الطور: ٢١. داواكارم لە خوا كە بێبەشمان نەكات لـە پاداشـتی هەوڵ و كۆشش و جیهادی و لە فیردەوسی ئەعلادا و لە ژێر سێبەری عەرشدا كۆمان بكاتەوە .

## مردنی دایكم:

حومەیرا دەڵێـت: دایكـم لـە دواڕۆژەكـانی ژیانیـدا زۆر نـاوی بـاوكمی دەبـرد و تەنانـەت جارێك لە گەرمای زۆرو بێ كارەباییدا كە تەنگەنەفسی لەگەڵدا بوو لە هۆش خـۆی چـوو، كـە هاتەوە هۆش خۆی بە دڵخۆشی‌یەوە وتی: باوكتان بانگم دەكات ودەڵێ سەركەوە وەرە بـۆ ئێـرە، سەیركە كەش و هەوا چەند خۆشە، چی دەكەیت لـەو گەرمایـەدا ..ئنجا دایكـم هەناسـەیەكی هەڵكێشاو وتی: تو خوا پێم بڵێ چۆن بێم بۆ لات ؟؟ من چاوەڕێی بانگهێشـتی خـوام وهێشـتا بانگی نەكردووم.

لـە ئێـوارەی هـەینی مـانگی ئیبریلـی ٢٠٠٨ دوای بیسـت و چوارسـاڵ لەكۆچـی بـاوكم دایكیشم كۆچی كرد ..پێم خۆشە یادەوەری‌یەكانم بەم دێڕە هۆنراوەیـە كۆتـایی‌بهێنم كـە دایكـم زۆر حەزی پێدەكرد كە دەڵێت :

ننام قريري العـين الى يـوم الحشـر فقد ارتحنا من حمل الامانة وهمـوم الـدنيا .....[1]

---

١- (المجتمع ١٨٣١)

## دوا وتە:

پیاوێك لە تورکیا بە ناوی (صەبانچی) لە هەژاری و حەماڵیەوە پێدەگات و دەبێتە دەوڵەمەندێکی ناوداری تورکیا، دەبێتە خاوەنی چەندەها بانق وکۆمپانیای گەورە...

کوڕێکی ئیفلیجی هەبوو، جارێك وتی: زۆر سەیرە کۆمپانیای سەیارەم هەیەو کوڕێکم نیە سەیارە لێ بخوڕێت...

(صەبانچی) ئەوەندە دەوڵەمەند بوو قەرزی ئەدا بە حکومەتی تورکی، چالاکیەکانی تەواو بە بۆرسەوە دیار بوو...

کاتێ نەخۆش کەوت چوو بۆ ئەمریکا بۆ عیلاج و لەوێش وەفاتی کرد، بۆ چەند ڕۆژێك هەواڵی مردنیان شاردەوە لە ترسی دابەزینی‌لیرەی تورکی و بۆرسەکان. ناوبراو ئەو هەموو ماڵ و سامان و کۆمپانیایەی بەجێهێشت و ئێستا کچەکەی دەیبات بەڕێوە...

لە سەرە مەرگیدا دوو وەسیەتنامەی نووسی و داوای کرد کە کاتێك مرد پێش ناشتنی لە کاتی شۆردن و کفن کردنیدا یەکەمیان جێ بەجێ بکەن... کاتێك کفنیان کرد یەکەمیان کردەوە، داوای کردبوو جووتێ گۆرەوی لە پێ بکەن و ئینجا بینێژن، ئەوانیش پرسی زانای ئاینیان کرد، وتیان: لە کفنەکە زیاتر نابێ هیچی تری پێوە بێ، ناچار بێ گۆرەوی ناشتیان!

کە لە ناشتنی تەواو بوون وەسیەتی دووەمیان کردەوە کە نووسیبووی: (دنیایەك وا بێت بەو هەموو سەروەت و سامانەوە نەتوانی جووتێ گۆرەوی لەگەڵ خۆتدا بەری هەقە پەندی لێوەرگیرێ).

بە ڕاستی ئەمە ئەزموونی دەوڵەمەندترین کەس و هەژارترین کەسە، ئەگەر هەموو دنیاش هی تۆ بێت ناتوانی جووتێ گۆرەوی لەگەڵ خۆتدا ببەی، تەنانەت کفن گیرفانی نیە؟! ئەورووپیەکانیش کە قات دەکەنە بەری مردووەکانیان و دەیان نێژن، لەو ڕاستیە تێگەیشتوون و قاتەکان گیرفانی بۆ ناکەن...

دەی کە ئەوە دنیاکە بێت با قۆڵی مەردایەتی لێهەڵکەین بۆ بانگەوازکردن بەڵکو لەو ڕێگەیەوە سەرفرازی دنیاو قیامەت ببین..

تا بەیەکگەیشتنەوەیەکی تر بە خواتان دەسپێرم ..هەرشادو سەرفرازو بانگخوازی بۆ خوا سوڵحاوین .

# پێڕست

بەرگی یەکەم (ئازادیی)



بەرگی دووەم (ئاسودەیی)

بەرگی سێیەم (دڵنیایی)

بەرگی چوارەم (ئارامی)



بەرگی پێنجەم (ئاشتی)

بەرگی شەشەم (هیممەت بەرزی)

بەرگی حەوتەم (سەرفرازیی)

## بەرگی هەشتەم (دیاریی)

بەرگی نۆیەم (بانگخوازیی)



بەردی لەنگەر گرتن و وێنەی ئەو تیمەی کە دۆزییانەوە



شێوەی کەشتیەکەی نوح بە بۆچوونی زانایان



بەردەکانی لەنگەر گرتن بە ژێری کەشتییەکەوە



شوێنەواری کەشتییەکەی نوح لەسەر شاخی جودی



ئیدریس تۆفیق لە ڤاتیکانەوە بۆ ئەزهەر




ئەبو تریکە.. هەموو فیداتین ئەی پێغەمبەری



وێنەی گەردوون کە بەگەلە
ئەستێرە چنراوە



صابر طعيمة : ئەو هونەرمەندەی لە پانو
خولەكدا سەدو هەشتا پلە ژیانی گۆڕ



لەدۆزینەوەکانی ئوور لە عێراق
کە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی قورئان



ڕاهێنەری فەرەنسی فیلیپ خۆی
و هاوسەرەکەی موسوڵمان دەبن




پەڕاوی ( گەڕان بە دوای
نهێنی هێزی بوونەوەردا )




پەڕاوی کۆدی دڵ



یەکێ لە مەسەلەکان کە براوەتە
گۆڕەپانێکی فەرەنسا




فانیلەی بانگخوازێکی لاوی بەریتانی
کە سەدان کەسی موسوڵمانکرد



موسوڵمانبوونی دکتۆر کای لوهری ئەڵمانی



لەم سەدەیەی دواییدا زانرا کە خۆر دەڕوات بە خێرایی دوو سەد کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا



گەلە ئەستێرەی ڕێگای کاکێشان کە خۆر یەکێکە لە ئەستێرەکانی کە ژمارەیان سەد ملیار ئەستێرەیە



(پیێ فۆگڵ)ی ئەڵمانیی لە (٢٠٠٢)دا موسڵمان بوو



عەلی گواتیمالا لە کاتی حەجدا




وەسفی قورئان زۆر وردە لە لایەنی زانستییەوە کە باس لە موستەقەڕی خۆر دەکات کە لەم دواییەدا دۆزراوەتەوە و هەمان دەستەواژەی قورئانی بۆ بەکار دێنن.







پرۆفیسۆری یابانی مۆسارۆ ئۆماتۆ پاش دە ساڵ لێکۆڵینەوە سەلماندی کە ئاویش هەستی هەیە و پەراوێکی نووسی بە ناوی (نامەکان لە ئاوەوە) ئەمەش چەند وێنەیەکی کریستاڵەکانی بەفرە لە کاتێکدا کە مۆسیقایەکی خۆش یان قسەی خۆش بۆ ئاوێك بکرێت پاشان بیبەستێت هەروەها کریستاڵی ئەو بەفرانەش کە ئاوەکەیان مۆسیقای رەق و ناخۆش یان قسەی ناخۆش دەبیستن دیارە کە وەك نەخۆش وان کزو شێواون...



وێنەی کریستاڵی ئاوی بەلووعەی شاری تۆکیۆ کە کلۆری تێکراوە پاش بەستنی شێواوە و رەنگی مردووی گرتووە.



پرۆفیسۆر عەلی بلۆسین لە
لوتکەی مارکسیەتەوە بەرەو ئیسلام



بانگخوازی هیندی د.ژاکر نایك



باڵوێز رەفیق چانین



ڕاهێنەری کاراتی جیهانی
ئەحمەد کەمال ئۆکاماتۆ



بانگخوازی بەرازیلی انطوان الاشقر




کتێبی (سێکس ، زن ، در تاریخ) بە زمانی فارسی سیامەك ستودە لە ئەمریکا دەریکردووە و مەریوان هەڵبجەیی تەنها وەریگێڕاوە



**نامەیەک**

لە شێخ عائج القرنی یەوە

بۆ نیلسۆن ماندێلا





بانگخوازی فلپینی محمد سوماوی





وێنەی (عەدەن) لە گوگڵ ئێرسەوە کە دەکەوێتە سەر دوورگەیەکی بورکانی، کە حەزرەت (ﷺ) لە فەرمودەکەیدا ئاماژەی بۆ دەکات و بەڵگەیەکی گەورەی پێغەمبەرایەتییە.



تیری هنری لەکاتی سوجدە بردنیدا
لە گۆڕەپانی تۆپی پێدا



(المسلّات الفرعونية)
مەسەللە فیرعەونیەکان





سەربازێکی ئافرەتی ئەمەریکی بەهەموو تفاقی جەنگەوەخەمی ئەنجامدانی نوێژەکەیەتی، بۆیە زۆر بە ئاسایی دەچێتە مزگەوتێکەوە و نوێژەکەی دەکات، لەکاتێکدا کە ژیانیشی لە مەترسیدایە

## بەرهەمی چاپکراوی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

| ژ. | ناوی بابەت، ژ.چاپ | | نووسەر | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ڕازی قورئانی | ٢چاپ | عمر خالید | بورهان محمدئەمین<br>ئەندازیار عوسمان |
| ٢ | محمەدی دوزجەیی | ٢ چاپ | خالید ئێرتوغرول | گۆنا غەریب |
| ٣ | کاتێ ژیانتە چۆنی دەگوزەرێنی | | محمدعلی قەرەداغی | |
| ٤ | جێنشینی سەرزەوی | ٢ چاپ | عمر خالید | لەیلا تاهیر |
| ٥ | بۆ بەهێی خۆشەویست | ٤ چاپ | عمر خالید | ئامانج محمدئەمین |
| ٦ | زنجیرەی بەرەوئیسلام (١٠ کتێب) | ٢چاپ | ئەندازیار عوسمان | |
| ١٦ | حەسەنی بەصری<br>چاپ | ٢ | بەدریە عزیز | |
| ١٧ | هەنگاوێك بەرەو ڕاستگۆیی | ٢ چاپ | دانا عوسمان | |
| ١٨ | گفتوگۆی خێزانی | ٢ چاپ | محمد أحمد عبدالجواد | محمد عبدالرحیم |
| ١٩ | نهێنیەکانی گەردوون لەنێوان قورئان و زانستدا | | عبدالدائم کحیل | جمال محمدئەمین |
| ٢٠ | ئەو پیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت | ٣چاپ | خالید ئێرتوغرول | شەیدا |
| ٢١ | پەروەردەی منداڵ – هونەرو لێزانین | | یاسر محمود | فریشتە محمد |
| ٢٢ | خۆشەویستەکەت ( محمد ﷺ) بناسە | | جاسم مطوع | لەیلا تاهیر |
| ٢٣ | یاداشتنامەی مامۆستایەك (بەرگی یەکەم) ٢ چاپ | | وەهبی وەققاس لۆغلۆ | د. زانا أحمد |
| ٢٤ | یاداشتنامەی مامۆستایەك ( بەرگی دووەم) | | وەهبی وەققاس ئۆغلۆ | د. زانا أحمد |
| ٢٥ | خۆشەویستی ڕاستەقینە | | نعمت ذهني، عزة الابراشي | بەهجەت جەمیل |
| ٢٦ | ناملیکەی پەیامەکانی خۆشکان<br>٣ چەپك لە (٢٥) ناملیکەدا | | عمر عبدالعزیز | |
| ٥١ | ئایا هاوسەرێکی نموونەیت | | هەڵاڵە محمد | |
| ٥٢ | ڕێگای بەهەشت | ٢ چاپ | عمر خالید | تاریق نەجیب |
| ٥٣ | ستەم | | دانا عوسمان | |
| ٥٤ | سەرایەکان ئاینەکانی | | د.عوسمان هەڵەبجەیی | |
| ٥٥ | لە نهێنیەکانی قورئانی پیرۆز | | د.مصطفی محمود | جەمال محمدئەمین |
| ٥٦ | لاوان و هاوین | ٢ چاپ | عمر خالید | محمد محمدمیرزا |

| ژ. | ناوی بابەت ، ژ.چاپ | نووسەر | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ٥٧ | قورئانی پیرۆز لە ١٠٠ فەرموودەدا | د. محمد زكي خضر | سەعید صاڵح |
| ٥٨ | جوانترین دیاری | سیما ماراشی | هەردەوان |
| ٥٩ | موعجیزاتی ئەحمەدی | بەشێك لە پەیامەکانی م.سەعیدی نورسی | فارووق رەسوڵ یحیی |
| ٦٠ | پەیامی بیماران | | |
| ٦١ | مرۆڤ و ئیمان | | |
| ٦٢ | میعراجی پێغەمبەر ﷺ | | |
| ٦٣ | سروشت هونەرە یا هونەرمەند | | |
| ٦٤ | سوننەتی پێغەمبەرﷺ بێ پلیکانەو رێبازە | | |
| ٦٥ | وتە بچوکەکان | | |
| ٦٦ | ئیخلاص و برایەتی | | |
| ٦٧ | مەلائیکەت و ژیانی دوارۆژ | | |
| ٦٨ | ئیجتهاد لەم سەردەمەدا | | |
| ٦٩ | نوور – خاتمانی باوەڕدار | گۆنا محی‌الدین | |
| ٧٠ | پاڕانەوەی رۆژانە | أحمد عبدالجواد | عمر أحمد نیزامی |
| ٧١ | خۆشەویستانی خوا | ئاری عبدالرحمن | |
| ٧٢ | مودەڕیسنامە | ئاوات ئەبوبەکر | |
| ٧٣ | ئەمەیە ئاکارت رۆڵەی شیرینم ٢ چاپ | عبدالله بن محمود البوسعیدی | دایکی سروشت |
| ٧٤ | بێ زمانان دێنە زمان | صلاح الدین محمد بهاءالدین | |
| ٧٥ | گەشتێکی نورانی | عمر عبدالعزیز | |
| ٧٦ | خۆبەگەورەزانین | دانا عوسمان | |
| ٧٧ | خنجیلانەکەم پێغەمبەر ﷺ خۆشی دەوێت | عبدالله بن محمود البوسعیدی | ئامانج محمدئەمین |
| ٧٨ | نوێژی بەیانی ٢ چاپ | فاتیح محمد سەمیع | |
| ٧٩ | یەکەم هەنگاو | فاتیح محمد سەمیع | |
| ٨٠ | شەیتان لەدادگای قورئاندا ٢ چاپ | عبدالحمید خورشید | رەوەند محمد رەئووف |
| ٨١ | پێغەمبەری چاوەڕوانکراو | فتح الله گولەن | حسن حەمەکریم |
| ٨٢ | ئاکاری پێغەمبەران | فتح الله گولەن | حسن حەمەکریم |
| ٨٣ | رێبەری حاجی | مەلا موسای بیارە | |

| ژ. | ناوی بابەت ، ژ.چاپ | نووسەر | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ٨٤ | دروود – بەرگی یەکەم ٣چاپ | فاتیح محمد سەمیع | |
| ٨٥ | دروود – بەرگی دووەم ٢ چاپ | فاتیح محمد سەمیع | |
| ٨٦ | ژیاننامەی حەزرەتی یوسف (علیە السلام) ٢ چاپ | ناصح محمد شەریف | |
| ٨٧ | کۆپاسەکانی دوانگە | أحمد پوشێنی | |
| ٨٨ | بۆ کچ و کوڕە لاوەکەم | هەلاڵە محمد | |
| ٨٩ | رازی هەردووهاوسەر بۆ یەکتر | سەعید صالح | |
| ٩٠ | نامیلکەی (جوان نوێژکردن) | محمد عبدالرحیم | |
| ٩١ | هاوسەنگی لەکسایەتی پێغەمبەردا ﷺ ٣چاپ | د.خالد سعد النجار | سیروان گەنجان |
| ٩٢ | نامیلکەی (یادی پەروەردگار) ٣ چاپ | | بەهرە محمدعلی |
| ٩٣ | نامیلکەی (چەند ڕازێك بۆ ژنان) | جۆ دۆناڵد والـتز | شنۆ محمد رەشید |
| ٩٤ | نامیلکەی (چەند ڕازێك بۆ پیاوان) | | |
| ٩٥ | نامیلکەی (چەند ڕازێك بۆ هاوڕێیان) | | |
| ٩٦ | نامیلکەی (چەپکێ گوڵ لەحیراوە) | جعفر محمد الماس | |
| ٩٧ | پرسی خوێندنەوە | | بهجت جەمیل |
| ٩٨ | فەزڵی نوێژ ٢ چاپ | ناصح سازانی | |
| ٩٩ | گیان و مادە | زنجیرەی ( پەیڤێك لەدڵەوە) عمر خالید | بەهرە محەمەد حەسەن |
| ١٠٠ | پەیامی خوایی | | شەونم عەبدوڵلا |
| ١٠١ | ڕازیکردنی پەروەردگار | | نسێ محەمەد حەمەعەزیز |
| ١٠٢ | نزا | | ئالاء بەکر ئەحمەد |
| ١٠٣ | ئارامگریی | | ناصح محەمەد شەریف |
| ١٠٤ | شەرم | | محمد صادق عبدالقادر |
| ١٠٥ | دامەزراویی | | بورهان محەمەدئەمین |
| ١٠٦ | مەبەست | | پشتیوان حەمەرەزا |
| ١٠٧ | تێکۆشان لەگەڵ دەروندا | | لەیلا تاهیر |
| ١٠٨ | بالاپۆشی | | فاروق عومەر ئەحمەد |
| ١٠٩ | لەژیانەوە | | مریەم حەسەن سەعید |
| ١١٠ | خۆشەویستی پەروەردگار بۆ بەندەکانی | | لەیلا تاهیر |
| ١١١ | هاوڕێیەتی | | بەناز جەمال |
| ١١٢ | تەوبەکردن | | ب. بۆسکانی |

| ژ. | ناوی بابەت ، ژ.چاپ | نووسەر | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ١١٣ | لەمیحرابی خامەوە | عابدین رشید | بورهان محمدئەمین |
| ١١٤ | ڕاستی خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ | ناصح محمد شەریف | |
| ١١٥ | لەسایەی ناوەجوانەکانی خوادا | عمر أحمد ئیزامی | |
| ١١٦ | چمکێك لەژیانامەی مامۆستا ئەحمەد زەهاوی | کاظم ناصر المشائلی | بورهان محمدئەمین |
| ١١٧ | نامیلکەی ( پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەرێتی محمد ﷺ ) | ئەبو ئەعلای مەودودی | بورهان حاجی علی |
| ١١٨ | خواپەرستی | ناصح سازالی | |
| ١١٩ | بەخۆداچوونەوەیەك لە خۆشەویستی پێغەمبەردا ﷺ | ئەندازیار عوسمان | |
| ١٢٠ | ئامانج دەستنیشان بکە - نامیلکە | عمر خالید | لەیلا تاهیر |
| ١٢١ | خۆشەویستی لە نێوان لاواندا - نامیلکە | عمر خالید | ڕوخۆش عومەر |
| ١٢٢ | پەیامێك بۆ کچە قوتابی زانکۆ - نامیلکە | د. عمر عبدالکافي | شەونم عبدالله |
| ١٢٣ | حەج و عەمرە - نامیلکە | عمر خالید | ب. بۆسکالی |

## بەرهەمی چاپکراوی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا بۆ منداڵانی ئازیز

## بە شێوەی نامیلکەی وێنەیی ڕەنگاوڕەنگ و قەشەنگ

| ژ | ناوی بڵاوکراوە و ژ.چاپ | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
|---|---|---|---|---|
| ١٢٤ | کلیلی پڕ نهێنی | زنجیرەی خولیاکانی هێمن | گالیب میکری | گۆزنا غەریب |
| ١٢٥ | بڕواوڕەوشت | | عمر عبدالعزیز | |
| ١٢٦ | نەلە | | ئاکۆ محمد سابیر | |
| ١٢٧ | یەکەمین ڕۆژوو | زنجیرەی مام بارام | بەتول ئێرتەکین | ئەحمەد خالید |
| ١٢٨ | بە پەرۆشی ئەڵمەند | | | |
| ١٢٩ | مزگەوتی درەوشاوە | | | |
| ١٣٠ | باپێغەمبەرمان بناسین بەشی یەکەم ٣ چاپ | | | ناصح محمد شەریف |
| ١٣١ | باپێغەمبەرمان بناسین بەشی دووەم ٢ چاپ | | | |
| ١٣٢ | بەرخۆلەکەم | | ئەسما یونس | |
| ١٣٣ | فیلی قارەمان | ژیانی پێغەمبەری ئازدارمان لە زمانی گیاندارانەوە | عائیشە گول ئایگن | ئاشنا عوسمان |
| ١٣٤ | گوێدرێژە بەختەوەرەکە | | | |
| ١٣٥ | بەردەڕەشـەکەو چـەوە بچوکەکان | | | |
| ١٣٦ | مێروولە ژیرەکان | | | |

## ئەم بەرهەمانەش لە ژێرچاپدان

| ژ. | ناوی بابەت ، ژ.چاپ | نووسەر | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ١٣٧ | ئایسێلْ – کچە لاوێکی بێ نەوا | خالید ئێرتوغروڵ | گۆنا غەریب |
| ١٣٨ | سۆزی نەتەوە یا نەتەوە پەرستی | مەلا سەید لەحمەد | |
| ١٣٩ | خاکی بوون | دانا عوسمان حەسەن | |
| ١٤٠ | نوێ بوونەوە | لەندازیار عوسمان | |
| ١٤١ | زنجیرەی نابلسی (٢٠) نامیلکەی پەروەردەیی و ئیمانی | د. محمد راتب النابلسي | ئامانج محمد ئەمین |
| ١٤٢ | راستی بەدیهێنان | فتح الله گولەن | |
| ١٤٣ | رۆژی دوایی – بەڵێنە راستەقینەکە | د. عمر عبدالكافي | ئامانج محمد ئەمین |

# بەرهەمی بینراو و بیستراوی ناوەندی راگەیاندنی ئارا

| . | بەرهەم | بابەت | ژ. ئەڵقە | ژ. سیدی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | زنجیرەی فلمە ئیعجازیەکان | فلمی دۆکیومێنتی ئیعجازی و زانستی و ئیمانی | ١٠٠ فلم | ٣٧ دیفیدی |
| ٢ | بێ بەبێی خۆشەویست | زنجیرە دۆبلاژکراوەکانی بانگخوازی بەناوبانگ م. عمر خالید | ٣٦ ئەڵقە | ٦ دیفیدی |
| ٣ | گۆرانی مەزن | | ئەڵقە١٨ | ٢ دیفیدی |
| ٤ | بەناوی تۆوە دەژین | | ٢٤ ئەڵقە | ٤ دیفیدی |
| ٥ | بەهەشتی ماڵەکانمان | | ٢٩ ئەڵقە | ٤ دیفیدی |
| ٦ | ڕابونی بارلا | ژیانی م. سەعیدی نورسی لە بارلا | ١ فلم | ١ دیفیدی |
| ٧ | فلیم کارتۆنی رەوشتە قورئانیەکان | گرنگترین رەوشت بە شێوەی زنجیرەی کارتۆنی بەرهەم هاتووە بۆ منداڵان | ٢٥ ئەڵقە | ٤ دیفیدی |
| ٨ | فلم کارتۆنی ئاکارە جوانەکان | چەند چیرۆکێکی بەسوود بۆ منداڵان | ١٠ ئەڵقە | ٢ دیفیدی |
| ٩ | فلیم کارتۆنی چیرۆکەکانی قورئان | هەندێك لەو چیرۆکانەی لە قورئاندا باسکراون و بۆ پەند وەرگرتن لێیان | ٨ ئەڵقە | ٢ دیفیدی |
| ١٠ | فلم کارتۆنی ژیانی م. سەعید نورسی | | ١ ئەڵقە | ١ دیفیدی |
| ١١ | خەتمەی قورئان | بە دەنگی چەند قورئان خوێنێکی بەناوبانگ | ٢١ خەتمە | ٢١ دیفیدی |



- ئەندازیار عوسمان محمد رشید
- لەدایکبوی ١٩٥٩لە سلێمانی
- دەرچووی کۆلێژی ئەندازیاری شارستانی زانکۆی سلێمانی ١٩٨١

لەبەرهەمەکانی:

- بەرەوپەروەردەی ئیسلامی.
- بەرچاو روونی.
- فەرهەنگی بانگخوازان.
- رامان لە قورئان.
- هەڵوێستەیەك لە خزمەت قورئاندا .
- بەهاری دڵان.
- ژیانەوە .
- بەرەوئیسلام .
- نوێ بوونەوە.
- زەوق و سەلیقەی بڕوادار.
- رازی قورئانی







ناوەندی راگەیاندنی ئارا

هەنگاوێک بەرەو راگەیاندنێکی کوردی ئیسلامی هاوچەرخ